




# مێژووی هاوچەرخی



# ئەوروپا

## لە شۆڕشی فەرەنسییەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی

خالید هەرکی
لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی



www.iqra.ahlamontada.com

# مێژووی هاوچەرخ

## ئەورووپا لەشۆڕشی فەرەنسییەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی


د. عبدالعزیز سلیمان ئەوار

د. عبدالمجید نەعنەعی


وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

خالید هەرکی

میژووی هاوچەرخ.. ئەوروپا لەشۆڕشی فەرەنسییەوە تا

جەنگی دووەمی جیهانی

- نووسەر: د. عبدالعزیز سلیمان نەوار

د.عبدالمجید نەعنەعی

- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: خالید هەرکی
- بابەت: مێژوویی
- نەخشەسازی: محمد حسێن خەتی
- چاپ: دووەم/ ٢٠١٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ:

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ ژمارەی سپاردنی (٦٧٩) ساڵی (٢٠٠٩)ی

پێدراوە

# پێشەکیی وەرگێڕ

خوێنەری ئازیز ئەم پەرتوکەی لە بەردەستت دایە لە دانانی بەڕێزان (د. عبدالعزیز سلیمان و د. عبدالمجید نعنعی)یە، باس لە مێژووی هاوچەرخی ئەوروپا دەکات لە ماوەی شۆڕشی فەرەنسییەوە تا جەنگی دووەمی جیهانیی. بە ڕای من بایەخی ئەم کتێبە بۆ خوێنەر لەوەدایە، کە شارەزایی و ئاشنایەتی لەگەڵ فرتوفێڵە دیپلۆماتی و یاساکانی ئەوسای دارستان و پیادەکراوی ئێستا پەیدا دەکات، لە ماهییەت و بێبنەمایی زاراوە بریقەدارەکانی ئێستای وڵاتە زلهێزەکان دەگات، لە بنەوانی مەبەستی بڕیارەکانیان دەگات. کاتێک بڕیارێک لە بەرژەوەندی ئەواندا بێت چۆن ڕشد دەبن لە سەری، بەڵام ئەگەر لە بەرژەوەندی گەلانی بندەست دابێت، ئەوا خۆیان دەدەن لە داوی گێلی تەنانەت بەر پێشیان نابینن، ئەو کاتەی میللەتە بێ کیانەکان دەکەونە بەر قاچیان گوێیان لە هاواریشیان نابێ.

بەم پێوەرە هەموو بڕیارەکانیان دوو سەرەن، یان خەنیت دەکەن یان گەنیت دەکەن، مافی چارەی خۆنووسین بۆ ئێمە مافی چارەڕەشی بووە، هێڵە سوورەکانی ئەم سەردەمە، کە پاراستنی یەکپارچەیی خاکی وڵاتە بەفەرمی ناسراوەکانە و دەستکارینەکردنی ناوە سەپێنراوەکان و ناسنامە شوومەکانی ئەوانە. ئەم پیرۆزمەندیە گەر مەبەستیان بێت زۆر بەئاسانی لەژێر ناوی دەستکرد دەستکاری دەکەن بێ ئەوەی کەسێک ورتەی لێوە بێت، هەندێک جار کودەتا سەربازییەکان دەبنە کودەتای سەربازیی ناڕەوا، هەندێک جاریش دەبنە ئیرادەی گەل، ئەمانە دوو دیمەنی دوو سەرەن.

پادشا و ئیمپراتۆرەکان، کە بە پارێزەری خاک و گەل و وڵات خۆیان دەناساند، دەبینین لەنێو خۆیاندا لە ترسی گەلەکانیان هاوپەیمانی دەبەستن، هەندێک جار گەیشتۆتە ئەو ئاستەی پیلانیان دژی میللەتەکانیان داناوە و هێرشی بەربڵاوی هاوبەشیان لە پێناوی مانەوەی ڕژێمەکانیان کردۆتە سەر میللەتێک. بەڵام ئەم شێوە هاوکاری و پەیوەندییە

لەنێو میللەتە بندەستەکان بۆتە خیانەتی گەورە و بە هۆیەوە سەرکردەکانیان گەیشتونەتە پەتی سێدارە.

وەکو هەموو مێژوونووس و زانایان لەسەر ئەوە کۆکن، کە مێژوو دووبارە دەبێتەوە، شارەزابوون لە ڕابردوو کارئاسانییە بۆ ئێستا و دوورکەوتنەوەیە لە هەڵە، کارئاسانی ئێستاش ئامادەباشییە بۆ داهاتوو و نزیکبوونەوەیە لە سەرکەوتن. کەوایە ڕابردوو کلیلی داهاتووە، لەم ڕوانگەیەوە هەڵوەستە و وردبوونەوە لەسەر مێژووی ناوچەیەکی ئەم جیهانە ئاشنابوونە بە مێژووی ناوچەکانی دیکە، چونکە هەموو ناوچەکان بە تۆڕێکی پتەو بە یەکەوە بەستراونەتەوە و کار و کاردانەوەیان بە یەکەوەیە و چالاکی و ڕەنگدانەوەشیان هەروا، ئێمەش ئەمڕۆ لە هەموو ناوچەکانی دونیا زیاتر پێویستیمان بە تێگەیشتن لە گۆڕانی کۆن و نوێدا هەیە. بۆیە ماندووبوون و شەونخونی ئەو ٩٠٠ کاتژمێرەی بە وەرگێڕانی ئەم پەرتوکەم بردۆتە سەر لە شوێنی خۆیدا دەبینم، هیوا دەخوازم تۆش خوێنەری بەڕێز سوود لەم خزمەتۆکەم وەربگریت. دیارە هیچ کارێکیش بێ کەموکوڕی نابێت، بۆیە داوا لە خوێنەری بەڕێز دەکەم لە هەر کەموکوڕیەکی زمانەوانی و وەرگێڕان بمبورێت، زۆریش دڵخۆش دەبم گەر لە ڕێگەی ئەدرێسی ئیمەیڵەکەم یان ماڵپەرەکەمەوە ئاگادارم بکات و بە زانیاریەکانی دەوڵەمەندم بکات، بۆ من مایەی دڵخۆشییە و بەوپەڕی دڵفراوانیش پێشوازی لە هەر ڕەخنەیەکی بنیادنەر دەگرم.

**خالید هەرکی**
**٩ی تەمووزی٢٠٠٨**
**ئارنهێم/ هۆڵەندا**
www.serben.com
khalidherki@chello.nl

# پێشەکیی دانەران

مێـژووی نـوێ و هاوچـەرخی ئـەورووپا تەوەرێکـە لـە تـەوەرە سـەرەکییەکانی توێژینەوەی مێژووی جیهانی ئەمڕۆمان، بەر لە ئێستا یەکێک لە دانەرانی ئەم پەرتوکە بە هاوکاری دکتۆر عەبدولحەمید البطریق (مێژووی ئەورووپای نوێ)ی نووسیوەتەوە، کە ماوەی نێوان چەرخی ڕێنیسانسی ئەورووپا لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمەوە تا کۆنگرەی ڤیەننا لە ١٨١٥ی لەخۆ گرتبوو. بۆ تەواوکردنی ئەو هەوڵ و تەقەلاّیانە ئەم توێژینەوە مێژوویییەمان ئامادە کردووە، کە مێژووی ئەورووپای هاوچەرخە لە شۆڕشی فەرەنسییەوە تا هەلگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانیی.

ئێمە لەم پەرتوکەماندا جەختمان لەسەر ئەو بابەتانە کردۆتەوە، کە کاریگەرییان هەبووە لەسەر مێژووی هاوچەرخی ئەورووپا و پێشکەوتنەکانی، بە دەستپێکی شۆڕشی فەرەنسی و شەڕەکانی ناپلیۆن و قەیرانەکانی ئەورووپا، کە لەو ماوەیە لە نێوان کۆنگرەی ڤیەننا تا شۆڕشەکانی ١٨٤٨ تووشی بووە. ئەو ماوەیە بەوە دەناسرا، کە نەتەوەکان بۆ کێشەی نەتەوایەتییان بەدوای ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕان بۆ گەیشتن بە ئاواتە نەتەوایەتییەکانیان. ئەوەبوو لەو سەردەم لە کاتێکدا هەموو بزووتنەوە شۆڕشگێڕە ڕزگاریخوازەکانی ئەورووپی شکستیان خواردبوو، تەنیا یۆنان و بەلژیک سەرکەوتنی نەتەوایەتییان بەدەست هێنابوو. بەلاّم ئەمە بوو بە دەسپێک بۆ سەردەمێکی نوێ، کە تێیدا جارێکی تر فەرەنسا دوای ڕووخانی خانەوادەی ئۆرلیان بوو بە ناپلیۆنی، بەم شێوەیەش بزووتنەوە ڕزگاریخوازە نەتەوەییەکان بۆ گەیشتن بە یەکێتیی و سەربەخۆیی زیاتر ڕێگایان بۆ ڕۆشن بوو.

لێرەدا (بیدمۆنت) بۆ خۆدەرخستن لە مەیدانی سیاسەتە بالاّکانی ئەورووپا جەنگی (قرم)ی بە هەل زانی بۆ ئەوەی هاوپەیمانیەک لەگەڵ ناپلیۆنی سێهەم وەدەست بێنێ و لە و ڕێگایەشەوە بەشی هەرە گەورەی یەکێتیەکەی وەدەست بێنێ.

هەرچی بروسیایە لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم توانی بە هێز دژی نەمسا و دانیمارک و فەرەنسا ڕێگە ببڕێ و وەرچەرخانێکی بنەڕەتی بەسەر ئەورووپادا بێنێ:

١- بە دەرکەوتنی ئەڵمانیایەکی زەبەلاح لە تەک فەرەنسا.

٢- بە دەرکەوتنی ئیتاڵیای یەکگرتوو، کە هەوڵی دەدا ببێتە وڵاتێکی زلهێز.

٣- نەمسا - ئەگەر بە تیۆرییش بێت- بوو بە وڵاتێکی هاوشان بە وڵاتە پاشکۆپێشینەکەی (هەنگاریا مەجەر)، پێی وترا وڵاتی دووقۆڵی (نەمسا و هەنگاریا) لە ١٨٦٧ەوە ئیمپراتۆری نەمسا دەستی بە نازناوەکەیەوە گرتبوو.

ئەم بارودۆخانە بوونە مایەی ئەوەی سیمای هاوسەنگیی نێودەوڵەتی ڕوون نەبێت، دوای ئەو قەیران و تەنگژەیەی دونیا بە هۆی ناکۆکیەکانی بڕوسیا و فەرەنسا تێی کەوت بوو، دەبوایە دۆخێکی نوێ لە هاوسەنگەکان بێتە کایەوە. فەرەنسا دژی ئەڵمانیای زەبەلاح بەدوای هاوپەیمانێکی نوێدا دەگەڕا، ئەڵمانیاش ڕێگەی لەم هاوپەیمانێتیە دەگرت. بسمارک هەوڵی ڕازیکردنی هەر یەک لە ڕووسیا و نەمسای دەدا بۆ ئەوەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ فەرەنسا نەبەستن، بەڵام هەوڵەکان بێسوود بوون. لە ئەنجامدا کارەکان لە بەرژەوەندیی نەمسادا تەواو بوون، بۆیە ئاسایی بوو فەرەنسا هاوپەیمانێتی لەگەڵ ڕووسیا ببەستێ.

ئەم ئاڵوگۆڕانەش دیسان وایان کرد پارسەنگەکان بە لای وڵاتە هێزدارەکاندا بشکێنەوە، کە ئەڵمانیا و نەمسا بوون، بووە هۆی ئەوەی ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیا ڕوویدات، بووە ئەگەری ئەوەی بەریتانیا بکەوێتە بەرەی فەرەنسا و ڕووسیا. ئەمە دوای ئەوە هات کە بەریتانیا لە بەدەستهێنانی سۆزی ئەڵمانیا بێئومێد دەبێ، دوای بەستنی ویفاقی فەڕەنسی - بەریتانی، کە لە ١٩٠٤ ئەنجام درا، (ویفاق)ی بەریتانی - روسیی لە ١٩٠٧ بە ئەنجام گەیشت، بەم شێوەیە وڵاتانی ویفاق باڵادەست بوون.

دوای ئەم گۆڕانکاریانە نیشانەکانی بەرپابوونی جەنگ لە ئەوروپا وەدەرکەوتن، بەڵام بەر لە بەرپابوونی جەنگ ئەوروپا تووشی زنجیرەیەک قەیرانی نێودەوڵەتیی بوو، کە بەرەو لێواری جەنگی دەبرد، زۆربەیان لە ناوچەکانی بەلکان بوون، هەرواش دەرچوو چەخماخەی یەکەمی ئەو جەنگە لە بەلکانەوە بوو.

بۆ ئەوەی ئەو بارودۆخانە ڕوون و ئاشکرابن، کە بوونە مایەی هەڵگیرسانی شەڕ و گۆڕانە سیاسیی و سەربازییەکان، توشی ئەو هێزانە بووین، کە بەر لە ڕوودانی جەنگی

جیهانییدا کاریگەریان بەسەر ئەورووپاوە هەبوو جگە لە ئەمەریکا، کە لە پەرتوکێکی تایبەتی و بەوردی تیشک خراوەتە سەری، ئەم پەرتوکە لەژێر ناونیشانی (مێژووی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای نوێ) کە لە ناوەڕۆکیدا ڕۆڵی تەواوی ئەمەریکامان لەم شەڕانە خستۆتە ڕوو.

ئەمەو کۆنگرەی ئاشتەوایی و ئەنجامەکانی گۆڕانی بنەڕەتیان بەسەر نەخشەی ئەورووپادا هێنا، بۆیە ناچار بووین توێژینەوەیەک ئەنجام بدەین بۆ ئەو کۆنگرەیە و ئەو کەسایەتیانەی، کە بەسەر کەشوهەواکەدا زاڵ بوون و بۆچوونەکانی خۆیان بەسەردا سەپاند بوو، چ ولاتە شکست خواردوەکان و چ ئەو ولاتانەی کە شان بە شانی هاوپەیمانان بەشداریی جەنگیان کردبوو، بۆیە دەبوو باس لەو ئەنجامە ئابووریی و کۆمەلایەتیانە بکرێت، کە لە ئەنجامی ئەو جەنگەوە هاتوونەتە ئاراوە.

ئەو گۆڕانە مەزنەی دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی ئەوروپا توشی هات، تیۆری دەوڵەتی تۆتالیتاری بوو بە هەموو شێوەکانییەوە.

- دەوڵەتی تۆتالیتاریی سۆڤیەتی.
- دەوڵەتی ئیتاڵیای فاشیست.
- دەوڵەتی ئەڵمانیای نازی.

ئێمە بەوردی لەسەرهەریەک لە ڕژێمی ئەو ولاتانە دواوین، کە ئەورووپایان ڕووبەڕووی ئەو ناکۆکی و قەیرانانە کردۆتەوە کە گرنگترینیان:-

- قە یرانی ئیتاڵیا- حەبەشە.
- جەنگی ناوخۆیی ئیسپانیا.

ڕاستە ئەم گۆڕاناکاریانە ئەورووپایان بەرەو جەنگێکی فراوان نەبرد، بەلام فراوانخوازی ئەڵمانیای نازی لەسەر دەستی هیتلەر یەکلاکەرەوەی سەرەتای جەنگ بوو، لە ڕاستیدا هیتلەر دەیەویست یەکێتیی ئەڵمانیا بە ئەنجام بگەیەنێ و ئەو خاک و خەڵکە بگەڕێنێتەوە باوەشی ئەڵمانیا، کە بە زۆر خرابوونە ژێر دەسەلاتی فەرەنسی و دانیمارکی و پۆلۆنیی و چیکەکان. بەلام یەکگرتنی ئەڵمانیا واتا جارێکی تر سەرهەڵدانەوەی

ئەڵمانیای زلهێز لەتەک فەرەنسا و بە شێوەیەک، کە هەڕەشە لە ئیمپراتۆریەتی فراوانخوازیی بەریتانیا بکات، بۆیە هەوڵەکانی هیتلەر بۆ یەکگرتنی ئەڵمانیا سەریان نەگرت، بەڵکو بوون بە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانیی، کە تێیدا هەرسێ دیکتاتۆریەتی (ئەڵمانی، ئیتالی و ژاپۆنی) بوون بە هاوپەیمان.

دیراسەکردنی ئەورووپا لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانییدا و دوای جەنگ پێویستیی بە چارەسەریەکی تایبەت هەیە، ئێمە لەم دیراسەیەدا بەوە کۆتاییمان هێنا، کە دیراسە لەسەر مێژووی ئەورووپای هاوچەرخ ئامادە بکەین لە شۆڕشی فەرەنسییەوە تا جەنگی دووەمی جیهانیی.

سەرکەوتن هەر لەلایەن خواوە دێت...

**دانەران**

**بەیروت/ جەنیوەری ١٩٧٣**

## پێڕست

## فەرەنسا بەر لە شۆڕش

شۆڕشی فەرەنسی تەنیا بۆ فەرەنسا ڕووداوێکی گرنگ نەبوو، بەڵکو لە بواری شارستانیەتی لە هەردوو سەدەکانی دواییدا لە ڕووداوە هەرە دیارەکانی ئەوروپا و دونیا بوو، چونکە هەر بەڕاستی خاڵی وەرچەرخانی بنەڕەتی بوو لە سیستەمی کۆمەڵایەتیی و سیاسی لە ئەوروپا. سنووری بۆ سیستەمی پادشایەتیی کۆن دانا، کە لەسەر چەوساندنەوە بنیاد ترابوو، لە دەسەڵاتدا پشتی بە مافی خودایی بەست بوو و دەرگای سیستەمی ئازادیی و کۆماریی لە ڕووی جەماوەردا خستە سەر پشت، کە لەسەر بنەمای ئازادی گەلان و یەکسانیی لە نێوان تاکەکانیدا سەرچاوەی گرتبوو، کە دەسەڵات لە هاووڵاتیەوە بێت و لەژێر چاودێری ئەویشەوە بێت.

ئەوەی فەرەنسا و هەموو ئەوروپا بەدەستیەوە دەیان ناڵاند، بریتی بوو لە باڵادەستی خانەوادەی پادشایەتی و حوکمی رەهایان، چینی دەستڕۆیشتوو دەستی بەسەر هەموو خێر و بێرێکی وڵاتەکەدا گرت بوو، لە لایەکی تریشەوە کلێساکان بە ناوی ئایینەوە خاوەنی هەموو ئیمتیازاتێک بوون، لە هەموو خێرو بێرەکان سەرپشک بوون، لە باج و هەموو ئەرکەکانی بەرانبەر بە وڵات بوردرابوون. سەبارەت بە توانا و چارەنووسی خۆی گەل خاوەنی هیچ جۆرە دەسەڵات و ڕا و بۆچوونێک نەبوو، ئازادییە گشتییەکان تەنیا لە خەیاڵی ئازادیخوازان بوونیان هەبوو، گەل هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر سامان و چارەنووسی خۆیەوە نەبوو، بۆیە شۆڕشی فەرەنسا بۆ چارەسەری ئەو دەردانە لە دایک بوو و هەوڵی دا چارەسەرییەک بدۆزێتەوە، کە بۆ فەرەنسا و بۆ وڵاتانی دیکە گونجاو بێت.

ڕووداوەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئەوەیان سەلماند، کە چۆن شۆڕش بۆ گەلانی مافخوراوی ئەوروپا بۆتە خوێندنگا و پێشەنگ لە بواری ئازادیخوازیدا، بۆ بەرپەرچدانەوەی گەندەڵیی و چاکسازی لە مەیدانی سیاسەت و کۆمەڵایەتیدا کاری کردبووە سەر هەموو توێژێک.

فاکتەرە بنەڕەتیەکانی هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشە ئەوەندە زۆر و تێکهەڵکێشراون، کە لە ژماردن نایەن، زۆربەی هۆکارەکان دەگەڕێنەوە بۆ بەر لە شۆڕش و تەنانەت

هەندێکیان بۆ سەردەمی لویسی چواردەهەم ئەو کاتەی فەرەنسا لەوپەڕی بوژانەوە و گەشەدا بوو.

لێرە دەتوانین هۆکارەکان بگەڕێنینەوە بۆ:

## سیستەمی پادشایەتی



لویسی چواردەهەم

لە سەروبەندی شۆڕشدا لە سەدەی هەژدەهەم رژێمی پادشایەتی لە فەرەنسا پشتی بەو بەند و برگانە دەبەست، کە لویسی چواردەهەم و وەزیرەکەی (ریشیلیۆ) دایان ڕشتبوو، واتە بە هێز و توانا و رەهاوە و بەبێ سانسۆر و هێڵی سوور داڕێژرابوون. تا ئەو کاتەش پادشا وا رەفتاری دەکرد، کە فەرمانەکانی یەزدان جێ بە جێ دەکات، بەم پێوەرە پابەندی ئەوە نییە کارەکانی نمایشی هیچ کەسێک بکات، تەنیا خوا نەبێ.

لەسەر ئەم بنەما و بیرکردنەوەیە خۆی بە سەرچاوەی هەموو یاسایەک دەزانی و ڕازیش نەبوو کەس لە دانان و جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە بەشداریی لەگەڵدا بکات، ئەو خۆی بە یەکەم و دوا سەرچاوە دەزانی و دەبوایە هەمیشە فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێن. چەوساندنەوە یەکێک بوو لە مافە دانپێدانراوەکانی لە نەریتی سیاسەتی فەرەنسادا، لەو نەریتانەش ئازادییە سیاسیی و ئایینیی و ئازادییەکانی تاک بوونیان نەبوو و دانیان پێدا نەنرابوو، خۆ ئەگەر لە کۆنیشدا سنوورێک بۆ دەسەڵاتەکانی پادشا هەبوویێت، ئەوا لە سەردەمی ڕیشیلیۆ بوو، کە بە شێوەیەکی ڕووکەش و بێ کاریگەر بوونی هەبوو..

هەر لە سەردەمی کۆنەوە دادگای باڵا (پەرلەمان) دەسەڵاتی چاودێری یاساکانی پادشای هەبوو، هەروەها دەسەڵاتی ئەوەشی هەبوو گفتوگۆ لەسەر یاساکان بکات و لە کارنامە فەرمیەکاندا تۆماریان بکات، بە هەر شێوەیەک ئەم یاسایانە کاریان پێ نەدەکرا تا لە پەرلەمان تۆمار نەکرابان، مەبەست لە دامەزراندنی ئەم دادگایانەش رێگرتن بوو لە دەرکردنی یاسای توند و چەوسێنەر بەرانبەریان. بەڵام ریشیلیۆ دەسەڵاتی ئەم دادگایانەشی سنووردار و ئفلیج کرد بوو، بۆ ئەوەی توانای ئەوەیان نەبێ بڕیارێک یان یاسایەک، کە پادشا دەری بکات، ئەمان رەتی بکەنەوە. لەو کاتەوە دادگاکانیش بایەخ و گرنگیان لە دەست دا، ئەوانیش رازی نەبوون چیتر یاساکان لای خۆیان تۆمار کەن. بەڵام ئەو گفتوگۆیانەی بەر لە دەرکردنی یاساکان دەکران کارێکی باش بوون، چونکە گەندەڵی و سەرپێچیەکانی دەوڵەتیان پەردە لەسەر هەڵدەماڵی. دیارە کە ئەم گفتوگۆیانەش ئەنجامی چاکیان هەبوو، بەتایبەت لە سەردەمی لویسی شازدەهەم، کە ئەندامی دادگاکان زۆربەیان لە بۆرجوازی و رۆشنبیرەکان بوون، گفتوگۆ و مشتومڕەکانی بەر لە دەرکردنی یاساکان دەبوونە هۆی ئەوەی لایەنە خراپ و کاردانەوەکانی سەر چینی سێیەم ئاشکرابکەن و بۆ هاووڵاتیان رابگەیەنن.

ئیدارەیەکی حکومەت هەبوو، کە بە رژێمەکی بەرچاو دواکەوتوو و کۆنەپەرست بوون، دەتوانین بڵێین درێژەپێدەری چەرخی ناوەڕاست بوون، یاریدەدەری پادشا بوون لە سەرپەرشتیکردنی کاروباری فەرەنسا. ئەمان درێژەپێدەری چەرخی ناوەڕاست بوون بە ئیمتیازاتەکانەوە، کە لە سەدەی هەژدەهەم ئەم جۆرە ئیمتیازانە هیچ پاساوێکیان نەبوو.

وڵات بەسەر چەند یەکەیەکی بەڕێوەبردندا دابەش ببوو، کە شێوەی لە دەرەبەگی کۆن دەچوو، دەسەڵاتی سەرکردەکانیان بۆ تەختی پادشایەتی گواستبووەوە، بە هێشتنەوەی سنووری جوگرافی تا سەردەمی شۆڕش، زۆر جار ئەم دابەشبوونە ڕەچاوی دۆخی ئابووری و جوگرافی و کۆمەڵایەتیی دانیشتووانی نەدەکرد، هەر یەک لەم هەرێمانە ئەنجومەنێکی یاسادانان و ئیمتیازاتی تایبەتی خۆی هەبوو، کە گەلێك جارلە ڕووی ئیمتیازاتەوە لەگەڵ ئەنجومەنەکانی تردا جیا بوون. هەروەها هەر یەک لەو هەرێمانە یاسا و سیستەمی سەربەخۆی خۆیان بۆ باج و گومرگ و بودجە هەبوو، کە ئەمە گەلێک جار رێگر بوون لە بەردەم گەشەکردنی بازرگانی و پێشوەچوونی لە نێوان هەرێمەکاندا لە لایەک و لە

نێوان ئەوان و دەرەوەی هەرێمەکان لە لایەکی تر، ئەمە دەبووە رێگر بۆ یەکگرتنی ئابوورییەکی پتەو، کە هەموو هەرێمەکانی فەرەنسا لە خۆ بگرێ.

ئەوەی کارەکانی زیاتر لەبارێەک بردبوو بریتی بوو لەوەی هەر هەرێمێک تەنیا یەک فەرمانبەر (نوێنەری پادشا) سەرپەرشتیی یەکەی ئابووری و بازرگانیی دەکرد، ئەمە لە سەردەمی ریشیلیۆ بوو ئەم بریکارەی پادشا دەسەلاتێکی فراوانی پێ درابوو، زۆربەی جارەکان ئەم دەسەلاتەی تەنیا بۆ کۆکردنەوەی باجەکان بۆ پادشا و حکومەتی مەرکەزی بەکار دەهێنا، ئەم رەفتارانەی بریکار ببوونە مایەی ئەوەی نوێنەری پادشا لای خەڵک دزێو و نەخوازراو بێت، بە تایبەت لەلایەن جوتیارانەوە.

١٥ ساڵ بەر لە شۆڕش بۆربۆن لویسی شازدەهەم دەسەلاتی گرتە دەست، هەرچۆنێکی بێت ئەو بەم ئاستە خراپ نەبوو، کە بە تەنیا باجی گەندەڵی و نادادپەروەرییەکانی پادشاکانی پێش خۆی بدات.

لویسی شازدەهەم پیاوێکی چاکەخواز و ئایینپەروەر و رەوشتبەرز بوو، بەڵام ئاستی وشیاریی بەرز نەبوو چونکە راڕا و هەندێکیش لاواز و بێتوانا بوو، کەسێک بوو لە ئاست ئەوەدا نەبوو لە کاتی تەنگانە و قات و قڕیدا رابەرایەتی تەنگژەکانی فەرەنسا بکات. سەرباری ئەمەش شاژنی فەرەنسا ئەوکات (ماری ئەنتوانێت)ی کچی (ماریا تریزا) ئیمپراتۆری نەمسا بوو، کەسێکی توند و بەئومێد بوو، بەهێزترین کەسایەتی بوو، کە بە ئارەزووی خۆی و بە دوای بەرژەوەندییەکانیدا دەچوو. بۆیە زۆر باجی هەڵە و رەفتارەکانی خۆی دا، بەتایبەتیش چونکە بە رەچەڵەک نەمسایی بوو، بۆیە لای خەڵکی فەرەنسا خۆشەویست نەبوو.

بە هۆی ئەوەی لایەنگرانی لویسی شازدەهەم لە دوایین ساڵەکانی دەسەلاتیدا پشتیان تێی کردبوو بەدوای بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی خۆیاندا دەگەڕان، زیانی زۆر بە خانەوادەی خاوەن تەخت و تەلاری پادشایەتی کەوت، تەنانەت چینی خانەدانیش لە ساڵەکانی بەر لە شۆڕش هەمان دڵسۆزیان بۆ تەختی پادشایەتی نەمابوو، ئەمە جگە لەوەی هەندێک لە رۆڵەکانیان لە رێگەی خوێندن و زانستەوە هەستیان بە ئاستی گەندەڵی لە فەرەنسا کردبوو و ئەو بڕوایەیان لا دروست ببوو، کە لە هەر لایەکەوە بێت وڵات پێویستی بە گۆڕینی ریشەیی هەیە.



ریشیلیۆ

## سیستەمی چینایەتیی

ئەوەی تا ئەوکات فەرەنسای ناشیرن کردبوو، ئەوە بوو، کە تا ئەوسا دەستی بە سیستەمی چینایەتییەوە گرتبوو، لەم سیستەمە تەنیا چەند کەسێک سوودمەند بوون و بەری رەنجی خەڵکیان دەخوارد. فەرەنسییەکان بەو پێوەرە بەسەر سێ چیندا دابەش ببوون، کە هەر چینەی جیاوازیەکی زۆریان لە نێواندا بەدی دەکرا و دەربازبوون لێیان ئاسان نەبوو.

### ١- شکۆدارەکان (الاشراف):

ئەمانە لە چینە باڵاکانی کۆمەڵگای فەرەنسیی بوون و لە دەوروبەری پادشا دەبوون، بە هەموو شێوەیەک بەرگریان لە پادشا و رژێمەکەی دەکرد، بەهۆیەوە ژیانێکی ئەوپەڕی خۆشیان دەبردە سە ر و هەمیشە سوودمەندی پلە یەک بوون، کە بەشێک لەو ئیمتیازانە دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی دەرەبەگایەتی. شکۆدارەکان لە لادێ خاوەنی زەوی و زارێکی زۆربوون، جوتیار و کۆیلەکان بە سەپانی بۆیان دەبردن بەڕێوە، ئەم زەویانە بەر لە شۆڕشی فەرەنسیی بە پێنجیەکی زەویەکانی فەرەنسا خەمڵێندرا بوون. دیسان تەنیا شکۆدارەکان بۆیان هەبوو پلە و پایە بەرزەکانی سوپا و بەڕێوەبردن و دادوەریی و دیبلۆماسیی وەرگرن، بۆیان هەبوو باج بەسەر ئەو جوتیارانەدا بسەپێنن، کە وەکو سەپان لای ئەوان کاریان دەکرد. دەیانتوانی زۆریان لێ بکەن تا باراشەکانیان لای شکۆدارەکان

لە ئاش بکەن و زەیت لە کارگەکانیان بەرهەم بێنن، دیسان بۆیان هەبوو لە کێڵگەکانی جوتیاران بە هەوەستی خۆیان راو بکەن و زۆرجار لە یەکلاکردنەوەی کێشەی نێوان جوتیاران خۆیان رۆڵی دادوەریان دەبینی. سەرباری ئەمە شکۆدارەکان لە گەلێک لەو باجانە بووردرابوون، کە دەبوایە بیدەن بە دەوڵەت. ئەم چاوپۆشینەی شکۆدارەکان لە باب و باپیرانیانەوە لە چەرخی ناوەڕاست بۆیان مابووەوە، بەڵام لە سەدەی هەژدەهەم لەگەڵ گۆڕانی دۆخەکان و باری ئابووریی وڵات و سەرەتای دروستبوونی پیشەسازی و بڵاوبوونەوەی بیری ئازادیی نوێ ئەم سیستەمە بووە بارێکی قورس بەسەر فەڕەنسییەکانەوە.

## ب- پیاوانی ئایینیی:

ئەمانیش لەتەک شکۆدارەکان چینێکی نایابیان پێکهێنابوو، خاوەنی پانتاییەکی سوودمەند بوون، لە ڕووێکەوە پشتگیریەکی باشیان لێ دەکرا، لە ڕووەکەی دیکەشەوە لە سەردەمی چەرخی ناوەڕاست هەندێک ئیمتیازیان بۆ مابووەوە.

کلێسا و قەشەکان، کە لە سەرتاسەری فەرەنسا بڵاو ببوونەوە، خاوەنی زەوی و زارێکی زۆربوون، نزیکەی بە پێنجیەکی زەویەکانی فەرەنسا دە خەملێندرا و بە هەزاران جوتیار لە بارودۆخێکی زۆر نالەباردا کاریان تێدا دەکرد. ئەمەو کلێساکان داهاتێکی باشیان هەبوو، کە ساڵانە کۆدەکرایەوە، پێی دەوترا دەیەک. ئەم دەیەکە وەکو باج ساڵانە لە سەرجەم فەڕەنسییەکان وەردەگیرا، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم کۆی ئەم باجە گەیشتە دووسەد ملیۆن فرەنک زێڕ، لەگەڵ ئەو داهاتەشیان کلێساکان لە زۆربەی باجەکان بووردرابوون. ئەوەی جێی نارەحەتی فەڕەنسییەکان بوو، ئەم داهاتە بۆ کاری مەبەست خەرج نەدەکرا، لە کاتێکدا دەبوایە لەپێناو بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای کریستی خەرج بکرابایە.

## ج- چینی سێیەم:

ئەوەی مابووەوە لە هاووڵاتیان لە یەک چیندا رێک خرابوون، بە چینی گشتیی یان چینی سێیەم ناو دەبردران. ئەمانە بەرگەی هەموو نەهامەتیەکانی وڵاتیان لە باجی قورس و خزمەتی سەربازی و خزمەتی کلێسا و خزمەتی شکۆدارەکانیش دەگرت، بە کورتیەکەی ئەم چینە دەبووایە هەموو فەرمان و پێداویستیەکانی وڵات جێ بە جێ

بکات، لەبەرانبەریشییەوە باجی زۆر بدات و مافی تەواویشی نەبوو لە ئازادیی رادەربڕین و یەکسانی لە بەرانبەر یاسا و مافی دەستنیشانکردنی سیستەمی ئابووریی و سیاسیی گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی.

بەشێکی کەم لەم چینە بە جیا بوونە خاوەن سامانێکی باش، بە هۆیەوە پایەی تایبەت و ڕۆڵی سەرەکیان لە بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی وڵات بینی، پێیان دەگوترا بۆرجوازی. ئەم بەشە کەمە مێژووی دروستبوونیان بۆ کۆتایی چەرخی دەرەبەگایەتی دەگەڕێتەوە، کاتێک کەمینەیەک لە کۆیلەکان وردە وردە ئازادبوون و بوون بە خاوەنی زەویی خۆیان، یان بوون بە خاوەنی کاری بازرگانیی و پیشەسازیی، ئەمەش ڕێخۆشکەربوو بۆ ئەوەی ئەم چینە بواری پیشەسازی و بازرگانی کۆنترۆڵ بکەن، تا گەیشتە ئەوەی خانەدانەکان دەستبەرداری ئەم پیشانە بن. کاریگەریەکی تری بەرزبوونەوەی ئەم چینە ئەوە بوو، کە دۆزینەوەی کیشوەری ئەمەریکا و هاتنی سەرمایەیەکی زۆر بۆ ئەوروپا دیسان بەرین بوونی مەودای بازرگانی بووە هۆی ئەوەی سەرمایەیەکی باش بکەوێتە دەست ئەم چینە، لە ئەنجامدا نەوەکانیان توانیان بەشێکی زۆر لە زانست وەدەست بهێنن و چەندین زانا لە بواری پزیشکی و هونەری و ئەندازیاری و فەلسەفە و یاساناسییان لێ هەڵکەوێ. ئەوەندەی نەبرد وای لێهات ئەو نەوە رۆشنبیر و چالاکە جێگە بە نەوەی خانەدانەکان لێژ بکا لە ناوەندە گەورەکانی دەوڵەتدا، بە تایبەتی ئەوانەی پێویستیان بە زانست و پسپۆڕیی هەبوو، لە کاتێکدا ئەم بەهرەیە لە خانەدانەکاندا بەدی نەدەکرا. ئەمە بەتایبەت لە سەدەی هەژدەهەم نووسەر و زاناکانیان توانیان ماف و ئەرکەکانی هاووڵاتیان دەست نیشان بکەن و بۆیان شی بکەنەوە، کە تا چەندە لە تاریکی دەژین و مافەکانیان چۆن پێشێل دەکرێت.

ئەوەی ئەرکی ڕۆشنبیرانی ئاسان کردبوو، بەرنامەی خوێندنی ئەدەبیی رەها بوو، بە تایبەت ئەدەبی یۆنانیی کۆن وەکو سەرچاوەیەکی لەبننەهاتوو بوو لە سەرمایەی ئەدەبیی و فەلسەفییدا.

ئەدەبی یۆنانیش بە ئەدەبێکی ئازاد و کراوە دەناسرا و یۆنانییە کۆنەکان یەکگرتوو و پابەندی دەسەڵاتێکی ناوەندیی بەهێز نەبوون، ئەمەش گیانی شۆڕشگێڕیی خستە جەستەی فەرەنسییەکان. لەم روانگەیەوە بەرنامەکانی خوێندن لە ناوەڕۆکدا هانی خەڵکی دەدا بۆ شۆڕش و دژایەتیکردنی بەرژەوەندییەکانی چینی دەوڵەمەند و دەرەبەگ، کە

دەستیان بەسەر هەموو پۆست و پلە و پایە سەربازی و سیاسیەکانی وڵاتدا گرتبوو. بۆرجوازەکان هەستیان بەوە دەکرد، کە لە بارودۆخێکی نامۆدان، چونکە خاوەنی زانست و شارەزایی و دارایی بوون، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵات و جەماوەر لە دەست شکۆدارە (اشراف)کان دابوو، کە لایەنگری بنەماکانی کۆنەپەرستی و دواکەوتویی بوون. بۆیە لانی کەم دەبوو سەرەتای شۆڕش دژی بەرژەوەندییەکانی شکۆدار و (اشراف) و پیاوانی ئایینی بێت لە بری ئەوەی لە دژی رژێمی پادشا بێت، ئەویش بە هۆی ئەو رۆڵە بنەڕەتییەی چینی رۆشنبیری بۆرجوازەکان دەیان گێڕا لە بەرپاکردنی شۆڕش و ئاراستەکردنی رووداوەکانیدا.

لە هەمووی ناهەموارتر لە بارودۆخی فەرەنسا ئەوەبوو، کە هەموویان پێیان وابوو ئەو ئیمتیازاتانە لە لێبوردنی باج کاری دزێون و هەموویان مەبەستی لەناوبردنیان هەیە، تەنانەت وەزیرەکان و زۆربەی دامودەزگاکانی دەوڵەت ئەو راستییەیان دەزانی. هەندێک لە وەزیرەکان هەوڵی چاککردنی ئەم دۆخە نالەبارەیان دا بە برینی دەستکەوتە ناشەرعییەکان، تەنانەت پادشاش دەستی خستە ناو کاری چاکسازیی، بەڵام هەموویان بێسوود بوون. کار وای لێهات لە بێتواناییاندا لە بەرانبەر چارەسەریدا دەستەوەستان مانەوە، لە چاوەڕوانی چاکبوونی خۆڕسکدا بوون. دواتر پادشا نەک تەنیا بەرانبەر بە چاکسازی دەستەوەستان وەستا، بەڵکو لە بەرانبەر بە چارەسەرکردنی کێشە داراییە درێژخایەنەکانیشدا بێدەسەڵات مایەوە، کە هەموو فەرەنسا بە دەستییەوە دەیناڵاند.

## قەیرانی دارایی و ئابووریی

فەرەنسا بەدەست بۆشاییەکی لەمێژینەی گەنجینەکانییەوە دەیناڵاند، ئەمەی هەر لە کۆنەوە و لە سەردەمی لویسی چواردەهەمەوە بە هۆی شەڕەکان بۆی مابۆوە، لەو سەردەمەوە کەسێک دەستپێشخەری ئەوەی نەکردبوو چارەسەریەکی ریشەیی بۆ بدۆزێتەوە. ئەم قەیرانە بەتەواوەتی ئەوکاتە سەری هەڵدا کاتێک ئەمەریکا دژی ئیمپریالیزمی داگیرکاری بەریتانی دەستی بە شەڕی سەربەخۆیی کرد، ئەوەش تێچوویەکی زۆری خستە سەر فەرەنسا لە یارمەتیدانی ئەمەریکییەکان دژی ئیمپریالیزمی بەریتانی.

ئەوەی لەم مەسەلەیە سەرسوڕهێنەرە ئەوەبوو، کە ئەم قەیرانە لە بنەڕەتدا بە هۆی بێداهاتی فەرەنسا وە نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوکات فەرەنسا خاوەنی کشتوکاڵێکی گەشەکردوو و پیشەسازییەکی پێشکەوتوو و بازرگانییەکی دەرەکیی چالاک بوو، بەڵام ئەوەی راستی بێت ئەم قەیرانە لە ئەنجامی بێبەرنامەیی لە بودجە و داهات و خەرجکردندا بوو. هۆکارێکی تری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی توانای دانی باجیان هەبوو، ئامادە نەبوون باجەکان بدەن، ئەوان ئەم باجانەیان نەدەدان، چونکە پێشتر خاوەنی ئیمتیازات بوون، کەوابێ کێشەکە لە بودجە دابوو نەک لە داهات.

بۆ ئەوەی لە راستیی بارودۆخی دارایی فەرەنسا بگەین ئەوەندە بەسە سەیرێکی حساباتی گەنجینەی فەرەنسا بکەین لە ساڵی ١٧٨٨ کە ساڵی بەر لە شۆڕش بوو. خەرجی وڵات لەو ساڵدا ٦٢٩ ملیۆن لیرە بوو لە کاتێکدا داهاتی وڵات لە ٥٠٣ ملیۆنی رەت نەدەکرد، واتە بە کەمهێنانی ١٣٦ ملیۆن لیرە کە دەکاتە رێژەی ٢٠% بودجەی گشتیی وڵات. نارێکی ئەو بودجەیە لە شێوازی دابەشکردنی خەرجیەکاندا بوو:

- پتر لە نیوەی بودجەکە، کە دەکاتە ٣١٨ ملیۆن لیرەی زێڕ، دەچووە گیرفانی بەخێوکەران، کە بۆ دانەوەی قەرزە کۆنەکان بوو.
- ٢٦%ی بودجەکەش، کە دەکاتە ١٦٥ ملیۆن لیرە زێڕ، بۆ سوپا و دەریاوانەکان بوو، لەم پارەیە ١٢ ملیۆن بۆ ئەفسەرەکان بوو، کە هەموویان کوڕانی شکۆدار و بۆرجوازەکان بوون، ٤٦ ملیۆنیش بۆ مووچەی شکۆدارەکان خۆیان بوو.
- ٦%ی بودجەکەش بۆ خەرجی کۆشکی پادشایەتی و دەست و پەیوەندەکانی بوو.
- کەمتر لە ٢%ی بودجەکە بۆ خەرجی بەرنامەکانی خوێندن و زانکۆ و خزمەتگوزارییە گشتییەکانی تر دەمایەوە.

لە سەردەمی لویسی چواردەهەم زۆرهەوڵدرا بۆ چاکسازی بارودۆخی دارایی وڵات، گرنگترینی ئەو هەوڵانە ئەوە بوو، کە هەریەک لە وەزیران تیرگۆ و نیکەر پێی هەڵسان، بەڵام ئەو هەوڵانە بەرانبەر بە ناچارکردنی چینی خانەدان (نبلاء) و ئەکلیرۆس شکستیان هێنا بۆ دەستبەردار بوون لە بەشێک لە ئیمتیازاتەکانیان و دانەوەی ئەو باجە کەڵەکەبووەی سەریان. لە راستیدا بارودۆخی بودجەی فەرەنسا بەو شێوەیە خراپ نەبوو، کە ژمارەکان دەیانخستە ڕوو، چونکە وڵاتی فەرەنسا زۆر دەوڵەمەند بوو، ئەگەر باجەکان

بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەشکرابان ئەوا زۆر بەئاسانی بودجەی دەوڵەت و خەرجیەکانی رێکدەخران.

دوایین هەوڵی چاکسازی لە (١٧٨٣-١٧٨٧) لەلایەن وەزیر(کالۆن) درا، کالۆن لە بەرنامە چاکسازییەکەیدا هەوڵی دابوو هەموو فەرەنسییەکان بەرانبەر بە دانی باج و ئەرک و فەرمانەکان یەکسان بکات، بێ گوێدانە پلەی کۆمەڵایەتیی، هەروەها لە بەرنامەکەیدا هاتبوو هەموو سنوورەکانی نێوان هەرێمەکان لە ڕووی گومرگ و هەر بەربەستێکی تر تێکبشکێنرێ، بۆ چالاککردنی بازرگانی ناوخۆیی و ئاسانکاری بۆ گواستنەوەی کاڵا و شتومەکی لە ناوخۆی فەرەنسادا. بۆ رازیکردنی پیاوانی ئایینیی و ئەکلیرۆس بۆ جێبەجێکردنی بەرنامە ریفۆرمیەکەی، بەوپێیەی کارێکی پێویستە بۆ پاراستنی رژێم وڵات، داوای دانیشتنی ئەنجومەنی پیرانی (پیاوماقولان) کرد، ئەم ئەنجومەنە ئەنجومەنی نوێنەرانی چینی ئەکلیرۆس و شکۆدارەکان بوو، بە دەگمەن ئەم ئەنجومەنە کۆدەبۆوە. لە ساڵی ١٧٨٧ کۆبوونەوە تیایدا باس لە دۆخی خراپی فەرەنسا کرا و بەرپرسیارێتیی روبەڕوبوونەوەی بەرنامەی چاکسازیی خستە ئەستۆی ئەوان. سەرەڕای شکستهێنانی ئەو هەوڵانە، کەچی ئەنجامەکانی بەرچاو بوون، بەو پێیەی کە ناوەڕۆکی ئەو راپۆرتەی لەبەردەم ئەنجومەنی ناوبراو خوێندرایەوە بەسەر فەرەنسییەکاندا بڵاوکرایەوە و بۆ یەکەم جار لەسە ر زاری وەزیرێکی بەرپرس درکیان بە ئاستی خراپی بارودۆخی دارایی فەرەنسا و هۆکارەکانی کرد.

لەو راپۆرتەی کە خرابووە بەردەم ئەنجومەن بەم شێوەیە کورت کرابۆوە:

(فەرەنسا لە چەند هەرێم و کەرتێکی پارچەکراو و ئیدارەی جۆراوجۆر پێک هاتووە، هەرێمەکان هیچ لەسەر یەکتری نازانن، کەسیان باری ئەوی تریان هەڵناگرێ، بەڵکو هەریەکە باری خۆی دەخاتە سەر پشتی ئەوی تریان، دەوڵەمەندترین چینیان کەمترین باج دەدەن، دەستکەوتەکان بە نایەکسانی دابەش دەکرێن و ناتوانن دەسەڵاتێکی چەسپاو و هەمیشەیی و ئیدارەیەکی هاوبەش پێک بهێنن. لاتان سەیر نەبێت ئەگەر بڵێم لە کەموکوڕی و گەندەڵیدا نقوم بووە، بۆیە ناکرێ ئێستا حوکمێکی باشی لەسەر بدرێت).

لەتەک دۆخی خراپی دارایی وڵاتدا کەمی لە داهاتی چینی کرێکار و خاوەن کەمدەرامەتەکاندا هەبوو بە شێوەیەک، کە بۆ هیچ هەوڵێکی چاکسازی بۆ گەنجینەی

وڵات ناكرێ پشتی پێ ببەسترێ، لە میانەی نیوسەدەی بەر لە شۆڕش نرخەكان بە ڕێژەی ٦٥% بەرز بوونەوە، كەچی رۆژانەی كرێكارەكان بە ڕێژەی ٢٢% زیادی كردبوو.

قەیرانی ئابووریی ساڵی ١٧٨٨، كە بە پلە یەك چینی بۆرجوازیی گرتبووەوە، بارودۆخی گشتی و دارایی خراپتر كرد، هەروەها وەرزی بەرهەمهێنان بەتایبەت بەرهەمی گەنم، كە ئەو ساڵ نەهات بوو، تا نزمترین ڕێژە دابەزی. ئەوكاتەی ساڵی ١٧٨٩ بەهاری بەسەردا هات، نرخی نان بەرز بۆوە، جوتیار و كرێكارەكانی شارنشین زۆر بە ئەستەم نانیان دەست دەكەوت. پەیماننامەی ئابووریی لەگەڵ بەریتانیا زیاتر قەیرانەكەی توندتر كردەوە، چونكە ڕێگەی بە بازرگانان دابوو گەنم هەناردەی بەریتانیا بكەن بۆ وەدەستهێنانی قازانج، سەرەڕای پێویستیی زۆری فەرەنسییەكان بە گەنم. ئەوەبوو رای گشتیی داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیماننامەیە یان دەكرد، كە ڕێگە بە هەندێك كەس دەدا گەنم و دانەوێڵە بۆ سوودی تایبەتی خۆیان بنێرنە دەرەوەی فەرەنسا.

برسێتی بڵاوبۆوە و بێئومێدی شار و لادێكانی گرتەوە، جوتیارەكان كەوتنە سواڵكردن، بەمەش كەشوهەوای شۆڕش فەرەنسای گرتەوە.

## ئەنجومەنی نیشتمانی

قەیرانی ئابووریی لە فەرەنسا لە هاوینی ١٧٨٨ بە ڕێژەیەکی مەزن توند ببوو، برسێتی و قاتوقڕی لە هەندێک گوند و گەڕەکە هەژار و کرێکارنشینەکانی شارە مەزنەکان بڵاوببووەوە. (نیکر) کە لە ساڵی ١٧٨٨ جارێکی تر داوای لێ کرابوو وەزارەتی دارایی بگرێتە ئەستۆ، بە شارەزا و تەگبیرکار ناسرا بوو، لە بەرانبەر ئەم قەیرانە دەستەوەستان وەستا، بەتایبەت لەوکاتەدا کە گەنجینەی وڵات خاڵی (سوختە) بوو. هەر واش بوو، چونکە (کالون) وەزیری پێشوی دارایی لە ١٧٨٧ لە ڕاپۆرتێکیدا بۆ ئەنجومەنی پیران ڕایگەیاندبوو، کە فەرەنسا بە گوژمەی چوار ملیار لیرەی زێڕ بە قەرزە کۆنەکانیشەوە قەرزارە، کە بە هۆی شەڕەکانی ڕزگاریی ئەمریکییەوە خراونەتە سەری.



نیکەر

بەرانبەر بەو مەترسیە ئابووری و داراییانە (نیکەر)ی وەزیر پێشنیارێکی خستە بەردەم لویسی شازدەهەم، کە لە ڕێگەی ئەنجومەنی چینەکانەوە ئەم کێشەیە بخاتە بەردەم نەتەوەی فەرەنسا، کە نوێنەرایەتیی هەموو گەلی فەرەنسای تیایە، ئەم ئەنجومەنە ١٧٥ ساڵ دەبوو داوای دانیشتنی لێ نەکرابوو.

سەرەڕای مەترسی لەسەر رەنگدانەوەی ئەم پێشنیارە، بەڵام پادشا ئەم پێشنیارەی پەسند کرد، دیارە کە شانشین پێویستی بە پارە هەیە، ئەمەش بە رەزامەندی هەموو نوێنەرانی گەل نەبێ ناکرێ.

لەسەر راسپاردەی پادشا (نیکەر) سیستەمێکی نوێی بۆ هەڵبژاردنەکان دانا لەسەر ئەم بنەمایە هەڵبژاردنێکی گشتی لە سەرتاپای مەملیکەتەکە کرا، ئەم سیستەمە بووە جێی رەزامەندی چینی جەماوەر، بەو هیوایەی لە رێگەی ئەم ئەنجومەنەوە نان پەیدا بکەن. هەروەها بۆرجوازەکانیش بەم پێشنیار و سیستەمە رازی بوون، ئەوانیش بەو هیوایە لە رێگەی ئەم ئەنجومەنەوە بەشێکی تری ئازادییەکان وەدەست بێنن لە ئاکامدا بتوانن ئەو پۆستانە بگرنە دەست، کە لە رێگەیەوە بەشداریەکی کاریگەرتر لە دەسەڵات و حکومڕان بکەن.

بەم شێوەیە هەموو چین و توێژەکان هەریەکە بۆ مەرامی تایبەتیی خۆی بەم بڕیارانە رازی بوون، کە هەنگاوی یەکەمی رێگەی شۆڕش بوون.

ئەنجومەنەکە لە ۱۲۰۰ ئەندام پێک هات، نیوەیان لە چینی گشتگیر و نیوەکەی تر لە چینی شکۆدار و ئەکلیرۆسەکان بە یەکسانی پێکهاتبوون. نەریتەکە وابوو هەر چینەی بە جیا کۆبوونەوەی خۆی بکات و دەنگ لەسەر بڕیارەکان بدات، ئەوسا لەسەر ئاستی چین دەنگ بە پرۆژەکان بدەن. دەنگدەران لە سەرتاسەری فرەنسا سکاڵایان بەرز کردەوە (ئەمە نەریت و رێنماییەکی دەستووری کۆنی فەرەنسا بوو) داخوازی وداواکاریەکانیان بەم خاڵانە دیار کردبوون:

١- پاراستنی ئازادییە گشتییەکان: رێ لە دەستدرێژی بگیرێ و تەنیا بە پێی یاسا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

٢- ئیمتیازاتە کۆنەکان هەڵبوەشێنرێنەوە و هەموولایەک بەرانبەر بە یاسا یەکسان بن.

٣- هیچ باجێک بەبێ رەزامەندی گەل نەسەپێندرێت، کە نوێنەریان ئەنجومەنی چینەکانە.

٤- ئەرکی باجدان بۆ هەموو کەسێک وەکو یەک بێت بەبێ گوێدانە جیاوازیی چینایەتیان.

ئەوەی لەم داواکاریانە بەدی دەکرا هیچ داخوازیەکی دژ بە رژێمی پادشایەتی یان هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری ریشەیی لە سیستەمی سیاسیی وئابووریی لە فەرەنسا لە خۆ نەگرتبوو، دیارترینی ئەو داواکاریانە دووپاتکردنەوەی دڵسۆزی هاوولاتیان بوو بۆ پادشایەتی و خۆشەویستیان بۆ پادشا، کە هاندەر بێت بۆ گۆڕینی فەرەنسا بۆ سیستەمی پادشایەتیی پەرلەمانیی دەستووریی.

لە یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی چینەکان، کە لە 5ی ئایاردا بەسترا، وەزیری دارایی (نیکەر) تیایدا گوتارێکی خوێندەوە و کورتەیەکی را و پێشنیارەکانی بۆ چاکسازی کاروباری گەنجینە خستە ڕوو، دوور و نزیک ئاماژەی بە هەڵوێستەکانی حکومەت سەبارەت بە داخوازیەکانی هاوولاتیانی نەدابوو.

هەر لە سەرەتاوە ڕوون و دیار بوو، کە حکومەت هیچ بەرنامەیەکی بۆ چاکسازی لە بەردەستدا نییە و هیچ وەلامێکیشی بۆ داخوازییەکان پێ نییە، کە لە ڕێگەی نوێنەرانی گەلی فەرەنسا وە پێی گەیشت بوون، دیسان حکومەت بۆ هەندێک مەسەلەی پەیوەست بە پەیڕەوی ناوخۆی ئەنجومەن هەڵوێستی ئاشکراش نەبوو.

لە هەمان دانیشتندا نوێنەرانی چینی سێیەم پێیان لەسەر ئەو داخوازیە داگرت، کە دەبێت دەنگدان لەسەر بنەمای تاکەکەس بێت نەک بنەمای چینایەتی، مەبەستیان وەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان بوو لە ئەنجومەن لە کاتی دەنگدان لەسەر یاساکان، بەمەش جڵەوی ڕێچوونەکە دەکەوێتە دەست خۆیان.

لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەندامانی چینی سێیەم یەکسان بوون لەگەڵ ژمارەی ئەندامانی چینی شکۆدار و ئەکلیروسەکان، چونکە ژمارەیەک لە ئەندامانی ئەکلیرۆس و شکۆدارەکان مەیلی چینی سێیەمیان هەبوو، هەر دەنگدانێک بە ناو زۆرینە لە بەرژەوەندیی چینی سێیەمدا دەبێ.

بەلام حکومەت بۆ ئەم پێشنیارەیان هیچ وەلامێکی نەبوو و بەڵکو هیچ ئەلتەرناتیڤیشی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ پادشا ئەم پێشنیارەی رەت کردەوە، بە پاساوی ئەوەی دەستکاری سیستەمی دەنگدان ناکرێ و کار بە یاسا کۆنەکان دەکرێن، کە دوو سەدەیە کاری پێوە دەکەن. بەم هەڵوێستەی پادشا کارێکی گەوجانەی کرد، نوێنەرانی

چینی سێیەمی لە تەختی پادشا (عەرش) دوورخستەوە، هەرچەندە خۆیان ئارەزوی ئەمەیان نەدەکرد، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی شێوازێکی سەربەخۆ بگرنە بەر.

## ئەنجومەنی نیشتمانیی

گفتوگۆی ئەم بابەتە زۆری کێشا، پادشا و نوێنەرانی شکۆدار و جوامێرەکان سووربوون لەسەر شێوازی دەنگدانی نەریتی، ئەمە وای لە چینی سێیەم کرد بەدوای شێوازێکدا بگەڕێن جڵەوی کارەکان لە دەست حکومەت دەربێنێ بۆ ئەنجامدانی چاکسازیەکی سەرتاسەریی لە دەستوور، بە قبوولکردنی پێشنیارەکانی سییاس، کە قەشەیەکی رووناکبیرو لەلایەنگرانی بڕواکانی ئازاد بوو، لەلایەن چینی سێیەم و ئەکلیرۆسەوە ئەوانەی پشتگیری چینی سێیەمیان دەکرد گۆڕانی بنەرەتی ڕوویدا. سییاس لە ١٧ی حوزەیرانی ١٧٨٩ داوای دانیشتنێکی ئەمانی لە ئەنجومەنی یاسادانان کرد، تا بەناوی ئەنجومەنی نیشتمانی نوێنەرایەتی هەموو گەلی فەرەنسا بکات.



سییاس

لە کۆبوونەوەی دووەمیش، کە لە ٢٠ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا لە یاریگەی تێنس لە نزیک کۆشکی ڤێرسای بەسترا، ئەمان سوێندیان بۆ یەکتر خوارد، کە کۆبوونەوەکانیان بەردەوام بن تا دەستوورێکی نوێ بۆ فەرەنسا دادەنێن و تیایدا ماف و ئازادیی هەموو کەسێکی فەرەنسی پارێزراو بێ. بەم پێوەرە ئامانجی دانیشتنەکانی ئەنجومەنی چینەکان

لە سەپاندنی باجەوە گۆڕا بۆ دانانی دەستوورێکی نوێ و ئەنجومەنەکەش بوو بە ئەنجومەنی یاسادانان، کە داخوازیی هاوولاتیان جێبەجێ بکات.

چونکە پادشا لەم هەنگاوەیان رازی نەبوو، بۆیە لە ٢٣ی هەمان مانگ داوای کۆبوونەوەیەکی لێ کردن، مەبەستی پادشا راگەیاندنی راکانی بوو، کە بریتی بوون لە:

١- مانەوەی جیاوازییەکانی نێوان چینەکان.

٢- بڕیاری دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانیی رەت کردەوە، کە لە شوێنی ئەنجومەنی چینەکان دامەزرابوو.

دانیشتنەکان بەم دوو بڕیارە کۆتاییان پێهات بەو مەبەستەی رۆژی دواتر هەر چینەی بەجیا دانیشتنەکانی خۆیان ئەنجام بدەن بۆ تاوتوێکردنی چۆنیەتی چاکسازیکردنی دۆخی دارایی ولات، دواتر پادشا لە هۆڵەکە دەرکەوت، لەدوای ئەویش ئەکلیرۆس و شکۆدارەکان چوونە دەرەوە، چینی سێیەم و ئەوانەی لە چینی ئەکلیرۆس مەیلی چینی سێیەمیان هەبوو لەناو هۆڵەکە مانەوە، تا فەرمانبەرێک لە کۆشکی پادشا داوای لێ کردن کە هۆڵەکە جێبهێڵن.

لەم کاتە کڵپەی بزاوی شۆڕش سەری هەڵدا، یەکێک لە سەرکردە هەرە دیارەکانی (میرابو) بوو، کە بە وتە بەناوبانگەکەیەوە ناسرابوو کە دەیوت: (ئێمە بە ئیرادەی گەل لێرەین لەسەر نوکی شمشێر نەبێ ناچینە دەرەوە)



میرابو

میرابو لە سەردەمی یەکەم نوێنەرایەتیی ناسنامەی شۆڕشی دەکرد، ئەو دەیویست بە مانەوەی پادشا چاکسازی ئەنجام بدا، مەبەستی بوو جۆرێک لە بەشداری و هەماهەنگی لە نێوان گەل و پادشا لە دەسەڵات و پاراستنی سەروەرییەکانی تەختی پادشایەتی هەبێت لەگەڵ زاڵبوون بەسەر زۆرداری تاکەکەسیدا، بێگومان میرابۆ کەسێکی پادشاخوازی دەستووری بوو،هەربەم شێوەیەش مایەوە تا دوا ساتەکانی ژیانی. یەکەم سەرکەوتنی گەل ئەوە بوو کاتێک پادشا فەرمانی بە ئەندامانی ئەکلیرۆس وشکۆدارەکان دا بچنە ناو ئەنجومەنی نیشتمانی، بەڵام ئەمە هەڵچوونی نارەزاییەکانی رانەگرت، کاتێک جموجۆڵ کەوتە شارەکان، پادشا درکی بە مەترسییەکان کرد، لە پاریسەوە بە هەموو لایەکەوە جووڵە پەرەی سەند، ئیتر پادشا ناچار بوو داوای کۆکردنەوەی هێز بکات. لە ١٢ی تەممووز هەر بۆ دڵنیابوون هێزی بردە کۆشکی ڤێرسای و (نیکەر)ی وەزیری لەسەر کار لادا و یەکێکی نزیک بنەماڵەی پادشایەتی لە شوێن دانا، دەبێت ئەم لادانەی لە بەر هۆکاری هزرە چاکسازییەکانی بێ.

## رووخانی باستیل

ئەم ئامادەباشی و لادانی وەزیر و دانانی یەکێکی نزیک لە بنەماڵەی لە شوێن ئەو و بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندەی ئەوەی گوایە پادشا بەنیازە ئەنجومەنی نیشتمانیی هەڵوەشێنێتەوە، ئەمانە هەمووی دڵەڕاوکێیان خستە ناو گەلی فەرەنسا و مقۆمقۆ دەستی پێ کرد.

ئەوەندەی نەبرد خۆنیشاندان پایتەختی فەرەنسای گرتەوە، لەم ڕووەوە گوتارخوێنە رادیکاڵەکان ڕۆڵی سەرەکیان دەبینی وەکو (ماراوود یمولین)، دواتر خۆپیشاندەران دەستیان بەسەر تەلاری شارەوانی (کومۆن) لە پاریس داگرت و کردیانە سەنتەری بەرگریی دەسەڵات. هەر لەوێش سەرپەرشتیکردنی پاسەوانیان بە مرکیز دی لافیتی پاڵەوانی شەڕەکانی رزگاریی ئەمەریکا سپارد، دیارە مەبەستیش لەم رێکخستنەی بەرگری تەنیا خۆپاراستن بوو لەو سوپایەی، کە پادشا لە ڤێرسای کۆی کردبوەوە.

بۆ وەدەستهێنانی چەک و تفاق خۆپیشاندەران هێرشیان بردە سەر کۆگاکانی ئەنفالید و هەرچی چەک و تفاق هەیە تالآنیان کرد وهێرشیان بردە سەر بەندیخانەی باستیل، کە بە دیدی فەرەنسییەکان بە سونبولی ستەم و زۆرداری دە ناسرا. هەر لەم هەڵمەتە بەندیخانەکەیان شکاند وهەرچی زیندانیی تیابوو ئازادیان کردن، بە هۆی ئەوەی دەوڵەت ماوەیەک بوو ئەم شوێنەی وەکو بەندیخانە بەکار نەدەهێنا، بۆیە ژمارەی ئازادکراوەکان زۆر نەبوون.

لە ١٤ی تەمووز کە زیندانەکەیان شکاند، ئەو رۆژە بە رۆژی ئازادی ناسرا، هەموو ساڵێك لەو رۆژەدا یادی دەکەنەوە. ئەوەی لەم رۆژە رەنگی دایەوە بڵاوبوونەوەی توندوتیژی و زۆرداری بوو، کە ئەمە مەبەست و ئامانجی شۆڕشەکە نەبوو، ئەوەی سوودی لەم پشێوی و توندوتیژییە وەرگرت چینی بۆرجوازی بوو، ئەوان لە ئەنجومەنی نیشتمانیی زۆرینەی رەها بوون. ترس و دڵەڕاوکێ لەناو جەماوەری فەرەنسی بڵاو بوەوە، دیارە ئەمەش باجی شۆڕشە، کە خەڵک حەزی لێ نەدەکرد.

رووخانی باستیل لە زۆر ڕووەوە رەنگی دایەوە، یەکێک لەم رەنگدانەوانە پاریس کەوتە ژێر دەسەڵاتی شۆڕشگرەکان و دەسەڵاتی شارەوانیش کەوتە دەست ئەندامە رەسەنەکانی ئەم شارە، کە لە ڕێگەی پاسەوانە خۆجێیەکانەوە دەیان پاراست و بەڕێوەیان دەبرد، ئەم پاسەوانانە وەکو بناغەی سوپای شۆڕش وابوون. لە دەرەوەی پاریسیش خەڵک ئەم ڕووداوانەیان وەکو دەسپێکی قۆناغی ڕزگاری دەبینی، لە هەرێمەکان هەژارو جوتیارەکان هێرشیان بردە سەرکلێسا و کۆشک و تەلاری شکۆدارەکان و هەندێکیشیان گڕ تێبەردان. هەموو رق و کینەیان دژ ئەو کەسانە بوون، کە کاربەدەستی باج و خاوەن ئیمتیازە کۆنەکان بوون، هێرشیان بردە سەر فەرمانگەی باجەکان و هەموو کارنامە و کۆنووسەکانیان سوتاندن. هەرچی دۆکومێنتێک هەبوون، کە ڕێگەی بە پیاوە ئاینی و شکۆدارەکان دەدا ببنە خاوەن ئیمتیازات، هەموویان سوتاند و ئاگریان لە هەرچی دۆکۆمێنت هەیە بەردا. فەرمانبەرانی دەوڵەت وەکو تەماشاکەر بەدیار ئەم راپەرینە جەماوەرییە وەستابوون لە ترسی ئەوەی نەبادا ئەوەی بەسەری پاسەوانانی بەندیخانەی باسیلیان هێنا بەسەر ئەوانیش بێت، لە بەرانبەر بێدەسەڵاتی دەوڵەت خەڵک لاسایی

دانیشتووانی پاریسیان دە کردەوە لە دامەزراندنی سوپای شۆڕش و گرتنەئەستۆی بەڕێوەبردنی کاروباری شارەوانی لە ڕێگەی خەڵکی ڕەسەنی ئەو شارەوە.

بەرانبەر بەم ئالۆزییە پادشا هەستی بە مەترسی کرد و لەوە دڵنیا بوو، کە جڵەوەکە لە دەست ئەم نەماوە و کەوتۆتە دەست جەماوەر، بۆیە ناچاربوو دەستبەرداری هەندێک دەسەڵات بێ، ژمارەیەک لە وەزیرەکانی لەسەر کار لابرد، وەزارەتی دارایی بە (نیکەر) سپاردەوە، ئاڵا سێ ڕەنگییەکەی شۆڕشی قبووڵ کرد.

## بڕیارەکانی ٤ ی ئاب

ئەم هەڵوێستە میانڕەو و خۆوەدەستدانەی پادشا کافی نەبوو بۆ دامرکاندنەوەی گڕی جەماوەر، بەڵکو چاوەڕوانی زیاتریان لە پادشا دەکرد بۆ ئەوەی جوتیار و هەژارە ڕاپەڕیوەکە ئارامکاتەوە.

ئێوارەی سێشەمە ٤ی ئاب ئەنجومەنی نیشتمانیی کۆبوونەوەیەکی سازدا بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک بۆ ڕاگرتنی شەپۆلی نارەزایی جەماوەری ڕاپەڕیو. لە دەسپێکی دانیشتنەکە (فیکۆنت دی نوای) کە یەکێکە لە سەرکردەی شکۆدارەکان، پێشنیاری کرد مافی دەرەبەگایەتی جوامێرەکان پووچەڵ بکرێنەوە. لە کەشوهەوایەکی توندا ئەنجومەنی نیشتمانیی زنجیرە بڕیارێکی دەرکرد بە ئامانجی هەڵوەشاندنەوەی (ئیمتیازاتەکان) گرنگترینیان:

١- پووچەڵکردنی مافی دەرەبەگایەتیی شکۆدارەکان، بە مافە دادوەرییەکانیشەوە.
٢- پووچەڵکردنی هەموو کاری سوخرە و باجی سەپێندراو بەسەر ئاش و نانەواکان.
٣- پووچەڵکردنی هەموو ئیمتیازاتەکانی بەخشراو بە کۆمەڵە هەرێمی و کەرتییەکان.
٤- پووچەڵکردنی باجی دەیەک، کە بە کڵێساکان دەدرا.
٥- ڕاگەیاندنی یەکسانی لە نێوان هەموو هاووڵاتییەک بۆ بەدەستهێنانی کار و فەرمانبەرێتیە گشتییەکان.
٦- چاکسازی لە دامودەزگای دادوەریی، بە شێوەیەک هەموو کەس لە بەرانبەر مافەکاندا یەکسان بن.

ئەم بڕیارانە سەدایەکی باشی هەبوو و کاردانەوەیان باش بوون، بەتایبەت لەنێو توێژی جوتیار و گوندنشینەکاندا، چونکە بەم بڕیارانە هەموو جیاوازیەکانی نێوان جوتیار و دەرەبەگ وەلادەنرێن، لە بەرانبەر یاساش هەموویان یەکسان دەبن، ئەمە نیشانەیەکی نەمانی دیاردەی دەرەبەگایەتیە.

لەگەڵ ئەوەی بڕیارەکان بە دڵێکی خۆشەوە پێشوازیان لێوە کرا، بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا رەنگدانەوەی خراپیان لێ دەرکەوتن، ئەمیش بە هۆی ئەوەی نیوەی داهاتی وڵات لە وەرگرتنی باجەکانەوە بوو باجەکانیش نەمان.

هەر چەندە میرابو پێشبینی ئەمەی دەکرد و پێشتریش ئاماژەی پێ دابوو ئەمە بە پشتبەستن بە فەرمانەکانی نیکەری وەزیری دارایی بوون، داوای لە ئەنجومەنی نیشتمانیی کردبوو رێژەی ٢٥% لە داهاتی ئەو کەسانە وەربگیرێت، کە داهاتیان لە ٤٠٠ لیرە رەت دەکات. هەر چەندە ئەمە قەرەبووی ئەو زیانانە ناکاتەوە کە دەوڵەت لە ئەنجامی پووچەڵکردنەوەی ئەو هەموو بڕیارانە لێ دەکەوێت، بەهەرحاڵ ئەمە یەکەم جارە لە مێژووی فەرەنسا بڕیاری لەم چەشنە دەدرێت، کە بەر لە هەژار و جوتیارەکان دەوڵەمەندەکان زەرەرمەند دەبن، دەبێت ئەمە یەکەم بەرهەمی شۆڕش بێت ؟

## جاڕدانی مافی مرۆڤ و هاووڵاتی

لە ٢٦ ئاب ئەنجومەنی نیشتمانیی پەیمانی مافی مرۆڤی راگەیاند، کە تیایدا بەتەواوەتی ئەو مافانەیان دەستنیشان کردبوون، کە هاووڵاتی لەسەر دەوڵەتی هەیە:

١- مرۆڤ بە ئازادی لە دایک دەبێت و بە ئازادیش دەمێنێتەوە و لە مافەکاندا یەکسانن.

٢- مەبەست لە حکومەتەکان ئەوەیە، دەستەبەرکردنی مافە سروشتییەکانی مرۆڤ و پاراستنی بگرێتە ئەستۆ: ئازادی مولکداریتی، پاراستنی گیان و ماڵ، مافی نەهێشتنی ستەم و زۆرداری.

٣- کەس نە زیندانی دەکرێ و نە دەست بەسەر دەکرێ، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێت، کە یاسا دیارییان دەکات.

لەم ڕاگەیاندنە زۆر لە گیانی تەبایی و بڕواکانی (جان جاک ڕۆسۆ)ی پێوە دیارە، هەروەها ڕەنگدانەوە و کاریگەری ڕاگەیاندنی ڕزگاری ئەمەریکاشی پێوە دیار بوو، ئەمە نیشانەی ئەوەیە هەموو تاکێکی فەرەنسی تینوی ئازادیی و سەربەستییە.

ئەم ڕاگەیاندنە وەکو پێشەکییەک بۆ دەستووری ١٧٩١ بڵاو کرایەوە.

## ڕووداوەکانی ئۆکتۆبەر

بڕیارەکانی ٤ و ٢٦ی ئاب لە چاوەڕوانی ئیمزای پادشادا بوون بۆ ئەوەی بکەونە مەیدانی پراکتیکەوە، چاوەڕوانی ئەوە نەدەکرا وا بەئاسانی ئەم بڕیارانە ئیمزایان لەسەر بکرێت، چونکە بە پیادەکردن و جێبەجێکردنی بڕیارەکان دەسەڵاتێکی زۆر لە پادشا دەسێنرایەوە، دەسەڵاتەکان هەموویان دەکەوتنە دەست جەماوەر. ئەوەبوو هەروەک مەزەندە دەکرا واشی لێ هات، پادشا بڕیارەکانی ڕەت کردنەوە و ئیمزای لەسەر نەکردن، ئیتر دۆخەکان پشێویان تێکەوت و ئاڵۆزیش کەوتە پاریس.

لە هەمان کاتدا داوای تیپی فلاندرز کرا بۆ پاراستنی ڤێرسای، پڕوپاگەندە لە پاریس بڵاو بووەوە گوایە لە ڤێرسای کاتی ئاهەنگگێڕان سوکایەتی بە ئاڵای شۆڕش کراوە، نەمانی نان لە بازاڕەکان لەگەڵ ئەم ڕووداوانە بە هەڵکەوت کەوتنە یەک کات و سات، خەڵك لە پادشای خواست کە بچێتە پایتەخت.

لە ٥ی ئۆکتۆبەر خۆنیشاندانێکی مەزن ڕێکخرا، ژنەکان لە ریزی پێشەوە بوون بەرەو ڤێرسای بەڕێکەوتن، داوایان دەکرد پادشا بگەڕێتەوە پاریس، بە مەزندەی ئەوان بە گەڕانەوەی پادشا بۆ پاریس خەڵک دڵنیا دەبێت و بەناچاری گەنم و دانەوێڵەکان دەکەونە بازاڕ.

میانڕەوەکان کاردانەوەی ئەم لێشاوەیان دەزانی، بۆیە مەترسیان لێ نیشت، ئەوەبوو پاسەوانانی نیشتمانی بەدوایان کەوتن، لافاییت کە لە ڤێرسای فەرماندەی پاسەوانەکان بوو، بە ناوی شارەوانی داوای لە پادشا کرد بگەڕێتەوە پاریس.

لە ٦ی ئۆکتۆبەر پادشا خۆی و خێزانەکەی بە یاوەری پاسەوانەکانی نیشتمانی گەیشتنەوە پاریس، پادشا هێمای شۆڕشی لەسەر سنگ هەڵواسی بوو، هەر هەمان کات ئیمزاشی لەسەر بڕیارەکانی ٤ و ٢٦ی ئاب کرد.

بەم شێوەیە پادشا خۆی و خانەوادەی لە کۆشکی (تویلری) نیشتەجێ بوون بە پاراستنی پاسەوانانی نیشتمانی، دەتوانین بڵێین لەژێر دەسەڵاتی شۆڕش دابوون ئەگەر نەڵێین دیلی بەر دەستی ئەوان بوو.

بە گواستنەوەی پادشا بۆ پاریس ئەنجومەنی نیشتمانیش دەستی بە گواستنەوە بۆ پاریس کرد بۆ ئەنجام دانی ئەرک و کارەکانی، کە داڕشتنەوەی دەستوور بوو، بە هاتنی ئەنجومەنی نیشتمانیی بۆ پاریس دیارە ئەمیش دەکەوێتە ژێر دلۆڤانی شۆڕش بە تایبەت توندڕەوەکان. داڕشتنەوەی دەستوور لەم کەشوهەوایە بە کاریگەری ئەوان دادەڕێژرێتەوە، کە پڕ دەبێت لە سیمای توندوتیژیی و توندڕەویی.

## کۆچبەرەکان

لە هاوینی ۱۷۸۹ لەگەڵ سوتاندنی کۆشک و کێڵگەکانی زۆر لە شکۆدارەکان و لەگەڵ دەرکردنی یاسای پووچەڵکردنەوەی ئیمتیازاتە کۆنەکان، گەلێک لە جوامێر و ئەکلیرۆسەکان درکیان بەو مەترسیە کرد، کە ئیتر رێککەوتن لەگەڵ ئەنجومەنی نیشتمانیی مەحاڵە، داهاتووی رەشی خۆیان لە فەرەنسا بەدی دەکرد. ئەمە وایکرد یان پۆل پۆل یان بە تاک لە وڵات وەدەرکەون، هەندێکیان کۆچیان دەکرد تا بەدوای کڕینی چەکدا بگەڕێن و رادەستی بێگانەکانی کەن تا دژی شۆڕشگرەکان بەکار بهێنن، هەندێکیشیان تەنیا بۆ مەبەستی دەربازکردنی گیانی خۆیان و خانەوادەیان کۆچیان دەکرد، هەندێکی تریشیان لە نائارامی وڵات ترسیان هەبوو و وەدەردەکەوتن بەو نیازەی ماوەیەکی تر وڵات ئارام دەبێتەوە و ئەوان بگەڕێنەوە.

ڕێژەیەکی کەم هەستیان بە گرنگی ڕووداوەکان دەکرد و لەوە بێخەبەر بوون، کە رەوڕەوەی مێژوو ئیتر بۆ دواوە ناگەڕێتەوە، بە هەرحاڵ کۆچبەرەکان زۆربەیان روویان لە وڵاتی بەلژیک کرد و لێی گیرسابوونەوە. بۆ پیلانگێڕان دژی شۆڕشگێڕەکان لە سنووری فەرەنسا دوور نەدەکەوتنەوە، شاری کۆبلینزیان کردبووە بنکەی چالاکیەکانیان. ئەم ئاژاوەگێڕانە گەلێک دەردەسەریان بۆ فەرەنسا و سیستەمە نوێیەکەی دروست کردبوو، لە سەرووی هەموویانەوە کونت دارتوان براکەی پادشا ، کە ببووە مایەی سەرئێشە و

پیلانگێڕان و دەستیشی بۆ بێگانە و یارمەتیدانی تێکدەران بۆ شێواندنی دۆخەکە ئەرکی ئەم بوو.

## شۆڕش و کڵێسا

دوای ئەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە پادشا دەسەندرێنەوە، ئەنجومەنی نیشتمانیی دەبێتە تاکە دەزگای دەسەڵات بەدەست بۆ کاروباری وڵات، ئەمە دوای ئەوەی گەلی فەرەنسا بڕوا و متمانەی خۆیان بە نوێنەرەکانیان بەخشی، لەم روانگەیەوە لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی ئەنجومەن، چارەسەری قەیرانی دارایی وڵات بوو، کە هۆکاری راستەوخۆی هەڵگیرساندنی شۆڕش بوو، بەتایبەت ئەوکات خەزێنەی وڵات خاڵی بوو. دەبووایە ئەنجومەنی نیشتمانیی هەنگاوێک بنێ بۆ چارەسەری ئەم قەیرانە، ئەوەبوو ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانیی رەبەن تالیران پێشنیارێکی بە ئەنجومەن دا، تیایدا داوای دەستبەسەرداگرتنی سامانی (مومتەلەکات) کڵێسای کرد، کە بە ٢ تا ٣ ملیار لیرە مەزندە دەکرا، بێ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون راستەوخۆ ئەم پێشنیارە دژوارە لە ٢ی نۆڤەمبەری١٧٨٩ پەسند کرا. هەر زوو حکومەت دەستی بەسەر هەموو موڵکەکانی کڵێسادا گرت و دەستی بە دەرکردنی بەڵگەنامە کرد بۆ خەزینە، کە دەستبەرداری موڵکەکانی کڵێسا بن، بەو نیازەی دواتر بە زیادەوە قەرەبوویان بکاتەوە. بەڵام ئەم بەڵگەنامە موڵکیانە چارەسەری کێشەکانیان نەکرد و لای خەڵکیش نەبوونە جێی بڕوا و متمانە، بۆیە کێشەکان خەستتر بوون، بە هۆیەوە نیکەر لە ١٧٩٠ دەستی لە پۆستی وەزارەت کێشایەوە و بۆ سویسرا کۆچی کرد، کەم و کوڕیش لە خەزنەی دەوڵەت بۆ هەموو حکومەتەکانی شۆڕش وەک خۆی مایەوە.

بە هۆی ئەوەی کڵێساکان لە مومتەلەکات بێبەش بوون، لەسەر دەوڵەت بوو بودجەیەک بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری پیاوە ئاینییەکان دابین بکات، بە تایبەتی موچە و بژێویان. بەم ئەگەرەوە لە تەمووزی ١٧٩٠ ئەنجومەنی نیشتمانیی دەستوورێکی سڤیلیی بۆ ئەکلیرۆس دەرکرد، ئەم دەستوورە دەسەڵاتی بە گەل بەخشی کە ئەوان دەتوانن ئەسقوفەکان دابمەزرێنن، لە کاتێکدا پێشتر ئەمە دەسەڵاتی پادشا بوو. دواتر ئەسقوفەکان موچەیان لە خەزینەی دەوڵەت وەردەگرت، بەم شێوەیە ئەوان بوون بە فەرمانبەر لە خزمەتی گەلدا. لە

راستیشدا ئەم بڕیارە بڕیارێکی خەتەرناک بوو، چونکە لەم حاڵەتە پیاوە ئایینیەکان بوونە کرێگرتە و لە بەرانبەر کرێ و رۆژانەیان کارەکانیان ئەنجام دەدا، لە کاتێک ئەمە بە پێچەوانەی نەریتی کڵێسایە. کاتی خۆشی وەکو ئەنجامدەری پەیامێکی ئاسمانی سەیری کارەکانی پیاوە ئایینیەکان دەکرا نەک وەکو کرێگرتە، ئەستەم بوو کڵێسا ئەم بڕیارەی قەبوڵ بکات. لە بەرانبەر رەتکردنەوەی ئەم بڕیارە ئەنجومەنی نیشتمانیی داوای لە قەشەکان کرد سوێند بخۆن، دڵسۆزی گەل و پادشا و دەستووری سڤیلی نوێ و ئەکلیرۆس بن، زۆریان ئەم داوایەیان رەت کردەوە و لە فەرەنسا دوورکەوتنەوە.

ئەم هەڵوێستەی ئەنجومەن بووە هۆی رەنجاندنی پاپا و لەدەستدانی پشتگیری ئەو، ئەمە زیانێکی زۆری بە شۆڕش گەیاند، بە تایبەت کاتێک پاپا فەرمانی قبوولکردنی ئەم دەستوورە نوێیەی بە حەرام دەرکرد. لویسی شازدەهەم یەکەم کەس بوو، کە بەم بڕیارەی پاپا زۆر پەشیمان بوو، چونکە ئەم خۆی ئیمزای لەسەر کردبوو و لە ناخیشا گەلێک ئایینپەروەر بوو، هەر بۆیە بەدوای کەلێنێکدا دەگەرا لێی دەرچێ و لە بڕیارەکەی پەشیمان ببێتەوە.





لویسی شازدەهەم و شاژن: ماری ئەنتوانێت

## راکردنی پادشا

سەرەڕای ئەوەی پادشا زۆربەی بڕیارەکانی شۆڕشی ئیمزا دەکرد و قبوولّی بوو لە زۆربەی بۆنەکانیش پابەندی خۆیان بۆ داخوازیەکانیان نیشان دەدا، بەڵام پادشا و خانەوادەکەی هەردەم بە چاوێکی قینەوە سەیر دەکران، ئەوان لە پەیوەندی بەردەوامدا بوون لەگەڵ پادشاکانی ئەوروپا بۆ دۆزینەوەی رێگەچارە و بەفریا هاتنیان، لەگەڵ کۆچبەرانیش لە پەیوەندیدا بوون بۆ پیلانگێڕان دژی شۆڕشگێڕەکان، تا ئەوکاتیش بێئومێد نەبوون لەوەی جارێکی تر ببوژێنەوە و دەسەڵاتی پادشایەتیان بۆ دۆخی جاران بگەڕێتەوە و بەسەر شۆڕشگێڕەکاندا زاڵ بن.

بەڵام فشاری کۆچبەران لە لایەک و دەستگرتنی توندڕەوەکان بەسەر بڕیار و کارەکانی شۆڕش لە لایەکی تر ئارامیان لە پادشا بڕی بوو، لە دوایین جاریشدا دەستووری ئەکلیرۆس، کە پاپای لێ زویر کرد، هاتە پاڵ فشارەکان، ئەمانە هەموویان بوونە خاڵی ناکۆک لەگەڵ ناخی پادشا لە کاتێکدا ئەم پیاوێکی بڕواداری کریستی بوو.

ئەوەی راستی بێت تەنیا پادشا بەتەنیا لەم کارانە پەست و نارەحەت نەبوو، پیاوەکانی دەوروبەریشی تووشی تاروکەیی ببوون، لەوانە میرابۆ، کە پیشتر باسمان لێیەوە کرد پیاوێک بوو بڕوای بە پادشایەتی دەستووریی هەبوو بە فەراهامکردنی ئازادییە سیاسییەکانی هاوولاتیانەوە.

میرابۆ بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندڕەوان هەوڵی دا هاوکاری لەگەڵ میانڕەوان بکا بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی مەرکەزیی بەهێز، کە بتوانێت بەرپەرچی ئاژاوەگێڕان بداتەوە و لە ناویان بەرێت، بۆ ئەم مەبەستە فشاری خستبووە سەر ئەنجومەنی نیستمانیی.

بۆهەمان مەبەست داوایەکی ئاراستەی پادشا کرد، کە هاوکاریی بکات تا بتوانێت کار بکاتە سەر ئەنجومەن و سەروەری رژێمی فەرەنسا بگەڕێنرێتەوە. بەڵام بە مردنی لەناکاوی میرابۆ لە نیسانی ١٧٩١ پادشایەتی دەستووری پشتگیرییەکی بەهێزی لەدەست دا، دەکرێ بڵێین ئەگەر وانەبوایە درێژە بە داخوازییەکەی دەدرا.

## راکردنی پادشا

سەرەڕای ئەوەی پادشا زۆربەی بڕیارەکانی شۆڕشی ئیمزا دەکرد و قبووڵی بوو لە زۆربەی بۆنەکانیش پابەندی خۆیان بۆ داخوازیەکانیان نیشان دەدا، بەڵام پادشا و خانەوادەکەی هەردەم بە چاوێکی قینەوە سەیر دەکران، ئەوان لە پەیوەندی بەردەوامدا بوون لەگەڵ پادشاکانی ئەوروپا بۆ دۆزینەوەی رێگەچارە و بەفریا هاتنیان، لەگەڵ کۆچبەرانیش لە پەیوەندیدا بوون بۆ پیلانگێڕان دژی شۆڕشگێڕەکان، تا ئەوکاتیش بێئومێد نەبوون لەوەی جارێکی تر ببوژێنەوە و دەسەڵاتی پادشایەتیان بۆ دۆخی جاران بگەڕێتەوە و بەسەر شۆڕشگێڕەکاندا زاڵ بن.

بەڵام فشاری کۆچبەران لە لایەک و دەستگرتنی توندڕەوەکان بەسەر بڕیار و کارەکانی شۆڕش لە لایەکی تر ئارامیان لە پادشا بڕی بوو، لە دوایین جاریشدا دەستووری ئەکلیرۆس، کە پاپای لێ زویر کرد، هاتە پاڵ فشارەکان، ئەمانە هەموویان بوونە خاڵی ناکۆک لەگەڵ ناخی پادشا لە کاتێکدا ئەم پیاوێکی بڕواداری کریستی بوو.

ئەوەی راستی بێت تەنیا پادشا بەتەنیا لەم کارانە پەست و نارەحەت نەبوو، پیاوەکانی دەوروبەریشی تووشی تاروکەیی ببوون، لەوانە میرابۆ، کە پیشتر باسمان لێیەوە کرد پیاوێک بوو بڕوای بە پادشایەتی دەستووریی هەبوو بە فەراهامکردنی ئازادییە سیاسییەکانی هاوولاتیانەوە.

میرابۆ بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندڕەوان هەوڵی دا هاوکاری لەگەڵ میانڕەوان بکا بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی مەرکەزیی بەهێز، کە بتوانێت بەرپەرچی ئاژاوەگێڕان بداتەوە و لە ناویان بەرێت، بۆ ئەم مەبەستە فشاری خستبووە سەر ئەنجومەنی نیستمانیی.

بۆهەمان مەبەست داوایەکی ئاراستەی پادشا کرد، کە هاوکاریی بکات تا بتوانێت کار بکاتە سەر ئەنجومەن و سەروەری رژێمی فەرەنسا بگەڕێنرێتەوە. بەڵام بە مردنی لەناکاوی میرابۆ لە نیسانی ١٧٩١ پادشایەتی دەستووری پشتگیرییەکی بەهێزی لەدەست دا، دەکرێ بڵێین ئەگەر وانەبوایە درێژە بە داخوازییەکەی دەدرا.

هەرچەند کارەکان بەدوا دەکەوتن پەیوەندی لەگەڵ کۆچبەران توندتر دەبوون، بە تایبەت لەگەڵ شازادە، ئەویش لە رێگەی وەزیری سوێدی (فرسن)، کە لە پەیوەندییەکی گەرمدا بوو بۆ وەدەرنانیان لە فەرەنسا. بە دیدی ئەمان لە دەرەوی فەرەنساوە باشتر کار بۆ رزگارکردنی فەرەنسا دەکرێت، وەزیری سوێدی کاری بۆ ئەوە کرد پادشا و خانەوادەی لە فەرەنسا وەدەرنێت.

پادشا و خانەوادەی بە داشقەیەکی داخراو و بە نهێنی لە پایتەختەوە بەرەو سنووری باکووری رۆژهەڵاتی وڵات رایان کرد و لە ٢١ی حوزەیران گەیشتنە فارین، کە شارێکی بچووکە لە نزیک سنوور. بەڵام کارەکەیان لێ ئاشکرا دەبێت و بە زۆر رۆژی دواتر لەژێر پاسەوانێتیەکی توندا دەیان گەڕێننەوە پاریس.

ئەوەی راستی بێت راکردنی پادشا هەموو پەردەکانی نێوان خۆی و میانڕەوەکانی رووخاندن، کە پشتگیریان لە مانەوەی کورسی و تەلاری پادشا دەکرد بە حکومەتێکی باڵادەسەڵاتەوە لەگەڵ بەردەوامبوونی شۆڕش، جگە لەمەش کاردانەوەی راکردنی پادشا لەسەر لایەنگر و بانگخوازانی پادشایەتی دەستووری هەبوو، سەرەڕای توندڕەوە کۆمارییەکان، کە بانگەوازیان بۆ بیری ئازادی دەکرد، دەرفەتیان بۆ رەخسا فراوانتر کار لەسەر بیرۆکەکانیان بکەن. چونکە بەم ڕاکردنەی پادشا ماکی خیانەت بە خۆی و خانەوادەکەیەوە لکا، بەوەی هاوکاری کۆچبەرانی دەکرد و دەستی لەگەڵ وڵاتە بێگانەکان تێکەڵ کردبوو بۆ لەناوبردنی شۆڕشگێڕەکان. ئەوەی کارەکانی زیاتر ئاڵۆز کرد ئەو راگەیاندنەی پادشا بوو، کە بەر لە راکردنی رایگەیاند بوو دەڵێت:

(ئەو بڕیارانەی لە دانیشتنی ٢٣ی حوزەیران داوەمە پووچەڵیان دەکەمەوە، چونکە لەژێر فشاردا ئیمزام کردوون) ئەمە بە راشکاوانە ئەوە دەگەیەنێ، کە پادشا هەموو دەستکەوتەکانی شۆڕش رەت دەکاتەوە.

هەر لەوکاتەی پادشا گەڕایەوە پاریس چارەنووسی پادشا و خانەوادە و کورسیەکەی جێی مشتومڕ بوو بەتایبەت لە نێوەندی توندڕەو و خاوەن دەنگەکاندا، بە ئاشکرا بانگەشەی رژێمی کۆمارییان دەکرد. بەڵام کەسە میانڕەوەکان لە لادانی پادشا دەترسان لەوەی لە ئەنجامی نەمانی دەسەڵاتی پادشا ئاژاوە و پشێوی لە وڵات بڵاو بێتەوە، بۆیە پشتگیریان لە کاراکردنی ئەنجومەنی نیشتمانیی کرد تا کار بۆ ئەوە بکەن پادشا

بگەڕێننەوە سەر تەختی پادشایەتی و دەسەڵاتەکانی سنووردار بکەن. ئەوەبوو ئەنجومەنی نیشتمانیی بڕیارێکی لەم شێوە دەرکرد، کە بە ناوەڕۆک و سیما کۆماری بوو، بۆ گەلی فەرەنساشی ئاشکرا کرد، کە پادشا بە زۆر لە کۆشک وەدەرنراوە و رووەو سنوور دوورخراوەتەوە، بۆیە پادشا لەم راکردنەی بەرپرسیار نییە.

بەڵام کۆماریخواز و توندڕەوەکان ئەم بڕیارەی ئەنجومەنیان رەت کردەوە و لە ١٧ی تەمووز خۆنیشاندانێکی مەزنیان رێکخست، مەبەستیان تۆقاندنی ئەنجومەنی نیشتمانیی بوو، بەمەش جڵەویان لە دەست میانڕەوان دەرکرد، پاسەوانی نیشتمانی خۆیان تێهەڵقورتاند، بەرگریان لە مانەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی و بەردەوامی شەرعیەتی دەسەڵاتی وڵات کرد. بۆ ئەم مەسەلەیەش ئەنجومەن چەند هەنگاوێکی خۆپاراستنی نا، بۆ رازیکردنی جەماوەری تووڕەش بڕیارێکی دەرکرد، کە دەسەڵاتەکانی پادشا بوەستێنرێت تا ئەوکاتەی دەستوورێکی نوێ بۆ وڵات دادەنرێت بە هێشتنەوەی مافی پادشایەتی.

## راگەیاندنی بلنیتز

تا هاوینی ١٧٩١هەموو هەوڵەکانی کۆچبەران بۆ راکێشانی وڵاتە ئەوروپییەکان بۆ ناو شەڕ دژی فەرەنسا لە پێناو رزگارکردنی رژێمی پادشایەتی هەرەسیان هێنا، هەروەها هەوڵەکانی پادشا لەلایەن ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و گفتەکانی، کە بە ئینگلیزی دابوون بە پێدانی هەندێک لە موستەعمەرەکانی، هیچیان سەرنەکەوتن. نەمسا و ئیمپڕاتۆریەکەی بە کێشە ناوخۆییەکانیانەوە گیریان خواردبوو و ئینگلیزیش خەریکی مشووری بازرگانیەکانی دەرەوەیان بوون و کاتی ئەوەیان نەبوو خۆیان خەریکی کێشەکانی فەرەنسا بکەن.

بەڵام بڕیارەکەی ئەنجومەنی نیشتمانی، کە بە هۆی راکردنیەوە پادشایان لە دەسەڵات دوور خستبۆوە، سەرنجی پادشاکانی ئەوروپایان بۆ خۆ راکێشا و پێی نارەحەت بوون. ئەوەبوو لە ٢١ ئابی ١٧٩١ لە پلینتز کۆبوونەوەیەک بۆ دووان و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو گۆڕانانەی لە فەرەنسا رویانداوە لە نێوان ئیمپڕاتۆری نەمسا و پادشای بروسیا رێک خرا، لەم کۆبوونەوەیە راگەیاندنێکی هاوبەش راگەیەندرا و تیایدا هاتبوو:

پشتگیریکردن لە پاراستنی سەلامەتی و مانەوەی تەختی پادشای فەرەنسا ئەرکی هەموو پادشاکانی ئەوروپایە، ئامادەیی خۆشیان خستەڕوو ئەگەر پادشاکانی ئەوروپا بەپیر بانگەوازەکەیانەوە بێن، ئەوا ئامادەن یارمەتی پادشای فەرەنسا بدەن. ئەمە وای لێ بەدی دەکرێ، کە ئەوان ئامادەن هاوکاری پادشای فەرەنسا بکەن ئەگەر هەموو پادشاکانی ئەوروپا رازی بن، ئەمەش مەحاڵە بکرێت! راگەیاندنەکە بە زمانێکی دیبلۆماسی و زیرەکانە داڕێژرابوو، نەک وەکو دارشتنی شۆڕشگێڕەکان و جەماوەری فەرەنسی، لەگەڵ ئەوەش بەیاننامەکە بە هەڵە لێکدرایەوە، لێکدانەوەکە دەڵێ "نەمسا و بروسیا لەوپەڕی ئامادەباشی دان بۆ دەستتێوەردانی کاروباری فەرەنسا" لە ڕووێک لاوازی پادشای فەرەنسای دەگەیاند، لە رووێکیشەوە شۆڕشگێڕەکان وا لێی تێگەیشتن، کە پادشا دەستی لەگەڵ بێگانەکان تێکەڵ کردووە، ئەمەش هەڵوێستی پادشا لاواز دەکات و وورەی جەماوەر و شۆڕشگێڕەکانیش بەرزدەکاتەوە.

## یانەکان

سەردەمی ئەنجومەنی نیشتمانیی چەند یانەیەکی سیاسیی بەخۆوە بینی، کە سیاسەتمەدار و بیرمەندەکان و سەرکردە شۆڕشگێڕەکان هاموشۆیان دەکردن و مشتومڕی سیاسی و ئاڵوگۆڕی را و بۆچوونەکانیان لێ ئەنجام دەدا. ئەم یانانە رۆڵێکی پڕبایەخ و گرنگیان دەگێڕا، هەموو ئەوانەی لە سەردەمی شۆڕش دەهاتنە سەر حوکم لە ناودارانی ئەم یانانە بوون. دواتر بە پەرەسەندن و گەشەکردنیان ئەم یانانە بوونە نیمچە حزب، لە وڵات زۆربەی گۆڕانەکان لەژێر کاریگەری ئەم یانانە روویان دا، لە مێژووی فەرەنسای نوێ بەناوبانگ ترین یانەکان سێ یانە بوون:

١- **یانەی کۆردلییر:** بارەگاکەی لە کۆنە دێرێکی باوکە فەرەنسیسکانەکاندا بوو، پێشەنگانی ئەم یانەیە نوێنەرانی چینی کرێکار و هەژاران بوون. بە ڕوونتر بڵێین پێشەنگانی ئەم یانە بەدوای چارەسەریەکی ریشەیی بۆ فەرەنسا دەگەڕان، ئەوان سیستەمێکی دیموکراتیان مەبەست بوو. هەندێک جار لە رووی کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەوە سیمای توندڕەویی لە سەرکردەکان بەدی دەکرا، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیان بە

خاوەندارێتی و رۆژانە و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیەوە هەبوو. (مارا) لە سەرکردە هەرە ناسراوەکانیان بوو، (مارا) پزیشک بوو دواتر بوو بە رۆژنامە نووس، رۆژنامەی (لامی دو پاولە)ی دەردەکرد بە هۆی بوێریی و نەترسی سەرنووسەرەکەیەوە لە رۆژنامە هەرە بەربڵاوەکان بوو. ئەم پیاوە هەردەم لەسەر دۆزی هەژار و نەدارانی دەنووسی، ئەم کاری بۆ پەیداکردنی نان بۆ هەژاران دەکرد و بۆ ئەو رۆژەی سامانی دەوڵەمەندان بەسەر هەژاراندا دابەش بکرێت کاری دەکرد.

دیمۆلین یەکێکی تر بوو لە سەرکردەکانی ئەم یانەیە، ئەمیش رۆژنامە نوس بوو بە بیرە توندڕەوەکانیەوە ناسرابوو، لەناو شۆڕشگێڕەکان یەکەم کەس بوو بانگەشەی بۆ کۆماری دەکرد، دانترۆن و روبسبیر بەردەوام سەردانیان دەکرد.

**٢- یانەی یاقوبییەکان:** لە راستیدا ئەم یانەیە لە هەندێک ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی ئەوانەی بەردەوام سەردانی کڵێسای یاقوبیان دەکردن، کە لە تەنیشت ئەنجومەنەوە بوو، پێک هاتبوو. بەم هۆیەوە ئەم ناوەی لە خۆ گرت، دەنا ناوە ڕەسەنەکەیان (کۆمەڵەی دۆستانی دەستوور) بوو. ئامانجی ئەم کۆمەڵەیەش چەسپاندنی دەستکەوتەکانی شۆڕش بوو، وە پشتگیریکردن لە رژێمی پادشایەتیی دەستووریی. لەم روانگەیەوە سیمای میانڕەویی پێوە دیار بوو، سەرچاوە و پاشخانی ئەو یانانە بوون، کە لە سەرتاسەری وڵات بڵاو ببوونەوە، بە هەوڵ و تەقەڵای رۆژنامە بەربڵاوەکەیان بوو، کە لە داهاتوو بوو بە دیارترین سەنتەری سەرکردایەتیی فەرەنسا لە سەردەمی شۆڕش.

لە دیارترین سەرکردەکانیشی (مارکیز دیلافییت) بوو، ئەوەی سەرپەرشتی لە دامەزراندنی پاسەوانانی سڤیلی کرد، هەروەها میرابۆی گوتارخوێنیش هامشۆی دەکرد و رۆڵی سەرکردایەتیی تیا گێڕا وێڕای هەریەک لە دانتۆن و رۆبسپێر.

سەرەڕای ئەوەی ئەم یانەیە نوێنەرایەتی باڵی میانڕەویی دەکرد، بەڵام بە هۆی تێکەوتنی کەسانی توندڕەو و ڕووداوەکانی فەرەنساوە بەرەو توندڕەوی هەنگاوی دەنا، لەگەڵ ئەوەش سەرکردەکانی لە پیاوە بۆرجوازەکان بوون، بەڵام دواتر ئەم یانەیە بوو بە بەرگریکاری مافی نەداران و چینی هەژاران، چونکە کەوتبوونە ژێر کاریگەری توندڕەوان.

**٣- یانەی جیرۆندییەکان:** لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە ئەم یانەیە نوێنەرایەتی باڵی راستی شۆڕشی دەکرد، لە رووی سیاسییشەوە لە سەرەتای شۆڕشەوە پێشرەوەکانی نوێنەرایەتی توندڕەوانیان دەکرد و مەیلی کۆماریخوازیان هەبوو، ئامانجەکانیشیان بەگەڕخستنەوەی پیشەسازی و بازرگانی و ئازادیی ئابووریی و پاراستنی خاوەندارێتی موڵکداران بوو. لەگەڵ هەنگاونانی شۆڕش بەرەو توندڕەوی ئەمان پەیتا پەیتا لێی دوور کەوتنەوە تا بەر لە لەسێدارەدانی پادشا بەرگرییان لێی دەکرد، دواتر لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، کە کەوتبوونە مەترسییەوە، مەبەستیان سازش بوو لەگەڵ ئۆروستوکراتەکان، لە سەرکردە دیارەکانی ئەم یانەیە: خاتوو رۆلان و بریسۆ.

بە هەر حاڵ ئەم یانانە بوون بە بنکەیەک بۆ بەیەکگەیشتنی کەسانی خاوەن بەرژەوەندیی هاوبەش و بیروبۆچوونی لە یەک نزیک، ئەوە نەبوون کە ببنە پارتی رێکخراو وەک ئەوانەی ئەمڕۆ دەیان بینین، زۆر لە سەرکردەکانی شۆڕش هامشۆی زۆربەی یانەکانیان دەکرد بێ جیاوازی لەم یانەوە بۆ یانەیەکی تر بێ مەرج و سانسۆر دەچوون، لەوانە روبسپیر ودانتۆن، کە هامشۆی زیاتر لە یەک یانەیان دەکرد.

## دەستووری ساڵی ١٧٩١

لە کۆتاییەکانی هاوینی ١٧٩١ ئەنجومەنی نیشتمانیی کۆتایی بەو کارانەی خۆی هێنابوو، کە لە ساڵەکانی یەکەمی شۆڕش بەسەر خۆیدا سەپاندبوو، بریتی بوون لە بڕیاردانی دەستوورێکی دیموکراتی بۆ گەلی فەرەنسا، تیایدا ئازادییە گشتییەکان و دابەشکردنێکی دادپەروەرانەی تیا ئاماژە پێ کردبێت. هەر واش بوو لە ٣ی ئەیلولی ١٧٩١ ئەم دەستوورە کەوتە مەیدانی جێبەجێکردن دوای ئەوەی لویسی شازدەهەم ئیمزای لەسەر کرد و سوێندی لەسەر خوارد، کە پابەند و دڵسۆزی بێ.

تا رادەیەک ئەم دەستوورە وەکو هیوا و ئاواتەکانی گەلی فەرەنسا لە دایک بوو، کە ساڵانێک بوو بە ئاواتیەوە بوون بۆ بەدیهێنانی ئازادی و دیموکراسی و یەکسانی. ئەمە و زۆر لە بیرۆکانی نووسەرە پێشکەتووخوازەکان، نموونەی رۆسۆ و مۆنتسکیۆ و ڤۆلتێر لە بڕگەکانی ئەم دەستوورە بوون. بەڵام بە هەوڵی بەرهەڵستیی نوێنەرانی میانڕەو لە

سەرکردەکانی ئەنجومەنی نیشتمانییدا توانرا بە رووی رەوتی توندڕەواندا بوەستن، تا دەست بە سیستەمی پادشایەتیەوە بگرن بە هێشتنەوەی دەستوورێکی دیموکراسیی تیایدا دەسەڵاتەکانی پادشا سنووردار کرابن، وێڕای پاراستنی ئازادییە گشتییەکان و مافی خاوەندارێتیی کەسێتی بەوپەڕی فراوانییەوە. لێرەشدا هەوڵ دەدەین هەندێک لە بڕگە کانی دەستوور بخەینە روو:

١- چاوگی سەروەری وڵات گەلە، کە لە رێگای دەزگا و ئۆرگانە هەڵبژێردراوەکان و پادشاوە کارەکانیان ئەنجام دەدەن.

بەم پێوەرە دەستبەرداری شێوازە کۆنەکە بوون کە دەیگوت: پادشا بەتەنیا چاوگی سەروەریی دەوڵەتە و هەر خۆشی لە جێبەجێکردنەکان بەرپرسە، گەلیش بۆی نییە لیپرسینەوە لەگەڵ پادشا بکات، چونکە ئەم بڕیارەکانی خودا جێبەجێ دەکات، لە سەردەمی کۆنەوە کار بەم دەقەی سەرەوە دەکرا.

لە دەستووری نوێدا دەسەڵاتەکانی پادشا سنووردار بوون، وەزیرەکان لە جێبەجێکردنی یاسادا بە هاوشان لەگەڵ پادشا مافیان هەبوو، لە بەردەمی ئەنجومەن نوێنەرایەتی ناکەن و لە دیباجەکانیش بەشدار نابن، دەسەڵاتی فەرماندارێتی سوپای دەریا و ئاسمان و زەمین و بەڕێوەبردن و کاروباری دەرەوەیان پێ سپێردرا، لەگەڵ مافی ڤیتۆ لەسەر ئەو یاسا و بڕیارانەی ئەنجومەنی نیشتمانیی دەریان دەکات، لەمەودوا پادشا لەسەر تەختی پادشایەتی لە فەرەنسا بۆ خزمەتی فەرەنسا و گەلەکەی دەبێت، نەک وەکو پێشتر بۆ سەروەریان بێت. لە هەندێک بڕگەدا ئەوەش کرایە دەسەڵاتی گەل، کە بۆی هەیە لە هەندێک حاڵەتدا پادشا دووربخرێتەوە یان دەسەڵاتەکانی لێ بسەندرێنەوە.

## دەسەڵاتی یاسادانان

ئەم دەسەڵاتە بە ئەنجومەنی یاسادانان درا، کە هەر دوو ساڵ جارێک لەلایەن گەلەوە هەڵدە بژێردرێت، بە مەرجێك ئەندامی ئەنجومەن بۆی نەبێت جاری دووەم بۆ ئەنجومەن خۆی بپاڵێوێ تا سەدەیەکی بەسەر تێپەڕ نەبێت. بە هۆی ئەوەی ئەنجومەن

نوێنەری گەلە و ئەم چاوگی سەروەریی و دەسەڵاتە، تەنیا ئەم بۆی هەیە کاتی نوێکردنەوەی کابینەکان دیاری بکات، لە دەسەڵاتی پادشادا نییە ئەنجومەن هەڵوەشێنێتەوە.

لە دەستووری نوێدا دیاری کرا، کە ئەندام بە دوو پلە دیاری دەکرێت، چەند مەرجێکیش بۆ ئەندامان دیاری کران، کە دەبێت دەنگدەر رۆژانەی سێ رۆژ بە خەزینەی دەوڵەت بدات، بە پێی ئەم بنەمایە لە کۆی ٢٤ ملیۆن کەس تەنیا ٤٣٠٠٠٠٠ (چوار ملیۆن و سێسەد هەزار) کەس بۆیان هەیە دەنگ بدەن. لەگەڵ ئەوەی ئەم شێوازە هەڵبژاردنە یەکسانیی بۆ گەلی فەرەنسی دەستەبەر ناکات و زۆر کەس لێی بێبەش دەبن تەنیا لەبەر ئەوەی هەژارن، کەچی شۆڕش بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە ئەم هەڵبژاردنانە گشتیین و بۆ هەموو کەسێکە، بەڵام هەرچۆنێک بێت هەنگاوێکی مەزن بوو بەرەو دیموکراسییەت.

دەسەڵاتی فراوان بە ئەنجومەنی یاسادانان درا، بەتایبەت لە مەیدانی دانانی یاسادا دیسان مافی دیاریکردن و بوردنی باج خرایە ژێر دەسەڵاتی ئەم ئەنجومەنە.

- بڕوابوون بە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە دەستووری نوێ بە تەواوەتی بڕیاری لەسەر درابوو، ئەرکەکانی فەرمانڕەوایی بە دەزگای سەربەخۆ سپاردران، تا هەر یەکە بە جیا کارەکان ئەنجام بدا، کاری یاسادانان، جێبەجێ کردن و دادوەری لە یەک جیاکرانەوە.

هەموو ئەو بڕگانەی لە پەیماننامەی مافی مرۆڤ، کە لە ئەنجومەنی نیشتمانیی دەرکرابوون، دەستوور پەسندی کرد و بۆی کرانە پێشەکی.

لە تەواوبوونی هەمواركردنی دەستووری نوێ هەرچی سەروەری و شانازی و مێرخاسی هەبوون لە دەستوورەکە بڕیاری لەسەر درا، دواتر بوونە مایەی سەریەشە بۆ فەرەنسا. ئەنجومەنی نیشتمانیی مافی خۆپاڵاوتن بۆ ئەندامێتی ئەنجومەنی یاسادانانی لە ئەندامەکانی خۆی سەندەوە، بەو مەرجەی دە ساڵ بەسەر ئەندامبوونی لە ئەنجومەنی نیشتمانیی تێپەڕکات، ئەوسا بۆی هەیە خۆی بۆ ئەنجومەنی یاسادانان بپاڵێوێت. بەم شێوەیە ئەنجومەنی یاسادانان لە کەسە خاوەن ئەزموون و زانا کۆنەکانی فەرەنسا بێبەش بوو و هەموو ئەوانەی لەم ئەنجومەنە بوون بە ئەندام کەسانی گەنج و کەمئەزموون بوون، شارەزایی کەمیان لە بەڕێوەبردنی وڵات هەبوو، زۆربەیان کەسانی هەرزەکار و توندڕەو بوون.

## ئەنجومەنی یاسادانان

لە سەرەتای مانگی ئۆکتۆبەری ١٧٩١ بەپێی دەسەڵاتەکانی دەستووری ١٧٩١، ئەنجومەنی یاسادانان یەکەم کۆبوونەوەی خۆی بەست. بە هۆی ئەوەی ئەنجومەنە نوێکە ئەندامانی بەتوانا و خاوەن ئەزمونیان تێدا هەڵنەکەوتبوو، چەند گەنجێک لە بۆرجوازەکانی ناوچەی جیرۆندی باشووری رۆژئاوای فەرەنسا دەستیان بەسەر ئەنجومەنەکەدا گرتبوو، ئەم کۆمەڵە گەنجە خوێنگەرم بوون بانگەشەی کۆمارییان دەکرد و لە هەوڵی هەناردنی رێبازی شۆڕشەکەیان بوون بۆ دەرەوەی وڵات، بۆ ئەوەی ببێتە دیاری و سەرکەوتن بۆ چینی چەوساوە.

هەر لە سەرەتاوە ئەنجومەن بەرانبەر بە سێ ئەرکی گرنگ خۆی بەرپرسیار دەبینی:

١- هەموو برگەکانی دەستووری نوێ بکەوێتە بواری جێبەجێکردن و رێز لە برگەکانی بگیرێت و لە پێناو کاراکردنیشی شەونخونی بکەن، بەم شێوەیە ئەم ئەنجومەنە دەبێتە خاوەنی دەسەڵاتێکی دیار، نەک وەکو ئەنجومەنی نیشتمانیی، کە تا ئێستا خاوەنی دەستوورێک نییە دەسەڵاتەکانی دیار بن.

٢- بە پێی یاسای دەرکراو لە ئەنجومەنی نیشتمانیی کار بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی شۆڕشی فەرەنسا بکرێت.

٣- پاراستنی فەرەنسا لە مەترسییە دەرەکییەکان و چاودێریکردنی ئەو هەورە رەشەی خەریکە لەسەر ئاسمانی پەیوەندییەکانی فەرەنسا و دراوسێکانی کۆدەبێتەوە.

## هەڵوێستی ئەوروپا لە شۆڕشی فەرەنسا

لە ساڵی ١٧٩٠وە لە ئەوروپا بە تایبەتی لە نێوەندی حکومی و گەلەری و سیاسییدا دیاردەی هەستکردن بە مەترسیەکانی بڵاوبوونەوەی بڕواکانی شۆڕشی فەرەنسیی لە وڵاتە دراوسێکان پەرەی سەند، لە هەمان ساڵدا شاری ئەڤینۆنی سەر بە پاپا بۆ داخوازی مافی چارەی خۆنووسین چوونە پاڵ فەرەنسا و یاخیبوونی خۆیان راگەیاند. دواتر هەڵگرانی

ئالآی ئازادیی و مژدەدەرانی داخوازیی مافی چارەی خۆنووسین ئەوانەی لە دۆڵی راینی بەلژیک بڵاو ببوونەوە و پێشوازیان لێ کردن. ئەم کارانە ئاگادارییەک بوون بۆ ناساندنی هێزی پارێزەران بەتایبەت لە نەمسا و بروسیا، بۆ ڕەواندنەوەی گومان لەسەر بانگەشەی کۆچبەران سەبارەت بە ئاسۆی راستەقینەی شۆڕشی فەرەنسا، لە ئەنجامدا ئامۆژگاری و هەوڵەکانی کۆچبەران لە ئەورووپا زیاتر گوێیان لێ رادەگیرا.

ئەوەی راستی بێت رابردووی پەیوەندییەکانی فەرەنسا و نەمسا هەر لە رۆژەکانی سەرەتای شۆڕشەوە پڕبوون لە ناکۆکی و کێشە. جگە لەمەش شۆڕش و ڕێبازەکەی بوونە مەترسی لەسەر رژێمی پادشایەتی لە فەرەنسا و ئەورووپا بەگشتی، چونکە بانگەوازی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان لایەنێکی تری مەترسیەکانی چڕتر کردبووەوە، چونکە وڵاتی نەمسا لە کۆمەڵێك نەتەوە پێک هاتووە، پیادەکردنی ئەم ڕێبازەش چارەنووسی ئیمپڕاتۆرییەت دەخاتە مەترسییەوە. دواتر سوکایەتیەکی زۆریش بە پادشای فەرەنسا و شاژن دەکرا، کە شاژن بە ڕەچەڵەک دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی پادشاکانی نەمسا. کێشەیەکی تری میرە ئەڵمانییەکان لە ئەلزاس هەبوو، بە پێی پەیماننامەی وستگال لە ١٦٤٨ لەو ناوچەیە مافی دەرەبەگایەتیان هەبوو، دواتر بڕیارەکانی ٤ی ئاب هاتن، کە مافی خاوەندارێتیان بەبێ بەرانبەر و قەرەبوو لە میرە ئەڵمانییەکان سەندەوە. گلەیی و نارەزاییەکان ڕووبەڕووی نەمسا کرانەوە، چونکە میرەکان پەناهەندەی ئەوێ بوون، دەبوایە ئەم بەرگریان لێ بکات. دواتر کۆچبەرەکان لەسەر خاکی میرنشینی تریڤسی نەمسایی کۆبوونەوە، کە دوژمنایەتیەکی توندیان لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسا هەبوو، سەرەڕای ئەم هەموو کێشمەکێشمە ئیمپڕاتۆری نەمسا لیو بولد ترسی لە ئەنجامی شەڕکردن لەگەڵ فەرەنسا هەبوو، ئەم دەیزانی ئەم شەڕە گەلێک قورس و درێژخایەن دەبێت، بە مەبەستی دوورکەوتنەوە لەم شەڕە زۆر لەبەر خوشکەکەی خۆی[1] پاڕایەوە و داوای هاوکاریی لێ کرد تا لەم کێشەیە هاوکاریی بکات. دیسان خۆی لەبەردەم داخوازیەکانی کۆچبەران راگرت، ئەوان داوای هاوکاریان لە نەمسا دەکرد بۆ هێرشبردنە سەر فەرەنسا. ئەمەو داوای لەو پادشایانەی ئەورووپا کرد ئەوانەی ترسیان لە ڕێبازی شۆڕش و ناردنەدەرەوەی شۆڕش

---

[1] شاژنی فەرەنسا بوو.. (وەرگێر).

هەبوو تا بە هەر شێوازێک بێت رێگە لەم شالآوەی فەرەنسا بگرن، لەوانە پادشاکانی روسیا و ئیسپانیا.

بەلآم مردنی ئیمپراتۆر لیوبولد و هاتنی فەرەنسیسی کوڕەکەی بۆ سەر تەختی پادشایەتی، بە هۆی ئەوەی هەم توندڕەو وهەم بایەخی بە پرۆسەی ئاشتەوایی نێوان فەرەنسا و نەمسا نەدەدا، ئەم ئیمپراتۆرە نوێیە ولآتی بەرەو شەڕ برد لەگەڵ فەرەنسا.

لە فەرەنساش کەشوهەوای شەڕخوازی بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە پەرەسەندن دابوو، پادشاخوازەکان و شکۆدارەکان هانی ئەو کەشوهەوایەیان دەدا. بە بۆچوونی ئەوان هەڵگیرسانی جەنگ فەرەنسا بەرەو شکست دەبا، کە تەنیا بە لاوازبوونی فەرەنسا دەتوانن پادشایەتی بپارێزن و ئەوانیش لەسەر سوودمەندێتی و ئیمتیازاتەکانیان بەردەوام بن. گرووپی جیرۆندییەکانیش، کە لە ئەنجومەنی یاسادانان بالآدەست بوون، ئەوانیش بۆ شەڕ تینوو و هاوڕا بوون، چونکە بە بۆچوونی ئەوانیش سەرکەوتنیان مسۆگەرە سەر باری بێهێزی فەرەنسا و هەژاری و نەبوونیی. ئەوان رۆمانتیکی و ئەندیشەیی بیریان دەکردەوە، بیرکردنەوەیان لە واقیع دوور بوو. لەو بڕوایە دابوون ئەگەر شەڕ هەڵگیرسا خەڵکی ئەوروپا هۆکارەکانی جەنگ دەخەنە پاڵ پادشاکان، بۆ لەناوبردنی رژێمی پادشاکانیش لە شۆڕش دەئاڵێنەوە، لە ئەنجامدا بڕواکانی یەکسانی و ئازادی و دادپەروەری سەردەکەون.

یەکەم نیشانە و هەنگاوەکانی جەنگ ئەو گەفە بوو، کە فەرەنسا بە تریفی میری نەمسای دا، فەرمانیان پێی دا ئەو کۆچبەرە فەرنسیانەی سەر خاکی نەمسا وەدەرنێت و چەکەکانیشیان رادەستی فەرەنسا بکاتەوە. لێرە هەندێک لە سەرکردە وشیارەکانی شۆڕش هەستیان بە مەترسییەکانی جەنگ دەکرد، چونکە ئەوان لاوازی و بێتوانایی فەرەنسایان دەزانی، کە ئەم شەڕە لە قازانجی ئەوان دا نییە. یەکێک لەوانە رۆبسپێر بوو، بڕوای وابوو ئەگەر فەرەنسا لەم شەڕە بدۆڕێ دەسکەوتە ناشەرعییەکانی پادشا و چینی شکۆدارەکان دەگەڕێنەوە، بەلآم ژمارەی ئەم جۆرە سەرکردانە کەم بوون، نەیاندەتوانی ڕەوڕەوەی جەنگ راگرن. کاتێک فرەنسیس ئیمپراتۆری نەمسا ئاگاداری و پەندەکانی باوکی بە هەند وەرنەگرت، بەرەنگاریەکانی فەرەنسای قبووڵ کرد و لەگەڵ بروسیا پەیماننامەیەکیان لە ٧ی شوباتی١٧٩٢ مۆر کرد، لە نیسانی هەمان ساڵیشدا نەمسا گەفێکی بۆ فەرەنسا نارد تیایدا داوای کرد:

- مافی میرە ئەڵمانییە دەرەبەگەکانی خاکی (ئەلزاس)یان بۆ بگێڕێتەوە.
- کەرتی (ئەڤینیۆن)یش بۆ ژێر دەسەڵاتی پاپا بگێڕێتەوە.
- چیتر کار بۆ بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی شۆڕش لە ئەوروپا نەکات.

لەبەرئەوەی جیرۆندییەکان ئەوکات زۆرینەی ئەنجومەنی یاسادانان بوون، بەم مەرجانە رازی نەبوون، بە تایبەت سەرکردەی بەتوانا وەزیری دەرەوەیان جەنەراڵ دیموریێ، ئەم بە کەسێکی بەتوانا و سەرکێش ناسرا بوو.

*ئیتر لە ٢٠ی نیسانی ١٧٩٢ بڕیاری جەنگیان دژی نەمسا راگەیاند، ئەو نەمسایەی ئێستا دوژمنی سەرسەختی فەرەنسایە* و سوێندخۆری خانەوادەی پادشاکەیەتی، لە راگەیاندنەکەی فەرەنسادا هاتبوو، بە پاساوی بەرگریکردن لە ئازادی و سەروەرییەکانی فەرەنسا ئەم بڕیارەمان داوە.

## جەنگ لەگەڵ نەمسا و بڕوسیا

هەر لە سەرەتای جەنگەوە بێتوانایی سوپای پادشایەتی فەرەنسا لە بەرانبەر سوپای دوو لە بەهێزترین وڵاتانی ئەوروپا دەرکەوت، کە نەمسا و بڕوسیا بوون. ئەو سوپایەی فەرەنسا ناردبووی بۆ داگیرکردنی بەلژیک هەر زوو بە تێکشکاوی گەڕایەوە، بەمەش فەرەنسا لە سەنگەری هێرشبردنەوە کەوتە سەنگەری بەرگریکردن لە هێرشەکانی لەشکری هاوپەیمانان دژی فەرەنسا.

لە مەزنترین نیشانەکانی دۆڕاندنی فەرەنسا خەڵک لە پاریس کەوتبوونە گەڕان بەدوای ئەو لایەنەی، کە بەرپرسیارێتی جەنگی دەکەوێتە ئەستۆ و باجەکەی دەدات. دیارە کەس بە رەزامەندی خۆی ناچێتە بن باری سەرنەکەوتن و دۆڕان، بۆیە سەرنجەکان روەو پادشا دەچوون. پرسیار ئەوە بوو، "ئایا چۆن کۆشک و پادشا وا بە ئاسانی بڕیاری هەڵگیرساندنی شەڕیان لەگەڵ وڵاتێک دا، کە لە رووی رەچەڵەکەوە لە پادشاکەیەوە نزیکە و تا دوێنێش هەم دۆست و هەم هاوپەیمانی بوو؟ دیسان چۆن دەکرێ پادشایەک

(لویسی شازدەهەم)، کە ئێستا لە کۆشکی پاریسە، خوازیارە دوژمنەکانی شۆڕش سەرکەون؟ "

هەواڵی سەرنەکەوتنەکان بۆ پادشا پاساوێکی باش بوو تا وەزارەتی جیرۆندییەکان هەڵوەشێنێتەوە و لە شوێنی ئەمان حکومەتێکی یەکێتیی نیشتمانیی دابمەزرێنێ، تا لەم حکومەتە هەموو یانەکان بەشدار بن.

ئەمەو پادشا پتر لە جارێک یاخیبوونی خۆی لە دژی ئەنجومەنی نیشتمانیی ڕاگەیاند و ژێر بە ژێریش پەیوەندیی دەکرد بە سوپای نەمسا و بڕوسییەکان و ئەوانەی لەسەر سنوورەکان مەلاسیان دابوو. پیاوە میانڕەوەکان چارەنووسی پادشا و رژێمەکەیان خستە ناو باس و لێکۆڵینەوە بەتایبەت، کە جیرۆندییەکان هێشتا خەونیان بە کۆمارییەوە دەبینی.

لە ٢٠ی مانگی حوزەیرانی ١٧٩٢ بە بۆنەی ڕۆژی (سوێندخواردنی یاریگای تەنس) خۆنیشاندانێکی مەزنیان سازدا، خۆپیشاندەران گەمارۆی (کۆشکی تۆیلەری)یان دا، کە شوێنی جێنیشی پادشا بوو، پادشا بە هۆی نواندنی نەرمونیانی لە هەندێک داخوازیەکانیان توانیی بمینێتەوە، بەڵام شێوازی خۆنیشاندانەکە گۆڕدرا ئەو کاتەی لە ٢٥ی تەمووز فەرماندەی بڕوسی گەفێکی دایە خۆپیشاندەران، کە ئەگەر پادشا هیچ زیانی لێ بکەوێ ئەوا پاریسیان بەسەردا دەڕوخێنێت.

لەم سەروبەندەی ڕووداوەکان کەسێک فەرماندارێتی فەرەنسای گرتەدەست، ئەویش (دانتۆن) بوو. ئەم فەرماندەیە فەرەنسای بەرەو توندوتیژی هەڵچوون برد، هەر ئەو بوو لە ١٠ی مانگی ئاب رێبەرایەتی خۆنیشاندانەکانی گرتە ئەستۆ و ڕووەو کۆشکی پادشا هەنگاوی نا، پاسەوانە سویسریەکەی کوشت و پادشای بەدیل گرت، داواشی لێ کرد کە سیستەمی کۆماری رابگەیەنێت و کوشتارێکی زۆریشی ئەنجامدا.

ئەنجومەنی یاسادانان بە باشی زانی تەنیا دەسەڵاتەکان لە پادشا بسێندرێنەوە، بۆ چارەنووسی پادشا ئەنجومەنێکی نیشتمانیی هەڵبژێردرێت، بڕیارەکەش بدرێتە دەست ئەم. بە دەستبەسەرکردنی پادشا توندڕەوەکان لە سەروی هەموویانەوە (دانتۆن) ڕۆڵیان لە بەڕێوەبردنی کاروبارە ئیداری و کاروباری بەرگری و وڵات بینی، چەند لیژنەیەکی بەرگری بە هاوکاری شارەوانیی پاریس پێک هێنران.



دانتۆن

کاتێک هەواڵی لەدەستدانی شاری فردان گەیشتە پاریس، خەڵکەکە شڵەژا، لە ١٩ی ئاب هێزەکانی نەمسایی و بروسیا سنووری فەرەنسایان بەزاند و چەند پێگەیەکیان داگیر کرد، ئاژاوە لە پاریس پەرەی سەند، دەستەی چەکداران هێرشیان بردە سەر زیندانەکان، کە چەند پیاوی شکۆداری تیا گیرابوون. لەو کاتەی کە پادشا دەستبەسەر کرابوو خۆپیشاندەران نزیکەی ١٥٠٠ کەسێکیان لەلایەنگرانی پادشا و رژێمەکەی کوشت. دەتوانین بڵێین دانتۆن لەم کوشتارە بەرپرسیار بوو، چونکە هەرنەبێ بێدەنگیەکەی نیشانەی رەزامەندیی بوو، ئەم رەفتارەی بۆ چاوترساندن و تۆقاندنی ناحەزانی شۆڕش بوو بۆ ئەوەی لانی کەم لە هەڵبژاردنەکان ببەنەوە.

پاساوەکانی دانتۆن بۆ تۆقاندن کۆنترۆڵکردنی بارودۆخ و سەپاندنی یاسا بوو، لە کاتێکدا وڵات بەرانبەر بە بەهێزترین دوو سوپای وڵاتانی ئەورووپا دەجەنگێ. دیارە بە هۆی قەیرانە ئابوورییەکان و کەمبوونی خۆراک لە بازاڕەکان، کە کاردانەوەی خراپی بەسەر بەرێکردنی جەنگ هەبوو، بە هۆیەوە مەترسی لە دژە شۆڕش هەبوو، بۆیە ئامادەبوو بە ئاگر و ئاسن وەڵامی هەر بزاڤێک بداتەوە تەنیا بۆ ئەوەی کەس بیر لە راپەرین و بەگژداچوونەوە نەکات.

## ڤالمی

لە برگەی پێشتر وتمان لە ١٩ی ئاب هێزەکانی بروسیا و نەمسا سنووری فەرەنسایان بەزاند بوو، لە گردۆڵەکانی ڤالمی لەگەڵ (دیمۆری)ی وەزیری پێشوی حکومەتی جیرۆندییەکان بەگژ یەکدا هاتن، لە ئەنجامدا سوپای هاوپەیمانان پاشەکشەیان کرد. هۆکاری کشانەوەکە ئەوەبوو لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا روسەکان کێشەی پۆلۆنیایان نابۆوە، دیارە پۆلۆنیاش بۆ بروسیا و نەمسا بایەخی تایبەتیی هەیە بۆ ئەوەی کێشەکە روسیا بەتەنیایی دەستی تێوەرنەدات، خۆیان لە شەڕەکانی فەرەنسا کشاندەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی فەرەنسییەکان لە شەڕە بچووکەکان گرنگیان بە سەرکەوتن و بەزاندنی هێزی هێرشبەر دابوو، لەم سەرکەوتنەیان ورەی خەڵکیان پێ بەرز کردەوە، واش نیشاندرا کە توانای پاراستنی سنوورەکانیان هەیە. لە راستیشدا شەڕەکانی ڤالمی هەستی نەتەوایەتی فەرەنسای بەرز کردەوە و هەستێکی وای پێ بەخشین، کە لە بەرانبەر مەترسییە دەرەکیەکاندا یەک جەستە و یەک گیان بەرگری بکەن، دیسان رەنگدانەوەی باشی لەسەر ناوەوەی فەرەنسا هەبوو. ئەم شەڕەی ڤالمی پاڵپشتیەکی باش بوو بۆ دایتۆن، چونکە خۆنیشاندانێک بوو بە هەبوونی توانای پاراستنی باری ئارامی وڵات، کە ببێتە مایەی ئەوەی دەسەڵاتی ڕەهایان هەبێت لە دیاریکردنی چارەنووسی پادشا.

لەم کاتەدا بوو ئەنجومەنی یاسادانان هەڵوەشایەوە و لە شوێنی ئەم (کۆنگرەی نیشتمانیی) هەڵبژێردرا، کە چارەنووسی رژێمی پادشایەتیی لە ئەستۆ گرت.

## کۆنگرەی نیشتمانیی

ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانیی لەژێر رێنمایی و مەرجی تازە هاتنە هەڵبژاردن، گرنگترینیان جەختکردن لەسەر دیموکراسی بە زیادکردنی ژمارەی دەنگدەران لە رێگەی کەمکردنەوەی تەمەنی دەنگدەر و پووچەڵکردنەوەی هەندێک لە مەرجەکانی هەڵبژاردن، بۆیە ئەنجومەنێکی توندڕەو و توندوتیژ لە رووی شێوازی کارکردن هاتە هەڵبژاردن. لە راستیشدا چەندین ناکۆکیی لەخۆگرتبوو، هەر لە کۆبوونەوەی یەکەمی لە ٢١ی ئەیلول ١٧٩٢ دەرکەوت، کە زۆربەی ئەندامانی لایەنگری کۆماریی بوون، بۆیە لەو دانیشتنەیاندا

بەبێ گرفت ئەو بڕیارانەیان دان، کە مەبەستیان بوون، ئەوانیش بە سەر سێ رەوت دابەش ببوون:

١- **جیرۆندییەکان:** ئەوانە لەسەر کورسییەکانی لای راستەوە دانیشتبوون و داوای کۆمارییان، دەکرد بەڵام بە مەرج و داکۆکیەکی توندی دژ بە یاقوبییەکان، کە تەگەڕێنەوە سەر سەکۆی دەسەڵات، چونکە ئەوان (یاقوبییەکان) لە هەڵوێستەکانی کاتی خۆیان پەشیمان ببوونەوە و لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییشەوە رەو توندڕەوی رۆیشتبوون.

٢- **یاقوبییەکان:** ئەمانە ژمارەیان کەمتر بوو، بەڵام بۆ کاروباری سیاسەت و حوکمران شارەزاتر و بەتواناتر بوون، پشتیان بە هەژار و جەماوەری کرێکارەوە ئەستور بوو. ئەوان لە کورسییەکانی چەپ و کورسییە بەرزەکان دانیشتبوون، بەم هۆیەوە خەڵک ناویان نابوون (شاخاوییەکان).

٣- لە نێوان هەردوو گرووپدا کۆمەڵێکی تر دانیشتبوون، کە هەڵوێستیان روون نەبوو، خەڵک ناویان نابوون لێپلاینە (ئاسانەکان).

لەگەڵ دەسپێکی سەردەمی کۆنگرەی نیشتمانیی، فەرەنسا چەند سەرکەوتنێکی سەربازیی وەدەست هێنا، لەوانە: شەڕەکانی ڤالمێ، کاتێک فەرەنسییەکان پاشەکشەیان بە دوژمنان کردبوو، بەوە نەوەستابوون لە ماوەی نێوان ٢٠ی ئەیلول تا ٧ی نۆڤەمبەر لە چەند هێرشێکدا توانیان چەند پانتاییەک لە خاکی بەلژیک داگیر کەن لەگەڵ چەند هەرێمێک لە لێواری رووباری راین. هەروەها دەستیان بەسەر نیس و ساڤوای داگرت.

ئەم سەرکەوتنانە ورەی جەماوەری بەرز کردەوە و زیاتر بڕوایان بە شۆڕش و تواناکەیەوە هێنا، لەوە دڵنیابوون کە شۆڕش لە توانایدا هەیە کارەکان بەڕێوە بەرێت. ئەمە وایکرد کۆنگرەی نیشتمانیی لە ١٩ی نۆڤەمبەر بڕیارێکی خەتەرناک دەربکات، کە کاریگەری بەسەر پەیوەندییەکانی وڵاتانی دراوسێوە هەبێت، تیایدا: ئامادەیی خۆی دەربڕی لە دانێنان بە سەربەخۆیی هەر نەتەوەیەک، کە داوای بکات. بەم شێوەیە فەرەنسا بوو بە وڵاتێکی پڕوپاگەندە و نێرەری بڕواکانی شۆڕش لە خەسڵەتەکانی ئەم کردارەش خۆتێهەڵقورتاندن لە کاروباری وڵاتان بوو، ئەمە وای گەیاند فەرەنسا بەنیازە دژایەتیەکەی لەگەڵ پادشا و رژێمەکەی وهەموو چەمکە کۆنەکان بۆ دەر و دراوسێکانی بگوازێتەوە.

ئەمە زەنگێکی خەتەر بوو بە ئەوروپا درا، کە ئاراستە نوێیەکانی فەرەنسای بە ئەوروپییەکان ئاشنا کرد، لەگەڵ سووربوونیان لە دەستگرتن بە خاکە داگیرکراوەکانی بەلژیک و چەند هەرێمێک لە کەنارەکانی ڕووباری راین، بۆ ئەوەی چێژی سەرکەوتن لەم داگیرکارییە بە خەڵکی فەرەنسا ببەخشن و لە بێزاری و ترسەکانی هەڵچوونی میللەت لە ئەنجامی خاڵیبوونی خەزنەی وڵات دوور کاتەوە، ئەم پڕوپاگەندە و هەڵوێستانەی رادەگەیاند. بەم شێوەیە فەرەنسا تەنیا بە وڵاتی رێکلام و پڕوپاگەندە نەناسرا، بەڵکو بوو بە وڵاتێکی داگیرکەر.

## لەسێدارەدانی پادشا

ئەم زاراوە نوێ و پڕ بەهایانە لە رووی سیاسییەوە مەترسی لە دڵی میانڕەواندا خولقاند، ئەوانەی وەکو کۆنەپارێز بیریان دەکردەوە ناچاربوون گرووپ گرووپ پێک بهێنن و لە ڕووی توندڕەویدا بوەستن، چونکە هەستیان بە مەترسییە ناوەخۆیی ودەرەکییەکان دەکرد، کە لە ئەنجامی ئەم کارە دەکەونەوە. ئەم کارە مەترسی یاقوبییەکانیشی وروژاند، هەڵوێستەکان لەسەر چارەنووسی کۆمار وەستان، بۆ تۆقاندنی دۆست و لایەنگرانی پادشا بە پێویستیان دەزانی پادشا لە سێدارە بدرێت، تا ئەرکانەکانی حوکم بچەسپێن و لایەنگرانیشی پێی بتۆقێنن.

یاقوبییەکان هەوڵی ئەوەیان دا کۆنگرەی نیشتمانیی ناچار بکەن بڕیارێکی لەم شێوەیە بدات، بەڵام جیرۆندییەکان بەربەرچی هەوڵەکانیان دانەوە. وەکو کاردانەوەیەک بۆ لەمپەر خستنە بەر توندڕەویان بۆ پاشگەزبوونیان لەهەڵوێستی کۆماری کۆنیان، داوایان کرد پادشا بدرێتە دادگا. پادشا لەم دادگاییە بەرگریەکی زۆری لە خۆی کرد، ئەوەندەی نەمابوو دادوەرەکان بگەیەنێتە ئەو بڕوایە کە بێگوناهە، ئەگەر ڕۆبسپێر خۆی تێ هەڵنەقورتاندبایە، ئەو هەڕەشەیەی لە ئامادەبووان کرد بۆ ئەوەی کارەکان بە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی بن.

لە ٧ی کانونی یەکەمی ١٧٩٣ بڕیاری لە سێدارەدانی پادشا دەرکرا و لە ٢١ی هەمان مانگ جێ بە جێ کرا.

## ململانێ لەگەڵ ئینگلتەرا

رۆشنبیر و شاعیر و بیرمەندانی بەریتانیا سەرەڕای دەربڕینی سۆز و هەستی خۆیان بەرانبەر بە شۆڕشی فەرەنسی، بەڵام تا ساڵی ١٧٩١ بەریتانیا هەوڵی ئەوەی دا بە فەرمی خۆی لە ڕووداو و گۆڕانەکانی فەرەنسا هەڵنەقورتێنێت و خۆی دووربخاتەوە و بێلایەنانە چاودێری ڕووداوەکانی دەکرد، بەڵام توندڕەوی شۆڕشگێڕەکان وایان لە بەریتانیا کرد لە قۆزاخی بێدەنگی و بێلایەنی بێتە دەر و هاوکاری لەگەڵ لایەنەکانی دژ بە شۆڕش بکات.

داگیرکردنی خاکی بەلژیک لەلایەن فەرەنساوە و هەڕەشەکانی فەرەنسا بۆ هۆڵەندا بە رادەیەک کاریان کردبووە سەر بەرژەوەندییە کانی بەریتانیا، چونکە ئەم دوو وڵاتە بۆ بازرگانی بەریتانیا شوێنی بایەخ بوون. بە دیدی بەریتانیا داگیرکردنی ئەم دوو وڵاتە لەلایەن وڵاتێکی مەزنی وەک فەرەنسا تەنگ بە بازرگانیەکەی هەڵدەچنێ، چونکە ئەمان لەسەر دەریاوە هاوسنوور و هاوکاری بازرگانین، بۆیە لەپێناو پاراستنی ئەم بەرژەوەندیانەی ئامادە بوو بەشداری لە شەڕەکان بکات. دواتر راگەیاندنەکەی فەرەنسا، کە تیایدا ئامادەیی خۆی دەربڕی بوو بۆ هاوکاریکردنی خەباتی گەلان لە رزگاریدا، کە لەلایەن بەریتانیا رەتکرایەوە، ئەم راگەیاندنە هاندانێکی راستەوخۆی داگیرکاریی ئێرلەندا و داگیرکەرەکانی ترە تا بەگژ پادشای بەریتانیادا بچێتەوە و لێی یاخی بێت.

لەسێدارەدانی پادشای فەرەنسا بێزاریەکی زۆری لەنێو کۆمەڵگای بەریتانی لەسەر فەرەنسییەکان دروست کردبوو، چونکە بەریتانیەکان نیازی ئەویان نەبوو لە حاڵەتی لادانی پادشاکەیان لەسەر کورسیی حوکم چارەنووسی بەم شێوە ئەنجامە بگەیەنن، لە کاردانەوەی ئەم کارە حکومەتی بەریتانیا داوای لە باڵوێزی فەرەنسا کرد خاکی بەریتانیا جێ بێڵێت و پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانیشی لەگەڵدا پچراندن.

## یەکەم هاوپەیمانیی نێودەوڵەتی

لە ١ی شوباتی ١٧٩٣ کۆنگرەی نیشتمانیی بڕیاری شەڕی دژی بەریتانیا راگەیاند، ئیتر بەریتانیاش هەڵسا بە بەستنی کۆمەڵێک پەیماننامە و سۆزداری لەگەڵ

ولاَتە نەیارەکانی فەرەنسا، یان ئەوانەی لە ئەنجامی لەسێدارەدانی پادشا پەیوەندییان لەگەڵ فەرەنسا پچراندبوو. بەم شێوەیە هاوپەیمانیەک دژی فەرەنسا لە ولاَتانی نەمسا، بروسیا، هۆڵەندا، سەردینیا، پرتوگال، ئیسپانیا، روسیا و ئینگلتەرا پێک هات. بەرنامە و پیلانەکانی بەریتانیا ئەوە بوو ئەم ولاَتانە بە سوپا بەشداری لە جەنگ نەکەن، تەنیا لە زەمینەوە هاوکارییەکان پێشکەش بکەن و کاری رووبەڕووبوونەوەش لە دەریاوە بۆ کەشتیگەلەکان جێبێڵن و گەمارۆدانی کەنارەکانی فەرەنسا بۆ دابڕاندنی ئابوورییەکەشی کاری بەریتانیا بن، بەرانبەر بەو هێزە زەبەلاحەی هێزی هاوپەیمانان دەبووایە شکست بە فەرەنسا بێنن. لە مانگی مارت نەمسا شکستی بە هێزەکانی دیمۆریەی هێنا و ناچاری کرد بەلژیک جێ بێڵێت، دیمۆریە بۆ پەردەپۆشکردنی شکستەکەی لە فەرەنسا لەگەڵ چەند لەلایەنگرانی پادشا هەوڵی دا دەست بەسەر دەسەلاَتدا بگرێ و کۆمارییەکان و حکومڕانەکان وەلانێت، بەلاَم لەم هەوڵەشی سەرکەوتوو نە بوو، ئەویش بە هۆی رازینەبوونی سەربازەکانی، ناچار رای کرد بۆ دەرەوە بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ دوژمانی شۆڕش. ئەم هەڵوێستەی دیمۆریە جیرۆندییەکانی لە بەرانبەر یاقوبییەکان شەرمەزار و لاواز کردن، چونکە ئەم یەکێک بوو لە سەرکردە جیرۆندییەکان.

لە دۆڵی راینیش فەرەنسییەکان لەسەر دەستی بڕوسیەکان شکستیان خوارد و لە هەموو ئەو شوێنانەی ساڵی پێشتر داگیریان کردبوو وەدەر نران. دیسان کەشتیگەلی بەریتانی گەمارۆی شاری تۆلۆنی دا و داگیری کرد، لە سەردەمی شۆڕش کاتێک بەهاری ١٧٩٣ بەسەر فەرەنسا داهات زۆربەی خاکی فەرەنسا لەژێر هەڕەشە و مەترسیی داگیرکەرانی بێگانەدا بوون.

## کۆمیتەی رزگارکردنی گشتی

بەرانبەر بە هەڕەشەی ولاَتانی بێگانە و بە هۆی هەڵوێستەکەی دیمۆرێ کۆنگرەی نیشتمانیی بە پێویستی زانی دەسەلاَت بە ئۆرگانێکی بچووک بدات، کە لە توانای دابێ لەلایەک بارودۆخەکە رابگرێ و لە مەترسیەکانی بپارێزێ، بەتایبەت لە بەرهەڵستکارە یاقوبییەکان، لەلایەکی تریش بەرپەرچی هێرشەکانی دەرەکی بداتەوە، بۆ ئەم مەبەستە کۆمیتەیەک بە دەسەلاَتێکی دیکتاتۆرانە رێکخرا، کە لە ٩ کەس پێک هاتبوو. لە

کاتێکدا ئەمان لە توندڕەوە یاقوبییەکان دەبن، دەستیان بە تۆقاندن و ڕاوەدونانی خەڵک کردبوو، بە تایبەت جیرۆندییەکان.

ئەم کۆمیتەیە نیازی ئەوە بوو وڵات بۆ دەسەڵاتی میانڕەوان بگێڕێتەوە و خۆیان بە چاکسازییە ناوخۆییەکانەوە خەریک کەن، چونکە نوێنەری بۆرجوازەکان بوون، بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە تێک هەڵچوون و نائارامیدا نەدەبینی.

دواتر کۆمیتەیەکی تر دامەزرا بە ناوی (کۆمیتەی دەستەبەری گشتیی) بە پشتگیری دادگای شۆڕش ئەرکی پاراستنی ئارامی و ئاسایش، چاودێریکردنی گومانلێکراوان، کاروباری پۆلیسی دادگاییکردنی گومانلێکراوان و ناردنیان بۆ جێبەجێکردنی سزای سەپێنراو بەسەریاندا لە ئەستۆ گرت.

کۆمیتەی دەستەبەری گشتیی هەر زوو دەستی بە کارەکانی خۆی کرد، لەپێناو رزگارکردنی وڵات لە ئاژاوە گێڕان ڕۆژانە چەندین گومان لێکراویان بە سزا دەگەیاند. ئەم کۆمیتەیە لە رووی ناوخۆوە ڕووبەڕووی چەند گرفتێک بۆوە، لەوانە: قەیرانی دارایی، دابەزینی نرخی دراوی فەرەنسی و ڕووبەڕووبونەوەیان لەگەڵ ئەکلیرۆس و کاسۆلیکەکان، کە دژایەتی شۆڕشیان دەکرد، ڕەنج و ماندووبوونی خەڵکی بەریتانییان بە هەل زانی بۆ ئەوەی خەڵکی پێ هان بدەن بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش لەو شوێنانە. ئەم کارە لابەلایانە ئەرکی کۆمیتەکەی قورستر کرد، (ریس)یان ناچارکرد هێز بۆ سەرکوتکردنی خەڵکە ڕاپەڕیوەکە بنێرێت. بە هۆی ئەوەی سەرکردە جیرۆندییەکان لەگەڵ ڕاپەڕیوەکان لە پەیوەندییەکی توند دابوون، سەرۆکی کۆمیتەی رزگارکردنی گشتی (دانتون) لە ٢ی حوزەیران چەند نوێنەرێکی جیرۆندیان لە ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی دەستگیر کرد و هەندێکیشیان لێ لەسێدارە دان و هەندێکیشیان رایان کردە ناوچەکەی خۆیان، خەڵکیان بۆ شۆڕش هاندەدا دژی یاقوبییەکان. بەم شێوەیە بزووتنەوەکانی ڕاپەڕین گەشەیان سەند، بە رادەیەک هەموو ناوچەکانی خوارو خۆرئاوای فەرەنسای گرتەوە، کە لایەنگری جیرۆندییەکان بوون. هەندێک لە ڕاپەڕیوەکانی ناوچەی تۆلۆن لە هاوکاریکردنی هێزەکانی بەریتانی زیادەڕۆییان دەکرد بۆ ئەوەی بیانهێننە ناوچەکانیان، بەڵام هەوڵەکانی هێزی ئاسایش کاریگەریی ئەوتۆیان نەبوو، تا هێزەکانی کۆماری توانیان گەمارۆی سەر

شاری تۆلۆن بشکێنن و شارەکە بێننەوە باوەشی فەرەنسا، ئەم سەرکەوتنە گورزێکی کوشندە و کاریگەر بوو بۆ یاخیبووەکان و بە تایبەتیش بۆ جیرۆندییەکان.

کۆماریەکان توانیان بەم سەرکەوتنەیان باقی ناوچەکانی تری فەرەنسا بخەنەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، ئەم ناوچەیەش ڕووبەڕووی شاڵاوێکی توندوتیژی و تۆقاندن هات لەلایەن گرووپی پارێزراوانی ئازادی و یەکپارچەیی فەرەنسا.

بەڵام کاروباری سیاسەتی دەرەوەی فەرەنسا و بەرگریکردن دژی وڵاتانی هاوپەیمانیی بە پیاوی یەکەمی کۆمیتەی رزگاریی گشتی دانتۆن سپێردرا، یاریدەدەرەکەشی (ل.کارنۆت)ی کۆنە ئەفسەر لە چەکی ئەندازیاری و پسپۆر لە بەڕێوەبردنی کاروباری لەشکر بوو، ناوبراو دامەزرێنەری لەشکرێکی گەلەریی کۆمارییە لە وێنەی میلیشیای ئەم سەردەمە. هەر زوو پەیوەندیی بە کارەکەیەوە کرد و یەکەم بڕیار، کە دەری کرد، بانگەشەی گشتی بوو. لەم بانگەشەیە هەرچی فەرەنسیەک بتوانێت چەک هەڵگرێت، دەبوایە ئامادە بێت، هەموو تواناکانی مرۆیی و ئابووریی وڵات بۆ خزمەتی جەنگ تەرخان کران. بەم هەنگاوەی کارنۆت بلیمەتیەکی مەزنی نواند، کە لە ماوەیەکی کورتدا فەرەنسا بوو بە خاوەنی سوپایەکی نزیک لە یەک ملیۆن سەرباز، کە هەموویان بە بنەماکانی شۆڕش و خۆشەویستیان بۆ فەرەنسا و کۆمارەکەی پەروەردە کرابوون. هەر لە پایزی ١٧٩٣وە لە بەرەکان هەڵوێست لە بەرژەوەندیی فەرەنسا گۆڕان، لە نیوەی یەکەمی ١٧٩٤ هەرچی سوپای نەمسا و پروسیای سەرخاکی فەرەنسا هەبوو هەموویان وەدرنران. بەر لە تەواو بوونی ساڵەکە فەرەنسا توانی دووبارە بەلژیکا وهەرێمەکانی لای چەپی ڕووباری راین و بەشێک لە خاکی هۆڵەندا داگیر بکات، بەم شێوەیە یەکەم چەرخی هاوپەیمانی کۆتایی هات، لە نوێوە هەر یەک لە پروسیا و ئیسپانیا و هۆڵەندا لە ١٧٩٥ پەیماننامەی ئاشتیان لەگەڵ فەرەنسادا بەست.

## چەرخی تۆقاندن

سەرەڕای ئەوەی کۆمیتەی رزگارکردنی گشتیی دەستکەوتی زۆری بۆ فەرەنسا بەدەست هێنابوو، بەڵام ئەوەی لەم سەردەمە گەشەی کرد تۆقاندن بوو، گەیشتبووە

ئاستێک قبووڵکردنی ئاستەم بوو. هەر لە هاوینی ١٧٩٣ ئەوکاتەی رۆبسپێر بە ئەندامێتی کۆمیتەکە هەڵبژێردرا بوو، بە هۆیەوە پیاوەکانی لە حکومڕانیدا دەستەڕۆ بوون تا هاوینی ١٧٩٤ تەنیا ئەوانەی گیران و رەوانەی زیندان کران لە پاریس ژمارەیان گەیشتە ٨٠٠٠ کەس، ئەمە جگە لە زیندانە لابەلاکانی تری وڵات، کە بەوانەوە ژمارەیان زۆر لەمە زیاتر دەکرد. تا دەهات زیندانەکان جێگەیان بەر تەنگ دەبوو، دادگاکان بە دادگاییەکی سەرپێی خاڵیان دەکردن، دادگاییکردنەکەیان هیچ مەرج و سیمایەکی دادگای پێوە دیار نەبوو، تەنیا ئەوانەی لەم ماوەیە لە پاریس رەوانەی سەربڕین کران گەیشتنە ٣٠٠٠ سێ هەزار کەس، ئەوانەی لە دەرەوەی پاریسیش بە دەیان هەزار مەزەندە دەکران.

رۆبسپێرپێی وابوو کە تەنیا بە لێدانی دوژمنەکانی دەتوانێ حکومەتی کۆماری بپارێزێ، ئەو تەنیا ئەو کەسانەی بە دوژمنی حکومەتی کۆماری نەدەزانی، کە بە ئاشکرا دوژمنداریتی کۆماریان دەکرد، بەڵکو ئەوانەی بە دڵسۆزیش کاریان بۆ نەکردبا یان بایەخیان پێی نەدابا ئەوانیشی بە دوژمن دەزانی. بۆیە سێدارە تەنیا تایبەت نەبوو بە جوامێران (نبلاء) گەلێك جار میوانەکانی سێدارە لەوانە بوون، کە سەردەمێک لایەنگری شۆڕش بوون. تۆقاندن و کوشتن و بڕین گەیشتە ئاستێک لایەنگرانی شۆڕشی دەیان پرسی: بۆ بەم رێژەیە خەڵک بکوژرێت ؟ بەتایبەت ئەو کاتەی مەترسییە ناوەکی و دەرەکییەکانی لەسەر فەرەنسا نەمابوون، دانتۆن خۆشی گەلێک جار لە پاساوی ئەم کوشتن و توندوتیژیەی دەپرسی، وای لێ هاتبوو ئەویش ئەو خۆشەویستیەی بۆ شۆڕش نەمابوو، کە رۆژانێک هەی بوو. رۆبسپێر لە مشتومڕ و گفتوگۆکاندا زۆر توند بوو، بە رادەیەک هیچ کاتێک رای بەرانبەری قبووڵ نەبوو، رەخنەگرتن لە شۆڕش رێگەی پێ نەدەدرا، ئەوەی دژی را و بۆچوونەکانی بووایە سزای مردن بوو و هیچی تر نا. ئەم بەو پانتاییە جەماوەریەوە، کە لە رێگەی گوتاری پاراو و دڵسۆزییەبێ گەردیەکەیدا هەیبوو، پێیەوە خورت بوو و لە خۆی بایی ببوو.

لە ساڵی ١٧٩٤ دووکەس لە مێرخازانی شۆڕش (دانتۆن) و برادەرەکەی (دیمۆلین) سەریان کردە قوربانیی باجی کتابێک، ئەو کتابەی لەژێر ناوی (کوردڵیەی پیرەمێرد)یان نووسی بوو، تیایدا داوای میانڕەوی و دلۆڤانیان کردبوو، ئەم پەرتوکەیان بووە مایەی گەیاندنیان بۆ بەردەم پەتی سێدارە.

دواتر رۆبسپێر لە ماوەی تەنیا ٦ هەفتەدا چەندین هەزار هاووڵاتی رەوانەی سێدارە کرد لەو کەسانەی زاتی ئەوەیان کردبوو رکابەرێتیی بکەن، لە ١٠ی حوزەیران ١٧٩٤ یاسایەکی دەرکرد وەکو شمشێر بوو بەسەر ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانییەوە، ئەم یاسایە لە مافی پاراستنی پەرلەمانیی بێبەش کردن، لەو رۆژە بەدواوە ئاسایی بوو هەر ئەندامێکی کۆنگرەی نیستمانی بەبێ پرسی کۆنگرە بدرێتە دادگا و بە سزای رەوای خۆی بگات. بەپێی ئەم یاسایەش دادگای شۆڕش بۆی نەبوو حوکمی زیندانی بۆ کەس دەر بکات، بۆیان هەبوو تەنیا حوکم دان بە ئازادکردن یان سێدارەدان دەربکەن، ئەمەش پێشێلکردنی بچووکترین بنەماکانی یاسای سزادانی فەرەنسییە. ئەم رەفتارانە ئەندامانی کۆنگرەی بێزار کرد لە سەروی هەموویانەوە باڕاس، ئەمیش بیری لەوە کردەوە کارێک بکات لەم مۆتەکەیە رزگاریان بێ، خەڵک لە دیمەنی داشقەکان بێزار ببوون، کە رۆژانە خەڵکی بێگوناهیان لە زیندانەوە بەرەو سێدارە دەبردن.

(باڕاس) و لایەنگرانی بە نهێنی هێزەکانیان رێکخستن، لە دانیشتنی ٢٧ی تەمووزی ١٧٩٤، واتە دوای ساڵێکی تەواو لە بەشداری لە کۆمیتەی رزگاریی گشتی، رۆبسپێر و هەڤاڵانیان دەستگیر کرد و لە خانووی شارەوانی زیندانیی کردن. بەیانیەکەی رۆژی دواتر خۆنیشاندانێکی مەزن لە (لە بیلاتییَر)ەوە، کە گەرەکێکی مەزنی پاریسە و جێی دەوڵەمەند و چەپرەوەکانە. هاتن خانووی شارەوانیان گەمارۆدا و رۆبسپێریان بەرەو پەتی سێدارە برد تا لەو ئاوە بنۆشێ، کە بە زۆر کەسی نۆشی بوو.



رۆبسپێر

## حکومەتی بەڕێوەبردن

بە رووخانی رۆبسپێر سەردەمی مۆتەکە و ترس و تۆقاندن کۆتایی هات، هەر لە خۆیەوە خەڵک حەزی کوشتن و برینیان نەما، رێگەی لەسێدارەدان لەو هاوولاتیانەی رۆژانە دەبردران بۆ لە سێدارەدان بە چۆڵی مایەوە، زۆربەی فەرەنسییەکان پشتگیریان لەهەڵوێستی ئەو میانڕەوانە کرد، کە دوای سەردەمی خوێن و تۆقاندن دەسەڵاتیان گرتەدەست. پاش ئەوەی کۆمیتەی رزگارکردنی گشتیی شارەوانیی (کۆمۆن) پاریسیان هەڵوەشاندەوە و یانەی یاقوبییەکانیشیان داخست، لێبوردنێکی گشتیان بۆ سەرکردە جیرۆندییەکان دەرکرد و رێگەیان پێدان کاری سیاسی بکەن.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە فەرەنسا وڵاتێکی شۆڕشگێڕ و کۆماریی نەما، بە پێچەوانەوە لە ١٧٩٥ بەولاوە فەرەنسا لە هەموو سەردەمێک کۆماریتر بوو، تەنانەت ئەوەی گۆڕا ئەوەبوو سەردەمی تۆقاندن و توندڕەویەکەی جارانی فەرەنسا نەما، بەتایبەت دوای ئەوەی هیچ مەترسیەکی دەرەکی لەسەر فەرەنسا نەما، دواتر لایەنگرانی رۆبسپێر تا ئەو کات خاوەن هێز و چەک بەدەست بوون، لە ئامادەباشیدا بوون بۆ بەرگریکردن لە هەر بەربەرچدانەوە یەکی روەو پادشا یان ڕاستڕەوەکان.

کەشوهەواکان گۆڕان و وا لەسەر کۆنگرەی نیشتمانی پێویست کرا دەسەڵاتێکی نوێ بە وڵات ببەخشێت، کە سەروەریی شۆڕشگێڕی بۆ وڵات مسۆگەر بکات. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٧٩٥ کۆنگرە ئەرکی خۆی بە ئەنجام گەیاند، کە بریتی بوو لە دەرکردنی دەستوورێکی نوێی کەمێک ئاڵۆز، کە بە (دەستووری کۆماریی گشتیی سێیەم یان دەستووری ساڵی ١٧٩٥) ناسرا.

## دەستووری ساڵی ١٧٩٥

بە پێی ئەم دەستوورە سێ ئۆرگان لە فەرەنسا حکومڕانی دەکەن:

١- **حکومەتی بەڕێوەبردن:** لە ٥ ئەندام پێک دێت، بە نۆرە هەر سێ مانگ یەکێکیان سەرۆکایەتی حکومەت دەکات، هەر ساڵێکیش یەکێکیان ئەندامێتی لە دەست دەدات، ئەم دەستەیە هەموو دەسەڵاتەکانی جێبەجێ کردن و حکومڕانیان دەبێ، دوو بەڕێوەبەریش لەلایەن ئەنجومەنەکانی یاسادانان هەڵدەبژێردرێن.

**٢- ئەنجومەنی پێنج سەد کەسی:** ئەم ئەنجومەنە لە ٥٠٠ ئەندام پێک دێت، لەوانەی تەمەنیان لە ٣٠ ساڵ رەت کردووە، هەر ساڵەی سێ یەکی ئەنجومەنەکە ئەندامێتی لەدەست دەدات، دەسەڵاتی یاسادانان بەم ئەنجومەنە دەسپێردرێت.

**٣- ئەنجومەنی پیران:** لە ٢٥٠ ئەندام پێک دێت، نابێت تەمەنیان لە ٤٠ ساڵ کەمتر بێت، ئەرکی ئەم ئەنجومەنە چاودێریکردنی کارەکانی ئەنجومەنی پێنج سەد کەسییە.

تا رادەیەک ئەم دەستوورە وەکو بەرپەرچدانەوەی ڕاسترەوە میانرەوەکانە، لەگەڵ ئەوەی ئەم دەستوورە مافی دەنگدانی بەو کەسانە داوە، کە دەتوانن بنووسن و بخوێننەوە، بەڵام بۆ دەنگدەرانی پلەی دوو (بە حساب دەنگدەران بەسەر دوو پلە دابەش ببوون) ئەوانەی تارادەیەک خاوەنی زەوی و زارن، کە ژمارەیان دەگەیشتە ٢٠٠٠٠ بیست هەزار کەس، ئەم ژمارەیەش گەلێک لەو ژمارەیەی ساڵی ١٧٩١ کەمتر بوو، کە دەستوور رێگەی پێ دابوون دەنگ بدەن. ئەمەش رەنگدانەوەیەکی بەرژەوەندییەکانی بۆرجوازیی مام ناوەندییە، کە لە پێناو بەرگریکردن لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان پەنایان بۆ کاری تێکدان و توندوتیژی دەبرد.

لە روێکی تریشەوە دەستووری نوێ توانی ئەو دەستکەوتانە بپارێزێت، کە شۆڕش بەدەستی هێنابوون، وەکو سیستەمی کۆماریی و راگەیاندنی مافی مرۆڤ و نەهێشتنی ئیمتیازاتەکانی چینی شکۆدار و ئەکلیرۆس.

## رووداوەکانی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٧٩٥

زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانیی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرپرسیار بوون لە لەسێدارەدانی پادشا و هەموو ڕووداوە توندوتیژیەکانی سەردەمی تۆقاندن، بۆیە ترسیان لێ نیشتبوو، کە لە سایەی سیستەمی دیموکراتی و دەستووری نوێدا چارەنووسیان بکەوێتە مەترسییەوە. لە بڕگەیەکدا دیاریکرا کە سێ یەکی پەرلەمانی نوێ لە ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانیی بن، ئەم بڕیارە بێزاریی لەناو ریزەکانی میانرەوان و پادشاخوازان نایەوە، چونکە کەمێک خۆیان کۆ کردبۆوە بە مەبەستی ئەوەی بتوانن دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرن.

بۆ دەربڕینی نارەزایی لە هەفتەی یەکەمی ئۆکتۆبەری ١٧٩٥ خۆپیشاندانێکی مەزنیان لە هەژار و کۆنەپارێز و پیاوە ئایینیەکانی پاریس ریک خست، هێرشیان بردە سەر بارەگای حکومەت و بەڕێوەبەرایەتییە نوێکەی.

باڕاس لە کەسە هەرە ناسراوە کانی حکومەت بوو، کە نوێنەرایەتی هەموو لایەنێکی دەکرد، لە هەموو کەسیش زیاتر ئامادەیی تیا بوو کاری سیاسیانە بکات و بەرگریش لە دەستکەوتەکانی شۆڕش بکات. ئەم پیاوە ئەرکی لەناوبردنی هەموو بزووتنەوە ڕاستڕەوەکانی گرتە ئەستۆ، بۆ سەرکەوتن لە کارەکەی دۆستێکی خۆی دەست نیشان کرد، کە لە ئەفسەرەکانی هێزی تۆپهاوێژی ئەو کاتە بوو، کە شاری تۆلۆن گەمارۆ درابوو ئەرکی پاراستنی دەزگاکانی حکومەتی پێ سپاردرابوو. ئەم ئەفسەرە گەنجە ئەوکات هەر بە چەند گولە هاوەنێک توانیی بڵاوە بە خۆپیشاندەران بکات، ئەم دەرفەتە بۆ ئەفسەرە گەنجەکە هەلێکی باش بوو، کە بە پشتگیری (باڕاس)ەوە زوو پلە بە پلە بەرەو ژوور بڕوات، ئەم ئەفسەرە گەنجەش (ناپلیۆن بۆناپارت) بوو. دواتر هەر زوو بە هۆی باڕاسەوە پۆستی فەرماندەی هێزەکانی ناوخۆی پێ سپێردرا، دوای ساڵێک فەرماندارێتی هێزەکانی فەرەنسای لە ئیتاڵیا کرد تا بەشداری لە جەنگی دژبە نەمسا بکات. هەر چەندە ئەم کارە بۆ حکومەتی بەڕێوەبردن بە خراپ دەنگی دایەوە، چونکە بەم هەڵوێستانەی حکومەت کەوتە ژێر دلۆڤانی و کاریگەری عەسکەرتارەکانەوە.

## قەیرانی ساڵی ١٧٩٧

حکومەتی بەڕێوەبردن لەناو جەماوەری فەرەنسی رەگ و ریشەی دانەکوتا بوو، دۆست و لایەنگری گەلێک لە دوژمنانی کەمتر بوون. لە لای راستەوە لایەنگرانی پادشایەتی بە ئاشکرا لە پاریس و دەرەوە کار و چالاکیان دەنواندن و لە پەیوەندیی بەردەوامدا بوون لە گەڵ لویسی هەژدەهەمی برای لویسی شازدەهەم، کە لە شاری ڤیرجینیای ئیتاڵی دەژیا، لە هەوڵی بەردەوام دابوو بۆ گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا بە پشتبەستن بەو هاوکاری و کۆمەکانەی بەریتانیا دەیدایێ، ئەمە سەرەڕای پشتگیرییە سیاسیەکانی نەمسا.

سەبارەت لە لای چەپیشییەوە پاشماوەی بزووتنەوە توندڕەوەکان بوون، کە بە نهێنی لە جووڵە و چالاکیی بەردەوام دا بوون. ئەمان کاریان بۆ گۆڕانێکی ریشەیی کۆمەڵگای فەرەنسی دەکرد لە رووی رێکخستنی ئابوورییەوە. رکەبەرایەتیەکەی ڕاستڕەو و چەپڕەوەکان کاری حکومەتیان پەکخستبوو و لە بەرانبەریاندا حکومەت دەستەوەستان بوو.

لەو هەڵبژاردنە ئازادەی لە وڵات کرا لە مانگی ئاداری ١٧٩٧ بۆ نوێکردنەوەی سێ یەکی ئەندامانی هەردوو ئەنجومەنەکە، تیایدا زۆرینەی پادشایەتی دەستوورییەکان و لایەنگرانی زۆرینەی رێژەی کورسیەکانیان وەدەست هێنا، بەمەش پارسەنگی کێشەکانی ناو ئەنجومەنی پێنجسەدی و دووسەدوپەنجایی لە بەرژەوەندی پارتە پادشاخوازەکان تەواو بوو، ئەمەش کارێکە کە کۆماریخوازەکان پێی رازی نابن. دواتر لایەنی دووەم لەو هاوکێشەدا هەیە، کە ناکرێ بۆ کارە چارەنوسسازەکان فەرامۆش بکرێت، ئەویش ناپلیۆن بۆناپارتە، کە لە ئیتاڵیا فەرماندەیی شەڕەکانی دەکرد دژی نەمسا.

ناپلیۆن هەردەم شۆڕشگێڕ بوو و لە لایەنگرانی کۆماریخوازەکان بوو، هەرگیز ئەوەی قبووڵ نەبوو پادشاخوازەکان بگەڕێنەوە سەر کورسیی حوکم، چونکە ئەمان لەلایەنگرانی بەستنی پەیمانی ئاشتەوایی بوون لەگەڵ ئینگلتەرای دوژمنی فەرەنسا و دۆستی نەمسا.

ناپلیۆن بۆ یارمەتیدانی باڕاسی هاوڕێ و هاوپەیمانەکەی دەستپێشخەریەکی کرد، هێزێکی بە سەرپەرشتی یەکێک لە برادەرە ئەفسەرەکانی بە ناوی (ئۆجیرو) بە تیپێکی سەربازەوە بۆ هاوکاریکردنی باڕاسی نارد، بۆ ئەوەی پاسەوانی لە حکومەتی بەڕێوەبردن بکات، هەر چەندە ئەم کارەی لەگەڵ بڕگەکانی دەستوور ناکۆک بوو. لە ٤ی سێپتەمبەری ١٧٩٧ سەربازەکانی ناپلیۆن ئەو ئەندامانەیان دەستگیرکردن، کە گومانی دڵسۆزیان بۆ کۆمار و حکومەتی بەڕێوەبردن لێ دەکرا، هەروەها چەند لیژنەیەکی سەربازی فەرمانی لە سێدارەدان و دوورخستنەوەیان بۆ هەندێک لە گیراوەکان دەرکرد، ئەمەو ئەنجامەکانی هەڵبژاردنیان لە ٩٤ شار هەڵوەشاندەوە.

دوای ئەم ڕووداوانە باڕاس و کۆنە هەڤاڵە کۆماریخوازەکانی بێباکانە دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت، بەڵام ئەم جارەیان بە پشتگیری و پاڵپشتی ناپلیۆن نەک جەماوەر، کە مەیلی رێبازی کۆنەپارێزیان هەبوو و هەوڵی گەڕانەوەی حوکمیان بۆ ئەو بیرۆکەیە دەدا، ئەم بۆچوونانەیان بەروونی لە هەڵبژاردنەکانی ١٧٩٧ بەدی دەکرا. پاساوی باڕاس بۆ

ئەم هەڵوێستانەی پشتگیریکردن بوو لە شۆڕش و ڕێگەگرتن لە گەڕانەوەی لویسی هەژدەهەم بۆ سەر کورسیی حوکم لە فەرەنسا. حکومەتی بەڕێوەبردن وێڕای لاوازی و لەدەستدانی پشتیوانیی جەماوەر درێژەی بە حکومڕانی دا، تا ئەو کاتەی ناپلیۆن ئامادە و بەتوانا بوو خۆی حوکم بگرێتە دەست لە ١٧٩٩.

## حکومەتی بەڕێوەبردن و ئەوروپا

حکومەتی بەڕێوەبردن لە رووی سەربازییەوە دەستکەوت و سەرکەوتنی زۆری لە بەرەکانی جەنگ لە دەرەوەی فەرەنسا بەدەست هێنا، لەم رووەوە هەڵوێستێکی سەربازیی درەوشاوەی هەبوو، کە بووە هۆی ئەوەی بروسیا ناچار بێت لە نیسانی ١٧٩٥دا بە تەنیایی پەیمانی ئاشتەوایی لەگەڵ فەرەنسا مۆر بکات، دواتر ئیسپانیاش لە تەمووزی هەمان ساڵ چاوی لێ کرد. لەم ڕێککەوتنەی ئەمان ئیسپانیا دەستی لە دوورگەی سانتۆ دۆمینگۆ لە ئەمەریکای ناوەند هەڵگرت بۆ بەرژەوەندی فەرەنسا، هەروەها هۆڵەنداش لە ئەیاری ١٧٩٥ پەیماننامەی ئاشتەوایی لەگەڵ مۆرکرد و تیایدا پەیمانی ئەوەی دا کەشتیگەلیەکەی لە خزمەت فەرەنسا تەرخان بکات دژی ئینگلتەرا. ئەم سەرکەوتنانە لە هەڵوێستی سەربازی سوپای فەرەنسا سەرکردە فەرەنسییەکانی توشی لەخۆباییبوون کرد، وای لێ کردن دووبارە بیر لە بنەما فراوانخوازیەکانیان بکەنەوە بە بیانووی بڵاوکردنەوەی بیر و باوەڕەکانی شۆڕش لە ئەوروپا، تا رژێمی پادشایەتی لاواز بێت و لە توانایدا نەبێت جارێکی تر بگەڕێتەوە مەیدانی حوکمڕانی لە ئەوروپا. لەم روانگەیەوە فەرەنسا هەوڵی دا کار بۆ ئەوە بکات تا ببێتە خاوەنی سنوورێکی سروشتی، بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەجێندایە دەبێت بەلژیک و چەند هەرێمێکی ئەڵمانی وەکو سافوای و ئەفینون لە رووی چەپی ڕووباری راین بکەونە ناو سنووری فەرەنساوە، بەم شێوەیە ڕووباری راین دەبێتە سنووری هاوبەشی نێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا، چیای ئەلبیش دەبێتە سنووری هاوبەشی فەرەنسا و ئیتاڵیا. بەڵام ئەم ڕاگەیاندنەی فەرەنسا لەسەر هەڵوێستی وڵاتانی ئەوروپا ڕەنگدانەوەی خەتەرناکی لێ بەدی دەکرا، چونکە ئاسایی نەبوو ئەم ئەجندایە وا بە ئاسانی قبووڵ بکرێت، لە کاتێکدا دەبێتە هۆی گۆڕینی سنووری نێوان وڵاتەکان، کە بەمەش پارسەنگی

هێزەکان تێکدەچێت. بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی وڵاتانی ئەوروپا دەبووایە حکومەتی بەڕێوەبردن بەردەوامی بە جەنگەکانی دژ بە ئینگلتەرا و نەمسا بدات، کە ئەمەش پەیمانێکی ناپلیۆن بوو کاری بۆ بەئەنجامگەیاندنی دەکرد، ئەم سەرکەوتنانەشی لە ئیتاڵیا دژی لەشکرەکانی نەمسا بوونە سەرەتای کۆتاییەکانی سەردەمی شۆڕش و سەرەتای سەردەمێکی نوێ لە فەرەنسا و ئەوروپا، کە ناپلیۆن تیایدا ڕۆڵی یەکەم و گرنگترینیان دەگێڕێت.

## ناپلیۆن بۆناپارت

ناپلیۆن بۆناپارت لە ساڵی ١٧٦٩ لە شاری ئەجاکسیۆی پایتەختی دوورگەی کۆرسیکا لە دایک بووە، واتە دوای یەک ساڵ لە دەستهەڵگرتنی کۆماری جەنەوا لەم دوورگەیە بۆ بەرژەوەندی فەرەنسا.





ناپلیۆن بۆناپارت

خانەوادەی ناپلیۆن بە رەچەڵەک خەڵکی ئیتاڵیا بوون، ژیانی منداڵێتیی لەگەڵ منداڵانی مێرخاسەکانی دوورگە بەسەر بردووە، بۆناپارتی باوکی کاری پارێزەریی لە دوورگەکە دەکرد، ئەم ناردیە قوتابخانەی بریانی سەربازی، دواتر پەیوەندیی بە قوتابخانەی سان سیری سەربازیی بە ناوبانگەوە کرد. لەم دوو قوتابخانەیە بەروونی پێیەوە دیاربوو، کە نەک تەنیا لە رووی زانستی سەربازییەوە خاوەن بەهرە و لە پێشەوەی هەڤاڵانیەوەیە، بەڵکو لە رشتەی ئەدەب و مێژوو و جوگرافیاش بلیمەت و زیرەک بوو. لە ماوەی خوێندنیدا ئاشنایییەکی تەواوی لەگەڵ نووسینەکانی نووسەرە بەناوبانگەکانی سەدەی هەژدەهەم کردبوو، ئەو نووسەرانەی هەڵگری بڕواکانی ئازادی بوون، لەوانە پەرتوکەکانی ڤۆڵتێر و مۆنتسکیۆ و کۆمەڵەی ئینسایکلۆپێدیا و رۆسۆ، کە ئەمەیان نووسینەکانی لە هەموویان کاریگەرتر بوون بۆ سەر بیرکردنەوەکانی ئەفسەرە گەنجەکان.

لە ١٧٨٥ کۆتایی بە خوێندنی هێنا و لە چەکی هاوەنی سەر بە سوپای فەرەنسیی پادشایەتی دامەزرا، لە سەردەمی شۆڕشدا هامشۆی یانەی یاقوبییەکانی دەکرد و لەوێش ئاشنایی لەگەڵ هەندێک لە پێشەنگ و بیرمەندانی کرد، بەڵام راستەوخۆ بەشداریی لە رووداوەکانی شۆڕش نەکرد، چونکە وەکو پابەندبوون بە پرەنسیپە سەربازییەکان دژی ئاژاوە و یاخیبوون بوو، دیسپلین و یاسای خۆش دەویست، زۆرجار رەخنەی لە هەڵسوکەوتی پیاوانی شۆڕش دەگرت، بە تایبەتی هێرشەکانیان بۆ سەر کۆشکی تۆیلەری لە پاریس لە ١٧٩٨. لەگەڵ ئەمەش وەکو دڵسۆزێک بۆ بنەماکانی شۆڕش مایەوە و بڕوای بە ئازادی و بۆچوونی فەیلەسووفەکانی سەدەی هەژدەهەم هەبوو، زیرەکی و بلیمەتیەکەی کاتێک دەرکەوت، کە لەگەڵ ئەفسەرە یاقوبییەکان وەکو سەربازێکی شەڕکەر لە سەردەمی حوکمی (کۆمیتەی رزگاری گشتی) بەشداریی لە وەدەرنانی ئینگلیزەکان کرد لە شاری تولون. لە ساڵی ١٧٩٥ زیاتر توانا و بلیمەتیی بەدی کرا ئەو کاتە توانیی حکومەتی بەڕێوەبردن پشتئەستور بکات و لە چنگ خۆپیشاندەرە پادشاخواز و کۆنەپەرست و کۆنەپارێزەکان رزگار بکات، کە مەبەستیان لەناوبردنی حکومەتی بەڕێوەبردن بوو. دیسان لە ساڵی ١٧٩٧ توانیی بۆ جاری دووەم حکومەت لە مەترسیی هێرشی پادشاخوازە دەستوورییەکان رزگار بکات، ئیتر لەو رۆژەوە ناپلیۆن بوو بە پاڵپشت و پاسەوانی راستەقینەی حکومەت و دەستووری ساڵی ١٧٩٥.

## هەڵمەتی ئیتاڵی

هەروەکو پێشتر باسمان کرد دەبوایە حکومەتی بەڕێوەبردن درێژە بە شەڕەکانی دژی ئینگلیز و نەمسا بدات، دیارە کە بەریتانیا لە پشتەوەی شەپۆلەکانی دەریاوە حەشاردرابوو، کەشتیگەلی فەرەنساش ئەوکات لە توانایدا نەبوو بگاتە کەنارەکانی ئینگلیز، بۆیە هەوڵەکانی فەرەنسا بۆ شکستهێنان بە نەمساییەکان چڕتر بوون بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان بە تەنیایی لە بازنەی جەنگ بهێڵنەوە و ئەوساش بتوانن بە سەریدا زاڵ بن. هەرێمەکانی ئیتاڵیا لە سەربەخۆ و نیمچەسەربەخۆ و لایەنگرەکان ئەوەندە زۆر بوون و هەمووشیان بە هێزەکانی نەمسای خاوەن سوپایەکی زەبەلاح و پڕچەک بە یەکەوە گرێدرابوون، بۆیە لای فەرەنسییەکان وا پێویست بینرا ململانێکەیان لەگەڵ نەمساییەکان لە خاکی ئیتاڵیا بێ.

لە ١٧٩٥ سەرکردایەتیی سەربازیی فەرەنسا بڕیاری دا بە سێ لەشکر هێرش بکاتە سەر نەمسا:

- یەکەمیان بە فەرماندارێتی (گۆردان) بۆ هێرشبردنە سەر لەشکری نەمسا لە ئەڵمانیا.
- دووەمیان بە فەرماندارێتی (مۆرۆ) بۆ هێرشبردنە سەر دوژمنەکانیان لە ڤیەننا.
- لەشکری سێیەم، کە بچووکتر و کەمبایەخترینیان بوو، بۆ لێدانی نەمسا بییەکان بوو لە ئیتاڵیا ئەمیش بە فەرماندارێتی ناپلیۆن بۆناپارت بوو.

بۆناپارت لەشکرەکەی لە ڕووی ژمارە کەمترین و لە ڕووی چەک و تفاقەوە هەژارترینیان بوو، بەڵام لە ڕووی وشیاری و بڕوابوون بە بنەماکانی شۆڕشەوە دەوڵەمەندترینیان بوو، ئەو لەشکرەی بڕوایان بە بڵاوکردنەوەی شۆڕش لە وڵاتە زۆردارە دراوسێکان هەبوو، ئەم بڕوایەی بۆناپارت خۆی لە بەیاننامەیەکدا رایگەیاند، کە روەو ئیتاڵییەکانی ئاراستە کردبوو تیایدا هاتبوو: "ئەی گەلی ئیتاڵیا، سوپای فەرەنسا هات بۆ ئەوەی زۆردارەکانتان تێک بشکێنێ، نەتەوەی فەرەنسی دۆستی هەموو گەلێکە، بە باوەڕەوە پێشوازیمان لێ بکەن، موڵک و ماڵتان پارێزراوە، نەریت و ئایینتان پیرۆزە. ئێمە جەنگێکی بە ئابڕوو دەکەین، شەڕمان تەنیا لەگەڵ ئەوانەیە، کە دەتانچەوسێننەوە.)

لە نیسانی ١٧٩٦ لە ڕێگە ئاوییەکانی ئەلبەوە فەرەنسییەکان سنووری ئیتاڵیایان بەزاند و پەڕینەوە. نەخشەی فەرەنسییەکان لێدانی نەمسا و هاوپەیمانانی بوو، لە یەکەم گەیشتنیان بە میرنشینی سەردینیا دەستیان لێ وەشاندن و شکستیان پێ هێنان، ناچاریان کردن لە ١٧٩٦ هاوپەیمانیەکیان لەگەڵ مۆر کەن تیایدا بۆ بەرژەوەندی فەرەنسا دەست لە (نیس و سافوای) هەڵگرن. دواتر راوەدووی نەمساییەکانیان نان تا کەرتی لمباردیا و شاری میلانۆی بەناوبانگ، هەروەها مانتوای لێ داگیرکردن و لە دەست نەمساییەکانی دەرهێنا. فەرەنسا لە هەڵمەتەکانی بەردەوام بوو و بەرەو پێش هێرشی دەبرد، ئەوەندەی نەمابوو ڤیەنناش داگیر بکات، ئیتر نەمساش ناچاربوو داوای مۆرکردنی پەیمانی ئاشتەوایی لەگەڵ بکات.

دواتر دەوڵەتی پاپاش خۆی دایە دەست، هەرچەندە بە هۆی هەڵوێستە شۆڕشگێڕەکانی وەکو دوژمنێک سەیری دەکردن، بەتایبەت هەڵوێستیان لە کڵێسا و دەستووره سڤیلیەکەی ئەکلیرۆس، لە بەردەوامیی شەڕەکاندا لەشکری بۆناپارت توانیان

خاکی کۆماری بندوقیەش داگیر کەن. دەبێت ئاماژە بەوەش بدەین کە ئەو لەشکرەی حکومەتی بەڕێوەبردن بۆ ئەڵمانیا و ڤیەننای ناردبوون هیچ سەرکەوتنێکیان بەدەست نەهێنابوو، ئەمە بووە مایەی ئەوەی ناپلیۆن ببێتە گەورەی مەیدانی ڕووداو و بەرەکانی جەنگ لە نەمسا، بە واتایەکی تر بووە سەرکەوتوی یەکەم. دواتر حکومەتی بەڕێوەبردن لە ڕادەبەدەر لاواز و بێتوانا بوو، بە هۆی ئەم سەرکەوتنانەی ناپلیۆن و شکستەکانی دوو لەشکرەکەی تر و بە هۆی ڕووداوەکەی ئۆکتۆبەری ١٧٩٥ەوە حکومەت خۆی بە قەرزاری ناپلیۆن دەبینی، ئەم هۆکارانە وایان لە ناپلیۆن کرد لەخۆبایی بێت و بێ گەڕانەوە بۆ بڕیارەکانی دەوڵەت هەڵسوکەوت بکات، بۆیە دەبینین بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ حکومەت یەکلایەنە لە ئۆکتۆبەری ١٧٩٧ لەگەڵ نەمسا ڕێککەوتنێکیان مۆرکرد، بەناوی ڕێککەوتنی ئاشتەوایی (کامبۆ فۆرمیۆ) تیایدا هاتبوو:

١- میرنشینی سەردینیا بە سەربەخۆیی دەمێنێتەوە.

لە ئیتاڵیای باکوور لە خاکی لمباردیا و هەندێک لە خاکی پاپا وڵاتێکی سەربەخۆ بەناوی (کۆماری سیسالْ پینە) دادەمەزرێت، بەڵام ئەم وڵاتە وەکو پراکتیک راستەوخۆ سەر بە ناپلیۆنەوە دەبێ، خۆی (ناپلیۆن) فەرمانڕەوا و کاربەدەستانی بۆ دادەمەزرێنێت و ئەرکی دانانی دەستووریش لە ئەستۆی خۆیدا دەبێ، لە شێوەی دەستووری فەرەنسیی بۆی دادەڕێژێ، بە هەرحاڵ مەبەستی بوو ئەم وڵاتە وەکو قەڵایەکی پێشەوەی بەرەکانی بێت بۆ بەرگریکردن لە خاکی فەرەنسا و بنکەیەکی فراوانخوازیی داهاتووی بێت.

٢- قەرەبووی نەمساش بە کۆماری بوندوقیەی کەنارەکانی باکووری دەریای ئەدریاتیک بکاتەوە.

٣- فەرەنسا هەندێک لە دوورگەکانی دەریای ئەیوانی دەبات.

٤- بەیەکجاری نەمسا دان بە یەکخستنی بەلژیک و ویلایەتەکانی راین بۆ سەر فەرەنسا دابنێت.

ئەم پەیماننامەیە بۆ فەرەنسا لە زۆر ڕووەوە مەزنترین سەرکەوتن بوو، چونکە کۆنەپەرستترین وڵاتی ئەوروپا دانیان بە داگیرکاریەکانی فەرەنسا و سنوورە سرووشتییە ئارامەکەی نا، وێڕای داننانیان بەو کۆمارانەی، کە بە شێوازی خۆی لە دەرەوەی فەرەنسا

دروستی کردبوون. لە راستیشدا هەموو هەنگاوەکان لەگەڵ چاوبڕینەکانی ناپلیۆن هاتبوون بۆ دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتی فەرەنسا، ئەمە ورەی ناپلیۆنی بەرز کردەوە و پانتایی جەماوەری و ناوبانگیشی لەناو خەڵک پەرەی سەند کرد.

بۆ ئیتاڵییەکان ئەم هێرشەی فەرەنسییەکان ئاستی وشیاریی نەتەوایەتیان پێ بەرز بۆوە، فەرەنسییەکان کەشوهەوایەکی ئازادیان لە ئیتاڵیا خوڵقاند، ئەمە لای ئیتاڵییەکان بووە مایەی بووژانەوەی گیانی نەتەوایەتی و سەرهەڵدانی رەوتی دووبارە یەکگرتنەوەی وڵات، دیسان بووە مایەی ئەوەی سۆزی نەمساییەکان تێکبشکێ و رووەو هەنگاوی یەکەمی بنیادنانی وڵاتێکی نوێ هەنگاو بنێن، دواتر ئەو کۆمارەی سی ساڵ پێنەکە خۆی دایمەزراند بوو شەو و رۆژ کاری بۆ بڵاو کردنەوەی بنەماکانی ئازادی و یەکسانی دەکرد، ئەوانەی شۆڕشی فەرەنسا لەگەڵ خۆیدا هێنابوون، دواتر بوونە هۆکاری گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی و ئەرکەکانی.

## هەڵمەتی میسر

دوای کشانەوەی نەمسا لە جەنگ، بەریتانیا بە تەنیا لەناو شەڕەکان بە رانبەر بە فەرەنسای شۆڕش مایەوە، خەڵکە میانڕەوەکەش لە هەردوو لادا هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئاشتیانەیان بۆ کێشەکان دەدا.

ئینگلیزەکان شاندێکیان بۆ وتووێژ نارده شاری لیلی فەرەنسی، سەرۆکی شاندی فەرەنسیش (تالیری)ی وەزیری دەرەوەی حکومەتی بەڕێوەبردن بوو، ئەمە یەکەم جاربوو ئەکلیرۆسێک لە سەردەمی هەڵگیرساندنی شۆڕشەوە بچێتە ریزی شۆڕشگێڕەکان و ببێتە ئەندامی پەرلەمان و دواتریش وەزیری دەرەوە لە سەردەمی حکومەتی بەڕێوەبردن. ئەگەر بە هۆی رووداوەکانی ١٧٩٧ نە بووایە، کە لە پاریس رویان دان و تیایدا میانڕەوەکان دەسەڵاتیان لەدەستدا، ئەوا هەردوو لایەنی (فەرەنسی و ئینگلیزی) گەیشتبوونە رێککەوتنێک، بەڵام کاتێک میانڕەوەکان دەسەڵات لە دەست دەدەن و گەلێک لە سەرکردەکانیان پۆست و پایەکانیان نامێنێ، لەوانە کارنۆ، کە چاکەی زۆری بەسەر فەرەنساوە هەبوو لە ئازادکردنی فەرەنسا لە چنگ داگیرکەرە بێگانەکان لە سەردەمی کۆمیتەی رزگاریی گشتیدا، هەروەها خۆشی خاوەنی دامەزراندنی سوپای شۆڕشی نوێ

بوو. دیسان برتلمی خاوەنی داهێنانی مۆرکردنی دانوستانەکانی بروسیا و پەیماننامەی ئاشتەوایەکەی بوو، دوای دوورخستنەوەی ئەم سەرکردانە و چەند سەرکردەیەکی تر باراس لەگەڵ هەندێك لە هەڤاڵانی بە لاوازی لە حوکم مانەوە، بەمەش فەرەنسا بۆ هەڵوێستە توندەکانی گەڕایەوە و پێی لەسەر ئەوە داگرت، کە دەبێت چۆک بە بەریتانیا بدات. ئەمە وای کرد بگەڕێنەوە بۆ هەڵوێستە توندەکانیان، لە ئەنجامدا دانوستانەکان هەرەسیان هێنا و پەیوەندییەکانیان بەرەو ئاڵۆزی رۆیشتن، ئەوەبوو ئیتر هەر یەکە لە لای خۆیەوە هەوڵی خۆئامادەکردنی دابوو بۆ دووبارە بەرپاکردنەوەی شەڕ.

فەرەنسا بۆ ئەم مەبەستە لەشکرێکی تایبەتیی پێک هێنا، ناوی نا لەشکری ئینگلتەرا، بنکەکانیان لە کەنارەکانی فەرەنسای باکوور داکوتا. کەشتیەکیشی بۆ مەبەستی گواستنەوەی لەشکرەکە دروست کرد، کە لە کەناری ئینگلیزەوە بیانگەیەنێتە شوێنی مەبەست، ئەم لەشکرە بە ناپلیۆن سپێردرا تا هێرش بکاتە سەر دوورگەکانی ئینگلیزی، ناپلیۆن تازە بە سەرکەوتویی لە ئیتاڵیا گەڕابۆوە دوای ئەوەی پەیماننامەی کامبۆ فۆرمیۆی ئیمزا کردبوو. ناپلیۆن و گەلێک لە پسپۆرە سەربازییەکان رایەکی تریان هەبوو، ئەوان لەو بڕوایە دابوون، کە بەم شێوەیە ناتوانن شکست بە ئینگلیز بێنن، ئەو ئینگلیزەی خاوەنی سوپایەکی زەبەلاح و چەک و تفاقێکی لەبننەهاتووە، بە ڕای ئەوان دەبووایە لە هێلەکانی بازرگانی وهاتووچۆیان بدەن، بە لێدانی ئەم هێلانە دەتوانن بازرگانی و سەرچاوە سامانیەکانیان پەک بخەن، دیسان ئەمیش لای ئەوان ئاسانتر و کاریگەرتر بوو، بۆ ئەم مەبەستە ناپلیۆن بۆ چەند مەرامێک میسری دەست نیشان کرد:

- میسر دەکەوێتە سەر رێگای سەرەکیی هاتووچۆی هیند، لەوێشەوە دەتوانن هاوکاری بزووتنەوە یاخیبووەکانی موستەعمەرەکانی ئینگلیز بکەن. هەروەها ئەو راپۆرتانەی لە میسرەوە دەهاتن ئاماژەیان بەوە دەدا، کە رژێمی پادشاکانی میسر لەوپەڕی گەندەڵی و ستەمکاری دان و میللەت دەچەوسێننەوە، ئەمەش هاریکارییەکی باشە بۆ وەدەستهێنانی هاوکاریکردنی هاوولاتیان و دەستگرتن بەسەر حوکمدا، بە دەستگرتن بەسەر میسردا سەرکەوتنێکی مەزن بۆ فەرەنسا تۆمار دەکرێت. دەکرێ ئەوەش بڵێین ئاڵۆزی و گەندەڵیی حوکم لە پاریس وای دەویست، کە ناپلیۆن لە ولات دوورکەوێتەوە بۆ ئەوەی کاتێک بە سەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە ولات، بنکەی جەماوەریی فراوانتر دەبێت و ئەوساش

دەتوانێت بە کودەتایەک رژێمی حوکم سەرنگون بکـ. تالیری وەزیری دەرەوەی فەرەنسا بە زیرەکی و بلیمەتی خۆیەوە لەوە گەیشت، کە مەرامی ناپلیۆن چییە و بە چی دەگات، بۆیە چارەنووسی خۆی بە چارەنووسی ناپلیۆن بەستەوە و هانی حکومەتی بەڕێوەبردنی دا پشتگیری لە بۆچوونەکانی ناپلیۆن بکەن و هەرچی ئیمکاناتە بیخەنە ژێر دەستی، بۆ ئەوەی لە ئەجنداکەیدا سەرکەوێت.

لە ١٩ی ئایاری ١٧٩٨ بە نهێنی ناپلیۆن بەندەری تولونی فەرەنسیی جێهێشت و بەرەو دوورگەی مالتا بەڕێکەوت و داگیری کرد، هەر زووش گەیشتە میسر و لەشکرەکەی لە بەندەری (ئەبی قیر)ی رۆژهەڵاتی ئەسکەندەریە دابەزاند و ئەوێشی داگیر کرد، ئەمەش لە ١ی تەمووز بوو. چەند کەمێکی بچووکی سەربازیی لەوێ جێهێشت و بەرە و پایتەخت بەڕێکەوت، لە بنکەی ئەهرامەکان بەسەر لەشکری مەمالیکەکاندا سەرکەوت و دواتر لە قاهیرە گیرسایەوە.

هەر لەو رۆژەی کەشتیگەلی فەرەنسی لە بەندەرەکانیەوە بەڕێ دەکەوێت، کەشتیگەلی بەریتانی بەدوایدا سوور دەخوات، لە ١ی ئاب ئینگلیزەکان هێرشیان کردە سەر فەرەنسییەکان لە ئەبی قیر و بەسەریاندا زاڵ بوون، پەیوەندی لە نێوان کەشتیگەلی فەرەنسا و وڵاتەکەی پچڕا، بۆیە ناپلیۆن ناچار بوو لە رێگەی ئەو زانا و پسپۆڕانەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی کاروباری میسر رێک بخەن لەسەر شێوازی ئەوروپی و فەرەنسی کارەکانیان فێرکەن و بۆیان بسازێنن.

لە کاتێکدا فەرەنسییەکان لە ناوەوە خەریکی بەڕێوەبردنی کاروبارە ناوخۆییەکانیان بوون ناپلیۆن هەواڵی پێگەیشت، کە ئینگلیزەکان لە ئاسیتانە تورکەکانیان رازی کردووە بۆ ئەوەی بەشداری لە جەنگ بکەن و لە دوو رێگاوە هەڵمەت بۆ سەر میسر بێنن. یەکیان لە وشکایی و ئەوی تریان دەریایی، بە یارمەتی کەشتیگەلی بەریتانی لە دەریای ناوەڕاستەوە هێرش بکەنە سەر لەشکری فەرەنسی و بەندەرەکان.

ناپلیۆن وای بە باش زانی لەم هەڵمەتە دەستپێشخەرییەکە هی خۆی بێ، هەر زوو بڕیاری داگیرکردنی سوریا و فەلەستینی دا، چونکە ئەمانە تاکە رێگەن کە لە زەوییەوە بتوانن هێرشی بۆ بێنن. لە ١٧٩٩ هێرشی کردە چەند شارێکی فەلەستینی، هەندێک سەرکەوتنی لێ بەدەست هێنا، بەڵام لە پەرژینەکانی شاری عەکای فەلەستین گیرسایەوە.

بۆ ماوەی چەند مانگێک ئەم شارە گەمارۆ درا، بەڵام هیچ سوودی نەبوو، چونکە لە ناوەوە احمد پاشا سەرکردایەتی هێزەکانی دەکرد و باش خۆی و هێزەکانی قایم کردبوون، دیسان کەشتیگەلی بەریتانی بە فەرمانداریتی سیدنی لە دەریای ناوەڕاستەوە هاوکاریی بەردەوامی دەکردن.

هەر کە گەمارۆکە درێژەی کێشا، نەخۆشی تاعون لەناو سەربازە فەرەنسییەکان بڵاو بۆوە، بە ناچاری هێزەکانی فەرەنسا بۆ میسر کشانەوە، لە ژیانیدا ئەمە یەکەم شکستی ناپلیۆن بوو، لە مانگی تەمووز کاتێک هێزی دەریایی تورکەکان گەیشتنە بەندەری ئەبی قیر، لەگەڵ فەرەنسییەکان ڕووبەڕوو بوونەوە، دوای بەرپابوونی شەڕێکی توند گورزێکی باشیان لە لەشکری تورک وەشاند و تەفروتونایان کردن و لە ناویان بردن، ئەم سەرکەوتنەش بۆ ناپلیۆن قەرەبووی شکستەکەی عەکای کردەوە و ناوبانگیشی راست کردەوە.

لەوکاتەدا بارودۆخەکان لە فەرەنسا بەرەو خراپی دەرۆیشتن بە هۆی ناکۆکی و نەگونجانی سەرکردەکان لەگەڵ یەک و بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و پیلانگێری لەسەر یەکتر، ئەمە لەسەر ئاستی ناوەوە، بەڵام لەسەر ئاستی دەرەوەی فەرەنسا بەریتانیا توانیبووی هاوپەیمانیەکی بەرفراوان دژی فەرەنسا پێک بێنێت و سەرکەوتنەکانی فەلەستینیش بۆ قازانجی خۆیان بقۆزنەوە.

لە یەک هەڵمەتی بچووکدا هاوپەیمانان لە ١٧٩٩ توانیان هەموو ئەو خاکە داگیرکراوانەی، کە ناپلیۆن لە ئیتاڵیا داگیری کردبوون، لێی بسەننەوە. ئەم هاوپەیمانیە ناونرا بە هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی دووەم، کە هەریەک لە روسیای دڵ پڕ لە قین لە ناپلیۆن بە هۆی داگیرکردنی دوورگەی مالتاوە، چونکە ئەوکات لەژێر زێڕەوانی روسیای قەیسەری دابوو. تورکیاش، کە ناپلیۆن یەکێک لە موستەعمەرەکانی (میسر) داگیر کردبوو، تێیدا ئەندام بوون وێڕای هەریەک لە نەمسا و ئینگلتەرا لێی ئەندام بوون، ئەوانە لە شکستەکانی ناپلیۆن چاوەڕوانی ئەوە بوون، کە بتوانن ئەو خاکانەی لە ئیتاڵیا لەدەستیان داون بیان گەڕێننەوە.

هەر کە ناپلیۆن بەم هەواڵانەی زانی، هەر زوو کەوتە خۆ تا بگەڕێتەوە وڵات، ئەوەبوو لە ئابی ١٧٩٩ سەربازەکانی بە فەرمانداریێتی جەنەرال کلیبیر سپارد تا خۆیان کار بۆ دەرچوونێکی سەربڵندانە بکەن لە میسر، لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ گەیشتەوە پاریس.

ئەم هەڵمەتە سەربازییە لە ڕووی فەرهەنگی و شارستانییەوە سوودێکی زۆری هەبوو، سەربازەکان لە میسر کاریان بۆ جولانەوەی ڕۆشنبیری کرد، زاناکانیان چەندین پەرتوکیان لەسەر ئەم وڵاتە بە چاپ گەیاندن، دیسان یەکەم کۆڕی زانستییان لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دامەزراند، لە ئەوروپاشەوە ئامێری چاپی پێشکەوتویان بۆ بردن، دیسان چاکە و جوامێری بۆ ئەوانە دەگەڕێتەوە، کە دەستپێشخەربوون لە بەستنی پەیوەندییەکانی شارستانێتی لە نێوان ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتدا.

## کۆنسولگەری

لە ٩ی ئۆکتۆبەری ١٧٩٩ ناپلیۆن لە کەنارەکانی فەرەنسا دابەزی و لە ١٦ی هەمان مانگیش گەیشتە ناو پاریس، لە پێشوازیە بەسۆزەکەی جەماوەردا، کە لە رێگاوە تا پاریس بۆی وەستابوون بۆی دەرکەوت خەڵک وەکو قارەمان و پیاوی چاوەڕوانکراو سەیری دەکەن، شکستەکانی میسریش لەسەر ئەو نەبۆتە ماڵ و ئەو لێی بەرپرسیار نییە، بەڵکو سیاسەتمەدارانی نیشتەجێ لە پایتەخت لێی بەرپرسیارن. ئەوکاتە حکومەتی بەڕێوەبردن لە تەنگەتاودا بوو، لە لای چەپیەوە لەژێر هەڕەشەی یاقوبییەکانی چالاک و بەهێز لەناو ریزەکانی هەژار و کرێکار و شوانەکان لە پاریسدا هەڕەشەی لێ دەکرا، لە راستیشیەوە فشار و هەڕەشەی پادشاخوازەکان، کە هەرکاتەی هەلیان بۆ برەخسایا بەئاشکرا کاریان بۆ ئەوە دەکرد خانەوادەی پادشایەتی بۆربۆن بگەڕێننەوە سەر کورسیی حوکم، سەرباری نالەباری دۆخی ئابووریی وڵات و بێکاری و بەرزبوونەوەی نرخی کاڵا و شتومەک و بڵاوبوونەوەی دزی و نەبوونی ئاسایش، هەموویان بۆ حکومەت لەمپەر و هۆکاری لاوازی بوون.

ئەوەی راستی بێت حکومەتی بەڕێوەبردن لەگەڵ ئەوەی ماوەی ٥ ساڵی لە تەمەنی بەڕێ کردبوو، ئەوساش نەیتوانیبوو باری ئاسایش و ئارامی چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی فەرەنسا بۆیان فەراهەم بکات، بۆیە خەڵک لەو بڕوایەدا بوو، کە دەبێت دەستێکی بەهێز حوکم بگرێتە دەست، کە لە توانایدابێت ئەم پێویستیانە بۆ خەڵکی فەرەنسا دابین بکات. ئەوکاتەی سەدەی هەژدەهەم دواساڵی بەڕێ دەکرد، خەڵکی فەرەنسا کەسیان شک نەدەبرد ئەم مەرجانەی لێ بەدی بکرێ تەنیا کەسایەتی ناپلیۆن نەبێ، کە تازەکی وەکو خاوەنی سەرکەوتنەکان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا ناسرا بوو.

هەندێک لە سیاسەتمەدارانی شۆڕش، ئەوانەی زیرەکیان پێش ڕووداوەکان دەکەوت لەو بڕوایە دابوون ئەمە تاقە رێگەیە وڵات لەم ئاستەنگە دەربازکات، بۆیە دەستیان لە هەموو بەرنامە تایبەتیەکانی خۆیان هەڵگرت و هەموویان لەو کەڵەپیاوە ئاڵانەوە و چارەنووسی خۆیان لە چارە نووسی ناپلیۆن بەستەوە، دیارە ناپلیۆنیش هەستی بەم بزاوانە کردووە و لە ژێرەوە کاری بۆ جێبەجێکردنی نەخشە و بەرنامەکانی خۆی دەکرد. ناسراوترین کەسەکانیش (سیایاس، ئەو قەشەی لە سەردەمی شۆڕش جلی قەشایەتی

داکەند و چووە ریزی شۆڕشگێڕان بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندییەکانی چینی سێیەم، دژی کلێسا کار و خەباتی دەکرد، دواتر بوو بە باڵوێز و پاشانیش ئەندامی حکومەتی بەڕێوەبردن، کەسە ناودارەکەی تر، تاللیران و فۆچییێ بوون، کە وەکو یاریدەدەر و نزیکترین کەسی ناپلیۆن مانەوە.



سیایاس

## کودەتاکەی برۆمیر لە ٩ی نۆڤەمبەری ١٧٩٩

لە کۆبوونەوەکەی ئەنجومەنی پیران، کە زۆرینەیان پشتگیری (سیایاس)یان دەکرد، سیایاس داوای لە هەردوو ئەنجومەن کرد بەیەکەوە کۆ ببنەوە. رۆژی دواتر بە بیانویەکی بێبنەما ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی پێنج سەدی لە دەرەوەی پاریس لە لێواری (سان کلو) کۆبوونەوە بە بیانووی ئەوەی یاقوبییەکان نیازیانە دژی حکومەتی بەڕێوەبردن کودەتا ئەنجام بدەن. کاتێک ئەنجومەنەکان لە کۆبوونەوە دابوون لە پڕ لەلایەن چەند چەکدارێکەوە شوێنی کۆبوونەوەکە گەمارۆ درا، لوسیان برای ناپلیۆن و سەرۆکی

ئەنجومەنی پێنجسەدی، کە سیایاس لە پیلانەکە تێیوە گلاندبوو، بە هێز بڵاوەی بە کۆبوونەوەکە کرد.

لە ئێوارەی هەمان ڕۆژ کۆمەڵێک لە نوێنەران داوای کۆبوونەوەیان لە ئەنجومەنی پیران کرد، لەم کۆبوونەوەیەدا بەزۆر پرۆژەیاسایەکیان بە ئەندامان پەسند کرد، ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە سپاردنی دەسەڵاتی وڵات بە سێ دەمراست (کۆنسول) لە بری حکومەتی بەڕێوەبردن. ئەنجومەنی پیران بە سوک و ئاسانی ناچاربوو ئەم پرۆژە یە پەسند بکات، چونکە زۆرینەی ئەندامەکانی لایەنگری سیایاس بوون.

خەڵکەکە بەئارامی و بێ کاردانەوە پێشوازیان لەم گۆڕانە کرد، کە بە ناوی کودەتای برۆمیر ناسرا، بە هۆی ئەوەی خەڵک لە حکومەتی بەڕێوەبردن بێزارببوون هیچ داخێکیان بۆی نەخوارد، بوونی ناپلیۆن لە گەڵ ئەم پێکهاتەیە بووە هۆکاری ئەوەی زۆرینەی خەڵک چاوەڕوانی مژدە بن لەم حکومەتە نوێیە.

## دەستووری ۱۷۹۹

بۆ ئەوەی سیمایەکی شەرعی بە کودەتاکە بدەن دەبووایە دەستوورێکی نوێ بۆ فەرەنسا دەربکەن، دەستوورێک بێ لەگەڵ گۆڕانەکان بگونجێت و مەودایەکی فراوانتری دیموکراتی و ئازادی بۆ فەرەنسییەکان دابین بکات. سیاسەتمەدار و بلیمەتی فەرەنسی سیایاس ئەم ئەرک و راسپاردەی گرتە ئەستۆ، دەستوورێکی بۆ فەرەنسا دانا لە مێژووی فەرەنسا بە دەستووری ۱۷۹۹ ناسرا، زۆربەی دەق و بڕگەکانی رەنگدانەوەی بیرکردنەوەکانی ناپلیۆن بوون لەسەر بەڕێوەبردنی دەسەڵات. ناپلیۆن لە سەرەتای شۆڕشەوە لەگەڵ ڕووداوەکانیدا هاتبوو و لە زۆربەشیان بەشداریەکی کاریگەری هەبوو، لەم ماوەیەدا ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی وڵاتدا هەبوو، لەم ماوە درێژەدا گۆڕانێکی زۆر بەسەر بیرکردنەوە و شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ حکومڕان و بەڕێوەبردن و دیموکراتیدا هاتبوو، دەبینین ناپلیۆن لە سەرەتای شۆڕش بڕوای زۆری بە بنەماکانی شۆڕش و شێوازی حکومڕانی هەبوو، کەچی لە دوایین کاتەکانی حکومەت بڕوای بە حوکمی تاکڕەو هەبوو، بە بۆچوونی ئەم بۆ رزگارکردنی وڵات لەم گێرەشێوێن و ئاژاوەی فەرەنسا تێیکەوتووە دەبێت بڕیاری تاکەکەس بڕیاری یەکەم و دوایین بێت. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت

کە دەستبەرداری شۆڕش بوو بێت، چونکە ناپلیۆن لە ڕووداوی کودەتاکەی برۆمیر لاریی نەبوو، بە پاساوی ئەوەی تاکە ڕێگایە بۆ رزگارکردنی فەرەنسایەکی سەقامگیر و دابینکردنی دۆخێکی ئارام بۆ وڵات، بۆ ئەوەی میللەت بتوانێت کاتەکانی خۆی بۆ بنیادنان و بەرهەمهێنان تەرخان بکات، کە ئەمەش یەکێکە لە بنەماکانی شۆڕش، ناپلیۆن بڕوای وابوو تەنیا خۆی دەتوانێت ئەم ئەرکە جێ بە جێ بکات.

ئەوە بوو ئیتر ئەنجومەنی پیران بڕیاری دا دەسەڵاتی جێبەجێکردنی وڵات بداتە دەست سێ دەمڕاست (کونسۆلگەر) بۆ ماوەی ١٠ ساڵ، سەنتەری دەمڕاستی (کونسولی) یەکەمیان بە ناپلیۆن سپارد و دەسەڵاتی ڕاگەیاندنی جەنگ و مۆرکردنی گرێبەست و پەیماننامەکان و دەرکردنی یاسا و دامەزراندنی وەزیر و گەورەبەرپرسانی وڵات و هەروەها بەڕێوەبردنی کاروباری سوپا و حکومەت و کاروباری دەرەوەشیان پێ سپارد. هەردوو کۆنسولەکەی تر وەکو یاریدەدەری دیاری کران، هەریەک لە لیبرۆن و کامبا سیریس بوون، ئەویش خۆی دەست نیشانی کردبوون، چونکە بەدیدی ئەم گوێڕایەڵ و دڵسۆزی خۆی و ڕژێمەکەین، بەم شێوەیە هەموو دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن کەوتنە ژێر دەستی ناپلیۆن.

دانانی یاساکانیش بە سێ ئەنجومەن سپاردران:

١- **ئەنجومەنی پیران:** ئەندامەکانیان بۆ یەکەم جار لەلایەن دەمڕاستەکان (کونسولەکان)ەوە دێنە هەڵبژاردن بۆ ماوەی تا لە ژیان مابن.

٢- **ئەنجومەنی تریبوونێت:** لە سەد ئەندام پێک دێت، هەر ساڵەی بیستیان مافی ئەندامێتی لەدەست دەدەن، ئەرک و دەسەڵاتی ئەمان تەنیا دیراسەکردنی پرۆژەیاساکانە، ئەوانەی لەلایەن کونسولی یەکەمەوە بۆیان دێت، بێ ئەوەی مافی ڕەت کردنەوە یان ڕەزامەندیان لەسەر هەبێت.

٣- **ئەنجومەنی یاسادانان:** لە سێ سەد ئەندام پێک دێت، ئەرک و دەسەڵاتیان تەنیا دەنگدانە لەسەر ئەو پرۆژە یاسایانەی لە ئەنجومەنی تریبۆنێتەوە بۆیان دێن.

کاتێک ئەم دەستوورەیان بۆ گەلی فەرەنسا نمایش کرد، بەزۆرینەی ڕەهاوە دەنگیان بۆ دا، ئەمە لەگەڵ ئەوەی بەم دەستوورە دیموکراتییەت بنچاڵ کرا و هەموو دەسەڵاتەکان لەبن دەستی تاکە کەسێک کۆکرانەوە. بە پێی ریزبەندی دەزگاکان دەسەڵاتەکان بۆ

ئەنجومەنی یاسادانان دەگەڕانەوە، بەڵام بڕوای فەرەنسییەکان و بلیمەتی و داهێنانەکانی سیایاس وای کردبوو دەسەڵاتەکان بەڕێژمیەک بخرێنە بن دەستی کۆنسولی یەکەم، کە لە هی لویسی شازدەهەمی بەر لە شۆڕش زیاتر بن، دواتر متمانەکە بە ناپلیۆن درا نەک بە دەستوور.

## پەیماننامەی لۆنڤیل

وەکو دەمڕاستی (کونسولی) یەکەم مەزنترین ئەرک، کە ڕووبەڕووی ناپلیۆن بۆوە، بەدواداچوونی جەنگی وڵاتانی هاوپەیمانی دووەم بوو (ئینگلتەرا، نەمسا، تورکیا، روسیا ). بەر لەوەی ناپلیۆن دەسەڵاتی فەرەنسا بگرێتە دەست، روسیا بە هۆی ناکۆکیەکانی چۆنیەتی دابەش کردنی هێزی دوو وڵاتەکە لە بەرەکانی شەڕدا بە کردار لە جەنگ کشا بووەوە، چونکە روسیا لە ئابی ۱۷۹۹ لە بەرەکانی باکووری ئیتاڵیا سەرکەوتنی باشی بەسەر لەشکری فەرەنسا وەدەست هێنابوو و مەترسی لە لای نەمساییەکان دروست بوو، کە لە دوارۆژدا روسەکان دەست بەسەر ئیتاڵیاوە بگرن، چونکە نەمسا بە بە شێک لە خاکی خۆی دەزانی، بۆیە نەمسا داوای لە روسیا کرد بەرەکانی ئیتاڵیا بۆ خۆی جێ بهێڵێت و ئەم لە رووی سویسراوە شەڕ لە گەل فەرەنسا بکات. ئەوە بوو لە کاتی گواستنەوەی هێزەکان لە ئۆکتۆبەر فەرەنسییەکان دەستێکی کاریگەریان لە روسەکان وەشاند و تێکیان شکاندن، بووە هۆی ئەوەی روسەکان بەرەی جەنگ جێ بهێڵن. لەسەر ناپلیۆن پێویست کرا شەڕ لەگەڵ نەمسا و بەریتانیا بکات، بۆیە بڕیاری دا یەکەم جار هێرش بکاتە سەر نەمسا. کە جگە لە (جەنەوا) بۆ جاری دووەم ئیتاڵیایان داگیرکرد بوو.

ناپلیۆن لەشکرێکی ئامادە کرد و بەرەو ئیتاڵیا بەڕێ کەوت، لە چیاکانی ئەلب دەرباز بوو بە هەمان نەخشە و پلانی کۆنی هنێبگل، بەم هێرشە هەڕەشەی لە هێلەکانی هاتووچۆی نەمسا دەکرد، لە شەڕی مرنگۆ لە ١٤ی حوزەیرانی ۱۸۰۰ لەگەڵ هێزەکانی نەمسا بە یەک گەیشتن و گورزێکی باشی لێ وەشاند و بەسەریاندا زاڵ بوو. ئەمە یەکەم سەرکەوتنی یەک لە دوای یەکەکانی ناپلیۆن بوو لە سەردەمی دەمڕاستیەکەی (کونسولیە) ، کە دواتر دێینە سەر باسی. ئەم سەرکەوتنەی ناپلیۆن و سەدای پەڕینەوە قارەمانێتیەکەی لەناو خەڵکی فەرەنسا دەنگۆیەکی باشی پەیدا کرد و نەمساییەکانیش

هەر دوای ئەو شکستەیان شکستێکی تریان لە بەرەکانی شەڕ لە ئەڵمانیا خوارد ئەویش لەسەر دەستی فەرماندەی فەرەنسی (مۆرۆ) لە شەڕەکانی هۆهنلەندەن لە مانگی دیسەمبەر. ئەم سەرکەوتنانەی ناپلیۆن نەمسایان ناچار کرد داوای پەیماننامەی ئاشتەوایی بکات، لە ئاداری ١٨٠١هەردوو شاند پەیماننامەیەکیان ئیمزا کرد، گرنگترین ئەو خاڵانەی لەم ڕێککەوتنەدا هاتبوون:

- نەمسا دان بە مافی فەرەنسا دەنێ لە داگیرکردنی هەموو ئەو خاکانەی ئەڵمانیین، کە دەکەونە نێوان سنووری فەرەنسا و ڕووباری راین، واتە هەموو کەنارەکانی چەپی راین.

- نەمسا لە هەموو خاکی ئیتاڵیا دەکشێتەوە و فەرەنسا دەست کراوە دەبێت لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکەی، دان بەو کۆمارانەش دەنێ، کە ناپلیۆن لە سویسرا و هۆڵەندا و ئیتاڵیا لەسەر شێوەی کۆماری فەرەنسا دای مەزراندوون و سەر بە فەرەنساش دەبن.

## پەیوەندییەکانی فەرەنسا - ئینگلیز

دوای سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکەکانی فەرەنسا بەسەر وڵاتانی هاوپەیمانی دووەم، تەنیا ئینگلیزی لە بەردەم مایەوە، ئەویش بە ڕۆژگارێکی نالەباری سەختی ناوخۆدا تێدەپەڕی. ئەوسا هەردوو تیپی شەڕکەر کەوتنە ئەو بڕوایەی، کە دەبێت سنوورێک بۆ کۆتاییهاتنی ئەم جەنگە دابنێن، ئەو کۆتاییەی کە ئەنجام و شێوەکەی روون و دیار نییە.

ناپلیۆن بە هۆی ئەوەی دەریاکان لەژێر پاسەوانی کەشتیگەلی بەریتانی دان بڕوای تەواوی هەبوو، کە لەم سەردەمە لە توانایاندا نییە ئەم بازنە بشکێنن، بۆیە کارێکی ئاستەمە بتوانێت دەست بەسەر بەریتانیادا بگرێت. لە م روانگەیەوە و بە هۆی ئەوەی ناپلیۆن پێویستیی بە ماوەیەکی ئارام و ئاشتییەکی کاتی هەبوو تا روو لە رەوشی ناوەوەی فەرەنسا بکات و سەقامگیرییەک بە ئەنجام بگەیەنێت، بەتایبەت لەو کاتەدا لە سەرتاسەری ئەوروپا باڵادەستە و دەکرێت سوود لەم کەشوهەوایە وەرگرێ بۆ دووبارە بنیادنانەوەی ژێرخانی ئابووریی وڵات.

لە ئینگلتەراش بارودۆخی ناوخۆی وڵات وای دەسەپاند بەدوای پرۆسەی ئاشتەوایی لەگەڵ ناپلیۆندا بگەڕێن، خەرجییەکانی شەڕی هەردوو هاوپەیمان (یەکەم و دووەم) بەسەر

خەڵکی ئینگلتەرای فەرز کردبوو باجی زیاتر بدەن، دیسان لەسەر خەزینەی دەوڵەت زۆر کەوتەوە، هەروەها ئیرلەندا لەژێر تاجی پادشای بەریتانی دایە، شۆڕشی ئەوانیش خەریکبوو هەڕەشەی لە یەکپارچەیی نەتەوەی بەریتانیا دەکرد، ئیرلەندیەکان دەمێک بوو لە ڕێگەی یاخیبوون و شێوازەکانی تردا داوای سەربەخۆییان دەکرد، هەرکاتێک هەلیان بۆ ڕەخسابا، بەتایبەت هەر کە بەریتانیا لەگەڵ دەر و دراوسێکان دەیکردە شەڕ، ئەمان ئەم هەلەیان دەقۆستەوە وەکو ئەوەی ساڵی ١٧٩٨ پێی هەڵسان و داوای سەربەخۆییان کرد.

بۆ ئەوەی کەمێک هێور و کپ بکرێنەوە و بەریتانیاش بە شەڕەکانی فەرەنساوە خەریک بێت، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ولیەم بیت هەندێک بەپەر داخوزیەکانیانەوە چوو، لەوانە پادشای رازی کرد ڕێگە بە ئیرلەندیەکان بدات نوێنەری خۆیان بنێرنە پەرلەمان، تا لە مافە سیاسیەکانیان لەگەڵ ئینگلیزەکان یەکسان بن. ئەمە جێبەجێ کرا و یەکەم کۆبوونەوەی هاوبەش لە جەنیوەریی ١٨٠١ بەسترا. لەو کاتەوە ئینگلتەرا ناوی میرنشینە یەکگرتووەکانی هەڵگرت، بەڵام ئیرلەندییەکان بەمە نەوەستان و داوای یەکسانیەکی تەواوەتیان دەکرد، بەڵام پادشا ئەم داواکاریەیانی ڕەت کردەوە بە پاساوی ئەوەی نابێ ئیرلەندییە کاسۆلیکەکان لەگەڵ ئینگلیزە پرۆتستانەکان یەکسان بن. سەرۆکوەزیران ولیم بیت پێی خۆش بوو گوێی لە داواکاریەکەیان بگیرێ، بۆیە دەبینین لە ٥ی شوباتی ١٨٠١ دەستی لەکار کێشایەوە، کە لە ١٧٨٣ وە ئەم پۆستەی گرتبووە دەستۆ. دەکرێ مەزندەی ئەوە بکەین هۆکارەکانی دەستلەکارکێشانەوەی بۆ ئەوەش بگەڕێتەوە، کە پێی باش بوو پەیمانی ئاشتەوایی لەگەڵ فەرەنسا مۆر بکرێت، چونکە وڵات پێویستیی پێیە، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت شوێن بۆ کەسێکی تر چۆڵ بکات بەم ئەرکە هەڵسێت، دیارە خۆی ماوەی نزیکەی ١٠ ساڵ لەگەڵ فەرەنسا درێژەی بە پرۆسەی جەنگ دابوو، بەم ئەگەرەوە بۆ ئەم کارێکی قورسە هەمان پرۆژەی ئاشتەواییش بەرێوە بەرێت.

سەرۆکوەزیرانی نوێی بەریتانی درێژەی بە دانوستانەکان دا و بە هۆی پێویستی هەر دوو لایەن بە پرۆسەی ئاشتەوایی، دانوستانەکان زوو کۆتاییان پێ هات. لە شاری ئامیانی فەرەنسی لە ٢٥ی ئاداری ١٨٠٢ هەردوو شاندەکە لەسەر مەرجەکانی ئاشتبوونەوە

گەیشتنە رێککەوتنێک، دیارترین ئەو دەقانەی لەناو رێککەوتنەکە دا هاتبوون بریتی بوون لە:

١- ئینگلتەرا دان بە سنووری سروشتیی فەرەنسا دەنێ، کە بەلژیک وهۆڵەندا و هەندێک لە خاکی کەناری چەپی ڕووباری راین دەگرێتە خۆ.

٢- ئینگلتەرا بە مانەوەی فەرەنسا لەناو خاکی ئیتاڵیا و بوونی ئەو کۆمارانەی (کۆمارەکانی برا) لەسەر شێوەی سیستەمی فەرەنسا دروست کراون، رازی دەبێ.

٣- بەریتانیا گفتی ئەوە دەدات دوورگەی مالتا بۆ خاوەنەکانی بگەڕێنێتەوە، کە سوارچاکانی مالتان، کە روسیای قەیسەر چاودێری و پاسەوانیی دەکرد. دیسان گفتی ئەوەشی ددا هەموو دەستکەوتە موستەعمەرەکانی فەرەنسا بگەڕێنێتەوە وەکو هۆڵەندا و ئیسپانیا، تەنیا دەست بە دوورگەی سیلان و دوورگەی ترینیداد لە دوورگەکانی هیندی رۆژئاوادا بگرێ.

٤- فەرەنساش گفتی ئەوە دەدات لە میسر بکشێتەوە و بۆ تورکە عوسمانییەکان بیگەڕێنێتەوە، هەروەها لە ناپۆلی و خاکەکانی پاپاش.

ئەم پەیماننامەیە بە لوتکەی دەستکەوتەکانی ناپلیۆن لە سەردەمی دەمڕاستی دادەنرێن، چونکە بەم پێکهاتنە فەرەنسا ئەوەی دەستی کەوتبوو بریتی بوو لە: دانپێدانانی ئینگلیز بە سنوورە نوێکەی، رژێمی کۆماری، دەستبەرداربوونی رژێمی پادشایەتی و هەموو ئەو گۆڕانانەی لە دوای شۆڕشی فەرەنساوە رویان دابوو، کە هەردەم ئینگلیزەکان ئەمانەیان رەت دەکردنەوە. هەر لە دوای حوکمی لویسی چواردەمەوە چەندین جار لە پێناو رەتکردنەوەیاندا رێگەی شەڕ و جەنگیان لەگەڵ فەرەنسییەکان گرتۆتەبەر، چونکە ئینگلیزەکان لایان گرنگ بوو ئاڵای هیچ وڵاتێکی مەزن لە کەنارەکانی بەرانبەر بە بەریتانیا لە بەلژیک بەرز نەکرێتەوە.

هەروەها دانیان بە مافی فەرەنسییەکان نا لە ئیتاڵیای خاوەن کەناری پان و بەرینی پڕ بایەخ لە دەریای سپیی ناوەڕاست، ئەمەش پێشان یەکێک لەو خاڵانە بوو، کە ئینگلتەرا هەرگیز ئامادە نەبوو پێی رازی بێت، چونکە فەرەنسا وڵاتێکی دەریاوانیی مەزنی دراوسێیە.

## چاکسازییە ناوخۆییەکانی بۆناپارت

ئەوەی لە حکومەتی بەڕێوەبردن بۆ ناپلیۆن لە ئەنجامی شەڕە دەرەکیی و شۆڕشە ناوخۆییەکاندا مابووەوە کۆمەڵگایەکی فەرەنسیی ماندوو و ژێرخانێکی لە بارچوو بوو، بێبڕوا و ناسەقامگیری سیاسی و خوێنڕشتن و حەزە کەسیەکان، نائارامی و تۆقاندن و توندوتیژی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو، کۆمەڵگا هەموو بنەما کەلتووریی و نەریتیی و ئایینیەکانی لەدەست دابوو، کەس حەزی لە باسکردنی رابردوو نەدەکرد، بۆیە رێگایەکی سەخت و دژوار و نالەبار لەبەردەم ناپلیۆن بوو.

دوای ئەوەی بە هەوڵ و بلیمەتی خۆی توانیی سەروەرییەکانی دەرەوەی فەرەنسا لەسەر هەموو خاک و سنووری سروشتی فەرەنسا بگەڕێنێتەوە، دەبووایە لە ناوەوەش سیستەمێکی سەقامگیر و ئارام بۆ خەڵکەکە دابین بکات و کار بۆ چەسپاندنی بنەما سیاسییە نوێکانی شۆڕش بکات.

ئەوەی لەم هەوڵە یاریدەدەری ناپلیۆن بوو ئەو متمانە و بڕوایەی خەڵکی فەرەنسا بوو، کە پێیان بەخشی بوو. دەبینین لە ١٨٠٠ لە هەڵبژاردنێکی جەماوەریی ئازاددا بە دەمڕاستی یەکەمی فەرەنسا بۆ ماوەی ١٠ ساڵ هەڵدەبژێردرێت. دواتر هەمان جەماوەر لە ١٨٠٢ دووپاتی دڵسۆزی و متمانەی خۆیان بۆ کردەوە، ئەم جارەیان بۆ ماوەی تا لە ژیاندا ماوە وەکو دەمڕاستی (کونسول) یەکەمی فەرەنسا هەڵی دەبژێرن. دیارترین پاشکارەکانی ناپلیۆن لە بواری رێکخستنی ناوخۆ و چاکسازی بریتن لە:

**١- چاکسازی بەڕێوەبردن**

بە یاسایەک، کە لە ١٧ی شوباتی ١٨٠٠ دەریکرد، توانیی وڵات لە رووی بەڕێوەبردن رێک بخات. بە پێی ئەم یاسایە وڵات بەسەر چەند ناوچەیەکی بەڕێوەبردندا لە شێوەی بەڕێوەبردنی کۆن دابەش کرد، کە ئەنجومەنی نیشتمانیی لە دەستپێکی شۆڕش دەری کردبوو. بەڵام بە پێویستی نەزانی فەرمانڕەواکان لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێن، بەڵکو خۆی دای مەزراندن. لەم بڕیارەی دا دوو مەبەستی هەبوو: یەکەمیان ئەم کاربەدەستانە لە ململانێی سیاسیی حزبەکان دوور بخاتەوە، دووەمیشیان بۆ ئەوەی ئەم حاکم و فەرمانبەرە کاربەدەستانە ڕاستەوخۆ بە خۆیانەوە ببەستێتەوە و لەم رێگەیەوە دەسەڵاتێکی بەهێزی توند دابمەزرێنێت، کە لە سەنتەرەوە کارەکان بەڕێوە ببردرێن، دیارە ئەمەش هەر بۆچوونی

ناپلیۆن خۆی بوو بۆ بەڕێوەبردنی حکومڕانی. بە مەبەستی پیادەکردنی بنەما دیموکراتییەکان لەتەک ئەم فەرمانڕەوایانەش بۆ هەر یەکەیان لێژنەیەکی هەڵبژێردراوی راوێژکاری دانرا، کە گرنگی بە کاروباری دارایی و باجەکان بدات. بۆ داکۆکیکردنیش لە مافی هاووڵاتیان وەکو ناوبژیوانێک لە یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوان فەرمانڕەوایانی بەڕێوەبردن و هاووڵاتیان دادگایەکی بەڕێوەبردن دامەزرا، تا لە کاتی پێویست هاووڵاتیان پەنای بۆ بەرن.

بە کورتیەکەی لەم سیستەم و پرۆسەیەدا ناپلیۆن مەبەستی ئەوە بوو حوکمێک لە پاریس ببات بەڕێوە توانای کۆنترۆڵکردن و دەسەڵاتی تەواوی هەبێت، لە هەمان کاتدا مافی هاووڵاتیش لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ پێشێل نەکرێت.

ئەم رێکخستنە ئەگەر بکەوێتە بواری پراکتیکەوە جوانترین شێوازی حوکم و یەکسانی کۆمەڵایەتی و پەیدابوونی دەرفەتی کار بۆ هاووڵاتی دەڕەخسێت، بەم سیستەمەش هەموو هاووڵاتیەکی فەرەنسی بەبێ جیاوازی ئایین یان چین پیادەی مافەکانی خۆیان دەکەن، بەم پێوەرە هەردەم کەسی شیاو لە شوێنی شیاو دادەنرێت. لەبەر رۆشنایی ئەم بنەمایانە چەندین زانا و بلیمەت و پسپۆرو گەورە بەرپرس و فەرمانبەری زیرەک، کە لە هەڵبژاردەی پیاوانی ئەوروپای سەدەی نۆزدەهەم بوون، لە دەوری ئەم پرۆژەیە کۆبوونەوە.

## کۆنکۆرداتۆ

ناپلیۆن پیاوێکی ئایینپەروەر نەبوو، تەنانەت باوەڕداری هیچ ئایینێکیش نەبوو، بەڵام ئەو کاریگەری ئایینی کریستیی لەسەر دەروونی جەماوەری فەرەنسای دەزانی، بە تایبەتی لەناو ریزەکانی جوتیار و گوندنشینەکان هەستی بەو پابەندە نەریتە ئایینیەی ئەوانی دەکرد. ناپلیۆن بڕوای بە یەکگرتنی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان هەبوو، ئەم لەو هەڵوەشاندنەوە کۆمەڵایەتیە بێزار بوو، کە لە سەردەمی شۆڕش کۆمەڵگای فەرەنسا تێی کەوتبوو، بڕوای وابوو ئایین فاکتەری سەرەکیی ئەم یەکگرتنە کۆمەڵایەتییە، هەردەم دەیگوت (ئایین نهێنی سیستەمی کۆمەڵایەتییە ).

لەم روانگەیەوە ئەم دەیویست پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەت و کڵێسا خۆشکاتەوە، دوای ئەو دوورکەوتنەوەیەی لە ئەنجامی یاسای ئەکلیرۆس رویدابوو، بۆ ئەوەی هەم سەرورییەکان بۆ ئەکلیرۆس بگێڕێتەوە و هەم دەستکەوتەکانیش بۆ حکومەت بە زیندویی بهێڵێتەوە. لە پشت ئەم هەنگاوەیدا مەرامێکی تریشی هەبوو، ئەویش بە گەڕاندنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ کڵێسا نەیارانی حکومەت و شۆڕش لاواز دەکات، ئەو وڵاتانەی کە دەخرێنە سەر فەرەنسا وەکو: بەلژیک، ئەوانیش دانیشتووانەکەی کریست و کاسۆلیکن و ناکرێت ڕێز لە ئیرادەی ئەوانیش نەگیرێ. بۆیە هەر ڕێککەوتنێک لە نێوان ناپلیۆن و ئەکلیرۆس پێگەی ناپلیۆن باشتر دەچەسپێ، دواتر دەبێت ئەوە بزانین، کە زۆربەی فەرەنسییەکان کاسۆلیکن، پەیوەندیکردنیان بە شۆڕشەوە ئەوە ناگەیەنێت دەستبەرداری ئایینەکەیان بوونە، بە دیدی ناپلیۆن گەڕانەوەی کڵێسا بۆ درێژەدان بە مەساجە کریستیەکەی ڕەزامەندی زۆربەی فەرەنسییەکان وەدەست دێنێت.

دوای دانوستانێکی چڕ و پڕ لە سەرئێشە و گرفت لە سەردەمی پاپا بیۆسی حەوتەم لە ١٦ی تەمووزی ١٨٠١ هەردوو لا گەیشتنە ڕێککەوتنێک، لەلایەن کڵێساوە کەردینال کۆنسالڤی بە نوێنەرایەتی پاپا ڕێککەوتنی کۆنکۆرداتۆی لە شاری پاریس واژوو کرد.

بە پێی ڕێککەوتنی کۆنکۆرداتۆ فەرەنسا دان بە سەروەری ڕۆحیی کڵێسای کاسۆلیک دەنێت وەکو ئایینی زۆرینەی فەرەنسییەکان. ڕێگەش بە ئەکلیرۆس درا نەریتە ئایینیەکانی خۆیان لە سەرتاپای فەرەنسا بە ئاشکرا پیادە بکەن، بە پێدانی مافی دەوڵەت لە دەستتێوەردان بۆ پاراستنی باری ئارامی دۆخە گشتییە کانی وڵات.

لە بەرانبەریشدا پاپا دان بە مافی فەرەنسا دەنێت بۆ فرۆشتنی ئەملاکی ئەکلیرۆس، کە کاتی خۆی دەستی بەسەردا گیرابوو، بە مەرجێک دەوڵەت موچەی پیاوە ئایینیەکان دابین بکات و دەمڕاستی (کونسول) یەکەمیش قەشە و ئەسقوفەکان دادەمەزرێنێت پاش ئەوەی پاپا رابۆبانک لێیان رازی دەبێت.

کە بڕگەکانی ئەم ڕێککەوتنە پیادە کران کڵێسا لە فەرەنسا کەوتەوە کارکردن، بەڵام نەک وەکو جاران، ئەم جارەیان سەربەخۆیی خۆی لەدەست دابوو و جڵەوەکان لەدەست دەسەڵاتی سڤیلی وڵات بوون.

بەهەرحاڵ ئەم ڕێککەوتنە ڕووبەڕووی نارەزاییەکی زۆری چینی ڕۆشنبیر و کۆنەبەرپرس و ئەفسەرەکانی فەرەنسا بووەوە، بە تایبەت ئەوانەی لەژێر کاریگەری رەوتی ئازادی دابوون، کە لە پەرتوکی سەدەی هەژدەهەم کەوتبوونەوە، بەڵام ناپلیۆن ئەم هەموو دژایەتیەی تێپەڕ کرد و بڕگەکان کەوتنە قۆناغی جێبەجێکردن.

## یاسای سڤیلی بۆ فەرەنسییەکان

ئەم دەستکەوتە یاساییە بە مەزنترین دەستکەوتە شارستانیەکانی ناپلیۆن دەژمێردرێت. حکومەتی شۆڕش پێش ناپلیۆن هەوڵی زۆری دابوو، کە هەموو یاسا و بڕیارە کۆن و نوێکان لە یەک چەمکدا کۆبکاتەوە و دیراسەیەکی رواڵەتییان بکات، تا ئەوەی بەسەر چووە هەڵیان وەشێنێتەوە، ئەوەی پێویستی بە هەموارکردن هەیە چاکیان بکا، تا لەگەڵ بارودۆخی ئێستا بگونجێن، بەڵام لەم کارەیان سەرکەوتوو نەبوون. ئەمە ئەرکێکی مەزن بوو ناپلیۆن گرتیە ئەستۆی، بۆ ئەم کارە لە ئابی ١٨٠٠ لیژنەیەکی لە یاسازانە هەرە مەزنەکانی فەرەنسای ئەوکات پێک هێنا.

ئەم پرۆژەیە لەلایەن ناپلیۆنەوە بایەخی زۆری پێدرا، زۆرجار لە دانیشتنی داڕشتنی دەقەکان بەشداریی دەکرد، هەندێک جاریش لە دانیشتنی دیباجەکانیش بەشدار دەبوو و تیایدا هەڵوێستی دیاری وەردەگرت.

لە بڕگەکانی ئەم یاسایە زۆر لە رەنگدانەوەی بۆچوونەکانی ناپلیۆنی پێوە دیاربوون، وەکو: جەختکردن لەسەر دەسەڵاتی باوکسالاری بەسەر منداڵ و هاوسەر.

چونکە ناپلیۆن خێزانی بە پیرۆز دە بینی، وەکو شانەیەکی بنەڕەتیی کۆمەڵی دەناسی، لە چوارچیوەی ماڵ و منداڵ و موڵکداری بڕوای بە باوکسالاری هەبوو، بۆ پاراستنی بێگەردی خێزان منداڵە ناشەعییەکانی لە مافی میرات بێبەش کردبوون. یاساکە دانی بە هاوسەرگیری مەدەنی هێنابوو، کە لە یاساکانی شۆڕشی فەرەنسی دابوون، مافی تەلاقیشی هێشتبوەوە، بەڵام زۆری بەرتەسک کردبوو، ئەویش دیسان لە پێناو پاراستنی شیرازەی خێزان بوو.

لە بواری ئازادییە گشتییە کانیشدا رێگەی بە و ئازادیانە دابوو، کە شۆڕش رێی پێی دابوون، لەوانە: ئازادیی رادەربڕین و ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی کارکردن، دیسان دادپەروەری و یەکسانی لە بەرانبەر یاسا بۆ فەرەنسییەکان دەستەبە رکرد لەگەڵ پاراستنی سیستەمی عەلمانییەت.

هەرچەندە یاسای مەدەنی مافی هەبوونی موڵکیەتی رەهای بۆ هەمووکەس مسۆگەر کردبوو، ئەمەش دیارە لە بەرژەوەندی بۆرجوازەکاندا بوو، بەڵام ناپلیۆن شتێکی وای کرد، کە مافی دەوڵەتیش لەم بەینە تێنەچێت. لە بڕگەیەکدا مافی بە دەوڵەت دابوو، کە هەموو ئەو شتەی لەژێر زەویە، موڵکی دەوڵەتە و مافی ئەوەشی هەیە بەکاری بهێنێت و بۆ بەرژەوەندی گشتی دەتوانێ دەست بەسەر هەموو موڵکێکدا بگرێت.

لە ساڵی ١٨٠٤ ئەنجومەنەکانی یاسادانان لە دیباجەی یاسای مەدەنی بۆ فەرەنسییەکان تەواو بوو، لە ٢١ی ئاداری ١٨٠٤ بڕیاری لەسەر درا و لە رۆژنامە فەرمییەکان بڵاو کرایەوە. بەم شێوەیە لە سەردەمی یۆستیانۆسەوە تا ئەمڕۆ فەرەنسا بۆ یەکەمین جار بوو بە خاوەنی باشترین کۆمەڵە یاسایەک، کە تیایدا نەریتە کۆمەڵایەتی و ئاینییەکانی پارێزراو بێت، لەگەڵ یاساکانی عەلمانی بە دەوڵەمەندکردنی بە هەندێک یاسای دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ئازادیی هاووڵاتیان.

## فێرکردن

ناپلیۆن دیراسەیەکی تایبەتیی باری فێرکردنی فەرەنسای کرد، کە ئەوسا بەقەدەر ئێستا ئاڵۆز و بە ئاستەنگ نەبوو، رێنمایی و شێوازی پەروەردەشی لە بیر و هزری خۆی سەرچاوەیان گرتبوو. بە هۆی گرانی باری فێربوونەوە ناپلیۆن ئەوەندە گرنگیی بە فێرکردنی سەرەتایی و ژنان نەدەدا، ئەوکاتیش هێشتا رای گشتیی ئەوروپا نەگەیشتبووە ئاستی ئەو تێگەیشتنەی، کە فێربوون بە مافی سروشتیی هەموو هاووڵاتیەک بزانێت. ئەوە نییە کەڵەپیاوی رزگارکردنی ئەورووپا لە سەدەی هەژدەهەم ڤۆلتێر دەیوت: "فێرکردنی هەژاران تەنیا ئاژاوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی وەبەرهەم دێنێ." لەم رووەوە دوای رێککەوتنی کۆنکۆرداتۆ کڵێسا توانیی سوود لەم هەلە وەرگرێت منداڵ و کەمدەرامەتان فێری خوێندن بکات، لەم بوارە کۆمەڵەی برایانی قوتابخانەی کریستەکان رۆڵی باشی

دەگێڕا. هەروەها دامەزراوە رەبەنیەکانی تر بایەخیان بە بواری فێرکردنی کچان دەدا، سەرەڕای بەشداریکردنی کارای شارەوانییەکان لەم هەڵمەتە بۆ فێرکردنی خوێندنی سەرەتایی.

بۆ بواری فێرکردنی خوێندنی دواناوەندیش چەندین خوێندنگای دواناوەندیان لەسەر بوودجە و ئەرکی دەوڵەت کردنەوە، کاریان بۆ ئامادەکردنی چەندین کادیری شارەزا کرد تا خزمەت بە دەوڵەت بکەن، سیستەمی خوێندنی خۆڕایی بەشێکی زۆر بە منداڵی ئەفسەر و فەرمانبەرانی دەوڵەت دران لە پای خزمەتکردنی باوکیان بە دامەزراوەکانی دەوڵەت، بەشێکیش لە خوێندنی خۆڕایی درا بە بەهرەداران. بوونی خوێندنگای دواناوەندی (لیسس)ی فەرمی رێگە لە بەردەوامبوونی خوێندنگا دواناوەندییە کانی تر ناگرێت، ئەوانەی سەر بە دەزگا تایبەتیەکان بوون، بەڵکو ئەو خوێندنگایانەش خرانە ژێر چاودێری فەرمانگا فەرمیەکانی وڵات.

لە ساڵی ١٨٠٨ بۆناپارت دانیشگایەکی دامەزراند، کە کاری بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی و رۆشنبیری و زانستی باڵا و رێکخستنی پێ سپارد، دەرماڵە و بوودجەکەشی لە گەنجینەی دەوڵەت دەردەکرد.

## ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی

ئاسان نییە لە نیازی سەرکردە فەرەنسی و ئینگلیزەکان بگەیت، ئەوانەی پەیماننامەی ئاشتەواییان مۆرکرد، ئاخۆ بۆ یەکتر چیان لە دڵە. ئایا بە ڕاستی مەبەستیان ئاشتیەکی هەمیشەییە لە نێوان هەردوو تیپی ناکۆک بۆ ئەوەی باری قورسی سەر ئەوروپا کەم کاتەوە، یان لایەنێک دەیەوێ بە ئاشتیەکی کاتی گیروگرفتە ناوەخۆییەکانی چارەسەر بکات، ئەوسا دەرفەت لەوی تر وەرگرێ؟ ئەمە سەلمێنرا کە پرۆسەی ئاشتەوایی تەنیا ئاگربەستێکی کاتییە، تەمەنی لە ساڵێک رەت ناکات. ئەوەی مسۆگەر بوو، هەردوو لایەن بە گوێرەی بۆچوون و بەرژەوەندییەکانی تایبەتیی خۆیان بڕگەکانی ئەم رێککەوتنە شی دەکەنەوە و مامەڵەیان لەگەڵ دەکات. ئەم دیاردەیە ئەوەی سەلماند، کە گەڕانەوە بۆ مەیدانی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە لێدەرچوونی بۆ نییە چ زوو چ

درەنگ، ئەمە وای لە مێژوونووسە بێلایەنەکان کرد هەردوو لایەن بە لەناوبردنی پرۆسەی ئاشتەوایی و گەڕانەوە بۆ جەنگ تاوانبار بکەن.

## ئابووری

ئینگلتەرا ئومێدی بە پرۆسەی ئاشتەوایی هەبوو بەوەی بازاڕەکانی گەردوونی ناپلیۆن، کە کۆمەڵێک موستەعمەر و وڵاتانی ئەو دیو دەریا بوون بە ڕوی بازاڕەکانی ئینگلتەرا بکرێنەوە و بۆ سوودی خۆی قۆرخیان بکات.

دوای کۆتاییهاتن بە شەڕەکان بازاڕەکانی فەرەنسا پێویستی زیاتریان بە کاڵای بەریتانی هەبوو، چونکە کارگەکانی فەرەنسا بە دروستکردنی کەشتییەوە خەریک بوون، بە هۆیەوە گەلێك لە چالاکییەکانی تری بازاڕ وەستابوون، بە بەجووڵەکەوتنی بازاڕی بەریتانی گەلێک دەنگی ئۆپۆزسیۆن کپ بوون، بەتایبەت ئەوانەی بڕوا و متمانەیان بە ناپلیۆن نەبوو درێژە بە ئاشتی بدات.

بەڵام ناپلیۆن لە بواری ئابووری بۆچوونێکی تری هەبوو، ئەو دەیویست سوود لە پرۆسەی ئاشتەوایی وەرگرێت بە دابینکردنی سەرمایەیەکی باش و ئابوورییەکی پتەو، کە لە ماوەدایەکی دوور ئامانجە ستراتیژیەکانی وڵات بە ئاکام بگەیەنێت و بێکاریی کەم کاتەوە و ئاژاوەچی و تێکدەرانیش بنبڕ کات. ناپلیۆن زیاتر گرنگی بە پیشەسازی دەدا، چونکە بە دیدی ئەم لەلایەک کرێکاری هەڵدەمژی لە لایەکی تریش دابینکردنی کەلوپەلی ئیستهلاکی بۆ وڵاتە موستەعمەرەکانی دابین دەکات، کە لەم ڕێگەیەوە پەیوەندیان لەگەڵ وڵاتی دایک باشتر دەبێت، هەروەها یارمەتی بەهێزکردنی ئامێر و پێداویستیەکانی جەنگیش بە بەردەوامی دەدات.

لە ساڵی ١٨٠٠ (نووسینگەی ئامار)ی دامەزراند و بایەخی زۆری پێدا بوو، ئەرکی سەرژمێری تواناکانی فەرەنسا و بەروبوومە کشتوکاڵییەکان و پیشەسازی و سەرژمێری دانیشتووانی پێ سپارد، وێڕای سەرژمێری داهاتە سروشتییەکان و بازاڕەکانی ناوخۆ و دەرەوەی ئێستا و دوارۆژ.

لە دەست بەکاربوونیدا ئەنجامی باشی لێ وەدی دەکرا، بۆ ئەم بیرۆیە جەخت لەسەر کاری بەیەکبەستنەوەی هەرێمەکان کرا لە رووی ئابوورییەوە، هەر بە پەرەپێدانی

پیشەسازییەکان نەوەستا بایەخیان بە جوانکارییش دا، کە ئینگلیزەکان بازاڕەکانی فەرەنسایان لێ پڕ کردبوو. ئەمە لای بەریتانییەکان بە نیازی خراپی فەرەنسییەکان لێکدرایەوە، دواتر باجی زۆری خستە سەر کاڵاکانی بێگانە، کە بۆ ناو فەرەنسا و موستەعمەرەکانی دەهاتن. ئەم هەڵوێستەی فەرەنسا کاردانەوەی خراپی لەسەر بازاڕەکانی بەریتانیا دروست کرد، چونکە ناپلیۆن نەخشەی بۆ ئەوە داڕشتبوو، کە نەتەوەی فەرەنسا ببێتە نەتەوەیەکی پیشەسازیست و بازرگانیست، ئەم هەنگاوانەی ناپلیۆن پاساوی باشی دایە دەست ئینگلیزەکان تا پەیماننامەی ئاشتەوایی هەڵوەشێننەوە.

## ئیمپریالیزم

دوای مۆرکردنی پەیماننامەی ئاشتەوایی ناپلیۆن بایەخی زۆری بە موستەعمەرەکانی دا، لەشکرێکی ناردە سەر موستەعمەرەی سانتۆدمینگۆ بۆ دامرکاندنەوەی ئەو شۆڕشەی لەوێ بەرپا ببوو. بەڵام مەزنی هەڵمەتەکە لە رووی سەربازییەوە لەگەڵ ئامانجەکە نەدەگونجا و گەلێک نابەرانبەر بوون، گومانی لای بەریتانیەکان دروست کرد، کە ناپلیۆن لەم هەڵمەتەی دا مەرامێکی شاراوە و لەوە مەزنتری لەودیو دەریاوە هەبێت. ئەوەی گومانەکانی کردنە بڕوا مانەوەی فەرەنسییەکان بوو لە موستەعمەرەی لویزیانای ئەمریکیی بە پیت و بەرەکەت، کە ئیسپانیا لە ١٨٠٠ دەستی لێ هەڵگرتبوو.

بەبەردەوامی ناردنی شاندی فەرەنسی بۆ ئەستەنبۆل ئینگلیزی ناڕەحەت کردبوو، ئەم کارەی فەرەنسییەکان بە مەبەستی خۆبەهێزکردن لە رۆژهەڵات لێک دەدرایەوە، دواتر سەردانەکەی نێردراوی ناپلیۆن جەنەراڵ سیبستیانی بۆ میسر و ئەو پێشوازییە گەرمەی لێی کرا، کە رۆژنامەکانی فەرەنسی زۆر بەسەرکەوتویی ناویان دەبرد، سەرباری هەموو ئەمانە بۆناپارت پەیماننامەیەکی دۆستایەتیی لەگەڵ هەریەک لە تەرابلسی رۆژئاوا و تونس و جەزائیر مۆرکرد.

ئەم چالاکییانە بوونە بەڵگەی تەواو لای ئینگلتەرا، کە ئیتر فەرەنسا نیازی فراوانخوازیی هەیە و بەنیازە تەرازووی هێزەکان لە ئەورووپا لە بەرژەوەندی خۆی بگۆڕێت. بۆیە بەباشی زانی چەند بیرکردنەوەیەک بۆ کاردانەوەی ئەم هەنگاوانەی فەرەنسا بکات،

ئەوەبوو بە فەرەنسای ڕاگەیاند کە: بە نیاز نییە دوورگەی ماڵتا، کە لە پەیماننامەکەدا هاتووە بەر لە ١٠ ساڵ، چۆڵ بکات و پاشگەزبوونەوەی خۆی لەم خاڵە پێ ڕاگەیاند، چونکە بە چۆڵکردنی ئەم دوورگەیە بە تەواوەتی کۆنترۆڵی دۆخەکەی لە دەست دەردەچێت و دەکەوێتە دەست فەرەنسا، دیارە فەرەنساش لەم ئانوساتەدا بەریتانیای بە لاواز دەبینی و پێی ئاسایی نەبوو سەر بۆ حەز و مەرجەکانی بەریتانیا دانوێنێت.

## ئەوروپا

ناپلیۆن لەوە گەیشت، کە مۆرکردنی پەیماننامەی ئامیان لەگەڵ ئینگلیز مانای بەرزکردنەوەی ئاڵای سپی و خۆوەدەس دانە و دیسان دەستوالاکردنی ئینگلیزە بە هەوەسەتی خۆی دەست لە ئەوروپا وەر بدات. ڕازیبوونی بەریتانیا بە بەرزکردنەوەی ئاڵای فەرەنسا لەسەر خاکی بەلژیکی بەرانبەر بە کەنارەکانی، مەگەر نیشانەی لاوازی بەریتانیا نەبوو؟ ئەمە ویستی ناپلیۆن بوو.

لە ئیتاڵیا بۆ بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا چەند هەنگاوێک نران، هەموویان دژی بەرژەوەندییەکانی نەمسا و بەریتانیا بوون، کتومتیش دژی بڕگەکانی پەیماننامەی ئامیان بوون. بەم هەنگاوانە فەرەنسا چەند پانتاییەکی خاکی بیامون لە باکووری ئیتاڵیا، کە لە بەپیتترین پارچە کانی خاکی ئیتاڵیابوو، خستە ناو سنوورەکانی خۆی، لەگەڵ مەزنترین ڕووبەر لە میرنشینی سەردینیا و دوورگەی ئەلبا، هەروەها کۆماری (سیزاڵبیێ)شی لەسەر شێوازی نوێ دامەزراند و خۆی کردە سەرۆک بە سەریەوە.

زۆر بە زێدەڕۆییەوە دەستی دەخستە ناو کاروباری سویسراوە، سەرەڕای بەرگریەکی زۆری سویسرییەکان هەندێک لە خاکیشی داگیرکردن، ئەم پارچە خاکەی بە پەیماننامەیەکی بەرگری بە فەرەنسا بەستەوە و خۆی کردە حاکمی بەرزی کاروبارەکانی، هەروەها ڕازی نەبوو لە هۆڵەندا بکشێتەوە.

## ئەڵمانیا

کاتی مۆرکردنی پەیماننامەی لۆنڤیل ناپلیۆن پەیمانی بە ئەمیرەکانی رووی چەپی ڕووباری ڕاین دابوو، ئەوانەی خاکیان بەر فەرەنسا کەوتبوو، هەر کاتەی

کاروبارەکانی بۆ ڕێکخستن قەرەبووی زیانەکانیان لە ئەڵمانیای ناوەڕاست بۆ بکاتەوە، کە ئەو کات ئەڵمانیا بەسەر چەندین دەوڵەت و میرنشین و شاری ئازاد و شاری قەشەییدا دابەش ببوو.

هەر یەک لەم یەکانە وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ رەفتاریان دەکرد، هەر یەکەیەك سیستەم و دەستووری تایبەتی خۆی هەبوو، هەموو ئەو میرنشین و وڵاتانە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی پیرۆزمەند ئەندام بوون، کە ئیمپراتۆری نەمسا سەرۆکایەتیی دەکردن. بە پێی ڕێکخستنە نوێکەی ناپلیۆن هەموو دەوڵەتۆکە و شانشینە ئایینییەکانی هەڵوەشاندنەوە و خرانە سەر بڕوسیا و باڤاریا و نەمس، بەم بڕیارەی زیانێکی ماددیی زۆری لە کڵێسا دا، ژمارەی شارە ئازادەکان ٥١ بوون، هەمووی هەڵوەشاندنەوە تەنیا شەش شاریان نەبن.

لە ڕێگەی بەخشینی هەندێک لە خاکی ئەم شارانە بە ئەمیر و حاکمەکان دڵی ئەوانی رازی کرد، هەروەها پەیوەندی ئابووریی چاکی لەگەڵ هەندێک لە دەوڵەتانی ئەڵمانیا بەست، کە بووە هۆی زویربوون و نیگەرانی ئینگلیزەکان، چونکە زیانی بە بەرژەوەندییەکانی سیاسی و ئابووریی دەگەیاندن.

لە ڕێکخستنە نوێیەکەیدا ناپلیۆن ژمارەی دەوڵەتانی ئەڵمانیا بۆ ٣٩ دەوڵەت کەم کردەوە، لەم هەنگاوەی گەلێک لە مێژوونوسان ڕەخنەیان لە ناپلیۆن گرت بە لێکدانەوەی ئەمان هەنگاوێکە بۆ دروستبوونی ئەڵمانیایەکی یەکگرتوو، بەڵام مەبەستی ناپلیۆن لەم کارەیدا دروستکردنی یەکێتیەکی سیاسیانەی بەهێز بوو، کە بتوانێت لە لوتکەی هەر یەک لەم یەکانە حاکم و ئەمیرێک دابمەزرێنێ و لە ڕێگەیەوە باشتر بتوانێت کارەکە ببات بەڕێوە و هەر خۆشی وەکو دادوەرێک سەرپەرشتی کێشەی نێوان دەوڵەتە نوێکان بکات. ئەم ڕێکخستنە نوێیەی ئەڵمانیا بە لێکدانەوەی ئینگلیزەکان لە بەرژەوەندی ئەواندا نەبوو، لەم گۆڕانە فەرەنسا دەیەوێت خۆی بەسەر ئەوروپادا بسەپێنێت. هەرچەندە ناپلیۆن رووبەری خاکەکانی نەمسای بەرفراوانتر کردبوو، بەڵام نەمسا لە ناڕەحەتیەکەی بەریتانیا بەشدارە، نەمسا ئەم فراوانکردنەی بە دەستتێوەردان لە کاروباری ئیمپراتۆریەت دەزانی.

ئەمانە هەمووی لە سەروەری ئینگلیز وەردەگیران، لە بەرانبەریشیدا ئینگلیزیش لە سەروەریی فەرەنسای وەرگرتبوو. ئینگلیزەکانیش سستیان لە دانەوەی زۆر لە

موستەعمەرەکانی هۆڵەندا دەنواند، هەروەها سەرەڕای ئاگادارکردنەومیان لەلایەن فەرەنساوە درێغیی لە پێدانەوەی دوورگەی ماڵتا دەکرد، کە چەندین جار ناپلیۆن داوای کردبوو بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانی، کە سوارچاکانی ماڵتا بوون. ناپلیۆن بەبەردەوامی گلەیی لەو رۆژنامانە هەبوون، کە لە بەریتانیا هێرشیان دەکردە سەر فەرەنسا و ناپلیۆن و سیاسەتەکەی. دیسان لەندەن ببووە بنکەی ناحەز و ئۆپۆزسیۆن و کۆچبەر و پیلانگێڕانی فەرەنسیی، ئەوانەی بەردەوام پیلانیان دژی فەرەنسا و گیانی ناپلیۆن دەگێڕا و پڕوپاگەندەیان دژی رژێمەکەی لە رووپەڕی رۆژنامەکان بڵاو دەکردەوە. هەڵسوکەوتەکانی فەرەنسا رای گشتیی بەریتانیای وروژاند، لەوە دڵنیا بوون کە ئەوەی چاوەڕواندەکرێ لە پەیماننامەی ئامیان بەدی نایە، بەڵام فەرەنسا دەستکەوتی زۆری لێ وەدەست هێناوە، ناکۆکی کەوتە نێوانیان و خاڵی هاوبەشی ناکۆکییەکەش مەسەلەی ماڵتا بوو.

کاتێک لە شوباتی ١٨٠٣ فەرەنسا داوای لە بەریتانیا کرد لە دوورگەی ماڵتا بکشێتەوە، بەریتانیاش داوای لێ کرد لە هۆڵەندا و سویسرا و بیامۆن بکشێتەوە، ئەمە لە ٢٦ی نیسانی ١٨٠٣ بوو. دواتر بێ راگەیاندنی بڕیاری شەڕ، بە پراکتیکی ئۆپەراسیۆنەکانی شەڕ دەستیان پێکرد.

## ناپلیۆن تاجی ئیمپراتۆریەت لە سەر دەنێت

یەک لە دوای یەک هاتنی ڕووداوەکان لە ناوخو و دەرەوەی فەرەنسا بە دیدی فەرەنسییەکان بووە مایەی فراوانبوونی دەسەڵاتی ناپلیۆن و بەرزبوونەوەی توانای پیلانە یەک لە دوای یەکەکانی دژی خودی ناپلیۆن، رای گشتی فەرەنسیی گەیاندە ئەو بڕوایە، کە دەبێت سنوورێک بۆ دوژمنانی گەلی فەرەنسا و شۆڕش دابنرێت، جا ئەمانە چ لە چەپڕەوەکانی یاقوبییەکان بن یان لە ڕاستڕەوەکانی.

لە ١٨٠٣ لە پاریس توانرا رێگە لە سەرکەوتنی پیلانێکی حکومی سەرۆکی گرووپی پادشاخوازە توندڕەوەکان بگیرێت، کە لە ئینگلتەرا نیشتەجێبوو و پەیوەندی باشی لەگەڵ نێوەندی حاکمەکانی بەریتانیا هەبوو. مەبەست لەو پیلانە گرتن یان کوشتنی بۆناپارت بوو، دواتر گەڕاندنەوەی رژێمی پادشایەتی بوو بۆ فەرەنسا.

ئەم پیلانەش بووە بەڵگەیەکی تر، کە بەرپرسە مەزن و کاربەدەستانی نزیک لە دامودەزگای حکومڕانی ناپلیۆن لەم کارانە تێوەگلابوون نموونە (مۆرۆ و بیشیگرۆ) لە جەنەراڵە مەزنەکانی نزیک لە ناپلیۆن بوون، کە لەو پیلانە بەشدار بوون. بەر لە پیلانەکە پیلانگێڕی مەزن کادۆدال بە دوو مانگ پێش ئەو ڕووداوە لە کەنارەکانی فەرەنسا دابەزیبوو دەستی بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە کردبوو، گوایە لەم زووانە دەسەڵاتی پادشایەتی دەگەڕێتەوە لەسەر دەستی یەکێک لە ئەندامانی خانەوادەی پادشایەتی بۆربۆن، دوای سەرنەکەوتنی پیلانەکە پیلانگێڕی یەکەم کادۆدال لە پاریس دەستگیر دەکرێت.

ئەم پیلانە رق و کینی فەرەنسییەکانی لە خانەوادەی پادشا و رژێمەکەی و ئینگلیزەکانیش زیاتر کرد، بەوەی واز لە کاروباری ناوخۆی فەرەنسا ناهێنن، هەروەها خۆشەویستی و پابەندیان بۆ ناپلیۆن زیاتر بوو. فەرەنسا ئەم ڕووداوەی بە هەل زانی تا فەرەنسییەکان بگەیەنێتە ئەو بڕوایەی، کە دوژمنان واز لە ئارامی فەرەنسا ناهێنن، بۆ ئەوەی دوژمن لە گەڕانەوەی رژێمی پادشایەتی بێئومێد بێت، باشترین چارەسەر ئەوەیە حکومڕانی لە فەرەنسا بکەینە ویراسی.



کادۆدال

ئەوەی ڕاستی بێت ناپلیۆن حەزی لەوە نەبوو ببێتە وارسی حوکمی بۆربۆن، چونکە ئەم چاوی لە زیاتر بوو، خانەوادەی بۆربۆن تەنیا حکومڕانیان لە فەرەنسا دەکرد. بەڵام ناپلیۆن چاوی لە حکومڕانی سەرتاپای ئەوروپای رۆژئاوا هەبوو، بەڵکو خەونی بە

زیاتریش دەبینی، بۆیە پێی باش بوو لە وێنەی شارلمان بکات نەک لویسی شازدەهەم، هەروەها نازناوی ئیمپراتۆری پێ باشتر بوو لە نازناوی پادشا.

لە نیسانی ١٨٠٤ راپرسیەکیان ئەنجام دا بۆ وەرگرتنی رای خەڵک لەسەر ناونانی ناپلیۆن بە ئیمپراتۆر لە ئەنجامدا بە ریژەی ٩٩% دەنگەکانی وەدەست هێنا، دیارە بەر لە هەزار ساڵ شکۆی مەزن (حبر الاعزم) تاجی ئیمپراتۆریەتی لەسەری شارلمان ناوە، بۆیە ناپلیۆنیش لەمە کەمتری قبووڵ نەبوو، ئەوە بوو لە ٢ی دێسەمبەری ١٨٠٤ پاپا بیۆسی دوانزەهەمی لە پاریس ئامادەکرد بۆ ئەوەی هەمان رێورەسم لە کڵێسای نۆتردام بەڕێوە ببات.

## هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی سێیەم

لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٨٠٣-١٨٠٤ شەڕەکان تەنیا بریتی بوون لە داگیرکردنی چەند بەندەرێکی هۆڵەندا و ئیتاڵیا و کەنارەکانی هانۆڤەر لەلایەن لەشکری فەرەنساوە، ئەم بەندەرانە بۆ بازرگانی بەریتانیا زۆر گرنگ بوون، بەریتانییەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشتەوە، کە رۆژێک لە خەو هەڵسن ببینن ئاڵا سێرەنگیەکەی فەرەنسا لەسەر خاکی ئەوان هەڵدراوە. ناپلیۆن گەلێک جار دەیگوت پێویستی بە تەنیا ٦ کاتژمێرهەیە بۆ ئەوەی لەشکرەکەی دەست بەسەر دەریای (مانش)دا بگرێت، ئەوکاتیش سەبارەت بە بەریتانیا هەموو شتێک کۆتایی دێت. فەرەنسییەکان هەڕەشەکانی ناپلیۆنیان بە هەند وەردەگرت بۆیە کارگەکانیان بەردەوام خەریکی دروستکردنی کەشتی و بەلەمی سەربازی بوون بۆ گواستنەوەی سەرباز و تفاقی جەنگی لە دەریاوە، سەربازەکانی فەرەنسی لە کەنارەکانی مانشەوە خەریکی مەشق و مانۆڕی سەربازیی بەردەوام بوون، لە هەموو لایەکیشەوە هێزی وڵاتانی هاوکار لە هۆڵەنداو ئیتاڵیا و بەلژیک و ئەڵمانیا دەهاتن، تا لە سوکایەتیپێکردنی ئینگلیزەکان بەشدار بن. لەم مانۆرە سەربازیانەدا بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سەربازەکان ناپلیۆن خۆی ئامادە دەبوو، لە پێناو بووژاندنەوە و بەهێزکردنی ئەم ئۆپەراسیۆنە ناپلیۆن لە سازشکردن لەگەڵ ئەمەریکا دوودڵی نەدەنواند، هەر زوو لە بەرانبەر هاوکارییەکانی ئەمەریکا دەستی لە دوورگەی لویزیانا هەڵگرت.

کاتێک ئامادەباشیەکانی لەشکری فەرەنسا گەیشتنە ئەوپەری لوتکە لە ئەفسەری بەتواناوە تا ژمارەی سەربازەکان، کە گەیشتە ١٢٠هەزار سەرباز، بڕوای ئەوە لەناو خەڵک بڵاوبۆوە،. کە ئیتر لوتبەرزیەکەی ئینگلیز بەرەو شکانە، تەنانەت ئەوانەی لە تواناکانی فەرەنساش بە گومان بوون بڕوایان وابوو، کە ئەم جارە فەرەنسا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت.

نەخشەی ناپلیۆن بۆ هێرشەکان ناردنی کەشتیگەلی فەرەنسی بۆ هاوکاریی کەشتیەکانی ئیسپانیای هاوپەیمان بوو بۆ دوورگەی ئەنتیل و گەماڕۆدانی، بە بڕوای ناپلیۆن هێزەکانی ئینگلیز بەدوایان دەکەون ئەوساش هێزەکانی ئینگلیز لە مانش کەم دەبنەوە، ئیتر ناپلیۆن بە ئاسانی دەتوانێ هێزەکانی خۆی لە مانش دابەزێنێت و دەست بەسەر کەنارەکانی ئینگلیزدا بگرێت. ئەم جۆرە هێرشە پێویستی بە زیرەکییەکی کەموێنە و گورجوگۆڵ و کتوپڕی لە ئەنجامداندا هەبوو، بەڵام ئەم خەسڵەتانە لە جەنەراڵی کەشتیگەلی فەرەنسا (ڤیلنۆڤ)دا نەبوون، ئۆپەراسیۆنەکەی بە دوودڵی و سستی ئەنجام دا، بووە هۆی ئەوەی ئەمیرال نلسۆن لە ٢١ی ئۆکتۆبەر ١٨٠٥ هێرشێکی کتوپڕ لە رووی (ئاگەر)ی بەرانبەر بە کەنارەکانی ئیسپانیاوە بکاتە سەر هێزەکانی فەرەنسا و دەستێکی کوشندەی لێ بووەشێنێت و شکست بە هێزەکانی بهێنێ و زۆربەی کەشتیەکانی لەناوبەرێت. بەم شێوەیە ئومێدەکانی ناپلیۆن هەرەسیان هێنا و سەروەریەکانی دەریاش بۆ ئینگلیزەکان مایەوە.

شەڕی ئاگەر وای بەسەر ناپلیۆندا سەپاند، کە نەخشە و پیلانەکانی بگۆڕێت، بەریتانیا لە ئابی ١٨٠٥ لە دژی فەرەنسا لە پێکهێنانی هاوپەیمانیەکی نێودەوڵەتیی نوێ دابوو، ئەم هاوپەیمانێتییە ناونرا (هاوپەیمانێتی نێودەوڵەتیی سێیەم) هەر یەک لە بەریتانیا و روسیا و نەمسا و ئەسوەج تێیدا ئەندام بوون، هەریەک لەم وڵاتانە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە هەڵسوکەوتی ناپلیۆن ناڕەحەت بوون.

روسیا لە دەستێوەردانەکانی ناپلیۆن لە کاروباری ئەڵمانی رازی نەبوو، نەمسا لە دێرزەمانەوە چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد دەرفەتێکی بۆ بڕەخسێت تا تۆڵەی کۆنی لێ بکاتەوە. نەمسا زۆر لەو راگەیاندنەی فەرەنسا ناڕەحەت بوو، کاتێک وەکو پادشای ئیتاڵیا خۆی ناساند و خاکەکەشی خستە سەر فەرەنساوە. دیسان سوێدیش لە رەفتارەکانی فەرەنسا ناڕەحەت بوو، کە بەرانبەر بە ئەوروپای رۆژئاوای دەکرد. بەریتانیا دەیزانی چۆن فاکتەری

بزوێنەری هەستی هاوولاتیانی ئەم وڵاتانە دەخاتە گەر، بۆیە لە هاوینی ١٨٠٥ دوای وەدەستهێنانی هاوکاریی وڵاتەکان بڕیاری جەنگی لەگەڵ فەرەنسا راگەیاند.

کاتێک ناپلیۆن هەستی بەم پیلان و ئامادەکارییەی کرد، کە لە ئەوروپا دژی ئەو دەکرێت، ئەو لەشکرەی لە باکووری فەرەنسا بۆ هێرشبردنە سەر ئینگلیز ئامادەی کردبوو، رووی وەرگێڕایە نەمسا تا گورزێکی لێ بووەشێنێت، بەر لەوەی ئامادە باشیەکەیان تەواو بێت و روسیا بە هانایەوە بێت، ئەوساش روو لە بەریتانیا بکات. سوپای فەرەنسا گەیشتە شاری ئۆلم لە کەنار ڕووباری دانوب، لەشکری نەمسا لەوێ دابەزی بوو. هەر لە وێ لە ٢٠ ئۆکتۆبەری ١٨٠٥ مەزنترین شەڕ لە نێوانیاندا رووی دا، لە ئەنجامدا هێزەکانی نەمسا شکستیان خوارد و پاشەکشەیان کرد، نزیکەی پەنجا هەزار سەربازیشیان لێ بە دیل گیرا، پاشماوەی لەشکرەکەی نەمسا روەو رۆژهەڵات رایان کرد بەرەو پیری لەشکری روسیا، کە بەهانایەوە دەهات بۆ ئەوەی بەیەکەوە دژە هێرشێک بکەن، بەڵام لەشکری فەرەنسا بە دوایانەوە رۆیشت بەر لەوەی لەگەڵ روسەکان بەیەک بگەن لێیان بووە شەڕ.

نزیکترین شوێن بۆ بەیەکگەیشتنی لەشکرەکان خاکی بڕوسیای بێلایەن بوو، ناپلیۆن رێزی تایبەتیی بۆ پادشاکەی هەبوو، بەڵام فەرەنسییەکان گوێیان بەم نەریتە نەدا و بێ سڵکردنەوە پیرۆزمەندی سنووری بڕوسیای بێلایەنیان بەزاند، ئەمەش بووە مایەی تووڕە بوونی پادشای بڕوسیا. ناچار پەیوەندیی بە قەیسەرەوە کرد بە مەبەستی بەشداریکردن لە شەڕەکان دژی فەرەنسا، لە ٢ی دێسەمبەری ١٨٠٥ لە گردۆڵەکانی ئوسترلیزی نەمسایی مەزنترین شەڕ لە مێژووی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا لەگەڵ هێزەکانی هەریەک لە نەمسا و روسیا روویدا، لەم شەڕە هەردوو لەشکری روسیا و نەمسا شکستی گەورەیان خوارد و ناپلیۆن دەرسێکی پێدان، کە بڕوسیای پێچاوشکاو کرد بۆ ئەوەی جارێکی تر هەڵەی وا نەکات لەگەڵ نەیارانی فەرەنسا بکەوێتە هاوپەیمانێتییەوە، هێزە شکستخواردووەکان لە دوای خۆیان بیست هەزار کوشتیاریان لێ بەجێما.

لە مەزنترین ئەنجامەکانی ئەم دوو سەرکەوتنە، هەر رۆژی دوای شەڕی ئۆسترلیتز پادشای نەمسا داوای چاوپێکەوتنی لە ناپلیۆن کرد، بە یەکەوە وتووێژ و دانوستانیان بۆ ئاشتەوایی دەست پێ کرد.

لە ١٦ی دێسەمبەری ١٨٠٥ پەیماننامەی برسبۆرگی بەناوبانگیان مۆر کرد، لەم پەیماننامەیە نەمسا تیادا رسواکرا و فەرەنساش لە ئیتالیا و خوارووی ئەڵمانیا سەرفراز کرا، روسیاش بە کردار لە شەڕەکە کشایەوە بێ ئەوەی هیچ مۆر بکات.

سەبارەت بە بڕوسیا ناپلیۆن لەو هەڵوێستەی بڕوسیا بێزار بوو، کە دەیویست لە فەرەنسا هەڵگەڕێتەوە و بکەوێتە گەڵ لایەنی هاوپەیمانێتی نێودەوڵەتیی سێیەمەوە، بۆیە پەیماننامەیەکی شەرمەزاری بەسەردا سەپاند، کە هیچ ئابڕووی بۆ بڕوسیا نەهێشت بۆوە، بە ناوی پەیمانی شۆنبرۆن. بە پێی ئەم پەیماننامەیە خاکەکانی کلیڤ و نیوشاتێل لەسەر ڕووباری راینی لێ سەند و کردنی بە میرنشینێکی سەربەخۆ لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسا، هەروەها کەرتی ئەنسباخی لێ جیاکردەوە و خستیە سەر باڤاریا، کەرتی هانۆڤەریشی لە بەرانبەر ئەمانەدا دا بە بڕوسیا. ئەم کەرتە کەرتێکی بە پیت و بەرەکەت بوو، بووە خاڵی ناکۆکی هەمیشەیی لە نێوان ئەمان و ئینگلیزەکان، چونکە جێی بایەخی خانەوادەی پادشای ئینگلیزی کۆن بوو، پەیماننامەکەش لە ١٥ی دێسەمبەری ١٨٠٥ مۆر کرا.

ناپلیۆن بەمە نەوەستا کاتێک گەڕایەوە پاریس بە پێشوازیەکی کەمونێنەوە بە گوڵ وگوڵزار پێشوازیی لێکرا، بەوەی توانیبووی هاوپەیمانێتی نێودەوڵەتیی سێیەم تێکبشکێنێت، لە کاردانەوەی ئەمەش یەکێتی دەوڵەتۆکە کانی ئەڵمانیای دامەزراند بەناوی (یەکێتیی راین)، کە سەر بە خۆیەوە بێت و پەیمان دەدا.

## هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی چوارەم

کاتێک فەرەنسا لە ١٨٠٥ سنووری بڕوسیای بەزاند بینیمان بڕوسیا سەرەڕای ترس و دڵەڕاوکێ بەشداری خۆی لە شەڕ راگەیاند، بەڵام کە ناپلیۆن لە شەڕەکانی ئۆسترلینتزا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بڕوسیا بۆ خۆپاراستن لە ئاگری شەڕ لە بڕیارەکەی پەشیمان بۆوە، و لەگەڵ ناپلیۆن پەیماننامەی شونبرۆنی بە شەرمەزاری مۆر کرد، هەر چەندە یەکێتی راین دەسەڵاتەکانی لە ئەڵمانیا بە رادەیەک کەم دەکردنەوە، کە توشی نامۆیی سیاسیی ببوو.

بەڵام کە هۆڵەندا کرایە میرنشینێکی سەر بە ناپلیۆن و لویسی برای خۆی کرد بە پادشا، بڕوسیا ناچار بوو بیر لە شەڕ بکاتەوە. ئەوەی بڕوسیای نارەحەت کرد ئەوە بوو، کە

ناپلیۆن لەجیاتی ئەو خاکانەی لێی سەندبوون هەرێمی هانۆڤەری پێ دابوو، ئەم دەیزانی لە پشتیەوە ناپلیۆن دانوستان لەگەڵ ئینگلیز دەکات و ئەم خاکانەی پێ دەدات، کە لە پڕوسیای سەندۆتەوە، ئەمەش سوکایەتیەکی مەزنە بۆ پڕوسیا.

لەم روانگەیەوە پڕوسیا داوای لە ناپلیۆن کرد لە هەموو خاکەکانی ئەڵمانیا بکشێتەوە، ئەمە بووە هۆی سەرنەکەوتنی دانوستانەکانی ئاشتەوایی فەرەنسا لەگەڵ ئینگلیز و روسیا، بەم شێوەیە هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی چوارەم لە نێوان پڕوسیا و روسیا و ئینگلتەرا و سوێد بەسترا. بەر لەوەی هاوپەیمانەکان بکەونە خۆ، ناپلیۆن دەستپێشخەریی لە هەڵگیرساندنی شەڕ کرد.

لە ئۆکتۆبەری ١٨٠٦ لە شاری یەینا پڕوسییەکان بە دەست فەرەنسییەکانەوە شکستیان خوارد، لەشکری پڕوسیەکان راونران تا بەرلینیشیان لەسەر دانا. بە هۆی شکستیان لەشکری پڕوسیا، کە بە فەرماندایەتی پادشاکەی بوو، روەو سنوور رایان دەکرد تا لە پڕوسینا بە لەشکری روسیا بگەن، کە بۆ کۆمەککردنیان دەهاتن. بەڵام ناپلیۆن لە هێرشبردن و راوەدونانی بەردەوام بوو، تا لە مانگی شوباتی ١٨٠٧ لە شەڕی فریدلاند بەسەر هەردووکیاندا زاڵ بوو و زیانی زۆریشی پێ گەیاندن، ئیترهەر زوو هەردوو وڵاتە هاوپەیمانەکە داوای ئاشتەواییان لە ناپۆلیۆن کرد.

## ئاشتەوایی تلسیت

لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٨٠٧ کۆبوونەوەیەک لە نێوان قەیسەری روسیا و ناپلیۆن لەناو بەلەمێکی بچووک لە رووباری نیمن بەسترا، بە چەند خاڵێکی لێکتێگەیشتن کۆبوونەوەکەیان کۆتایی هات. گرنگترین ئەوخاڵانەی لەسەری پێکهاتبوون بریتی بوون لە:

- روسیا هیچ لە خاکەکەی لەدەست نەدات و هەوڵ بدرێت بەرژەوەندییەکانی روسیا لە فنلەندا مسۆگەر بکرێن.
- لە بەرانبەریدا قەیسەر دان بە هەموو ئەو گۆڕانانە بنێت، کە ناپلیۆن لە ئەوروپا کردویەتی و دەیکات، بەتایبەت ئەو پەیماننامەیەی لەگەڵ پڕوسیا مۆری کردووە دانی پیا بنێت.
- قەیسەر لەگەڵ فەرەنسا لە جێبەجێکردنی گەمارۆی سەر ئینگلتەرا یەکهەڵوێست بن.

لە ٨ی تەمووز پەیماننامەی ئاشتەوایی تلسیت مۆر کرا، کە سزای قورسی بەسەر بڕوسیادا سەپاندبوو، لەوانە:

- لە رۆژئاوای ئەڵمانیا ناپلیۆن میرنشینێکی دروست کرد بە ناوی وستگالیا، براکەی خۆی جیرۆمی کردە پادشای ئەوێ.
- لە خاکی بڕوسیا لە پۆلۆنیا دەوڵەتێکی بە ناوی دۆقیە ڤیرسۆفیای دروست کرد، ئەمیشی خستە سەر پادشای سەکسۆنیای هاوپەیمانی فەرەنسا.
- سەرەڕای ئەم هەموو زیانانە باجێکی زۆری خستە سەر ئەڵمانییەکان بۆ قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی جەنگ.
- ژمارەی سەربازەکانیشی سنووردار کرد.
- سوپایەکی داگیرکاریشی لەسەر خاکەکەی دانا.

بەم شێوەیە هاوپەیمانی نیودەوڵەتیی چوارەم دواهەناسەی دا، لەبەردەم فەرەنسا شتێکی ئاوا نەمایەوە جێی مەترسی بێت، تەنیا ئینگلیز و سوێد نەبن، کە دووەمیان دوورەدەستە و پێویست بە ترس ناکات، تەنیا ئینگلیز نەبێت.

## جەنگی ئیسپانی

ناپلیۆن لە ١٨٠٧ دوای ئەوەی توانی زیاتر لە جارێک سەر بە نەمسا و بڕوسیا شۆڕ بکات و هاوپەیمانیش بەسەر روسیادا بسەپێنێ، گەیشتبووە لوتکەی نەش و نمای، ئیتاڵیا و سویسراشی ناچارکردن کلکایەتیی بۆ بکەن، خۆی بەسەرهەموو ئەوروپادا سەپاند، بەهێزیەکەی بوو بە واقیعێک، کە جگە لە ئینگلیز هیچ هێزێک نەما بە روویدا قیت بێتەوە. دوای ئەوەی ماوەی ١٠ ساڵ لە شەڕی بەردەوامدا لەگەڵ ئینگلیز نەیتوانی شکستی پێ بهێنێ کەوتە ئەو بڕوایەی، کە تاقە ئومێدی بۆ شکستهێنان بە ئینگلیز تەنیا گەمارۆدانە. لە ١٨٠٦ لە بەرلین رێوڕەسم بەرێوەچوو بۆ تەنگهەڵچنین بە ئینگلتەرا و شکستپێهێنانی، بە پێی ئەم رێوڕەسمە هیچ وڵاتێکی ئەوروپی بۆی نییە بازرگانی لەگەڵ ئینگلیز بکهات، هەروەها رێگە بە کەشتیەکانی ئینگلیز نادرێ لە کەنار و بەندەرەکانی فەرەنسا و وڵاتە هاوپەیمان و دۆستەکان بووەستێت، فەرمانیشی بە کەشتیگەلی فەرەنسا دا هەر کەشتیەکی ئەوروپی ئاڵای بەریتانیای هەڵگرتبێ لە بەندەرەکانی فەرەنسا بووەستێت

دەست بەسەر بارەکەیدا دەگیرێت. هەر کەشتیەک ئەم ڕێنمایانە پیادە نەکات، بە کەشتیەکی دوژمن دێتە ئەژمار و رەگەزنامە رەسەنەکەی لە دەست دەدات، کەشتیگەل بۆی هەیە دەست بەسەر سەرپێچیکاردا بگرێت یان نقومی کات.

لە کاتێکدا ئینگلیز بۆ چاوگی ئابووریی هێزی سەربازی و سیاسیی پشتی بە بازرگانی ئەوروپا دەبەست، بۆیە لەم دەرگایەوە ناپلیۆن دەیویست گەمارۆی بدات و چۆک بە میللەتەکەیدا بدا، بازاڕەکەی کەساس و کاول بێت، ئەوەبوو هەر یەک لە نەمسا و روسیا و بڕوسیا و دانیمارک و ئەسوەج سەرەڕای ناڕەحەتیان لەم هەڵوێستەیان، بەڵام پابەندی بڕیارو ڕێنماکان بوون وهەموو بەندەرەکانیان بە رووی کەشتیەکانی ئینگلتەرا داخستن.

لە پێناو سەرکەوتنی پڕۆسەی گەمارۆدان پێویست بوو هەموو وڵاتە کانی کیشوەر پابەندی بن، ناپلیۆن سەرەڕای بلیمەتی و زانایی درکی بەوە نەکرد بوو، کە ئەم بڕیارە بڕیارێکی سەختە و خەڵکی ئەوروپا لەسەر رەواجکردنی کاڵاکانی بەریتانیا راهاتبوون، کارێکی ئاسان نەبوو ئەمەیان لێ قەدەغە بکرێت. بۆیە کەشتیەکانی بەریتانی بەنهێنیەوە کاڵا و کەلوپەلەکانیان لە بەندەرەکان دادەبەزاند، لە ڕێگەی قاچاخیشەوە دەگەیەنرانە بازاڕەکانی ناو دەوڵەتە هاوپەیمانەکان هەر بەنهێنی. زۆرترین بەندەرە یاخی بووەکانی ئەم گەمارۆیە بەندەرەکانی خاکی پاپا و بازاڕەکانی پرتوگالی دۆستی دێرینی ئینگلتەرا بوون.

ناپلیۆن زۆر خەمخۆری پڕۆسەی گەمارۆکە بوو، دەیوت کەمترین نیانی و سستی لە کارەکە کاریگەریەکە لەدەست دەدات، هەر بۆیە رەچاوی هەستی کاسۆلیکەکانی خوارووی ئەڵمانیا و بەلژیک و هەندێک لە ناوچەکانی فەرەنسای نەکرد، لەم پێناوەدا لە ئەیاری ١٨٠٩ موڵکەکانی پاپای خستە سەر خاکی فەرەنسا و پاپاشی دەستگیر کرد، چونکە پابەندی پڕۆسەی گەمارۆکە نەبوو و لەگەڵیشی ناکۆک بوو. بە تایبەت لە ئیتاڵیا، کە پاپا سەرچاوەی هێزی تەنیا لە پیرۆزمەندی و گەیاندنی پەیامی مەسیحەوە نەدەبینی، ئیتاڵییەکان وەکو سومبوولی نەتەوایەتی سەیریان دەکرد، بۆیە ئەم کارەی ناپلیۆن بە بریندارکردنی هەستی ئیتاڵییەکان لێکدرایەوە.

ئینگلیزەکانیش بە پلە یەك لەم بڕیار و پڕۆسانە زیان لێکەوتوو بوون لە ئاست ئەم کارە، بۆ ئازادکردنی کاری بازرگانی و دەریاکانیان دەبووایە هەڵوێست وەرگرن. کەشتیگەلی ئینگلتەراش لە بەرپەرچدانەوەی ئەم گەمارۆیە گەمارۆی خستە سەر هەموو بەندەر و موستەعمەرەکانی پابەند بە بڕیاری بەرلین، تا هیچ پەیوەندییەک لە نێوانیاندا نەمێنێت. بڕیارەکانی فەرەنسا و کاردانەوەکانی ئینگلیز سستی و خاویەکیان خستە ناو بازرگانی دەریاوە، بازرگانی بەتەواوەتی پەکی کەوت و هەموو وڵاتەکان لەم پرۆسەیە زیانیان لێ کەوت قەیرانی ئابووری سەری هەڵدا، وڵاتی زۆرترین زیانلێکەوتوو ئینگلتەرا و فەرەنسا بوون، لە کاتێکدا پیشەسازی لە بووژانەوە دابوو ئەم دوو وڵاتە خەزێنەیان قەلۆش بوون، کارگەکانیان وەستان و بێکاری زیادی کرد.

## داگیرکردنی پرتوگال

هەموو هەوڵەکانی ناپلیۆن بێسوود بوون بۆ وازهێنانی پرتوگال لە پەیوەندییە ئابووریی و سیاسیەکانی لەگەڵ ئینگلیز، بە هۆی ئەوەی بەندەرەکانی پرتوگال ببوونە بنکەی بەرێکردنی کاڵاکانی ئینگلیز بە قاچاخی بۆ هەموو ئەوروپا، ناپلیۆن بڕیاری داگیرکردنی پرتوگالی دا. بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ سەرۆکوەزیرانی ئیسپانیا (گۆدی) کە لە کەمترین بنەماکانی ئابڕوو و پیاوەتی بێبەش بوو، دانیشتنێکی سازدا، لەسەر ئەوە رێککەوتن رێگە بە سەربازەکانی فەرەنسا بدا بەسەر خاکیدا هێرش بەرنەسەر پرتوگال، بە مەرجێك لە پاتاڵ و دەستکەوتەکان براپشک بێت.



ژونۆت

ئەو لەشکرەی بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ ژونۆت بۆ داگیرکردنی پرتوگاڵ نارد، کە بەبێ تەگەرە و ئاستەنگ پرتوگاڵی داگیرکرد، چونکە دەمێک بوو فەرەنسا سامی خۆی بەسەر پرتوگاڵدا سەپاندبوو، بۆیە پرتوگاڵییەکان بیریان لە بەرگریش نەکردەوە، خانەوادەی پادشا لە ١٨٠٧ ئەوێیان جێ هێشت و بۆ بەرازیل رایان کرد.

## داگیرکردنی ئیسپانیا

دوای داگیرکردنی پرتوگاڵ فەرەنسا بە بیانووی بەرگریکردن لە کەنارەکانی پرتوگاڵ هەندێک هێزی لە ئیسپانیا هێشتەوە، ناپلیۆن کە بینیی وا بەئاسانی توانیی پرتوگاڵ داگیر بکات، بێ گوێدانە هاوپەیمانێتی یان دۆستایەتی بیری لە داگیرکردنی ئیسپانیاش کردەوە. هاتنی سوپای فەرەنسی بۆ ئیسپانیا بە رەزامەندی خۆیان بوو و بە مەرجی ئەوەی هەر کاتێک بیەوێت پاشەکشە بکات، بەڵام ئەوەی زیاتر وای کرد فەرەنسییەکان چاویان لە مانەوە بێت، دۆخی بەندەرەکانی ئیسپانیا بوو، کە هەموویان

لەگەڵ ئینگلیزەکان بە بازرگانێتی قاچاخەوە خەریک بوون، چونکە بە هۆی لاوازیی حکومەتی ئیسپانیا ئەم کەنار و بەندەرانە کۆنترۆڵ نەدەکران.

بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانی ناپلیۆن هێزێکی بە فەرماندارێتی جەنەرال مۆرای لە ئیسپانیا دامەزراند، ئەرکی داگیرکردنی تەواوی خاکی ئیسپانیاشی پێ سپارد، بەڵام بە شێنەیی ناپلیۆن بەم بڕیارەی دیسان هەڵەیەکی مەزنی کرد، مەزنتر لە هەڵەی داگیرکردنی زەویەکانی پاپا و دەستگیرکردنی، چونکە ئیسپانییەکان لە هەموو ئەوروپییەکان ئایینپەروەرتر بوون، لە هەموو ئەوروپییەکانیش کەمتر هەواداری بیروا نوێخوازیەکانی فەرەنسا بوون. دیسان لە رووی وشیاری سیاسییەوە لە هەموویان لەپاشتر بوون، ئەوان سەرەڕای ستەم و زۆرداریی پادشاکانیان و گەندەڵی و باری گوزەرانی خراپیان هەستیان بە نالەباری خۆیان نەدەکرد و دەستکەوت و گۆڕانەکانی فەرەنساش هیچ سەرنجێکی ئەوانی رانەدەکێشا. دواتر ئیسپانیا یەکڕیزیی زۆر بەهێز بوو هەر لە سەردەمی شەڕەکانی مسوڵمانانیاندا ئەم یەکڕیزییە لەناو گەلی ئیسپانیا بایەخی پێدراوە، هیچ لەو ولاتانەی ناپلیۆن شەڕی لەگەڵ کردبوون وەکو ئەڵمانیا و نەمسا و روسیا و ئیتاڵیا لە ناوخۆیاندا وەکو ئیسپانیا یەکگرتوو نەبوون، بۆیە لە ئیسپانیا ڕووبەڕووی میللەتێکی یەکڕیز و یەکگرتوو بووەوە، ئەمەش کارێکی پڕ لە گرنگییە.

هەر لە سەرەتای داگیرکارییەوە ئیسپانییەکان لە رووی داگیرکاران وەستان و بەرگریان کرد، لەنێو ریزی جوتیار و گوندنشینەکان تەگەرە و گیروگرفتی زۆریان بۆ داگیرکەران دروست کرد، ئەوان هێرشیان دەبردە سەر عەمبار و کاروانە سەربازییەکان و زیانی زۆریان لێ دەدان، لە رووەکەی ترەوە هێزەکانی داگیرکەر هەر لە زیاد بوون دابوون بۆ ئەوەی دەست بەسەر هەموو خاکی ئیسپانیادا بگرن.

ئەو کاتەی پادشای ئیسپانیا بە نیازەکانی فەرەنسای زانی هەستی بە خەتەرناکی کرد، بۆیە جێی حەوانەوەی خۆی گواستەوە لە پایتەختەوە بۆ بەندەری قادش، تا لەوپەڕی ئامادەباشی دابێت ئەگەر کار گەیشتە ئاستی هەڕەشە لەسەربوون، ئەوسا بۆ ئەمەریکای خواروو خۆی و خانەوادەی رابکات.

خەڵکی ئیسپانی لەم ڕەفتارەی پادشا بێزار بوون، ڕەنگدانەوەی ناجەسووری و نابەرپرسیارێتی بوو، بۆیە پادشایان ناچار کرد واز لە تەختی پادشایەتی بهێنێ بۆ کوڕەکەی فێردیناندی حەوتەم.

بە پاساوی ئاژاوە دروستبوون لە پایتەخت میرا هێزەکانی بردە ناو پایتەخت و بۆ دەستگرتن بەسەر جڵەوی کارەکان هێزەکانی خۆی هێشتەوە و داوای لە پادشاش کرد رانەکات و بێتەوە پایتەخت، بەڵام ئەم نەیتوانی هاوتەباییەک لە نێوان پادشا هەڵاتووە کۆنەکە و پادشا هەڵبژێردراوە نوێکە دروست بکات، بۆیە (میرا) خانەوادەی پادشای بە تێکرا ناردە بایۆن لە فەرەنسا.

لێرە ناپلیۆن هەرچی فێڵ و چەواشەکاریی هەبوو بەکاری هێنان تا هەردوو پادشاکە دەست لە پادشایەتی هەڵگرن.

تاجی مەدریدی بە براکەی خۆی (جۆرج) سپارد، کە پێشتر پادشای ناپۆلی بوو، بەڵام پادشایەتی ناپۆلیی بە میرای فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی فەرەنسا سپارد.

ئیسپانییەکان لەم گۆڕانکارییە نەگەیشتن، ئەوان هەر داوای پادشا نوێکەی خۆیان دەکردەوە، هەر ئەویشیان بە پادشا دەزانی، جۆزیف بۆناپارت وەکو روخساری داگیرکاری و ستەمکاری سەیر دەکرا.

لەبەرئەوەی پیاوە ئاینییەکان وەکو شۆڕشی فەرەنسی سەیری (جۆزیف)یان دەکرد، ئەو شۆڕشەی سام و پیرۆزمەندی ئایینی مەسیحی پێشێل و رسوا کردبوو و وەکو خوانەناسێک دەیانبینی، بۆیە خەڵکیان دژی ئەوان هاندەدا و بۆ بەرەنگاربوونەوە و قوربانیدان دژی داگیرکاران میللەتیان جۆش دەدا و داوای زیاتر بەرگریان لێ دەکردن. ئەوان لەپاڵ ئەوەی پیاوی ئایینیی و خواپەرستی بوون، پیاوی خەباتگێڕ و بەرخۆدان و بەرگریکەریش بوون و هەردەم لە ریزی پێشەوەی بەرگریکردن دابوون. دیسان ئەوان توانیان شکۆدار و خاوەن زەوییەکان تێبگەیەنن، کە مەبەستی شۆڕشی فەرەنسا لەم کردەوەیان چییە و ئەنجامەکەی بە چی دەگات و چیان لەدەست دەدات، دواتر پیاوە ئایینییەکان زیاتر کەوتنە خۆ لە خەڵک وشیارکردنەوە و بزاوتنی سۆزی ئایینییان بۆ هاندان و شەڕکردن دژی دوژمنانی مەسیح.

دوای ئەوەی کەس گوێی لە بانگەوازی شۆڕشی فەرەنسییەکان نەگرت، دەنگی پیاوە ئایینیەکان زیاتر گوێی لێ گیرا، جەماوەری ئیسپانیا بە تێکرا بەرگریان لە خاکی ئیسپانیا کرد بۆ دەرکردنی سەربازە داگیرکارەکان، کە لە سە د و شەست هەزار سەربازی فرەرەگەز و فرەنەتەوە پێکهاتبوو.

بەرگریکردنی ئیسپانییەکان شێوەی پارتیزانیی وەرگرت، کەسانی ئەفسەری راکردوو لە ریزەکانی سوپای ئیسپانی و شارەزا و دڵسۆزانی ئیسپانی بەلێشاو چوونە ریزی ئەم پێکهاتە بەرگریانەوە، جوتیار و گوندنشین و دیسان ئەکلیرۆسەکان و شکۆدارەکانیش بە پارە و چەک و تەقەمەنی هاوکاریان دەکردن. ئەم شۆڕشە خەڵکی پرتوگالیشی هاندا، کە ئەوانیش چەک دژی داگیرکەر هەڵگرن، بە هاوکاری ئینگلیز و فەرماندەیی (دوق وۆلیندفۆن سیز) دە هە زار کەس چەکیان هەڵگرت بۆ بەرگریکردن لە پرتوگال، لە رێگەی دەریاشەوە هاوکاریەکانی ئینگلیزیان پێ دەگەیشتن. سەرکەوتنی ئیسپانییەکان لە ئەوروپا دەنگی دایەوە، بەتایبەت لەنێو وڵاتە داگیرکراوەکاندا، کە بووە هۆی ئەوەی ئەوانیش بیرێک لە ئازادی بکەنەوە.

ناپلیۆن درکی بە شکستەکانی فەرەنسا کرد، بە تایبەت کاتێک لە شەڕی بایلن هێزەکانی ئیسپانیا فەرەنسییەکانیان تێکشکاند و لە پایتەخت وەدەریان نان، ئەوسا بە پێویستی زانی خۆی لە مەیدانی جەنگ ئامادە بێت.

بەر لە سەفەرکردنی بۆ ئیسپانیا لە شاری ئێرفۆرتی ئەڵمانی لەگەڵ قەیسەر دانیشت، لەم دانیشتنەدا بۆ رازیکردنی قەیسەر ناپلیۆن دەستی لە زۆر لە مافەکانی خۆی هەڵگرت لەوانە:

- ناپلیۆن پەیمانی دا لە بڕوسیا و خاکی پۆلۆنیا بکشێتەوە.
- هەروەها رازی بوو بە مانەوەی سوپای رووسی لە میرنشینەکانی دانوب (مولداڤیا و فالاشیا) ، کە قەیسەر لەدەست ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیی دەرهێنابوون و داگیری کردبوون.
- بەرانبەر بەم وازهێنانەی ناپلیۆن، روسیا گفتی ئەوەی دا ئارامی ئەوروپای رۆژهەڵات بپارێزێ.
- روسیا رێگری لە هە ر جووڵەیەکی دوژمنکارانەی نە مسا بگرێت، کە دژی فەرەنسا بێ.

ئەم پەیماننامەیە لە ترسی ئەوە بەسترا تا نەمسا لە دەرفەتێکدا هێرش نەکاتە سەر فەرەنسا.

دوای ئەوەی ناپلیۆن لای رۆژهەڵاتی بێخەم کرد لە نۆڤەمبەری ١٨٠٨ رووی لە ئیسپانیا کرد و براکەی خۆی (جۆزێف)ی گەڕاندەوە سەر تەختی پادشایەتی، هەروەکو نەریتی خۆی لەسەر بنەمایەکی نوێ دەستی بە گۆڕینی شێوازی بەڕێوەبردنی وڵات کرد، هەندێک چاکسازیی بە ئەنجام گەیاندن لەگەڵ بنبڕکردنی هەندێک لە شێوازە کۆنەکان،.ئەمە لە وڵاتێکی دواکەوتووی کۆنەپارێز ئەوەندە کاریگەر نییە، چونکە هیچی لە کاری پارتیزانەکان نەگۆڕی. ئەوان لە لێدانی سوپای فەرەنسا و دروستکردنی تەگەرە و گیروگرفت بەردەوام بوون، لە هەرشوێنێکی بۆیان بلوابا رێگەیان بە داگیرکاران دەگرت و دەستیان لێ دەوەشاندن، لەم کردە و چالاکیانەشیاندا خەڵک و جەماوەر بەگشتی هاوکاریی دەکردن.

## شەڕی نەمسا - بڕوسیا لەساڵی ١٨٠٩

بۆ وڵاتێکی خاوەن شارستانییەت و مێژوویەکی پڕ سەروەری وەکو نەمسا کارێکی چاوەڕوانکراو نەبوو لە شکستەکانی فەرەنسا دەرفەت وەرنەگرێت و نەتوانێت تۆڵە وەرگرێتەوە، دوای ئەوەی ماوەی ٥ ساڵ لە ١٨٠٥ تا ١٨٠٩ لە خۆئامادەکردن و پڕچەککردن و بایەخدان بە پیشەسازیی سەربازیدا بوو.

دیمان کە چۆن هێشتا ساڵێک بەسەر شکستەکەی ئۆسترلیتز دا تێپەری نەکردبوو، بۆ تۆڵەسەندنەوە خەریک بوو لەگەڵ بڕوسیا دژی فەرەنسا بکەوێتە جەنگ، بەڵام سەرکەوتنەکانی فەرەنسا ئەم بیرۆکەی پێ دواخست. دواتر سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن، کە لە سەرتاپای ئەوروپا دەنگیان دابووەوە، سوپا زەبەلاحەکەیمان بینی لە ئیسپانیا بەدەستی گەلێکی هەژار و دواکەوتوی ئایینپەروەر چۆن شکستیان خوارد، وە تێکشکانە یەک لەدوا یەکەکانی ناپلیۆن دوای شکستەکەی بایلن، کە ٢٣ هەزار سەربازی بەدەست ئیسپانییەکان لێ بەدیل گیرا.

ئەم گۆڕانە کتوپڕانەی سەربازی چۆڵکردنی مەیدانی جەنگ و چوونی ناپلیۆن بۆ ئیسپانیا ئەمانە هەمووی بوونە فاکتەر و بەڵگەی ورەبەرزبوونەوەی نەمساییەکان، کە بڕوایان بە خەبات و رزگاری زیاتر بێت. بۆ ئەم مەبەستە نەمسا بەتەنیا لە مەیداندا نەبوو، بەڵکو ئینگلیزەکان گفتی هاوکاریان پێ دابوون، لە ئەڵمانیاش لەنێو ریزی گەنجاندا هەستێکی ئازادیخوازانە پەرەی سەندبوو و درکیان بە رزگاربوون لە چنگ فەرەنسییەکان دەکرد. ئەمانە هەموو بۆ نەمسا بوونە هاندەر و پاڵپشت، ئومێدێکی بەوە هەبوو ئەگەر شەڕ دژواربوو لەلایەن ئەڵمانییەکانیشەوە هاوکاری بکرێ. سەبارەت بە روسەکان قەیسەر خۆی یەکلا کردەوە، کە لە گفت و پەیمانەکانی لەگەڵ ناپلیۆن ڕاستگۆ نییە، ئەم ناتوانێ رووی رۆژهەڵاتی بۆ بپارێزێت.

لەساڵی ١٨٠٩ نەمسا هێزێکی پڕ چەک و شارەزا بە ژمارەی ٤٥٠ هەزار سەرباز بە سەرۆکایەتی بلیمەتترین ئەفسەری (ئەرشیدۆق شارل)، کە لە باشترین ئەفسەرانی سەردەمی خۆی بوو، بۆ رێکخستنی ئەم ئۆپەراسیۆنەی فەرماندارێتیی پێ سپارد. بۆ پڕچەککردن و دەوڵەمەندکردنی ئینگلیزەکان هاوکاریان کردن بە هاوکاری قەرزی هەندێک لایەن ئەم سوپایە ئامادەکرا. هەر کە فەرەنسا ئەو سوپایەی لە ئەڵمانیا هەیبوو بەرەو ئیسپانیای بەرێکرد، ئیتر بێ راگەیاندن لە نیسانی ١٨٠٩ نەمسا هێرشێکی توند و کتوپڕی کردە سەر فەرەنسا.

هەر لەسەرەتاوە ناپلیۆن درکی بە نیازەکانی نەمسا کردبوو، بۆیە فەرمانی ئامادەباشیی بە هێزەکانی سەر سنوور و بەتایبەتی دوقیە ڤەرسۆفیا و ئیتاڵیا و یەکێتیی راین دابوو، دواتر هەر بەپەلە لە ئیتاڵیا گەڕایەوە و هەڵمەتێکی بردە سەر هێزەکانی نەمسا و لە ئیتاڵیاوە کۆمەڵێک شکستی بچووکی بە هیزەکانی نەمسا گەیاندن، پاشان لە ٢٢ی نیسانی ١٨٠٩ لە شەڕی ئەکمول گورزێکی مەزنی لە هێزەکانی نەمسا وەشاند. ناپلیۆن هەوڵی ئەوەی دا بەدوای هێزە بەزیوەکەی ئەرشیدۆق شارل دا بڕوات تا ناو جەرگەی نەمسا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. ئەوەندە نەبێ کە لە ڕووباری دانوب پەڕیەوە و زوو ڤیەننای داگیر کرد، بەڵام ئەرشیدوق شارل ئەوەندەی بۆ مایەوە هێزەکانی خۆی و براکەی ئەرشیدوق جان کۆ بکاتەوە، کە لە ئیتاڵیا دەجەنگان، بۆ رزگارکردنی ڤیەننای پایتەخت.

لەم سەروبەندەدا چەند وردە بەگژیەکداچوونێک رویان دا، نەمسایەکان پاڵەوانێتی زۆریان نواندن، بەڵام دواتر لە شەڕی واگرام لە تەمووزی ١٨٠٩ فەرەنسییەکان بەسەر نەمساییەکاندا زاڵ بوون و دەستێکی کاریگەریان لی وەشاندن، بووە هۆکاری ئەوەی نەمساییەکان داوای ئاگربەست و ئاشتەوایی بکەن.

لەشکری ئینگلیز بۆ هاوکاریکردنی نەمسا لە هۆڵەندا بەرمیەکی تری جەنگی کردەوە، فشارەکان لەوێ کەم بوون بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکی کوشندە لەنێو ریزی سەربازەکاندا، ئەنجامی بە بەزین و تیاچوون گەیاند، ناچاردەبن کە بە دۆڕاوی بگەڕێنەوە دوورگەکەیان. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین ناپلیۆن بەسەر هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی پێنجەمدا سەرکەوت، کە بە یارمەتی ئینگلیز دروست ببوو.

ناپلیۆن نیازی ئەوەی نەبوو دوای شکستەکانی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەمسا وەکو جاران بە وشکی و توندی بێت، بۆ کەمکردنەوەی رق و کینەی نەمساییەکان هەندێک نەرمیی لە مامەڵەکردن نواند، بەڵام بوژانەوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی ئەڵمانی و بووژانەوەی بڕوسیای سەربازیی و فکریی هەڕەشەبوون لەسەر بارودۆخەکان لە ئەڵمانیا. دواتر شکستەکانیان لە ئیسپانیا بەرەو ئەو بیرکردنەوەیە چوون، کە بە دەستێکی پۆڵایین لە هەر یاخیبوونێک بدات، تا بۆ نەمسا ببێتە پەند. سیمای ئەم رەوشە بەسەر پەیماننامەی ڤیەننادا دیار بوو، کە لە ٩ی ئۆکتۆبەری بەسەر ناحەزانیدا سەپاند ١٨٠٩.

پەیماننامەی ڤیەننا سزایەکی زۆری بەسەر نەمساییەکاندا سەپاند:

- ٨٥ ملیۆن فرەنکی زێر.
- لە ڕووی سەربازییەوە نابێت بەهیچ شێوەیەک ژمارەی سەربازانی لە ١٥٠هەزار رەت بکات.
- بە پانتایی رووبەری دانیشتووانی ٤ چوار ملیۆن کەس لە خاکی ئیمپراتۆریەتی نەمسا لێ بسەندرێتەوە.
- زەویەکانی گالیسیای لێ سەندەوە و هەندێکی دا بە روسیای قەیسەری لە بەرانبەر دژایەتینەکردنی فەرەنسا.
- هەندێکیشی دا بە ڤێرسۆفیا لە بەرانبەر دڵسۆزیی بۆ ناپلیۆن.
- هەرێمی سالزبۆرگی دا بە باڤاریای دۆستی و هاوپەیمانی ناپلیۆن.

مەزنترین زیانەکانی لە نەمسا کەوتن، لە دەستدانی کەنارەکانی ئەدریاتیک بوو، بەو هۆیەوە نیشانەکانی دەوڵەتی لەسەر نەما، چونکە نەیدەتوانی پەیوەندی ڕاستەخۆ بە ئینگلیزەوە بکات.

دوای ئەم هاوپەیماننامەیە کتوپڕ ناپلیۆن و ماری لویزی کچی ئیمپراتۆریەتی نەمسا ژیانی هاوسەرییان پێکەوە نا، پێشتریش جۆزیفینی هاوسەری تەڵاق دابوو، بۆ ئەم هاوسەرگیرییە سیاسییە وەزیری دەرەوەی نەمسا میتەرنیخ دەستکایەتی بۆ کردبوو. بە دیدی ئەم چونکە لە تواناڈا نییە بەسەر ناپلیۆندا زاڵ بن، باشتر ئەوەیە لێی نزیک ببنەوە تا ئەو کاتەی نەمسا دە بووژێتەوە و هێزە لەدەستدراوەکەی دەگێڕێتەوە.

## دەستتێوەردانی بەریتانیا لە ئیسپانیا و پرتوگال

لە ڕاستیدا ئەنجامی گەمارۆکە بۆ ناپلیۆن سوودمەند و پۆزەتیف نەبوو، چونکە ئەو هەموو کارانەی ناپلیۆن کردی بۆ نانەوەی کۆسپ لەبەردەم چالاکییە بازرگانی و ئابووریەکانی بەریتانیا هیچ کاریان نەکردبووە سەری، چونکە بەریتانیا و کەشتیگەلی بەریتانی لە سەرتاسەری دەریا تاکە دەستەڕۆ بوو. دواتر لە دەریای باکوور و مانش و دەریای سپیی ناوەڕاست دەستی بەسەر چەند دوورگەیەکی بچووکدا گرتبوو، سوودی لێ وەردەگرتن بۆ ئاودیوکردنی کاڵاکانی بۆ سەرتاسەری ئەوروپا. ئەمەو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی چەندین ئاسانکاریی بۆ کردبوون، هەروەها ئاسانکاریی زۆری لە ئیسپانیا و پرتوگالەوە پێ گەیشتبوو، کە هەموویان بوونە هۆکاری ئەوەی بەریتانیا لە قەیرانەکانی ئابووری دەرباز بێت، بەم شێوەیە هەناردەکانی بازاڕی بەریتانیا بەرەو سەر رۆیشتن لە ساڵی ١٨٠٥ لە ١٠٠ەوە گەیشتە ١٣٠ لە ساڵی ١٨٠٩.

سەرەڕای ئەوەی بەریتانیا لەو قەیرانە دەربازی ببوو، بەڵام هێشتا ترسی سوپاکەی ناپلیۆنی هەر هەبوو، بۆیە بڕیاری دامەزراندنی سوپایەکی زەمینیی مەشقپێکراوی پڕچەکی بەتوانای دا بە هەماهەنگی وڵاتە هاوحەزەکان، لەم روانگەیەوە لە ١٨٠٩ سوپایەکی بە فەرماندەی دۆق لینگتۆن نارده پرتوگال بۆ هاوکاری کردنیان، بۆ ئەوەی کەلێنێک لە جەستەی ئەوروپا بکاتەوە، لەو ڕێگەیەوە لەشکری بەریتانیا خۆی بخزێنتە

ئەوروپا، لە کاتێکدا بەریتانیا لە ئەوروپا بەدوای دۆستدا دەگەڕا، ئەم سوپایەی بەریتانی سەرئێشەی زۆری بۆ ئیسپانیا و پرتوگال دروست کرد.

ئینگلیزەکان لە ڕێگەی شۆڕشگێڕە ئیسپانی و پرتوگالییەکانەوە سەرکەوتنی زۆریان بەسەر سوپاکانی فەرەنسا بەدەست هێنا، ئەوەی هۆکاری ئەم سەرکەوتنانە بوو ناکۆکیەکانی نێوان سوپای فەرەنسی بوو لە دوورگەی ئەیبیریە و بێزاری سەربازەکانیان بە هۆی کەمی خۆراکەوە بوو. ساڵی ١٨١١ نەهات بوو، ولینگتۆن بە هاوکاری دەیان هەزار لە شۆڕشگێڕە نیشتمانپەروەرەکانی ئیسپانی توانیان بچنە ناو مەدریدی پایتەخت و لەوێشەوە بە ڕێگەی چیای (ئەلبیر نیێ)وە هەڕەشە لە ئیمپڕاتۆریەتی فەرەنسی بکەن.

## رووخانی ئیمپڕاتۆریەتی فەرەنسی

بۆ ناپلیۆن لە ئەوروپا شەڕەکانی ئیسپانیا ئەنجامی خراپی لێ کەوتەوە، سەرکەوتنەکانی ئیسپانیا و دەرکەوتنی نەتەوەکان وەکو هێزێکی کاریگەر دژی داگیرکاری فەرەنسی ئومێدێکی بە خەڵک بەخشی، کە لە چنگ ستەم و زۆرداری فەرەنسی رزگاریان بێ. نموونەی ئازایەتی ئیسپانییەکان بووە هاندەرێک بۆ ئەڵمانی و تلیانی و نەمساییەکان تا بەرگری لە نیشتمانی خۆیان بکەن، وای لێ هات هەموو هاووڵاتیەکی ئەوروپی بە ئەرکی خۆی بزانێ کار بۆ لادانی مۆتەکەی داگیرکاری بکات.

لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا گەلێک بزووتنەوەی یاخیبوون سەریان هەڵدا و دژی رژێمی ناپلیۆن راپەرین، بەڵام هەموویان دامرکێنرانەوە، لە فەرەنساش بە هۆی بەردەوامی شەڕ خەڵک توشی شۆک و بێتاقەتی بوو.

لەو کاتەی ئەم گۆڕانانە رویان دەدا پەیوەندییەکانی نێوان روسیا و فەرەنسا روەو خراپی هەنگاویان دەنا، وا پێشبینی دەکرا ئەم هەنگاونانە وڵاتەکانیان بەرەو کارەسات بەرێت.

لە ١٨٠٩ لەو کاتەی پەیماننامەی تسلیت مۆردەکرا، روسیا درکی بەوە کرد، کە لەم پەیماننامەیە هیچی لێ وەدەست ناکەوێت بەڵکو زیان بە بەرژەوەندیە کانی دەگەیەنێت،

لەم روانگەیەوە کاری بە رێنما نوێیەکان کرد، کە بریتی بوون لە دەستگرتن بە بەرژەوەندییەکانی نەتەوایەتیی وڵات.

بۆ گرتنەبەری ئەم سیاسەتە نوێیە پاساوی بە هێزی هەبوون، کە دەبووایە ئەم رێچکەیە بگرێتە بەر، دیارترینیان:

- لەسەر ئاستی سیاسەتی ئەوروپا، ئەوەی قەیسەری روسیا چاوەڕوانی دەکرد لە وەدەستهێنانی ئامانجەکانی هاوپەیمانێتیەکەی لەگەڵ فەرەنسا، ئەوە نەهاتە دی. لە کاتی کۆبوونەوە دووقۆڵییەکەی قەیسەر و ناپلیۆن لەناو کەشتیەکە ناپلیۆن بەڵێنی زۆری پێدابوو، کەچی هیچیان نەهاتنە دی، لەوانە

- هاوکاری کردنی قەیسەر لە جێبەجێکردنی مەرامەکانی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.
- هەروەها واڵاکردنی دەستی قەیسەر بۆ دەستگرتن بەسەر تەنگاوەکاندا.
- دیسان دامەزراندنی دۆقیەی ڤێرسۆفیا و هەرێمی گالیسیای خستە سەری، کە بووە مایەی دروستبوونی ناوپرچکێک لە نێوان روسیا و ئەوروپا، کە هەردەم وەکو پردێک دەمێنێتەوە لە نێوان سنووری روسیا و فەرەنسا بۆ بەکارهێنانی.
- بە هۆی هەڵوێستی فەرەنسا لەلایەنگیریکردنی ڤیرسۆفیا، کە وەکو دژایەتی بەرژەوەندییەکانی روسیا لێک دەدرێتەوە، نیاز و چاوتێبڕینەکانی فەرەنسا ئاشکرا دەکات. دیارە ئەسکەندەری یەکەم قەیسەری روسیا پێی خۆش بوو ڕۆڵێکی سەرەکی لە سیاسەتەکانی ئەوروپا بگێڕێت شایستەی ئاستی دێرینترین خانەوادەی (خانەوادەی رۆمانۆ) پادشایەتی ئەوروپا بێ. بەڵام ئەو ناپلیۆنەی خۆی بە ڕەچەڵەک لە چینی بۆرجوازەکان بوو، ڕۆڵی پادشاکانی لە ئەوروپا پەراوێز کردبوو، بۆیە چینی ئوروستوکراتەکانی روسیا دژایەتیەکی توندی ناپلیۆن و هزر و بۆچوونە شۆڕشگێڕەکانیان دەکرد. ئەم بۆچوونانە گیانی نەتەوەپەرستیی لەلای قەیسەر توندتر دەکرد، گومانی لە نیازەکانی ناپلیۆن هەبوو و بووە مایەی ئەوەی هانی هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانێتیەکە بدات.

٢- سیاسەتی گەمارۆی سەر ئینگلیز لە بنیادنانی قەیسەری روسیا بوو، لە سەرەتا زیانی زۆری بە ئینگلیزەکان گەیاند، بەڵام دواتر ئەو زیانە بەو وڵاتانەش گەیشت، کە مامەڵەیان لەگەڵ ئینگلیز دەکرد.

روسیا دانەوێڵە و دار و کەتانی بە ئینگلیز دەفرۆشت، ئەمانەش بەشێکی گرنگی هەناردەی روسیایان پێکدەهێنا، کە بۆ وڵاتانی دەرەوەی دەناردن، لە بەرانبەریشیەوە روسیا لە رێگەی بازرگانە ئینگلیزەکان گەلێك جۆر لە کاڵا و کەلوپەلی لێ هاوردە دەکرد.

بەرهەمهێنەرو بازرگانە رووسەکان لە ئەنجامی ئەو بایکۆتکردنە لە هەموو توێژەکان زیاتر هەستیان بە وەستانی جوولەی بازاڕ دەکرد، ئاستی بەرهەمهێنان و کڕین و فرۆشتنی بەرهەمەکانیان بە رێژەیەکی بەرچاو دابەزی و داهاتیان کەم کرایەوە، بازرگانەکان ئەم گلەییانەیان دەگەیاندنە قەیسەر.

قەیسەر لێرە ناچار کرا لە رێنماکانی گەمارۆ ئابوورییە سەپێنراوەکەی سەر ئینگلیز دەرچێت.

لە ١٨١١ رێگەی بە گەمیەی کەلوپەلی ئینگلیز دا لە بەندەرەکانی روسیا بێنە ژورەوە، ئەمە وێڕای دەربڕینی نارەزایی لەلایەن ناپلیۆنەوە، بەڵام ئەمە هەر بەردەوام بوو، ناپلیۆن ئەم هەڵوێستەی روسیای بە دەرچوون لە پەیماننامەی تلسیت دایە قەڵەم، بەم شێوەیە هاوپەیمانێتی روسیا و فەرەنسا بەرەو نەمان چوو.

٣- دروست بوونی کێشەیەکی خێزانی پەیوەندییەکانی نێوانیانی ئاڵۆزتر کرد، ئەوکاتەی ناپلیۆن دەستی لە جوزیفینی هاوسەری هەڵگرتبوو، نیازی خواستنی خوشکی قەیسەری هەبوو، لە رێگەی چەند پەیوەندییەکی نافەرمییەوە ئەم خواستەی بە بنەماڵە گەیاند، بەڵام ئەم مەسەلەیە نارەزاییەکی زۆر لە ریزی کاربەدەستە فەرمیەکانی وڵات لێ کەوتەوە.

باوکی ئەمیرە، کە چاودێر و راسپاردەی فەرمیی کچە کەبوو، بە پێی رێنماکانی روسیا مافی ئەوەی هەبوو رەزامەندی لەسەر ئەم هاوسەر گیریە نەدات، لاریبوونی بۆ ناوبانگە زۆرداریەکەی ناپلیۆن دەگەڕایەوە.

هەروەها ئەروستوکراتەکانیش لەم کارە نارازی بوون، بە دیدی ئەوان نابێت یەکێک لە ئەمیرەکانی خانەوادەی رۆمانۆ شوو بە پیاوێکی رەچەڵەکنادیاری وەکو ناپلیۆن بکات، دواتر رێگرێکی تری ئایینی کەوتە پێش ئەم هاوسەرگیرییە، ئەویش ئەمیرە ئەرسۆدۆکس

بوو. ناپلیۆن هەرچەندە پیاوێکی ئایینپەروەر نەبوو، بەڵام کاسۆلیک و سەرکردەی مەزنترین وڵاتی کاسۆلیکە لە ئەوروپا.

بە هۆی دوودڵی و یەکڕانەبوون داواکەی ناپلیۆن دواکەوت، بۆیە ناپلیۆن لە وەڵامی ئەم هەڵوێستەیان داخوازیی ماری لویزی کچی ئیمپراتۆری نەمسای کرد، ئەم کارەی ناپلیۆن سوکایەتیەکی مەزن بوو بۆ خانەوادەی قەیسەر، چونکە بە پێی نەریت و ڕێنماییە پرۆتۆکۆلییەکان دەبووایە ناپلیۆن تا ئەو کاتەی بە فەرمی وەڵامی دەدرێتەوە چاوەڕوان بێت.

ناپلیۆن هەستی بەو گۆڕانانە دەکرد، کە بەسەر هەڵوێستەکانی روسیادا دێن و وردە وردە قەیسەری لێ دووردەکەوێتەوە، ناپلیۆن بە زیرەکی و دیبلۆماسی هەوڵی ئەوەی دا، کە چەندی لە توانایە زیاتر وڵاتانی ئەوروپا لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، یان هەر نەبێ لە کاتی دروست بوونی کێشە و شەڕلەگەڵ روسیا ئەمان بێلایەن بووەستن. روسیاش هەمان هەوڵی دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە فەرەنسا بە بارێکی قورس بەسەر ئەوروپاوە دەزانن.

دیارترین دیاردە لەم بوارە سەرهەڵدانی چالاکبوونی هەرەوەزیی نیشتمانی لە بروسیا و بزووتنەوە نەتەوایەتیەکان لە ئەڵمانیا بوون، دواتر بۆ دووبارە دامەزراندنەوەی سوپای بروسیا خزمەتی سەربازیی ئەو وڵاتە کرایە بە زۆر.

شازادەی سوید براندوت بە هۆی ناڕەزایی لە ناپلیۆن لە روسیا نزیک بۆوە، لەولاشەوە ئینگلیزەکان ئامادەبوون یارمەتی هەرکەسێک بدەن، کە چەک بە رووی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی بەرزکاتەوە.

کاتێک لە ١٨١٢ ناکۆکیەکانی نێوان روسیا و فەرەنسا گەیشتبوونە لوتکەی گرژی، ئەوسا هێشتا هیچ لایەکیان بە تەواوەتی بەرمیەکی مکومی پێک نەهێنابوو بۆیە ململانێکە تەنیا لە نێوان هەردوو زەبەلاحەکە مایەوە.

## هەڵمەتی روسیا

لە ١٢ی نیسانی ١٨١٢ قەیسەری روسیا هەموو ئامادەباشیەکی تەواو کردبوو، ئەوسا گەفێکی بۆ ناپلیۆن نارد، کە دەست لە ڕێکخستنەکانی لە ئەڵمانیا هەڵگرێت و

فەرمان بە لەشکرەکەی بدات لە بڕوسیا بکشێتەوە. بەڵام ناپلیۆن ماوەیەک بوو چاوەڕوانی ئەم هەڵوێستەی دەکرد، دیسان ناپلیۆن لەو سەرکردانە نەبوو گوێ لەم گەفانە بگرێت، بۆیە بە فەرماندایەتی خۆی لەشکرێکی مەزنی پێکهاتوو لە ٧٠٠٠٠٠ حەوت سەد هەزار شەڕکەری لە فرەنەتەوەکان ئامادە کرد و فەرەنسای جێ هێشت. لەناو ئەم لەشکرە سەربازی فەرەنسی، ئەڵمانی، پۆلۆنی، تلیانی و ئیسپانی و سویسری و پرتوگالی هەبوون، ئەم فرەپێکهاتەیەش نیشانەی لاوازی و لەیەکنەچوونی هێزەکە بوو، بە هۆی جیاوازی لە زمان و شێوازی ژیانەوە نەگونجان و لەیەکتێنەگەیشتنیان پێوە دیار بوو.

لە شکری روسیاش لە یەک ملیۆن سەربازی هەڵگری یەک بڕوا و بۆچوون و ئامانج پێک هاتبوون، بە ئامانجی بەرگری لە خاک و نیشتمان هاتبوونە مەیدانی جەنگ. لەم شەڕە روسەکان سوودیان لە ئەزمونی ئیسپانییەکان وەرگرتبوو، خۆیان توشی شەڕێکی مەزنی یەکلا کەرەوە نەکرد، پلانەکەیان بریتی بوو لە کشانەوەی پێ بە پێ بەرەو رۆژهەڵات تا هێزەکانی فەرنسی لە بنکەکانیان دوورکەونەوە و رێگەی هاتووچۆکردنیان بە ئاستەنگ بکەوێت.

لە مانگی ئاب یەکەم بە گژیەکداچوون لە شاری سمولنسک، کە دەکەوێتە نێوان سنووری روسیا و مۆسکۆ روویدا، لەم شەڕە فەرەنسییەکان توانیان شارەکە داگیرکەن روسەکانیش بەرەو ناوەوەی روسیا پاشەکشەیان کرد. ناپلیۆن بەدوایاندا هێرشی برد تا لە ١٤ی سێپتەمبەری ١٨١٢ مۆسکۆشی داگیر کرد، بەڵام کاتێک چووە ناو شار بینیی چۆڵ وهۆڵە، لە ئێوارەی هەمان رۆژ فەرمانڕەوای شار فەرمانی سوتاندنی شاری دا. ماوەی مانگێک ناپلیۆن لە دەرەوەی شار مایەوە لە چاوەڕوانی ئەوەی قەیسەر داوای رێککەوتن و ئاشتەوایی لێ بکات، بەڵام قەیسەر هەموو شێوە رێککەوتنێکی لەگەڵ فەرەنسییەکان رەتکردەوە. لە ترسی ئەوەی وڵاتانی تری ئەورووپا هاوکاری روسیا نەبن و لە ترسی هەڵگەڕانەوەی خەڵک و ترسی بەرپابوونی شۆڕش لە ناوەوەی فەرەنسا، ناپلیۆن بڕیاری کشانەوەی لەشکری دا، لە رێگەی گەڕانەوەیدا بە دەیان هەزار سەرباز لە برسان و لە سەرمان رەق بوونەوە، هەر لە گەڕانەوەشیاندا کاروانەکەیان دەکەوتنە بەر دەستلێوەشاندنی هاووڵاتیان، بە تایبەت سوارچاکانی قەوقاز زیانی زۆریان لێدان، بەم شێوەیە ئەم لەشکرە تا گەیشتە سنووری بڕوسیا تەنیا سەد هەزارێکی لێ مایەوە.

ئەوکاتەی ناپلیۆن گەیشتە بڕوسیا سوپاکەی لەوێ جێهێشت و خۆی گەیاندەوە پاریس بۆ ئەوەی لە کاتی گەیشتنەوەی سوپاکەی هەواڵی زیانەکان لەناو خەڵکەکە بڵاو دەبنەوە نەبنە هۆی نانەوەی ئاژاوە و گێرەشێوێنی، بوونی خۆی لە پاریس بە هۆی ناوبانگی باشی دەتوانێت کۆنترۆڵی دۆخەکان بکات و فەرامۆشی ئازارەکانی سەرنەکەوتنەکانیشی بکات.

لە جەنیوەری ١٨١٣ روسەکان راوی لەشکرە هێرشبەرەکەی فەرەنسایان نا، لە دژەهێرشێکدا توانیان بچنە ناو خاکی بڕوسیا و دۆقیەی ڤێرسۆفیا داگیر کەن. بەم شێوەیە روسەکان لە سەنگەری بەرگرییەوە چوونە سەنگەری هێرشبردن، لەم چوونە پێشەوەیان دەرگای ئومێد لە بەردەم ئەوروپییەکان واڵا کرا، ئیتر ئەو کۆتە شکا، کە پێشتر ئاستەم بوو شکست بە ناپلیۆن بهێنرێت.

## هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی شەشەم

لە پەیماننامەی ئاشتەوایی (تلست)ەوە بڕوسیا کاتەکانی بۆ چاکسازی ناوخۆ تەرخان کردبوو، ئەم پرۆسە چاکسازییەش بواری بەڕێوەبردنی حکومەت و کاروباری دارایی و سوپا و کۆمەڵایەتیی گرتەوە، لەسەر بنەمایەکی یەکسانی هەموو توێژەکانی کۆمەڵ بۆ ئەوەی هەموو کەسێک دژی داگیرکار بوەستیتەوە. ئیمتیازەکانی دەرەبەگی هەڵوەشاندەوە بۆ ئەوەی لە موڵکدارێتی و کڕین و فرۆشتنی زەوییەکان جوتیارەکانیش بەشدار بن، هەروەها جوتیارەکان لە خزمەتکردنی دەرەبەگەکان بووردران.

خزمەتی سەربازیش کرایە زۆر بۆ ئەوەی دەرگای وەدەستهێنانی پلە و پایە لەبەردەم هەموو چینەکانی کۆمەڵ کراوەبن، وەرگرتنی ئەفسەرەکانیش لەسەر بنەمای تاقیکردنەوە و شارەزایی و لێوەشاوەیی بن نەک لەسەر بنەمای چینایەتی و ساماندارێتی.

کاتێک هەواڵی شکستەکانی ناپلیۆن گەیشتن خەڵکی بڕوسی رژانە سەر شەقام داوایان کرد بچنە پاڵ روسیا، نەک بۆ مەبەستی رزگاربوون، بەڵکو بە هۆی ئەو فشارە گەمارۆیەی خرابووە سەر ئابووریی وڵاتەکەیان.

لە ٢٨ی شوباتی ١٨١٣ بڕوسیا و روسیا هاوپەیمانێتیەکیان بەست، لە ١٦ی ئادار بڕیاری شەڕیان دژی فەرەنسا راگەیاند، سوپای بڕوسی دەوڵەتی ساکسۆنیای هاوپەیمانی فەرەنسای داگیر کرد و بەرەو رۆژئاوا هەڵمەتی برد.

هەردوو هاوپەیمان لە راگەیاندنێکی هاوبەشدا ئاشکرایان کرد، کە ئەم شەڕە شەڕی رزگاری نیشتمانی و خۆبەختکردنێکی نەتەوایەتییە دژی هەر داگیرکاریەکی بێگانە و لەسەر هەموو ئەڵمانییەک ئەرکە، ئەم بانگەوازە کاری کردە سەر هەستی ئەڵمانییەکان لەپێناو پاراستنی سەروەریەکانی ئەڵمانیا کەوتنەخۆ.

لە ئایاری ١٨١٣ بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی نەیارانی ناپلیۆن سوپایەکی مەزنی رێکخست و لە رووبەڕووبوونەوەکانیدا سەرکەوتنی باشی وەدەست هێنا، ساکسۆنیای گێڕایەوە و بەشێکی زەویەکانی بڕوسیاشی داگیر کرد، بەڵام ناپلیۆن پێی باش بوو بەسەرکەوتویی رێککەوتنێک مۆر بکات تا ئەو کاتەی هاوکارییەکان دەگەن. وڵاتە شەڕکەرەکان ئەم داخوازیەی ناپلیۆنیان قەبووڵکرد لە ٢٠ی تەمووزی ١٨١٣ ئاگربەست راگەیەندرا، تا ١٠ی ئاب درێژەی کێشا. لە میانەی ئەم دانوستانانە دانیشتن و هەوڵی زۆر دران لەپێناو گەیشتن بە رێککەوتنێک، کە هەموو لایەک رازی بکات. لەم هەوڵانەدا مترنیخی وەزیری دەرەوەی نەمسا رۆڵی سەرەکیی دەگێڕا، لە لایەک بۆ گەیشتن بە خاڵێکی هاوبەش لەگەڵ فەرەنسا و هاوپەیمانەکان، لە لایەکی تریش بۆ گێڕانەوەی لەدەستدراوەکانی نەمسا، هەروەها بۆ ئەوەی فەرەنسا لە نیازە فراوانخوازیەکانی دەست هەڵگرێت و بگەڕێتەوە سنوورەکانی پێشوی، بە پێچەوانەی ئەم داخوازیانە وڵاتەکەی بەشداری لە هاوپەیمانە نێودەوڵەتیەکە دەکات.

لە هەمان کات ئینگلیزەکان لە هەوڵی دیبلۆماسیی چڕ و پڕدا بوون لەگەڵ هاوپەیمانان بۆ بەستنی پەیوەندیی دیبلۆماسی لەگەڵ بڕوسیا و راکێشانی نەمسا بۆ ناو شەڕەکان. کاتێک مترنیخ لە هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو، بڕیاری شەڕی دژی فەرەنسا دەرکرد، ئەمیش چووە ریزی هاوپەیمانانی روسی و بڕوسی، بەم شێوەیە هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی شەشەم لە ئەورووپا دژی ناپلیۆن راگەیەندرا.

## ئۆپەراسیۆنە جەنگیەکان تا دەست لەکارکێشانەوەی ناپلیۆن

سوپای فەرەنسی لە ٤٥٠ هەزار شەڕکەر پێک هاتبوو، کە زۆربەیان نەوجەوان بوون، بە هۆی تەواونەکردنی مەشق و ڕاهێنانە سەربازییەکان لەم بوارە بێئەزموون و نەشارەزا بوون.

سوپای ئەورپاش لە نیو ملیۆن شەڕکەری مەشق پێکراوی بەتوانا و خاوەن بڕوای پۆلاینەوە پێک هاتبوون، سەرەڕای چەندین هێزی یەدەگی ولاتانی بەشداربوو لە پشتەوەیان بۆ جێگرتنەوەی لەشکرەکان ئامادە بوون. ناپلیۆن دەیەویست لەگەڵ هەر دەوڵەتەو بە جیا ڕووبەڕوو بێتەوە، لەگەڵ لەشکری نەمسا لە شاری درێسدن بە گژیەکدا چوون.

فەرمانده‌کانی ناپلیۆن لە مانگی ئابی ١٨١٣ شکستی مەزنیان خواردبوو، لە مەیدانی جەنگ بە بەزێوی روەو فەرەنسا رایان دەکرد، نزیکەی ١٥٠ هەزار شەڕکەریان لێ کوژرا و لە سەنگەر و قەلاکانی بڕوسیاش ١٢٠ هەزار شەڕکەریان لی جێ مابوو، کە ئەمە یەکەم جارە بەم ژمارەیە لەشکری ناپلیۆن بە دیلی بکەوێتە دەست نەیارانی.

لە لایپزیک دیسان شەڕ دامەزرا و ماوەی ٤ رۆژی خایاند، لەم شەڕە رێژەی سەربازەکانی فەرەنسی لەگەڵ دوژمنانی یەک بە چوار بوون، لەم شەڕەشدا دوای ئەوەی خەڵکی ساکسۆنیا و باڤاریا لە کاتێکدا هاوپەیمانی بوون، خیانەتیان لەگەڵ کرد. بۆیە دیسان ناپلیۆن ژێر کەوت، ناچار بوو لەشکرەکەی بکشێنێتەوە، تا نۆکتۆبەری ١٨١٣ لە ڕووباری راین پەریەوە شوێنی سەنگەرەکانی خۆیان لە سنووری سروشتیی فەرەنسا قایم کرد.

لە نۆڤەمبەری هەمان ساڵدا لە رێگەی وەزیری دەرەوەی نەمساوە بە ناوی هاوپەیمانان پەیوەندی بە ناپلیۆنەوە کرا و داوای رێککەوتنیان لێ کرد بە مەرجێ بگەڕێتەوە هەمان سنووری پێشوی بەر لە شۆڕش، بە هۆی لەخۆباییبوونییەوە ناپلیۆن رازی نەبوو، بە بۆچوونی ناپلیۆن بەم رێککەوتنە جڵەوی هەڵوێستەکانی لەدەست دەردەچێت، کە بەدیدی خۆی جڵەوەکەی لەدەست ماوە. دیارە ئاماژەکانی ئینگلیزیش وایان دەگەیاندن، کە چیتر سازشی لەگەڵ نەکات، چونکە کۆتاییەکەی نزیک بۆتەوە.

لەو کاتەدا هێزی هاوپەیمانان سنووری فەرەنسایان بەزاندبوو و بە سەرکەوتویی هەڵمەتیان بەرەو پێش دەبرد، تا لە ۳۱ی ئاداری ۱۸۱٤ دەستیان بەسەر پاریس داگرت و چوونە ناوەوەی.

ناپلیۆن بە نیاز بوو بەردەوامی بە شەڕەکان بدات، بانگی هەموو فەرماندەکانی کرد و نیازەکانی خۆی پێ راگەیاندن، بەڵام ئەوان دۆخ و هەواڵەکانی وڵاتیان پێ راگەیاند، وتیان: چونکە فەرەنسییەکان پابەندی ناپلیۆنن، بۆیە حەزیان لە ئاشتییە و نەفرەت لە شەڕ دەکەن، ئەو شەڕەی چاوبڕینی ئیمپراتۆرەکان لە فراوانخوازی تێر ناکات و فەرامۆشی بەرژەوەندییەکانی وڵات دەکات.

سنوور داخستنەکەی ناپلیۆن بەڕووی بازرگانە ئینگلیزەکان فەرەنسای نەگەیاندە کەناری ئاشتی و بووژاندنەوە، ئەوەی بەم هۆیەوە زیادی کرد قاتوقڕی و بێکاری بوو. ئیتر ناپلیۆن دەستی لە کار کێشایەوە و دەستبەرداری تەختی ئیمپراتۆریەت بوو، بەرەو دوورگەی ئەلبا سەفەری کرد، هاوپەیمانان لەسەر بڕیاری دوورکەوتنەوەی رازی بوون بە مانەوەی نازناوی ئیمپراتۆر.

## پەیماننامەی یەکەمی پاریس

دوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان پادشا و سەرۆکی وڵاتان لە کۆشکی (تالیران) کۆبوونەوە، تالیران ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی ناپلیۆن وەزیری دەرەوە بوو و دواتر لادرابوو.

ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە بانگەوازێکیان بۆ گەلی فەرەنسا بڵاو کردەوە، تیایدا داوایان لە فەرەنسییەکان کرد شێوەی رژێم بۆ خۆیان دەست نیشان بکەن، وە پێشنیاریشیان بۆ کردن رژێمی پادشایەتی بگەڕێننەوە.

ئەنجومەنی پیران کۆبوونەوەکەی خۆیان لە ۲ی نیسانی ۱۸۱٤ بەست و بڕیاری لادانی ناپلیۆنیان دا لەگەڵ پێکهێنانی حکومەتێکی نوێی کاتیی بە سەرۆکایەتی تالیران.

لەسەر پێشنیار و حەزی تالیران داوای لە لویسی هەژدەهەمی برای لویسی شازدەهەم کرد، کە دەسەڵات بگرێتە دەست، بەم شێوەیە خانەوادەی بۆربۆن دوای ۲۳ ساڵ، کە شۆڕشی فەرەنسی دووری خستبوونەوە، گەڕانەوە سەر حوکم.

حکومەتی کاتیی فەرەنسا، کە لەژێر سێبەری داگیرکاری دوای لادانی ناپلیۆن دامەزرا، وا بیری دەکردەوە بە گەڕانەوەی خانەوادەی بۆربۆن ئارامی و خۆشگوزەرانی بۆ وڵات دەگەڕێتەوە.

لە ٣٠ی ئایاری ١٨١٤ پەیماننامەیەک لە نێوان فەرەنسا و وڵاتە هاوپەیمانەسەرکەوتووەکان مۆر کرا، ئەم پەیماننامەیە بە شێوازێکی میانڕەو و هۆشمەندانە لەلایەن وڵاتانی ئەورووپاوە داڕێژرابوو.

سەرکەوتووەکان فەرەنسایان بۆ سنووورە کۆنەکەی بەر لە شۆڕش گەڕاندەوە، کە هەندێک لە ناوچەکانی ئەلزاس و روێکی ڕووباری راین و زۆربەی خاکی ساڤوای و ئەڤینونیان بۆ هێشتەوە، ڕێگەشیان پێدا کە موستەعمەرەکانی بگەڕێنێتەوە بەردەستی خۆی جگە لە دوورگەی ئەنتیل و هەندێک دوورگەی تر لە زەریای هێمن، هیچ باجێکیشیان بەسەر فەرەنسییەکاندا نەسەپاند، سوپای داگیرکاریشیان لەناو خاکی فەرەنسا نەهێشتەوە.

ئەم نەرمونیانیە بۆ ئەوە کرا تا یارمەتیی فەرەنسییەکان بدەن ئەوانیش هزری شۆڕش لەسەریان وەدەرنێن و هاوکاریی پادشاش بکەن بۆ قایمکردنی پێگەی حکومڕانیی.

## لویسی هەژدەهەم

هەر دوای رووخانی رژێمی ئیمپراتۆریەت لویسی هەژدەهەم رایگەیاند، کە ڕێز لەو بارودۆخە دەگرێت، کە حاڵی حازر لە ئەنجامی شۆڕش هاتۆتە کایەوە لە دەستوورێکی نوێدا، کە بە فەرەنسییەکانی بەخشی لەژێر ناوی (دۆکیۆمێنتی چارت):

- رازی نەبوو دان بە رژێمی حکومڕانی کۆن دابنێت، رایگەیاند ساڵی ١٨١٤ دەکاتە ١٩مین ساڵی حکومڕانیی.
- بنەمای سەروەری نەتەوەیی هەڵوەشاندەوە.
- رایگەیاند کە خۆی بە پێی پەیامی خوا پادشایە.
- بە پێی دەستوور بۆ سەرپەرشتیکردن و جێبەجێکردن دەسەڵاتی فراوانی بە پادشا بەخشی.
- لەگەڵ بەرپرسنەبوون لەبەردەم دادگا، واتە بە پێی ئەم بڕگەیە کەس بۆی نییە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات بۆ هەر بڕیارێک.

- دەسەڵاتی یاسادانانی بە دوو ئەنجومەن بەخشی (ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران) ئەمەیان لەلایەن گەلەوە دێتە هەڵبژاردن.
- مافی دەنگدانیشی بە ئاستی سامان و داراییەوە سنووردار کرد.
- لە دەستوور مافی ئازادی رۆژنامەنوس و ئازادیی تاکەکەسیەکان و ئایینپەرستیی مسۆگەر کردن.

هەر چەندە ئەم دەستورە زۆر لە مافەکانی گەلی فەرەنسیی پێشێل کردبوو، بەڵام چونکە دوای شکستەکان هاتبوو، خەڵک قبووڵی بوو و زۆر بە وشیاریی و هۆشمەندانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد، وردە وردە پادشا بە عەقلیەتی کۆنەوە دەگەڕایەوە مەیدان، بە ماوەیەکی کورت وەکو ئەوەی لە رابردوو هیچ رووی نەدابێت و نەکرابێت هەموو ڕووداو و بڕیارەکانی لەبیر خۆی بردنەوە و پەندی لە هیچ وەرنەگرت.

- هەر زوو موڵک و سامانی بۆ هەندێک لە شکۆداران و نوبەلاکانی گەڕاندەوە، بۆ ئەوانی تریش لە سامان و گەنجینەی دەوڵەت قەرەبووی کردنەوە.
- هەر بەشێنەیی بۆ رەفتارە ستەم و زۆرداریەکەی گەڕایەوە، چاودێری توندی لەسەر رۆژنامەکان دانا.
- هەزارەها ئەفسەری رەوتی کۆماریی لەسەر کار لابردن.
- پاسەوانی پادشای لە کوڕ و نەوەکانی شکۆدار و جوامێرەکان (نوبەلا) دامەزراند بە بوودجەیەکی بەهابەرزی خەملێنراو لە پارەی دەوڵەت و بە موچەیەکی نایابیشەوە.
- ئاڵا سێ رەنگیکەی شۆڕشی هەڵوەشاندەوە و لە شوێنی ئەو ئاڵای خانەوادەی بۆربۆنی هێنایەوە، کە لە رەنگی سپی و گوڵی شلێر و زەرد پێک هاتبوو و کردی بە سونبولی وڵات.
- لە رووی ئابوورییشەوە نەیتوانی هیچ گۆڕانێکی چاکسازی بکات، باری ئابووریی وڵات لەوپەڕی خراپی دابوو، بێکاریی سەرتاپای وڵاتی گرتبووەوە بە تایبەت لە ریزی هەوادارانی ناپلیۆن و ئەوانەی بەهیوای گەڕانەوەی بوون، ئەمە لە رووی ناوخۆ.

سەبارەت بە دەرەوەی فەرەنسا بەپێی ئەوەی لە پەیماننامەی پاریس هاتبوو وڵاتانی شەڕکەر کۆنگرەیەکیان لە ڤیەننا بەست بۆ لێکۆڵینەوە لە هەموو کێشە و گرفتەکانی پەیوەست بە ئەورووپا.

هەر زوو دەرکەوت لەسەر دەستکەوتەکانی شەڕ ناکۆکی لە نێوان روسیا و ئینگلیز هەیە، هەروەها ناکۆکیی بنەڕەتی لەسەر ئاستی حەز و بەرژەوەندییەکانی تر هەن، کە لەیەکتر نزیککردنەوەیان کارێکی ئاسان نییە.

هەر کە هەواڵی ئەم ناکۆکیانە و هەواڵەکانی تری ناوخۆ لە بێزاربوونی خەڵک و حەز و داخوازییەکانیان بە گەڕانەوەی رژێمی کۆن لە رێگەی میرای پادشای ناپۆلیی فەرەنسی بە ناپلیۆن گەیەندران، ناپلیۆن بە بیستنی ئەم هەواڵانە بڕیاری گەڕانەوەی بۆ پاریس دا.

لە دوورگەی ئەلبا شوێنی دوورخستنەوەکەی لە ٢٦ی شوباتی ١٨١٥ رای کرد، بەنهێنی لە کەنارەکانی فەرەنسا لە نزیک شارێک دابەزی، کە وەکو سەرکردەیەکی رزگارکار زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێ کرد و باوە شیان بۆ کردەوە و هەموو شارەکانی فەرەنسایان بۆ خستنە سەر پشت. بە بڵاوبوونەوەی هەواڵی گەڕانەوەی ناپلیۆن لویسی هەژدەهەم بۆ بەلژیک رای کرد، سەرلە نوێ لە ٢٠ی ئاداری ١٨١٥ ناپلیۆن هاتەوە ناو کۆشکی تویلری.

کاتێک ئامادە بووانی کۆنگرەی ڤیەننا بەمەیان زانی، بەیاننامەیەکیان دەرکرد بە ناوی فەرەنسا لە ١٣ی ئادار، تالیران بە ناوی فەرەنسا ئیمزای لەسەر کرد، تیایدا ناپلیۆنیان بە دوژمنی دونیای شارستان ناوبرد، داواشیان لە گەلانی ئەورووپا کرد شەڕی لەگەڵدا بکەن و لەناوی بەرن.

## حکومڕانیی ١٠٠ رۆژی

ناپلیۆن دوای گەڕانەوەی، یەکەم کار کە بایەخی پێدا:

- کۆکردنەوەی لایەنگر و پەیداکردنی متمانەی نەتەوەی فەرەنسا بوو.

- هەروەها دەستوورێکی ئیمپراتۆریی نوێی دەرکرد، بە پێی ئەم دەستورە رێگەی بە فراوانترین پانتایی جەماوەری دا بەشداری لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بکات.
- لە پێناو سنووردارکردنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر، وڵاتی بە دوو ئەنجومەن سپارد، ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران.
- سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە، هەوڵی دا وڵاتانی ئەوروپی بگەیەنێتە ئەو بڕوایە، کە نیازی ئاشتی و دۆستایەتیی لەگەڵ دەوروبەردا هەیە.
- پەسندکردنی هەموو بڕگەکانی پەیماننامەی پاریس.

بەڵام وڵاتە سەرکەوتووەکان هەموو مامەڵەکردنێکیان لەگەڵ رەت کردەوە و ئەم بانگەوازەشیان پشت گوێ خست، جەختیشیان لەسەر دوورخستنەوەی کرد. بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەش هەر دەوڵەتەی بە ١٥٠ هەزار سەرباز ئامادەیی خۆی نیشان دا.

ئەو کاتەی ناپلیۆن گومانی نەما کە ئیتر شەڕ بەڕێوەیە و بەر لەوەی ئەوان بکەونە خۆ، لەشکرێکی نیو ملیۆنیی پێک هێنا و خۆی فەرماندایەتیی کرد. ئەوکات لەشکری ئینگلیز بە فەرماندایەتی شازادە ولنگتۆن لە بەلژیک پنگا بووەوە، لەشکری بروسیاش بە فەرماندایەتی بلوخەر بوو، بەر لەوەی ئەوان دەرفەت وەرگرن، ناپلیۆن پلانێکی سازدا بۆ هێرشێکردنە سەر هەردووکیان و لەناویان بەرێت. لە ١٦ی حوزەیرانی ١٨١٥ لەشکری فەرەنسی بە فەرماندایەتی ناپلیۆن دەستی لە لەشکری بلۆخەر وەشاند و بەسەریدا زاڵ بوو، فەرمانی بە (گروش)، دا کە سەرکردەیەکی خۆی بوو، بروسیەکان راوبنێت، خۆشی بەرەو بەرەکانی ئینگلیز رۆیشت لە واتەرلۆ. ئەگەر لەشکری بلوخەر کتوپڕ بە فریای لەشکری ئینگلیز نە کەوتبا، ئەوا ناپلیۆن بە ئاسانی بەسەر ئینگلیزەکاندا زاڵ دەبوو، لە ١٨ی حوزەیرانی ١٨١٥ بە هاتنی بلۆخەر شکستی بە ناپلیۆن هێنا و بەرەی جەنگی پێ چۆڵکرد، لە دوای خۆی نزیکەی ٣٠ هەزار شەڕکەری لێ جێ ما.

بە شکستخواردنی ناپلیۆن کۆتایی بە ململانێ دوور و درێژەکەی نێوان شۆڕشی فەرەنسی و خانەوادەی پادشاکانی ئەوروپا هات، لە لایەکی تر ئەم ململانێیە ماوەی ٢٣ ساڵ بەر لە واترلۆ لە شەڕی (ڤالمی)یەوە دەستی پێ کردبوو. واتەرلۆ کۆتایی بە چەرخی شۆڕشی فەرەنسیی هێنا، سەرەتای چەرخێکی نوێ دەستی پێکرد، ئەویش گەڕانەوەی خانەوادەی بۆربۆن بوو.

ناپلیۆنیش کەشتیەکی بەریتانی باری کرد و بۆ دوورگەی هیلانەی پیرۆزی برد، وەکو زیندانی لەوێ مایەوە تا لە ٢١ی ئایاری ١٨٢١ هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکات.

## پەیماننامەی دووەمی پاریس

لە ٧ی تەمووزی ١٨١٥ بۆ جاری دووەم نوێنەرانی هاوپەیمانەکان هاتنەوە ناو پاریس، لەگەڵ خۆشیاندا لویسی هەژدەهەمیان هێنایەوە، پەیماننامەی پاریسی دووەمیان لە ٢٠ی نۆڤەمبەر مۆر کرد، بەڵام ئەم جارەیان بە مەرجی توند تر:

- ٧٠٠ ملیۆن فرەنک زێڕ و ٣٠٠ ملیۆن فرەنک وەکو قەرەبووی جەنگ بەسەر فەرەنسادا سەپێندرا.
- دەبێت فەرەنسا رازی بێت ١٥٠ هەزار سەربازی داگیرکار لە هەندێک لە هەرێمەکانی بمێننەوە بۆ ماوەی ٥ ساڵ لەسەر خەرجی فەرەنسا بە مەبەستی پاراستنیان.
- فەرەنساشیان گەڕاندەوە بۆ سنوورەکانی لویسی شازدەهەم.
- رێگەشیان پێ نەدا دەست بەو خاکانەوە بگرێت، کە لە سەردەمی شۆڕش داگیری کردبوون، تەنیا شاری نیس و هەندێک لە خاکی ساخوای نەبێت.

ئەم پەیماننامەیە رێگەی بەو رق و کینە نەدا، کە لە دڵی بروسیەکان و نەمسایییەکاندا هەیە، تا تۆڵەی رابردویان بکەنەوە، ئەمەو تا رادەیەک میانڕەوی و هۆشمەندی بە شێوەی دارشتنی پەیماننامەکەوە دیار بوو، بۆ ئەم میانڕەویە مێرخاسیەکە بۆ ئینگلیزەکان دەگەڕێتەوە، ئەوان رێگەیان نەدا دەرگای تۆڵەسەندنەوە بکەنەوە و ببێتە هۆی بێزاری وبیرکردنەوە لە کاردانەوە و یاخی بوون لە پادشا و گەڕانەوەی شەڕ و جەنگ.

## کۆنگرەی ڤیەننا

ناپلیۆنمان بینی لە سەردەمی حکومڕانیی وەکو دیاردەیەکی نامۆ بوو، هی ئەوە نەبوو لە ئاستیدا بێدەنگی بنوێنرێت. ناپلیۆن کاری لە گۆڕینی نەخشەی ئەوروپای سیاسی کرد، خاکی فەرەنسا لە سەردەمی ناپلیۆندا بە ڕێژەیەک فراوان بوو، کە پێشتر وای بەخۆوە نەدیبوو. جگە لە خاکی خۆی بەلژیکا و هەموو زەویەکانی نێوان فەرەنسا و ڕووباری راینی دەگرتە خۆ، دواتر کاری بۆ ئەوە کرد کەنارەکانی ئەڵمانیا تا دەریای بەلتیکی رۆژئاوا بخاتە ژێر دەستی، لە ئیتاڵیاش دەستی بەسەر هەموو کەنارەکانی ئیتاڵیادا گرت. لە سنووری فەرەنساوە تا رۆما، کوڕی خۆی کرد بە پادشای شاری پیرۆز، ژمارەی بەرێوەبەرایەتیەکان لە ٨٣وە بۆ ١٣٠ بەرێوەبەرایەتی بەرز بووەوە.

بە فراوانکردنی سنووری فەرەنسا نەوەستا و بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی هەوڵی گۆڕینی سیماکانی ئەوروپای دەدا، بۆ نموونە: سویسرا، هەر بە ناو کۆمارێکی سەربەخۆ بوو، بە رواڵەت سەر بە فەرەنسا بوو، لە پۆلۆنیا میرنشینی ڤێرسۆفیای لەناو دامەزراند و بە مەلیکی ساکسۆنیا بەخشی، کە دۆستی خۆی بوو بێ گوێدانە بەرژەوەندی و مافەکانی بڕوسیا و نەمسا و روسیا.

لە ئەڵمانیا لە نێوان ئەو خاکانەی بە فەرەنساوەی لکاندبوون لەگەڵ هەندێک لە خاکەکانی بڕوسیا و نەمسا دەوڵەتێکی لە چەند دەوڵەتۆکە دروست کردبوو، ناوی نابوون یەکێتیی راین، ئەم دەوڵەتەشی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی. سەرەڕای هەموو ئەم رەفتار و کارە ناڕەوایانەی مافی خانەوادە پادشایەکانی ئەوروپای پشتگوێ خستبوو، بەڵکو پێشێلیشی کردبوون، بۆ نموونە لەسەر حوکم لادانی خانەوادەی پادشاکانی هۆڵەندا و ئیسپانیا و لویسی شازدەهەم و جیرۆم ستفالیا.

ناپۆلیی کردە دیاری بۆ کارۆڵینای خوشکی و مۆرای مێردیشی کرد بە پادشای ئەوێ، هەروەها زۆربەی سامانەکانی پاپا و لۆمباردیا و بوندوقیەی خستنە سەر یەک و کردنیە میرنشینێک و خۆی کردە پادشای ئەوێش، بەڵام حکومڕانیەکەی بە جوزفینی زڕ کوری سپارد، دواتر لە خۆی نەگرت کە کارێکی شایستە بە خاڵی خۆی بدات و کردی بە کاردینال.

لە ڕێگەی ئەم نەخشەیەوە دەبینین ئەورووپای سیاسیی سەردەمی ناپلیۆن زۆر جیایە لە ئەورووپای بەر لە شۆڕش، ناپارسەنگی و خۆسەپاندنی فەرەنسای بەڕوونی پێوە دیارە، کە ئەمەش بە کتومتی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی وڵاتە زەبەلاحەکانی وەکو ئینگلتەرا و ڕوسیا نەدەهاتەوە. ئەمە ئەو شەڕە دژوارەمان بۆ دەردەخات، کە فەرەنسای شۆڕش لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپا بە درێژایی ٢٣ ساڵ دەجەنگین، ئەوەی ناپلیۆن لە وڵاتە مەزنەکان لەدوای خۆی هێشتەوە شوێنەوارێکی پڕ خەتەرناک و زیاتر مانەوەی مەودا کۆمەڵایەتی و ئابووریی و هزرییەکان بوو.

شاڵاو و داگیرکردنەکانی ناپلیۆن دامەزراندنی حکومەتی نیشتمانی و دەستوورێکی فرە ئازاد و دیموکراتی بە دواوە دەهات، دەستوورێکی نوێی ئاودراو بە بڕواکانی شۆڕشی فەرەنسی تیایدا دەسەڵاتی دەوڵەت دیار و سنووردار بوون و مافی هاووڵاتیان پارێزراو بوو.

لە قۆناغی سێیەمدا دەستی بە بزووتنەوەیەکی چاکسازی لە شێوەی چاکسازیەکەی شۆڕش لە وڵات ئەنجام دەدا، لەم ڕووەوە دەتوانین ئیمپراتۆریەت بە میراتگری شۆڕش و پارێزەری بڕواکانی دابنێین.

چاکسازییەکانی دژی هەموو دەربەگەکان بوون، سیستەمی چینایەتیی نەهێشت و هەموو خەڵکی لە ئەرک و ماف یەکسان کرد، دیسان جوامێرەکانی (نوبەلا) لە ئیمتیازاتەکان بێبەش کردن، لە هەموو ئەورووپا دەبووایە ڕاستەوخۆ سەر بە ناپلیۆنەوە بن، کڵێساش هەندێک لە سامان و دەسەڵات و دەستکەوتە ناڕەواکانی لەدەست دان لەگەڵ لێسەندنەوە و سنووردارکردنی دەسەڵاتی سیاسی و دادگاییەکانی کڵێسا، باجی دەیەکی هەڵوەشاندەوە، بەرانبەر بە یاسا بڕوادار و بێبڕوا کاسۆلیک و نا کاسۆلیک هەموویان یەکسان کران.

بە شێوەیەکی گشتی هەموو ئەو وڵاتانەی کەوتنە ناو دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەت بنەما بنەڕەتیەکانی شۆڕشی فەرەنسیی لێ پیادە کردن، لە هەموو شوێنێک هەوادار و لایەنگرانی بڕواکانی ناپلیۆنت دەبینی، ئەوانەی تینوی ئازادی بوون لە سەدەی هەژدەم. دواتر دەبینین کە ئاسەواری ئەم گۆڕان و چاکسازیانە لە ئیتاڵیا و خوارووی ئەڵمانیا مانەوە و تیا نەچوون، تەنانەت ئەو وڵاتانەی نە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ناپلیۆنیش لەژێر ڕەنگدانەوەی شۆڕشی فەرەنسی چەند گۆڕان و نوێکاریەکیان لێ ئەنجام دران.

دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن وڵاتە سەرکەوتووەکان دەبووایە کار بۆ گەڕاندنەوەی نەخشەی ئەورووپای سیاسی بکەن بۆ ئەوەی بیگێڕنەوە بۆ سەردەمی بەر لە شۆڕش، یان هەر نەبێت لانی کەم لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان بگونجێنن و بەسەر هەموو بزووتنەوە نەتەوایەتی و پێشکەوتنخوازەکانی ئەو وڵاتانەدا زاڵ بن.

## کارەکانی کۆنگرە

بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە لە پەیماننامەی پاریسی یەکەمدا هاتبوو، کە بۆ پرۆسەی ئاشتەوایی لە سەرتاسەری ئەورووپا و چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان کۆنگرەیەک لە ڤیەننا ببەسترێت.

هەڵبژاردنی شاری ڤیەننا بۆ ئەوە نەهاتبوو، کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەورووپا، بەڵکو وەکو قەرەبوویەک بۆ ئەو زیانانەی فەرەنسا لە نەمسای دابوون، لە زیانی ماددیی و سیاسی و دابڕاندنی خاک و سامانی، دواتر چوونە بن باری ئەو زیانانەی لە سەردەمی شۆڕشەوە لە هەموو وڵاتانی هاوپەیمان لێی کەوتبوو، بۆیە هەموو لایەک رازی بوون شوێنی ئەو کۆنگرەیە ڤیەننا بێت.

ئەوە بوو لە سێپتەمبەری ١٨١٤ەوە پادشا و سەرۆک و وەزیرەکان بە مەبەستی بەستنی ئەم کۆنگرەیە رویان لەم شارە کرد، ژمارەی شاندەکان گەیشتنە ١٤٠ شاند، ئەو میرنشینانەی لە ئەنجامی داگیرکردنی میرنشینەکەیان و یەکخستنیان لەگەڵ میرنشینێکی تر ئەوانیش لەم کۆنگرەیە ئامادە بوون بە نیازی گێڕانەوەی مافەکانیان یان قەرەبووکردنەوەیان.

ئەوەی ڕاستی بێت پایتەختی نەمسا ئەم چەند رۆژە لە خۆشترین سات و گوزەراندا دەژیا، بۆ نەمساییەکان شانازی بوو، کە ئیمپراتۆرەکەیان فرانسوای یەکەم خاوەن شکۆیەکی وەکو قەیسەری روسیا ئەسکەندەری یەکەم خاوەنی بەهێزترین سوپای دونیا و پانترین ئیمپراتۆریەت و فریدریک گلیۆنی سێیەم پادشای بروسیا و بەهێزترین فەرمانڕەوای ئەڵمانییەکان و کالیسریی وەزیری دەرەوەی ئینتالیا بە یاوەری پاڵەوانی جەنگی ئیسپانیی دژی ناپلیۆن لەو کاتە داوەت بکات و لە پێشوازیاندا بێت، بەیەکگەیشتنی ئەم ژمارە کەسایەتییە پایەبەرزەی ئەورووپا بۆ وەزیری دەرەوەی نەمسا

مترنیخ دەرفەتێکی باش بوو تا دیبلۆماسیەتی خۆی لەم رۆژە دەربخات، بەتایبەت بە حوکمی ئەوەی خۆی وەزیری دەرەوەی وڵاتی خاوەن میوانە، مافی خۆیەتی سەرپەرشتی کۆنگرە بکات و بۆچوونە پادشاخوازیەکانی خۆی و بیرە کۆنەپەرستیەکەی ورد کاتەوە، تەنانەت بۆ دوای کۆنگرەش کاریگەریان هەبێت.

نەمساییەکان بەگشتی و مترنیخ بەتایبەتی هەوڵ و تەقەلای زۆریان دا، کە ئەم چەند رۆژەی نەمسا بۆ شاندی میوان رازاوە و پڕ لە خۆشی و رابواردن بێت، کۆشکی ئیمپراتۆر رۆژانە پێشوازیی لەو هەموو پادشا و شاندی یاوەر و سەرکردە مەزنانە دەکرد، هەموو خەڵکی نەمسا و کاربەدەستانی لە پێشوازی و خزمەت میوانان دابوون، رۆژانە بە چاوتێری ئەو سفرە و خوانانە دەڕازندرانەوە. سازدانی ئاهەنگ و جوانترین کچی ئەورووپا رۆژانە لە خزمەت میوانانیدا بوون، باشترین تیپی میوزیک و بەناوبانگترین گۆرانیبێژ و بەهێزترین شانۆگەری و خەرجیەکی کراوە رۆژانە بەردەوام بوون.

گورزەکانی ناپلیۆن بۆ ئیمپراتۆری نەمسا تەنیا کاتیی بوون، لە توانایدا بوو هەموویان قەرەبوو بکاتەوە.

بە هۆی بۆچوونی جیا و بەرژەوەندی جیاوە ئەم شاندە زۆرانە نەیانتوانی بگەنە هیچ رێککەوتنێک، بۆیە بڕیاریان دا چوار وڵاتە مەزنە سەرکەوتووەکە بە جیا (روسیا، بەریتانیا، بڕوسیا و نەمسا) لە لێژنەیەکی چوارقۆڵیدا کۆببنەوە و لە هەموو کێشەکان بکۆڵنەوە و چارەسەریان بۆ دیاری بکەن و پێشکەشی خاوەنی پەیوەندیدار بکەن، ئەمە لە رووی شکلیەوە. بەڵام لە رووی پڕاکتیکەوە وڵاتە مەزنەکان سووربوون لەسەر ئەوەی دەستکەوتەکان لە نێوان خۆیاندا دابەشکەن و نەخشەیەکی نوێش بۆ ئەورووپا داڕێژن، کە لە بەرژەوەندییە بنەڕەتییەکان یەک بێت، دەوڵەتە بچووکەکانیش ئەوەندەیان لەسەر بوو گوێڕایەڵی بڕیارەکانی چوار وڵاتە مەزنەکە بن.

سەرەتا فەرەنسا لە وڵاتە بچووکەکان بوو، بەڵام بۆ قایمکردنی پێگەی لویسی هەژدەهەم لە رووی ناحەزانیدا، فەرەنساش خرایە ناو لیستی وڵاتە مەزنەکان. دەبێت ئەوە بڵێین زیرەکی وبلیمەتی تولیران بووە هۆی ئەوەی کار بکاتە سەر کۆنگرە، تا فەرەنسا لە وڵاتە مەزنەکان ئەژمار بکرێت، چونکە هەموو وڵاتە بچووکەکان داوایان دەکرد دانیشتنەکانی کۆنگرە بە ئاشکرا و بە بەشداری هەموو وڵاتە بچووک و مەزنەکان بێت،

بەڵام ئەمەیان بۆ نەچوەسەر. تەنیا فەرەنسا، کە سوودی لە ناکۆکیەکانی نێوان وڵاتە مەزنەکان وەرگرت، توانیی شوێنی خۆی لە لێژنە چوارقۆڵییەکە بکاتەوە.

دەرکەوت گفتوگۆکان لە سەرەتا ئامانجەکانیان کردبوونە دوو بەش: گشتی و تایبەتی. ئامانجە گشتییەکان هەموویان لەسەری ڕێک کەوتبوون، کە لە سەرانسەری ئەوروپا ئەنجام بدرێن، تایبەتیش هەر دەوڵەتەی بە جیا دەبێ، ئەمەیان ناکۆکیی لێ کەوتەوە.

ئامانجە هاوبەشەکانی نێوان هەموویان بریتی بوون لە:

بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامیی وڵاتە مەزنەکان:

- پێویستە هەموو ڕژێمە شۆڕشگێڕە کۆماریخوازەکان لە سەرتاسەری ئەوروپا لەناو ببردرێن.
- دەستگرتن بە بڕوا و بنەماکانی گەڕاندنەوەی مافی هەموو کەس و فەرمانڕەوایەک، کە ناپلیۆن دووری خستۆتەوە، جا لە هەر شوێنێک بێت.
- کارکردن بە هەموو شێوازێک بۆ پاراستنی ڕژێم و سیستەمە کۆمەڵایەتییە کۆنەپارێزەکان و پاراستنی مافی تەختی حکومڕانیەکانیان.
- ڕوانەکردن بە فەرهەنسا، وە وەکو چاوگی ئاژاوە و گێرەشێوێن لە ئەوروپا سەیر بکرێت، بۆیە دەبێت لە رووی سەربازی و سیاسییەوە لاواز بکرێت. پشتگیری لە ڕەوتە کۆنە ارێزەکان بکرێت و بەهێز بکرێن، تا جارێکی تر بە ناوی شۆڕشەوە بیری ئاژاوەگێڕی لە ئەوروپا بڵاو نەکەنەوە و نارەحەتی لە ناوچەکە پەیدا نەکەن، کە هەموویان دژی بەرژەوەندییەکانی وڵاتە مەزنەکانن.

لە تەک ئامانجە گشتییەکان هەر وڵاتەو ئەجندا و مەبەستی تایبەتی خۆی هەبوو و دەیویست بە ئەنجامی بگەیەنێ، کە بوونە هۆی لە یەک هەلۆقزینەوە و بە یەک نەگەیشتن و وهەڕەشەی جیابوونەوەی لە ئامادەبووانی کۆنگرە دەکرد. ئەنجامی ئەو نەگەیشتنە یەکە بوو کە ناپلیۆن لە شوێنە دوورخراوەکەیەوە بگەڕێتەوە پاریس و ١٠٠ ڕۆژی تر دەسەڵات بگرێتە دەست، لە خوارەوە بە کورتی بنەماکانی سیاسەتی هەر یەک لە وڵاتە مەزنەکان لە و کۆنگرەیە نمایش و ئاشکرا دەکەین.

## ئامانجەکانی نەمسا

مترنیخ وتووێژکاری نەمسایی و سەرۆکی کۆنگرە دەیزانی شەبەق و تریسکەی سەرکەوتن و رازاندنەوەکانی ئاهەنگەکان هەموویان دەستکردن و هیچیان ناگەنە پێگەی ئەو گورز و زیانانەی چەندین جار لە سەردەستی ناپلیۆن بە نەمسا گەیشتوون، دواتر هەم ناتوانێت و هەم مافی ئەوەشی نییە داواکاری زۆرلە کۆنگرە بکات، سەرجەم ئەو ئومێدانەی کە چاوی لێبوون بریتی بوون لە:

- گەڕاندنەوەی خاک و هەرێمە داگیرکراوەکان لەلایەن فەرەنساوە.
- بەرژەوەندییە کۆنەکانی لە ئیتاڵیا بۆ بپارێزن.
- روسیاش لە چارەنووسی پۆلۆنیا و دەستێوەردان لە کاروباری ئەڵمانیا سەرفراز نەکەن.

وا پێدەچوون داواکان رەوا بوون لە پێناو پاراستنی ئاسایش و یەکسانی لە ئەوروپاو پشتگیری کردن لە رژێمی پادشایەتی کۆن و رێگەنەدان بە دەوڵەتە مەزنەکان بوون، کە دەست بەسەر ئەوروپاوە نەگرن.

## ئامانجەکانی ئینگلیز

لە ڕاستیدا ئینگلیزەکان هیچ داواکاریەکی ئەوتۆیان لە کیشوەری ئەوروپا نەبوو، تەنیا ئەوەی مەبەستیان راگرتنی پارسەنگی هێزەکان لە نێوان وڵاتە ئەوروپییەکاندا بوو، بە شێوەیەك هیچ لایەنێک نەتوانێت ئەویتریان پەراوێز بخات. لە رێگەی ئەم هاوسەنگییەش دەتوانێت ئارامی و ئاشتیەکی تەبا لە ئەوروپا بەرقەرار بێت و هەر لەم رێگەیەشەوە دەتوانرێت چاودێری فەرەنسا بکرێت بۆ ئەوەی جارێکی تر ئارامی لە وڵاتەکان نە شێوێنێت، لەم رێگەیەشەوە مەبەستی بوو سنوورێک بۆ چاوبڕینەکانی روسیا دابنێت لە ئەوروپای رۆژهەڵات و ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی. لە دەرەوەی ئەوروپاش وەزیری دەرەوەی بەریتانیا کاسلریە لەسەر قۆرخکردنی دەریا پێی داگرت و رشت بوو، بە هیچ شێوەیەک رازی نەبوو باس لەم بابەتە بکرێت سەروەریی دەریای بە مافی خۆیانی دەزانی. لە بەرانبەر ئەو بێداوایەی بەریتانیا لە کیشوەری ئەوروپا، چاوی لەوە بوو کە:

هەندێک لە دوورگەی بچووکی بە رووبەر مەزن و ستراتیجیی و هەندێک لە موستەعمەرەکانی لەوبەری دەریاوە وەدەست بێنێت بە مەبەستی پێویستیی کەشتیگەلی بەریتانی.

## ئامانجەکانی روسیا

قەیسەری روسیا زۆر بە بنەماڵە دێرین و سوپاکەیەوە دەینازی، ئەوکات بەهێزترین سوپای ئەوروپا بوو، لەم روانگەیەوە بە مافی خۆی دەزانی ڕۆڵێکی سەرەکیی لە سیاسەتەکانی کیشوەر هەبێت، بەتایبەت کە بەشداریەکی کارای لە لەناوبردنی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا کردووە:

- بۆ پاراستنی باری ئارامیی کیشوەر داوای هاوپەیمانێتیەکی لە نێوان وڵاتە مەزنەکان کرد بە سەرۆکایەتی خۆی.
- لە وڵاتەکانی داوا دەکرد دان بە مافی دەستگرتن بە سەر فنلەندا و بیسارابیا بنێن، کە لە ساڵی ١٨٠٨ بە ڕێککەوتن لەگەڵ ناپلیۆن داگیری کردبوون.
- چاویشی لە پۆلۆنیا هەبوو، ئەو وڵاتە داماوە، کە لە بەدبەختی خۆی کەوتبووە نێوان سێ وڵاتی مەزنی روسیا، فەرەنسا، نەمسا، لە سەدەی هەژدەهەم سێ جار لە نێوان ئەم سێ وڵاتە خاکەکەی دابەش کرابو و دوایین جار وەکو قەوارەیەکی سیاسی بوونی نەبوو.
- دیسان دەیویست دەست بەسەر خاکەکانی میرنشینی ڤێرسۆفیا بگرێت، کە ناپلیۆن لەناو خاکی بروسیای پۆلۆنی دای مەزراندبوو بۆ ئەوەی ئەم وڵاتە و هەندێک لە خاکی پۆلۆنیا، کە لەژێر دەستی روسیایە، یەکیان بخات و وڵاتێکی سەربەخۆیان لێ دروست بکات لەژێر دەسەڵاتی خۆی.
- چاوی لە بەنداوەکانی تورکیش هەبوو.

## ئامانجەکانی بڕوسیا

- بڕوسیاش دەیەویست لەسەر خاکی ئەڵمانیا فراوانی بە سنوورەکانی بدات، بە تایبەتیش چاوی لە خاکەکانی ساکسۆنیا بوو، گوایە لە سەردەمی ناپلیۆن پادشای ساکسۆنیا لایەنگری فەرەنسا بووە و زیانی زۆری بە بڕوسیا گەیاندوە، نایەوێت فریدریکی سێیەم سزا بدات، تەنیا ئەوە نەبێت لەسەر تەختی پادشایەتیی دایبەزێنێت و دەست بە خاکیەوە بگرێ، لە بەرانبەر رازیبوونی ئەم داوایەی دەکرێ لە داواکاریەکەی روسیا بە گرتنی دۆقیە ڤێرسۆفیای قبووڵ بێت.
- شاندی بڕوسی لەسەر ئاستی فەرمیی دەوڵەت هەندێک داواکاری تری قورسی هەبوون، بریتی بوون لە: دەستگرتن بەسەر هەرێمی ئەلزاس و لۆرینی فەرەنسی.
- لە نێوەندی گەلەریی و رۆشنبییرەکان داوای یەکخستنی هەموو دەوڵەتۆکەکانی ئەڵمانیایان لەناو یەک دەوڵەتی مەزنی بەهێزدا دەکرد.

## ئامانجەکانی فەرەنسا

هەڵوێستەکانی تالـلیرانی سەرۆکی شاندی فەرەنسی تابڵێی لە رووداماو بوون، چونکە وەکو نوێنەری وڵاتێکی دۆڕاوی سەرسەختی بەترس سەیر دەکرا، وڵاتەکان ترسی ئەوەیان لێی هەبوو جارێکی تر ئاژاوەو سەریەشە بنێتەوە، بۆیە هەموویان دەیانەوێت وەکو وڵاتێکی لاوازی بێهێز بمێنێتەوە. تالـلیران زۆر بە نیانی و دیبلۆماسیانە رەفتاری دەکرد، بۆ ئەوەی لەم کۆنگرەیە فەرەنسا لە نامۆیی وەدەرنێت، لەو پێناوەدا داواکانی سادە و واقعی بوون، ئەویش بریتی بوون لە:

- گەڕاندنەوەی پێگەی سیاسی فەرەنسا وەکو وڵاتێکی مەزن.
- بۆ وەدەستهێنانی متمانەی وڵاتەکانیش رایگەیاند، کە دەست لەو شوێنانە هەڵدەگرێت، کە ناپلیۆن داگیری کردبوون.

رایگەیاند پشتگیری تەواوی بۆ سیستەمی بۆ جێماوەی پادشایەتی دەکات، ئەو سیستەمەی لای دڵی شاندی فەرەنسا و نەمسا خۆشەویستە.

- تەنیا ئەوەندە نەبێت کە زۆر بە کارامەیی وشاراوەیی و نیانی ئەوەی دەربڕی، کە چاوبڕینەکانی نەمسا و هەوڵەکانی بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئیتاڵیا بەپێی توانا سنووردار بکرێت.

چونکە بەرژەوەندییەکانی وڵاتە مەزنەکان لەم کۆنگرەیە دژی یەکتر نەبوون، بۆیە کاری کۆنگرەکە درێژەی کێشا، لە ناوەڕاستی سێبتەمبەری ١٨١٤ تا ئاداری ١٨١٥ی خایاند. لەم ماوەیە کارەکان لە ڕێگەی کۆبوونەوە لاوەکی و نهێنیەکاندا لە نێوان وڵاتە مەزنەکان بەرێ دەچوون، وڵاتە بچووکەکانیش ڕۆڵی تەماشاکار و چەپڵەلێدەریان دەبینی.

وروژێنەرترین بابەتی ناکۆک لە نێوان وڵاتە مەزنەکاندا دۆسیەی پۆلۆنیا و ساکسۆنیا بوو، کە بووە هۆی دابەشبوونی وڵاتەکان بەسەر دوو گرووپدا: روسیا و بڕوسیا ڕێککەوتن، کە یەکەمیان پۆلۆنیا بەرێت و دووەمیان ساکسۆنیا، بەریتانیا و نەمسا دژی ئەم رایە وەستان، چونکە:

یەکەم: ئەگەر روسیا هەموو پۆلۆنیا بەرێت، ئەوا بەسەر ئەوروپای ناوەڕاستدا زاڵ دەبێت و پارسەنگی هێزەکان لە ئەوروپا تێک دەچێت، ئەمەش جێی قبوولکردن نییە.

دووەمیان ئەگەر بڕوسیا دەست بەسەر ساکسۆنیا دابگرێت، ئەمەش بۆ ئەوان دەستکەوتێکی مەزنە و پێشینەی دەستێوەردانی ئەم وڵاتەیە بە کاروباری ئەڵمانیا.

بارودۆخەکان ئاڵۆز بوون و بووە هۆی ئەوەی تاللیران کاتی زیاتر هەبێت تا شوێنپێی فەرەنسا لەم بەینە بکاتەوە و سوود لە ناکۆکیەکان وەرگرێت، بەو هۆیەوە توانیی فەرەنسا لە لێژنە چوارقۆڵیەکەدا بکاتە ئەندام. بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان ئیتر ئەم لێژنەیە بوون بە پێنج دەوڵەت، دوای ئەوەی چوار دەوڵەتە مەزنەکە بوون، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی لەگەڵ نەمسا و ئینگلتەرا هاوپەیمانیەک لە ٣ی جەنیوەریی ١٨١٥ ببەستن بۆ ئەوەی لە بەردەم چاوبڕینەکانی روسیا و بڕوسیا بووەستن و پارسەنگیی کیشوەرەکەش ڕاگرن.

بەڵام گەڕانەوەی کتوپڕی ناپلیۆن لە دوورخرانەوەکەی هانی وڵاتەکانی دا زیاتر لە یەکتر تێبگەن و یەکڕیزیەک دروست کەن. دواجار لە ٩ی حوزەیرانی ١٨١٥ وڵاتەکان بڕیاری کۆتایی کۆنگرەکەیان ئامادە کرد بە سازشکردنی هەموو کێشەکان، داواشیان لە وڵاتە بچووکەکان کرد ئیمزای لەسەر بکەن، دەتوانین بڕیارەکان بەم شێوەیە کورت کەینەوە:

## بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤییەننا

١- فەرەنسایان بۆ سنووری بەر لە شۆڕش گەڕاندەوە، بەڵام ڕێگەیان پێدا شاری ئەڤینیۆن بە دانیشتووانەکەیەوە لەژێر دەستی خۆی بهێڵێتەوە.

لە پێناو ڕێگەگرتن لە بەردەم شۆڕشگێڕەکان تا بیر لە تۆڵەی شکستیەکانی واتەرلۆ نەکەنەوە، دەورەی فەرەنسایان بە چەند وڵاتێکی بەهێزی بێلایەن دا. وەکو پەرژینێک لە نێوان فەرەنسا و وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا هۆڵەندا و بەلژیکایان لە یەک دەوڵەت کۆکردەوە و حکومڕانیەکەشیان دایە خانەوادەی ئۆرنج، سەربەخۆیی وڵاتە یەکگرتەوەکانی سویسرایان پاراست و پەیمانی بێلایەنی و پاراستنی سنووریان بۆ دا، (باڤاریا و پلاتینیا)یان لە یەک دەوڵەت کۆکردەوە، لە خوارەوەش خاکی نیس و ساڤوای و بیامۆنتیان بە میرنشینی سەردینیا بەخشی.

٢- هەرێمی هانۆڤەریان بە بەریتانیا بەخشی بە هۆی ئەوەی شوێنی لەدایک بوونی پادشای بەریتانیایە، وە دان بە مافی ئینگلتەرا نرا دەست بەسەر دوورگەی هیلیفولاند دا بگرێت، کە لە ساڵی ١٨٠٧ لە دانیمارکی سەندبوو. هەروەها ماڵتاش، کە لە ساڵی ١٧٩٧ داگیری کردبوو، دوورگەی ئەیونیەش بکرێتە کۆمارێکی ژێر چاودێریی ئینگلیز، ئەمەو دوورگەی سیلان وموستەعمەرەی سەر بە ئاسیا و دوورگەی مۆریسی فەرەنسی و توباگۆ و سانتالۆسی، کە هەموویان موستەعمەرەی پێشوی فەرەنسا بوون.

٣- دان بە مافی روسیا نرا دەست بەسەر خاکی بیسارابیا دابگرێت، کە لە عوسمانیەکانی سەندبوو و خاکەکانی فینلەنداش، کە لە سوێدییەکانی سەند، خاکەکانی ڤێرسۆفیاش لەگەڵ خاکەکانی پۆلۆنیا، کە لەژێر دەستی روسیابوون، لە یەک میرنشینی کۆکردنەوە و خستنیە ژێر حوکمی قەیسەری روسیا.

٤- بڕوسیا سێ یەکی خاکی ساکسۆنیای برد لەگەڵ زەویەکانی بۆمیرانیا، کە کاتی خۆی هی سوێد بوو، خاکەکانی بۆزنانی پۆلۆنیشی وەرگرتەوە و دەستیشی بەسەر خاکەکانی و ستگالیا و ڕینانیادا گرت.

٥- لە تۆڵەی زیانەکانی بە نەمسا کەوتبوون، کە بەلژیکای لەدەست دابوو، چەند شوێنێکیان لە ئیتاڵیا پێ بەخشی، دەستی بەسەر زەویەکانی لمباردیا و بوندوقیە و میرنشینی ساڵزبۆرگدا گرت.

٦- میرنشینەکانی ئەڵمانیا، کە ناپلیۆن دروستی کردبوون، بۆ رەچەڵەکی خۆیان نەگەڕانەوە، تەنیا ژمارەیان کەم کرایەوە و بوون بە ٣٨ دەوڵەت لەناو یەکێتیی ئەڵمانیا، ئەمیش بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و سنوورەکانیان بوو.

٧- سەبارەت بە ئیتاڵیا مومتەلەکات و سامانەکانی پاپایان بۆ گێڕایەوە و زۆربەی ئەمیرە ئیتاڵییەکان، کە ناپلیۆن دووری خستبوونەوە، بۆ میرنشینەکانی خۆیان گێڕانەوە جگە لە و میرنشینانەی بە نەمسا و سەردینیا درابوون.

٨- خاکەکانی نەرویجیان لە دانیمارک وەرگرتەوە و دایان بە سوید لە قەرەبووی لەدەستدانی زەویەکانی فینلەندا.

پەیماننامەی پاریسی دووەم، کە ئاماژەمان پێی دابوو هاوپێچی ئەم بڕیارانەیان کردبوون.

بەم شێوەیە دەبینین سەرکردە ئەوروپییەکان لە ساڵی ١٨١٥ نەخشەیەکی سیاسیی نوێیان لەسەر دوو بنەما بۆ ئەوروپا کێشابوو:

گەڕانەوە بۆ شەرعیەتی نەریتی کۆن، هەر کاتەی لە توانادا بوو بکرێت، لە پێناو پاراستنی راگرتنی پارسەنگی وڵاتانی کیشوەر بەمەرجێك جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونە تاڵەکەی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا. ئەوەی ڕاستی بێت ترس و خۆپاراستن لە دووبارەنەبوونەوەی ئەزمونەکەی فەرەنسا، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ ویست و ئارەزوەکانی نەتەوە پەرستەکانیش ناکۆک بن، فاکتەری سەرەکیی نەخشەی سیاسیی ئەوروپای ساڵی ١٨١٥ بوون.

لە پێناو دووبارەنەبوونەوەی شۆڕش و بەربەستدانان لە بەردەم بڵاوبوونەوەی بیروڕاکانی ئازادی و لە پێناو سەلامەتیی رژێمە کۆنەکان و بەردەوام بوونیان، وڵاتە مەزنەکان بە پێویستیان زانی کۆمەڵێک هەنگاو بنێن، کە لە بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننادا هاتبوون. دیارترینیان:

## هاوپەیمانێتیی پیرۆز

قەیسەری روسیا بیرۆکەیەکی شاشی خستە بەردەم کۆنگرە، داوای کرد هاوپەیمانێتیەکی نێودەوڵەتی و ئەوروپی ببەسترێت بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان

وڵاتان بە پشتبەستن بە بنەما کریستیەکانەوە. پاساوی بۆ ئەم داوایەی ئەوە بوو، کە زۆربەی گەلانی ئەوروپا بە ئایینی مەسیح بڕوادارن، ئێمەش بە ئەرکی خۆمان دەزانین لە پەیوەندییەکانمان پابەندی پەیامەکانی مەسیح بین ئەو پەیامەی پڕە لە خۆشەویستی و ئاشتی. بە ڕوونتر دەیەویست پەیوەندییەک لەسەر بنەمای خۆشەویستی و دادپەروەری دروست بکات، کە شوێنی پەیوەندییە کۆنەکان بگرێتەوە، ئەو پەیوەندییەی لەسەر بنەمای هاوپەیمانێتیی سیاسییانە و سەربازییانە لە نێوان وڵاتاندا دەبەسترا. ئەمەو مەبەستیشی بوو کە ئایینی مەسیح بکاتە چاوگی ڕێنماییەکان، کە هەموو وڵاتە ئەوروپییەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان بە گیانێکی کریستیانەوە پێیەوە پابەند بن.

بۆ دڵنیابوون لە جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیەش بەباشی زانی پادشاکان خۆیان ئیمزای لەسەر بکەن، چونکە ئەوان لەلایەن خواوە فەرمان و دەسەڵاتی حکومڕانی و پاراستنی ئاشتیان پێ دراوە، گوایە ئەو رژێم و چینایەتیەی ئێستا هەیە دەستکردی خوایە، دەبێت ئەوانیش پابەندی پاراستنی ئەم دەستکردە بن. بەم شێوەیە قەیسەری روسی ئاشتیی ئەوروپای بە سیستەمی کۆن بەستەوە و پشتگیریی ئەوروپاشی کردە مەرجێکی پاراستنی پەیامەکانی مەسیح.

لێرە نارێکییەک هاتە پێش، قەیسەر دەیەویست لە ڕێگەی مەسیحەوە رژێمی کۆنی پادشایەتی بپارێزێ، لە کاتێکدا لە سیستەمی پادشایەتیی کۆن کۆمەڵێک نادادپەروەیری و پێشێلکاری و کۆنەپەرستی و دواکەوتن هەبوون، لەگەڵ ئەوەی گومان لە ئایینپەروەریی قەیسەر ناکرێت، ئەمە وەکو دەربڕینێکی ناخی قەیسەر بوو بۆ بیرۆکەی هاوپەیمانێتی، لە ڕاستیدا ئەم پێشنیارەی قەیسەر تەنیا وەکو حەزێکی بۆ لەناوبردنی هەموو بزووتنەوە دیموکراتیخواز و کۆماریخواز و ئازادیخوازەکان لە ئەوروپا دەبینرێت ئەگەر لە داهاتوودا سەریان هەڵدا.

ئەم بیرۆکەی هاوپەیمانێتیی پیرۆزە کۆنە، بەڵام هەر وەکو ئەندێشە و دوور لە پراکتیک دەبینرێت، جگە لەمەش لەگەڵ ئومێد و ئاواتەکانی گەلی ئەوروپا ناکۆکن. سەرەڕای ئەمە هەڵوێستە کۆنەپەرستی و فراوانخوازیەکانی قەیسەر ئەم بیرۆکەیەی خستە گومانەوە، چونکە لەگەڵ رەفتارەکانی قەیسەر ناگونجێن، کە دوورن لەو ئاشتی و خۆشەویستیەی پەیامی مەسیح بانگەوازی بۆ دەکات.

هەر لەسەرەتاوە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ئەم بیرۆکەی هاوپەیمانێتی لەسەر بنەمای ئایین رەت کردەوە، بە دیدی ئەوان ئەو گۆڕانە ڕاستەقینانەی شۆڕشی فەرەنسا لە ویژدانی ئەوروپییەکاندا دروستی کردوون لە توانای هاوپەیمانێتیەکی لەم جۆرەدا نییە، کە ڕووبەڕووی ئەوروپای دوای ۱۸۱۵ ببێتەوە.

دواتر خۆی باش نیاز و مەرامەکانی قەیسەری دەزانی، کە ئەم لە هەموویان کەمتر پابەندی ئیمزاکەی و فەرمانەکانی مەسیح دەبێ، بۆیە ئینگلتەرا رازی نەبوو بچێتە ناو ئەم هاوپەیمانییەتیە، بە نەچوونی ئینگلتەرا بۆ ناو ئەم هاوپەیمانیە هەر لەسەرەتا و بەر لە نەدایکبوونی ڕاستگۆیی وهێزی جێبەجێکردنی لەدەست دا.

بەڵام نەمسا، کە نەخشەکێش و سەرکردەی یەکەمی ئەوسای مەترنیخ بوو، لە قەیسەر کەمتر حەزی لە پاراستنی رژێمە کۆنەکان نەبوو، هەر زو رەزامەندیی لەسەر چوونە ناو ئەم هاوپەیمانیە دا، هەروەها پادشای بروسیاش رازی بوو، ئەم تەنیا بۆ رازیکردنی دڵی قەیسەر بوو نەک بۆ بڕوابوون بەم هاوپەیمانییە. دواجار لە ٢٦ی سێپتەمبەری ۱۸۱۵ هەرسێ وڵاتە مەزنەکە ئیمزایان لەسەر هاوپەیمانێتیەکەی پیرۆز کرد، فەرەنسا هیچ حەزێکی وەدەرنەخست، کە چاوی لە مانەوە و پاراستنی رژێمە کۆنەکان بێت، لە هەمان کاتدا خۆشی لە بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان بە دوور بینی، دواتر هۆڵەنداش چوە پاڵی.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم هاوپەیمانە بە هۆی بازووی پۆڵایینی مترنیخ دەتوانێت گەرووی ئازادیی لە بزووتنەوەکان بگرێت، بەتایبەت لە ئەڵمانیا، کە دوای ۱۸۱۵ هزری ئازادی و شۆڕشی نوێ بۆ گۆڕان بڵاوەی کردبوو. توانرا دەنگی ئەو کەسانە کپ بکات نە ئیتاڵیا، کە داوای دەستووری ئازادیان دەکرد لە چەشنی سەردەمی فەرەنسییەکان، هەروەها هەموو بانگەوازێکی یەکبوونی کپکردن، کە بۆ یەکگرتنی ئیتاڵیا و ئەڵمانیا بەرز دەبوونەوە، لە ئیسپانیاش پشتگیرییەکی زۆری پادشاکەیانی کرد بە هۆی ئەوەی لە گۆمی ستەم و کۆنەپەرستیدا نقوم ببوو.

## هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی

ئیمزانەکردنی شاندی بەریتانی لەسەر هاوپەیمانێتیە نوێکە نیشانەی ئەوە نەبوو ئینگلتەرا بەرگری لە پاراستنی رژێمی کۆن ناکات، نەخێر، سەرۆکی شاندی ئینگلیز وەزیری دەرەوەی کاسلری لە بەریتانیا لەلایەن ئۆپۆزسیۆنەوە بەوە تاوانبار دەکرا، کە دژایەتیی بیری ئازادیخواز دەکات. ئینگلیزەکان واقیعبینانە بیریان دەکردەوە، ئەوان لە و بڕوایەدا نەبوون، کە دوای ئەو گۆڕانەی لە ناخی ئەوروپییەکاندا دروست بووە پادشاکان بە حوکمی دووریان لە ئایین و ئایینپەروەرییەوە بتوانن بەم شێوازە ئاشتی و ئارامی لە ئەوروپا بپارێزن. دواتر لە نیازەکانی قەیسەریش بەگومان بوون، کە قەیسەر لە ڕێگەی زاڵبوونی بەسەر هاوپەیمانەکەوە هەوڵی دەستبەسەرداگرتنی ئەوروپا دەدات.

بۆ پشتگیری لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ڤیەننا ئینگلیز پێشنیارێکی تری خستە بەردەست وڵاتان، بریتی بوو لە هاوپەیمانێتیەکی نوێ لە هەر چوار دەوڵەت بۆ پشتگیریکردن لە بڕیارەکانی ڤیەننا و پاراستنی بارودۆخی ئەوروپا، تەنانەت ئەگەر بە هێزی سەربازیش بێت.

- ماوەی هاوپەیمانێتیەکە ٢٠ ساڵ بێت.
- ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی بیروڕاکانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی شۆڕشی فەرەنسی بگیرێت.
- بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکان دەبێت وەزیری دەرەوەی وڵاتەکان کۆبوونەوەی دەوریی بکەن، دواتر لەسەر ئاستی باڵوێزەکان کۆ ببنەوە، بۆ چارەسەرکردن و لێکۆڵینەوە لە هەر ڕووداوێکی کتوپڕ لە کیشوەردا.

لە ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٨١٥ هەر چوار وڵاتە مەزنەکە روسیا، نەمسا، بڕوسیا و ئینگلیز ئیمزایان لەسەر هاوپەیمانێتیەکەی چوارقۆڵی کرد، ئەم هاوپەیمانێتیە لە ئینگلتەرا ناڕەزاییەکی زۆری لێ کەوتەوە، بەوەی مترنیخی کۆنەپەرست را و بۆچوونەکانی خۆی بەسەر بەریتانیا دەسەپێنێت، کە دەست لە کاروباری ئەوروپا وەربدات، ئەمەش بەریتانیەکان حەزیان لێی نەبوو.

## رەخنەی یەکلاکەرەوە

- دەتوانین بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا و پەیماننامە هاوپێچەکانی لە رۆژی ئاشتەوایی و ستڤالیا لە ١٦٤٨وە تا ئەوکات بە مەزنترین رێککەوتنی دیبلۆماسی لە ئەوروپا ئەژمار بکەین. ئەم بڕیارانە چەند لایەنێکی ئەرێنیان هەبوون:
- فەرەنسا بە بڕیارەکانی ڤیەننا رازی بوو، چونکە کەمترین زیانیان بە فەرەنسا گەیاند.
- چارەسەرییەکی سیاسیانەی بۆ کێشەی پۆلۆنیا دۆزیەوە، کە بەدرێژایی سەدەی هەژدەهەم جێی مشتومڕی نێوان روسیا و نەمسا و بڕوسیا بوو. گرنگیی ئەو چارەسەرییە لەوە دابوو، کە مەزنترین هۆکاری ناکۆکیەکانی نێوان وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپای ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی نەهێشت.
- لە روێکی تر ئەم رێککەوتنە لەسەر ماف و سۆزی ملیۆنەها پۆلۆنی تەواو بوو، ئەوانەی بوونی خۆیان وەکو وڵات و نەتەوە ون کرد بوو، لە ئەڵمانیاش یەکلاییبوونەوەکان کەمتر بوون، هەرچەندە لەوێش لەسەر حسابی ئومێدەکانی ئەڵمانییەکان بوو بە هۆی توندی ململانێکەوە، کە ماوەی ٥٠ساڵ بوو لە نێوان نەمسا و بڕوسیا بۆ دەستگرتن بەسەر وڵاتەکانی ئەڵمانیا درێژەی هەبوو.
- ئەم یەکلاکردنەوەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێک پێگەکانی وڵاتانی ئەوروپای قایم کرد، بوونە پشتگیر و هاوکاری راگرتنی هاوسەنگی هێزە مەزنەکان لە کیشوەری ئەوروپا.
- بڕیارەکانی ڤیەننا دەستی بڕوسیای لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا والاکرد.
- ئەڵمانیا و ئیتاڵیاشی خستە ژێر دەسەڵاتی نەمسا.
- دەریا و زەریاکان و هاتووچۆی نێو وڵاتان بۆ ئینگلتەرا قۆرخ کران، بۆ ئەوەی هیچ یەک لەم سێ وڵاتانە سنووری دیاریکراویان لە کۆنگرەی ڤیەننا نەبەزێنن.
- دوو وڵاتیان وەکو دەمەوانەی ئەمانەت (صمام الامان) دەستنیشان کردن.

فەرەنسا هەردەم چاودێریی نەمسای دەکرد بۆ ئەوەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی لە ئیتاڵیا فراوان نەکات، بڕوسیاش هەردەم ئامادەیە لە رێگەگرتنی بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی روسیا لە ئەوروپای رۆژهەڵات و دەسەڵاتی نەمساش لە دونیای جێرمەنی. بە

پێی ئەمە ئینگلیز راسپاردرا تا چاودێری لە سیاسەتەکانی روسیای قەیسەر بکات بەرانبەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وهیچ گۆڕانێک لە دەریای رەش و بەنداوەکان نەکات، کە ببێتە مایەی بەهێزبوونی ئیمپراتۆریەت و لە ئەنجامدا پارسەنگی هێزەکانی ئەوروپا لەنگیان تێ بکەوێت.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم رژێمە وێڕای بوونی ناکۆکی و نا پاکیی بۆ ئەوروپا تا نیوەی سەدەی نۆزدەهەم سوودبەخش و پارێزەری ئاشتی بوو، گەشبینترین کەس لە وانەی نەخشەی سیاسیی ئەوروپاییان لە ١٨١٥ دارشت چاوەڕوانی ئەمەیان نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم لایەنە باشانەی بڕیارەکان هەندێک لایەنی خراپیشی هەبوون، لەوانە:

- هەڵگرانی بیری نەتەوایەتی و حوکمی دیموکراتی لە هەموو شوێنێکی ئەوروپا توشی شۆک هاتن، بۆ نموونە لە ئەڵمانیا وێڕای بوونی رەوتی نەتەوایەتییەکی چالاک، رەسمکردنی سنووری دەوڵەتەکان بە پێی بەرژەوەندییەکان دارێژرایەوە بێ گوێدانە هەستی نەتەوایەتییان و بێ ئاگاداریی گەل.
- ڕاستە کە ئەڵمانیا بۆ پارچەپارچەبوونەکەی جاران نەگەڕایەوە، بەڵام بوو بە ٣٩ وڵات، ئەم یەکلاکردنەوەیە زۆ شەرمەزارانە لە نێوان فەرمانڕەواکانی ئەڵمانیا و وڵاتە مەزنەکان ئەنجام درا. دواتر ئەو یەکێتیەی لە نێوان ئەم وڵاتانە کرابوو وەهمی وئەندێشەیی بوون، بۆ نموونە: ئەوەندە بەسە کە هەر وڵاتێک لەم وڵاتانە مافی ڤیتۆی هەبوو، واتە هەموو بڕیارەکان دەبێت بە کۆی دەنگ بدرێن، ئەمەش نیشانەی شەلەلخستنە کارەکانە. لەم کارە داخوازیارانی یەکێتیی ئەڵمانیا توشی بێئومێدی هاتن، چونکە ئەوان دڵنیا بوون لەوەی ئەم ئەنجومەنەی یەکێتی شانۆیەکە بۆ ململانێی هەر سێ زلهێزەکەی ئەڵمانیا، نەمسا و بڕوسیا دیسان دەبێتە بەردی تەگەرەی بەردەم هەموو بڕیارەکانی، کە پادشا یان میر بیەوێت ڤیتۆ لەسەر بڕیارێکی ئەنجومەنی یەکێتی بدات.
- لە هۆڵەندا و بەلژیکا ترسیان لە فەرەنسا لێ پەیدا بوو، حەزیان لەوە بوو دەوری بە وڵاتێکی بەهێز بدرێت، بۆ ئەم مەبەستەیان دەوڵەتێکیان لە دوو نەتەوەی جیا و دوو رەچەڵەک و شارستان پێکهێنا، کە هۆڵەندا و بەلژیک بوون، هەر زوو ئەنجامی کارە هەڵەکەی ئەم دروستبوونە بەدیار کەوت.

- لە ئیتاڵیاش دەسەڵاتی نەمسا گەڕایەوە و سامانی زۆربەی ئەمیرە ئیتاڵییەکانیان بۆ گەڕاندەوە، بەم شێوەیە ئەندامانی کۆنگرە لە ناحەزی ئیتاڵییەکان لە نەمسای دراوسێیان و پێشوازیی هێزەکانی بڕواهێنەر بە شۆڕشی فەرەنسی و سیستەمە دەستوورییە ئازادییەکەی لەناو ریزی جەماوەری ئیتاڵییەکان بێخەبەر بوون. دەوڵەتە مەزنەکان لەو گۆڕانانە نەگەیشتن، کە لە ٢٠ ساڵەی دوای شۆڕش لە ئیتاڵیا رویان دا، چۆن خاکی ئیتاڵیا بە پێی بەرژەوەندییەکان دابەشکرایەوە، بێ ئەوەی بگەڕێنەوە لای حەز و داخوازیەکانی جەماوەر و مافی چارە خۆنووسییەکەیان.

تاقە شیکردنەوە بۆ ئەم هەڵوێستانە ئەوەیە، کە ئەندامانی کۆنگرە لە ترسی ئەوەی جارێکی تر لە فەرەنسا یان هەر وڵاتێکی تر دووبارە شۆڕش هەڵنەگیرسێتەوە هەڕەشە لە ئیمتیاز و تەقلیدییەکەیان نەکاتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی هەر چەندی رەخنە روەو کۆنگرە بکرێت، بەڵام لە کارە گرنگەکەیدا سەرکەوتوو بوو، کە دابینکردنی سەقامگیری و ئارامی بۆ ئەوروپا بوو. بە ڕاستیش ئەوروپا سوودی لەم ئاشتییە وەرگرت، هیچ کارێک ریزەکانی تێک نەدا جگە لە چەند وردە بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکی ساڵانی ١٨٣٠ و ١٨٤٨ نەبێت.

## رژێمی مەترنیخ و سیاسەتی کۆنگرەکان

ماوەی ساڵەکانی نێوان ١٨١٥ تا ١٨٢٣ بە زاڵبوونی دەسەڵاتی کۆنەپەرستی بەسەر ئەوروپا ناسرا بوو، ئەو دەسەڵاتەی کە کۆنگرەی ڤیەننا پاراستنی رژێمی پادشایەتیی لاساییکەرەوەی قبووڵ کرد، ئەو سیستەمەی لە سەردەمی بەر لە شۆڕشی فەرەنسا لەسەر حوکم بوو، ئەم جارەیان بە شێوەیەکی کۆنەپەرستانەتر و ستەمکارانەتری بەسەر ئەوروپادا سەپاند.

ئەو بەرێزانەی لە کۆنگرەی ڤیەننا ئامادە ببوون نەک تەنیا بڕیاریان دا رژێمە کۆنەپەرستەکان بگەڕێنەوە و بپارێزرێن، بەڵکو کاریان بۆ ریشەکێشکردنی بنەماکانی شۆڕشی فەرەنسی و دواتر ناپلیۆن و بەتایبەتیش بۆ بۆچوونەکانی مافی گەلان لە بەشداریکردن لە چارەی خۆنووسینیان و سیستەمی پەرلەمانی و دەستوورەکانی هەڵبژاردنی ئازاد و چاکسازیەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کرد. ئەم زاراوانە هەموویان بە مەترسی

ناساندران و بڕیاریان دا لەناو ببردرێن، ئەم زاراوانە هەموو وەکو فرتوفێڵی جەماوەر وەسف کران، چونکە بۆ دژی بەرژەوەندییەکانی وڵاتە مەزنەکانە و دواتر لەبەر ئەوەی ئەمانە بنەمای کار و چالاکیەکانی بەر لە شۆڕش بوون. بۆ ئەم مەبەستە دەبووایە چاودێریی توند لەسەر هەموو رۆژنامە و پەرتوک و بڵاوکراوە و کۆبوونەوە جەماوەرییەکان دابنرێت و رێگە لە هەموو چالاکیەک بگیرێت، کە بۆنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی و ئازادیخوازییان لێ دێت.

لوتکەی ئەم بۆچوونە بۆگەنانە لە کەسی مەترنیخ وەزیری دەرەوەی نەمسا بەدی دەکران، مەترنیخ ئەوەی لە دوای ساڵی ١٨١٥ خەڵک بە پاڵەوانی پاراستنی رژێمی پادشایەتی و کۆنەپەرستی و دژمنی سەرسەختی گۆڕانکاری ناویان دەبرد، ئەوەی راستیش بێت رۆڵی ئەو پیاوە لە لەناوبردنی ناپلیۆن تا کۆنگرەی ڤیەننا و گێڕانی پارێزەری یەکەمی رژێمی پادشایەتی و رووکەشکردنی بڕیارەکانی کۆنگرە بە بۆچوونە کۆنەپەرستیانەکەی و بەردەوامیی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی نەمسا بوو، تا ساڵی ١٨٤٨ بە هۆی گێڕانی ئەم رۆڵە گرنگانەی بوو بە دەرەوشاوەترین کەسی دیبلۆماسیی ئەوروپا تا لاچوونی لەسەر شانۆی سیاسیی ئەوروپا.



سەدەی نۆزدەهەم. مەترنیخ

## مەترنیخ

لە ڕاستیدا ئەم پیاوە لە پیادەکردنی سیاسەتە کۆنەپەرستانەکەیدا دەستی بۆ بەرژەوەندییەکان پان نەکردەوە و داوای هاوکاری و یارمەتیشی نەدەکرد، ئەمەی دەیکرد ڕەنگدانەوەی پەروەردە و بیرە لاسایکەرەوەکانی بوو، کە بە دڵسۆزی خزمەتی بەم ڕەوتە دەکرد.

مەترنیخ لە ٣ی ئایاری١٧٧٣ لە دەوروبەرێکی دەرەبەگایەتی و لە خانەوادەی مەترنیخ لە نزیک شاری کۆبلنتزی ئیمپراتۆریەتی نەمسایی لە خێزانی مەترنیخی کاسۆلیکیی شکۆدار(نەبیل) لە دایک بووە. باوکی گەلێک پۆستی بەرزی لە دەوڵەت وەرگرتووە، دواییینیان وەزیری سەرفرازی نەمسا لە برۆکسل بووە. هەر لە منداڵییەوە لەسەر

دڵسۆزیی بۆ تاجی پادشایەتی راهێنراوە، کە بۆتە گەنج چۆتە دانیشگای ستراسبوورگ، کە تەنیا منداڵە دەوڵەمەند و شکۆدارەکان بۆیان هەبوو لەم دانیشگایە بخوێنن. دەنگوباسەکانی فەرەنسا ئەم گەنجەیان بێزار و هەراسان کردبوو، پەرەسەندنی بیری شۆڕشگێڕ و گەیشتنی شاڵاوی گەشەبوونی بۆ ستراسبۆرگ ئەمی ناچار کرد بۆ مایانس بگوازێتەوە. لەوێ دەستی لەگەڵ لایەنەکانی دژی شۆڕش تێکەڵاو کرد و دەرسیشی لە دوو مامۆستا وەردەگرت (ڤۆگ و کۆتزبۆی شاعیر)، کە بە ناحەزانی توندی رەوتی شۆڕش ناسرابوون.

مەترنیخ بە لە سێدارەدانی ماری ئەنتوانێتی نەوەی ماڵی پادشای نەمسا زۆر ناڕەحەت بوو، خۆشەویستی و ریزی بێ پایانی بۆی هەبوو، رق و کینی لە فەرەنسییەکان زیاتر بوو کاتێک لە ١٧٩٤ دەستیان بەسەر موڵک و سامانیان داگرت و بەپێخواسی ناردنیانەوە نەمسا، ئەوسا هاوسەرگیریی لەگەڵ کچە هەژارێک کرد، کە خانەوادەی کچەکە یارمەتیان دا ئەم بچێتە کاری دیبلۆماسی. دواتر پلە بە پلە پۆستە گرنگ و پڕبایەخەکان وەدەست بهێنێ وەکو: وەزیری سەکسۆنیا لە ١٨٠١ دواتر باڵوێز لە بەرلین لە ساڵی ١٨٠٣ و باڵوێز لە پاریس لە ١٨٠٦ ئەو کات بوو، کە لە نزیکەوە ناپلیۆنی ناسی و لە ناخ و دەروونی ئەم پیاوە گەیشت، بۆیە زیاتر رقی بەرانبەر بە فەرەنسا هەستا، هەر لە جەستەی ناپلیۆنیشەوە لە چۆنایەتیی شۆڕش گەیشت. دواتر وەرگرتنی پۆستی وەزارەتی دەرەوەی نەمسا لە ١٨٠٩، کە جڵەوی کار و فەرمانەکان تا ناوەڕاستی سەدە لە دەست خۆی مایەوە.

لە ژیاننامەی ئەم پیاوە بۆمان دەردەکەوێت، کە هەر لە رۆژی لەدایکبوونی و مەزنبوونی لە کەشوهەوایەکی بۆرجوازیانە و پەروەردە بوونی بە بیری کۆنەپەرستانە و دڵسۆزیی بۆ خانەوادەی پادشایەتی ئەم پیاوە هەوڵی ئەوەی داوە سیاسەتێکی کۆنەپەرستانە بەسەر ئەورووپادا بسەپێنێت. بە رادەیەک بڕوای بە پادشایەتی و رژێمەکەی هەبوو، کە بە دیدی ئەو دونیایەکی نموونەیی و خۆشگوزەران و دادپەروەر و سەقامگیر ئەو کاتە دێتە دی، کە نە گەل نە نەتەوە بوونی نەبێ تەنیا دەوڵەت نەبێت، ئەویش لەژێر دلۆڤانیی پادشاکان بن و هەر ئەوەندە ئازادیان هەبێت کە پادشاکان پێیان رەوا دەبینن ئەو پادشایانەی بە توانا و فەرمانی خوا حکومڕانی دەکەن، بڕواشی وابوو کە تەنیا پادشایەتیی بێسنوور دەتوانێت دوارۆژێکی بەختەوەرو ئارام بۆ ئەورووپا دابین بکات. بەم عەقڵییەت و بۆچوونانە

مەترنیخ نیو سەدە ئەمسای حوکم کرد، هەر ئەم بۆچوونە کۆنەپەرستانەش بوون، کە لە بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا رەنگیان دابوونەوە، بەرادەیەک ناوی مەترنیخ بە ناوی کۆنگرەکەوە لکابوو، هەندێک جار هەر بە بڕیارەکانی مەترنیخەوە ناویان دەبرد.

لە ڕاستیشدا بەقەدەر ئەوەی کە توانیی بەسەر بڕیارەکانی ئەمسادا خۆی بسەپێنێت، ئەوەندەش بەسەر ئەوروپا خۆی سەپاند، دەمێنێتەوە بپرسین ئایا تا چەند مەترنیخ توانیی دەنگی نارەزایی و بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان کپ و ریشەکێش بکات؟

لە رووی سیاسەتی دەرەوەش ئارادەیەک سەرکەوتوو بوو لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا و ڕاگرتنی ئارامی لە ئەوروپا تا نیوەی سەدەی نۆزدەهەم، ئەگەر هەندێک گۆڕانی بچووکیش لە نێوان سنوورەکانی بەلژیک و یۆنان رویان دابن، بەڵام ئەوانە ئەوەندە گرنگ نەبوون تا کارێکی وا بکەنە سەر رەوشەکە، دواتر ئەمانە بە رەزامەندی وڵاتە مەزنەکان ئەنجام دران.

بۆ پاراستنی بارودۆخی نێودەوڵەتی لە ئەوروپا لەبەر قەیسەری روسیا دەپارایەوە بۆ یارمەتیدان و هاوکاری کردنی، ئەو قەیسەرەی تا سەرئێسقان لە بیری کۆنەپەرستی و دژایەتیکردنی دیموکراسی و بیری ئازادیخوازی نقوم ببوو، هەندێک جار بە بیانووی پەیماننامەی پیرۆزەوە دەستی دەخستە ناو کاروبارەکانی ئەوروپا، هەندێک جاریش بە هۆی بەستنی کۆبوونەوە خولییەکانی کۆنگرەی هاوپەیمانێتیی چوار قۆڵییەوە.

بەڵام لە رووی ئازادییەکان و دیموکراسی و بیرە نوێکانەوە سەرکەوتنی مەترنیخ و کۆنەپەرستە لایەنگرەکانی لە کپکردن و لە ناوبردنیان سەرکەوتوو نەبوون، چونکە کارێکی ئاسان نەبوو وڵاتێک لە ئازادی و دیموکراسی بێبەش کەیت لە کاتێکدا ماوەیەکی زۆر تێی پشکدار بوون. گەڕاندنەوەی ڕەوڕەوەی مێژوو بۆ دواوە کارێکی ئاسان نییە، کە مەترنیخ و گەورەکانی لە ڤیەننا دەیانەویست بیکەن، ئەوەی ڕاستی بێت ئاسان نییە، چونکە دەکرێ گەلێک هەر لەسەرەتاوە لە تامی ئازادی و سەربەستی ودیموکراسیی بێبەش کەیت بەڵام، ئەگەر ئەم گەلە تامی ئەم ئازادییەی چێشت دواتر لێی گیرایەوە جێی قبووڵ کردن نییە بە ئاسانی.

هەر لە کاتی بەستنی هەردوو کۆنگرەکەی ڤیەننا شکستهێنانی کارەکانی مەترنیخ ئەم بوارە پێیەوە دیار بوو، چونکە بە درێژایی ئەم ماوەیە هەندێک وڵات وەکو ئینگلتەرا

سویسرا و فەرەنسا لە پیادەکردنی دیموکراسی و ئازادی درێغیان نەدەکرد. لەم وڵاتانە دەستوورێکی بەهێز هەبوو، کە بنەمای رێکخستنی سیاسی و رێکوپێککردنی کاری بەڕێوەبردن بوو. نەک هەر ئەمەندە بەڵکو ئازادییە گشتییەکان لە دوای ١٨١٥ هەر وەکو خۆیان مانەوە، دەتوانین بڵێین باشتر بوون، بۆ نموونە: دەربەگەکان بۆ هەتا هەتایی نەمان، دیسان ئیمتیازە کۆنەکان و نادادپەروەری و نایەکسانی بەرانبەر بە یاسا ئەوانیش نەگەڕانەوە.

تەنیا بەردەوامبوونی بیری شۆڕش لە دامودەزگا ئەوروپییەکان مەترسیدار نەبوو، بەڵکو گەلێک لە بیرمەند و زانا و فەیلەسووفەکانی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتاڵی سەدەی هەژدەهەم و نووسەرە سیاسییەکانی جیرۆندی لە کۆماری ئازاد هەموویان بە زیندویی لە ویژدانی خەڵکدا مانەوە و چاوگی هەڕەشە و مەترسی بوون بۆ ئەوروپا.

ئەم کارانە مایەی ناڕەحەتیی مەترنیخ و قەیسەری هاوپەیمانە کۆنە پەرستەکەی بوو، کە دژی سیاسەت و بۆچوونەکانیان بوون، هەر جارەی بە بیانووی بەستنی کۆنگرە لەبەر یەک دەپاڕانەوە تا دەرفەتی دەستێوەردانیان لە کاروباری ئەوروپا هەبێت.

## ١- کۆنگرەی ئەیکس لاشابیل سێپتەمبەری ١٨١٨

مەبەست لەم کۆنگرەیە کشاندنەوەی لەشکری بێگانە بوو لە خاکی فەرەنسا، کە بە پێی پەیماننامەی ڤیەننا لەوێ بوو، بڕیاری بەستنی ئەم کۆنگرەیە لە پەیماننامەی ڤیەننادا هاتبوو، بەشداربووان لەلایەن نەمسا و پادشاکەی بە یاوەری وەزیری دەرەوەی مەترنیخ ئامادە ببوو، لە روسیا قەیسەر، لە بروسیای خاوەن میوان پادشاکەی فریدریک گەلیۆمی سێیەم، لە ئینگلتەراش بە وەزیری دەرەوەی کاسلریە و شازادە ولنگتۆن و لە فەرەنساشەوە سەرۆکی وەزیران ریشیلیۆ دۆستی خودی قەیسەری روس ئامادە ببوون.

بە پشتبەستن بە پابەندبوونی فەرەنسا بە بڕیارەکانی ڤیەننا و حەز و ویستی لە پاراستنی ئارامی و ئاسایش لە ئەوروپا لە پێناو راگرتنی پارسەنگی هێزەکان و دوپاتکردنەوەی پەیمانەکانی لە پابەندبوونی بە پاراستنی رژێمی کۆنی پادشایەتی، بە پشتبەستن بەم راستیانە هەریەک لە ئینگلتەرا، نەمسا، روسیا و بروسیا بڕیاریان دا لەشکرەکانیان تا کۆتایی نۆڤەمبەری ١٨١٨ بەتەواوەتی لە خاکی فەرەنسا بکشێننەوە. لە

بەرانبەریشیدا فەرەنسا پەیمانی ئەوە دەدات هەموو ئەو قەرزانەی لەسەریەتی هی قەرەبوو و زیانەکان، کە لە کۆنگرەی ڤیەننا بڕیاریان لەسەر دراوە، بیان داتەوە.

سەرەڕای دوودڵیی ئینگلتەرا چاکە و بلیمەتی ئەم بڕیارە بۆ قەیسەر دەگەڕێتەوە، کە زۆر لەسەر گەڕاندنەوەی فەرەنسا بۆ ناو مەحافلی دەوڵەتی سور بوو تا ببێتە هاوپەیمانێکی بەهێز لە رۆژئاوای ئەوروپا، ئەمە هۆکارێک، هۆکاری دووەمیشی بۆ ئەو دۆستایەتیە بەتینەی نێوان قەیسەر و سەرۆکوەزیرانی فەرەنسا ریشیلیۆ دەگەڕێتەوە. دەبێت ئاماژە بەوەش بدەین، کە بە هۆی ترسی ئینگلتەرا لە گەڕانەوەی هەڕەشە و مەترسیەکانی فەرەنسا لەسەر کۆمەڵگای ئەوروپی نەبادا بگەڕێتەوە سەر دۆخە ئاژاوە گێریەکەی، لەژێر بەژێرەوەو بە نهێنی پرۆتۆکۆلێکیان وەکو جەختکردن لەسەر هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی و بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا مۆرکرد.

لە ڕاستیدا جگە لە پشتگیرییەکانی قەیسەر بۆ فەرەنسا بە گەڕاندنەوەی بۆ نێو ریزی وڵاتە ئەوروپییەکان و کشاندنەوەی پێشوەختی لەشکرەکانی هاوپەیمانان و گەڕاندنەوەوی فەرەنسا بۆ ریزی وڵاتە مەزنەکان و بەشداریپێکردنیان لە کۆنگرەی پێنج قۆڵی. جگە لەمە هۆکاری تریش هەبوون، ئەویش باری ناوخۆی فەرەنسا بوو، پادشا لویسی هەژدەهەم لە ملی ڕاستیەوە لەژێر فشاری ڕاستڕەوە توندڕەوەکانی لایەنگرانی پادشادا بوو، لە لای چەپیشیەوە فشاری کرێکار و رۆشنبیر و ئەوانەی پابەندانی بنەماکانی شۆڕشدا بوو، لەم روانگەیەوە لەسەر وڵاتە مەزنەکان بوو هاوکاریی میانڕەوەکان بکەن، ئەوانەی لەسەر حوکم دان لە وێنەی ریشیلیۆ بۆ ئەوەی پێگەیان قایم کەن و لە بەردەم ئەو رەوتە توندڕەوانەدا بووەستنەوە.

لە دانیشتنێکی تری کۆنگرەکەدا قەیسەر مەسەلەی دەستووری وروژاند، کە چۆن لێرەو لەوێ هەندێک دەنگی بیری شۆڕشگێڕانە دەبیستێت داوای گۆڕینی دەستوور دەکەن، بە تایبەت لە ئیتاڵیا و هەندێک جاریش لە ئەڵمانیا و ئیسپانیا. دواتر پێشنیارێکی کرد، کە کۆنگرە مافی ئەوە بدات دەست لە کاروباری وڵاتان وەربدرێت هەر کاتەی پێویستی کرد، بۆ ئەم پێشنیارەی مەترنیخ لە هەموویان بەپەرۆشتر بوو، چونکە ئەم بڕیارە دەستی واڵا دەکات بۆ لێدانی سەرهەڵدانی هەر بەرهەڵستکارێکی خانەوادەی پادشا لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا.

ئینگلیز دژی ئەم پێشنیارە وەستایەوە، چونکە بەدیدی ئەو دەبێتە پاساو بۆ دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتە بچووکەکان و لە ئەنجام ئاژاوە و کێشە دەخولقێن و پارسەنگی هێزیش لە ئەوروپا تێک دەچێت، ئەمەش ئەوەیە کە لەسەرەتاوە ئینگلیز خۆی لێ بەدوور دەخاتەوە.

ئێمە دیمان لە سەرەتای ئیمزاکردنی پەیماننامە چوارقۆڵییەوە وەزیری دەرەوەی ئینگلیز کاسلریە چۆن ڕووبەڕووی نارەزایی ڕۆشنبیران بووەوە و بە لایەنگری کۆنەپەرست و ڕێگری دیموکراسی و ئازادیی گەلانیان ناونا، تاکە پاساو کە بووە هۆی ئەوەی بەریتانیا هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی قبووڵ بکات، ترسی گەڕانەوەی شۆڕشی فەرەنسی و گیانی فرەخوازی بوو.

ئینگلیزەکان تەنیا بۆ ئەوە کۆنگرەکانیان حەز لێ بوو تا دەنگەکانی فەرەنسا کپ کەن و دواتر لەسەر ئاستی ئەوروپاش شتێکی ئەوتۆیان گەرەک نەبوو جگە لە پاراستن و پابەندبوون بە سنوورەکانی وڵاتانی ئەوروپا، کە لە کۆنگرەی ڤیەننا بڕیاریان لەسەر دراوە.

لە کۆنگرەی ئەیکس لاشبیل بەڕوونی ناکۆکیەکانی نێوان روسیا و نەمسا لەلایەک و ئینگلیز لەلایەک سەبارەت بە ئامانجە ستراتیژیەکانی هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی دەرکەوتن، نیازەکانی روسیا بۆ وڵاتانی بەلقان و دەریای رەش بوون، ئاواتەخوازیەکانی نەمساش بۆ دەستگرتن بەسەر ئیتالیا و ئەڵمانیا بوون، هۆکاری سەرەکیی رەتکردنەوەکەی ئینگلیز بە هۆی ڕێگەدان بە دەستوەردان لە کاروباری وڵاتاندا بوو.

لە کۆتاییدا ئیرادەی بەریتانیا سەرکەوت، ڕێنمایی تازە بۆ هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی دەرچوون و تیایدا ئەو حاڵەتانە دیاری کران، کە وڵاتەکان دەتوانن دەست لە کاروباری وڵاتان وەربدەن. لەو کاتیشەوە هاوپەیمانێتیەکە بوو بە پێنج قۆڵی، ڕێنماکان دەڵێن مەرجی دەستوەردان لە کاروباری وڵاتان دەبێت سەرەتا وڵاتە مەزنەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە چارەسەریی کێشەکە کۆببنەوە و نوێنەری وڵاتی خاوەن کێشە ئامادە بێت، ئەوسا بەتێکڕا بڕیاری چۆنیەتی دەستێوەردانەکە دیاری بکەن، ئەمە واتە دەقاودەق لەگەڵ بۆچوونەکانی ئینگلیز هاتەوە و ڕێگەشی لە چاوتێبڕینەکانی روسیا و نەمسا گرت.

## کۆنگرەی کارلسباد ساڵی ١٨١٩

دوای کۆنگرەی ڤیەننا هزر و بیرە ئازادەکان لە دەروونی رۆشنبیرو نووسەر و خوێندکارانی زانکۆدا بە چالاکی مانەوە، لە بەرهەمەکانی شاعیر و ئەدیبانی ئەڵمانییەکان بیری شۆڕشی فەرەنسی رەنگیان دابووەوە، لەوانە گانز(١٧٩٨-١٨٣٩) و شتراوس و هاین (١٧٩٧-١٨٥٦). ئەمانە تەنیا کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی بنەماکانی شۆڕش نەدەکرد، بە ڵکو بانگەوازی یەکگرتنەوەی خاکی ئەڵمانیا و مێژوو و زمانەکەشی دەکرد. بزووتنەوەی نیشتمانیی ئەڵمانیا لە چالاکترین بزووتنەوەکانی ناو دانیشگا و نێوەندی خوێندکاران بوون، ئەم تویژە لە دانیشگا لە ساڵی ١٨١٧ یەکەم کۆنگرەیان بۆ سەرتاسەری خوێندکارانی ئەڵمانیا بەست.

ئەم گۆڕانانە مێشکی مەترنیخیان ئاڵۆز کردبوو، تا لە ١٨١٩ دەرفەتی بۆ رەخسا سانسۆر و چاودێری بخاتە سەر ئازادیی بیر و بڵاوکردنەوەکان. لە ئاداری هە مان ساڵدا خوێندکارەکان نووسەرێکی بروسیی کرێگرتەی قەیسەریان کوشت، کە بە خۆفرۆشی و کرێگرتەیی بۆ حکومەتی بترسبوورگ ناسرا بوو. مەترنیخ ئەم دەرفەتەی بە هەل زانی و داوای لە ئەنجومەنی یەکێتیی جێرمان (دییت) لە کارسباد کرد کۆببێتەوە، لەم کۆبەنەوەیەدا بڕیاری دا سانسۆر و چاودێری بخاتە سەر هەموو ئازادییە گشتییەکان و چاپەمەنی و رۆژنامە و دانیشگاکان، ئەنجومەنی یەکێتی بە شێوەیەکی ئاوەرتە لێژنەیەکی هەمیشەیی بۆ چاودێریکردن وسەرپەرشتیکردنی چالاکی و کارەکانی زانکۆکانی ئەڵمانیا دامەزراند.

کاتێک هەموو حکومەتە ئەڵمانییەکان چ لە ترسان چ لە بڕوابوونەوە پابەندی ئەم بڕیارانە بوون، جەماوەری ئەڵمانیا گەڕاندنەوەی ئەم کەشوهەوایە لەلایەن وڵاتانی هاوپەیمانێتیی پیرۆز بە گەڕانەوەی ستەم و زۆرداری دایە قەڵەم.

## کۆنگرەی ترۆپاو

رووداوەکانی دوای ١٨١٥ ئەوەیان سەلماند ئەو گۆڕانانەی لە بیست ساڵی دەسەڵاتی فەرەنسی، کە لە وڵاتانی وەک ئیتاڵیا رویان دا، گۆڕانی بنەڕەتیی بوون و حکومەتەکانی بەر لە مەترنیخ و دوای شۆڕش نەیانتوانی چۆک بەو گۆڕانانە بدەن و

بیـان هێننـەوە سـەر دۆخـی جارانی بـەر لـە شۆڕشـی فەرەنسـی. ئیتاڵییـەکان لـە پێنـاو وەدەسـتهێنانی ئـازادی و حـوکمی دیمـوکراتی بـەرگری زۆریـان کـرد و بـە گـژ سـتەم و زۆرداریـدا چوونـەوە، بـە هـۆی ئـەوەی کـاری سیاسـی لـە ئیتاڵیـا قەدەغـە بـوو لـە هـەموو سوچێکی ئیتاڵیا ڕێکخراو پارتی سیاسی بە نهێنی کار و چالاکیەکانی خۆیان بە ئەنجام دەگەیانـدن، شـێوازی کوشـتن و لـەناوبردن شـێوازی خـەباتیان بـوو. بـەناوبانگترین ئـەم ڕێکخراوانە کۆمەڵەی ڕەژوکەران بوو، کە بڕیاردەرەکەی لە میرنشینی ناپۆلی بوو، لەوێوە بانگێشـتەکانی ئـازادی و رزگـاربوون لـە چنـگ نەمسـا و بـۆ یەکگرتنـەوەی دەوڵەتـە ئیتاڵییەکانیان دەکرد.

لـە سـاڵی ١٨٢٠ کوشـتن و بڕین لـە میرنشـینی نـاپۆلی گـەیشـتە ئاسـتێکی بـەرز، پادشای ناپۆلی فردینانی یەکەم بە دەستێکی ئاسنین حکومڕانی دەکرد، دژی هـەموو بـەها مرۆڤایـەتی وئازادییـەکـان بـوو و بـەو پـەری کۆنەپەرستانە حـوکمی دەگێرا و دژی هـەموو بیرێکـی شۆڕشـگێرانە دەوەسـتا. بەرهەڵسـتکارەکانی پادشـا لـە داواکانیـان زۆر میانڕەوانـە بـوون، ئـەوان داوای حـوکمێکی دیمـوکراتی و دەسـتوورێکیان دەکـرد، کـە بەرژەوەندییەکانی گەل و پادشا بپارێزرێت و ئەنجومەنەکان لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێن. بەرامبەر بە دڵڕەقی پادشا ڕۆشنبیر وکۆنە ئەفسەرەکانی لەشکری دەستیان بە کـاری توندوتیژی کرد، ئەم کـارە توندوتیژیانە گەشەیان سەند تا بووە شۆڕشێک سەرتاسەری ناپۆلیی گرتەوە، بەرانبەر بەم توندوتیژیە پادشا دڵنەرمیی نواند و بەو دەستوورە رازی بـوو، کە داوایان کردبوو.

ئەم رەفتارەی بۆ مـەترنیخ بـاش نەبوو لـە کاتێکدا بـوو ئـەو ناوچـە ئـەڵمانیانـەی ژێر دەسـەڵاتی نەمسـا لـەژێر سانسـۆڕ و مەترسـیدابوون بـە هـۆی سـەرهەڵـدانی بزووتنـەوەی رزگاریخواز لێرە و لـەوێ تـا کـار گـەیشتە ئـەو ئاسـتەی ئـاگری شـۆڕش بگاتـە نـاپۆلی و دواتـر بـۆ ئیتاڵیـا پەریـەوە، بـە تایبـەتیش بـۆ بوندوقیـە و لمباردیـا. بەرهەڵسـتکار و کـارە توندوتیژییەکان بۆ رزگاربوون لە چنگ نەمساییەکان یـەکیان گرتـەوە، ئـەوەی لـە نـاپۆلی پادشـاکەی قبـووڵی کـرد مـەترنیخ نەیـدەتوانی لـە نەمسـا و ناوچـەی ژێر دەسـەڵاتەکەی قبـووڵی بکـات. چونکـە ئەگـەر لـە شـوێنێک قبـووڵی بکـات، ئـەوا وره و داخـوازیی شۆڕشگێرەکان بەرزتر دەبووەوە، بەمـەش ئـەوەی لـە ١٨١٥ەوە پێکـی هێنـاوە کۆنترۆڵەکەی

لەدەست دەردەچێ. دواتر ئەدی لە نێوان نەمسا و پادشای ناپۆلی فەردینانـد پەیماننامەیەکی نهێنی نییە، کە لە ١٢ی حوزەیرانی ١٨١٢ مۆریان کردووە، بە پێی ئەم پەیماننامەیە فەردیناند هیچ هەنگاوێك لە وڵاتەکەی خۆی نانێت ئەگەر دژی بەرژەوەندی و نەریتەکانی پادشای نەمسا بێت؟ بەرانبەر بەوەی لە ناپۆلی روودەدات بە بیانوی پەیماننامەی پیرۆزەوە مەترنیخ ناچار بوو خۆی تێهەڵقورتێنێت، بۆیە خۆی بۆ پێکهێنانی لەشکرێک ئامادە کرد تا هێرش بکاتە سەر ئیتاڵیا. بەڵام فەرەنسییەکان، کە لە گەشەکردنی دەسەڵاتی نەمساییەکان ناڕەحەت بوون، لەم کردارەیان ناڕەزایی خۆیان دەربڕی. ئەم ناڕەزاییەی پشت ئەستورکرد بەو راگەیاندنەی کۆنگرەی ئەیکس لاشبیل، کە دەڵێت: ئەوکاتە دەتوانرێت وڵاتە مەزنەکان دەست لە وڵاتە بچووکەکان وەربدەن، کە خۆیان داوایان لێ بکەن، بەڵام کە ئێستا کەس داوای لە نەمسا نەکردوە مەترنیخ بۆی نییە ئەم لەشکرکێشیە بکاتە سەر ئیتاڵیا.

ناڕەزاییەکانی فەرەنسا پیویستیی بە بەستنی کۆنگرەیەک بوو، لە شاری ترۆبۆ لە سیلیزیا لە ئۆکتۆبەری ١٨٢٠ئەم کۆنگرەیە بەسترا، لەلایەن روسیا وە قەیسەر ئامادەی کۆنگرەکە بوو، لەلایەن بروسیاش پادشاکەی، لەلایەن نەمساش ئیمپراتۆرەکەی ئامادە بوو، بەڵام ئینگلتەرا کە دەبینین لە ١٨١٨ەوە خۆی لە کۆنگرەکان دووردەخاتەوە بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری وڵاتەکان وەرنەدرێت، بۆیە لە بەشداربوونی ئەم کۆنگرەیەش دوودڵ بوو. لە دواییدا باڵوێز خۆی لە نەمسا بۆ ئامادە بوون لەم کۆنگرەیە ئامادە کرد، باڵوێزی فەرەنساش لە نەمسا و روسیا بە نوێنەرایەتی وڵاتەکەی بەشداریی لەم کۆنگرەیە کرد، فەرەنساش بەشداریەکەی بەم ئاستە نزمە بۆ هەمان مەبەست بوو، کە بە بەشداربووان نیشان بدات لە دەستوەردان لە کاروباری وڵاتان رازی نییە. دیسان بۆ گرنگی نەدان بە بەرنامە و رەفتارەکانی قەیسەر، کە هەرواش بوو قەیسەر لەم گرنگینەدانەی فەرەنسا بە بەشداربوونیان بەم ئاستە زۆر ناڕەحەت بوو، کە لە بەرانبەر ئەو چاکانەی قەیسەر بۆ فەرەنسای کردن چۆن ئاوا وەڵامی دەدەنەوە، قەیسەر ئەم هەڵوێستەی فەرەنسای بە خیانەت زانی.

کۆنگرەکە پڕ بوو لە پیلان و تەڵەکەبازی لە نێوان روسیا و نەمسا، قەیسەر دەیویست بنەماکانی دەستێوەردان فراوانتر بکات بۆ ئەوەی چارەسەری کێشەکانی ئیسپانیا و ئەمەریکای لاتین بکات، مەترنیخ و هەموو بەشداربووانی کۆنگرەکەش داوایان دەکرد

کۆنگرەکە تەنیا بۆ چارەسەریی کێشەی ئیتاڵیا و بەتایبەتیش مەسەلەی شۆڕش و ناپۆلی تەرخان بکرێت. لە کۆتاییدا داخوازیەکانی نەمسا سەرکەوتن و بڕیار درا، کە نەمسا سەرفراز بکرێت بۆ چارەسەریی کێشەی ئیتاڵیا بۆ ئەوەی جارێکی تر هیچ گەلێک زاتی ئەوە نەکات دەست درێژی بکاتە سەر مافەکانی خانەوادەی پادشاکان.

بڕیار درا بانگەشەی پادشای ناپۆلی بکرێت بۆ مەبەستی رزگارکردنی لە دەست هاووڵاتیانی، کە کۆنگرە ریگەی پێداون ئەم کێشەیەیان لە رێگەی ناوبژی لەگەڵ هاووڵاتیان چارەسەر بکات یان لە رێگەی بەکارهێنانی هێزەوە.

لە پرۆتۆکۆلی کۆنگرە کە لە ١٩ی نۆڤەمبەری ١٨٢٠دەرکرا ناوی هاوپەیمانێتیی پیرۆز بە زەقی ئاماژەی پێدرابوو، کە چ رۆڵێکی باش لە ئەوروپا دەگێڕێت، ئەمەش نیشانەیەکی دیارە کە ئینگلیزەکان دەیانەویست لە سیاسەتی وڵاتە مەزنەکان دوورکەونەوە، بەتایبەت ئەو لایەنەی کە رێگە بە دەستێوەردانی وڵاتە بچووکەکان دەدات. لە پرۆتۆکۆلەکەشدا هاتبوو سەرکۆنەی شۆڕشەکانی ئیسپانیا و ئەمەریکای لاتین و ئیتاڵیا دەکەین، چونکە زیان بە رژێمە گشتییەکان دەگەیەنێت و بە هەمان بۆنەوە داواش لە هەموو وڵاتان دەکەین ئەم مەسەلەیە بە مەترسی بزان. ئامادە بووان لەسەر ئەوە رێککەوتن، کە لە مانگی جەنیوەریی ١٨٢١ واتە دوای سێ مانگی تر، پێشوازی لە پادشای ناپۆلی فەردیناندی یەکەم بکەن لە شاری لیباخ لە نەمسا.

## کۆنگرەی لیباخ جەنیوەریی ١٨٢١

کاتێک کۆنگرە داوەتنامەی بۆ فەردیناندی یەکەم پادشای ناپۆلی نارد بۆ ئەوەی لە کۆنگرە ئامادە بێت، تا ناوبژیوانی لە نێوان ئەم و گەلەکەی بکات، گەلەکەی بۆ ئەم بانگەشەیەی پادشا لاریان نەبوو، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، کە ئامادەن ئاشتەوایی لەگەڵ گەورەی خۆیان بکەن، دەشێت رازیبوونەکەیان لە ترسی ئەوەبێت تا نەمسا بە هێزەوە دەست لە کارەکەیان وەرنەدات؟

هەر کە پادشا لە وڵات وەدەرکەوت لە ١٦ی جەنیوەری رایگەیاند، کە لە هەموو بڕیار و پەیمانەکانی بەگەلی داوە، پاشگەزە، بە گوتەی خۆی هەمووی لەژێر فشاردا ئیمزا کردوون.

لە کردنەوەی کۆنگرە هەموو ئەندامەکانی بەشداربوو لە کۆنگرەی ترۆپاو لە لیباخ ئامادە ببوون وەکو ئەوەی کۆنگرەی لیباخ تەواوکەری دانیشتنەکانی ترۆپاو بێت تایبەت بە چارەسەریی کێشەکانی ئیتاڵیا، کارەکانی کۆنگرە ئەوەندەیان نەکێشا وا بەدی دەکرا هەردوو پیاوە بەهێزەکە، واتا مەترنیخ و قەیسەر لەسەر هەموو شتەکان رێککەوتبن. بۆیە لە ١٢ی جەنیوەری بڕدرا دەستووری نوێی ناپۆلیی هەڵوەشێندرێتەوە، لە ٣ی شوباتیش بڕیاردرا لەسەر ئەرکی دانیشتووانی ناپۆلی و لە پێناو کپکردنی دەنگی ناڕەزایی بریار درا لەشکری نەمسا هێرشێک بکاتە ناپۆلی و داگیری بکات. هەموو هەوڵەکانی فەرەنسا لە کۆنگرە بێسوود بوون لە پێناو رێگەگرتنی سوپای نەمسا بۆ ئەنجامنەدانی ئەم هێرشە، هەروەها پێشنیارەکانیشی سوودیان نەبوو، کە پاپا بە ئەرکی ناوبژیوان لە نێوان پادشا فەردیناند و میللەتەکەی بکات، چونکە نەمسا زۆر بەکتوپڕی لە بەرەبەیانی چواری شوبات ئەو هێرشەی ئەنجام دا، هێرشەکەی نەمسا بە هۆی نابەرانبەری زوو بەسەر هێزەکاندا زاڵ بوو، بەمەش دەسەڵاتی مەترنیخ لە ئیتاڵیا و پێگەی لە دەرەوە و ناوەوەش قایمتر بوو. مەترنیخ بەمە نەوەستا لە ١٢ی شوبات کاری کردە سەر کۆنگرە، تا بڕیارێک دەربکات هەموو دەزگا دەستووریەکانی ئازاد لە ئیتاڵیا هەڵوەشێنێتەوە. لە ٢١ی ئاداری ١٨٢١ لە بیامۆن شۆڕش بەرپا ببوو، بەڵام مەترنیخ بە هاوکاری و رەزامەندیی پادشاکەی شارل فیلیکس بە چەند رۆژێک لە ناوی برد.

کاتێک کە کۆنگرە ناڕەزایی دەربڕی ئەوکات هەموو کارەکان تەواو ببوون، ئیتاڵیا بە تەواوەتی لەژێر دەسەڵاتی نەمسا دابوو، پادشاکانی ئیتاڵیا خۆیان بە قەرزاری مەترنیخ دەزانی و گوێڕایەڵی داخوازیەکانی بوون، ئامادەیی خۆشیان دەربڕی لە دامرکاندنی هەموو دەنگێکی ئازادیخواز و دیموکراتیخواز.

ئەوەی لەم کۆنگرەیە بەدی کرا دوورکەوتنەوەیان لە سیاسەتەکانی ئینگلیز و چوونە بن باڵی نەمسا و روسیا بوو، هەرچەندە لە کۆنگرەکانی ترۆپاو و لیباخ ئینگلیزەکان لەسەر ئاستی باڵوێز بەشداریان لە کۆنگرەکە کرد، بەڵام هەردەم رۆڵی گوێگر و چاودێریان دەبینی، بۆیە دەدیترا بڕیارەکان بە باڵای هاوپەیمانێتیی پیرۆزیان هەڵدەدا بێ ئەوەی ئاماژە بە هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی بدەن. هەرچەندە بەریتانیا لەسەر زمانی وەزیری دەرەوەی لە ئەنجومەنی نیشتمانیان لە ٢١ی شوباتی ١٨٢١رایگەیاند، کە ئێمە دژی هەڵمەتی نەمسا

بۆ سەر ناپۆلی نین، ئەمەش چونکە وڵاتە مەزنەکان خستیانە بەردەم ئەمری واقیع. پاساویشی بەوە هێنایەوە، کە گوایە شۆڕشەکەی ناپۆلی ئەفسەرە کۆنەکان بەشداریان تێدا کردووە، ئەمەش وەکو کودەتایەکی سەربازی دژی دەسەلاتی شەرعی دێت، کە لەگەڵ یاساکانی دیموکراتیی بەریتانیا ناگونجێن.

بە هەرحاڵ بە هۆی ئەوەی ئینگلیزەکان لەسەر هیچ لە بڕیارەکانی هەردوو کۆنگرەکە ئیمزایان نەکردبوو، ناکرێت بەرپرسیارێتیی ئەم هەڵمەتە بخەینە سەر ئەوان و دیسان پاساوی هەڵمەتەکەش ئەوە نییە، هەروەها ناشتوانین ئەوروپا لەم هەڵمەتە بێگوناهـ کەین، گوایە بۆ بەرژەوەندیی ئەوروپا ئەم کارە کراوە.

## کۆنگرەی ڤیرۆنا لە ساڵی ١٨٢٢

لە ١٨١٥ و دوای رووخانی ناپلیۆن پادشای ئیسپانیا ئەو دەستوورەی هەڵوەشاندەوە، کە لە ساڵی ١٨١٢ ناپلیۆن دەرکردبوو، کە ئازادییەکی زۆری بە هاووڵاتیان دابوو، وێڕای مافی بەشدارییکردنی جەماوەر لە کاروباری ژیان و چارەی خۆنووسینیان. لەو رۆژەوە دوای ١٨١٥ ئیسپانیا خۆی بە پادشایەکی ستەمکار و زۆردار بینی، ئەو دەسەڵاتەی حوکمی فەرەنسی لە کڵێسا و خاوەن موڵکەکانی سەندبووەوە هەمووی بۆ گەڕاندنەوە، بە هۆی شۆڕشەکان لە ئەمەریکای لاتین موستەعمەرەکانی ئیسپانیا سەرقاڵیی زۆریان بۆ دروست کردبوو، لە ناوەوەش بەرهەڵستکارانی سیاسەتی پادشا و ئازادیخوازەکان ئاستەنگ و نائارامیان دەنایەوە. بە هۆی ناڕەزاییدەربڕینی سەربازە بەشداربووەکانی شەڕەکانی ئەمەریکای لاتین، لە ساڵی ١٨٢٠ شۆڕش لە شاری قادش هەڵگیرسا و لە هەموو وڵات تەشەنەی کرد، پادشای ناچار کرد شێوازی حکومڕانیی بگۆڕێت و قبووڵی ئەوە بکات دەستووری ١٨١٢ی دیموکراتی بگێڕێتەوە.

پادشا لە هەڵوێستەکەی دڵسۆز نەبوو، ئەم لەژێرەوە پەیوەندیی بە وڵاتە مەزنەکانەوە کرد، قەیسەری روسیا کە سۆزی بۆ پادشایەتیی ئیسپانیا هەبوو، پەیوەندیی پێوە کرد نەک تەنیا بۆ یارمەتیدانی تا بەسەر نەیارانی لە ناوەوە زاڵ بێت، بەڵکو تا پێگەی لە موستەعمەرەکانی لە ئەمەریکای خوارووش مەحکوم و قایم کات، هەروەها داوای یارمەتی لە لویسی هەژدەهەم کرد وەکو دۆست و دراوسێ و وەکو پادشای مەزنترین

خانەوادە لە ئەوروپا، کە خانەوادەی بۆربۆنە. ئەم بانگەوازەی پادشای ئیسپانیا لە پاریس و لە نێوەندی پادشا و ڕاسترەوەکان دەنگی دایەوە، فەرەنسییەکان زۆر بە پەرۆش بوون تا دەرفەتێکی وایان بۆ بڕەخسێت فەرەنسا هێز و توانا سەربازیەکەی خۆیان نیشان بدات دوای ئەو هەموو شکستانەی لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی خواردبوو. دواتر شەڕێک، کە فەرەنسا بەشداریی تیادا بکات، بۆ بەرگریکردن لە دەسەڵاتی پادشا نیشانەی نیازپاکی و بەرگریکردنە لە رژێمی پادشایەتیی کۆن لە ئەوروپا، ئەمەو گێڕانەوەی ڕۆڵی فەرەنسایە بۆ مەیدانی سیاسەتی ئەوروپا وەکو وڵاتێکی مەزنی ئەوروپی. بەڵام تەگەرەیەکی مەزن کەوتە پیش فەرەنسا، کە نەتوانێت ئەم رۆڵە بگێڕێت، ئەویش ئینگلیز بوو. ئینگلیز زۆر بەتوندی رێگەی لەم دەستێوەردانەی فەرەنسا گرت بە بیانووی ئەوەی سنووری کەنارە گرنگەکانی لەسەر دەریای سپیی ناوەڕاستە مومتەلەکاتێکی زۆریشی لەو دیو دەریاوە هەیە، لە سەرووی ئەمانەش لەگەڵ پرتوگال هاوسنوورن، کە ئەویش لە کۆنترین و بەبایەخترین دۆستی ئینگلیزە.

لە سەرەتای ١٨٢٢ بۆ نیشاندانی نیاز و پشتگیریی بۆ پادشای ئیسپانیا فەرەنسا دەستی بە لەشکرکێشی کرد بۆ سەر سنوورەکانی ئیسپانیا لە چیای ئەلبینیە، لە رووێکی تریشەوە بە پارە و تفاق یارمەتیی یاوەرانی پادشای دەدا. لە حوزەیرانی ١٨٢٢ لە هەرێمی کەتەلۆنیا و نافارای باکوور لەسەر دەستی هەندێک لە فەرماندە لایەنگرەکانی پادشا شۆڕش هەڵگیرسا، لە ٢ی تەمووز پاسەوانانی پادشا لە مەدرید بزووتنەوەیەکی یاخیبوونیان دژی ئەنجومەنی کۆرتس (ئەنجومەنی نیشتمانی) بەرپا کرد، هەوڵیان دا بیخەنە ژێر دەسەڵاتی پادشا. بەو هۆیەوە شەڕی ناوخۆ لە مەدرید هەڵگیرسا، بەڵام بە هۆی زاڵبوونی پارتە ئازادیخوازەکان بەسەریاندا زوو دامرکایەوە، بەم شێوەیە ئەمجارەیان لە هەموو کاتێک زیاتر پادشا بووە بارمتە و دیلی ئەوان. ئەم گۆڕانە و فشارەکانی روسیا و فەرەنسا بۆ والاکردنی دەستی فەرەنسا تا بە هانای رزگارکردنی پادشا هەنگاو بنێت، مردنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز کاسلریە و دانانی کاننگ لە شوێن ئەو ئەمانە هەمووی بوونە هۆکار بەڵکو پێویست بوو بۆ بەستنی کۆنگرەیەک بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانی ئیسپانیا، ئەوەبوو بڕیار لەسەر بەستنی کۆنگرەی ڤیرۆنا لە ئیتاڵیا درا لە هەمان ساڵ.

سەرەڕای نارەزایی و توڕەبوونی ئینگلیزەکان لەم کۆنگرەیە بۆ ڕێگەگرتن لە فەرەنسا بە دەستێوەردانی، بەڵام یەکێک لە نوێنەرانی فەرەنسا، کە نووسەر و ئەدیب شاتۆبریان بوو، بە یارمەتی قەیسەر توانی لە ۳۰ی جەنیوەریی ۱۸۲۳ ڕەزامەندیی وڵاتە مەزنەکان وەدەست بێنێت، کە لویسی هەژدەهەم بۆی هەبێت بە ڕێگەی دیبلۆماسی و سیاسی و سەربازی دەست لە ئیسپانیا وەر بدات بۆ هاوکاریکردنی پادشای ئیسپانیا.

لە ۱۸ی ئابی ۱۸۲۳ لە بەردەم ئەنجومەنی نیشتمانیی لویسی هەژدەم رایگەیاند. کە ۱۰۰ هەزار سەربازی فەرەنسی ئامادەیە بۆ رزگارکردنی پادشای ئیسپانیا، نەوەی هنریی چوارەم بچنە ئیسپانیا بۆ گەڕاندنەوەی سەروەریی و ئاشتی و ئارامی بۆ وڵاتی دراوسێ. لە ٤ی ئایار سوپای فەرەنسی چووە ناو مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا، لە ۳۱ی ئابیش بەسەر دوا بنکەی حکومەتی ئازادی لە ترۆ کادیرۆدا زاڵ بوو، لە ۳۱ی هەمان مانگ فەردینانەی حەوتەم پادشای ئیسپانیا لەدەست ئازادیخوازەکان رزگار کرا و هێنایانەوە مەدرید، بە گەڕانەوەی مەزنترین ئاهەنگیان لەژێر پاسەوانێتیی فەرەنسییەکان سازدا.

فەرەنسییەکان ئەم سەرکەوتنەیان وەکو شەرملادان و گەڕاندنەوەی ڕۆڵی فەرەنسا لە مەیدانی سەربازی و سیاسی بینی، بەمەش سەنگی دیبلۆماسیی فەرەنسایان گێڕایەوە دۆخی جاران.

## موستەعمەرەکانی ئیسپانی

لە ماوەی داگیرکردنی ئیسپانیا لەلایەن فەرەنساوە موستەعمەرەکانی لە ئەمەریکای خواروو رازی نەبوون سەر بە حکومەتی مەدریدەوە بن، تەنیا دڵسۆزیان بۆ پادشا فەردیناندی حەوتەم هەبوو. بۆ بەڕێوەبردنی موستەعمەرەکان خۆیان حکومەتی خۆجێی و سەربەخۆیان دامەزراندبوو، کە تەنیا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بە ناوی پادشای ئیسپانیاوە بوو. هەرچەندە ئەو حکومەتە نیشتمانیانەی لە ئەرجەنتین و چیلی و پیرۆ و کۆلۆمبیا و فەنزویلا دروست ببوون بەردەوام پابەندی خۆیان بۆ نیشتمانی دایک بە سەرۆکایەتی پادشای ئیسپانیا رادەگەیاند، بەڵام دروستبوونی ئەم حکومەتانە وەرچەرخانێکی بنەڕەتی بوو لە مێژووی ئەم موستەعمەرانە. دروستبوونی ئەم حکومەتانە

خۆی لە خۆیدا بۆ خەڵکەکە نوێ و گۆڕان بوو، خەڵک خۆی کارەکانی وڵاتیان بەڕێوە دەبرد، کاریان بۆ بڵاو کردنەوە و دامەزراندنی خوێندنگا دەکرد، کاری دەزگا و دامەزراوە حکومی و خزمەتگوزارییەکان بەدەست خەڵکەوە بوون، ئەمەش شتێکی نوێ بوو و لە سەردەمی بەڕێوەبردنی ئیسپانی ئەمە نەبوو. دواتر ئازادیخوازان بیری رزگاری و ئازادیان لەناو خەڵک بڵاو دەکردەوە، بانگەشەی رزگاربوون لە چنگ ئەمەریکای لاتینیان دەکرد لە شێوەی دراوسێکانیان لە باکوور. ماوەیەکی کەمی برد کە خەڵکەکە وشیار بووەوە لە بەڕێوەبردن ئیدارە و حوکمڕان شارەزاییان پەیدا کرد ،هەستیان بەوە کرد کە ئیتر پێویست ناکات سەر بە پادشای ئیسپانیاوە بن، بەڕێوەبردنی وڵات لەدەست خۆیان زۆر باشتر بوو لەو کاتەی لە چنگ ئیمپڕیالیزمدا بوون، بۆیە هەستیان بە پێویستەتی رزگاربوون دەکرد.



سیمۆن بۆلیڤار

یەکەم کەس کە لەناو موستەعمەرەکان هەڵسایەوە و ئاڵای سەربەخۆیی هەڵگرت سیمۆن بۆلیڤار بوو، بۆلیڤار لە دایکبووی کەرەکاسی ڤەنزویللا بوو، لە ڕۆڵەی چینە مەزنەکان بوو، لەوانەی لە زووەوە لە چنگی ئیسپانیا رزگاریان ببوو. جۆشدراوی بیری

ئازادیی سەدەی هەژدەهەمی دژی ئیمپریالیزمی ئیسپانی بوو، پەیوەندی بە زۆر لە ئازادیخوازەکانی ئەورووپاوە هەبوو، بەتایبەت لە ئینگلتەرا. بۆلیڤار موستەعمەرەکانی باکووری ئەمەریکای خواروو، واتە فەنزویلا ، دواتر کۆلۆمبیای کردە بنکەی بانگەشەی شۆڕش و بڵاوکردنەوەی بیری ئازادی وسەربەخۆیی، لە خوارووی ئەمەریکاش لە ئەرجەنتین سەرکردەیەکی تر وەدەرکەوت بە ناوی سان مارتین.



**سان مارتین**

ئەم شۆڕشگێڕە لە بۆلیڤار کەمتر نیشتمانپەروەر و دڵسۆزی مەسەلەکەی نەبوو، هەر زوو جوتیار و هەژاران بەپیر بانگەوازی رزگاری و سەربەخۆییەکەیەوە هاتن، جوتیاران بەگژ خاوەن موڵکە ئیسپانییەکاندا چوونەوە و فەرماندەی ئۆردوگا سەربازیەکان زۆر بە گرانی کارەکانیان بۆ مەیسەردەکرا و ئارامیان پێ سەقامگیر نەدەکرا. لە سەرەتای ١٨١٠وە بزووتنەوە ئازادیخوازەکان سەرتاپای ئەمەریکای خوارووی گرتەوە، هەموو گەلان بەگژ سەربازگەکاندا چوونەوە، شەڕی رزگاریی نیشتمانی موستەعمەراکانی بەگشتی گرتەوە.

فـەنزویلا بـە فەرماندایـەتی بۆلیڤـار یەکـەم وڵات بـوو سـەربەخۆیی خـۆی راگەیانـد، دەستوورێکی دیموکراتی و رژێمێکی کۆماریی بۆ وڵاتەکەی دانا، ئینگلیزەکان قەرسیان بـە هاوکـاریکردنی ئەمـەریکای خـواروو نـەکرد لەبـەر چەنـد هۆیـەک: یەکـەمیان بـۆ تۆڵەسەندنەوە لە فەرەنسا، کە دەستی لە ئیسپانیا وەردا، ئیسپانیا ببووە ژێردەستی فەرەنسا، دواتر لە تۆڵەی ئەو هاوکاریانەی ئیسپانیا بە ئەمەریکای دان لە کاتی شەڕی رزگاریی ئەمـەریکا. کاتیـک رژێمـی ناپلیۆن روخا و فەردیناندی حەوتـەم دەسـەڵاتی لـە مەدریـد گرتـەوە دەسـت، بەتونـدی ڕووبـەڕووی ڕووداوەکـانی ئەمـەریکای خـواروو بـووەوە، تـوانیی فەنزویلا بگێڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بۆلیڤاریش راونێت. بەڵام نەیدەتوانی دەسەڵات لە هەموو موستەعمەرەکان بگێڕێتەوە بێ یارمـەتیی لایەنێک، پەنای بۆ زۆربەی وڵاتانی ئـەورووپا برد، جارێـک بـە پشتبەستن بە بنـەماکانی پەیماننامـەی پیرۆز، جارێکی تر بە پشتبەستن بـە پەیماننامـەی چوارقۆڵی. قەیسـەر لـە جارێـک زیـاتر ئامـادەیی خۆی بۆ یارمەتیدانی ئیسپانیا دەربڕی، بەڵام ئینگلیزەکان زۆر بەتوندی رێگەیان لێ گرت و پێشیان راگەیانـد، کـە رازی نـین دەسـت لـە کاروبـاری ئەمـەریکای خـواروو وەربـدرێت، ئەگـەر سەرپێچیش بکرێت، ئەوا کەشتیگەلی بەریتانی لە دەریاکان ئامادەی بەرپەرچدانەوەی هـەر دەستدرێژیەکە. ئینگلیزەکان لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی رزگاری لە موستەعمەرەکان دەیـانزانی گرنگیـی ئـەو ناوچەیان لـە رووی ئابوورییـەوە چییـە، بۆیـە لـە سـەرێکەوە هـانی شۆڕشگێڕەکانیان دەدا لە سەرێکی تریشەوە پەیوەندیان لەگەڵ هاووڵاتیانی وڵاتەکان خۆش دەکـرد، لـەم هەڵوێسـتەی ئینگلیزلـە یەکنـەچوونێـک هـەبوو، لـە سـەرێکەوە هاوکـاریی شۆڕشگێڕەکانی ئەمەریکای خوارووی دەکرد، لە سەرێکی تریشەوە دەمانبینی چۆن بیری ئازادی و بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی لە ئەورووپا سەرکوت دەکردن. بەڵام ئەوەی ئینگلیزی خستبووە ئـەم هەڵوێسـتە مەسـەلەی ئـابووریی بـوو، بەرهەمـە زۆرەکـانی موسـتەعمەرەکـان پاساوی ئەم دەستیوەردان و هەڵوێستانەی ئینگلیز بوون.

یارمەتیـەکـانی ئینگلیـز بـە تـەواوەتی لـە ١٨١٥ زیادیـان کـرد، ئیتر حکومەتـەکانی بـەریتانیا ببـەردەوام کۆمـەکی چـەک و کـاڵا و کەلوپـەلیان بـۆ ئـەوێ دەنـاردن، هـەر کەسێکی خۆبەخش نیازی سـەفەری بۆ ئەمـەریکای خواروو هەبووایـە، بێ پابەندبوون بە بنەما و رینماکانی لەسەر رێککەوتوو رێگـەی پێدەدان بچن لە ئەمـەریکای خـواروو کـار

بکەن. ئەم هەڵوێستەی ئینگلیز دوای ئەو گۆڕانانە هاتن، کە لە ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رویان دابوون سەبارەت بە باجی گومرگی هێنانی کەلوپەلەکان. سەرەڕای گرانی نرخی گومرگ لەسەر کەلوپەلەکانی هاوردە، لەم روانگەوە لەسەر ئینگلیز بوو بە دوای بازاڕی ماددەی سەرەتایی و بازاڕی فرۆشتنی کاڵاکانی خۆیدا بگەڕێت، ئەمەش هەمووی لە ئەمەریکای خواروو دەست دەکەوت. ئەوەبوو وەزیری دەرەوەی بەریتانیا کاننگ هەڵوێستی حکومەتەکەی بەم شێوەیە دەربڕی: "لە بارودۆخی ئەمڕۆی دونیادا مەسەلەی ئەمەریکا بۆ ئێمە لە ئەوروپا لە هەموو مەسەلەیەک گرنگترە."

بە رزگاربوونی موستەعمەرەکانی ئەمەریکا یەک لە دوای یەک: فەنزویلا، ئەرجەنتین، کۆلۆمبیا و پیرۆ، پادشای ئیسپانیا و ئەوانەی بەرژەوەندیان لە دەست دابوو کەوتنە پاڕانەوە بۆ گەڕاندنەوەی بەرژەوەندیاکانیان، دوای دەستێوەردانی فەرەنسا و گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی فەردیناندی حەوتەم، دووبارە پادشای ئیسپانیا کەوتە بانگەشە بۆ یارمەتیدانی بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتە لەدەستچوەکەی لە ئەمەریکای خواروو. بۆ ئەم بانگەوازە قەیسەر بە پەرۆش بوو، بۆیە لە ١٨٢٣ بۆ ئەم پرسە داوای بەستنی کۆنگرەیەکی کرد، بەڵام ئەم بانگەشەیە بە هۆی رازینەبوونی ئینگلیز و پشتگیرینەکردنی گەرمی نەمسا و مەترنیخ سەری نەگرت. بۆ ئەوەی ئەم دەرگایە دابخات و چیتر کەس بیر لە دەستێوەردانی کاروباری ئەمەریکا نە کاتەوە، ئینگلیز لەسەر زمانی وەزیری دەرەوەی لە پەرلەمانی بەریتانی لە ١٨٢٣ حەزی بەریتانیای دەربڕی بە داننان بە سەربەخۆیی وڵاتەکانی ئەمەریکای خواروو، زیاتر ئەوەی بەریتانیای هاندا دان بە سەربەخۆییان دابنێ ئەوەبوو، کە ئەم وڵاتانە وەکو واقیع سەربەخۆییان وەرگرتبوو.

بۆ زیاتر پاراستنیان ئینگلیز داوای لە ئەمەریکای باکوور کرد، کە هەردووکیان دان بە سەربەخۆیی ئەم وڵاتە تازانە بنێن بۆ ئەوەی بە یاسایی بپارێزرێن، بەڵام ئەوان لە دەستێوەردانی بەریتانیا ناڕەحەت بوون بۆ ئەم مەسەلەیە بڕیاریان دا ئەم لێدوانە رابگەیێن، کە بە لێدوانی مۆنرۆ لە ١٨٢٣ ناسرا:

١- کیشوەرەکانی ئەمەریکا، کە خاوەنی سەربەخۆیی و ئازادیی خۆیانن، سەربە هیچ ئیمپریالیزم یان وڵاتێکی ئەوروپی نین.

٢- رژێمی سیاسیی وڵاتانی هاوپەیمان جیایە لەگەڵ رژێمی ئەمەریکا، بۆیە جێی قبووڵ نییە هیچ وڵاتێک رژێمی خۆی بەسەر وڵاتەکانی تر بسەپێنێت.

٣- بە هیچ شێوەیەک بەشداریمان لەو شەڕانە نەکرد، کە لە نێوان وڵاتە ئەوروپییەکان رویان دا، دیارە ئەمە لەگەڵ سیاسەتەکانمان ناگونجێ.

پشتگیریی ئینگلیز بۆ بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی ئەمەریکا و دژایەتیی لە بەستنی کۆنگرە نەهێشتنی سیاسەتی کۆنگرەکان دەگەیەنێت، کە لە هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی بڕیاری لەسەر درابوو، هیچ کۆنگرەیەک دوای کۆنگرەی میرابۆ نەبەسترا، دواتر ئەو سیاسەتەی ئینگلیز جیابوو لەگەڵ سیاسەتی پادشای وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا، ئەمە نەگەڕانەوەی هەتاهەتایی و تەبایی چوار وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا و یەکێتیی پادشا و ئەمیر و هێز و توانای مەترنیخ. بە پێچەوانەوە مەترنیخ خۆی وەکو بەرپرسی یەکەمی لەناوبردنی بزووتنەوە ئازادیخوازەکان لە ئەوروپا دەزانی، ئەوە بووە هۆی ئەوەی ئازادیخوازەکان لە هەموو ئەوروپا بە دوژمنی سەرسەختی ئازادی و سونبوولی کۆنەپەرستی و ستەمیی بزانن.

## شۆڕشی فەرەنسا و شۆڕشەکانی ئەوروپی (١٨٣٠)

وەکو کاردانەوەی دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتە بچووکەکان و سیاسەتی کۆنەپەرستانەی پیادەکراو بە تایبەتی لەلایەن قەیسەری روسیا و مەترنیخی وەزیری دەرەوەی نەمسا، لە سەرتاپای ئەوروپا لە ١٨٣٠ زنجیرەیەک شۆڕش و شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسان. لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی شۆڕشیان لێ هەڵگیرسا بوو داخوازی ئازادییە گشتییەکان و دامەزراندنی حوکمێکی دەستووری و چارەی خۆنووسینیان کردبووە ئامانج.

ناپلیۆن لە سەردەمی ئیمپراتۆریەت هەر وڵاتێکی داگیر کردبێت بنەماکانی شۆڕشی فەرەنسی و هزری ئازادیی لێ بڵاو کردۆتەوە، کە دوای ئەو لە ناوبردنی ئەم هزر و بیرانە کارێکی ئاسان نەبوو. ئەوانەی بەدوای بڵاوکردنەوەی ئەم بیروڕایانەوە خەمخۆربوون چینی بۆرجوازی بوو، دواتر پرسی نەتەوایەتی کاریگەرترین پرس و فاکتەری شۆڕش بوون بە تایبەتی ساڵی ١٨٣٠ و لەو وڵاتانەی ژێر دەسەڵاتی بێگانەبوون، کە هیچ بەهایەکیان بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی و حەزەکانی هاووڵاتیاندا نەدەنا، بۆ نموونە:

وڵاتی بەلژیکا و پۆلۆنیا، کە لە کۆنگرەی ڤیەننا بڕیاریان لەسەر درا، ئەوە بوو هەندێک لەو شۆڕشانە شێوازێکی خوێناویان بە خۆوە بینی وەکو ئەوەی لە فەرەنسا و بەلژیک و پۆلۆنیا رویان دا.

لە خوارەوە گرنگترین ڕووداوەکانی ساڵی ۱۸۳۰ دەخەینە روو.

## شۆڕش لە فەرەنسا

کۆنگرەی ڤیەننا بە هاوکاریی و لایەنگیریی دوژمانی فەرەنسا لە دەرەوە و پشتگیریی هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی و هاوپەیمانێتیی پیرۆز توانیی لویسی هەژدەهەم لە خانەوادەی بۆربۆن بگەڕێنێتەوە سەر تەختی پادشایەتی، هەرچەندە لە گەڕانەوەی جاری یەکەمی پادشای فەرەنسا لویسی هەژدەهەم رایگەیاند، کە نە هیچ لە رابردوو فێربووە و نە هیچی رابردوش لە بیر دەکات، بەڵام لە گەڕانەوەی دووەم جاری، کە ناپلیۆن لە شەڕەکانی واتەرلۆ شکستی هێنا و بۆ دوایین جار دوور خرایەوە، نەرمیی لە بڕیار و رەفتارەکانی دەنواند و کەمتر پابەندی بنەماکانی پادشایەتیی کۆن بوو. لەوانەیە لە ۱۰۰ رۆژە دوورخراویەکەی ئەم پەندە فێر بووبێ، کە ئیتر فەرەنسا دوای شۆڕشی فەرەنسی گۆڕان لە کۆمەڵگاکەی دروست بووە و گەڕاندنەوەی مێژوو کارێکی ئاسان نییە، بۆیە دەبێت بە هەمان شێوازی بەر لە ۱۷۸۹ەوە رەفتار نەکرێت. هەرچۆنێک بێت پادشا گەڕایەوە و کۆچبەرەکانی دەرەوە، کە بەردەوام لە پیلانگێڕان دابوون، ئەوانیش گەڕانەوە فەرەنسا و دەستیان بەسەر موڵک و سامانە زەوتکراوەکانی خۆیانەوە گرت، ئاڵا سێ رەنگیەکەی شۆڕشیان لابرد و لە شوێنی ئەو ئاڵای خانەوادەی بۆربۆنیان هەڵکرد، کە بریتی بوو لە رەنگی سپی و زەنبەقی زەرد. هەر چۆنێک بێت بە خۆشی یان ناخۆشی گەلی فەرەنسی رازی بوون، پادشا لەگەڵ میللەت نەرمونیان بوو، بڕیارەکانی سەردەمی ناپلیۆنی هەڵنەوەشاندنەوە و ئەوانەی مەودایەکی باشیان بە ئازادی و دیموکراتی بەخشی بوو، ئەو خاکانەی ناپلیۆن بە جوتیارە فەرەنسییەکانی بەخشی بوون، کە هی دەرەبەگە فەرەنسییەکان بوون، لێیانی نەسەندنەوە. سیستەمی دادوەریی سەردەمی ناپلیۆنی پیادە دەکرد، سەرەڕای ئەمانە رازی بوو دەستوورێک بە فەرەنسییەکان ببەخشێت دیموکراسی و ئازادییە گشتییەکان بۆ فەرەنسییەکان دەستەبەر بکات لەو دەستوورەی، کە لەسەردەمی

ناپلیۆن پیادە دەکرا، لە بەرانبەری ئەوە هەموو دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن بە پادشا بەخشران، دەسەڵاتی یاسادانانیش بە دوو ئەنجومەن بەخشرا:

ئەنجومەنی پیران، کە پادشا ئەندامەکانی دادەمەزراند. ئەنجومەنی نوێنەران، لەلایەن گەلەوە ناڕاستەوخۆ دێتە هەڵبژاردن، بە سنووردارکردنی مافی دەنگدان تەنیا بۆ ئەو کەسەی ساڵانە ٣٠٠ فرەنک بدات، ئەوا مافی دەنگدانی هەیە. بەم بڕیارە ژمارەی دەنگدەران بۆ ٨٠ هەزار کەم کرایەوە، ئەم دەستوورە لە مێژووی فەرەنسی بە دەستوور یان بە میساقی ساڵی ١٨١٤ دەناسرێت، کە لە ٤ی حوزەیرانی ١٨١٤ دەرچوو.

بەڕوونی دیار دەکەوێت لویسی هەژدەهەم هەوڵی ئەوەی دەدا لەم نێوەندە هەڵوێستێکی میانڕەوانە لە نێوان سیستەمی پادشایەتیی خانەوادەی بۆربۆن و دیموکراتخوازەکان، واتە لە نێوان ڕژێمی کۆن و نوێدا هاوسەنگیەکە ڕاگرێت، یان بەڕوونتر بڵێین هەوڵی ئەوەی دەدا، کە بە کەمترین شێوە بۆربۆنی بێت و لە هەمان کاتیشدا سەرۆکێکی شۆڕشگێڕ و کۆماری بێت بەقەدەر ئەوەندەی بۆی دەلوێت، بەمەرجێك لە بەرژەوەندیی خانەوادەکەیدا بێت.

لویسی هەژدەهەم کاری بۆ ئەوە دەکرد دڵسۆز بێت بۆ ئەو دەستوورەی ئازادی و دیموکراسی بۆ گەل مسۆگەر دەکات و ئەوان دەنگیان پێی داوە، لە بەربەرچدانەوەی بەردەوامی ڕاستڕەوەکان و شکۆمەندەکاندا بوو بۆ ئەوەی لە هەوڵەکانیان سەرنەکەون، کە داوای گێڕانەوەی ئیمتیازاتەکان دابوون، ئەوان زۆر بێ نەزاکەتانە دەیانویست ڕەوڕەوەی مێژوو بۆ بەر لە ١٧٨٩ بگەڕێننەوە. دیارە لەم ڕووەوە بە شێوازی توندڕەوی و کاری تیرۆری هەوڵەکانیان بە ئەنجام دەگەیاندن، بۆیە توانیان یاسای دەنگدەران بۆ ٨٠ هەزار کەم کەنەوە، ئەوانیش هەمووی لە خاوەن سامان و دەوڵەمەندەکان بوون، بەم شێوەیە لە ١٨١٥ زۆرینەیان لە پەرلەمان وەدەست هێنا، کە ئەنجامەکەی فەرەنسای بە حوکمێکی ستەمکار و نادیموکرات لە بواری چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانی گەیاند. ئەم ڕەفتارانە پادشایان نارەحەت کرد بە هۆی ئەوەی لە ئەنجامی ئەم ستەمکارییە خەریک بوو پارسەنگی هێزەکان لاری و نابەرانبەرییان تێدەکەوێت، پادشا هەستی بە بێزاری و بێئۆقرەیی جەماوەر دەکرد. ئەوەی لەم گۆڕانە کۆنەپەرستیانە زۆر دەترسان ئینگلیز و ڕوسیا بوون لە ترسی ئەوەی کاردانەوەی جەماوەر بەرەو شۆڕش بەرێت و فەرەنسا دووبارە ڕاپەڕێتەوە، بۆیە داوایان

لە لویس کرد ئەنجومەنی نوێنەران هەڵوەشێنێتەوە و هەڵبژاردنی نوێ ئەنجام بدرێت، لویسی هەژدەم ئەم ئامۆژگاریەی بەهەند وەرگرت، بڕیاری دەرکرد بە هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەن لە ٥ی سێپتەمبەری ١٨١٥ و داوای هەڵبژاردنی نوێی کرد.

لە هەڵبژاردنەکە پارتی پادشایەتی دەستووری، کە لایەنگری سیاسەتە میانڕەوەکانی پادشا بوو و ئەوانەی پابەندی دەستووری ١٨١٤ن بە زۆرینەی ١٤٢ کورسی دەرچوون، پارتی پادشایەتیی توندڕەویش ١٠٠کورسیان وەدەست هێنا، پارتی بێلایەنەکان تەنیا ٢٠ کورسیان وەدەست هێنا، کە بانگخوازی دیموکراسی وسەروەری نەتەوەیی بوون. بەم شێوەیە حکومەتی فەرەنسا بە سەرۆکایەتی ریشیلیۆ لە ساڵەکانی ١٨١٦ تا ١٨٢٠ خاوەنی حکومەتێکی بەتین و سەقامگیر و زاڵ بوو بەسەر تەنگ و چەڵەمەکان و ئەوانەی لە ئەنجامی شکستیەکان لێی کەوتبوو، توانیی هەڵسێتەوە سەرپێ و بەسەریاندا زاڵ بێت. هەر بە هۆی ئەم سەقامگیریەوە بوو فەرەنسا توانیی ئابووریەکەی ببووژێنێتەوە و بەشێکی زۆر لە قەرز و قەرەبووەکانی شەڕ بە وڵاتەکان بداتەوە، لە ئەنجامی ئەو گەش و نمایە متمانەی وڵاتانی وەدەست هێنا و ڕۆڵی کاریگەریی خۆی جارێکی تر لە مەیدانی سیاسەتەکانی ئەوروپا وەرگرتەوە. هەر بە هۆی ئەم ئارامی و متمانەیە بوو کۆنگرەی ئەیکس لاشبیل لە ١٨١٨ بەسترا و بڕیاری کشانەوەی پێشوەختی هێزەکانی بێگانەیان لەسەر خاکی فەرەنسا دا، لە رووی ناوخۆش حکومەت لەگەڵ کەشوهەوا ئارامییەکان گونجا و لە هەڵبژاردنی جەنیوەری ١٨١٧ مۆڵەتی زیاتری بە هاووڵاتیان دا، تا ڕاستەوخۆ بەشداری لە هەڵبژاردنەکان بکەن و ساڵانەش پێنجیەکی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بگۆڕدرێن، لە هەنگاوێکی ئەرێنی تردا وەزیری ناوخۆ بڕیاری لابردنی سانسۆر و چاودێریی یەکجارەکیی لەسەر رۆژنامەکان دا.

ئەم کار و هەنگاوانە رەنگدانەوەی سیاسەتەکانی پادشا و پارتی پادشایەتیی دەستووری میانڕەو بوون، گۆڕانەکان وهەنگاوەکان لە نێوەندی لایەنگرانی ڕاستڕەو و توندڕەوەکان هەرای نایەوە، دەیان وت ئەم رەفتارانە بەرەو لەدەستدانی دەستکەوت و سامانەکانمان دەبات، ئەگەر بەردەوام بن خانەوادەی پادشایەتی لەنێو دڵمان خۆشەویستە لەدەست دەدات و لە هەموو خاوەندارێتی بێبەش دەکرێت. لایەنگرانی سیستەمی چەپ و لیبرال و کۆماری لەم کەشوهەوایە دڵخۆش بوون، ئەوان دەیانزانی چۆن سوود لەم دەرفەتە

وەردەگرن و کاریان بۆ ئەوە دەکرد، کە ئەوەی لە دوای ١٨١٥ لەدەست دراوە، بیگەڕێننەوە. جەماوەریش زۆر بەگەرمی بەپیر بانگەوازەکانیانەوە دەچوون، تا حکومەتیان ناچار کرد هەڵبژاردنەکانی ١٨١٩ ئەنجام بدرێت، کە ژمارەیەکی زۆر لە پیاوەکانی شۆڕش بە ئەندامی ئەنجومەن هەڵبژێردران و هەڕەشەی لێسەندنەوەی حوکمیان لە میانڕەوەکان دەکرد، پادشا درکی بە ئەنجامی ئەم هەرەشانە دەکردن بۆیە بە داواکاریە کانیان رازی بوو.

بەڵام کوشتنی شازادە دی دێ بێری، کە شوێنگرەوەی باوکی بوو لە حکومڕانی پادشایەتی بە دەستی کورە فەرەنسیەکی گێرەشێوین، مامی کوژراوەکە پادشا لویسی هەژدەهەمی زۆر توڕە و نارەحەت کرد، سەبر و ئۆقرەی لێ برا، دوای کوشتنی برازاکەی نەیتوانی گەلێک خۆی لە بەرانبەر بانگەواز و داخوازیەکانی پادشاییەکان بە تایبەتیش براکەی، واتا باوکی کوژراوەکە راگرێت، بڕیاری دا کاردانەوەیەک ئەنجام بدرێ تا چیتر سەروەری و بەرژەوەندییەکانی پادشایەتی نەکەونە ژێر پێ و لە ترسی کۆماریخوازەکان رزگاریان بێت.

دەرکردنی بڕیاری هەموارکردنی یاسای هەڵبژاردن، کە لەژێر فشاری پادشا دەرکرا، یەکەم هەنگاوی حکومەت بوو بەرەو کۆنەپەرستی، وە تیایدا دیاری کرا، کە هەڵبژاردن بە دوو پلە ئەنجام بدرێت، کورسیەکانیش بۆ ١٧٢ زیاد بکرێن و لە رێگەی ئەنجومەنی پارێزگاکانەوە بن، کە بەم شێوازە زۆربەی ئەوانەی دەردەچن لە خاوەن موڵک و دەوڵەمەندەکان دەبن، ئەوسا خاوەن موڵکە توندڕەوەکان بەسەر ئەنجومەنی نوێنەراندا زاڵ بوون. لە ١٨٢٢ ئەوان توانیان پادشا رازی بکەن تا ریشیلیۆ لەسەر پۆستەکەی لابەرێت، کە یەکێک بوو لە دەستوورییە میانڕەوەکان و یەکێکی تر لە توندڕەوەکان بێنێتە شوێن ئەم، ئەویش توندڕەو ڤیلێل بوو، بە هاتنی سەرۆکوەزیری نوێ سیاسەتی کوشتن و تۆقاندن راونانی کۆماریخوازەکان دەستی پێ کرد سانسۆر و چاودێری دووبارە خرانەوە سەر رۆژنامە و چاپەمەنییەکان و ماوەی خولی پەرلەمان درێژکرایەوە بۆ ٧ ساڵ.

## شارلی دەیەم

چونکە هیچ کوڕی لە پاش جێنەمابوو، بە مردنی لویسی هەژدەهەم لە ١٨٢٤ تەختی پادشایەتی بۆ شارلی دەیەم جێما، بەپێی نەریتی پادشایەتی دوای مردنی لویس

دوایین کەس لە خانەوادەی بۆربۆنی کۆن، کە لە ژیان مابێت دارا توا بوو، ئەویش بە ناوی شارلی دەیەم تاجی پادشایەتیی لەسەر نا. بە هاتنی شارلی دەیەم بەتەواوەتی دەسەڵات کەوتە دەست ڕاستڕەوە توندڕەوەکان، شارل خۆی یەکێک بوو لە سەرکردە و هاندەریان. حکومەت بە کارایی دەستی بە گەڕاندنەوەی سیستەم و شێوازەکانی دەزگا حکومیەکانی بەر لە ١٧٨٩ی کرد، هەموو سامان و مومتەلەکاتی شکۆدارەکان ئەوانەی لە دەستیان دابوون و تائێستا نەیاندابوونەوە، بۆیان گەڕاندنەوە. بۆ ئەم کارەیان یاسایەکیان دەرکرد ناویان نا یاسای ملیار، بە پێی ئەم یاسایە هەموو ئەو زیانانەی شۆڕشی فەرەنسی لێیان داون، بۆیان قەرەبوو دەکرێتەوە. هەروەها ڕێگەی بە باوکە یەسوعییەکان دا (جزویت) بگەڕێنەوە وڵات و دانیشگا و دەزگا فێرکارییەکان بە سەرۆکایەتی ئەکلیرکیی لە خزمەت دانان.

ئەم سیاسەتە توندڕەوییە شەپۆلێکی نارەزایی لەناو بەرهەڵستکارەکان دروست کرد، ترسی ئەوەیان هەبوو وڵات بەرنەوە سەردەمی پادشایەتیی بێسنوور، چونکە ئەمە دوور نەبوو لە ڕواڵەت، بە هۆی ئەوەی چەند جارێک وتبووی: بۆ من باشترە دارفرۆشێک بم نەک پادشایەکی وەکو پادشای ئینگلتەرا.

هەروەها ئۆپۆزسیۆن بەسەر سێ بەرەدا دابەش ببوون:

- لە چەپ دەستەی رۆشنبیر و نووسەر و رۆژنامەنوسانی پابەند بە کۆماری و بنەماکانی شۆڕشەوە، ئەم دەستەیە لە رەفتارەکانی پادشا ناڕازی بوون، بەتایبەت کاتێک پاشماوەی ئەفسەرانی ناپلیۆن لە سوپا و پاسەوانی ئەهلیی هەڵوەشاندەوە، کە دوایین دەزگای شۆڕش بوو مابوونەوە.

- لە ناوەڕاستیش دەستەی پادشایەتیی دەستووریی، کە لە گەورە رۆشنبیر و گەورە بازرگانەکان و پیشەسازمانەکان پێک هاتبوون.

- لەوپەری ڕاستیشەوە دەستەیەک لە توندڕەوەکان بە سەرۆکایەتی شاتۆ بریان، کە بە هۆی دوورخستنەوەی لە سەنتەری دەسەڵات جیا بووەوە.

سەرەڕای ئەوەی پەرلەمانی فەرەنسا سەربە لایەنگرانی پادشاوەبوو، بەڵام ئەو بڕیارەی رەت کردەوە، کە میراتی موڵکە زۆرەکان بە کورە مەزنەکە دەدات و سانسۆر و چاودێریش

دەخاتە سەر رۆژنامە و چاپە مەدەنییەکان، بە هۆیەوە پادشا پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە و داوای هەڵبژاردنی نوێی کرد.

لە هەڵبژاردنەکانی ١٨٢٨هاوپەیمانیی پادشایەتیی دەستووری و هەندێک لە ئازادیخوازانی کۆماریی میانڕەو بە زۆرینەی کورسیەکان دەرچوون، بە پێی ئەم ئەنجامانە دەبووایە پادشا میانڕەوانە هەڵسوکەوت بکات، بۆیە داوای لە سیاسەتمەدارێکی کۆن کرد بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکوەزیران، ئەویش مارتیگناک بوو. بەڵام مارتیگناک نەیتوانی هیچ لایەک لەلایەنانی پەرلەمان رازی بکات، ئەمەش حەز و دڵخوازی پادشا بوو، ناچار لە ١٨٢٩ ماتیگناک دەستی لە کار کێشایەوە. ئەوسا داوا لە پۆلیگناک کرا، کە بە سەرسەختترین دوژمنی سیستەمی ئازادی دەناسرا، پۆستی سەرۆکوەزیران وەرگرێت، کە پێشتر باڵوێزی فەرەنسا بوو لە لەندەن، ئەم پیاوە ٧مانگ حکومڕانیی کرد بێ ئەوەی لەو ماوەیەدا پەرلەمان کۆ بێتەوە.

لە جەنیوەری ١٨٣٠ رۆژنامەی ناشیۆنال، کە گەنجێکی فەرەنسی بە ناوی تییرس لەسەر خەرجیی خاوەن بانکەکانی فەرەنسا دەری دەکرد، ئەم رۆژنامەیە لە پێناو پاراستنی دەستوور و ئازادییە گشتییەکان دا بە ئاشکرا و بە نهێنی بانگەوازیی بۆ گۆڕینی حکومەتی فەرەنسا دەکرد.

لە مارسی ١٨٣٠ لە یەکەم دانیشتنی دا پەرلەمان داوای کرد رێگە بە خەڵک بدرێت زیاتر بەشداری لە حکومڕانی بکەن و متمانەش لە حکومەت بسەندرێتەوە، پادشا لەم بڕیارەیان توڕەبوو و پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە، لە هەڵبژاردنەکانی دوای ئەم هەڵوەشاندنەوەیە ئازادیخوازەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و ژمارەی کورسیەکانیان بۆ ٥٠ کورسی زیاد کردن، لەم کاتەدابوو فەرەنسا جەزائیری داگیر کرد، کەواتە بناغەی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی دامەزرا. ئابووریی و خەزنەی وڵات، کە خاڵی ببوون، بووژانەوە، خەزینەی شارلی دەیەم ٥٠ ملیۆن فرەنکی زێری هەبوو، کە بە زۆر لە گەلی جەزائیریان سەندبوو. ئەم سەرکەوتنە ئیمپریالیزمیەی بووە هۆی لەخۆبایی بوونی پادشا، لە ٢٥ی تەمووزی ١٨٣٠رووی لە ئۆپۆزسیۆنی ناوخۆ کرد و چوار بڕیاری تایبەت بەوان دەرکردن:

١- هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نوێ.

٢- سنووردارکردنی ئازادیی رۆژنامەگەری.

٣- هەموارکردنی یاسای هەڵبژاردن.
٤- لە هەموارکردنەکەدا کارێکی وا کرا، کە زۆربەی دەنگدەران لە موڵکدارەکان بن.

لە ٢٧ی تەمووزیش لەیەکتێگەیشتنێکی نێوان کۆماری خوازەکان و کۆمەڵە کرێکاریەکاندا پێکهاتن لەسەر ئەوەی یاخیبوونی چەکداری رابگەیەنن، هەر واشبوو خوێندکار و کرێکارەکان بە چەکەوە دابەزینە ناو شەقامەکان و سەنگەریان دامەزراند و دەرگای کارگەکانیان داخستن، لەلایەن پیشەسازکارەکانەوە چەک دابەش کرا. رۆژی دواتر خەڵکە راپەڕیوەکە دەستی بەسەر کۆشکی پادشادا گرت لە تویلەری و پایتەختیان کۆنترۆڵ کرد، ئەوکاتە پادشا لە کەنارەکان راوە ماسیی دەکرد، هەوڵی دا خەڵکە راپەڕیوەکە بە هەڵوەشاندنەوەی رێورەسمەکان رازی بکات، بەڵام شۆڕشگێڕەکان پێیان لەسەر دابەزینی پادشا داگرت تا شارلی دەیەم ناچار بوو بۆ دەرەوە رابکات. سەرنجەکان بەرەو شازادە دۆرلیانی سەرکردەی خانەوادەی ئۆرلیانی دێرین چوون، ئۆرلیۆن لقێکە لە خانەوادەی بۆربۆن و کوڕی فیلیپی یەکسانە و خزمی لویسی شازدەهەمی لایەنگری شۆڕشە، کە دەنگی بۆ لە سێدارەدانی پادشای فەرەنسی دا بەرلەوەی ئەو لە سێدارە بدرێت. خۆشی بەدەستی ئازادیخوازەکان لە سێدارە درا. بە درێژایی ماوەی بێپادشایی کوڕی ئەم شازادە دۆریان لە دەرەوە لە مەیدانی پیلانگێڕی بەسەر فەرەنساوە دوور بوو، دوای رووخانی ناپلیۆنیش ئەم پەیوەندیی لەگەڵ ئازادیخوازەکان خۆش کرد.

پەرلەمانی فەرەنسی بانگی شازادە دۆرلیانی کرد بۆ ئەوەی تاجە گوڵینەی پادشایەتیی فەرەنسا بنێتە سەر، بەڵام وەکو (پادشا لەسەر فەرەنسییەکان) نەک (پادشای فەرەنسا)ی وەکو پادشاکانی پێشتر، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بە هۆی سامان و موڵکەکانی کە هەیەتی، نەتەوە خۆی هەڵی بژاردووە بیێتە پادشا بەسەریانەوە. بەسەریشیاندا سەپاند لەژێر ئاڵا سێ رەنگەکەی شۆڕش حکومڕانی بکات، کە لای هەموو فەرەنسییەکان خۆشەویستە نەک ئاڵاکەی خانەوادەی بۆربۆنی کۆن.

ئەوەی راستی بێت هۆشیارەکانی فەرەنسا رژێمی کۆماریان بەدوور زانی بە هۆی نارەزایی نەمسا و روسیا، بەم شێوەیە دەبینین شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازەکان بوون، کە تۆوی کۆماری و شۆڕشیان لە ١٨٣٠ چاند، هەر خۆشیان بوون پاراستیان و مەزنیان کرد تا

پادشاییە دەستوورییەکان هاتن بەروبوومەکەیان چنی بێ ئەوەی پێیەوە ماندوو بن، چونکە بارودۆخی ئەوروپای ئەوساجگە لەمە ڕێگەی بە هیچی تر نەدەدا.

## شۆڕشی بەلژیکا

بە دیدی ئەندامانی کۆنگرەی ڤیەننا پێویستییەکانی پاراستنی ئاشتی و ئارامیی ئەوروپا وا پێویستی دەکرد فەرەنسا بە چەند وڵاتێکی بەهێز و بەتوانا دەوری بدرێت، نەبادا رۆژێک هەڵسێتەوە سەر پێ و دووبارە شۆڕش هەڵگیرسێنێتەوە و دیسان کیشوەری ئەوروپا ئارامیی لێ دەبڕێ. لەم روانگەیەوە هەردوو وڵاتی بەلژیک وهۆڵەندایان یەکخستن و ولیەم ئۆف ئۆرەنجیان بە پادشای ئەو وڵاتە دامەزراند، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێی دا ئەم بڕیارە بڕیارێکی زیرەکانە نەبوو، چونکە هیچ حسابێکیان بۆ جیاوازیەکانی نەتەوایەتی و زمان و مێژوو نەکردبوو، تالێیران ڕاستی وت کاتێک وتی: نەتەوەیەک بە ناوی نەتەوەی بەلژیک بوونی نییە، بەڵام نەتەوەی فلامنکی و گەلی فالون بوونیان هەیە. بە هەر حاڵەتێک بێت ڕاستە کە نەتەوەیەک بەناوی نەتەوەی بەلژیک نییە، بەڵام بەلژیک و ویلایەتەکانی لە دێرزەمانەوە سەر بە ئیسپانیا و و ئیمپراتۆریەتی نەمسا بوون، مێژوویەکی دێرین بە دونیای لاتینیان دەبەستێتەوە و لە هۆڵەندایان جیا دەکاتەوە. دواتر ناکۆکیی ئایینیشیان لە نێوان هەیە، هۆڵەندییەکان زۆرینەیان پرۆتستانن، کەچی بەلژیکەکان زۆرینەیان کاسۆلیک و ئایینپەروەرن. لە رووی زمانیشەوە زۆرینەی دانیشتووانی بەلژیک بە زمانی فەرەنسی دەدوان، لە رووی شارستانیەتەوە بە فەرەنسا و دونیای لاتینیەوە بەستراوەتەوە، بەڵام هۆڵەندییەکان زمانی تایبەتیی خۆیان هەبوو بە دونیای جێرمانی و ساکسۆنیەوە بەستراونەتەوە.

هەر لەسەرەتاوە هۆڵەندییەکان بەشێوەیەکی نیان مامەڵەیان لەگەڵ بەلژیک نەکردووە تا ئەو زوڵمە لەبیرکەن، کە بێ ویستی خۆیان بە هۆڵەنداوە لکێنراون. بە پێچەوانەوە ئەوان زمانی خۆیان بەسەردا سەپاندن، لە دام و دەزگا و خوێندنگاکان دەبووایە زمانی هۆڵەندی بخوێندرێت، دەستیان بەسەر زۆربەی پۆستە دیبلۆماسی و ئیمتیازاتەکاندا گرتبوو و کارێکی وایان کرد، کە زۆرینەرەهای ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی لە هۆڵەندییەکان بن.

بەلژیکییەکان لە مامەڵەی هۆڵەندییەکان ناڕەحەت و نارازی بوون، هاوپەیمانێتیی پیرۆز و هاوپەیمانێتیی چوارقۆڵی لەسەرسنگیان دایان کوتابوو، بە ئەگەری لاوازی ریزەکانیان بەسەر دوو حزبدا دابەش ببوون. پارتی سەرەکی پارتی کاسۆلیک، کە بانگەوازی بۆ ئازادیی فێربوون و دژایەتیی عەلمانیەت دەکرد، پارتی ئازادیخوازەکانیش بە توندی دەستی بە عەلمانیەتەوە گرتبوو بە مانەوەی پرۆسەی فێربوون بە دەستی حکومەت.

بەڵام لە سەرەتای ساڵی ١٨٢٤ەوە و لە ئەنجامی فشارەکانی دەوڵەت لە سەر ئازادییە گشتییەکان بڵاوبوونەوەی رەوتێکی میانڕەو لە نیوەندی هەردوو لایەن سەری هەڵدا، هەوڵی لەیەکنزیککردنەوەی هەردوو پارتیان دەدا بۆ بەگژداچوونی حکومەت، ئەم نزیک بوونەوەیە لە ساڵی ١٨٢٨ کاتێک رووی دا، کە هەردوو لایەن لەسەر یەک بەرنامە و بنەمای ئازادیی رۆژنامەگەری و ئازادیی فێربوون رێککەوتن.

کاتێک لە تەمووزی ١٨٣٠ شۆڕش لە پاریس هەڵگیرسا دەبووایە بگاتە بەلژیکای دراوسێ و هاوگیانی، ئەوەبوو لە وێنەی کاری توندوتیژی لە ٢٥ی ئابی هەمان ساڵ بە پشتگیری و هاوکاریی بۆرجوازیی نیشتمانی دەستیان پێکرد. ئەوەندەی نەبرد خوێنێکی زۆر رژا، ئەوسا ئۆپۆزسیۆن ئەرکی دەسەڵات گرتنە دەستیان لەئەستۆ گرت، هەرچی فەرمانبەری هۆڵەندی هەبوون ناردنیانەوە هۆڵەندا. لە ٢٦ی هەمان مانگ لە شوێنی ئەوان فەرمانبەری خۆیان دامەزراندن، لە ٢٥ی سێپتەمبەر پاش ئەوەی شکستیان بەو لەشکرە هێنا، کە پادشای هۆڵەندا بۆ سەرکوتکردنی راپەڕیوەکان ناردبووی، حکومەتێکی نوێیان دامەزراند، ئەم حکومەتە ئەرکی وەدەرنانی هۆڵەندیەکانی لە ئەستۆ گرت. لە ٤ی ئۆکتۆبەری ١٨٣٠ سەربەخۆییان راگەیاند و داوای هەڵبژاردنی نوێیان کرد، لە ١٠ی نۆڤەمبەری ١٨٣٠ یەکەم دانیشتنی کۆنگرەی نیشتمانییان بەست.

بەرانبەر بەم رووداوە خەتەرناکانە پادشای هۆڵەندا داوای کۆمەکی لە وڵاتە مەزنەکان کرد، هەر زوو فەرەنسا نارەزایی خۆی بۆ هەر دەستێوەردانێکی دەرەکی لە بەلژیکا راگەیاند، ئەوەشی راگەیاند، کە هەر وڵاتێک دەست لە بەلژیکا وەر بدات بێ سێ و دوو بەلژیکا داگیر دەکات. ئەوەی راستی بێت فەرەنسییەکان زۆر هەستیارانە و بەهێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ رووداوەکانی بەلژیکا دەکرد، چونکە بە دیدی ئەوان ئەوە یەکەم گورزی کوشندەیە لە کۆنگرەی ڤیەننای ١٨١٤دەدرێت، ئەو کۆنگرەی بۆ ئەوان ماکی

شەرمەزاری بوو هەڵوەشاندنەوەی وڵاتێکی بەناو بەهێز لەسەر سنووری فەرەنسا بۆ ئەوەی جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر ڕێبازی شۆڕش، ئەمە بۆ فەرەنسییەکان سەرکەوتنێکی باش بوو. سۆز و جۆشی فەرەنسییەکان ڕێگای ڕاستی لێ ون نەکردن کاتێک ئەو داوایەیان ڕەت کردەوە، کە یەکێک لە نەوەکانی پادشاکەیان بێت فەرمانڕەوایەتیی بەلژیکا بگرێتە دەست، بۆ ئەوەی کێشە لەگەڵ وڵاتێکی وەک ئینگلتەرا دروست نەبێت، هەروەها ئینگلیزەکانیش نارەزایی خۆیان دەربڕی لە دەستێوەردانی هیچ لە وڵاتانی هاوپەیمانێتیی پیرۆز. روسیا کە ئەم هەلانەی لە ئاسمان دەقۆستەوە، بەڵام سەری قال بوو بە ڕووداوەکانی شۆڕش لە پۆلۆنیا، بەر لەوەی کارەکان ئاڵۆزتر بن ئینگلیز داوای بەستنی کۆنگرەیەکی پێنج قۆڵیی کرد لە لەندەن لە نۆڤەمبەری ١٨٣٠.

لە ٢٠ی هەمان مانگ کۆنگرە بەئاسانی توانیی بڕیار لەسەر بنەمای لەیەکجیابوونەوە بدات و دانی بە سەربەخۆیی بەلژیکا نا، لە ٢١ی جەنیوەریی ١٨٣١ بەلژیکا بێلایەنی هەمیشەیی خۆی ڕاگەیاند.

کێشەی سیستەمی حوکم مایەوە تا کۆنگرەی نیشتمانیی بەلژیکی سیستەمی پادشایەتیی هەڵبژارد و دەستنیشانی یەکێک لە بنەماڵەی (لویس فیلیپ)یان کرد وەکو پادشای وڵات، بەڵام کۆنگرەی لەندەن دوای مشتومڕێکی زۆر گەیشتنە بڕیارێکی میانڕەوانە، ئەمیر (لیۆبۆلد دی ساکس کۆبۆرگ)یان هەڵبژارد، کە دەکاتە خاڵی ڤیکتۆریای شاژن و مێردی پێشینەی کچی پادشای ئینگلتەرا چارلتۆن، کە بە پادشایەتی مرد و دواتر هاوسەرگیریی لەگەڵ کچی پادشای فەرەنسا لویس فیلیپ کرد.

بە هۆی ئەوەی پادشای هۆڵەندا رازی نەبوو بەلژیکا سەربەخۆیی وەرگرێت، لەشکرێکی نارد بە نیازی داگیرکردنی، بەڵام فەرەنسا بە هێزێکی زۆرەوە بەرپەرچی دایەوە و پێگەی پادشای بەلژیکاشی قایم کرد.

## شۆڕشی پۆلۆنیا (پۆڵەندا)

وەکو بینیمان زۆربەی شۆڕشەکانی ئەوروپا ئامانجیان چاکسازیی دەستوور و پاراستنی ئازادییە گشتییەکان بوو، بەڵام لە پۆلۆنیا دۆخەکان جیا بوون، ئەو وڵاتەی کۆنگرەی ڤیەننا سەربەخۆیی پێ بەخشی، قەیسەری روسیا لە سەرتەختی حوکمی

دانیشتبوو، لەسەر دەستی ئەسکەندەر لە ساڵی ١٨١٥ بارودۆخێکی جیا لە پارچەکانی تری ئیمپڕاتۆریەتی روسیای بۆ خوڵقاند بوو. دەستوورێکی پێدابوون، کە تا رادەیەکی باش ئازادیی رۆژنامەگەری و ئازادییە گشتییەکان و جێبەجێکردنی بڕواکانی کاسۆلیکی لێ رەها و بێسانسۆر بوون، هەروەها کردبوونییە خاوەنی ئەنجومەنێکی نوێنەرانی هەڵبژێردراو بۆ جێبەجێکردنی دەسەڵاتە شەرعییەکان. لە دەستوورەکەشدا هاتبوو، کە بۆ پۆڵەندیەکان هەیە پۆستە مەزنەکانی وڵات بگرنە دەست. قەیسەری روسیا تەنیا ئەوەندە دەسەڵاتی بۆ خۆی هیشتبووەوە، کە نوێنەرێکی دانا بوو بۆ پێشنیارکردنی یاساکان و هەندێک دەسەڵاتی دارایی و فەرماندایەتیکردنی سوپا بۆ رێکوپێککردنی بارودۆخەکانی وڵات.

بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ ئەوەی قەیسەری روسی رێزی لەدەستووری پۆلۆنیا نەدەگرت، بارودۆخی ئازادییە گشتییەکان هیچ رۆژێک لە رۆژان بە م ئاستە خراپە نەگەیشتبوو، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ دراوسێکانی لە ئەورووپای رۆژهەڵات لە هەموویان باشتر بوو، بۆیە بەگشتی پۆلۆنیەکان ناحەزایەتیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ قەیسەردا نەبوو، بەڵام کۆمەڵێک لە بەرهەڵستکاران و دوژمنانی رژێم لە گەنجە رۆشنبیرەکان و منداڵی شکۆدارەکان و وردە بۆرجوازی، ئەوانەی هەوادار بیری رۆژئاوا بوون، دوور لە بنکەی جەماوەری لە رەوتە رۆمانتیکە سیاسیەکان کۆ ببوونەوە، ئەوانە داوای رزگارکردنی هەمیشەیی پۆلۆنیایان دەکرد دوور لە رەچاوکردنی بارودۆخی ئەورووپا. بە هۆی ئەوەی ئەوان لە سەنتەرە باڵاکانی وڵات نزیک بوون کاتێک هەواڵەکانی شۆڕشی فەرەنسی لە تەمووزیان پێگەیشت، ئیتر ئەوانیش دەستیان بە جووڵە کرد، جێگری پادشایان لە ٢١ی نۆڤەمبەری ١٨٣٠ وەدەر نا، دوای ٤ رۆژ حکومەتێکی میانڕەوی نیشتمانییان پێک هێنا. ئەم حکومەتە هەوڵی زۆری دا تا لەگەڵ قەیسەر بگاتە رێککەوتنێک، بەڵام قەیسەر رازی نەبوو، بە هۆی نابەرانبەری هێزی شۆڕشگێڕەکان و حکومەتەکەی ئەسکەندەری خاوەن مەزنترین سوپا لە ئەورووپا دەرفەتی سەرکەوتنی شۆڕش کەم بوو ئەگەر نەڵێین هەر نەبوو.

شۆڕشگێڕەکان بانگەواز لە دوای بانگەوازیان بۆ وڵاتە ئەورووپییەکان دەکرد، ئینگلیزەکان وێڕای پشتگیریکردنیان بۆ دۆزی گەلی پۆلۆنی، وایان بەباش زانی حکومەتەکەیان دەست نەخاتە ناو کاروباری ئەوان، ئەویش بە هۆی مەزنی ڕۆڵی روسیا

لەو ناوچەیە بوو، فەرەنساش بە ئاواتەخوازی و پەژارە دەربڕین بەشداریی لەم ڕووداوە کرد، بڕوسیا و نەمساش ئاواتەخوازبوون شۆڕشگێڕەکان شکست بخۆن تا پۆلۆنیەکانی ژێر دەسەڵاتیان چاویان لێ نەکەن.

بەم شێوەیە پۆلۆنیا بە تەنیایی لەبەردەم روسیای زەبەلاح مایەوە، کە ژێرکەوتنی مسۆگەر بوو، روسیا بە هێزێکی زۆرەوە هێرشی بردە سەر پۆلۆنیا و شۆڕشگێڕە پۆلۆنیەکان ماوەی ٧ مانگ بەوپەڕی قارەمانێتی و پاڵەوانیتیەوە بەرگریان دەکرد. تا لە کۆتایی روسیا توانیی لە شوباتی ١٨٣١ ڤەرسۆفیا بگرێت و هەزارەها لە سەرکردەی شۆڕشگێڕەکان دەستگیر بکات و بۆ سیبیریا دووریان خاتەوە، دەستووری هەڵوەشاندەوە و وڵاتیشی خستە ژێر حوکمی ڕاستەوخۆی روسی، بەم شێوەیە پۆلۆنیای سیاسی هیچ بوونێکی نەما. بە شکستهێنانی شۆڕش دەهەزار پۆلۆنی لە زانا و نووسەر و ئەدیب وهونەرمەندان بۆ فەرەنسا کۆچیان کرد، لەوێ خەریکی زیندووراگرتن و پاراستنی کەلتوری خۆیان بوون.

## شۆڕشەکان لە ئیتاڵیا

دوای کۆنگرەی لیباخ و دەستێوەردانەکانی نەمسا لە کپکردنی بزووتنەوەکان ئارامیەک باڵی بەسەر دۆخەکاندا کێشا و شۆڕشگێڕەکان لەوە دڵنیا بوون، کە لە داهاتوێکی نزیک گۆڕان ئاسان نییە، بەڵام هەندێک لە کۆمەڵە نهێنیەکان بەتایبەت کۆمەڵەی رەژوکەران و پاشماوەی ئەفسەرانی ناپلیۆن بە نهێنی و لەسەرخۆ کار و چالاکیەکانیان دژی بوونی نەمساییەکان ئەنجام دەدا. لە ساڵی ١٨٣١ هەندێک لە ئەندامانی ئەم کۆمەڵە شۆڕشگێرانە، کە لەژێر کاریگەریی شۆڕشی حوزەیرانی فەرەنسی دابوون، بە سۆزێکی رۆمانتیکیی دوور لە بنەما جەماوەریی و سەربازییەکان لە هەرێمەکانی مۆدینا و بارامی ئیتاڵی و هەندێک لە هەرێمەکانی پاپا راپەرین، زۆربەی جارەکان ئەم راپەرینانە تەنیا بۆ بەرگریکردن لە ستەم و زۆرداری دەسەڵاتداران بوو نەک زیاتر، چونکە بێئومێدیان لە بێپشتیوانی و هاوکاریی دەرەکی و نەبوونی بنکەی جەماوەری هۆکاربوون بۆ بیرکردنەوەیان بەم شێوەیە.

نەمسایییەکان لە بەربەرچدانەوەیان بە توندی راپەرینانە دوودڵیان نەدەنواند لە ترسی ئەوەی گەشە نەکات و هەموو وڵاتی ئیتاڵیانەگرێتەوە، لە سەرەتای ۱۸۳۱ مەترنیخ فەرمانی دا هەرێمەکانی یاخیبوو داگیر بکرێت و شۆڕشگێڕەکان دەستگیر بکەن و بزووتنەوەکەش بخنکێنرێت.

## ڕووداوەکانی سویسرا و ئینگلتەرا

ڕووداوەکانی ۱۸۳۰ی ئەورووپا دەرباز نەدەبوون بێ ئەوەی رەنگدانەوەی لەسەر سویسرا و ئینگلتەرادا نەبێت، لە چوارچێوەی یاسادا و دوور لە توندوتیژی هەندێک ڕووداو لەو وڵاتانەش رویان دا.

سویسرا ئەوکات لە ۲۲ هەرێمی سەربەخۆ پێک هاتبوو، بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەرەوەیان ئەنجومەنێک بە ناوی (دیات) کۆی دەکردنەوە، لە زۆربەی هەرێمەکان دەسەڵات بە دەست بازرگانەکانی لایەنگرانی کۆنەپەرستەکانەوە بوو. چالاکبوونی ئۆپۆزسیۆن لە ئەنجامەکانی شۆڕشی حوزەیرانی فەرەنسی بوو، کە لە نێوانیاندا دەستەی ئازادیخوازی رۆشنبیریی دەرچووانی زانکۆکانی ئەڵمانیا بوون، ئەوسا ئەوان لە درەوشاوەترین هەڵگرانی بیری ئازادیی ئەورووپا بوون، لە هەڵبژاردنەکان دەستکەوتی باشیان وەدەست هێنا و بە هۆیەوە توانیان ڕووبەڕووی کۆنەپارێزەکان ببنەوە و چەند چاکسازییەک لە دەستووردا بکەن، لەوانە:

- دانان بە بنەماکانی سەروەریی نەتەوە جیاکان لە سویسرا.
- یەکسانی لە ریزەکانی هاووڵاتیاندا بێ رەچاوکردنی باری کۆمەڵایەتیی و ئایینیی.
- گرەنتیی زیاتر بۆ رێزگرتن لە ئازادییەکانی رادەربڕین و رۆژنامەگەری.

بەڵام لە ئینگلتەرا ئامانجی خوێندکارەکان هەموارکردنی سیستەمی هەڵبژاردن بوو، ئینگلیزەکان لەژێر کاریگەری شۆڕشی حوزەیرانی فەرەنسیدا خۆنیشاندان و چەند جووڵەیەکی گەلەرییان ئەنجام دا، مەبەستیان هەموارکردنی یاساکانی هەڵبژاردنی کۆن بوو، کە لەگەڵ گۆڕانەکان و جووڵانەوە دانیشتووانەکانی ئەم سەردەمەی سەدەی نۆزدەهەم نەدە گونجان. لە کاتێکدا لە گوندەکان زیاتر لەیەک نوێنەریان بۆ پەرلەمان دەنارد،

کەچی شارە پیشەسازییەکان بە بەراورد رێژەیەکی زۆر کەمتر نوێنەریان دەنارد، جاری وا هەبوو هەر کەسیان نەدەنارد، ئەمە چونکە ئەو کاتەی یاساکانی هەڵبژاردن دانراون خەڵکەکە زۆربەیان لە لادێکان نیشتەجێ بوون و شاری پیشەسازیی بەم شێوەیە گەشەیان نەکردبوو.

بە هۆی فشاری شەقامی ئینگلیزییەوە حکومەتی ولینفتۆن روخا و لە شوێنی ئەو لۆرد گراو بوو بە سەرۆکوەزیران، لە دیسەمبەری ١٨٣٠ یاسای هەڵبژاردن هەموار کرا و مافی هەڵبژاردن لە نیو ملیۆن بۆ ٨٠٠هەزار کەس بەرز بۆوە. ئەم هەموارە بۆ بۆرجوازییەکان دەستکەوت بوو، چونکە ئەوان لە شارە پیشەسازییەکان زۆرینەبوون، بەم شێوەیە ئەو چاکسازیانەی هاووڵاتیەکان داوایان دەکردن لە چوارچێوەی یاسا و دەستووردا جێبەجێ کران.

## شەڕی ناوخۆ لە ئیسپانیا و پرتوگال

ئەو ڕووداوانەی لە سەرەتای ساڵی ١٨٣٠ لە ئەوروپا لەم دوو وڵاتە رویان دەدا هۆکارەکانیان ناوخۆیی بوون، بە پلە یەک بۆ گرتنەدەستی جڵەوی حوکم بوون، بۆیە ڕەوایە گەر ناوی شەڕی ناوخۆی لێ بنێین، لە رووی ئامانج و زنجیرەی رووداو هاوبەشییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ شۆڕشەکاندا نەبوون. هاووڵاتیان بەسەر لایەنگرانی ئازادیخواز و پادشایی رەهای بێسنووردا دابەش ببوون، هەریەکەشیان پێی لەسەر داواکانی خۆیان داگرتبوو بۆ دەسەڵات گرتنە دەست، لە ئەنجامدا شەڕی ناوخۆ لە ئیسپانیا و پرتوگال بوو بە تەوەری شەڕەکان.

دوای سەربەخۆیی بەرازیل پادشا دۆن بەدروی یەکەم بە هۆی توانا و بەرهەمی زۆر و ناسۆی روونی ئەو وڵاتە مانەوەی لە بەرازیل بۆ خۆی هەڵبژارد، لە بەرانبەریدا دەستی لە حوکمی پادشایەتی لە پرتوگال کێشایەوە بۆ گلۆریای کچی. لەبەرئەوەی هێشتا نابالغ بوو، دایکی بوو بە راسپاردە و کارەکانی گرتە ئەستۆ، هەروەها لە ١٨٢٦ دەستوورێکی نوێشی بە وڵات بەخشی.

میگالی برای بەم گۆڕانە رازی نەبوو و داوای تەختی پادشایەتیی لێ کرد، بەم شێوەیە پرتوگال بەسەر دوو تیپدا دابەش بوو: پادشاییە دەستوورییەکان لایەنگری شاژن و

دۆخی حاڵی حازربوون، پادشاییە نەریتییەکان، کە هەر لە سەرەتاوە بەرهەڵستکاری دەستووری ١٨٢٦ بوون، لە دەوری میگال کۆبوونەوە. دۆن میگال پشتگیری ئیسپانیا و فەرەنسای وەدەست هینا، ئەمە بووە هۆی بەهێزبوونی میگال، بەهۆیەوە پادشا دۆن بەدرۆ لە بەرازیلەوە بەپەلە گەڕایەوە بۆ بەرگریکردن لە هەڵوێستی کچەکەی. لە ئەنجام لە ١٨٣٤ کێشەکە کۆتایی هات بە سەرکەوتنی شاژن و دەستوور، دۆن میکالیش بە شکستی وەدەرنرا بە ستەم و زۆرداریەکەیەوە. چونکە پادشای ئیسپانیا فەردیناند هیچ کوری نەبوو، بە پێی دەستوور تەختی پادشایەتی دوای مردنی بۆ کارلۆسی برای دەگەڕێتەوە، بە هۆی ئەوەی کچەکەی منداڵ بوو ئەو کاتەی لە ١٨٣٣مرد، لە جیاتی ئەم خێزانەکەی راسپاردەی حوکمی گرتە دەست، وەکو ئەوەی لە پرتوگال رویدا هاووڵاتیان بەسەر دوو تیپدا دابەش بوون. لایەنگرانی شەرعییەت و دەستوور لە دەوری پادشای بچووک کۆبوونەوە، بەڵام لایەنگرانی پادشایەتیی نەریتی لە دەوری کارلۆس کۆبوونەوە. کە هەرێمی باسکی کردبووە بنکەی چالاکی و شوێنی نیشتەجێی خۆی. لایەنگرانی کارلۆس، کە بە کارلیست ناسرابوون، توانیان هاوکاری و پشتگیری لە کۆنەپەرستانی ئەوروپا لە روسیا و نەمسا وەدەست بێنن، بەڵام لایەنگرانی یاسا یارمەتیی هاوسۆزییان لە بەریتانیا و فەرەنسا وەدەست هێنا. شەڕ بەردەوام بوو تا ساڵی ١٨٣٩ بەوە کۆتایی هات کارلۆس وڵات جێ بهێڵێت و یاوەرانی لە مافی دەسەڵات گرتنەدەست بێبەش بن، بەم شێوەیە ڕووداوەکان کۆتاییان هات بە سەرکەوتنی یاسا و دەستوور بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی ئابووری و کۆمەڵایەتیی بنەڕەتی لە سیاسەتی پرتوگال و ئیسپانیا روویدەن.

## کۆتایی هاتنی شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٣٠

ڕووداوەکانی ساڵی ١٨٣٠ و دواتر پەردەیان لەسەر ناکۆکیەکانی نێوان بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی مەزن لەمەڕ دیدیان بۆ پرسەکانی ئەوروپا هەڵدایەوە، ئینگلتەرا وەکو بینیمان کاری بۆ لەناوبردنی سیاسەتی کۆنگرەکان دەکرد. ئەوانەی لە هاوپەیمانێتیی چوارقوڵی لە ساڵەکانی ١٨١٥ ئاماژەیان پێی دا، دەبینین ئەمجارە لە ١٨٣٠ سیاسەتێکی توندتر دژی بنەماکانی هاوپەیمانێتییەکان پیادە دەکات، بە ئاشکرا

دژی هەموو سیاسەتەکانی وڵاتە مەزنەکان دەوەستێت بەرانبەر بە دەستوەردان لە کاروباری وڵاتە ئەوروپییەکانەوە لەژێر هەر پاساوێک بێت.

ئەو کاتەی وڵاتە مەزنەکان روسیا و نەمسا و بڕوسیا لە ۱۸۳۳ بۆ توێژینەوەی بارودۆخی ئەوروپا کۆنگرەیان بەست، ئینگلتەرا بەشداریی نەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کۆنگرە سێ قۆڵیەکە بەیاننامەیەکیان دەرکرد، کە هەر پادشایەکی ئەوروپی لە دەرەوە یان لە ناوەوە هەڕەشەی لێ بکرێت داوای کۆمەک لەم سێ پادشایە بکات دەبێت بە هانایەوە بچن، هەر کەسێکیش رێگر بێت بە وڵاتێکی دوژمنی ئەو سێ وڵاتانە دێتە ئەژمار، کە لەسەر ئەم بەیاننامەیە واژویان کردووە.

ئەم بایاننامەیە ئینگلتەرای وروژاند، هەروەها فەرەنساش لێی نارازی بوو بە هۆی ئەوەی لە سەرەتاوە فەرەنسا خۆی لە هاوپەیمانێتیی پیرۆز دووردەخاتەوە بۆ ئەوەی بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی سیاسەتی دەرەوەی داڕێژێت، ئەویش بەرژەوەندییە نەتەوایەتیەکانە .کە رازی نابێت کەس دەست لە کاروباری بەلژیک و سویسرا و بیامۆن وەر بدات، لە پێناو ئەم هەڵوێستەشیدا ئامادەیە شەڕ بکات.

هەر وەکو دەبینین لە دوای ساڵی ۱۸۳٤ دۆخەکان هەندێک ئارام ببوونەوە، بەڵام وڵاتە مەزنەکان بە هۆی بەرژەوەندییەکانیانەوە ناکۆکیی بنەڕەتیان کەوتنە نێوان و بەسەر دوو ئۆردوگادا دابەش بوون:

ئۆردوگای سێ وڵاتەکە: روسیا، بڕوسیا، نەمسا.

ئۆردوگای وڵاتە رۆژئاواییەکان فەرەنسا و ئینگلتەرا بوون، هەر یەک لە پرتوگال و ئیسپانیا لایەنگرییان دەکردن.

## شۆڕشی فەرەنسیی ۱۸٤۸ و شۆڕشەکانی ئەوروپا

ئەگەر ئێمە سەیرێکی نەخشەی ئەوروپای سیاسیی ساڵی ۱۸٤۸ بکەین دەبینین هەمان نەخشەیە، کە لە کۆنگرەی ڤیەننا لە ۱۸۱٥ کێشرابوو جگە لە دەستکاریەکی کەم لە ئەنجامی سەربەخۆیی بەلژیک و یۆنان نەبێت، ئەمەش سەرکەوتنێکی مەزنە بۆ لایەنگرانی کۆنەپەرستی و پاراستنی دۆخە کۆنەکانی ئەوروپا لە سەروی هەموویان قەیسەر و مەترنیخ وەزیری دەرەوەی نەمسا. بەڵام لە ساڵی ۱۸٤۸ بە چاکە و کاریگەریی

سەرهەڵدانی بیری نەتەوایەتی و گۆڕانە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم گۆڕان بووە فەرمانێکی حەتمی دەرچوونی بۆ نەبێت، تەنانەت ئەگەر ناچار بێت کاری توندوتیژییش بگرێتە بەر، دیارە گەلی فەرەنسا لەم بوارە پێش هەموو گەلێک دەکەوێت لە هێنانەدیی گۆڕان تەنانەت ئەگەر بە چەکهەڵگرتن و هەڵگیرساندنی شۆڕشیش بێت.

## شۆڕش لە فەرەنسا

لە ئەنجامی شۆڕشێکی سەرتاسەریی بینیمان چۆن لەسەر شانی ئازادیخواز و کۆماریخوازان بە پلەی یەک لویس فیلیپ سەرکەوتە سەر تەختی پادشایەتی، بە سەرکەوتنی لویس بیروبۆچوونی پادشاییە دەستوورییەکان کۆتایی هات و لەلایەن خانەوادەی ئۆرلیانەوە درێژە بە رژێمی پادشایەتی درا.

هەر لەسەرەتای حوکمییەوە پادشای نوێ لە لایەن حکومەتەوە ڕووبەڕووی ناکۆکی هاتەوە:

- لەوپەڕی ڕاستەوە ئەوانەی ناویان لەخۆیان نابوو شەرعییەکان، یان یاوەرانی شەرعی وەستابوون.
- ئەوانە نوێنەرایەتیی خانەوادەی بۆربۆنیان دەکرد داوای مانەوەی تاجی پادشایەتی لەدەست خانەوادەی لویسی هەژدەم دەکرد، ئەمانە خۆیان لە حکومەتە نوێکە دابڕاند و بە سەرۆکایەتی شازادە بریی خێزانی کوری شارلی دەیەم چوونە سەنگەری دژایەتییەوە، لایەنگری زۆریان لە دێکان و لەناو ریزی جوتیار و ئەکلیرۆسەکاندا هەبوو.
- لە چەپی حوکمیشەوە کۆماریخواز و توندڕەوەکان و لایەنگرانی گۆڕانی ریشەیی وەستابوون، کە بەرهەڵستاکاری پادشایان دەکرد، بە هۆی ئەوەی متمانەیان بە پادشا نەدەکرد، گوایە لە رێگەی جەماوەرەوە متمانەی پێ نەبەخشراوە، بەڵکو ژێر بە ژێر لە نێوان هێزە کاریگەرەکان سەپێندراوە. بۆیە بەردەوام بوون لە بەرهەڵستکردنی پادشا. تاوێک بە شێوازی دیموکراسی و تاوێک بە شێوازی توندوتیژی، تا ساڵی ١٨٣٥

چەندین جار شێوازی یاخیبوونیان گرتە بەر، دەسەڵات ناچار بوو چەند یاسایەک بۆ سنووردارکردنی چالاکیەکانی کۆمەڵەکان دەربکات.

پارتی پادشاییە دەستووریەکان، کە لویس فیلیپ لەسەر شانی ئەوانەوە بە تەختی پادشایەتی گەیشت، ئەوانیش لە نێوان خۆیاندا بۆ دوو بەرەی ناکۆک و دژ دابەش بوون، ئەمەش کارەکانی لەبەردەم پادشا سەختتر کردن، ناکۆکیەکانیان لەسەر گرتنەبەری شێوازی سیاسەتی دەوڵەت بوو. بەرەی چەپڕەوەکان، کە ناوی بزووتنەوەییان لەخۆ نابوو (شۆڕشی حوزەیران)یان بە سەرەتایەکی وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی بەربڵاو دەزانی، بە دیدی ئەوان دەبێت دەسەڵاتی نوێ بەدوای هەواڵ و گۆڕانەکانیدا بچێت و لەگەڵی هاوکێشیەک هەبێت تا لە بووژاندنەوەی بەردەوامدا بن. بەرەی ڕاستڕەوەکانیش، کە ناوی بەرگرییان لەخۆ نابوو دەیان وت شۆڕشی حوزەیران لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک چاکسازیی دەستووریی هێنابوو، کە سەردەمی نوێیان خولقاند، ئەمەش ئەوپەری داخوازییەکانی خەڵک بوون، بۆیە دەبێت دەسەڵاتی نوێ کار بۆ دابینکردنی ئارامی و سەقامگیربوونی دۆخەکان بکات لە دەرەوە و لە ناوەوە.

بەم شێوەیە بە دیدی چەپڕەوەکان دەبێت حکومەت لە گۆڕان و گەشەکردنی بەردەوامدا بێت، بە ڕوونتر بڵێین دەبێت شۆڕشی هەمیشەیی بێت، بەڵام بە دیدی ڕاستڕەوەکان دەبێت حکومەت خۆی وەکو مەبەست و کۆتایی شۆڕش سەیری خۆی بکات، دوای ئەوە ئیتر بڕوای بە هەستانەوە و وچاندان بۆ گەلەکەی هەبێت. چونکە باڵی ڕاستڕەوە کۆنەپارێزەکان لە پارتی پادشایەتیی دەستووری بە پلەی یەک نوێنەرایەتیی بەرژەوەندییەکانی چینی مامناوەندیی فەرەنسی دەکات، هەر خۆشیان بوونە خاوەنی ئەو چاکەیەی، کە (لویس فیلیپ)یان گەیاندە تەختی پادشایەتی. ئەوان لە باڵەکەی تر زیاتر کار بۆ ئامانج و بەرژەوەندییەکانی پادشا و چینە یاوەرەکەی دەکەن، بۆیە دەسەڵاتی حکومڕانیی تا رووخانی ساڵی ١٨٤٨ی بەوان سپارد. نەک تەنیا ئەمە، بەڵکو مەبەستی بوو سوودیان لێ وەرگرێت بۆ بەگژدابردنیان لەگەڵ ڕاستڕەوە توندڕەوەکانی لایەنگرانی بۆربۆن و چەپڕەوە کۆماریخوازەکان و شۆڕشگێڕەکان، لە پێناو ئەمە لە ساڵی ١٨٣١ یاسای پەرلەمانی هەموار کرد بە شێوەیەک ژمارەی ئەندامانی زیاد بکات، کە چینی مامناوەندی لەناو

ئەنجومەنەکان زۆرینە وەدەست بێنن. پاسەوانی ئەهلیی بە ڕێنمایی نوێوە نۆژەن کردەوە، کە تەنیا ئەوانەی باجی زۆر بە دەوڵەت دەدەن ئەوان بۆیان هەبێت بەشداریی تێدا بکەن، بەم پێوەرە تەنیا منداڵانی چینی مامناوەندی بۆیان هەبوو، کوڕە هەژارەکان پاڵپشتانی کۆماریخوازەکانی توندڕەویش بێکار لە شەقامەکان دەخولانەوە.

ئەم سیاسەتە جیاوازیخوازەی پادشا تووڕەیی و بێزاریی چینەکانی تری پتر کرد و هانی ئەوەی دان لە ئۆپۆزسیۆن بناڵێنەوە و دژایەتیی پادشا بکەن، لایەنە جیاکانی بەرهەڵستکاران لە نەخشەی دژی پادشا و ڕژێمەکەی بەردەوام بوون، هەندێک جار هەوڵی کوشتن و لەناوبردنیشیان دەدا.

چونکە توندوتیژی کوشتن و توندوتیژی و تیرۆر لەگەڵ خۆی دەهێنێت، ئیتر وردە وردە پادشا و ڕژێمەکەی خزانە ناو شەڕ و ستەمکاری، ئەمە لە کاتێکدایە پادشا خۆی ئەم دەستوورەی هەڵبژاردووە، کەچی پتر لە جارێك دەبینین دەستوور پێشێل دەکات و لە بنەماکانی دەردەچێت.

لە سەرەتای ساڵی ١٨٣٥، کە ئەو ماوەیە بە ماوەی سەقامگیری لە بەرژەوەندییەکانی پادشا و چینی مامناوەند دەناسرێت، هەموو هەوڵەکانی کۆماریخوازەکان و پادشاییە توندڕەوەکان بەفیرۆ چوو، لەو کاتەدا ناکۆکیەک لە نێوان پادشا و لایەنگرانی دروست بوو. پادشا خۆی دەیخواست بەپێی دەستوور فەرمانڕەوایی بکات و کارەکان جێبەجێ بکات، بەڵام لایەنگرانی دەیانخواست پادشا تەنیا موڵکداری بکات و سامان و سەروەت پێکبهێنێت و لە کارەکانی تر دوور بکەوێتەوە. ئەم ناکۆکییانە رویان لە زیاد بوون کرد و پادشایان ناچار کرد روو لە کەسایەتییە دەستڕۆکانی مایانڕەو بکات بۆ هاوکاریکردنی لە بەڕێوەبردنی دەسەڵات، لەگەڵ ئەم کێشەیە مایەوە تا رووخانی لە ١٨٤٨. دەسەڵاتی حکومەت بەم هۆیەوە بەرەو لاوازی چوو، رکابەران روویان لە زیاد بوون کرد بە تایبەت لە سەردەمی حکومەتی گیزۆ لە ١٨٤٠-١٨٤٨، کە ئەوسا ناکۆکیەکانی نێوان کۆشکی پادشا و دەسەڵات بۆ یانە سیاسییەکان و پەرلەمان و رۆژنامە و سەر شەقامەکان گواسترانەوە.

لە ئەنجامی پشێوی سیاسیی و گۆڕانە ئابووریی و کۆمەڵایەتیەکاندا دوو رەوت دژی دەسەڵاتی پادشا سەریان هەڵدا ئەوانیش رەوتی بۆناپارتی و رەوتی سۆشیالزم بوون.

## بۆناپارتی

ئەو ماوە دوورەی دوای رووخانی ناپلیۆن، کە ماوەیەک فەرەنسا بە نامۆیی مایەوە و ماوەیەکیش فەرەنسایەکی سیاسیانەی لە ئاستی دەرەوەی سەر بە وڵاتە مەزنەکان بە تایبەتی ئینگلتەرا و دوای ساڵی ١٨٣٠ لە رووی سیاسەتی سەربازیی بە وەستاوی مایەوە، ئەمانە هەمووی کاریگەربوون تا فەرەنسییەکان بە چاوێکی حەز و پەرۆشەوە سەیری ئەو رۆژانە بکەن، کە فەرەنسا لەگەڵ سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن لەژێر ئاڵا سێ رەنگیەکەیدا دەژیا. ئەوەی زیاتر خەڵکی تامەزرۆی ئەو وەبیرهێنانەوانە دەکردن سیاسەتە سنووردارەکەی فەرەنسا بوو، کە ئامانجەکانی بەرتەسک و دیاریکراوبوون، هەموو کارەکانی بۆ رازیکردنی سیاسەتی بەریتانیا بوو. لەم پێناوەدا ئامادەبوو ئەگەر لەسەر حسابی سەروەریی فەرەنسییەکانیش بێت بیکات، نموونەی ئەمەش قەیرانەکەی محمد علی پاشا بوو لەگەڵ عوسمانیەکان، کە فەرەنسا دەستبەرداری میسری دۆستی دێرینی بوو بۆ ئەوەی بەریتانیای لێ زویر نەبێت. ئەم رووداوە سەرکەوتن و شکۆمەندیەکانی سەردەمی ناپلیۆنیان وەبیر فەرەنسییەکان دەهێنایەوە، کە چۆن چۆکی بە هەموو ئەوروپییەکان دادابوو، لەم بوارە نووسەر و شاعیرەکان ڕۆڵی باشیان گێرا بۆ بەداستانکردنی سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن، لەوانە ڤیکتۆر هۆگۆ تاموچێژی دەدایە ڕووداوە شکۆمەندیەکانی ناپلیۆن و وەکو داستانی قارەمانێتیی بۆ خەڵک دەگێرایەوە، خەڵکی وا لێکردبوو تامەزرۆی بیستن و زانینی ڕووداوەکان بن، چونکە پڕ بوون لە سەروەریی و قارەمانێتیی فەرەنسییەکان.

## سۆشیالیزم

هەروەها لە سەردەمی لویس فیلیپ و بە هۆی شەڕەکانی ناپلیۆن و خاڵیبوونی خەزینەی وڵات و دواکەوتنی باری ئابووریی فەرەنسییەکان، هەروەها لە توانانەبوونی دەوڵەت لە جێبەجێکردنی بەرنامەکانی ساخلەمی و فێرکردندا، لە ئەنجامدا بزووتنەوەیەکی سۆشیالیزمی بەهێز دروست بوو. دواتر ئەو گۆڕانانەی لە ئەنجامی دروستبوونی کۆمەڵگای پیشەسازی هاتنەکان، کە هەردەم لەگەڵ هاتنە پێش ئەم رۆژگارانە گۆڕان دەکەوێتە پەیوەندییەکانی نێوان کرێکار و خاوەن کاردا، لە ئەنجامی کۆچکردن لە گوندەوە بۆ شار و سەرهەڵدانی جیاوازیەکانی چینایەتی و گۆڕان لە داهات. ئەمانە هەموو کاریان

لەسەر بیرمەند ورۆشنبیران کرد تا بیرێک لەم ئاستەنگانە بکەنەوە، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی چەند رێبازێکی ئابووریی سەرهەڵدەن، کە هەموویان خۆیان لە مۆرکی سۆشیالستی دەبینیەوە. (سان سیمۆن) کە لە ئەنجامی دروستبوونی سەردەمی پیشەسازیی هاتە کایەوە یەکەم کەس بوو بە دوای دۆزینەوەی رێگەچارەی ئەو کێشەیە دەگەڕا، بۆ دیاریکردنی پەیوەندییەکانی نێوان کرێکار و خاوەن کار، ئەو لەسەرەتا تەنیا بانگەوازی بۆ دانیشتن و لەیەکتێگەیشتن لە نێوان هەردوو لایەن دەکرد، بۆیە سۆشیالیستیەکەی ئەو تەنیا وەکو تیۆرێکی ئەندێشەیی مایەوە، چونکە بەشداریی لە پەرەپێدانی رواڵەتی ململانێکە کرد و هیچ چارەسەریەکی بۆ نەدۆزینەوە. لە هەمان ماوە بانگەوازخوازێکی تری فەرەنسی بەشداریی لە چارەسەریی کێشەکانی کار کرد، کە خەڵکان بە زۆری بە پیریەوە دەهاتن، ئەویش لویس پلان بوو. ئەو بانگەشەی بۆ مافی کارکردن دەکرد بۆ هەموو کەسێک. داواشی لە دەوڵەت کرد کارگە دروست بکات و لەلایەن کرێکارەکان خۆیانەوە بەڕێوە ببردرێت، قازانجەکەشی بەسەر خۆیاندا دابەش کەن. ئەم بانگەوازە سەرەڕای دووریی لە رواڵەتەوە، بەڵام هەوڵێک بوو بۆ چارەسەریی کێشەکان، بە پەرەسەندنی ئەم کێشەیە لاوازیی حکومەت بەدەر کەوت.

## شۆڕش و حکومەتی کاتیی

کێشە و بەیەکدادانەکان لەگەڵ رەوتە سیاسیی و کۆمەڵایەتییە نوێیەکاندا زیادیان کرد، بەرزبوونەوەی ئاستی نارەزایی هێزە بەرهەڵستکارەکانی حکومەت بوونە پاساوی ئەوەی پادشا دەست لە ئازادییە گشتییەکان وەربدات، لە ئاکامدا دەنگی نارەزایی خەڵک بەرز بووەوە، داوای چاکسازی و بنبڕکردنی وەرگرتنی بەرتیلیان لە دەزگا حکومیەکانیان دەکرد. دەنگی شاعیری فەرەنسی لامارتین یەکێک بوو لە دەنگە بەرزکراوەکان، لە هەمووکەسیش پتر هەواداری هەبوو، بە بەرزبوونەوەی ئاستی دەنگی نارەزایی لە نێوان ساڵەکانی ١٨٤٦ و ١٨٤٧ حکومەت کەوتە هەڵوێستێکی خراپەوە، باری ئابووریی رووی لە کزی کرد. بۆ نموونە: کەنتالی گەنم بەر لە قەیرانەکان بە ١٨ فرانک بوو، دواتر بوو بە ٢٩ فرانک بێ ئەوەی کرێی رۆژانە زیاد بکرێت. بە هۆی ئەم قەیرانەوە دەوڵەت ناچاربوو لە ١٤٨٧ وەرشەکانی هێڵی ئاسنینی وڵات و چەند پرۆژەیەک، کە لە ١٨٤٠ەوە

کاری لەسەر دەکردن دایان بخات و هەزارەها کرێکار لە دەرفەتی کار بێبەشبن و بەرەو ماڵەوە بەڕێ بکرێن.

لەم کاتەدا دەبووایە هێزە بەرهەڵستکارەکان چاوپۆشی لە هەندێک ناکۆکیەکانی نێوانیان بکەن، هەر نەبێت بۆ ئەوەی بتوانن هاوکاریەکی یەکتر بکەن. دیارە ئەمەش رویدا کاتێک ئازادیخواز و کۆماریخواز و سۆشیالیستەکان و بانگخوازانی پادشایەتیی شەرعی داواکاریەکانیان یەک خستن، داوای هەموارکردنی یاسای پەرلەمانیان کرد بە مەرجێک هەموار بکرێت، کە زۆرترین رێژەی خەڵک بەشداری لە هەڵبژاردن بکات و هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگای فەرەنسی بگرێتەوە. ئەم دەستەیە رێگەیەکی یاساییان بۆ بڵاوکردنەوەی داخوازیەکانیان گرتە بەر، بە کۆبوونەوەی جەماوەری لە شار و ناو کۆمەڵگایەکان کاریان بۆ وشیارکردنەوەی خەڵک دەکرد، تەنانەت بە نامەش داوایان لە پادشا کرد داخوازیەکانیان، کە بریتی بوون لە چاکسازی رژێمی حوکم، جێبەجێ بکرێت. بەڵام دەوڵەت لە سەرەتای ساڵی ١٨٤٨ هیچ گرنگیەکی بەم چالاکیانە نەدا، لەجیاتی گوێلێگرتن بە ئاگر و ئاسن وەڵامی دانەوە، کۆبوونەوە سیاسیەکانی قەدەغەکردن. ئەمە بووە هۆی نانەوەی پشێوی لە وڵات، لە شەوی ٢٢-٢٣ی شوبات پێکدادان لەگەڵ سەربازەکان رووی دا، لە ئەنجامی ئەو پێکدادانەی نێوان جەماوەر و سەربازەکان چەندین کوشتار و برینداری لێ کەوتەوە، بارودۆخەکان زۆر بە خێرایی تێکچوون، ئاڵای وڵات بەرز کرایەوە، سەنگەر لێدران و یاخیبوون و شۆڕش دەستیان پێ کرد.

پادشا پاراستنی رژێمی بە پاسەوانانی ئەهلیی سپارد، کە هەموویان لە رۆڵەکانی چینی مامناوەندیی خاوەن بەرژەوەندی بوون، بۆ رازیکردنی راپەڕیوەکان پادشا هەندێک وردە گۆڕانی ئەنجام دان، لەوانە وەزارەتەکەی عیزۆی گۆڕی و لە شوێنی ئەو مۆلێی دانا، ئەویش دیارە هەر لەلایەنگرانی خۆی بوو. لە ئێوارەی هەمان رۆژ واتە لە ٢٣ی شوبات نیشانەکانی ئەوە دەرکەوتن، کە قەیرانەکە گەلێک لەوە مەزنترە بە گۆڕینی سەرۆکوەزیرانێک چارە بکرێت، ئەوە بوو لە بەردەمی وەزارەتی دەرەوە شەڕ و پێکدادان لە نێوان کرێکارە خۆپیشاندەرەکان و سەربازەکان رویان دا و ٥٢ کەس کوژران، ئیتر توندوتیژی و شۆڕش دژی رژێم بە شێوەیەکی بەربڵاو هەموو شوێنێکی گرتەوە. بەیانیەکەی ٢٤ی مانگ پادشا نیازی چارەسەرکردنی دۆخەکانی هەبوو، بەڵام توشی

شۆک هات کاتێک بینیی پاسەوانی ئەهلی، کە هەموو ئومێدەکانی لەسەر بنیاد نابوون، دژی حکومەت بەگەڵ شۆڕشگێڕ و نەداران کەوتوون. بەم شێوەیە پادشا لویس فیلیپ هیچی لە بەردەم نەما تەنیا ئەوە نەبێ هەمان هەنگاوی شارلی دەیەمی پادشای پێشتری بنێت، کە دەستی لە تەختی پادشایەتی بۆ کوڕەکەی کێشایەوە و خۆی رای کرد بۆ ئینگلتەرا.

## راگەیاندنی کۆماری دووەم

هەموو هەوڵی میانڕەوان لە پەرلەمان لە پێناو سپاردنی تەختی پادشایەتی بە شازن بێهودە بوون.

لەژێر فشاری جەماوەر لە ٢٥ی شوباتی ١٨٤٨کۆماری فەرەنسا راگەیەندرا، لە هەمان رۆژیش حکومەتێکی کاتیی لە هەموو پێکهاتە سیاسییەکان بۆ بەڕێوەبردنی وڵات دامەزرا، بەناوبانگترین کەسایەتیەکانی ئەو حکومەتە شاعیری ناسراو لامارتین وەزارەتی دەرەوەی گرتە ئەستۆ و لۆدرۆ رۆلان وەزارەتی ناوخۆی گرتە ئەستۆ، نووسەر و بانگخوازی سۆشیالیست لویس پلان کرێکارێکی بلیمەتی تا ئەوکات نەناسرابوو بە ناوی ئەلکسەندەر ئەلبێرت.

یەکەم کارەکانی حکومەتە کاتیەکە ئازادکردنی رۆژنامە و ئازادییە گشتییەکان و بانگەوازی کردنی هەڵبژاردنەکان بوو، کە دەستوورێکی دیموکراسی بۆ کۆماری فەرەنسای نوێ دابنێت. لیژنەیەک بە سەرۆکایەتی لویس پلان دامەزرا، ئەرکی دامەزراندنی کارگە و وۆرکشۆپی پێ سپێردرا بۆ نەهێشتنی بێکاری، هەوڵی ئەوەش بدرێت بنەماکانی تیۆریی سۆشیالیستی لەم کاتە پیادە بکرێن. ڕووداوەکان زۆر خێرا دەڕۆیشتن، هەوڵ و بیرۆکەکان بێ ئەوەی لە نەگونجانیان بترسن سەپێندران ورایەرێنران. ئۆپۆزسیۆنەکان خۆشیان لەگەڵ چاکسازی و بەرگری و نەهیشتنی ستەم و زۆرداری دابوون، ئەوان هیچ بەرنامەیەکی هاوبەشیان نەبوو، چونکە حکومەتە کاتیەکە لە زۆرینەی میانڕەوان و کەمینەی شۆڕشگێڕەکان پێک هاتبوو. ئەوان داخوازیەکانی جەماوەر و چینی هەژاریان جێبەجێ دەکردن، کە چاکسازی ریشەیی دامودەزگاکان بوو، لەژێر جۆش و تامی سەرکەوتنەکان هەموو لایەک داوایان لە لویس پلان دەکرد بە هەرشێوەیەک بێت

بێکاری نەهێڵێت، هەرچەندە زۆر لە هەنگاوەکانی لویس پلان لەگەڵ بۆچوونەکانی هەندێک لە ئەندامانی حکومەتی کاتی دانەبوون.

ئەو کاتەی حکومەت بڕیاری دا هەموو کەسێک مافی کارکردنی هەیە، خەڵکەکە هەلهەڵەی خۆشیی لێدەدا، پۆل پۆل خەڵک بە پیر بانگەوازەکەی لویس پلان روەو وۆرکشۆپەکان دەڕۆیشتن بۆ ناونووسین و کارکردن رۆژی بە ٢ فرانک.

تەنیا مانگێکی نەبرد کاتێک هەموو لایەک بە تایبەتی لویس پلان توشی شۆک و بێئومێدی هاتن بە هۆی بێئەنجامیی بەرنامەکەیان، لویس پلان خۆی کابرایەکی تیۆری بوو، ئەم دوور بوو لە کاری پراکتیکی، ئەوەی ئەم کردی تەنیا راز کردنی خەڵکەکەبوو، هیچ لە بەرهەمی کارگەکانی نەگۆڕی. کرێکارەکان رۆژانە دەچوونە کارگەکان بێ ئەوەی هیچ کارێک بکەن ٢ فرانکیان وەردەگرت و دەگەڕانەوە، دواتر ئەم پارەیە هەر خۆی لە گەنجینەی دەوڵەت بوونی نەبوو، ئەم کارەی لویس پلان دوور بوو لە بەرنامە و پلانی ئابووریی شارستیانەی وڵات، بۆیە هەر زوو شکستی هێنا. ئەمە لەسەر ئاستی کەرتی گشتی، لەسەر ئاستی کەرتی تایبەتیش لە بەرانبەر بەردەوامیی شۆڕش خەڵک گرەنتی و متمانەی بە بانک و سەرچاوەکان نەما، خاوەن کارگەکان وردە وردە سەرمایەکانی خۆیان دەکێشایەوە، بازاڕ پارەی تیادا نەما، بێکاری پەرەی سەند و پشتیوانی پارەی فەرەنسی لە بانکەکانی دەرەوە بەهای نەما.

لە نیوەی مانگی ئادار و نیوەی نیسان خۆنیشاندانی کرێکاران بۆ پشتگیریکردنی بەرنامەکەی لویس پلان و داواکردنی کار دەستی پێکرد، بەڵام لویس پلان بە رواڵەت شکستی هێنا، ناچاربوو خۆی لەناو حکومەتەکە شاردەوە و کار و ئەرکەکانی بە وەزیری ناوخۆ سپاردن، ئەویش ئەرکی پاراستنی ئارامیی وڵاتی لەسەروی هەموو ئەرکەکان دەبینی. دواتر هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی دامەزراندن هاتە پێش، بۆ فەرەنسا یەکەم ئەزمون بوو، کە هەموو فەرەنسییەکان دەنگ بدەن، ئەمەش دیسان نیشانەیەکی پابەندبوونی ئەوانە بە دیموکراتی و دووریان لە هزر و بیردۆزە توندڕەوییەکان.

ئەنجامی هەڵبژاردنەکان کۆمارییە میانڕەوەکان، کە نوێنەری چینی بۆرجواز و پیاوە بازرگانەکان و پیشەسازییەکان ٥٠٠ کورسیان وەدەست هێنا، پادشاییەکانیش ٢٠٠

کورسی، کۆماریە چەپڕەوەکان و سۆشیالیستەکان تەنیا ١٠٠ کورسییان وەدەست هێنا، بەم شێوەیە ڕێگاکە لەبەردەم شۆڕش ڕوونتر بوو.

یەکەم ئەرکی ئەنجومەن دانانی دەستوورێکی دیموکراسیی نوێ بوو، ئەم دەستوورە فەرەنسای کردە کۆمارێکی دەستووری سەرۆکی کۆمار حکومڕانیی بکات بۆ ماوەی ٤ ساڵ و لەلایەن گەلەوە ڕاستەوخۆ دێتە هەڵبژاردن، هەموو دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن دەخرێنە بەردەستی سەرۆک، دەسەڵاتەکانی یاسادانانیش دەخرێنە بەردەست ئەنجومەنێکی نوێنەران، کە هەر ٣ ساڵ جارێک دێتە هەڵبژاردن و لە ٧٥٠ ئەندامیش پێک دێت.

لە یەکەم هەڵبژاردنی سەرۆککۆماردا، کە لە دێسەمبەری ١٨٤٨ ئەنجام درا لویس ناپلیۆنی برازای ناپلیۆن بۆناپارت بە ٥٥٠٠٠٠٠ پێنج ملیۆن و پێنج سەد هەزار دەنگ لە کۆی حەوت ملیۆن دەنگ بە سەرۆککۆمار دەرچوو، هەروەکو پێشتر رای گەیاندبوو ئەم بۆ ئەوە خۆی هەڵبژاردووە تا پێگە و ستونەکانی ئارامی و ئاسایش لە وڵات قایم بکات. لە ٢ی دێسەمبەری ١٨٥٢ لەسەر داوای ئەنجومەنی یاسادانان گەلی فەرەنسا ڕەزامەندییان دا بە دامەزراندنی ناپلیۆن وەکو ئیمپراتۆری فەرەنسا، بەم شێوەیە کۆماری دووەم لە فەرەنسا هەناسەی هەڵکێشا و لە قۆناغی سەرەتای دایە. لە کۆتاییدا دەبێت شتێک لە هەڵوێستی ئەوروپا و گردبوونەوەی هاوپەیمانێتی لەسەر شۆڕشی شوباتی ١٨٤٨بزانین.

هەر لەسەرەتاوە بەریتانیا هەوڵی ئەوەی دا دان بە کۆماری دووەمی فەرەنسا بنێت وەکو ئاماژەیەک، کە رازی نییە کەس دەست لە کاروباری وەر بدات. بەڵام هاوپەیمانێتیی پیرۆز بە شێوەیەکی لاواز هەندێک چالاکیی نارەزایی دەربڕین وەکو دوایین چالاکیی بەر لە ونبوونی یەکجارەکیی، نەمساش لە فەرەنسای داواکرد پابەندیی خۆی بۆ هاوپەیمانێتیەکان رابگەیەنێت، کە مەبەستی بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا بوو.

بەڵام دواتر بە هۆی بڵاوبوونەوەی گڕی شۆڕش لە هەموو وڵاتە هاوپەیمانەکان ئەوەندەیان بۆ مایەوە هەریەکە خەریکی باری ئاڵۆزی ناوخۆی و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بێت، کۆتایی لێدوانەکان بە لێدوانەکەی لاپارتینی وەزیری دەرەوەی فەرەنسا هات، کاتێک وتی: نیازمان نییە بۆ ئەوە بگەڕێینەوە دان بە ڕێککەوتنەکانی ساڵی ١٨١٥دا بنێین.

## شۆڕشی نەمسا- هەنگاریا(مەجەر)

بە درێژایی ماوەی حکومڕانیی مەترنیخ هەوڵی دەدا بەهەر بەهایەک بێت سیاسەتی دیفاکتۆ بەسەر ئیمپراتۆریەتی نەمسادا بسەپێنێت، واتە هەمان سیاسەتی دەرەوەی، کە لەگەڵ ئەوروپا گرتبوویە بەر. هەردەم خۆی لە هۆکارەکانی گۆڕان دووردەخستەوە بۆ ئەوەی دۆخەکان هەر بە کۆنی بمێننەوە و ئەویش خۆی بە سیاسەتی دەرەوە خەریک بکات، فاکتەری راپەراندنی کارەکانیشی پۆلیسیی بوون، پۆلیسی کردبووە داردەستی خۆی بۆ پاراستنی دەسەڵات و سەلامەتی خۆی. چاودێری و سانسۆری خستبووە سەر چاپەمەنی و رۆژنامەکان، دانیشگە و مامۆستاکان لەژێر ئەوپەری چاودێری دابوون، بە دیدی ئەم بنکەی هەموو راپەرین و کارە چالاکیەکانی راپەرینن، هەموو بزووتنەوەکانی شانۆگەری و هونەری وێنەکێشانی خستبووە ژێر فەرمانی خۆی. پۆلیسی سەرفرازکردبوو بۆ چاودێریکردنی هەموو کارەکان، تەنانەت نامەی هاوولاتیانیشیان دەپشکنی، ئەوەبوو کە گرپلبارزر شاعیر لە نامەیەکیدا بۆ بێتهۆڤنی نووسی، حەسوودیت پێ دەبەم بەوەی تەنیا میوزیک جاسوسیی و چاودێریی لەسەرناکرێت.

مەترنیخ بەم کارانە دەیەویست هەموو پەنجەرەکانی سنووری وڵات بگرێت بۆ ئەوەی بای بیری ئازادیی نەگاتە هاوولاتیانی نەمسایی و توشی نەخۆشیی شۆڕش و بیری ئازادیی نەبن، ئەو نەخۆشییەی دوای شۆڕشی فەرەنسی خەڵک پێی ئاشنا بوون. مەترنیخ لە هەڵوەشاندنەوە و لەبارچوونی جەستەی ئیمپراتۆریەتەکەی دەترسا، گوێی بە هیچ داخوازی و گۆڕانێک نەدەدا، بە درێژایی سەردەمی حکومڕانیی ئامادە نەبوو هیچ چاکسازیەک بکات، هەردەم بانگەوازی خەڵکی رەت دەکردەوە، کە داوای چاکسازییان دەکرد، بە مەزندەی ئەو باشترین چاکسازی ئەوەیە هەموو پەیوەندییەکانی شارستانێتی لە نێوان ئەوروپای رۆژئاوا و نەمسا بپچڕێنێت.

لە لایەکەی تری حوکمەوە دەنگی ناڕەزایی لە بەرهەڵستکارەکان رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبوو، خەڵک بێزارتر دەبوون، ژمارەی ئۆپۆزسیۆن روەو هەڵکشان بوو، ئەوکاتەی ساڵی ١٨٤٨ هات بێزاریی خەڵک لە مەترنیخ گەیشتبووە لوتکە، ئەم پیاوە ببووە دوژمنی سەرەکیی هەموو ئەوانەی بیر لە ئازادی و مافی چارەی خۆنووسین دەکەنەوە. وای لێهاتبوو پۆلیس نەیدەتوانی زاری ئەو هەموو خەڵکە بگرێت، کە لە هەموو شوێنێک

بێزاری و نارەزاییان دەردەبری، تەنانەت بێزاری گەیشتبووە کۆشکی پادشاش کاتێک شازادە سۆفی براژنی ئیمپڕاتۆر زۆر بە توندی رەخنەی لە رەفتارەکانی دەگرت، هەروەها لە ئەنجومەنی دەوڵەت، کە کاروباری ئیمپڕاتۆری دەبرد بەرێوە رەخنە و تاوانبارکردنەکانی بۆ دەهاتن.

لە نێوەندی بۆرجوازەکان و خاوەن پیشەسازیی و بازرگانەکان پرتەوبۆڵە بەرزبوونەوە. دەنگی نارەزایی داوای گۆڕانکاریان دەکرد، داوای رژێمێکی دیموکراسیی دەستووریان دەکرد، کە ئازادی و یەکسانی بۆ خەڵک دەستەبەر بکات.

ئەو نەیوێرا بۆرجوازەکان تاوانبار بکات، بەڵام کرێکار و شۆڕشگێڕەکانی بەوە تاوانبار کردن، کە کار بۆ رووخانی حکومەت دەکەن، ئەمەش گیانی ئیمپڕاتۆریەت دەخاتە خەتەر و بە هۆیەوە دانی بە لاوازی حکومەتەکەی نا، زیاتر لە جارێک هاواری کردبوو و وتبووی: پشتگیری لە رژێمێکی روخاو دەکەم. لەگەڵ درێکردنی بە لەدەستدانی جڵەوی حوکم بە هۆی بێتوانایی لە مامەڵەکردن لەگەڵ گۆڕانەکان و بەساڵاچوونی تەمەنی و بێتوانایی لە گونجانی رژێم لەگەڵ دۆخە نوێکان، خۆی دایە دەست قەدەر و لە چاوەڕوانی یەکی نەدیار لە کۆشک لێی دانیشت.

لە ١٨٤٨ بای شۆڕش لە سێ لای جیاوە هەڵیان کرد.

- ا - لەسەر ئاستی حکومی دەسەڵاتی وڵات لەوپەڕی لاوازی دابوو، فەردیناندی ئیمپڕاتۆر هەم لە ڕووی تەمەن هەم لە رووی ئەقڵەوە پەککەوتە ببوو، ئەوەی لە تواناندا نەمابوو بەرپرسیارێتیی وڵات بگریتە ئەستۆ، وڵات بەوسا لەلایەن ئەنجومەنی دەوڵەتەوە بەرێوە دەچوو و ئەویش مەترنیخ خۆی بەسەردا سەپاندبوو، نارەزایی خەڵک لە مەترنیخ رەنگی دابووەوە سەر دامودەزگا حکومییەکان.
- ب- لەسەر ئاستی ئازادییە گشتییەکان دیسان خەڵک لەوپەڕی ئازار و ناخۆشید دەژیا، دەزگا پۆلیسیەکەی مەترنیخ، کە بۆ چاودێریکردن و تۆقاندنی خەڵک دایمەزراندبوو، لە توانایدا نەمابوو پێش لە هەوای ئازادی و بیری شۆڕشگێڕانەی رۆژنامەگەر و خوێندکارە رۆشنبیرەکان بگرێت بۆ ئەوەی هەواڵەکان لە فەرەنساوە نەگەن. ئەم حەزەی خاوەن پیشە و خوێندکارو رۆشنبیران بۆ کەشوهەوای ئازادی. کە سەرتاپای ئەوروپای گرتبووەوە، خەڵکی نەمساش حەزی لێ بوو.

- ج- سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتیەکی بەهێز لەلایەن گەلانی ئیمپڕاتۆریەت وەکو هێزێکی کاریگەر مەترسیترین شت بوو، کە مەترنیخ لێی دەترسا، چونکە ئەو رەفتار و کارە توندوتیژیەکانی لەگەڵ نەیارانی بەکاردەهێنا پاساوی ئەوە بوو تا تەوژمی رەوتی نەتەوایەتی ئەوەی لە فەرەنسا رویداوە نەگاتە نەمسا، ئەو دڵنیا بوو تەنیا ئەم رەوتەیە دەتوانێت کورسیەکەی لەق بکات. ئیمپڕاتۆرییەت لە گەلێک نەتەوەی لە یەکتر جیا پێکهاتبوو، جیا لە رووی ئایین، زمان، رەگەز و شارستانیەت پێکهاتبوو، هیچ شتێک لە یەکی نزیک نەدەکردنەوە جگە دڵسۆزی بۆ ئیمپڕاتۆریەت نەبێت. لەم ئیمپڕاتۆریەتە ئەڵمان، پۆلۆن، سلۆڤاک، چیک، رۆمان، کروات، سلۆڤین و ئیتاڵیی تێدا بوو، لەمە خەتەرناکتر هەیە هەریەک لەم نەتەوانە داوای مافی چارەی خۆنووسین بکات و هەر یەکەی بە لایەکدا بڕوا؟ ئەوەی لە هەموو شتێک مسۆگەرترە ئەوەیە، کە لە توانای مەترنیخدا نییە ڕەوڕەوەی مێژوو بووەستێنێت و لە رووی ئەم هەموو ڕووداوانەدا بەرگری بکات و رێگە لە گۆڕان و بەرەوپێشچوون بگرێت، ئەوەبوو ڕووداوەکانی ساڵی ١٨٤٨ ئەم بۆچوونانەیان سەلماندن.

## شۆڕش لە ڤیەننا

ڕەنگدانەوەی شۆڕشی شوبات لە فەرەنسا و شۆڕشەکانی ئیتاڵیا و ئەڵمانیای رۆژئاوا بە شێوەیەکی بەرچاو لە شەقامەکانی ڤیەننا دەنگیان دایەوە تا لە ٣ی ئاداری ١٨٤٨ کۆمەڵێک خۆنیشاندانی خوێندکار و کرێکاران شەقامەکانی ڤیەننایان هەژاندن، خۆپیشاندەران هێرشیان بردە سەر کۆشکی دییات و ئەندامەکانیان ناچارکردن داوا لە مەترنیخ بکەن دەست لە کار بکێشێتەوە. لەهەمان رۆژدا کاتێک سەربازەکان تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد و خوێن رژا، ئیتر شۆڕش راگەیەندرا، ئەوساتە پادشا دەستی لە مەترنیخ هەڵگرت و داوای لێ کرد هەر ئێستا دەست لە کار بکێشێتەوە، دوو رۆژ دواتر مەترنیخ وڵاتی جێهێشت و بەرەو ئینگلتەرا رای کرد.

ئەوەندەی نەبرد شاڵاوی شۆڕش بە پایتەختیشەوە هەموو ناوچە و شارێکی گرتەوە، داخوازیەکانی گەلان بەرزبوونەوە بە دامەزراندنی حکومەتێکی دەستووریی دیموکراسی، کە هەموو داخوازیەکانی گەلان جێبەجێ بکات، بەتایبەت جوتیار و کرێکارەکان تا ئەو

جیاوازیەی لە نێوان ئەوان و شکۆمەند و نوبەلاکاندا هەیە، ئەوانەی خاوەنی موڵک و سەرمایەی زۆرن و لە باج و خزمەتی سەربازی بووردراون و پۆست و پلە بەرزەکانی حکومەتیشیان قۆرخ کردووە.

دوای راکردنی مەترنیخ لەنێو سەنتەرەکانی حوکمدا کۆمەڵێک وەزیری ئازادیخوازی تێکەوتن، دواتر لە ئەنجامی هەندێک ڕووداوی توندوتیژیدا لە ١٥ی مایۆ و رێککەوتن لەسەر داواکردنی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی نوێ بە شێوەیەک هەموو کەس بۆی هەبێت دەنگ بدات بۆ دانانی دەستوورێکی دیموکراسیی نوێ و مافی هەموو کەسی لێ مسۆگەر بێت، پاشان ئەنجومەن یەکەم کۆبوونەوەی خۆی بەست.

لە ٣١ی ئاب کاتێک بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی مافی دەرەبەگایەتی درا یەکەم بەرهەمی شۆڕشیان چنی، کێشەکانی نێوان هاوولاتیان بە روونی بەدەرنەکەوتن، بەڵام بێئومێد بوون لە هەلی دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراسی بە مانەوەی ئیمپراتۆریەت.

## ڕووداوەکانی هەنگاریا

هەنگارییەکان خاوەنی مێژوویێکی پڕ لە سەروەریی کۆن بوون، تەنانەت بەر لەوەی بێنە ژێر رکێفی ئیمپراتۆریەتی نەمساش ئەوان بە هەوڵ و توانای خۆیان دۆخێکی جیاوازیان بۆ خۆیان خوڵقاندبوو، تەنیا ئەوان دەستوورێکی کۆنی تایبەتیان هەبوو بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان ئیمپراتۆریەت و ئۆروستوکراتی بەم دەستوورە مافە کۆنەکان دەپارێزرا.، هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە بانگەوازی نەتەوایەتی لەناو هەنگارییەکان بڵاو ببووەوە، مەزنترین گوتارخوێن و رۆژنامەنووسی نەتەوایەتیان کۆسسوت بوو، کە کاری بۆ ژیاندنەوەی زمانی هەنگاریی کۆن کرد و لە شوێن زمانی ئەڵمانیای دانا، کە ئەوسا زمانی فەرمیان بوو، هەر ئەویش بوو بانگەوازیی بۆ سەربەخۆیی ولاتیکرد.




**لاگۆس کۆسسوت**

توانیی سود لە ڕووداوەکانی ١٨٤٨ی ڤیەننا و ئیتاڵیا وەربگرێت، کە وڵاتی بەرەو پشێوی برد، بەهۆیەوە دەوڵەت ڕووبەڕووی تەنگ و چەڵەمە هات، هێرشیان بردە سەر دیبات و زۆریان لێ کرد بڕیار لەسەر دامەزراندنی حکومەتێک بدات بە سەرۆکایەتی ئەم لەگەڵ دامەزراندنی پاسەوانی ئەهلی و دانانی دەستوورێکی نوێ بۆ وڵات. هەر بە هەوڵەکانی ئەم بوو بڕیار لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئیمتیازاتە داراییە کۆنەکانی چینی ئۆروستوکراتەکان درا، لەگەڵ ئەویش مافی دەرەبەگەکانیش هەڵوەشێندرایەوە بە ڕەهاکردنی ئازادیی ڕۆژنامە و ئازادییە گشتییەکان، واتە کۆسسوت توانیی بە یەک کەرەت دەوڵەتێکی دیموکراسیی نوێ لە هەنگاریا دابمەزرێنێت.

## ڕووداوەکانی پڕاگ

لە پڕاگیش میساقی (بۆهیما) پەخش کرا، ئەمەش وەکو دەستوورێکی دیموکراسیی ئازاد ئەژمار دەکرێت، کە مافی چارەی خۆنووسین و ئازادییە گشتییەکان بە چیکییەکان

دەدا، دواتر لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا کۆنگرەیەکی گشتی لەسەر ئاستی هەموو گەلانی سلاڤی لە ئیمپراتۆرییەت بەسترا:

چیک، سالۆڤاک، رۆتین، سلاڤیۆی خواروو و پۆلۆنیەکان و روسەکان. ئامانج لەم کۆنگرەیە تاوتوێکردنی توانای دامەزراندنی یەکێتیی سلاڤی بوو، بە هۆی ئەوەی نەمساییی و ئەڵمانەکان رقی زۆریان لە گەلی سلاڤی بوو، ئەم کۆنگرەیەش خۆی دروستکردنی تەگەرەیەک بوو لە بەردەم ئیمپراتۆرییەت، بۆیە ئەم کۆنگرەیە شەپۆلێکی وروژاندن و رەگەزپەرستیی لە ڤیەننا لە نێوەندی سەربازیی و سیاسییدا دروست کرد. ئەوەی پتر بەرپرسەکانی توشی ترس و دڵەڕاوکێ کرد، گەشەکردنی ئەم شەپۆڵە بوو لەنێو نەتەوەکانی کرۆات و سرب و رۆمانییەکان و ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتی هەنگارییەکان دان ئەوانیش کاریان بۆ هەمان هەنگاو دەنا، بۆ ئەوەی بە مافە رەواکانیان شاد بن، لەوانە مافی چارەی خۆنووسین.

لە کاردانەوەی ئەم رووداوانە لە ١٧ی حوزەیران فەرماندەی سەربازگەی نەمسا لە بۆهیمای چیکۆسلۆڤاکیا لەشکرێکی لە سەربازەکان رێکخست و بەرەو پراگ هەڵمەتی برد، توانیی دەست بەسەر شاردا بگرێت و بڵاوەش بە کۆنگرەکە بکات و حکومەتە خۆجێیەکەش لەناو بەرێت.

لە ٢٧ی ئۆکتۆبەر ویندشگراز فەرماندە و پاڵەوانی داگیرکردنی پراگ توانیی بزووتنەوەی دیموکراتیخواز لە نەمسا لەناوبەرێت دوای ئەوەی گیانی شۆڕشگێڕیی تیا کەم ببوو و بە هۆی گۆڕانی دۆخەکان ئاراستە کۆنەپارێزەکان بەسەر دۆخەکاندا زاڵ ببوون، لەم کاتەدا کێشە جوداخوازییەکان سەریان هەڵدابوو.

لە ٢١ی نۆڤەمبەری ١٨٤٨ سیاسەتمەداری بەناوبانگ شوارتزن برگ، کە بە هەوڵ و بلیمەتی خۆی توانیی ئەرکانی حوکم لە ڤیەننا لەسەر بنەمایەکی دەزگایی بسەپێنێت و بروا بە سەلامەتی ئیمپراتۆرییەت بێنێت و زۆر لە فەردیناندی نەخۆش و لاواز بکات دەست لە تەختی پادشایەتی هەڵگرێت بۆ بەرژەوەندی فرانسوا جۆزێفی برای.

لە بەرانبەر گەشەسەندنی هزری جوداخوازی لەناو هەنگارییەکاندا حکومەتی نەمسا بیری لەوە کردەوە، کە دراوسێکانیان لێ هاندەن، بیریان لە کرواتە وشکەکان کردەوە، کە بۆ ئەم مەسەلەیە توند و بەقینن لێیان. لەلایەن خۆشیەوە لەشکرێکی بۆ ناردن تا ناچاریان

بکات دەست لە مەرامەکانیان هەڵگرن، بەڵام بە هۆی خەریکبوونی حکومەتی نەمسا بە شۆڕشەکانی ئیتاڵیا لە ١٨٤٨ لە توانایدا نەبوو بەخێرایی هەنگارییەکان ناچار بکات، ئەمە بووە هۆی ئەوەی نەتەوەخوازەکان و سەرکردەکەیان (کۆسسوت) بتوانێت جێ پێی خۆی لەناو شۆڕشگێڕان قایم کات و لە نیسانی ١٨٤٩ دامەزراندنی حکومەتێکی کۆماریی دیموکراسیی سەربەخۆ لە هەنگاریا رابگەیەنێت.

لە بەرانبەر پەرەسەندنی بزووتنەوە رزگاریخوازەکاندا نەمساییەکان هیچیان بۆ نەمایەوە نەوەندە نەبێ داوای کۆمەک لە قەیسەر بکەن، ئەویش لە ئابی ١٨٤٩ هەر زوو بە پیریانەوە چوو و لەشکرێکی مەزنی نارده سەر کۆماریخوازەکان و حکومەتەکەیانی لێ رووخاند و سزای زۆریشی بەسەردا سەپاندن.

## شۆڕشەکانی ئیتاڵیا

ئەگەر نەمساییەکان لە ١٨٣٠ توانیان بەسەر شۆڕشەکانی ئیتاڵییەکاندا زاڵ بن و هەر زوو بە زوو یاسایەکی توند و ستەمکاریان بەسەردا بسەپێنن، ئەوا ئەمە رێگە لە دووبارە ژیانەوەی تۆوی ئازادی ناگرێت، کە لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسییەوە لە ناخی ئەو میللەتەدا چێندراوە. دۆزی ئیتاڵییەکان تەنیا لەلایەن ئیتاڵییەکان خۆیانەوە گرنگ نەبوو، بەڵکو لە هەموو دونیا جێی بایەخ و گرنگیپێدان بوو، ئەویش بە هۆی مێژووی پڕ لە سەروەریی ئەم نەتەوەیە و ڕۆڵی پڕ بایەخیان، وێڕای ئەو ستەم و زۆرداریەی لەدەست مەترنیخەوە بینیان، ئیتاڵیە پەناهەندەکان بۆ هەر وڵاتێک چووبان بەگەرمی پێشوازیان لێ دەکرا.

## مازینی

مەزنترین و قارەمانترین کەسی راکردوو و یەکێک لە ئەستێرە درەوشاوەکانی بواری رزگاری مازینی بوو، بە هۆی چەوساندنەوەو ستەمکاریی دەسەڵاتدارانی نەمسا لە لەندەن میوان بوو، دامەزرێنەری بزووتنەوەی ئیتاڵیای فەتات بوو.



مازینی

لە دەرەوەی وڵات وەکو چاوێکی خەولێنەکەوتوو کاری بۆ رزگارکردنی وڵاتەکەی دەکرد، لە پەیوەندیی بەردەوامیدا لەگەڵ خەباتگێرانی ناوەوە و دەرەوە لە کار و چالاکیەکانیدا بەردەوام بوو، هەرچەندە شاعیری ئینگلیزیی مەزن بیرۆن لەو نەبوو لە رووی شۆڕش گێری و دڵسۆزیی بۆ دۆزەکە.

مازینی لە بەیاننامەی دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیتاڵیای فەتات لە ساڵی ١٨٣١ لە دەربڕینی رای خۆی سەبارەت بە دوارۆژی نەتەوەکەی وتی: دوارۆژی نەتەوەی ئیتاڵی دەبێت لەسەر سێ بنەما دابمەزرێت: سەربەخۆیی، رزگاربوون لە حوکمی بێگانە و یەکبوون. بەم شێوەیە بزووتنەوەکەی بەرەو رەوشێکی تر برد، بەرەو ئامانجی یەکبوون جیا نە بزووتنەوەی ١٨٣٠، دوور لە رۆمانتیکی بۆ بەرنامە و ئامانجەکانی پلانی دیار و روونی

دەستنیشان کردن، هەزارەها ڕۆڵەی خۆبەختکاری کۆمەڵەی ئیتاڵیای فەتاتی بۆ لە ژوان دانان بە نهێنی و بە ئاشکرا، خۆشی پەیمانی دا تا سەرکەوتن بخەوتێ. ئەوەی ڕاستی بێت بانگەوازەکەی مازینی بۆ یەکێتی و رزگارکردن لە نیوەندی گەلی ئیتاڵیا زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێ کرا، تەنانەت لەلایەن هەندێک لە نیوەندەکانی فەرمانڕەواکانیش بەپیریەوە هاتن، شارل ئەلبرت پادشای بیامۆن و سەردینیا بانگەوازەکەی مازینیی پێ پەسند بوو دروستبوونی وڵاتێکی ئیتاڵیای یەکگرتوی ئازاد دوور لە کۆت و بەندی داگیرکاری بووە مایەی ئەوەی هێدی هێدی لێی نزیک بێتەوە.



گاریباڵدی

## گاریباڵدی

لە ئەمەریکای لاتینی دوورخراوەیەکی تر گاریباڵدی بوو، ئەویش بلیمەتێکی تری نیشتمانپەروەری ئیتاڵیا بوو، کە هەوڵی بۆ رزگارکردنی نیشتمانەکەی دەدا. لە منداڵیەوە هۆگری بیری ئازادی بووە، ئەوکاتیش بڕوای بە بیروڕاکانی مازینیی هێناوە و بەهۆیەوە

پەیوەندیی بە ریزەکانی کۆمەڵەی ئیتاڵیای گەنجەوە کردووە، لە ناخەوە بڕوای بە رزگارکردنی نەتەوەکەی هەبوو هەردەم دەیووت: "مردن لە ژیانی کۆیلەتی باشترە".

لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازانە لە کەشتیگەلی بیامون، ناچار دەبێت بۆ ئەمەریکای خواروو رابکات، لەوێش بە کار و چالاکیی رزگارکردنی نەتەوەکەیەوە خەریک دەبێت، کۆمەڵێک گەنجی خوێنگەرم لە خۆی کۆ دەکاتەوە لەو ئەزموونە فێری گەلێك شت دەبێت. لە کاتێکدا پیاوێکی سیاسەتمەدار بوو، بوو بە پیاوێکی خاوەن ئەزموون و شارەزاش لە بواری سەربازیدا، ئەمەش لە داهاتوو لە کاتی دامەزراندنی کۆمکاری (کراسە سورەکان) لە ئیتاڵیا بە هانایەوە دێت. لە ئاوارەییەوە گاریباڵدی پەیوەندیی باشی لەگەڵ هاوەڵ و دۆستانی ناوەوە هەبوو، بە تایبەت لەگەڵ مازینیی مامۆستا و سەرۆکی لە ئینگلتەرا. بەر لە قۆناغی شۆڕشەکانی ١٨٤٨ لە ئیتاڵیا وێڕای ستەم و تۆقاندن بیروڕاکانی مازینی و گاریباڵدی لەناو خەڵکدا وەکو بای ئازادی و دیموکراسی جووڵە و بڕیاریان هەبوون، ئەم جووڵە و ئەزمونانە خۆیان بەسەر دۆخەکاندا سەپاند.

سەرکەوتنی پاپا بیۆسی نۆیەم لە ١٨٤٦ بۆ سەر کورسیی دەسەلات جێی خۆشحاڵی و گەشبینیی ئیتاڵییەکان بوو، چونکە پاپا بیوس لە دێرزەمانەوە بە کەسێکی هەژارپەرست و نزیک لە ئازادیخوازان ناسرابوو، بەتایبەت لە نیشتمانپەروەرەکانەوە زۆر نزیک بوو. لەسەردەمی ئەم بڕیاری لێبووردنی گشتیی زیندانییە نیشتمانپەروەرەکان درا. قۆناغی چاکسازی لە بەڕێوەبردن دەوڵەت کرا، بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانیی سەربەخۆ دامەزراند، ئازادیی تەواو بە رۆژنامەگەری درا، نیشتمانپەروەرەکان خۆیان لەگەڵ چاکسازیەکانی گونجاندن لە زۆر رووەوە یەکیان دەگرتن، مازینی و گاریباڵدی پشتگیرییەکی تەواوی هەنگاوەکانیان دەکردن، هەندێک کەس ناوی پاپای یەکبوونی ئیتاڵیایان لێ نابوو.

لە ١٨٤٧ دوای ماوەیەکی زۆر لە دوودڵی شارل ئەلبرت بڕیاری دا وەزارەتەکان رادەستی ئازادیخوازەکان بکات و ئازادیی رۆژنامەگەریی راگەیاند، دواتر لیۆبۆلدی دووەمیش هەمان هەنگاوی لە توسکانە نا، ئامێری پۆلیسی هەڵوەشاندەوە و ئازادییەکانی رەها کردن.

## شۆڕش

کاتێک ساڵی ١٨٤٨ هات لەبەردەم ئیتاڵییەکان هەموو شتێک روون و ئاشکرا بوون، دەبووایە هەموویان کار بۆ بەئەنجامگەیاندنی سێ ئامانجەکانی مازینی بکەن، کە بریتی بوون لە: وەدەرنان، سەربەخۆیی و یەکبوون. ئەگەر بمانەوێت ئیتاڵیا سەرلەنوێ بژیێنینەوە، هەرسێ ئامانجەکان بە یەکەوە بەستراون. هەر لە رۆژی یەکەمی ئەو ساڵ دیار بوو، کە کەشوهەواکانی ئیتاڵیا بە لای پشێوی و یاخی بوون دەڕۆن، کتومت وادەرچوو، لە ١٢ی جەنیوەری کاری توندوتیژی لە میرنشینی ناپۆلی و سقلیە دەستیان پێکرد، پادشا فەردیناند ناچار کردا دەستوورێکی دیموکراسی لە شێوەی دەستووری فەرەنسای ١٨٣٠ بە گەلەکە بدات، هەروەها پادشای بیامۆن شارل ئەلبێرت لە مانگی ئادار و دواتر پاپاش هەمان هەنگاویان نا. خەڵکە نیشتمانپەروەرەکە ئەو کاتەی هەستیان بەوە کرد، کە پێدانی دەستوورێکی دیموکراسی مانای رزگاربوون لە حوکمی بێگانە دەگەیەنێت، ئەمە بووە ئومێدی ئیتاڵییەکان بۆ دەستکردن بە شەڕ و بەگژداچوونەوەی نەمساییەکان، یەکەم کەس کە بڕوای بەوە هێنا پادشای ئیتاڵیا شارل ئەلبێرت بوو، هەر زوو پەیمانی شەڕکردنی دژی نەمسا دا.

لە ئەنجامی روودانی کاری توندوتیژی لە ڤیەننا و روخانی مەترنیخ نیشتمانپەروەرانی بووندقیە و لمبادیا، کە دوو میرنشینی سەر بە نەمساییەکان بوون بڕیاری رزگاریان دا، لە هەر یەک لەو میرنشینانە حکومەتی نیشتمانی دامەزران و جیابوونەوەی خۆیان لە ئیمپراتۆریەت راگەیاند و لەشکر و سوپای نەمسایان لە خاکی خۆیان وەدەرنا. چونکە ئەم دوو میرنشینە دەیانزانی نەمسا بەمە رازی نییە، سەرکەوتنی ئەمان مانای رووخانی نەمسایە لە ئیتاڵیا، بۆیە داوای کۆمەک و هاوکارییان لە شارل ئەلبێرتی پادشای بیامۆن کرد. ئەم پیاوە دەیزانی کە بەتەنیایی ناتوانێت بەر لە لەشکرە زەبەلاحەکەی نەمسا بگرێت، چونکە هێزێکی لە باکووری ئیتاڵیا بە فەرمانداریتی رادتسکی جێنشینە، بۆیە لەژێر فشاری ئیتاڵییە نیشتمانپەروەرەکان توانیی ٣٠ هەزار سەرباز لە پاپا و توسکانە و ناپۆلی وەرگرێت. سەرەڕای ئەوەی ژمارەی ٨٥ هەزار سەربازی لەبەردەست بوو، بەڵام ناشارەزا بوون، وەکو بەدەنگەوەهاتنی براکانی لە بوندوقیە و لمباردیا شارل ئەلبێرت لە ٢٥ی ئادار ١٨٤٨ لەشکرەکەی بۆ باکوور نارد و بڕیاری

شەڕی لەگەڵ نەمسا دا. بەڵام لەشکری نەمسا، کە خاوەن تفاق و راهێنانی سەربازییەکی بەرزدەبێت، لە مانگی تەمووز لە شەڕی کۆستۆزا توانیی بەسەر لەشکرەکەی ئیتاڵیادا زاڵبێت و شارل ئەلبێرت ناچار بکات داوای ئاگربەستی گشتی بکات.

بە هۆی چەند سەرکەوتنێکی بچووک و لەژێر فشاری خەڵک پادشای بیامۆن لە ئاداری ١٨٤٩دا ئاگربەستەکە دەشکێنێت و دووبارە لەگەڵ نەمسا دەست بە شەڕ دەکاتەوە. بەڵام هەر دوای ١٠ رۆژ نەمساییەکان توانیان لە شەڕی نۆڤار دیسان شکست بە هێزەکانی ئیتاڵییەکان بهێنن، ئەوسا شارل ئەلبێرت ناچار دەبێت دەست لە دەسەڵات و تەختی پادشایەتی هەڵگرێت بۆ کوڕەکەی عەمانۆئلی دووەم، ئەویش لەگەڵ نەمساییەکان دەکەوێتە ئاگربەست و دۆخەکەی لمبارديا و بوندوقیە بۆ ساڵەکانی بەر لە ١٨٤٨ دەگەڕێننەوە.

دوای شکستخواردنی لە شەڕی کۆستۆزا لە ناوچەی مومتەلەکاتی پاپا ناکۆکیەک لەسەر چۆنیەتی پەیوەندییەکان لەگەڵ نەمسا کەوتە نێوان لایەنگرانی پاپا ولایەنگرانی مازینی، هەرچی پاپا بوو لە پێناو یەکێتیی کریستەکان نەیدەویست ناکۆکی بکەوێتە نێوان ئەم و نەمسا، نەبادا لە ئەنجام لەیەکدابڕانێک لە نێوان کڵێسای رۆما و ئیمپراتۆرییەت روو بدات. ئەم هەڵوێستە بووە هۆی راکردنی پاپا و دروستبوونی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕ لە وڵات بە سەرۆکایەتیی مازینی، پاپا هاواری بۆ وڵاتە کاسۆلیکەکان برد وەکو نەمسا و ئیسپانیا و فەرەنسا، تا سەروەت و سامانەکەی بۆ بگەڕێننەوە، بە هۆی ئەوەی ئیسپانیا ئەو کات لە دۆخێکی لاواز دابوو لە توانایدا نەبوو هاوکاریی دەرەوەی سنوور بکات، نەمساش بە ڕووداو و شۆڕشەکانی مەجەریەکانەوە خەریک بوو. لەم بەینە تەنیا فەرەنسا مایەوە، لویس ناپلیۆن ئەوکات پێی خۆش بوو هاوکاریی پاپا بکات تا سۆزی کاسۆلیکەکان لە فەرەنسا بۆخۆی بکێشێت، ئەوەی لەبیر نەمابوو، کە سەردەمانێک لەناو شۆڕشگێڕەکانیدا دژیا و لەریزەکانیان وەکو خەباتگێڕێک کاری دەکرد و دەحەوایەوە و بۆ ئەو پەناگە بوو. بەهەر حاڵ فەرەنسا لەشکرێکی پێکەوە نا بۆ ئیتاڵیای نارد، لە حوزەیرانی ١٨٤٩ رۆمای داگیر کرد و پاپای بۆ سەر تەخت گێڕایەوە و کۆماریخوازەکانیشی وەدەر نان. ئەنجامەکانی شکستەکەی کۆستوزا و نوڤار و دەستێوەردانەکەی فەرەنسییەکان نیشتمانپەروەرەکانی توشی شۆک و رەشبینی کرد، لە

ماوەی سالانی ١٨٤٨ و ١٨٤٩ لە نیمچە دوورگەی ئیتالیا بیروڕاکانی ئازادیخوازی پاشەکشەیان کرد، هەموو دەزگا حکومیەکان کەوتنە ژێر پێی کۆنەپەرستەکانی بەردەست و پای نەمسابیە داگیرکارەکان.

دوای کۆتایی هاتنی کشانی شۆڕشگێڕ هیچ ئاسەوارێکی ئازادیخوازانە لە وڵات نەما، تەنیا ئەو دەستوورە نەبێت، کە پادشا عمانوئیل رازی نەبوو لەناوی ببات و دەستی پێوە گرتبوو، ئەمە بووە تاقە تروسکایی نیشتمانپەروەران، کە بە چاوی ئومێدەوە سەیری بکەن.

## شۆڕشەکان لە ئیتالیا

لە ساڵی ١٨٤٧ پادشای بروسیا فردریک گەلیۆمی چوارەم ڕووبەڕووی داواکاریەکی زۆری هاووڵاتیانی بووەوە بۆ ئەنجام دانی چاکسازیی لە دەستوور، کە خۆی پەیمانی دابوو. چونکە ئەو کاتەی پادشا لە ١٨٤٠ هاتە سەر کورسیی حوکم خۆی بڕوای بە بنەماکانی ئازادی ودیموکراسی و حوکمی دەستوور هەبوو، بەڵام هیچی لەو پەیمان و بانگەوازانە جێبەجێ نەکردن، کە هەر جار لە بۆنەکاندا دووبارەی دەکردنەوە. جگە لەمە چەندین جار بە فرتوفێڵەکانی خۆی پڕۆژەکانی چاکسازی، کە پێشکەش دەکران، خۆی لێ دەدزینەوە و لە ئەنجامیشدا نەزۆکی دەکردن.

لەژێر فشاری بڕوسیەکان بڕیاری دامەزراندنی یەکەم پەرلەمان (دیات)ی دا، کە لەسەردەمی خۆی لە شوباتی ١٨٤٧ەوە ئەمە یەکەم ئەنجومەن بوو، بەڵام کاتێک پەرلەمان هەوڵی ئەوەی دا دەسەڵاتی بۆ دانانی یاسا و چاودێریی دارایی وڵات هەبێت، لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە.

کاتێک هەواڵی هەڵگیرساندنی شۆڕشی شوبات لە فەرەنسا گەیشتنە ئەڵمانیا، جووڵە لە نێوەندی گەلەری و نیشتمانپەروەرەکان دەستیان پێ کرد، خۆنیشاندانی بەهێز لە شارەکانی باد، لۆرتمبوورگ، هاس و ناساو دەسەڵاتدارانیان ناچار کرد ئازادیە گشتییەکان ڕەها کەن، لە گوندەکان جوتیار و گوندنشینەکان بەگژ بەگزادە و دەرەبەگەکاندا چوونەوە، کۆشک و تەلاریان لێ دەسوتاندن و دۆکۆمێنتەکانیان لەناودەبردن، هەروەها لە نێوەندی کرێکارەکانیش ڕاپەڕین و یاخیبوون لە شارە پیشەسازییەکان دەستیان پێ کرد. ئەم

گۆڕانانە ترسیان خستە دڵی فریدریک گەلیۆمی چوارەم، بۆ پێشگرتن لە ڕووداوەکان لە ١٨ی ئادار داوای لە ئەنجومەنی نوێنەران کرد کۆ بێتەوە، بەڵام ئەم بانگەوازە بە درەنگوەختانێکەوە هاتن و نەتواندرا بەرۆکی ڕووداوەکان بگرێت و شەڕ و پێکدادانی نێوان سوپا و قەڵغانی پادشای بروسیا و دەستە گەلەریەکان روونەدات. شەڕی ناوخۆ لە بەرلین هەڵگیرسا، خوێن رژا و سەنگەر لێدران، رۆژی دواتر پادشا ملی بۆ داواکانی شۆڕش کەچ کرد، گەلیۆمیی برای دوور خستەوە، کە بە سەرکردەی ڕاسترەوەکان و بەرپرسی ئاژاوە و خوێنڕژانەکە دانرا. سەربازەکانیشی لە پایتەخت وەدەرنان، پەیمانیشی دا پەرلەمانێکی نوێ لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێت و کار بۆ یەکێتیی نەتەوەی ئەڵمانی بکات، دواتر دەسەڵات و وەزارەتەکانی بە دەستەی بۆرجوازییە ئازادیخوازەکان سپارد.

کاری توندوتیژی و شۆڕش هەموو کونجێکی وڵاتی گرتەوە و داخوازیەکانیان لەتەک دیموکراسی دروستبوونی ئەڵمانیایەکی ئازاد و سەربەخۆ بوون، سەبارەت بە داخوازیەکانی هەموو چینی کرێکار و خوێندکار و رۆشنبیر و بۆرجواز و بانگخوازانی دیموکراسی یەکبوونی ئەڵمانیا ئامانجێکی هاوبەش بوو، بانگەواز بۆ یەکبوونی ئەڵمانیا و دەستوورێکی دیموکرات و رزگاربوون لە چنگ خۆسەپاندنی نەمسا بەسەر کاروباری هەموو دونیادا.

## پەرلەمانی فرانکفۆرت

بە پشتبەستن بە داخوازییەکانی گشتیی بۆ دروستبوونی یەکێتیی ئەڵمانیا، تیپێک لە ئازادیخوازەکان لە شاری هایدلبێرگ داوای بەستنی کۆنگرەیەکی گشتیان کرد لە فرانکفۆرت وەکو کۆنگرەیەکی ئامادەکار، تیایدا نوێنەرایەتی هەموو ئەنجومەنەکانی ئەڵمانیا بەشدار بن. یەکەم کاری ئەو کۆنگرە ئامادەکارییە دانانی سیستەمێکی نوێیە لەسەر بنەمای دەنگدانی گشتی بۆ هەموو ئەڵمانییەکان بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی دامەزراندن، تا ئەرکی دانانی دەستوورێک بۆ ئەئەڵمانیای مەزن دابنێت، بەدروستیی لە ١٨ی مایۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی یەکەم کۆبوونەوەی خۆی لە کڵێسای پۆلسی پیرۆز لە شاری فرانکفۆرت بەست.

هەموو ئەندامەکانی ئەنجومەن، کە لە رۆشنبیرەکانی چینی مامناوەند پێک هاتبوون، ئەوپەڕی نەرمیونیانیان نواند. سەرەڕای ناکۆکیی بیروڕا و مشتومڕەکان لەگەڵ ئەوەش بڕیارەکان لەوپەڕی مامناوەندی بوون، خۆیان لە بۆچوونی کۆماریخوازی و شۆڕشگێڕی توندڕەوە دوورخستەوە، بانگەوازی یەکگرتنی سەرتاسەری ئەڵمانیایان دەکرد بە هاوکاریی میر و فەرمانڕەواکان، چونکە تەنیا بە یەکگرتنی هەموو چینەکان دەتوانن یەکبوونی ئەڵمانیا بێ خوێنڕشتن وەدەست بێنن. سەرەتا ئەنجومەن سەرکەوتنی باشی وەدەست هێنابوو لە نزیککردنەوەی بۆچوونەکان، سەرەڕای دژایەتیی دەستەیەک لە ڕاستڕەوە کۆنەپارێزەکان و چەپڕەوە توندڕەوەکان، ئەڵمانییەکان ئومێدی زۆریان لەسەر بنیاد نابوو.

چونکە بەئەنجامگەیاندنی ئەو یەکێتیە پێویستیی بە سوپایەکی مەزن و بەهێز هەیە، ئەوە بوو پەرلەمان لە ٢٨ی ئاداری ١٨٤٩ تاجی پادشایەتیی ئەڵمانیایان خستە بەردەست فردریک گلیۆمی چوارەم تاوەکو پادشای یەکێتیی بروسیا قبووڵ کات. بەڵام لە خۆباییبوونی فەردریک گلیۆم هەرەسی بە ئومێدەکانی شۆڕشگێڕان هێنا، کاتێک دوای پێنج رۆژ ئەم داواکاریەی رەت کردەوە بە پاساوی ئەوەی تاجێک قبووڵ دەکات، کە لەلایەن ئەمیر و فەرمانڕەواکانەوە پێشکەشی بکرێت نەک لەلایەن گشتیی جەماوەرەوە، دەستوورێکیش قبووڵ ناکات، کە لەلایەن حکومەتەکەیەوە دەرنەچوویێت، بەم شێوەیە هەوڵی یەکبوونی ئەڵمانیا لە رێگەی پەرلەمانی فرانکفۆرت هەرەسی هێنا.

ئەوەی ڕاستی بێت پادشا بەر لەم ڕووداوە رووی ڕاستە قینەی خۆی ئاشکرا کردبوو، ئەو هەردەم لەگەڵ هاووڵاتیانی لە پەیمان و گفتەکانی خۆی ڕاستگۆ نەبوو، کاتێک لە ئاداری ١٨٤٨ گفتی چاکسازیی پێدابوون، بەڵام نەیگەیاندە جێ، ئەو تەنیا بۆ بردنەوەی کات ئەم گفتانەی دەدان. ئەوکاتەی ئۆپەراسیۆنەکانی دامرکاندنەوەی شۆڕش لە ڤیەنناش دەستیان پێ کرد، ئەم پتر هاندرا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی بەرلین و راونانی ئازادیخوازان و وەدەرنانیان لە پۆستی وەزاریی و گرتنەبەری سیاسەتێکی تاسەر نقوم لە کۆنەپەرستی، بەمە ئیتر هەنگاو و هەڵوێستەکانی لە بەرانبەر کۆنگرەی فرانکفۆرت بەتەواوەتی لەگەڵ ئەم هەنگاوانەی ئێستای بەرەو کۆنەپەرستی یەکیان دەگرتنەوە.

لە ئەنجامی بڕیارەکەی پادشای بڕوسیا ئومێدی ئازادیخواز و نیشتمانپەروەرەکان هەرەسیان هێنا، زۆربەی ئەندامانی پەرلەمان بێ هەرا بڵاوەیان کرد، تەنیا هەندێک لە ئەندامانی توندڕەو نەبن، کە رازی نەبوون بڵاوە بکەن، بەڵام ئەوانیش دوای خۆتێهەڵقورتاندنی سوپا بڵاوەیان کرد. بەم شێوەیە پادشای بروسای فریدریک گلیۆمی چوارەم ئومێدی ئەڵمانییەکان لە یەکگرتنەوەی نەتەوەی ئەڵمان، کە لە لە کۆنگرەی فرانکفۆرت هاتبوو، هەرەس پێ هێنا و بێئومێدی کردن، دواتر سوپا ئەرکی لەناوبردنی هەموو بزووتنەوە ئازادیخوازەکان و یاخیبوونەکانی دوای سەرنەکەوتنی کۆنگرەی فرانکفۆرت گرتە ئەستۆ.

## پرسی رۆژهەڵاتی و جەنگی قەرم

تا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مابێت و لە قۆناغی فراوانبوون و لە ئاستێکی بەتوانا بێت، کە بتوانێت خاک و دەسکەوتەکانی بپارێزێت، تا ئەو کات هیچ پرسێک نییە بە ناوی پرسی رۆژهەڵاتیی.

لە سەرەتای بەرتەسکبوونەوەی دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە ئەوروپا پرسی رۆژهەڵاتیی سەری هەڵدا و بە هۆی بڵاوبوونەوەی عوسمانییەکان لە ئەوروپا و پەرشوبڵاویان هەندێک لە بەهێزی سەربازیان لەدەست دا، بەتایبەت لەگەڵ دراوسێکانی وەکو روس و نەمساییەکان. لە میانی سەدەی نۆزدەهەم ئەم پرسە زیاتر لە بۆنەیەک خرایە سەر مێزی سیاسیی ئەوروپا بۆ گفتوگۆ لەسەرکردن. دەتوانین شەڕی قەرم لە ١٨٥٤ بە دەسپێکی قۆناغی ئەم پرسە و کۆتاییهێنەری ماوەی ئارامی لە ئەوروپا دابنێین، ئەو ماوە ئاشتی و ئارامییە دوای کۆنگرەی ڤیەننا بەر قەرار بوو، ئەم شەڕە ش لە نێوان روسیا لە لایەک و هەریەک لە تورکیا و ئینگلتەرا و فەرەنسا و سەردینیا لە لایەکی تر رووی دا.

## پەیوەندییەکانی روسیی - تورکی

ئەوەی ڕاستی بێت دیاریکردنی هۆکارەکانی ئەو جەنگە ئاسان نییە، ناکرێت لە پرسی رۆژهەڵاتیی جیاکەینەوە، یان لە بوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وەکو هێزێکی بەهێز لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئەوروپا، کە ماوەیەکی زۆرە کێبڕکێ لەگەڵ هەر یەک لە روسیا و نەمسا دەکات بۆ دەستگرتن بەسەر خاکی خۆیدا. هۆکارە دیارەکان دەستگرتن بەسەر خاکە پیرۆزەکانە لە فەلەستین، بەڵام کێشەیەکی واتای ئاوا نابێت ببێتە هۆی بەرپابوونی جەنگێکی ئاوا سەرتاسەریی لە ئەوروپا، بۆیە دەبێت لە هۆکارە بنەڕەتی و ڕاستەقینەکانی گۆڕانی پەیوەندییەکانی نێوان روسیا و عوسمانییەکان بکۆڵینەوە.

نیکۆلای یەکەم قەیسەری روسیا، کە لە ساڵی ١٨٢٥ دەسەڵاتی قەیسەریی گرتە دەست، دوای نەمانی مەترنیخ و لەناوچوونی هاوپەیمانێتیی پیرۆز، لە بەرانبەر پاراستنی دۆخە نالەبارەکان لە ئەوروپا و پاراستنی رژێمی نەریتی خۆی وەکو بەرپرسی یەکەم دەبینی. بەڵام لە رۆژهەڵات سیاسەتەکەی بریتی بوو لە نانەوەی ئاژاوە و پشێوی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، تا بۆی بکرێت دەست لە کاروبارەکان وەر بدات بۆ ئەوەی

پێگەی حوکمی قایمتر بکات و دەستیش بەسەر بەنداوەکان دابگرێت، تا ببێتە خاوەنی دەروازەیەک بۆ دەریای سپیی ناوەڕاست.

لە ١٨٣٥ بەدیدی قەیسەر دەتوانێ کۆتایی بە پرسی رۆژهەلات بێنێت، بۆیە پرۆژەیەکی بەم مەبەستە لە بەردەم باڵوێزی ئینگلتەرا لە مۆسکۆ دانا بۆ دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی:

بە پێی ئەم پرۆژەیە روسیا بەنداوەکانی بۆسفۆر دەگرێت و بە شێوەیەکی کاتیش ئاستانە داگیر دەکات، وڵاتەکانی عوسمانیش لە ئەوروپا لە یەک دەوڵەتدا یەکیان دەخات، بەرانبەر بە رازیبوونی ئینگلتەرا ئەویش میسر و ورودس و قوبرس دەبات. ئاسایی بوو کە ئینگلیزەکان ئەمەیان قبووڵ نەبوو، چونکە ئینگلیز رێگا بە روسەکان نادات بگەنە دەریای سپیی ناوەڕاست، چونکە ئەوان لە وێ خاوەنی بەرژەوەندیی زۆرن، دواتر ئیگلیز دەیخواست ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە سەلامەتی لەم مامەڵە دەرچێ چونکە ئینگلیز نیازی ئەوەی نەبوو گۆڕانی وا مەزن لە ئەوروپا روو بدەن، کە ببێتە هۆی ئاڵۆزبوونی کەشوهەوای ئاشتیی ئەوروپا و تێکچوونی پارسەنگی هێزەکان لە کیشوەر.

## پرسی شوێنە پیرۆزەکان

فەرەنسییەکان لە چەرخی کۆنەوە و لە سەردەمی حوکمی شارلمانەوە بۆ سەلامەتیی حاجیەکانیان لە کاتی سەردانیان بۆ شوێنە پیرۆزەکان و بۆ پاراستنی مافی کەمە ئایینیەکانی کاسۆلیک لە رۆژهەلات، ئیمتیازاتیان هەبوون.

لەو کاتەی عوسمانییەکان وڵاتانی عەرەبیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان دانیان بە ماف و داواکانی فەرەنسییەکان نابوو، لەگەڵ دەستپێکردنی نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم روسیا وەکو وڵاتێکی بەرچاوی خاوەن هێزێکی زۆر لە ئەوروپا هاتە سەر شانۆ. بە هۆی ئەوەی روسیا مەزنترین وڵاتی ئەرسەدۆکسییە، بە بیانووی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەرسەدۆکسەکان دەستی لە کاروباری ئیمراتۆریەتی عوسمانی وەردەدا، دواتر داوای ئەوەی دەکرد، کە شوێنی هەرە پێشەوە لە شوێنە پیرۆزەکان بدرێتە ئەرسەدۆکسەکان، بە بیانوی ئەوەی ژمارەیان لە ژمارەی کاسۆلیکەکان پترە لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا. بە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش لە فەرەنسادا کاروباری

ئایینیەکان لەلایەن ئەوانەوە پشتگوێ خرا، ئیتر ڕۆڵی ئەرسەدۆکسەکان لە فەلەستین ڕوەو پێش چوو و شوێنی پیاوە ئایینیەکانی کاسۆلیک بەرەو نزمی چوو بە تایبەتی لە قودس. کارەکان بەم شێوەیە مانەوە تا ١٨٥٢ کاتێک ناپلیۆن بۆ ڕازیکردنی پارتی کاسۆلیک گرنگیی بە ڕۆڵی ئایین دا، کە لە پێگەی حکومڕانیی پشتی پێ بەستبوون. لەم ڕوانگەیەوە نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی عوسمانی نارد و وێڕای پێداگرتنی لەسەر داکۆکی لە مافە نایابەکانی شوێنە ئایینیەکان، پڕی بوو لە دەربڕینی دۆستایەتی، داوای گەڕاندنەوەی ئەو شوێنانە ئایینیەکانی کردەوە. دوای خۆ گرخاندن و دڵەدڵدانێکی درێژ عوسمانییەکان ڕەزامەندیان لەسەر داخوازیەکەی فەرەنسییەکان دا، مافە نایابەکانی قەشە و پیاوە ئایینیەکانی کاسۆلیکی لاتینیان پێ دانەوە و لەگەڵ سێ کلیلی شوێنە پیرۆزەکان لە بەیت لەحم. بەم ڕەفتارە دەسەڵاتی کاسۆلیکە لاتینەکان بەسەر بەیت لەحمدا زاڵ بوو، لەم ڕەفتارە ڕوسەکان، کە هەردەم شکۆداری و سەروەریی خۆیان لای عوسمانییەکان گرنگ بوو، پێی نارەحەت بوون.

دواتر ڕوسەکان لە سیاسەتی فەرەنسا بە گومان بوون لەوەی زیاد بوونی دەسەڵاتی فەرەنسا لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ئەوروپا دەبێتە هاندەر و پشتگیری بۆ کێشە و کێبڕکێکانی شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازی لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا.

## ئەرکی منتچیکۆف

لە بەرانبەر ڕەتکردنەوەی ئینگلتەرا بۆ پێشنیارەکەی ڕوسیا، قەیسەر بە باشی زانی پەیوەندیی ڕاستەوخۆ بە تورکەکانەوە بکات، بۆ ئەم نیازەی مەسەلەی شوێنە ئایینیەکانی کردە مەبەست، لە کۆتاییەکانی مانگی شوباتی ١٨٥٣ منتچیکۆفی ئەمیر بە ئەرکێکی فەرمیی ناردە ئاستانە بۆ ئەوەی پەیماننامەیەک لەگەڵ عوسمانییەکان ئیمزا بکات، کە بۆ ڕوسیا لەم پێکهاتنە هەڵوێستێکی دیارتر بنوێنێت بە هۆیەوە پاساوی ئەوە هەبن، کە ڕوسیا دەست لە کاروبارە ناوخۆییەکانی تورکیا وەر بدات.

شاندی ڕوسی پرۆژەیەکی هاوپەیمانێتیی لە بەردەم دەسەڵاتدارانی عوسمانی دانا، کە لە سێ خاڵ پێکهاتبوو:

١- هەموو ئیمتیازاتەکانی لە فەلەستین بە قەشە کاسۆلیکەکان دراون لێیان بسێندرێتەوە و بدرێنە قەشە ئەرسەدۆکسەکان.

٢- دان بە مافی روسیا بنرێت لە پاراستنی بەرژەوەندیی ئەرسەدۆکسەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

٣- هاوپەیمانێتیەکی بەرگری لەگەڵ روسیا ببەسترێت.

کاتێک دەسەڵاتدارانی عوسمانی ئەم پێشنیارانەیان لەبەردەم باڵوێزانی وڵاتە بێگانەکان نمایش کرد بەتایبەتی باڵوێز ئینگلتەرا (لۆرد ستراتفۆرد ) ئەم ئاماژەی دا، کە خاڵی یەکەم قبوڵ کات و دوو خاڵەکەی تر رەت کاتەوە، چونکە ئینگلیز بە هەر نرخێک بێت پشتیوانیان لە سەلامەتیی عوسمانییەکان دەکرد، دواتر دانانان بە مافی روسەکان لە پاراستنی ئەرسەدۆکسەکان کارێکی مەترسیدارە، چونکە ئەوان لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان کەمینە نین وەکو کاسۆلیکەکان، ژمارەیان لە ١٢ ملیۆن کەس دەدات و لە هەندێك شوێن زۆرینەن، دواتر چاوبرینەکانی روسیا لە ئینگلیز شاراوەنەبوون هاوسنووریشی زیاتر مەترسییەکان دەخەنە شوێن خۆی.

لە ئایاری ١٨٥٣ کە نوێنەری روسیا دڵنیا بوو لە سەرنەکەوتنی ئەرکەکەی، بە یاوەریی پیاوەکانی باڵوێزخانەی روسیا لە ئاستانە گەڕایەوە بۆ روسیا.

## داگیرکردنی هەردوو هەرێمی دانوب

لە ئەنجامی رەتکردنەوەی پێشنیارەکەی روسیا لەلایەن عوسمانیەکانەوە و گەیشتنی کەشتیگەلی ئینگلتەرا و فەرەنسا بۆ بەنداوەکانی تورکیا قەیسەر فەرمانی بە لەشکری روسیی دا هەردوو فەرمانڕەوای (هەرێم) ئەفلاق و بەگدانی دانوبی (رۆمانیای ئێستا) بگرێت. هەردوو فەرمانڕەوا (هەرێم)، کە هەر بەناو سەر بە عوسمانییەکان بوون، قەیسەری روسیا رایگەیاند، کە گرتنی ئەم دوو فەرمانڕەوایە نیشانەی راگەیاندنی جەنگ نییە لەگەڵ عوسمانیەکان، بەڵکو تەنیا بۆ خۆپاراستنە لە هیرشە کتوپڕیەکانی سەر روسیا. دوای ئەم ئۆپەراسیۆنە لە ئەورووپای رۆژئاوا چالاکیی دیپلۆماسیی چڕ دەستیان پێ کرد بۆ ئەوەی ئەم ناکۆکیە نەبێتە تێوەگلانی ئەورووپا، بەڵکو تەنیا لە نێوان پەیوەندییەکانی روسیا و تورکیا بمێنێتەوە، بەڵام پشتگیرییە مکومەکانی ئینگلیز بۆ تورکیا

هەڵوێستەکانی بەرانبەر بە مەسەلەی پاراستنی ئەرسەدۆکسەکان توندتر کردن. لە کۆتاییدا دەسەڵاتدارانی عوسمانی نارەزاییان دژی روسیا لە داگیرکردنی بەشێک لە خاکەکەیان دەربڕی و روسیایان ئاگادار کردەوە، کە بە زووترین کات لەشکرەکەی بکشێنێتەوە.

لە ٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٨٥٣ وەڵامەکەی روسیا راگەیاندنی جەنگ بوو، لە ترسی هێرشی روسیا بۆ سەرخاکی عوسمانییەکان ئینگلیز و فەرەنسا فەرمانیان بە کەشتیگەلی خۆیان دا بەرەو دەریای رەش بەرێکەون، بۆ ئەوەی هەڕەشە لە سوپاکەی روسیا بکات ئەگەر سنوور ببەزێنێت، وەڵامیشیان بۆ روسەکان سەبارەت بە کشانەوەی کەشتیگەلییەکان ئەوەبوو تا لەشکری روسیا لە هەردوو فەرمانڕەواکەی دانوب نەکشێتەوە ئێمەش لە دەریای رەش ناکشێینەوە.

لە ٢٨ی ئاداری ١٨٥٤ دوای ئەوەی روسیا کەشتیگەلێکی تورکیی لە دەریای رەش لەناو برد، هەردوو وڵات بڕیاری شەڕیان دژی روسیا راگەیاند، ئەم رەفتارە وەکو کارێکی دوژمنکاری دژی ئەو دوو وڵاتە لێکدرایەوە.

## هەڵوێستی ئەوروپا لە بارەی ناکۆکیەکە

هەموو وڵاتەکانی ئەوروپا لەم ڕووداوە یەک هەڵوێستیان نەبوو، هەر وڵاتەو بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی هەڵوێستی وەرگرت، ئەمەش بووە هۆی ئاشکرابوونی ناکۆکیی بەرژەوەندییەکانی نێوانیان، لە خوارەوە هەڵوێستی هەر وڵاتە بەجیا دەخەینە روو لەگەڵ هۆکارەکانی وەرگرتنی هەڵوێستەکان:

١- **فەرەنسا:** بە دیدی ناپلیۆن فەرەنسا لایەنێکی سەرەکیە لەم ناکۆکییە، چونکە ئەوەی بەرچاوە لەم ناکۆکیە شوێنە پیرۆزەکانە، ئەویش لە سەپاندنی پێگەی حکومڕانیی خۆی پشت بە پارتی کاسۆلیکی فەرەنسی دەبەستێت، هەروەها دەبێت ئەوە لەبیر نەکات، کە خۆی بەرپرسیارە لە ئاودانی تینوێتیی فەرەنسییەکان بۆ زیندووراگرتنی پیرۆزمەندییەکان. کە ساڵەهای ساڵە بە هۆی نامۆکردنی فەرەنسا لێی بێبەش بوون. ناپلیۆن ئەو ناکۆکیەی وەکو رێگەیەک دەبینی، کە فەرەنسا لێیەوە لە پەراوێزخراویی و دوورخراوەیی وەدەرنێت، ئەو

پەراوێزییەی لە کۆنگرەی ڤیەنناوە بەسەر فەرەنسادا سەپێنراوە، بۆیە ئەم شەڕەیان بە هەلێکی باش زانی بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتە کۆنەکانیان.

**٢- ئینگلتەرا:** هەر لەو کاتەی روسیا وەکو هێزێکی مەزنی ناحەزی تورکیای دراوسێ و هێزێکی نارەحەتی ئینگلتەرا لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی لە دەریای ناوەڕاست و هیند و فارس دەرکەوت هەڵوێستی دیار و روون بوو، کە بریتی بوو لە پاراستنی سەلامەتیی عوسمانییەکان و ڕێگەگرتن لە بەردەم روسیا بۆ ئەوەی نەگاتە دەریای سپیی ناوەڕاست.

**٣- بروسیا:** بڕوسییەکان هیچ بەرژەوەندیەکی دیاریان نە لە ئیمراتۆریەتی عوسمانی و نە لە بەلقاندا نەبوو، بۆیە ناچارنەبوون هەڵوێستێکی دیار و راشکاوانە وەرگرن، بڕوسیەکان لەم ناکۆکیە بەسەر دوو باڵدا دابەش ببوون.

نێوەندی کۆنەپارێزەکان لە سەروی هەموویانەوە پادشا بە پێویستی دەزانی وەکو مەزنی ئەڵمانیا دەبێت نەمسا هەڵوێستێک لە بەرژەوەندیی خۆی وەرگرێت، لەو لاوە هەڵوێستێکی ترهەبوو، ئەویش دەڵێت دەبێت بڕوسیا هەڵوێستێکی دژی نەمسای هەبێت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا رێگە بە بڕوسیا بدات لە نێوان وڵاتە ئەڵمانییەکان شوێنی پێشەوە بگرێت، ئەمەش رای بسمارک و دەستەیەک لە رۆشنبیرو چالاکانی بواری نەتەوایەتی و خەمخۆرانی یەکبوونی خاکی ئەڵمانیا بوو بە سەرۆکایەتی بسمارک. ئەوان نەمسایان وەکو تەگەرە لە بەردەم بەدی ێنانی ئامانجەکاندا دەبینی، بەڵام لەگەڵ ئەمانەش بڕوسیا لەسەر حەزی پادشاکەی فریدریکی چوارەم بێلایەنیی لەم کێشەیە هەڵبژارد.

**٤- نەمسا:** نەمسا خۆی بە قەرزاری روسیا و خودی قەیسەر دەزانی بە هۆی ئەو هاوکاریەی قەیسەر لەساڵی ١٨٤٩ بە ١٥٠هەزار سەرباز کۆمەکی کردن بۆ لەناوبردنی شۆڕشی هەنگاریا و پاراستنی خاکەکەی. لە سەرێکی ترەوە قبووڵی ئەوەی نەبوو دەسەڵاتی روسەکان لە بەلقان بەرفراوان تر بێت، چونکە بەرژەوەندیی زۆری لەو ناوچەیە هەبوو.

هەروەها لە بنەرەتدا لە داگیرکردنی هەردوو فەرمانڕەواکەی دانوب رازی نەبوو، چونکە سنووریان بە خاکی نەمساوە نوساوە. ئەوەی زیاتر ترسی دایە نەمسا نەگەری رووخانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بوو، کە هەڵوەشانەوەی دەبێتە سەرکەوتن بۆ بنەما نەتەوایەتیەکان. بەم شێوەیە فەرەنسا و ئینگلتەرا هەستیان بە خاڵە لاوازەکانی نەمسا کرد،

بۆیە هێدی هێدی بۆ بەرەی هەڵوێستی بێلایەنییان ڕاکێشا. هەرچەندە لە سەرەتاوە کەمە ئارەزووێکی ئەم هەڵوێستەی هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی لە هەوڵەکانی بۆ بەستنی کۆنگرەیەک لە ڤیەننا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بە ڕێگەی ئاشتیانە سەری نەگرت، نەمسا ناچار وەکو بێلایەن خۆی ڕاگەیەند.

## ئۆپەراسیۆنە جەنگییەکان

هاوپەیمانەکان دوای ڕاگەیاندنی بڕیاری جەنگ بە هێزی سەربازی بەشداریان لە شەڕ کرد، لەشکرەکانی فەرەنسا لە نزیک شاری ڤارنا (بولگاریای ئێستا) دابەزین بۆ یارمەتیدانی شاری سیلیستریا، کە دەکەوێتە سەر دانوب، کە ڕوسەکان ماوەیەک بوو بە هۆی گرنگییەوە گەمارۆیان دابوو. بەڵام سەربازە عوسمانییەکان و بە تایبەتیش میسرییەکان، کە بەر لە ڕوودانی شەڕەکان سوڵتان ئامادەی کردبوون، بەرگریەکی بێوێنەیان نواند. بە هۆی درێژەدانی گەمارۆکە و بەر لە گەیشتنی هاوکاریەکانی هاوپەیمانان نەخۆشی کولێرە لەناو ریزی لەشکری ڕوسیا بڵاو بووەوە، ڕوسیای ناچار کرد بکشێتەوە، دوای ئەم شکستە بچووکەی ڕوسیا نەمسا داوای لە قەیسەر کرد لەشکرەکەی لە هەردوو فەرمانڕەواکە بکشێنێتەوە. کاتێک ڕوسیا سەیری کرد نەمسا گرنگی بە کشانەوەی هێزەکانی ڕوسیا لەم دوو فەرمانڕەوایە دەدات و لە ڤیەننا لەگەڵ ئینگلتەرا و فەرەنسا خەریکی کۆبوونەوە و وتووێژن و بۆ ئەم مەبەستە دوورنییە ئەگەر داواکەی ڕەت بکرێتەوە لە داهاتوو بکەوێتە شەڕ دژی، بۆیە لە ئابی ١٨٥٤ بڕیاری دا هێزەکانی لە هەردوو هەرێمەکەی ئیفلاق و بەگدان بکشێنێتەوە. هەر زوو دوای کشانەوەی ڕوسیا نەمسا لەشکری نارد بۆ گرتنەوەی تا ئەو کاتەی کۆنگرەیەکی ئاشتەوایی لە نێوانیان ئەنجام دەدرێت، ئەوەبوو ئیتر هێزەکانی هاوپەیمانان لە باکووری شاری سیبا ستۆبۆل دابەزین، کە ڕوسیا خۆی لێ قایم کردبوو.

ئەوەی ئەم شەڕانەی لە شەڕەکانی ناوچەکانی تر جیا دەکردەوە خۆگێزراندن (هێنان و بردن) بوو، هاوپەیمانەکان لە چوونیان بۆ بەندەرەکە خۆیان گێزراند، کە بووە هۆی ئەوەی ڕوسەکان خۆیان لێ قایم کەن و ماوەی ساڵێک بتوانن لێی بمێننەوە.

شیکردنەوە بۆ هۆکارەکانی خۆگیزراندنی هاوپەیمانان:

- لەوانەیە ئەوان چارەسەری دیبلۆماسییان پێ باشتر بووبێت لە چارەسەری سەربازیی، بۆیە تەمای ئەوەیان هەبوو ناکۆکیەکان لەو رێگەیەوە بێنە چارەکردن.

- هەروەها ئەوان لەو بڕوایەدا بوون، کە رێگەی سەربازی چارەسەری نییە، بە هۆی فراوانی خاکی روسیاوە.

لەم ماوەیە گەلێک شەڕ رویان دا، لەوانە شەڕی ئەلما لە سێپتەمبەری ١٨٥٤، کە رێگەی بۆ هاوپەیمانان کردەوە تا بگەنە بەندەری سیپا ستۆبۆل، لەوێش شەڕ و پێکدادانیکی زۆر لە مانگی نۆڤەمبەری ١٨٥٤روویان دا، سەرەڕای بالابوونی ئاستی هاوپەیمانان، بەلام ئەم شەڕانە هیچ ئەنجامێکیان نەبوو.

لە سێپتەمبەری ١٨٥٥ دوای شەڕێکی توند سیبا و ستۆبۆل کەوتە دەست هاوپەیمانەکان، بەلام روسیا تۆڵەی ئەم زیانەی بە داگیرکردنی قارس لە ئەرمینیا و سەرکەوتنی بەسەر لەشکری عوسمانییەکان لە دێسەمبەری ١٨٥٥ دا کردەوە.

## بەشدار بوونی سەردینیا لە جەنگ

بەرانبەر بە دوودڵی نەمسا لە بێلایەنی و بەشداربوون لە جەنگ، ئەورووپییەکان دەبوایە لە ئەوروپا بەدوای هاوپەیمانێکی تردا بگەڕێن بۆ ئەوەی لە لەشکرکێشی هاوکاریان بکات، بۆ ئەم مەبەستە سەرنجیان بۆ سەردینیا راکێشرا، کە خاوەنی سوپایەکی بچووکی مەشق پێکراو بوو، ئەم ولاتە ئیتالییە لەسەر زاری سەرۆکوەزیرانیەوە ئامادەیی خۆی بۆ بەشداریکردنی جەنگ دەربڕی. کافور هەوڵی بۆ یەکگرتنەوەی ولاتەکانی ئیتالیا دەدا، بڕوای وابوو ئەم یەکگرتنەوەیە پێویستیی بە ولاتێک یان چەند ولاتێکی ئەورووپی هەیە، تا یارمەتیی بدات لە بەرگریەکانی نەمسا بەرانبەر بەم داخوازیەیان. بەشداریکردنی لەم شەڕە سۆز و پەیمانی ئینگلتەرا و فەرەنسا وەدەست دێنێت، بۆیە بڕیاری دا بە ٢٠ هەزار سەرباز بەشداری بکات لە بەرانبەر پشتگیریکردنی ئینگلتەرا و فەرەنسا لە دۆزی یەکێتیی ئیتالیا، بەلام ئینگلتەرا و فەرەنسا بۆ ئەوەی نەمسا تورە نەبێت ئەم داواکاریەیان رەت کردەوە.

دواتر لەبەر سووربوونی سەردینیا لە بەشداریکردنی جەنگەکە وەکو هاوپەیمانێک و بە هۆی پاشەکشەی نەمسا لە بەشداربوونی هاوپەیمانەکان لە جەنیوەریی ١٨٥٥

پەیماننامەیەکی سەربازیان لەگەڵ سەردینیا ئیمزاکرد، بەڵام بێ بەرانبەر و پەیماندان بە پشتگیریکردنی دۆزی یەکێتیی ئیتاڵیا، ئەویش چونکە تا ئەوکات چاویان لە هاتنی نەمسا بوو، چونکە ئەوان پێویستیان بە هێزێکی وەکو نەمسا هەبوو تا بەرەنگاری روسەکان ببنەوە. بەڵام هاوپەیمانێتیی کافور وەکو سەرکەوتنێک بۆ مەسەلەی یەکگرتنی ئیتاڵیا دێتە ئەژمار، سەربازەکانی ئیتاڵی لە شەڕەکانی چرنایا بەشداریان کرد و ڕۆڵێکی دیاریان گێڕا، توانا و ئازایەتیی خۆیان تیا سەلماند.

## ناوبژیوانێتیی نەمسا

ئاماژەمان بەوە دا دوای ئەوەی لەگەڵ هاوپەیمانەکان لەسەر مەرجی کۆتاییهێنان گفتو گۆی کرد، نەمسا داوای لە روسیا کرد لەشکرەکەی لە هەردوو هەرێمەکەی دانوب بکشێنێتەوە، هەروەها ناوبژیوانێتیەکەشی بۆ کۆتاییهێنان بە ناکۆکییەکان بە ڕێگەی ئاشتیانە لە بەردەم هەردوو تیپ دانابوو، ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکەی ئەوسای بە روسیا نیشان دابوو، کە مەرجەکان بریتی بوون لە:

١- سیستەمێکی نوێ بۆ رژێمی هەردوو هەرێمەکە دابنرێت بە گرەنتیی ئەوروپییەکی هاوبەش.

٢- ئازادیی دەریاوانی لە دانوب.

٣- پێداچوونەوەی پەیماننامەی بەنداوەکانی ساڵی ١٨٤١.

٤- روسیا دەست لە داواکاریەکەی سەبارەت بە مافی پاراستنی نەسارەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەڵگرێت.

چونکە ئەم مەرجانە بەتایبەتی مەرجی یەکەم و دووەم وردە وردە نەمسا بەرەو شەڕکردن دەبات، بەرانبەر بەو هەستەی قەیسەر، کە نەمسا وردە وردە بەرەو جەنگ هەنگاو دەنێت، لە ئۆکتۆبەری ١٨٥٤ وەکو بنەمای وتووێژکردن لەگەڵ هاوپەیمانەکان بە مەرجەکان رازی بوو. بەڵام ئەوان بەمە رازی نەبوون، داوای قبوولکردنی هەموو خاڵەکانیان بە بێ مەرج لە روسیا کرد.

کە ئەمە رەت کرایەوە دووبارە هاوپەیمانەکان داوایان لە نەمسا کرد بەشداریان لەگەڵ بکات لە شەڕی دژ بە روسیا، بەڵام هەر دوودڵ بوو، بۆیە مەرجی ئەوەی دانا

دەبێت هەموو وڵاتە ئەڵمانییەکان لەگەڵیان بکەونە جەنگ، ئەمەش نەدەکرا بۆیە بەرگریی هەموو فشارەکانی کرد و دوور لە شەڕ مایەوە.

## کۆتاییهاتنی جەنگ و پەیماننامەی پاریس

بە ماوەیەکی کەم دوای رووخانی شاری سیپا ستۆبۆل قەیسەری روسی نیکۆلای یەکەم کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو لە ٢ی ئاداری ١٨٥٥ ئەسکەندەری دووەم هات، ئەم کابرایەکی ئاشتیپەروەر بوو، پتر گرنگیی بە کاروباری ناوخۆی روسیا دەدا لەوەی گرنگی بە شەڕ و فراوانخوازی و کاروباری ئەوروپی بدات. بە هۆی خاڵیبوونی گەنجینەی دەوڵەت و لەدەستدانی کەشتیگەلی روسی و شکستیەکانی لەشکری روسیا لە شەڕەکان کارێکی ئەستەمە بتوانێت درێژە بە شەڕ بدات، بۆیە بە لای ئاشتیدا شکایەوە. نەمساییەکان درکیان بە نزیکبوونەوەی کۆتایی هاتنی شەڕ کرد، لەم رووەوە ترسیان لا دروست بوو فەرەنسییەکان بۆ یەکگرتنەوەی ئیتاڵیا هاوکاریی سەردینیا بکەن، بۆیە بڕیاریان دا شەڕ دژی روسیا بەرپاکەن. لە سەرەتای ساڵی ١٨٥٦ نەمسا گەفێکی بۆ روسیا نارد، کە بەبێ مەرج هەر چوار خاڵەکانی مەرجی راگرتنی جەنگ قبووڵ بکات، بە پێچەوانە بڕیاری شەڕ دژی روسیا دەدات، لە ١٦ی جەنیوەریی ١٨٥٦روسیا بە قبوولکردنی وەڵامی دایەوە بێ ئەوەی پێویست بە راگەیاندنی شەڕ بکات. بۆ بەستنی کۆنگرەی ئاشتەوایی لە پاریس بانگەوازی لایەنەکان کرا، کۆتاییەکەی بە ئیمزاکردنی پەیماننامەی پاریس هات لە ٣٠ی ئاداری ١٨٥٦، دەقی مەرجەکانیش ئەمانەن:

١- دەسەڵاتەکان دان بە یەکسانی مافی هاووڵاتیان دەنێن بێ رەچاوکردنی جیاوازیی ئایین و رەگەز، ئەمە ئەوەی دەگەیاند تەنیا دەسەڵات خۆی مافی گرنگیدانی بە کاروباری کریستەکانی هەبێت و کەسێکی تر بۆی نییە دەست لە کاروباریان وەر بدات.

٢- وڵاتە ئەوروپییەکان دان بە مافی عوسمانییەکان دەنێن لە سەروەریی بەنداوەکان، روسیاش بۆی نییە کەشتیگەلی سەربازیی و کارگەی سەربازیی دروست بکات، بەم شێوەیە دەریای رەش بێلایەن دەمێنێتەوە.

٣- ڕاگەیاندنی ئازادیی دەریاوانی لە ڕووباری دانوب و پێکهێنانی لیژنەیەکی نێودەوڵەتی بۆ سەرپەرشتیکردنی.

٤- بەدەستهێنانی سەربەخۆیی هەردوو هەرێمی دانوب لەناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

## ئەنجامەکانی شەڕی قەرم

مەزنترین ئەنجامەکانی شەڕی قەرم لەناوبردنی هاوپەیمانێتیەکەی نێوان روسیا و نەمسا بوو، کە وەکو گەرەنتی بوو بۆ رژێمە کۆنەپەرستەکان لە ئەوروپا. بەم شێوەیە بواری ئازادی و سەربەخۆیی پتر بۆ نەتەوەکان رەخسا، بارودۆخەکان لەبار بوون هەروەکو دوای ساڵی ١٨٦٠ ئیتاڵیا و ئەڵمانیا بۆ ئەم هەنگاویان نا. هەروەها روسیا دوای ئەو شەڕە ماوەی ١٥ ساڵ تەنیا گرنگیی بە کاروباری ناوخۆ دەدا، کاروباری ئەوروپای تا رادەیەک پشتگوێ خست. دواتر ئەو دەنگوباسانەی هەواڵنێرەکان دەیان گواستنەوە ئاماژەیان بە برسێتی و ئازاری سەربازەکان دەدا لەم شەڕە، زۆربەی سەربازەکان توشی نەخۆشیی تیفۆ و کۆلێرا و نەخۆشیی سییەکان ببوون، ئەم هەواڵانە کاریان کردبووە سەر رای گشتیی ئەوروپا بە تایبەتی کاتێک زانرا چوار لەسەر پێنجی نەخۆشەکان مردن، ئەمەش بەڕاستی ژمارەیەکی بەرز بوو. دواتر دەرکەوت کە نەخۆشییەکان لە ئەنجامی کەمی خزمەتگوزاریی پزیشکییەوە بوون، ئەمە دواتر بوو بە هۆکاری دامەزراندنی رێکخراوی خاچی سور، کە ستونیەکانی لە هاوپەیمانێتیی جنێڤ لە ١٨٦٤ جێگیر بوون. دیسان ئەو بەیاننامەیەی لە کۆنگرەی پاریس لە ١٨٥٦ دەرکرا رێنمایی و بنەماکانی نێودەوڵەتیی گەمارۆدانی دەریاوانی و مەرجەکانی پاراستنی مافی بێلایەنیان دانان، جگە لەمە کاری رێگریی دەریاوانیانیشیان قەدەغەکرد.

## یەکێتیی ئیتاڵیا

لە ١٨٥٨ ئیتاڵییەکان ئەوکات لە سەرووبەندی دەرچوونە مەزنییەکەیان رووەو وەدەستهێنانی ئومێدەکانیان هەنگاویان دەنا بۆ ئازادی و یەکێتی، ئەوکات وڵاتەکەیان شانۆی فەرمانڕەوا و ئەمیرەکان بوو بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان و ئامانجی بەرژەوەندییەکانی داگیرکاری و هەندێک جاریش دژایەتیکردن بوو، لەو کات نەخشەی نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا هێشتا هەمان نەخشەی بەر لە سێ یەکی سەدە بوو، ئەوەی سیاسەتمەدارانی ئەورووپی لە کۆنگرەی ڤیەننا وێنەیان بۆ کێشابوو.

لە باکوورییەوە میرنشینێکی بچووکی هەژار، هەندێک جار بە ناوی سەردینیا و هەندێک جاریش بە ناوی بیامۆن ناو دەنرا، بیامۆن وڵاتی بیامۆنی دەگرتەوە. ئەم وڵاتە بچووکە هەژارە دەکەوتە سەر لوتکەکانی چیای ئەلب، دوورگەی سەردینیای بێدەرامەتی هەژار و دواکەوتوو و خاکەکانی سافوا و سافوای سەروو و نیس و خاکەکانی جەنەوای بوو، ئەم میرنشینەش فیکتۆر عەمانۆئیلی دووەم، کە لە خانەوادەی سافوای بوو، حکومڕانیی دەکرد، پایتەختەکەشی شاری تۆرینۆ بوو.

لە باکووری رۆژهەڵاتیەوە هەردوو وڵاتی لۆمباردیا و بوندوقیەی دەوڵەمەند و بەپیت هەبوون، دەوڵەمەند لە رووی جوگرافیا و مێژووی پڕ لە سەروەری و دەستکەوتی شارستانی، سەرەڕای یاخیبوونی بەردەوامیان تا ئێستا لەژێر رکێفی ڤیەنا دەناڵن، لە ناوەڕاستیش دەوڵەتی پاپای پیرۆزمەند هەبوو، کە بە هۆی سۆزی ئایینپەروەرە کاسۆلیکەکان دەچوو بەڕێوە، ئەرکی پاراستنیشی لەشکرەکانی فەرەنسی گرتبوویانە ئەستۆ. لە دەوروبەری دەوڵەتی پاپا چەند دەوڵەتۆکەیەک هەبوون، کە کۆنگرەی ڤیەننا دروستی کردبوون لەژێر سێبەری نەمسا دەسەڵاتیان جێ بە جێ دەکرد و سەرکوتی هەموو بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازیان دەکرد، دیارترین ئەم دەوڵەتۆکانە، میرنشینی بارام و مۆدینا و توسکانە بوون.

لە خوارووشیەوە میرنشینی هەردوو سقلیەکە هەبوون کە بەشی خوارووی نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا و دوورگەی سقلیەی دەگرتەوە، فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینەش پادشای خانەوادەی بۆربۆن بوو، پایتەختەکەی ناپۆلی بوو رژێمێکی تا بلێی ستەم و زۆرداری بەسەر هاوولاتیاندا سەپاندبوو.

لە تەک ئەم لەتویەتیەدا لە ساڵی ١٨٤٨ ئەو کاتەی شۆڕشەکان هەرەسیان هێنا و کۆنەپارێزەکان هاتنەوە سەر حوکم، لە زۆربەی ناوچەکانی ئەم نیمچە دوورگەیە شەپۆلێکی کۆنەپەرستانە و حوکمڕەهای زۆرداریی بەڕێوەی دەبرد.

لەناو ئەو هەموو دۆخە نالەبارانەدا سەردینیا حوکمێکی دەستووریی دیموکراسیی پیادە دەکرد، کە ببووە جێی ئومێدی نیشتمانپەروەرە دەربەدەرەکان لە ناوەوە و دەرەوە. ئەوەی مایەی دڵخۆشکەری و پشتگیری مانەوەی ئەم دۆخە دیموکراسییە بوو پادشای تۆرینۆ عمانۆئیلی دووەم بوو، کە چەندین جار بەرۆکی لە نەمسایییەکان گرتبوو بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری وڵاتەکەی وەرنەدەن، هەروەها خۆشی لەو رۆژەی بەگژ نەمسایییەکاندا دەچوەوە لە بیروڕاکانی نیشتمانپەروەران و بانگەوازخوازانی چاکسازی نزیک بوو. مادام دژی پادشایەتیی ئیتاڵیا دەوەستا نیشتمانپەروەرەکان لێی نزیک دەبوونەوە، زۆربەی هەوادار و لایەنگرانی مازینی لە دەوری حوکمەکەی کۆ ببوونەوە، بەتایبەت دوای ساڵی ١٨٥٢ ، کە حوکمی رادەست سەرکردەی نیشتمانپەروەر کافور کرد. ئەمەو سەرکردەی شۆڕشگێڕ کۆماری گاریباڵدیش لەگەڵی کۆبووەوە و گوێی بۆ داخوازیەکانی راگرت، چونکە لای ئەم جێی ئومێد بوو لەم پێناوە دەستی لە رژێمی کۆماری هەڵگرت.

ئەگەر تێبینی بکەین دەبێت هەندێک هاندەر هەبن بۆ ئەوەی سەردینیا شایستەی رابەرایەتیی یەکێتیی ئیتاڵیا بێت، پادشاکەی بە بلیمەتی و نیشتمانپەروەرییەوە سەیری ستراتیژیەتی مەسەلەکانی دەکرد، ئەم لە حەتمیەتی یەکێتیی ئیتاڵیا دڵنیا بوو. وڵاتێکی وەکو سەردینیا خاوەن جوگرافیا و پادشایەکی بە کەسایەتی و بەتوانا، بەهێزترین فەرمانڕەوای ئیتاڵیا، بۆ دەبێت شایستەترین کەسی ئیتاڵیا نەبێت، کە رابەرایەتیی یەکێتیی ئیتاڵیا بکات؟ هەموو ئەو فەرماندە ئیتاڵیانەی تر لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ نەمسا ژێر بە ژێر سازشیەکیان هەبوو، بەم هەڵوێستەیان ئەمان ببوونە جێی گومان.

ئەگەر سەیری گەلی ئیتاڵیا بکەین ئەوان بە دیدێکی تر سەیری وڵاتەکەیان دەکرد، مەزنترین کێشە لای ئەوان خۆسەپاندنەکەی نەمسا بوو بەسەر خاکی باکووری ئیتاڵیا و بەشێک لە ناوەڕاستی، بە دیدی ئەوان ئەگەر لە ستەم و ژێردەستی نەمسا رزگاریان نەبێت، ئەوا لە حوکمی فەرماندە و ئەمیر و کرێگرتە ستەمکارەکان رزگاریان نابێت. ئەمە

لە تەک ئەم لەتوپەتیەدا لە ساڵی ١٨٤٨ ئەو کاتەی شۆڕشەکان هەرەسیان هێنا و کۆنەپارێزەکان هاتنەوە سەر حوکم، لە زۆربەی ناوچەکانی ئەم نیمچە دوورگەیە شەپۆلێکی کۆنەپەرستانە و حوکمەهای زۆرداریی بەڕێوەی دەبرد.

لەناو ئەو هەموو دۆخە نالەبارانەدا سەردینیا حوکمێکی دەستووریی دیموکراسیی پیادە دەکرد، کە ببووە جێی ئومێدی نیشتمانپەروەرە دەربەدەرەکان لە ناوەوە و دەرەوە. ئەوەی مایەی دڵخۆشکەری و پشتگیری مانەوەی ئەم دۆخە دیموکراسییە بوو پادشای تۆرینۆ عمانۆئیلی دووەم بوو، کە چەندین جار بەرۆکی لە نەمساییەکان گرتبوو بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری وڵاتەکەی وەرنەدەن، هەروەها خۆشی لەو رۆژەی بەگژ نەمساییەکاندا دەچوەوە لە بیروڕاکانی نیشتمانپەروەران و بانگەوازخوازانی چاکسازی نزیک بوو. مادام دژی پادشایەتیی ئیتاڵیا دەوەستا نیشتمانپەروەرەکان لێی نزیک دەبوونەوە، زۆربەی هەوادار و لایەنگرانی مازینی لە دەوری حوکمەکەی کۆ ببوونەوە، بەتایبەت دوای ساڵی ١٨٥٢ ، کە حوکمی رادەست سەرکردەی نیشتمانپەروەر کافور کرد. ئەمەو سەرکردەی شۆڕشگێڕ کۆماری گاریباڵدیش لەگەڵی کۆبووەوە و گوێی بۆ داخوازیەکانی راگرت، چونکە لای ئەم جێی ئومێد بوو لەم پێناوە دەستی لە رژێمی کۆماری هەڵگرت.

ئەگەر تێبینی بکەین دەبێت هەندێک هاندەر هەبن بۆ ئەوەی سەردینیا شایستەی رابەرایەتیی یەکێتیی ئیتاڵیا بێت، پادشاکەی بە بلیمەتی و نیشتمانپەروەرییەوە سەیری ستراتیژیەتی مەسەلەکانی دەکرد، ئەم لە حەتمیەتی یەکێتیی ئیتاڵیا دڵنیا بوو. وڵاتێکی وەکو سەردینیا خاوەن جوگرافیا و پادشایەکی بە کەسایەتی و بەتوانا، بەهێزترین فەرمانڕەوای ئیتاڵیا، بۆ دەبێت شایستەترین کەسی ئیتاڵیا نەبێت، کە رابەرایەتیی یەکێتیی ئیتاڵیا بکات؟ هەموو ئەو فەرماندە ئیتاڵیانەی تر لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ نەمسا ژێر بە ژێر سازشیەکیان هەبوو، بەم هەڵوێستەیان ئەمان ببوونە جێی گومان.

ئەگەر سەیری گەلی ئیتاڵیا بکەین ئەوان بە دیدێکی تر سەیری وڵاتەکەیان دەکرد، مەزنترین کێشە لای ئەوان خۆسەپاندنەکەی نەمسا بوو بەسەر خاکی باکووری ئیتاڵیا و بەشێک لە ناوەڕاستی، بە دیدی ئەوان ئەگەر لە ستەم و ژێردەستی نەمسا رزگاریان نەبێت، ئەوا لە حوکمی فەرماندە و ئەمیر و کرێگرتە ستەمکارەکان رزگاریان نابێت. ئەمە

بۆچوونی گەلی ئیتاڵیا بوو بۆ دۆزە نەتەوایەتییەکەیان، بەڵام مەسەلەی یەکێتیی ئیتاڵیا لای ئەوان مەسەلەیەکی دواڕۆژ بوو، چونکە وڵاتانی دەوروبەر دژی ئەم داخوازیەن. ئەوەی گەلی ئیتاڵیا دەیخواست ئەو یەکێتیە ئەوکاتە بەدەست بێنن، کە لەژێر چنگی داگیرکاران رزگاریان دەبێت، ئەوسا وەکو یەکێتیەکی کۆنفیدراڵییەکە سیاسی و سەربازی و ئابوورییەکانی لە نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا یەک بگرن، بۆیە دەبینین مەسەلەی یەکێتی لەسەرەتا تەنیا داخوازیی رۆشنبیر و شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازەکان بوو بەر لەوەی داخوازیی گشت گەلی ئیتاڵیا بێت.

## کافور

بە گەیشتنی کافور بۆ سەر کورسیی دەسەڵاتی سەردینیا لە ١٨٥٢ بە هۆی پشتگیریی پادشا و گشت لایەنەکانی گەل لە نێوەندە شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەرەکان هەندێک توانای ناچاوەڕوان کراو هاتنە کایەوە، کە خۆیان لە دوو ئامانجی هاوتەریب دەبینیەوە، ئەوانیش (یەکێتی و رزگاری) بوون.

ئەم پیاوە بە رەچەڵەک لە خێزانێکی ئۆروستوکراتیی خاوەن زەوی و زارێکی زۆر بوو لە تورینتۆی پایتەخت، خۆیشی هەر لەوێ لە ساڵی ١٨١٠ لە دایک بووە. وەکو نەریتی هەموو کوڕە دەوڵەمەندەکان لە تەمەنی گەنجێتییەوە پەیوەندیی بە خوێندنگای سەربازیەوە دەکات و بە پلەی ئەفسەر خزمەتی سەربازیشی بۆ وڵات کردووە. دواتر واز لە سەربازی دەهێنێت بۆ ماوەیەک خۆی بە بەڕێوەبردنی کێڵگە کشتوکاڵییەکەی خەریک دەکات، لە کاتە بێنیشەکانیدا سەفەری دەکرد، سەردانی فەرەنسای کرد و ئاشنایی لەگەڵ بیرمەندەکانی کرد، شارەزاییشی لەسەر شارستانێتی و رۆشنبیری ئەوێ پەیدا کرد. لە بەریتانیا ئاشنایی لەگەڵ سیاسەتمەدارانی بانگەوازخوازی دیموکراسی کرد وەکو: بت و کاننگ و گرای، کەوتە ژێر کاریگەریی فەرهەنگیان، لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا بڕوای تەواوی بە رژێمی پادشایەتی هەبوو، لەو بڕوایەدا بوو، کە تەنیا لەو رێگەیەوە دەتوانرێت دەستووری دیموکراسی بپارێزرێت و کێشەکانی وڵات چارەسەر بکرێن، لە هەمان کاتدا پەیوەندیی لەگەڵ هەموو رێکخراوە نهێنییەکانی ئیتاڵیا هەبوو بە هەموو بۆچوونەکانیانەوە، تەنانەت لە ڕووداوەکانی شۆڕشی ١٨٤٨ بەشداریشی تێدا کردبوو.

کە دەسەڵاتی گرتە دەست پیاوێکی خاوەن ئەزموون و بەتوانا بوو، هیچ ساتێک بۆ بیرکردنەوە نەوەستا و ڕاستەوخۆ دەستی بە جێبەجێکردنی سیاسەتێکی دووربینانە کرد. لە ساڵی ١٨٣١ ڕۆژێک خۆی وتبووی: "من پیاوێکی چاو لە داهاتووم، ڕۆژێک لەخەوما بینیم بوومەتە وەزیر لە میرنشینی ئیتاڵیا ".

کەوایە دەبێت ئەو میرنشینەی سەردینیا بکاتە ئەو میرنشینەی ئیتاڵیەی، کە لە ڕۆژەکانی گەنجێتی لە خەودا بینیبووی.

لەسەر ئاستی سیاسەتی ناوخۆ بڕیاری دا وڵاتەکەی ببێتە خاوەنی سوپایەکی بەهێزی نوێ، کە لە توانایدا بێت سیاسەتە نەتەوایەتییەکانی جێبەجێ بکات، جەنەراڵ لامەر ئیمزای ڕاسپارد تا لەسەر بنەمایەکی نوێی دووبارە سوپا ڕێک بخاتەوە، بە نوێترین چەکی سەردەم و ڕاهێنان لەسەر شەڕی نوێ دەوڵەمەندیان بکات.

ماوەیەکی کەمی برد سەردینیا بووە خاوەنی سوپایەکی ٩٠ هەزاریی سە ربازی بەهێز و لێهاتوو و کەشتیگەلێکی نوێی بۆ میرنشینەکەی دروست کرد.

لە بواری ئابوورییدا بەشداریی لە دامەزراندنی چەندین بانک و کۆمپانیای پیشەسازی و بازرگانی کرد، ئامانجی لەم دامەزراوانە گەیاندنی وڵاتەکەی بوو بە کاروانی چەرخی پیشەسازی هاوشان لەگەڵ وڵاتە ئەوروپییەکان. ئەمەو تۆڕێکی هاتووچۆی پێشکەوتووی بۆ وڵات دامەزراند، کە لەگەڵ ئاستی وڵات بۆ کاتی ئاشتی و شەڕ بگونجێت، شاری جەنەوای کردە نوێترین بەندەر لە دەریای ناوەڕاست، هەموو شارەکانی وڵاتیشی بە تۆڕێکی ئاسنینی پێشکەوتوو بە درێژایی ٨٠٧کم بە یەکەوە بەستەوە، ئەم درێژاییە بۆ ئەو سەردەمە، واتا ساڵی ١٨٥٩، بۆ وڵاتێکی وا بچووک کەم نەبوو.

لە بواری سیاسەتی دەرەوەشدا ئەرکەکانی کافور گەلێک قورستر بوون، دڵنیا بوو لەوەی هەموو گەلی ئیتاڵیا هەست بە نیازەکانی ئەوروپا دەکەن، کە هەموویان دژی یەکێتیی ئیتاڵیان، ئەوەشی دەزانی، کە نەمسا لە بەرانبەر یەکێتی و ئازادی و ڕزگاریدا کەللەڕەق و پێداگیرە هیچ کاتێک قبووڵی نییە ئیتاڵیا لەژێر دەستی بێگانە ڕزگاری بێت. ئەویش کە وڵاتێکی بەهێز و دەوڵەمەندە، سەردینیا لە توانایدا نییە شکستی پێ بهێنێت، بۆیە دەبێت بەسەر نیازەکانیدا زاڵبین، کە دژی داخوازیەکانمانە بە وەدەستهێنانی

پشتگیریی ولاتێکی بەهێز تا هاوکاریمانبکات لە رزگاربن، ئەمەش کارێکی ئاسان نییە، ولاتە مەزنەکان ئەوسا لە روانگەی بەرژەوەندییەکانیان دەیانڕوانییە نەمسا و هیچ سەنگێکیان بۆ مەسەلە مرۆڤایەتی ودیموکراسی دانەدەنا.

نەمسا یەکەم دوژمنی رزگاربوون و یەکێتیی خاکی ئیتاڵیایە، ئامادەیە ئەوپەڕی بەرگری لە دەسەلاتەکانی لەناو ئیتاڵیا بکات بە هەموو شێوازێک، تەنانەت بە جەنگیش. دواتر مەسەلەی نەتەوایەتی لە ئیتاڵیا لە سەرووی هەمووشتێک بوو، ئەگەر هەر کاتەی بنەماکانی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلان دەستەبەر کرا و نەتەوەی ئیتاڵیاش بە مافەکانی خۆی شاد بوو، ئەو کات چ هێزێک دەتوانی رێگە لە نەتەوەکانی ناو نەمسا بگرێت بۆ هەمان داخوازی هەمان رێچکە بگرنە بەر، ئەوسا چی لە بەردەم ئیمپراتۆریەتە نەخۆشەکە دەمێنێتەوە؟

بنەماکانی نەتەوایەتی بۆ نەمسا خەتەرناکن و بە هەموو شێوەیەک دژیان دەوەستێت، دواتر بۆ نەمسا مایەی سەرئێشەیە لە خواروویدا ولاتێکی یەکگرتووی بەهێزی وەک ئیتاڵیا هەبێت، تەنانەت ئەگەر دوژمنیشی نەبێت، بە هۆی رابردووی پڕ لە کارەساتە جەنگیەکانی نێوانیان هەرگیز نابێتە دۆست.

روسیا ئەگەر بەرژەوەندیشی لەگەڵ ئیتاڵیادا نەبێ، بەلام لەپێناو پاراستنی ئەو دۆخەی بۆ ئەوروپا هاتۆتە کایەوە، زۆر پابەندی بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننایە. لەم روانگەیەوە لەگەڵ نەمسا یەک دەگرن، دیسان ئەوە لە بیر نەکەین، کە روسیا لە چەندین نەتەوەی جیا لە رووی زمان و ئایین و مێژوو پێکهاتووە، ناتوانێت دژی بنەماکانی مافی چارەی خۆنووسین نەبێت، بۆیە کافور دەبێت روسیا لە حساباتەکانی خۆی وەدەرنێت ئەگەر لە ریزی دوژمنانی نەژمار نەکات.

لە ئینگلتەراش وتمان کە گەلی ئینگلتەرا هاوسۆزبوون لەگەڵ ئیتاڵییەکان بۆ وەدەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانیان و رزگاربوونیان لە دەست نەمساییەکان، لەناو خوێندکار و رۆشنبیر و زانکۆکاندا و لە شەقامی ئینگلتەرا و لە هەموو شوێنێک و تەنانەت لە پەرلەمانیش هەوادار و لایەنگرانی دۆزی ئیتاڵیا هەبوون، بەلام کافور لە سەرەتای حکومڕانیی بۆ رزگاربوونیان لەژێر دەستی نەمساییەکان چاوی ئەوەی نەبوو ئینگلتەرا کۆمەکی سەربازیی بکات، چونکە ئەوان خاوەنی ئەو جۆرە سوپایە زەمینیە نەبوون، کە

بتوانێت شکست بە نەمسا بێنێت. دواتر شتێکی تری گرنگ لای ئینگلیزەکان هەبوو وەکو هێڵی سەرەکیی سیاسەتی دەرەوەیان لەبەر چاویان دەگرت، ئەویش بوونی نەمسایەکی یەکگرتووی بەهێز لە ئەوروپا پێویستە بۆ سەقامگیربوون و راگرتنی پارسەنگی هێزەکانی ئەوروپیی. لەو ماوەیەدا هیچ گۆڕانێک لە سیاسەتی ئینگلتەرا رویان نەدا تا ساڵی ١٨٥٩ کاتێک لۆرد بالمرستۆن پۆستی سەرۆکیوەزیرانی گرتە دەست و لۆرد (راساڵ)یش پۆستی وەزارەتی دەرەوە، هەردووکیان لە لایەنگر و پشتیوانکارانی دۆزی ئیتاڵیا بوون. لەگەڵ ئەمەش پادشا ڤیکتۆریا بە پێی ئەوەی کە دەستوور دەسەلاتی پێ دابوو، توانیی جڵەوی مەسەلەکان بگرێتەدەست و هەرەس بە هەموو هەوڵەکان بهێنێت و بارودۆخەکان وەکو خۆیان بهێڵێتەوە.

تەنیا فەرەنسا مێرگی هیوا و ئومێدی بۆ کافور هێشتەوە، کە بتوانێت پشتگیریی بکات، ئەویش لەبەر چەند هۆیەک، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- فەرەنسای دۆڕاو لە ١٨١٤ بە هیچ شێوەیەک لە شێوەکان بەو بارودۆخە رازی نەبوو، کە کۆنگرەی ڤیەننا لە ئەوروپا خوڵقاندبووی، کە لەگەڵ بەرژەوەندییە نەتەوایەتیەکانی نەدەگونجا، لەم روانگەیەوە دوور نییە هاوکاریکردنی سەردینیا کەشوهەوایەکی تر بخولقێنێت هەندێک لە دۆخەکان لە بەرژەوەندیی دابن.

- بە دیدی فەرەنسا خاکی ساڤوای و نیس بە پێوەری جوگرافیی و نیشتەجێیی نزیکترن لەوەی تەواوکەری فەرەنسان بن نەک سەر بە ئیتاڵیا بن، ئەگەر فەرەنسا بڕوا بە بنەماکانی نەتەوایەتی بهێنێت پێگەی فەرەنسا بەهێزتر دەبێت، ئەم بۆچوونە لە بڕواکانی کافورەوە دوور نییە.

- ئیمپڕاتۆر ناپلیۆنی سێیەم ماوەیەکی زۆر لەناو ئیتاڵییەکان ژیاوە و لەگەڵ دۆزەکەیان مامەڵەی کردووە و سۆزی بۆیان هەیە، سەردەمانێک لەناو رێکخراوی رەژوکەران کاری بۆ ئیتاڵییەکان دەکرد، ئەمیش خۆی بە پەیوەستی ئەو سۆزانەوە دەبینی. ئەگەر سەردەمانێک لە ١٨٤٩ لەژێر کاریگەریی بەرژەوەندییە باڵاکانی وڵات ناچار بووە دژی شۆڕشگێر و ئازادیخوازان بوەستێت، بەڵام ئەمە لەو سۆز و خۆشەویستییەی دانەبڕاندوە، کە بۆ دۆستە ئیتاڵییەکانی هەبووە. کافور بینیی، کە دەکرێت بە دیبلۆماسیەتێکی وشیارانەوە بۆ بەرژەوەندیی دۆزەکەی سوود لەو سۆزە وەرگیرێت.

هەر لەدوای رووخانی ئیمپراتۆریەت فەرەنسا لەناو سنووری ئەوروپا بە نامۆ و دابڕاوی ماوەتەوە، هەرچەندە لەدوای ئەو رۆژە گەلێک لە هاوپەیمانێتیەکان هەڵوەشاونەتەوە و دۆخ و بەرژەوەندییەکان گۆڕانیان تێکەوتون، بەڵام وڵاتە ئەوروپییەکان هەر بە چاوی گومانەوە لە فەرەنسا دەڕوانن، ترسیان لەوەیە ئەوەی فەرەنسییەکان بیری لێ دەکەنەوە لە هەر ساتێک دا رووبدات. بە بڕوای ئەم ئەگەر هاوکاریی سەردینیای کرد و بە پشت و پەنای ئەو لە ئیتاڵیا بوو بە وڵاتێکی بەهێز، ئەوا بۆ ئەمیش دەبێتە هاوسیاسەت و پشتیوانێکی باش لە ئەوروپا.

لەم روانگەیەوە و دوای هەڵسەنگاندنی هەموو دۆخە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی وڵات کافور نەخشە و بەرنامەی سیاسەتەکانی داڕشت، کە تا سەرەتاکانی ١٨٥٨ پیادەی دەکردن، دەکرێت بەم شێوەیە کورتیان کەینەوە:

- ئامانجی یەکەم و نزیکی دەبێت رزگارکردنی ئیتاڵیا بێت لە چنگ نەمسا.
- کێشەی ئیتاڵیا لە وتووێژەکان وەکو کێشەی هەموو ئەوروپا لێ بکرێت، لە سەرووی هەموو کێشەکان بێت بۆ باسکردن.

دیمان هەموو رێگاکانی گرتنەبەر تا بتوانێت لەگەڵ فەرەنسا و ئینگلیز بەشداری لە شەڕی قەرم بکات بۆ ئەوەی هەر کاتەی کۆنگرە و دانیشتنێکی نێودەوڵەتی بەسترا، دەرفەتێکی باش بێت ئەمیش مەسەلەی ئیتاڵیا بخاتە سەر مێز بۆ باسکردن. ئەوەبوو لە کۆنگرەی پاریس لە ١٨٥٦ لەگەڵ وڵاتە مەزنەکان دانیشت و داوای لێیان کرد، کە دەبێت چارەیەک بۆ وەدەرنانی داگیرکار بدۆزرێتەوە، بۆ ئەوەی چارەیەکی ئاشتیانە بۆ کێشەکەیان بگرنە بەر.

- کاری بەردەوام بۆ ئەوەی پشتگیری عەسکەریی فەرەنسا وەدەست بێنێ.

بەر لە ئێستا باسمان لەو هۆکارانە کردن، کە بوونە هۆی ئەوەی فەرەنسا مەیلی بە لای هاوکاریکردنی سەردینیادا بشکێت، بەڵام هەندێک تەگەرە کەوتنە بەردەم کافور بۆ وەدەستهێنانی هاوکارییەکان، ئەوانیش بریتی بوون لەوەی پارتی کاسۆلیک، کە ناپلیۆن بۆ حکومڕانی و پشتیوانیی پشتی پێ دەبەستن، لە یەکێتیەکەی ئیتاڵیا مەترسیی دەسەڵاتەکانی پاپای بەدی دەکرد. بە دیدی ئەوان بە رووخانی دەسەڵاتی پاپا دەبێت فەرەنسا هێزەکانی، کە بۆ پاراستنی رۆمای ناردبوون، بیان گەڕێنێتەوە، لەو حاڵەتەشدا

هەم فەرەنسا هەم پاپا دەسەڵات لەدەست دەدەن، بۆیە ئەم کارە جێی قبووڵکردن نییە. هەندێک لە ستراتیژزان و پسپۆرە سەربازییەکان وایان دەبینی بە دروستبوونی ئیتاڵیایەکی بەهێز و یەکگرتوو نارەحەتی بۆ فەرەنسا لە دەریای سپیی ناوەڕاست دروست دەبێت، کەوایە چۆن لای فەرەنسییەکان هەندێک هۆکار و فاکتەری هاوکاریکردن هەن، ئاوەهاش پاساو و هۆکاری هاوکارینەکردنیش هەن، بەڵام هەر چۆنێکی بێت ناپلیۆنی سێیەم سووربوو لەسەر ئەوەی لە دەرفەتێکدا بتوانێت هاوکاریی ئیتاڵییەکان بکات بۆ سەرکەوتنی دۆزەکەیان.

لە ١٤ی جەنیوەری لە ١٨٥٨ کاتێک ناپلیۆنی سێیەم بە نیاز بوو بچێتە ئۆپرا، ئۆرسینی هەوڵی تیرۆرکردنی ناپلیۆنی دا، کە یەکێک بوو لە هەڵگرانی بیری مازینی و بە هۆی توندڕەویی لە نەتەوەپەرستیدا چەندین جار لە ئیتاڵیا وەدەرنرابوو.

بە گوتەی خۆی ئەم کارەی بۆیە ئەنجام دا، چونکە ناپلیۆن لە پەیمانەکانی خۆی بۆ هاوکاریکردنی ئیتاڵیا پەشیمان بۆتەوە، ئەو پەیمانانەی ئەوکاتە دابوون کاتێک لە گەنجێتی بەشداریی لە کۆمەڵەی ڕەژوکەران کردبوو. ناپلیۆن بە پاساوی مەترسیی لە تیرۆرکردنی لەلایەن ڕکابەرەکانی وردە وردە بەرەو پارمەتیدانی ئیتاڵییەکان هەنگاوی نا، دواتر ئەو دادگاییکردنەی ئۆرسینی و دانیشتنەکانی لەگەڵ خۆی کۆمەڵێک پرسی سیاسیان هێنا، لەمیانەدا سۆز و هەستی فەرەنسییەکانی بۆ خۆی و دۆزی ئیتاڵیا ڕاکێشا. ئەوکاتەی بکوژ چوە سەر پەتی سێدارە، فەرەنسییەکان وەکو بکوژ سەیریان نەدەکرد، وەکو پاڵەوان و قارەمانێکی دۆزی وڵاتەکەیان سەیر دەکرد، هەرچەندە ئەو کاتەی بکوژەکە نارنجۆکێکی بە نیازی تیرۆرکردنی ناپلیۆن هەڵدابوو ٨ بێگوناهی کوشتبوو. یەکێک لە بەربڵاوترین ڕۆژنامەی فەرەنسی دوایین نامەی ئۆرسینی، کە بەر لە مردنی بۆ ناپلیۆنی ناردبوو، بڵاو کردەوە، بڵاو کردنەوەی ئەو نامەیە کارێکی زۆری کردە سەر ناخی فەرەنسییەکان. ئەمەش ناوەڕۆکی نامەکەیە:

(متمانە و دڵنیایی بۆ ئەوروپا ناگەڕێتەوە و سەلامەتی جەنابیشت پارێزراو نابێت، چونکە بۆ ئەنجامدانی یەکێتی و سەربەخۆیی هاوکاری ئیتاڵیا ناکەیت، بۆیە داوای کەسێکی ئیتاڵیایی نیشتمانپەروەری بەر لە چوونی بۆ بەردەم پەتی سێدارە بێئومێد مەکە... نیشتمانەکەم ڕزگار کە).

## کۆبوونەوەی پلۆمبیر

ئەو کاتەی بڕواکان لەسەر ئەوە کۆک بوون، کە دەبێت هاوکاری سەردینیا بکرێت، ئیمپراتۆر داوای لە کافور کرد چاویان بە یەک بکەوێت، ئەم چاوپێکەوتنە لە شاری پلۆمبیر ئەنجام درا. لە ٢١ی حوزەیرانی ١٨٥٨ کافور بە پاسپۆرتێکی قەلپ و ناوێکی خوازیارەوە بە نهێنی لە پلۆمبیر ئامادە بوو و بەیەکەوە وتووێژیان کردن. لەم کۆبوونەوەیەدا ناپلیۆن ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاریکردنی سەردینیا راگەیاند، هەروەها هەڵوێست و دیدی خۆیان سەبارەت بە دوارۆژی ئەم وڵاتە خستە ناو باس و لێکۆڵینەوە، ناپلیۆن هەوڵی ئەوەی دەدا لە سیاسەتەکانیدا هەستی دۆستەکانی راگرێت وێڕای بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی، بۆ ئەم مەبەستە ئەم پێشنیارانە کران:

- لە باکوور سنووری وڵاتی سەردینیا فراوان دەبێت، بە شێوەیەک مومتەلەکاتەکانی نەمسا لە لۆمبارديا و بووندوقیە بگرێتەوە، واتە سنوورەکەی لە چیای ئەلبەوە تا دەریای ئەدریاتیکی دەبێت.

- لە ناوەڕاستی یەکێتییەک لە نێوان میرنشین و ویلایەتەکانی ئەو ناوچەیە بەتایبەتی مۆدینیا و توسکانە دروست دەبێت، رۆما و خاکەکانی دەوروبەریشی بۆ پاپا دەمێننەوە.

- لە خوارووشیەوە هەردوو مەملکەتەکەی سقلیە وەکو خۆیان دەمێننەوە.

لە نێوان ئەم دەوڵەتانەش یەکێتییەکی گشتی دادەمەزرێت ئەگەر تەنیا بە ناویش بێت سەر بە پاپاوە دەبن، وەکو پاداشتی هاوکاریەکانی فەرەنسا دەبووایە ئیمپراتۆریەت خاکەکانی ساڤوای و نیس بەرێت. لەژێرەوە فەرەنسا چاوی بڕیبووە شتی تریش، کە بە نهێنی ئاماژەیان پێ درابوو، ئەویش ئەو وڵاتانەی لە ناوەڕاستی ئیتاڵیا دروست دەبوون، نیازی وابوو کوڕە مامەکەی خۆی (جیرۆمی) لەسەر بکاتە پادشا، مەملکەتی خواروش بە یەکێک لە ئەمیرە فەرەنسییەکان بدات لە خانەوادەی ئیمزا.

بۆ دیاریکردنی کاتی هاوکاریکردنەکان فەرەنسا پێی باشبوو لە کاتێکدا بێت، کە نەمسا دەستدرێژی بکاتە سەر سەردینیا، ئەوکات فەرەنسا وەکو هاوکاریکردن لەو دەستدرێژییە کۆمەکی بکات. ئەمە بۆ ئەوەی فەرەنسا بە دیدی ئەوروپییەکان وەکو دەستدرێژکار نەیەتە بەرچاو، بەم رەفتارەش ناپلیۆنی یەکەم و کارەکانی بێنەوە یادیان.

کافور زۆر بەوردی گوێی لە پێشنیارەکانی ناپلیۆن گرت، کە لەگەڵ بۆچوونەکانی زۆر یەکیان نەدەگرتنەوە، بەڵام شوێنی لە ڕووداوەکان ئەوەی بۆ نەدەچووە سەر دژی راکانی بێت. بەبێ هیچ رادەربڕینێک هەموو پێشنیارەکانی قبووڵ کرد، کەوتەخۆ بۆ نانەوەی ئاژاوە لەسەر سنوورەکانی نێوان نەمسا و سەردینیا. ناوچەی کارار لە نێوان وڵاتەکەی و لمباردیای وەکو شانۆی نانەوەی چالاکیەکان هەڵبژارد، دوای ئەوەی نەمسا ناچار دەبێت دەست لە دامرکاندنەوەی چالاکیەکان بووەشێنێت، کافوریش ناچار دەبێت هاوکاریی خەڵکەکە بکات، ئەوسا فەرەنسا بە بیانووی یارمەتیدانی هاوپەیمانەکەی دێتە ناو کێشەکە.

ماوەی چەند مانگێک پەیوەندییەکانی دیبلۆماسی لە نێوان هەردوو تیپ بەردەوام بوون، تا کۆتاییەکەی بە ئیمزاکردنی هاوپەیمانێتیەک هات لە ٢٦ی جەنیوەریی ١٨٥٩، کە لە بنەڕەتدا دژی نەمسا بوو.

## جەنگ لە نێوان نەمسا و ئیتاڵیا

سەرەڕای نهێنیی بڕگەکانی پەیماننامەکە بە بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە لە ئەوروپا هەرایەکی زۆر نرایەوە، هەموو دڵنیا بوون، کە فەرەنسا دەیەوێت شەڕ لەگەڵ نەمسا هەڵگیرسێنێت و دەبێت ئەویش خۆی بۆ ئامادە بکات بۆ ئەوەی ئەوروپا لە چارەنووسی شەڕ دوور کەوێتەوە. ئینگلتەرا بە نیازی ناوبژیوانی خۆی تێهەڵقورتاند، پێشنیارێکی خستە بەردەم فەرەنسا بریتنی بوو لە کشانەوەی هێزەکانی فەرەنسا لە رۆما لە بەرانبەر دەستهەڵگرتنی نەمسا لە هەندێک دەسەڵاتی لە ئیتاڵیا، بە مەرجێک هەڵوێستەکان لە شوێنەکانی تر وەکو خۆیان بمێننەوە. دواتر روسیا هاتە سەر هێڵ و داوای بەستنی کۆنگرەیەکەی پێنجقۆڵیی وڵاتە مەزنەکانی کرد بە مەرجێك سەردینیا بەشدار نەبێت، تا لە ناوەڕۆکی پەیماننامەی فەرەنسا - سەردینیا بگەن. فەرەنسا بۆ ئەوەی لەبەردەم وڵاتە مەزنەکان وەکو دەستدرێژیکەری شەڕ نیشان نەدرێت، داواکەی روسیای قبووڵ کرد.

سەرکردە نەمساییەکان بە هەڵە لە هەڵوێستی فەرەنسا گەیشتن، وایان لێکدایەوە کە فەرەنسا ئارەزووی شەڕی نییە بۆیە داواکەی روسیای قبووڵ کرد، دواتر لە هەڕەشە و هێرشەکانی راگەیاندنی سەردینیا و ئەوەی لە پەرلەمانی تۆرینۆ دەرچووبوو زۆر بێزار ببوو،

پادشا دەیووت من ناتوانم لە بەرانبەر ناڵە و هاواری ئیتاڵییەکان بێدەنگ بووەستم. لە کۆتاییەکانی نیسانی ١٨٥٩ نەمسا گەفێکی بۆ سەردینیا نارد و تیایدا ماوەی ٣ رۆژی بۆ دیار کرد، کە سوپاکەی چەک بکات وبڵاوەشیان پێ بکات. حەتمەن ئەم گەفەی نەمسا کافور رەتی کردەوە، ئەمەش وەکو راگەیاندنێکی شەڕ دێت، دیارە ڤیەنناش ئاواتەخوازی ئەمە بوو بۆ ئەوەی لەبەر چاوی ئەورووپییەکان وەکو دەستدرێژ نەیەتە بەرچاو لە کاتێکدا هەموو هەوڵەکانی ئاشتەوایی قبووڵ کردبوون.

ناپلیۆن لە هاوکاریکردنی هاوپەیمانەکانی دوودڵیی نەکرد، هەر زوو لەشکرێکی ١١٥ هەزاریی بۆ ناردن و خۆشی فەرماندارێتیی کرد، لەم هێرشەیدا دوو دروشمی بەرز کردەوە: (ئیتاڵیا بۆ ئیتاڵییەکان) و (لە ئەلبەوە تا ئەدریاتیک) ناحەزەکانی بەرژەوەندییەکانی نەمسا لە دوو شەڕدا شکستیان بە نەمساییەکان هێنا یەکەمیان لە ٤ی حوزەیران بە ناوی شەڕی ماجنتا و ئەویتر لە ٢٤ی حوزەیران بە ناوی سۆلفرینۆ، لەم شەڕانەدا فەرەنسا و ئیتاڵیا لۆمباردیایان داگیر کرد و خاکەکانی بوندوقیەش لە بەردەم ناپلیۆن کرانەوە. بەڵام کتوپڕ ناپلیۆن لە بەرەوپێشچوون وەستا، لەگەڵ ئەوەی لە دروشمەکەیدا وتبووی دەبێت بگەمە ئەدریاتیک، لەکاتێکدا دوژمنانی بەرەو دواوە رایان دەکرد، ئەو کتوپڕ لە شوێن خۆی چەقی، نەک تەنیا ئەوەندە بەڵکو پەیوەندیشی بە ئیمپراتۆری نەمساوە کرد و ژوانی یەکتربینینیان لە فیلا فرانکۆ دانا.

لە ١١ی تەمووز ئاگربەستێکیان راگەیاند، تەنیا لۆمبادییان بە سەردینیا بەخشی و بووندوقیە و هەموو بەرژەوەندییەکانی تر لە نیمچە دوورگە بۆ نەمسا مانەوە. ئەم رێککەوتنە بە بەندەکانی زیورخ پشتڕاست کران، دواتر لە ١٠ی نۆڤەمبەر ١٨٥٩ ئیمزایان لەسەر کرا، کە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی ویلایەتەکانی ئیتاڵیا لە وڵاتێکی یەکگرتوو بە سەرۆکایەتی پادشا.

ئەم رەفتارە تاکرەویەی ناپلیۆنی سێیەم وەکو خەنجەرێک لە ئومێدەکانی ئیتاڵییەکان درا، دەستیلێهەڵگرتن لە کاتێکدا لە سەرویەندی رزگارکردنی بوندوقیەدا بوون و ئەوەندەشیان نەمابوو بگەنە ئەدریاتیک و بە بووندوقیەوە لە دەست نەمساییەکانیان رزگار کەن. هەموو هەوڵ و کۆششەکانی کافور بەبا چوون، گەڕانەوەی لۆمباردیا بۆ ئەوان هیچ ناگەیەنێت، لە کاتێکدا هەموو ئیتاڵیا لەژێر دەستی نەمسا مایەوە و ئەمیر و پادشا

و فەرمانڕەوا بەکرێگیراوەکان لە شوێنی خۆیان دەستیان بەسەر سامانی خەڵکەوە گرتووە، هەڵوێستی ئیتاڵییەکان بەرانبەر بە ناپلیۆن بە تەواوەتی گۆڕا، ئەو خیانەتلێکردنەی ئەو هیچ پاساوێک ناخوات، چی بوو وای لە ناپلیۆن کرد بەم شێوەیە هەڵوێستی لەگەڵ ئیتاڵییەکان بگۆڕێت؟

هەر بە دەستپێکردنی شەڕەکانی فەرەنسا هەموو بەرژەوەندییەکانی هاوپەیمانانی فەرەنسا و ئیتاڵیا کەوتنە مەترسی، لەسەر داوای ئیمپراتۆریەتی نەمسا لە ئەنجومەنی دیاتی ئەڵمانی بڕوسیا هێزەکانی خۆی لە ناوچەی راینی نزیک سنووری فەرەنسا کۆکردنەوە. ناپلیۆن لەوەی دڵنیا بوو ئەگەر هەردوو دوژمنە بەهێزەکەی (ئەڵمانیا و بڕوسیا) هاوپەیمانێتیان بەست، ناتوانێت پێیان بووەستێ. نەمسا لە دوو شەڕی مەزندا شکستیی هێنا، بەڵام دوایی نەڕووخا، چونکە خاوەنی توانا و وزەیەکی بەردەوامە. دوای فراوانبوونی روپێوی شەڕ هێزەکانی فەرەنسا روەو رۆژهەڵات کشان، هاتووچۆکردنیان بۆ بنکەکانیان لە وڵاتی دایک بە زەحمەت کەوتن. کافور فەرەنسای سەرفراز کردبوو، کە لە دەرەوە خەریکی شەڕ و پێکدادان بێت لە ناوەوەش کافور خەریکی بەئەنجامگەیاندنی مەرامەکانی بوو لە خەباتی یەکێتی و هەڵگیرساندنی شۆڕش بۆ هاندانی جەماوەر تا بەرووی فەرمانڕەوا و کاربەدەستاندا هەڵگەڕێنەوە، دانیشتووانی تۆسکانە و مۆدینا توانیان داگیرکاران لە خاکی خۆیان وەدەر نێن. لەسەرێکەوە ئەم رەفتارانەی کافور لە ناوەڕاستی ئیتاڵیا پارتی کاسۆلیکی نارەحەت کرد، چونکە مەترسی لەسەر قەوارەی پاپا دروست دەکات، لە سەرەکەی ترەوە ناپلیۆن ئەم رەفتارانەی کافوری بە تاکڕەوی دەبینی، کە بەرەو یەکێتی هەنگاو دەنێت، ئەمانەش دژی بەرژەوەندییەکانی فەرەنسان.

لەولاوە هۆیەکی مرۆڤایەتیش هەیە و زیانی مرۆیی مەزن لەو شەڕە کەوتنەوە، بە تایبەت لە شەڕی سۆلفرینۆ نزیکەی ٤٠ هەزار برینداری لێ کەوتەوە، کە زۆربەیان لە بێخزمەتگوزاریی تەندروستیدا گیانیان لە دەست دا. چەندین جۆرە نەخۆشیی کوشندە بڵاوبوونەوە، کە خەتەرناکیان لە کولێرە کەمتر نەبوو، پیاوێکی سویسری بەناوی دۆنان لە پەرتوکێکدا بە ناوی (بیرەوەرییەکان لە سۆلفرینۆ) باس لەو کارەساتانە دەکات، بڵاوبوونەوەی هەواڵی ئەم ئازار و کارەساتانە دواتر بووە هۆی دامەزراندنی خاچی سور بە ماوەیەکی کورت. ناپلیۆن لەناو جەرگەی شەڕەکاندا ناڵە و هاواری سەربازە نەخۆش و

برینداره‌كانی گوێبیست ده‌بوو، له‌ ئاست ئه‌م ئازارانه‌ نه‌یتوانی درێژه‌ به‌ شه‌ڕه‌كان بدات، ئه‌وه‌بوو دوودڵیی لێ په‌یدا بوو و توانای داگیركردنی بوندوقیه‌ی نه‌ما.

كافور كه‌ له‌م گۆڕان و نه‌چوونه‌ پێشه‌ بێتاقه‌ت و بێئومێد ببوو، به‌ ته‌واوه‌تیش دوای ئه‌وه‌ی پادشاكه‌ی رازی نه‌بوو بێت به‌شداریی فه‌ره‌نسا درێژه‌ به‌ شه‌ڕه‌كان بدات، هه‌روه‌ها قبوولكردنی په‌یماننامه‌ی زویرخ ناچار بوو به‌ ده‌ست له‌ كاركێشانه‌وه‌ ناڕه‌زایی و بێتاقه‌تی خۆی ده‌ربڕێت. به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش له‌ خه‌بات و هه‌وڵه‌كانی بۆ رزگاركردنی وڵات كۆڵی نه‌دا، هه‌ر خۆی له‌ دوای په‌رده‌وه‌ هێڵه‌ گشتییه‌كانی سیاسه‌تی سه‌ردینیای ده‌كێشا.

## یەکێتی ئیتاڵیای باکوور

هه‌ڵمه‌ته‌كانی فه‌ره‌نسا وێڕای به‌هاكانی زیانی مرۆیی زۆریشیان هه‌بوون، گه‌نجینه‌ی فه‌ره‌نسا ٤٢٠ ملیۆن فره‌نكی له‌م شه‌ڕانه‌ زیان لێ كه‌وت، له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا كافور به‌ هۆی په‌شیمانبوونه‌وه‌ی له‌ په‌یمانه‌كانی به‌رانبه‌ر به‌ سه‌ردینا رازی نه‌بوو نیس و سافوای به‌ فه‌ره‌نسا بدات، سه‌ره‌ڕای ئه‌مه‌ش ناوبانگی فه‌ره‌نسا له‌ ئیتاڵیا توشی له‌رزینێكی توند هات. له‌ ده‌ره‌وه‌ی ده‌سه‌ڵات كافور له‌ هه‌وڵی ئه‌وه‌ دابوو له‌ رێگه‌ی كۆن بالمرستۆن و رسل، كه‌ هه‌ردووكیان له‌لایه‌نگرانی دۆزی ئیتاڵیا بوون، له‌ ١٨٥٩ یه‌كه‌میان پۆستی سه‌رۆكوه‌زیران و ئه‌وی تریان وه‌زیری ده‌ره‌وه‌یان پێ سپێردرابوو، پشتگیرییه‌كی دیبلۆماسی له‌ ئینگلته‌را وه‌ده‌ست بێنێت، مه‌به‌ستێكی دووسه‌ره‌ی له‌م پشتگیرییه‌ هه‌بوو:

یان ئه‌وه‌تا هاوكارییه‌كانی ئینگلته‌را وه‌ده‌ست دێنێ، یا فه‌ره‌نسا له‌م كاره‌ توشی ته‌نگه‌تاوی ده‌بێت له‌ ترسی ئه‌وه‌ی ئینگلته‌را ده‌ست نه‌خاته‌ ناو كاره‌كه‌، ناچار ده‌بێت هاوكاریی بكات.

كافور سوودی له‌م گه‌مه‌یه‌ وه‌رگرت كاتێك سه‌رۆكوه‌زیرانی ئینگلته‌را دۆن مواربیه‌ رایگه‌یاند: "له‌سه‌ر نه‌مسایه‌ خاكی ئیتاڵیا جێبێڵێت، چونكه‌ هه‌موو گه‌لێك مافی خۆیه‌تی بڕیار له‌سه‌ر چاره‌نووسی خۆی بدات".

له‌ شوێنێكی تریش وتی: "ئینگلته‌را له‌ هه‌وڵی ئه‌وه‌دایه‌ تا ئیتاڵیا بكاته‌ وڵاتێكی به‌هێزی سه‌ربه‌خۆی ده‌ستووریی". هه‌ر چه‌نده‌ ئه‌م لێدوانانه‌ ته‌نیا وه‌كو ئاخاوتن مانه‌وه‌، به‌ڵام بۆ سه‌ردینیا سوودی هه‌بوو ئاستی دۆزه‌كه‌یانی به‌رزتر كردوه‌، كه‌ وه‌كو نه‌ته‌وه‌یه‌ك ده‌بێت گوێیان لێ رابگیرێت. له‌ ناوه‌وه‌ش كافور له‌ هه‌وڵی ئه‌وه‌ دابوو هه‌موو خاكه‌كانی ئیتاڵیای

باکوور بە سەردینیا بلکێنێت، بۆ ئەم مەبەستە ئاژاوە و گێرەشێوێنیی لە وڵاتەکانی باکوور نایەوە، بەبێ گوێدانە پەیماننامەی زویرخ خەڵکی شارەکانی فراری و بارم و مۆدینا و توسکانە و بۆلۆنای لە حکومەتەکان هاندا تا بەگژیاندا بچنەوە و شۆڕش هەڵگیرسێنن.

شۆڕش لە وڵاتەکان هەڵگیرسان و خەڵکەکە فەرمانڕەوا و حوکمرانەکانی خۆیان وەدەرنا، ئەنجومەنی دامەزراندنیان پێکهێنا و وڵاتەکانیشیان بە سەردینیاوە یەکخست. سەرەڕای دانانی ئینگلیز بەم یەکخستنە، بەڵام کافورمەبەستی دانانی فەرەنساش بوو بۆ ئەوەی هەم لێی زویر نەبێت و هەم نەکەوێتە لایەنگریی نەمسا، دواتر لە داهاتوش پێویستیی بە تواناکانی فەرەنسا دەبێ. لە ژێرەوە لەگەڵی رێککەوت، کە ئەو خاکانەی مەبەستیەتی بیداتێ، لە بەرانبەر ئەمەدا فەرەنسا پشتگیریی سەردینیا بکات لە یەکگرتنەوەی هەندێک ناوچەی باکووری ئیتاڵیا.

ئەو ساتەی کافور هاتەوە سەر حوکم بە ئاشکرا کاری بۆ سیاسەتەکەی کرد، لە هەر سێ ناوچە ریفراندۆم کرا: بارم و مۆدینا و توسکانە، هەروەها لە مومتەلەکاتەکانی پاپا، ئەنجامەکان بە زۆرینەی رەهاوە دەنگیان بۆ یەکگرتنەوە لەگەڵ سەردینیا دا. بە پێی پەیماننامەیەک، کە لە پاریس و سەردینیا لە ١٢ی ئاداری ١٨٦٠ بەسترا، سەردینیا دەستی لە خاکەکانی نیس و سافوای هەڵگرت بۆ فەرەنسا، ئەمەش بە ریفراندۆمێک چەسپا.

بەم شێوەیە سەردینیا هەموو خاکەکانی باکووری ئیتاڵیای دەگرتەوە جگە لە بوندوقیە نەبێت، پاپاش چوار لەسەر پێنجی خاکەکانی خۆی لەدەست دا، بۆیە مافی ئەوەشی نەما سەرۆکایەتی یەکێتیی وڵات و میرنشینەکانی ئیتاڵیای پێ بسپێردرێت.

## هەردوو سقلیە دەخرێنە سەر سەردینیا

کافور هەنگاوێکی مەزنی رووەو ئازادی و رزگاری بە وڵاتەکەی نا، هەرچەندی تەگەرە هەبن پێویست بەوە ناکات لە نیوەی رێگا بووەستێت، ئەم هەنگاوانەش دەبووایە بهاوێژرێن بۆ ئەوەی سقلیەش یەکبخرێت، بەڵام بوونی دەسەڵاتێکی بەهێزی خانەوادەی بۆربۆن لە بەردەم ئەم ئەرکە رێگر بوو. نیشتمانپەروەران هەلێکیان بۆ رەخسا توانیان سوودی لێ وەرگرن، ئەویش لە ١٨٥٩ پادشای ناپۆلی کۆچی کرد و کوڕەکەی فرانسوا هاتە شوێنی، ئەم کوڕەی لاواز و بێتوانا و نەشارەزا بوو لە کاری حکومڕانی، بە هۆیەوە ئاژاوە

بڵاو بۆوە، لە ۱۸٦۰ شۆڕشێکی گەلەری لە دوورگەی سقلیە بەرپا بوو و زۆر بە دڕندانە لەناوی برد. لە بەرانبەر هاوار و بانگەوازی یاخیبووەکان گاریباڵدی و دۆستەکانی لە کۆمەڵەی ئیتاڵیای گەنج دوودڵیان نەکرد و بە هانایانەوە چوون، هەزار گەنجی خوێنگەرمیان بۆ کۆکردنەوە و کراسی سوریان لە بەرکردن، کە دواتر هەر بەم ناوەشەوە ناسران. هەندێک کۆنە چەکیان بۆ پەیدا کردن و لە ٥ی ئایار بە پێزانین و رەزامەندی کافور لە جەنەوا لە دەریایان پەڕاندنەوە. لە سقلیە دابەزین و لەوێش تیپی ئازادیخواز و نیشتمانپەروەرانیان لێ کۆبوونەوە و هێرشیان بردە سەر شارەکان، هەر زوو شاری پالێرمۆی پایتەختیان داگیر کرد و حکومەتێکی کاتیان دامەزراند، لەوێشەوە بۆ وشکاییەکانی ئیتاڵیا خۆیان ئامادەکرد تا ناپۆلیی پایتەخت داگیر کەن.

لەم ساتە کافور ڕووبەڕووی ئەرکێکی قورس بووەوە، گاریباڵدی، کە بە سەرکردەیەکی توندڕەوی نیشتمانپەروەری خاوەن لایەنگریەکی پانی جەماوەر ناسرا بوو، رۆژێک لە رۆژان کاری حکومڕانیی بە کردار بەجێ نەگەیاند بوو، بۆیە لە سیاسەتی ستراتیج و دووربینیدا بێئەزمون بوو. دەبووایە کافور هەردەم رێنمایی بکات بۆ ئەوەی بەپێی بەرژەوەندییە دەوڵەتییەکان رەفتار بکات، ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو. ئەو کاتە هێشتا سۆزی ئینگلتەرا نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی دان بە یەکگرتنی سەردینیا و باشووری ئیتاڵیا بنێ، ئەمە هەمان هەڵوێستی فەرەنساش بوو، بۆیە کافور ناچار بوو لە دەرەوە و بە ئاشکرا ناڕەزایی خۆی لە سیاسەتەکانی گاریباڵدی ئاشکرا بکات، بەتایبەت دەستدرێژیەکەی کردیە سەر فراسوا، کە پادشایەکی شەرعی بوو، لە دڵیشەوە لە هەنگاوەکانی رازی بوو و بۆچوونەکانیان، کە ئاراستەی رزگارکردنی باشووری ئیتاڵیا بوون، یەکیان دەگرتنەوە. لە کاتێکدا لە دەریاوە لەشکرێکی نارد بۆ رێگەگرتن لە لەشکری گاریباڵدی تا سقلیە داگیر نەکات، لەژێرەوەش بە فەرماندەکانی وتبوو دەست نەخەنە بەر کاری گاریباڵدی. ئەوەبوو سوپای گەلەری توانیان لە بەنداوی مسینا، کە سقلیە و باشووری ئیتاڵیای لێک جیا دەکردەوە، بپەڕینەوە و لە ۲۰ی ئاب لە کەنارەکان دابەزین، لە ۹ی سێپتەمبەریش دەستیان بەسەر ناپۆلیی پایتەخت داگرت، لەوێ کۆتاییان بە سەردەمی بۆربۆن هێنا. بەم شێوەیە نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕەکان وڵاتە مەزنەکانیان خستە بەردەم دیفاکتۆ، باشووری وڵات کەوتە ژێر دەستی خۆیان. ئینگلتەرا لە رای خۆی پەشیمان نەبووەوە و دانی بە یەکێتیی

باکوور و باشووری ئیتاڵیا نەنا، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت فەرەنسا بەنیازە تاجی پادشایەتیی ناپۆلی بدات بە ئەمیرێکی فەرەنسی، ئیتر ململانێکە کەوتە نێوان هەردوو وڵاتە مەزنەکە، ئەمەش لە بەرژەوەندیی کافور دابوو.

## گرتنەخۆی خاکەکانی پاپا

بە سەرکەوتنەکانی گاریباڵدی ماندووبوون و خەتەرناکیی زۆر بۆ کافور دروست بوون، فەرماندە سەرکەوتوەکە زوو راینەگەیاند، کە دێتە پاڵ باکوور و باشوور سەرەڕای ئەوەی بەردەوام دڵسۆزیی خۆی بۆ پادشا عەمانوئیل دەردەبڕی. بەڵام بە هۆی ئەوەی دەستی لە نیس هەڵگرتبوو بۆ فەرەنسا، کە شوێنی لە دایک بوونیەتی، بەهۆیەوە لە پادشا زویر بوو دووبارە بە بەژن و باڵای کۆماریخوازانی هەڵدەدایەوە. کافور لەوە دەترسا لەژێر کاریگەریی سەرکەوتنەکان و یاوەرانی لەلایەنگرانی هەڵگری بیری مازینی، کۆماری باشوور رابگەیەنن، لەم حاڵەتەدا دەرفەتەکانی یەکگرتنەوەی هەردوو پارچەکە کەم دەبنەوە و ژیانی پادشا لە باکوور دەکەوێتە مەترسی، لە کاتێکدا کافور تا سەر ئێسقان پابەندی پادشا و رژێمەکەی بوو. ئەمەو گاریباڵدی دواتر رایگەیاند، کە بەردەوام دەبێت لە شالاوەکانی بەرەو ناوەڕاست تا هەموو ئەو خاکانەی لەژێر دەسەڵاتی پاپایە دەریان دەهێنێت، ئەم ئارەزوانەی گاریباڵدی ڕاستیەکانیان لەبەر چاوی کافور ون کردن. ئەگەر ئەم پیاوە بەرەو ناوەوە هێرش بەرێت یەکێتیی ئیتاڵیا لەناو دەچێت، دواتر لە دەستبەسەرداگرتنی زەویەکانی پاپا کاسۆلیکەکانیش لە هەموو دونیا لێی دەتۆرێن و لەوێش لەگەڵ هێزەکانی پاراستنی فەرەنسی دەکەونە لێکدان، دواتر کەس ناتوانێ مەزندەی ئەوە بکات کە چی روودەدات.

بەر لەوەی گاریباڵدی کارێکی گەوج بکات و کارەکان لە دەست دەرچن کافور بڕیاری دا شتێك بکات بۆ ئەوەی بچێتە باشوور و لە وێ گاریباڵدی تێبگەیەنێت، کە کاری وا نەکات و دەبێت بە زەویەکانی پاپادا بڕوات، دیارە پاپاش ئەمە قبووڵ ناکات، بۆیە بیری لەوە کردەوە هانا بۆ ناپلیۆنی سێیەم دۆستی دێرینی بەرێت. ئەم جارەیان ناپلیۆن بەخیلیی نەکرد و بە هانای ئیتاڵییەکانەوە چوو و رێگەی بە کافور دا بە زەویەکانی پاپادا بڕوات، تەنانەت ئەگەر بوو بە شەڕیش، بەڵام بە مەرجێک زۆر بە خێرایی ئۆپەراسیۆنەکە ئەنجام بدات تا گەلی کاسۆلیکی فەرەنسا لە رووداو بمێنن.

هێزەکانی سەردینیا بە بیانووی لەناوبردنی یاخیبووەکان لە شاری مارچ و ئۆمبریا زۆر بەخێرایی چوونە ناو خاکی پاپا و لەگەڵ خۆبەخشکارانی پاپەوی لە ١٨ی سێپتەمبەر ١٨٦٠ بە گژ یەکدا چوون، کە بەرگریەکی زۆریان دەکرد.

ئەو کاتەی هیزەکانی سەردینیا گەیشتنە باشوور نیشتمانپەروەرایەتیی گاریباڵدی بەسەر هەموو فاکتەرەکاندا زاڵ ببوون، بەخێرهاتنی باکووریەکانیان کردن و سڵاویان بۆ پادشا عەمانۆئیل هەبوو وەکو پادشای ئیتاڵیا، بەم شێوەیە باکوور و باشووریان خستنە پاڵ یەک لەژێر دەسەڵاتی پادشا، کافوریش ئەمەی مەبەست بوو.

هەر زوو ریفراندۆمێک لە باشوور و لەو شوێنانەی لە خاکە دابراوەکانی پاپا ئەنجام درا، زۆرینەی دەنگەکان لە بەرژەوەندیی یەکخستنی باشوور لەگەڵ سەردینیا بوو. لە ١٨ی شوباتی ١٨٦١ عەمانۆئیل لە خانەوادەی سافوای وەکو پادشای ئیتاڵیا (بە ڕێپێدراوی خوا و ویستی میللەت) ڕاگەیەندرا، بەڵام چارەنووسی ستەمکار واهات کە کافور دوای ئەم ڕووداوە ئەوەندە نەژیا لە ٦ی حوزەیرانی ١٨٦١ کۆچی دوایی کرد.

## رزگارکردنی بوندوقیە

ئیتاڵییەکان توانیان بەشی زۆری خاکی نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا لە دەرەوەی دەسەڵاتی نیشتمانیی یەکگرتوو رزگار کەن، ئەوەی سەیر بوو ئەو ناوچانەی لە دەرەوەی دەسەڵاتی یەکگرتووی نیشتمانی دابوو ناوچە گرنگ و خۆشەویستەکان بوون، رۆما لەژێر دەسەڵاتی پاپا مابووەوە، کە بە پاسەوانێتیی فەرەنسا پارێزرا. رۆما لە شارە هەرە دێرین و پیرۆزەکان بوو و پایتەختی ئیمپراتۆرە رۆمانییەکان بوو، هەروەها شاری دوو پێغەمبەرە پیرۆزەکە بوو، بەترۆس و پۆلس و گەوهەری نیمچە دوورگە. ئەوەی لەژێر دەستی دەسەڵاتی نەمسا مابووەوە بوندقیە بوو، کە جوانترین شاری ئیتاڵیایە و دوای رۆما بە دێرینترین شاری ئیتاڵیا دەژمێردرێت لە رووی شارستانی و کەلتووری ئیتاڵیا و لە مەزنترین شارەکانی ئەوروپا دەژمێردرێت لە چەرخی ناوەڕاست. دواتر خاکی پترۆڵ شارەکانی تەرسینا و ئیستریاش لەژێر چنگی نەمسا مابوونەوە، حکومەتی ئیتاڵیا ئەمانەی لە بیر نەدەکردن، بەڵام لە بێتواناییدا بێدەنگیی هەڵبژارد بە ئومێدی گۆڕانی فاکتەری کات.

کە پەیوەندییەکانی نێوان بروسیا و نەمسا تێک چوون و لەسەر لێواری شەڕدابوون لە ١٨٦٦ هەردوولا بەدوای هاوپەیمانێک دەگەڕان، ئیتاڵیا ئەم دەرفەتەی بە هەل وەرگرت

بۆیە لە دەوری هەردووکیان دەخولایەوە تا لە کۆتایی بە گەرەنتیی ناپلیۆن لەگەڵ بڕوسیا ڕێککەوتن. بەندەکانی ڕێککەوتن دەڵێن "بڕوسیا لەگەڵ ئیتاڵیا ڕێککەوت، کە هەرکاتێک لەگەڵ نەمسا کەوتە شەڕ ئیتاڵیا هاوکاریی سەربازیی بکات. ئەگەر سەرکەوتن، ئەوا بڕوسیا لە رزگارکردنی بوندقیەدا هاوکاریی ئیتاڵیا بکات." هەر واش بوو کاتێک شەڕ رویدا نەمسا شکستی هێنا، لە پەیماننامەی ئاشتەوایی لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە نەمسا واز لە بووندقیە بێنێت بۆ فەرەنسا، فەرەنساش بە دەوری خۆی دەیکاتە دیاری بۆ ئیتاڵیا.

## رۆما پایتەختی ئیتاڵیا

ئیتاڵییەکان بۆ رازاندنەوەی سەرکەوتنەکانیان لە رێوڕەسمی یەکگرتن پایتەختیان گواستەوە رۆمای شاری نەمر، بەڵام بوونی هێزی پاراستنی فەرەنسا لە رۆما رێگر بوو. لە ١٨٧٠ دەرفەت رێکەوت کاتێک شەڕ لە نێوان بڕوسیا و فەرەنسا روی دا، بە هۆی پێویستیەکانی هێزی سەربازیان فەرەنسا هێزەکانی خۆی لە رۆما کێشایەوە، ئەوکاتە هەموو ئەوروپییەکان بیریان لای سەلامەتیی پاپا بوو. ئیتر دەرفەت بوو بۆ ئیتاڵیا پادشا، ئەوەبوو عەمانۆئیل وەکو پادشای ئیتاڵیا رۆمای بە پارچەیەک لە خاکی ئیتاڵیا راگەیاند، بۆ سەلامەتیی پاپاش هێزەکانی خۆی گەیاندنە ئەوێ. بۆ ئەوەی سیمایەکی یاسایی بە مەسەلەکە بدەن ریفراندۆمێکیان لە شاردا ئەنجام دا و بە رێژەی **٩٩%** دەنگیان بۆ هەنگاوەکانی پادشا دا، بەم شێوەیە کۆتایی بە دوایین دەوڵەتی ئایینی لە ئەورووپا هات.

ئەم رووداوە لەیەکدابڕانێکی لە نێوان پاپا و حکومەتی ئیتاڵیا دروست کرد تا ساڵی ١٩٢٩ درێژەی کێشا تا ئەو کاتەی پەیماننامەیەک لە نێوان هەردوو لایەن لە سەردەمی مۆسۆلینی ئیمزا کرا بە ناوی پەیماننامەی (لاتران)، بە پێی ئەم رێکەوتننامەیە هەندێک گەرەک لە دەوروبەری کەنیسەی پیرۆزی پەترۆس بە پاپا دران و دانیش بە دەوڵەتی پاپا لە فاتیکانی سەربەخۆ نرا.

ناوچە کانی تریش وەکو تیرۆڵ و تریست بە خاکی نیشتمانی دایک لکێنران، بەم شێوەیە لە ١٩١٩ کۆتاییان بە قۆناغەکانی یەکێتیی ئیتاڵیا هێنا دوای ئەوەی ئیتاڵیا بەسەرکەوتوویی لە شەڕەکانی جەنگی جیهانیی یەکەم دەرچوو.

# بەشی شەشەم

## یەکێتیی ئەڵمانی

- جەنگی روسیا- دانیمارک
- جەنگی روسیا- نەمسا
- جەنگی ئیمپڕاتۆریەتی ئەڵمانی
- کۆماری سێیەمی فەرەنسی

## یەکێتیی ئەڵمانی

لە میانی باسکردن لە یەکێتیی ئیتاڵیا وتمان کۆنگرەی ڤیەننا بە رۆحیەتی مەترنیخی ستەمکار و زۆردار چارەسەری کێشەکانی ئیتاڵیای کردبوو، بە هەمان گیان و دوور لە دادپەروەری و گیانی ئازادیخوازانە چارەسەری کێشەی ئەڵمانیای کردبوو. ئەم کۆنگرەیە کاتێک کێشەکەیان خستە روو بە زۆر دامەزراندنی یەکێتیەکی جێرمانیان بەسەر وڵاتە ئەڵمانییەکاندا سەپاند، ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتی جەرمانیدان، ئەم یەکێتییە ئیمپراتۆریەتی نەمساشی گرتەوە. بە هەوڵی مەترنیخ ئەو یەکێتییە کەوتە ژێر دەسەڵاتی نەمسا، مەترنیخ ئەمەی بۆ ئەوە بوو رێگە لە بەردەم بروسیا بگرێت سەرۆکایەتیی ئەڵمانیا بکات، کۆنگرەی ڤیەنناش بڕیاریدا نەمسا سەرۆکی هەمیشەیی یەکێتیەکە بێت. گرنگترین وڵاتەکانی یەکێتی بریتی بوون لە نەمسا، بروسیا، باڤاریا، سەکسۆنیا و ڤۆرتنبێرگ. بڕیار درا ئەنجومەنێکی یەکێتی پێک بێنن، کە هەموو وڵاتەکان تیادا نوێنەریان هەبێت، ناونرا (دیات) بارەگاکەشی بووە فرانکفۆرت، ئەرکی ئەم ئەنجومەنەش یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوان وڵاتەکان بوو.

بەڵام ئەم ئەنجومەنە بێکار و لاواز بوو،هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوو، چونکە یەکێک لە بڕگەکانی بڕیاردان بە شێوەی گشتی دەبێت، ئەمە خۆی کێشەی دروست کردبوو، چونکە ئاسان نەبوو ٣٧ وڵات بە بەرژەوەندیی جیا و بۆچوونی جیاوە لەسەر بابەتێک کۆک بن، هەر بۆیە بڕیارەکانی ئەنجومەن وەکو راسپاردە بوون نەک وەکو بڕیار. ئەوەی ڕاستی بێت ئەو کاتەی نەمسا یان ئەڵمانیا مەبەستیان بووایە بڕیارەکان دەبوونە بڕیار و دەبووایە جی بەج ێ بکرابان، ئەمە چونکە خاوەنی سەنگ و هێزی زبەلاح بوون، بەڵام ئەگەر بڕیارەکان لە بەرژەوەندیی وڵاتە بچووکەکان بووایە، ئەوا دەبوونە راسپاردە. بەم شێوەیە هەریەک لە وڵاتەکان شوێنیکی تایبەتیی هەبوو، کە هەموویان لە یەک ئاستدا نەبوون. نەمسا مەبەستی بوو بە هەر شێوەیەک بێت یەکێتیەکە بپارێزرێت. چونکە خۆی لەم رێگەیەوە دەسەڵاتی بەسەر هەموو وڵاتە جێرمەنییەکانەوە هەبوو، دواتر مانەوەی یەکێتیەکە مانەوەی بروسیایە لەژێر دەسەڵاتی نەمسا، جگە لە مەسەلەی یەکگرتنەوەی ویلایەتە ئەڵمانییەکان هەر بەدەستی نەمسا دەبێت، کە هەرگیز رێگە بە ئەنجامدانی نادات. بەڵام بروسیا دەیویست ئەم کۆتە بشکێنێت، کە کۆنگرەی ڤیەننا

بەسەریدا سەپاندووە، تا ئەم یەکێتیە مابێ دەبێت نەمسا بەسەریدا بالا دەسەلات بێت، ئەویش لە دەستێوەردانی وڵاتەکانی ئەڵمانیا بەدوور دەبێت. مەسەلەیەکی تری گرنگ ئەوەبوو، کە بروسیا بە هۆی مەزنی و بەهێزیەوە خۆی لە بەرانبەر چارەنووسی ئەڵمانیا بە بەرپرسیار دەبینی، لە ئاست یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا خۆی بەرپرسیار بوو و ئەمەی بە ئەرکی خۆی دەزانی. نەمسا بە پێچەوانەوە کارەکانی دەبینی، هەر کاتێک یەکێتیەکە بە ئەنجام بگات هەڕەشە لە ئیمپراتۆریەتی نەمسا دەکرێ، لای نەمسا یەکێتیی ئەڵمانیا ئەوە دەگەیەنێت، کە ٢٠% دانیشتووانی وڵاتەکانی جێرمانی نەمسایین و بەم پرۆسەیە لە دەستیان دەدات، دواتر هانی گەلەکانی تری ژێر دەسەلاتی نەمسا دەدات داوای سەربەخۆیی بکەن. بە هەموو ئەو هۆیانەی کە باسمان کردن لە حاڵەتی دروستبوونی ئەڵمانیایەکی یەکگرتوو مەترسی لە نەمانی دەسەلاتی نەمسا لە ئەورووپای ناوەڕاست نزیک دەبوو، هەر ئەمەش هۆکاری راستەوخۆی ئەوە بوو، کە نەمسا حەزی لە بیستنی ئەم بیرۆکە بێت. ئەگەر ئەو پیاوە بەهێزە لە بروسیا هەڵنەکەوتبا، کە ناوی بسمارک بوو، چاوەڕوانی هەوڵەکانی نەمسا بوون بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکە لە بەرژەوەندیی خۆیا.. ئەم پیاوە توانیی هەوڵە کۆنە پەرستەکانی نەمسا هەرەس پێبێنێت و گەلی ئەڵمانیا بەرەو یەکگرتن بەرێت.



بسمارک

## بسمارک

بسمار لە ١٨١٥ لە براندبۆرگی بڕوسیا لە دایک بووە، سەر بە خێزانێکی ئۆروستوکراتیی دێرین و کۆنەپارێزی بڕوسی بوو، بە نەریتی سەربازی و دڵسۆزیی بۆ پادشا پەروەردە بووە. وانەکانی لە بەرلین وەرگرتوون، دواتر چۆتە خوێندنی دادوەریی و ماوەیەکیش کاری پێوە کرد، دواتر دەگەڕێتەوە شارەکەی و کار لەسەر زەوی و زاری خێزانەکەی دەکات. تا ساڵی ١٨٤٩ کە بە نوێنەری هەرێمەکەی بۆ ئەنجومەنی نوێنەرایەتی هەڵدەبژێردرێت، ڕۆڵی بەرچاو لە گوتارخوێندنەوە دەگێڕێت، دواتر بە نوێنەرایەتیی وڵاتەکەی لە ئەنجومەنی فرانکفۆرت دادەنرێت، واتە ئەنجومەنی یەکێتی.

بسمارك پیاوێکی بەهێز و بەتوانا بوو، دڵسۆزیی بۆ پادشایەتیی ڕەها و ستەمکار هەبوو، بە ڕادەیەک بڕوای بەوە نەبوو گەل بەشداری لە حکومڕانی بکات. ئەم

خەسڵەتانەی بوونە هۆکاری ئەوەی پادشا بە باڵوێز لە روسیا و دواتر لە فەرەنسای هەڵبژێرێت، تا ساڵی ١٨٦٢ پۆستی سەرۆکوەزیرانی پێ دەسپێردرێت.

لەم ساڵەدا لەسەر بوودجەی تەرخانکراو بۆ سەربازی ناکۆکی کەوتە نێوان پادشا و پەرلەمان، چونکە دەنگیان بۆ بوودجەکە نەدەدا، کارەکان بە رادەیەک ئاڵۆز بوون گەیشتە ئەو ئاستەی پادشا وازهێنانی خۆی بخاتە بەردەمیان، بەڵام بسمارک توانیی پێی بکێشێتەوە بە گفتی ئەوەی دەتوانێت داخوازیەکانی لەم بوارەدا جێبەجێ بکات. دواتر کاروباری سوپای بە شێوەیەک رێکخست و بەڕێوەی برد، کە ئەنجامەکانی پێکا و قەیرانەکەشی رەواندەوە.

## ئامانجی بسمارک

بسمارک هاتە سەر دەسەڵات بە بەرنامە و ئامانجی دیار و دیراسەکراوی زانستیانەوە، بە دیدی بسمارک ئامانجی هەر حکومەتێکی بروسی دەبێت یەکێتی ئەڵمانیا بێت، چونکە مەزنی پایەی بروسیا لە ئەڵمانیا ئەمەی بەسەردا دەسەپێنێت. ئەگەر بروسیا ئەمە ئەنجام نەدات، ئەوا ئەو یەکێتییە لە دایک نابێت.

بە دیدی بسمارک دوو ناحەز لە بەردەم ئەو یەکێتیەدا هەن، کە دەبێت شکستیان پێ بهێنرێت، ئەوانیش نەمسا و فەرەنسان، بۆیە بروسیای ئامادە دەکرد بۆ هەردوو جەنگەکە، یەکەمیان دژی نەمسا و ئەویتریان دژی فەرەنسا.

## کێشەی شلزوینگ و هۆڵشتاین

لەوکاتەی بسمارک دەسەڵاتی گرتبووە دەست شارەزایی لە بواری دوژمنداریتی نەمسا بۆ یەکێتی ئەڵمانیا هەبوو، دڵنیا بوو لەوەی ئەم کێشەیە لە رێگەی وتووێژ و دانیشتن ناگاتە هیچ ئەنجامێک، چونکە مەسەلەکە دژایەتیەکی بنەڕەتیی هەیە و پەیوەندیی بە بەرژەوەندیەکانەوەیە. بۆیە بسمارک بروسیای بۆ شەڕێک ئامادە دەکرد، ئەو دەرفەتیش ئەوکاتە هاتە پێش، کە کێشە لە نێوان نەمسا و بروسیا لەسەر هەردوو هەرێمی شلزوینگ وهۆڵشتاین لە ١٨٦٦روویان دا. لە ساڵی ١٨٦٤ ناکۆکیەک لە نێوان دانیمارک و ئەڵمانیا لەسەر مافی خاوەندارێتی لەم دوو هەرێمە رووی دا، ئەم ناکۆکییە بووە هۆی

دروستبوونی شەڕ لە نێوان دانیمارک لە لایەک بڕوسیا و نەمسا لەلایەکی تر، بە دۆڕاندنی دانیمارک کۆتایی بەشەڕەکە هات. هەردوو هەرێمەکەش لە نێوان نەمسا و بڕوسیا دابەش کران. هۆلشتاین درا بە نەمسا و شلزوینگ لەگەڵ شاری کیال دران بە بڕوسیا. دواتر بڕوسییەکان دەستیان بە لێدانی ئەو کەندرە کرد، کە دەریای باکوور بە دەریای بەلتیک دەبەستێتەوە. نەمسا ئەمەی وەکو بەهێزکردنی کەشتیگەلی بڕوسی و زیاد کردنی دەسەڵاتی بڕوسیا لەسەر حسابی نەمسا دەبینی، کاری بۆ وەدەستهێنانی بەشێك لە قەرەبوو کرد لە بری ئەو دەستکەوتانەی بڕوسیا وەدەستی هێناون بە تایبەتی لە سیلیزیا.

بسمارک لە سیماکان بۆی دەرکەوت، کە کێشەی دوو میرنشینەکە بە جەنگ نەبێت چارەسەر ناکرێ، نەک تەنیا ئەو کێشەیە بە جەنگ چارەسەر دەکرێت، بەڵکو کێشەی چارەنووسی یەکێتیی ئەڵمانیاش لەگەل خۆی چارەسەر دەکات، چونکە بڕوای زۆری بە سوپای بڕوسیا هەبوو شکست بە لەشکرەکانی نەمسا بێنێت. هەموو ئەوروپییەکان هەستیان بە نیشانەکانی جەنگ دەکرد کە بەڕێوەیە، هەر بۆیە خۆیان بۆ ئامادە کرد. لە کۆتایی مانگی شوباتی ١٨٦٦ ئەنجومەنی وەزیرانی ئەڵمانیا بۆ هەڵسەنگاندنی تواناکانی ئەڵمانیا و ئەگەرەکانی سەرکەوتن کۆبوونەوە. سەرۆکی باڵای سوپا جەنەرال ڤۆن مۆلتکە راکانی خۆی بەڕوونی خستەبەردەم ئەنجومەنەکە و وتی: "بڕوسیا بەتەنیا ناتوانێ شکست بە نەمسا بێنێت، بۆ ئەم مەبەستە دەبێت لەگەڵ ئیتاڵیا هاوپەیمانێتیەک ببەستین بۆ ئەوەی لەو حاڵەتەدا ئیتاڵیاش سێ یەکی نەمسا سەرقاڵ بکات، بەم هۆیەوە دەرفەتەکانی سەرکەوتن زیاتر دەبن".

لەو کاتەوە بسمارک هەوڵەکانی بۆ بەستنی هاوپەیمانێتییەک لەگەڵ ئیتاڵیا چڕتر کردن، لە لایەکی تریشەوە کاری بۆ نانەوەی ئاژاوە لەگەڵ نەمسا دەکرد تا بیوروژێنێت، و بڕوسیاش لە بەرچاوی ئەوروپییەکان بە ئاژاوەگێڕ نەیەتە بەرچاو.

یەکەم کار لەم بوارە ئەنجامی دا، لە ئەنجومەنی دیاتی خواست نوێنەری حکومەتەکان وەکو نوێنەری نەتەوەکانیان حسابیان بۆ بکرێت (هەرچەندە ئەمە لەگەڵ بۆچوونەکانی بسمارک یەکیان نەدەگرتنەوە). مەبەستی ڕاستەقینەشی لەم داخوازییە ئەوە بوو تا بڕوسیا بە سیمایەکی شارستانی بێتە بەرچاو و نەمساش بە وڵاتێکی دژی

داخوازیەکانی گەلان و دیموکراسی و وەکو وڵاتێکی کۆنەپەرست بناسرێت. بە مەزندەی بسمارک کاتێک ئەم پێشنیارە دەخرێتە بەردەم ئەنجومەنی دیات نەمسا بە هەموو توانایەکییەوە دژی دەوەستێت و لە ئەنجامدا بەگژ پروسیادا دێتەوە، ئەوەش مەبەستەکەی بسمارک بوو. بەر لەوەی بچینە ناو ناوەڕۆکی جەنگ، با هەڵوێستی وڵاتە ئەوروپییەکان لەمەڕ ئەم کێشە ئاماژە پێبدەین.

**ئینگلتەرا:** هەڵوێستی بەریتانیا لەم کێشەیە بە هۆی ئەوەی هیچ بەرژەوەندییەکی لە ئەوروپای ناوەڕاستدا نەبوو هەڵوێستی تەماشەوانی وەرگرت، بە شێوەیەکی گشتی ئەمە هەڵوێستەکەی بوو. بەڵام لای بەریتانیا گرنگیەکی تریشی هەبوو، کە نەیدەویست وڵاتێک بەسەر وڵاتێکی تردا زاڵ بێت و لە ئەنجامدا پارسەنگی هێزی وڵاتە ئەوروپییەکان تێک بچێت.

بەهەرحاڵ نارەزاییەکەی بەریتانیا لە ئاستی نارەزایی دیبلۆماسیانە رەتیان نەکرد، کارەکانی نەگەیاندە ئەو ئاستەی بە لەشکرکێشی دەست بخاتە ناو کێشەکە، تا دۆخەکان لە بەرژەوەندیی خۆی وەرچەرخێنێت.

**ئیتاڵیا:** ئیتاڵیاش هیچ بەرژەوەندیەکی لە ئەوروپای ناوەڕاستدا نەبوو، هەرچەندە لای ئەو ئەوەندە گرنگ نەبوو دەست لە کاروباری ئەو ناوچەیە وەربدرێت، بەڵام لاریی نەبوو ئەڵمانیایەکی یەکگرتووی بەهێز لەسەر سنووری نەمسا دروست بێت، کە مایەی هەڕەشە بێت، بەڵکو لە رەفتارە ستەمکاریەکانی کەم دەکاتەوە. لە روویەکی ترەوە مەسەلەیەکی هاوبەش هەیە لە نێوان نەمسا و ئیتاڵیا، ئەویش کێشەی بوندوقیەیە. ئیتاڵیا هەردەم ئامادەیە لە پێناویدا هەم سازش وهەم شەڕ بکات، بۆیە رایگەیاند لە پێناو وەدەستهێنانی بوندوقیە ئامادەیە هەردەم پشتگیری لە پروسیا بکات دژی نەمسا.

**روسیا:** لەوکاتەی بسمارک جڵەوی دەسەڵاتی لە پروسیا گرتۆتە دەست ویستویەتی تەوەرێک لە نێوان روسیا و پروسیا دروست بکات، بەهۆیەوە روسیا ببێتە هاوپەیمانیکی ڕاستەقینە و هەمیشەیی بۆ چەند مەبەستێکی گرنگ، چونکە روسیا هیچ چاوبڕینێکی لە ئەوروپای ناوەڕاست نییە، تەنیا چاوی بڕیوەتە ناوچەی بەلکان، دیارە کە پروسیاش چاوی لە ناوچەی بەلکان نییە و چاوی تەنیا لە ئەوروپای ناوەڕاستە. ئەم رواڵەتانە بوونەتە هۆی بەردەوامی دۆستایەتی وهاوپەیمانێتیی پروسیا و روسیا، چونکە

بەرژەوەندییەکانیان لە هیچ شوێنێک لەگەڵ یەک دژ نین. بە هەوڵەکانی بسمارک پرۆسیا و روسیا هاوکاری یەک بوون، کاتێک کێشە و شەڕ کەوتە نێوان پرۆسیا و نەمسا روسیا هاتە پاڵ پرۆسیا.

**فەرەنسا:** ناپلیۆنی سێیەم سۆزی زۆری بۆ هەموو بزووتنەوە نەتەوایەتییەکان هەبوو، تەنانەت ئەگەر ئەڵمانیش بایە، بەڵام ئەم ئارەزووانەی لە بەرژەوەندیی فەرەنسادا نەبوون، دروستبوونی ئەڵمانیایەکی بەهێز مەترسی بۆ فەرەنسا دروست دەکات، لەم روانگەیەوە فەرەنسا پێی باش بوو لە ئەڵمانیا سێ یەکێتی دروستبن: یەکێتیی وڵاتانی باکووری ماین، یەکێتیی وڵاتانی باشووری ماین، یەکێتیی سێیەم وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی نەمسا و ناوچەکانی سوودێت بگرێتەوە. ئەگەر پرۆسیا بەم مەرجانە رازی بێت، ئەوا فەرەنسا ئامادەیە پشتگیریی بکات بەتایبەتی ئەگەر هاوپەیمانێتیی لەگەڵ ئیتاڵیا ئەنجام دا و گفتی رزگارکردنی بوندوقیەی بۆ دا. هەر چۆنێکی بێت فەرەنسا نایەوێت بەشداری لە شەڕەکان بکات، بۆیە هەڵوێستی بێلایەنیی هەڵبژارد.

## دانوستان

لەسەر ئارەزووی فەرەنسا و ئامۆژگاریی فەرماندە سەربازیەکانی پرۆسی دانوستان لە نێوان ئیتاڵیا و پرۆسیا دەستی پێ کرد، دوای دوودڵییەکی زۆر و پەیمان و ئامۆژگاریەکانی فەرەنسا بە پاراستنی لە هەر مەترسیەک، ئیتاڵیا هاوپەیمانێتیی لەگەڵ پرۆسیا ئەنجام دا، بەم شێوەیە هاوپەیمانێتی لە نێوان پرۆسیا و ئیتاڵیا لە ٨ی نیسانی ١٨٦٦ بۆ ماوەی ٣ مانگ ئیمزا کرا. بە هۆی ئەوەی ماوەکە کەم بوو لە بەردەم بسمارک، دەبووایە بەنهێنی پەلە لە کۆکردنەوەی لەشکر بۆ سەر سنووری نەمسا بکات. کاتێک نەمسا بەمەی زانی بەئاشکرا لەشکری کۆکردەوە و ئەوانەی لە سەربازیی وەدەرنابوون دووبارە بانگی کردنەوە، ئەمەش نارەزایی لێکەوتەوە و لە ئەوروپا نەمسا وەکو دەستدرێژکار هاتە ناسین. بەر لە دەستپێکردنی شەڕ بە مەبەستی هێورکردنی ئەڵمانییەکان نەمسا رایگەیاند، کە دەستی لە کاری هەردوو میرنشینەکە (دۆقیە) هەڵگرتووە، بەڵام بسمارک ئەمەی بە پێشێلکردنی رێکەوتنی گشتاین ناو برد، کە لە نێوان نەمسا و پرۆسیا ئیمزا کراوە. رێککەوتنەکە ماف دەداتە پرۆسیا شلزوینگ بخاتە سەر خاکی وڵاتەکەی و

هۆڵشتاینیش بە نەمسا بدات. نیشانەکانی شەڕ دەرکەوتن کاتێک ئەنجومەنی دیات کۆبووەوە و زۆرینەی وڵاتانی ئەڵمانیا دەنگیان بۆ نەمسا دا، بە تایبەت وڵاتە مەزنەکانی وەك: باڤاریا، وارتمبرگ، هانۆڤەر و ساکس.

## شەڕی نەمسا- روسیا

دوای ئەوەی شاندی بڕوسیا رایگەیاند ئەو یەکێتیەی راگەیاندراوە هەڵیدەوەشێننەوە، لە شەوی ١٤ - ١٥ی حوزەیرانی ١٨٦٦ شەڕ لە نێوان بڕوسیا و نەمسا هەڵگیرسا.

کاتێک شەڕ دەستی پێکرد نەمسا لەشکرێکی ٢٣٠ هەزاریی نارد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکری بڕوسیا و ١٤٠ هەزاریشی ناردە باشوور لە چاوەڕوانیی لەشکری ئیتاڵیا. لە ٣ی حوزەیران شەڕەکان لە نێوان سوپای نەمسا و بڕوسیا دەستیان پێکرد، ئەمەش بە شەڕی سادوا ناونرا، لەم شەڕەدا سوپای بڕوسیا سوپای نەمسای تێکشکاند. بەر لەوەی وڵاتە ئەڵمانییە هاوپەیمانەکانی نەمسا بتوانن هیچ هاوکارییەکی بکەن ئەم سەرکەوتنە بەدەست هات، لە هەمان کاتدا لە باشووریش ئیتاڵییەکان هێرشیان دەست پێکردبوو لە شەڕی کۆستۆزا، سەرەڕای زۆری ژمارەیان لەگەڵ ئەمەش ئیتاڵییەکان شکستیان خوارد. دەنگۆی شەڕی سادوا لە ئەوروپا دەنگی دایەوە، ئیتر دەبووایە دوای ئەو شەڕە وەکو وڵاتێکی مەزنی خاوەن هێز لە ئەوروپا حسابێک بۆ بڕوسیا بکرێت. ڕەنگدانەوەی ئەم شەڕە لە فەرەنسا زۆر کاریگەریی هەبوو، هەموو لایەک لە فەرەنسا هەستیان بە خەتەرناکی بەهێزبوونی بڕوسیا کرد، لێرە بەدەرکەوت بێلایەنیەکەی فەرەنسا لەم شەڕانە هەڵوێستێکی هەڵە بوو. لەم روانگەوە فەرەنسا بە پێویستی زانی ناوبژیوانیەک بکات لە نێوان هەر دوو لایەن، ئەم ناوبژیوانیەشی لەسەر داوای نەمسا پێی هەڵسا، بە تەواوەتیش بۆ ئەوەی بڕوسیا بەرهەمی یەکجارەکیی سەرکەوتنەکانی نەچنێ. بڕوسیا ئەم هەوڵەی فەرەنسای بە گرانی قبووڵ کرد، بە مەرجی ئەوەی هاوشانی ئەم ناوبژیوانیە ئۆپەراسیۆنی سەربازی و ئامادە کاری هەبن، ئەمەش خۆی داخوازیی وەزیری دەرەوەی فەرەنسا بوون، بەڵام ترس و دوودڵیی ناپلیۆن لەم ناوبژیوانیە وایان کرد پرۆسەکە بە شێوازێکی ناشتیانە بەڕێوە بچێت، تا کارەکەی بێسوود و کاریگەر کرد.

لە کۆتایی لە ئەنجومەنی وەزیرانی فەرەنسی لەسەر ئەم خاڵانە پێکهاتن، کە بیانخەنە بەردەم لایەنەکان:

١- سەلامەتی خاکی نەمسا بپارێزرێت جگە لە بوندوقیە.

٢- یەکێتیی جێرمانی، کە نەمسا پابەندیەتی، هەڵبوەشێندرێتەوە.

٣- ماف بە بروسیا بدرێت یەکێتیی جێرمانەکان دابمەزرێنرێت.

٤- ئەو وڵاتانەی دەکەونە خوار ڕووبار یەکێتی لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسا پێک دەهێندرێن.

٥- هەردوو میرنشینەکە (دۆقیە) بە بروسیا بدرێت.

بروسیا ئەم مەرجانەی قبووڵ کردن، چونکە مەبەستی نەبوو نەمسا رسوا بکات، پادشا و سوپا مەبەستیان بەئەنجامگەیاندنی یەکێتیەکە و فراوانبوون بوو لەسەر مافی خاکی نەمسا، بەڵام بسمارک توانیی رازیان بکات. پوختەی سیاسەتەکانی بسمارک بەئەنجامگەیاندنی یەکێتیی ئەڵمانیا بوو نەک رسوابوون و داگیرکردنی، لە کۆتاییدا لەسەر ئەم بنەمایانە ڕێککەوتنی ئاشتەوایی لە ساڵی ١٨٦٧ لە نێوان نەمسا و بروسیا ئیمزا کرا.

لە ١٢ی ئاب ئیتاڵیا پەیماننامەی ئاشتەوایی لەگەڵ نەمسا ئیمزا کرد، لەسەر بنەمای وازهێنانی نەمسا لە بوندوقیە بۆ فەرەنسا، ئەویش لەلای خۆیەوە بە دیاری دەیداتەوە ئیتاڵیا.

بە پێی ئەم پەیماننامانە ئەڵمانیا هەنگاوی باشی بەرەو یەکێتی نا، بەو پێیە ئەڵمانیا بەسەر سێ ناوچەدا دابەش بوو، یەکێتیی ماین بروسیا سەرۆکایەتیی دەکات، یەکێتی باشووری ماین کە کاریگەری لایەنگرانی فەرەنسا بەسەریەوەیە، دواتر بەشێک، کە نەمسا دەسەڵاتی بەسەریەوە دەبێت. ئاوها بسمارک توانیی چۆک بە نەمسادا بدات و بەرەو یەکێتی هەنگاوی باش بنێت بە نەهێشتنی یەکێتیی جێرمان.

## ڕەنگدانەوەی لە فەرەنسا

فەرەنسییەکان هەر لە رۆژی شەڕی سادواوە هەستیان بە خەتەرناکی سەرکەوتنەکانی بروسیا دەکرد، هەموو چوونەپێشێکی بروسیا مەترسی بۆ فەرەنسا زیاد

دەبن، ئەوەی زیاتر ئازاری فەرەنسییەکانی دەدا وەبیرهاتنەوەی ئەو کاتەنەبوون، کە فەرەنسا بۆ ناوبژیوانیەکەی لە توانایدابوو هەندێک سازش بکات و دەستکەوتی باش وەدەست بێنێت، بەلاَم دواتر بوندوقیە وەردەگرێت و بە دیاری رادەستی ئیتاڵییەکانی دەکاتەوە. لەبەرانبەر ئەم بێزاریەی خەڵک دەبووایە ناپلیۆنی سێیەم کارێک بکات تا دەستکەوتێک بۆ فەرەنسییەکان بە ئەنجام بگەیەنێت، بەلاَم کاتەکان بەسەر چووبوون، بڕوسیا کێشەکانی خۆی لەگەڵ نەمسا یەکلا کردبوونەوە و پێویستی بە سازشی لەگەڵ فەرەنسا نەبوو.

## سیاسیەتی بسمارک بەرانبەر بە فەرەنسا

هەر لەسەرەتاوە بینیمان سیاسەتەکانی فەرەنسا دژی یەکێتی ئەڵمانیا دروستبوونی ئەڵمانیایەکی بەهێز لەسەر سنوورەکانی مایەی ترس و نارەحەتی و هەڕەشەیە بۆ سەر خاکەکەی، دیارە بسمارک درکی بەم مەترسیانەی فەرەنسا دەکرد، بۆیە لە سیاسەتەکەیدا بوو یەکەم جار شکست بە نەمسا بێنێت و دواتر روو لە فەرەنسا بکات، ئەمە وەکو پێشەکیەکی یەکێتی ئەڵمانیا. دەستێوەردانەکانی فەرەنسا لە ناوبژیوانیی نێوان نەمسا و بڕوسیا بە بڕوای بسمارک تەنیا بۆ دواخستن یان تەگەرەتێخستنی یەکێتیی ئەڵمانیا بوو، بۆیە هەر کە کێشەکانی لەگەڵ نەمسا تەواو بوون رووی لە فەرەنسا کرد، بەلاَم لە دەرگایەکی ترەوە، کە ئەو وەکو دەستدرێژکار نیشان بدرێت. کاری بۆ ئەم مەرامە کرد تا دەرفەتی بۆ رەخسا.

## پەیوەندییەکانی فەرەنسیی ئەڵمانی تا ساڵی ١٨٧٠

دوای تەواوبوونی شەڕ لە نێوان بڕوسیا و نەمسا ناپلیۆن هەستی بەوە کرد، کە دەرفەتی ئەوەی لەدەست چووە سوود لەو هەڵە وەربگرێت کاتێک ناوبژیوانیی بۆ دەکردن، بۆ ئەوەی تۆڵەی لەدەستچووەکان بکاتەوە داوای قەرەبووی هەرێمیی لە بڕوسیا کرد. یەکەم جار داوای هەندێک لە خاکی ئەڵمانیای لە بڕوسیا کرد لەسەر ڕووباری راین، بەلاَم بسمارک بە بیانووی ئەوەی ئەو دەسەلاَتەی نییە دەست لە خاکی ئەڵمانیا بدات داواکەی رەت کردەوە. ئەم جارەیان ناپلیۆن داوای بەلژیک و لۆکسۆمبۆرگی کرد، بسمارک ئەمجارەیان قبووڵی کرد، بەلاَم لەژێرەوە نیازەکانی فەرەنسای بە ئینگلتەرا

راگەیاند. بەم رەفتارە فەرەنسا توشی تەنگەتاو هات، ئەم جارە ناپلیۆن تەنیا داوای لۆکسۆمبۆرگی کرد، بسمارک داواکەی رەت کردەوە، ئەوسا فەرەنسا لۆکسۆمبۆرگی داگیر کرد بەم کارەی دۆخەکان لە ئەوروپا ئالۆز بوون. ئەوکات کۆنگرەیەک لە لەندەن بەسترا لە ١٨٦٧، بڕیار درا ئەو وڵاتە ببێتە وڵاتێکی بێلایەن لە نێوان بڕوسیا و فەرەنسا.

بەم شێوەیە هەموو هەوڵەکانی ناپلیۆنی سێیەم هەرەسیان هێنا بۆ وەدەستهێنانی هەندێک دەستکەوت لە ئەوروپا، ئیتر زیاتر لە بڕوسیا بە قین داچوو و کەوتە بیانوونانەوە بۆ شەڕپێفرۆشتن.

دۆخەکان لە ئەوروپا بەرەو ئالۆزتر دەچوون، بسمارک بەم کەمە دەستکەوتانە نەوەستا، کە لە ئەنجامی شەڕی نێوان بڕوسیا و نەمسا وەدەستی هێنابوون، لە ١٨٦٧ کەوتە هەوڵی بەستنی هاوپەیمانێتی لە نێوان وڵاتەکانی باکووری ئەڵمانیا و هەندێک لە وڵاتەکانی باشوور، ئەمانەش نیشانەی سووربوونی بسمارک بوون بۆ ئەنجامدانی یەکێتیی ئەڵمانیا، کە فەرەنسا پێی تەنگاو دەبوو.

ئاوا نیشانەکانی شەڕ لە نێوان فەرەنسا و بڕوسیا دەردەکەوتن، کە دەتوانین بڵێین شەڕ بەڕێوە بوو، لەگەڵ ئەمانە هەموو بسمارک لە هەوڵەکانی بەردەوام دەبێت. ئەوەی ناپلیۆنی توشی تەنگەتاو کردبوو شکستهێنانی سیاسەتەکانی ناوخۆی بوون، بۆیە بەدوای سەرکەوتنێکی سەربازی لە دەرەوە دەگەڕا تا شکستەکانی ناوخۆی پێ داپۆشێت، تا فەرەنسییەکانی پێ خەریک بکات و لە گیروگرفتە ئابووریی و دارایی وکۆمەڵایەتییەکانیان وەدوورخات.

## هەڵوێستی نێودەوڵەتی تا ساڵی ١٨٧٠

هەر لە ساڵی ١٨٦٧ کە هەردوو لایەن هەستیان بەوە کرد شەڕ رواڵەتێکە هەر دەبێت رویدات، ئیتر هەردولایان کەوتنە خۆ بۆ گونجاندنی هەڵوێست و بارودۆخەکانیان، فەرەنسا لە ئەوروپا بەدوای هاوپەیمانێک دا دەگەڕا، چونکە دڵنیا بوو بە تەنیا ناتوانێت بەسەر سوپاکانی بڕوسیادا زاڵ بێت ئەگەر لەم ئۆپەراسیۆنانەی وڵاتێک پشتگیریی لێ نەکات. بەڵام بڕوسیا متمانەی تەواوی بە سوپاکەیەوە هەبوو و لە سەرکەوتن بەسەر فەرەنسادا بێگومان بوو. بۆیە بەدوای دروستکردنی گرفت دەگەڕا بۆ هەوڵەکانی، فەرەنساش

دەیخواست ئەوروپا هەڵوێستی بێلایەنیان هەبێت. لێرە هەڵوێستی هەر وڵاتەو بە جیا دەست نیشان دەکەین:

لە ١٨٦٧ ئاراستەکانی نەمسا گۆڕانیان تێکەوتبوو، هەنگاریا تازە سەربەخۆیی وەرگرتبوو، بە نەمسا دەوترا ئیمپراتۆریەتی نەمسایی - هەنگاری. واتا لێرە نەمسا بەتەنیا سیاسەتی وڵات دیاری ناکات بەڵکو هەنگاریاش بەشداری تیادا دەکات.

دواتر لە دوای شکستخواردنەکەی لە ١٨٦٦ نەمسا بنەماکانی سیاسەتی خۆی گۆڕی بوو، گرنگی و بایەخەکانی لە کاروباری بەلقان و ناوەڕاست چڕکردبوون، بەم شێوەیە ناحەزی سەرەکیی روسیا بوو نەک بڕوسیا. بەم جۆرە فەرەنسا بینی، کە ناکرێت پشت بە نەمسا ببەسترێت، چونکە گرنگی بە کاروباری ئەڵمانیا نادات. سەرەڕای هەموو دڵرازیکردن و پاداشتانەی ناپلیۆن لە بەردەمی نەمسای دانان بۆ ئەوەی هاوپەیمانێتیەکی لەگەڵدا ببەستێت دژی بڕوسیا، بەڵام هەموویان بێسوود بوون. لە دروستبوونی یەکێتیی ئەڵمانیا روسیا هەستی بە هیچ ناڕەحەتیەک نەدەکرد، بە پێچەوانەوە بەڵکو نیازی وابوو هاوکاریی بڕوسیاش بۆ ئەم مەبەستە بکات، ئەو چاوی لە ڕووداوەکانی بەلقان و پۆلۆنیا بوو بۆ ئەوەی جارێکی تر شۆڕشەکانی ١٨٦٣ دووبارە نەبنەوە.

روسیا لەسەر دۆستایەتیی لەگەڵ بڕوسیا سوربوو بۆ ئەوەی ئارامی و سەقامگیری لە پۆلۆنیا بەرقەرار بێ، ئەوکات حکومڕان لە ئینگلتەرا بەدەستی ئازادیخوازەکان بوو ئەوانیش بە کاروبارە ناوخۆییەکانی ئیمپراتۆریەت خەریک بوون لە: ئەمەریکا، کەنەدا، سنوورەکانی هیندی - روسی کاروباری هەڵبژاردن ئینگلتەرایان لە کاروباری ئەوروپا وەدوورخستبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەش هەمووی هەر سوربوو لەسەر ئەوەی پارسەنگی هێزەکان لە ئەوروپا وەکو خۆیان بمێننەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە هیچ هاوپەیمانێتیەک لە نێوان ئینگلتەرا و فەرەنسا نەبەستران، پێشبرکێ لە نێوان بڕوسیا و فەرەنسا بەردەوام بوو بۆ وەدەستهێنانی سۆزی وڵاتەکان، تا ساڵی ١٨٧٠هات فەرەنسا نەیتوانی هیچ هاوپەیمانێتیەک ئەنجام بگەیەنێت، کە بتوانێت هاوکاریی بکات بۆ لەناوبردنی بڕوسیا. بەڵام بسمارک لەو ماوەیەدا توانیی بێلایەنیی بە نەمسا و ئینگلتەرا هەڵبژێرێت و دۆستایەتی روسیاش وەدەست بێنێت، ئەوسا دەستی بەوە

کرد پاڵ بە فەرەنساوە بنێت تا دەست بە شەڕ بکات، بۆ ئەوەی خۆی رووی ناشیرن نەبێت و وەکو دەستپێشخەری شەڕ نەیەتە ناسین.

## هۆیەکانی جەنگ

لە ساڵی ۱۸٦۸ کێشەیەکی تر دروست بوو، کە بووە مایەی زیادبوونی گرژی و ئاڵۆزی لە نێوان فەرەنسا و بڕوسیا، ئەویش مەسەلەی ئیزابیل پادشای ئیسپانیا بوو، لە ئەنجامی ناکۆکیەکی لەمێژینەی نێوان پادشا و گەلی ئیسپانی پادشا بەم هۆیەوە رای کرد و دەسەڵاتی جێهێشت. چارەنووسی ئیسپانیا کەوتە دەست سەرۆکوەزیرانی پڕیم، کە دەبووایە چارەسەریی ئەم کێشەیە بکات، هەموو لایەک بەباشیان زانی درێژە بە رژێمی پادشایەتی بدرێت. بۆ ئەم مەبەستە لە ئەوروپا بەدوای ئەمیرێکدا دەگەڕان بۆ ئەوەی بیکەنە پادشا، دەستنیشانەکان لەسەر لیۆبۆلد نیشتنەوە، کە لە خانەوادەی هۆهنزلۆنی خزمی قەیسەری روسیا و برای پادشای رۆمانیا بوو. بۆ ئەم دەستنیشانە فەرەنسا ناڕەزایی خۆی بە ئاشکرا راگەیاند، کارەکان وەستانیان تێکەوت تا هاتنی نێردراوی تایبەتیی پڕیم بۆ لای لیۆبۆلد بۆ ئەوەی قبووڵی بکات، بەڵام نێردراوەکە لە ئەرکەکەی سەرکەوتوو نەبوو. لە ساڵی ۱۸۷۰ دووبارە فەرمانەکە لە بەردەم ئەمیر دانرایەوە، ئەم جارە بۆ پادشای بڕوسیی گواستەوە، بۆ ئەم پرسە بسمارک گەلێک بەجۆش بوو، بوونی پادشیەک لە خانەوادەی هۆهنزلۆر لە سەرتەختی پادشایەتیی ئیسپانیا تەڵەیەکی باشە. بەم شێوەیە فەرەنسا کەمتر دژایەتیی بەرژەوەندییەکانی بڕوسیا دەکات، بەڵام پادشا لەوە دەترسا فەرەنسا بە توندی دژی ئەو قبووڵکردنەی بڕوسیا بووەستێت، ئەوساش رای گشتیی ئەوروپا و لیۆبۆلد پشتگیریی فەرەنسا بکەن هەڵوێستی بڕوسیا لاواز دەبێت، بەڵام چونکە بسمارک بۆ ئەم هەلە گەلێک تامەزرۆ بوو، توانیی بڕوا بە پادشا و ئەمیر بکات قبووڵی نمایشەکە بکات، ئەوەبوو ئیتر لە ۲۱ی حوزەیران ساڵی ۱۸۷۰بڕیاری قبووڵکردنی بە جەنەراڵی ئیسپانی راگەیاند.

هەر کە فەرەنسا بەمەی زانی ناڕەزاییەکی توندی دەربڕی، بە باڵوێزی خۆی لە بەرلین راگەیاند بچێت چاوی بە پادشا بکەوێت، کە ئێستا پشووی هاوینی بەسەردەبات لە ئەمس، داوای لێبکات دەست لەم کارە وەربدات بۆ ئەوەی پاڵێوراویان بکێشنەوە. توانیی

بڕوا بە پادشا بێنێت و یەکێک لە یاوەرانیی راسپارد تا فەرمانەکە بە لیۆبۆلد رابگەیەنێت. بەڵام فەرەنسا بەمەندە رازی نەبوو، داوای رەزامەندی بە نووسین لێ کرد، دووبارە باڵوێزی ناردەوە لای پادشا، بەڵام ئەوجارەیان بە هۆی ئەوەی پادشا گەڕایەوە بەرلین نەیتوانی چاوی پێی بکەوێت.

تا ئێرە بسمارک لە کارەکان بێئاگا بوو، بەڵام کاتێک پادشا نامەی بۆ بسمارک نارد فەرمانەکەی پێ راگەیاند، بسمارک شێت و هار بوو و بروسکەکەی پادشای بە شێوەیەک گشتگیر پەخش کرد، کە سوکایەتیکردن بە فەرنسیەکانی پێوە دیار بوو. لێرە ئەوە رویدا، کە بسمارک چاوەڕوانی بوو، گەلی فەرەنسی بەم ڕووداوە هەڵچوون و دژی بڕوسیا راپەرین، داوایان لە فەرەنساش کرد بڕیاری جەنگ رابگەیەنێت.

لە ١٤ی تەمووز ئەنجومەنی وەزیرانی فەرەنسا سێ کۆبوونەوەیان بەدوای یەکدا ئەنجام دا، تیایدا داوایان کرد بودجەیەک بۆ کاری سەربازی تەرخان بکەن. لە ١٩ی تەمووز ئەنجومەنی نوێنەران داواکەیانی قبووڵ کرد، ئەوسا حکومەتی فەرەنسا بڕیاری شەڕی دژی بڕوسیا دەرکرد.

روسیاش لە ٢٠ تەمووز بێلایەنی خۆی راگەیاند، لە ٢٣ی تەمووز دووبارە گەڕایەوە رایگەیاند لە بێلایەنیەکەی بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی نەمسا بێلایەنە، هەرکاتەی نەمسا بەشداریی کرد ئەوکات لایەنگری بڕوسیام، ئینگلتەراش بێلایەنی خۆی راگەیاند. بەم شێوەیە فەرەنسا بەتەنیایی لە بەرانبەر بڕوسیا مایەوە.

## جەنگ

لە سەرەتای شەڕ سیمای بەهێزی سوپای بڕوسیا وەدەرکەوتن، چوونکە فەرماندەی گشتیی بڕوسی لە سەروی هەموویانەوە ڤۆن مۆلتکەی پاڵەوانی شەڕی سادوا بوو. سەربازەکانی ئەڵمانیای باش فێری شەڕ و جەنگ کردبوون و بۆ شەڕی بەردەوامی راهێنابوون. ئەم هەر لە ساڵی ١٨٦٧ەوە ئەگەری شەڕی لەگەڵ فەرەنسا دانابوو، بۆیە خۆی بۆ ئامادە کردبوو، مەشق و راهێنانی باشی بۆ کردبوو، بەرنامە و پلان و بوودجەشی بۆ تەرخان کردبوو. هەموو فاکتەرەکانی سەرکەوتنی ئامادە کردبوون، لێکۆڵینەوەی تەواوی لەسەر چۆنایەتی و چەندایەتیی سوپای فەرەنسا ئەنجام دابوو، توانا و خاڵە

لاوازەکانی دۆزیبوونەوە، بیری لە هەموو هۆکارەکانی پەیوەندیی نوێ و هاتووچۆ و توانا سەربازیەکانی تۆپ و شتی لەم بابەتەی کردبوو. فەرەنسا لەگەڵ ئەوەی ناو و ناوبانگێکی بەرزی لەسەر ئاستی ئەورووپا هەبوو، بەڵام لە ڕووی فەرماندەی سەربازی و چەکی مەیدان و هۆکارەکانی پەیوەندی و هاتووچۆی جەنگ بێتوانا و لاواز بوو.

بەخێراییەکی زۆر بەر لەوەی سوپای فەرەنسی بکەوێتە خۆ و لەشکر کۆ بکاتەوە، بڕوسیا هێرشی بردە سەر فەرەنسا و جەنگی گواستەوە ناو خاکی فەرەنسا، دوای دوو ڕۆژ لە پەڕینەوەی سوپای بڕوسی سەرکەوتنی زۆریان وەدەست هێنابوون لە ٦ی ئاب لە ئەلزاس و لۆرین. ئەم سەرکەوتنانەی بڕوسیا لە پاریس نارەزایی و بێزاریەکی زۆریان نابووەوە، ناپلیۆن ناچار بوو دەست لە فەرماندەی گشتیی سوپا هەڵگرێت بۆ جەنەراڵ بازین.

بەڵام ئەم زۆر لەوە دوور بوو بتوانێت بەرۆکی هێرشە کتوپڕەکانی بڕوسی بگرێت، خۆی لە شاری متز قایم کرد، بەڵام بڕوسیەکان گەمارۆیان دا، لەبەرانبەر گەمارۆکەی بڕوسی، بازین دوودڵی و خۆگێزراندنی نواند. لەوکاتە ٦ هەزار ئەفسەرو ١٧٠ هەزار سەربازی لەگەڵ بوو، فەرەنسا ئەوسا پێویستیی زۆری بەم هێزە هەبوو، کەچی ئەم بۆ کاتبردنەسەر خۆی دەهێنا و دەبرد. سوپاکەی تری فەرەنسی، کە لە شاری شالۆن بە فەرماندارێتی جەنەراڵ مەکماهۆ کۆ دەبووەوە، نیازی ئەوە بوو بەرەو پاریس بگەڕێتەوە، بەڵام ناپلیۆن فەرمانی پێدا بۆ شکاندنی گەمارۆی متز بچێتە هاوکاریی لە نزیک سنووری بەلژیک. فەرماندەی بڕوسیش ڤۆن مۆلتکە چاودێریی دەکرد بۆ ئەوەی بەدوای دا بچێت، ئەوەبوو لە سێپتەمبەری ١٨٧٠ لە سیدان پێی گەیشت و دەوری لەشکرەکەی دا و کوشتارێکی زۆری پێگەیاند و ١٠٠ هەزار سەربازیشی لێ بەدیل گرت بە ناپلیۆنەوە.

بە گەیشتنی ئەم هەواڵە بۆ پاریس جەماوەری جۆشدراو دژی ئیمپراتۆر راپەری تا ئیمپراتۆریەتی فەرەنسییان رووخاند، لە ٤ی سێپتەمبەر ١٨٧٠جەماوەری ڕاپەڕیو دروستبوونی کۆماری فەرەنسای سێیەمیان راگەیاند لەگەڵ حکومەتی بەرگریی نیشتمانیی کاتی.

ئەم حکومەتە بۆ رزگارکردنی ئابڕووی فەرەنسا بڕیاریاندا درێژە بە جەنگەکە بدەن، دوای ئەوەی لە ١٣ای سێپتەمبەر ئەڵمانییەکان گەیشتنە لێواری پاریس گەمارۆیان بەسەر

شاری پاریس دا سەپاند، ناچار فەرماندارێتیی جەنگیان بۆ شاری تۆر گواستەوە لەوێ را و تەگبیرەکانیان بۆ شەڕی دژ بروسیا دەکرد.

ئەگەر سوپای فەرمیی فەرەنسا توانای خۆڕاگریی هەبووایە، ئەم حکومەتە دەیتوانی کارێک بکات، بەتایبەت دوای ئەوەی سەرکردەی گەلەری گامبتا توانیی لەشکرێک لە ۱۸۰هەزار کەس کۆ کاتەوە. لە ۲۸ی ئۆکتۆبەر شاری تۆل و ستراسبۆرگ روخان و لە ۲۷ی ئۆکتۆبەریش جەنەڕال بازین خۆی و لەشکرەکەی خۆیان دایە دەست ئەڵمانییەکان، ئەوساش ئەڵمانییەکان بۆ گەمارۆدانی پاریس تواناکانی خۆیان تەرخان کرد، لە ۲۸ی جەنیوەریی ۱۸۷۱سەرەڕای بەرگریەکی توند ناچار کرا خۆی بداتە دەست. دوای راگەیاندنی ئاگربەست دانوستانەکان لە نێوان هەردوو دەوڵەت دەستیان پێ کرد، بەڵام بسمارک سوربوو لەسەر ئەوەی ئەنجومەنێکی نیشتمانی بێتە هەڵبژاردن ئەوسا ئەو رێککەوتنە ئاشتەواییە ئیمزا بکرێت.

لە ۸ی شوباتی ۱۸۷۱هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی ئەنجام درا، دوای ٤ رۆژ ئەنجومەن لە شاری بۆردۆ کۆبووەوە، سیاسەتمەداری فەرەنسی (تییر)یان بۆ سەرۆکی جێبەجێکردنی دەسەڵات هەڵبژارد و دەسەڵاتی ئەنجامدانی پرۆسەی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیایان پێ بەخشی.

## ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی

دوای کۆتاییهاتنی شەڕی سیدان و رووخانی حوکمی ناپلیۆن لە فەرەنسا بسمارک دڵنیا بوو، کە ئیتر هیچ گرفت و تەگەرەیەک لە بەردەم جێبەجێکردنی یەکێتیی ئەڵمانیا نەماوە و پێویست بە چاوەڕوانی ناکات تا شەڕەکان کۆتاییان پێ دێت. بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێک کۆبوونەوەی لەگەڵ پادشا و ئەمیرەکانی ئەڵمانیا بەستن بۆ ئەنجامدانی یەکێتیی ئەڵمانی، سەرەتا دەبووایە لەگەڵیان بکەوتبایە رێککەوتنێک لەسەر شێوەی حکومەتی ئەڵمانیی نوێ. ئازادیخوازو رۆشنبیرەکان مەبەستیان بوو دەوڵەتێکی بەهێزی دیموکراسیی یەکگرتوو بێت، کە بتوانێت بەسەر هەموو ئەمیرەکانی هەرێمەکاندا زاڵ بێت و ئیمتیازاتە مێژووییەکانیان لێ بسەنێتەوە، کەچی ئەمیر و حکومەتی ویلایەتە باشوورییەکان بەتایبەت باڤاریا مەبەستیان بوو قەوارەکانیان وەکو خۆی بمێنێتەوە بە ئیمتیازاتەکانەوە. بە هۆی ئەوەی هێشتا شەڕەکان تەواو نەببوون دەنگی باشوورییەکان بە

هەند وەردەگیرا بۆ بەڕێوەبردنی شەڕەکان، بۆیە لەسەر رژێمێکی یەکگرتوو لەناو دەوڵەتی ئەڵمانیای نوێدا پێکهاتن. بەم شێوەیە میرنشین و وڵاتەکانی ئەڵمانی وەکو خۆیان مانەوە و دەوڵەتی باڤاریاش هەندێک ئیمتیازاتیان پێ دان وەکو مافی سەرپەرشتیی لەسەر سوپاکەی لە کاتی ئاشتی و گرنگیدان بە سیاسەتی دەرەوەی ئەڵمانی. بسمارک لەگەڵ ئەمیر و حکومەتە ئەڵمانییەکان رێککەوت، کە دەوڵەتێکی ئەڵمانیی یەکگرتوو لە بواری سیاسەتی دەرەوە و سەربازی بە سەرۆکایەتی قەیسەری ئەڵمانیا دابمەزرێنرێت، لەناو ئەم دەوڵەتەدا هەر وڵاتە لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆ سەروەریی خۆی دەپارێزێت.

لە کاتێک کە پادشای بڕوسی تاقە پاڵێوراوی شایستەبوو بۆ وەرگرتنی تاجی پادشایەتیی ئەڵمانیای نوێ، کەچی رازی نەبوو ئەو تاجە لەسەر دەستی گەل وەرگرێت، ئەوسا بسمارک کارێکی وای کرد، کە ئەمیرەکان ئەو تاجە پێشکەشی پادشا کەن.

لە ١٨جەنیوەری ١٨٧١ ئەمیر و پادشاکانی ئەڵمان لە هۆڵی مەرایا لە کۆشکی ڤێرسای کۆبوونەوە، ئەمە بەر لە رووخانی پایتەختی فەرەنسا بە ١٠ رۆژ لەو کۆبوونەوەیندا ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیان راگەیاند، هەروەها ولیامی یەکەم پادشای بڕوسیا وەکو سەرۆکی دەوڵەتی ئەڵمانیای نوێ دەست نیشان کرد بۆ ئەوەی نازناوی قەیسەری ئەڵمانیا هەڵگرێت.

## پەیماننامەی فرانکفۆرت

دانوستانەکانی نێوان بسمارکی راوێژکاری ئەڵمانیا و تییری سەرۆکی حکومەتی فەرەنسا لە ٢٦ی شوبات دەستیان پێکرد، بەڵام ئەم دانوستانانە بە هۆی سووربوونی بسمارک لەسەر مەرجەکانی ئاشتەوایی، کە زۆر توند بوون، درێژەیان کێشا. سەرەڕای ئەوە سەرۆکی حکومەتی فەرەنسا تییر زۆر دیبلۆماسیەت و هێنان و بردنی نواند، بەڵام هیچی لە توندی بسمارک نەگۆڕی، دوایین جار فەرەنسییەکان بە مەرجە رسواکارییەکان رازی بوون. لە ١٠ی مایۆی ١٨٧١ کە لەلایەن هەردوو دەوڵەتەوە ئیمزای لەسەر کرا و بە رێککەوتنی فرانکفۆرت ناسرا، هەر ئەم مەرجانەش بوونە هۆکاری هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانیی، دیارترین مەرجەکانی ئەم رێککەوتنە ئاشتەواییە بریتین لە:

١- بڕوسیا هەرێمەکانی ئەلزاس و لۆرین داگیر دەکات لەگەڵ شاری متز.

٢- لە ماوەی ٥ ساڵدا فەرەنسا بڕی ٥ ملیار فرەنکی زێڕ وەکو سزای جەنگ دەدات.

٣- هێزەکانی ئەڵمانی خاکەکانی فەرەنسا لە باکوور داگیر دەکەن تا ئەو کاتەی سزاکە دەدرێت (فەرەنسییەکان بۆ ئەوەی لە داگیرکاری رزگاریان بێ سزاکەیان بە ٣ ساڵدا).

## کۆماری فەرەنسیی سێیەم

دوای ئەوەی لە ٨ی شوبات ئەنجومەنی نیشتمانیی هاتە هەڵبژاردن، لە ١٨ی هەمان مانگی ١٨٧١ یەکەم کۆبوونەوەی خۆی بەست لە شاری بۆردۆ، کە کرابووە بارەگای حکومەتە کاتیەکەی فەرەنسای دوای رووخانی ئیمپراتۆریەت. لە بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە: سیاسەتمەداری بەساڵاچوو (تییر)یان بۆ سەرۆکایەتیی دەوڵەت دەست نیشان کرد، دەسەڵاتی ئیمزاکردنی رێککەوتنیان پێدا، ئەم پیرە سیاسەتمەدارە لە ١٠ی مایۆی ١٨٧١ رێککەوتننامەی لەگەڵ ئەڵمانیا ئیمزا کرد.

## شۆڕشی کۆمۆن

سەرۆکی حکومەت لە دەسپێکی کارەکانی ڕووبەڕووی فیتنەیەکی مەزن بۆوە لە پاریس، ئەوەندەی نەمابوو هەڕەشەی لەناوبردن لە هەموو دەزگاکانی فەرەنسی بکات، زۆربەی دانیشتووانی فەرەنسا مەبەستیان دامەزراندنی رژێمێکی شۆڕشگێڕی کۆماری بوو. ئەوان لەو رژێمە بێزاربوون، کە دەسەڵاتەکەی بە دەست ئەنجومەنی نیشتمانیی بێت، کە زۆربەی ئەندامانی لە پادشاخوازانی کۆنەپارێز بن. دواتر ئەو ئەنجومەنەی لە سەرەتاوە بۆ بەڕێوەبردنی ڕێککەوتنە ئاشتەواییەکە دامەزرابوو، دوای تەواوبوونی ئەرکەکانی هەر بەزیندوویی مایەوە و لە کارەکانی خۆیدا بەردەوام بوو، بارەگاکەشی خۆی لە ١٠ی مارس لە بۆردۆوە بۆ ڤێرسای گواستەوە و بەدوای دۆزینەوەی شێوەی حکومەتێکی نوێدا دەگەڕا. چونکە زۆربەی ئەندامەکانی لەلایەنگرانی سیستەمی پادشایەتی بوون، فەرەنسییەکان مەزەندەی ئەوەیان دەکرد رژێمە کۆنەکەی جاران بە هەموو خراپیەکانییەوە بگەڕێننەوە. ئەمەو فەرەنسییەکان هەستیان دەکرد، کە ئەنجومەنەکەیان خیانەتی لەگەڵ کردوون کاتێک ئەو رێککەوتنەیان لەگەڵ ئەڵمانیا ئیمزا کردووە، ئەوان مەبەستیان بوو لە رێگەی شەڕی رزگاریخوازانەوە درێژە بە خەباتیان بدەن، بۆ ئەوەی وێنەی سەربازەکانیان بەم شێوە رسواییە لە پاریس نەبینن.

لە ١٨ ئادار حکومەتی ڤێرسای تیپێکی سوپای نارده پاریس بۆ ئەوەی ئەو تۆپ و چەکە قورسانەی لە دەست شۆڕشگێڕەکاندا ماون، کە کاتی هاتنی سوپای ئەڵمانەکان بۆ ناو پاریس کەوتبوونە دەستیان، لێیان بسێنێتەوە، بەڵام رزگاریخوازەکان ئەمەیان قبووڵ نەکرد و لەگەڵ هێزەکەی ڤێرسای کردیانە شەڕ و دوانیان لە فەرمانەدەی هێزەکە دەستگیر کرد و گوللەبارانیان کردن. دوای ئەم ڕووداوە حکومەتێکی شۆڕشگێر لە شارەوانیی

پاریس دامەزرا، کە لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرا و زۆرینەیان لە شۆڕشگێر و کۆماریخواز و سۆشیالیستەکان بوون. ئەم بزووتنەوەیە بێ بەرنامە و ئامانج بوو، بۆیە سیمای ئاژاوەی پێوە دیار بوو، هەندێک لە سەرکردەکانیان نیازی لەناوبردنی رژێمی سەرمایەدارییان هەبوو لە سەرتاسەری دونیا، هەندێکیشیان مەبەست و ئامانجی گۆڕانی فەرەنسایان هەبوو بۆ یەکێتیەکی ئارەزوومەندانەی هاوپەیمان، کە کۆمار و هەرێمەکان لە خۆ بگرێت.

هەر کە (تییر)ی سەرۆکی حکومەت هەستی بە مەترسیەکانی ئەو بزووتنەوەیە کرد لە ٢١ تا ٢٨ مایۆ ١٨٧١ لەشکرێکی لە ١٣٠ هەزار سەربازی فەرمیی رێکخست و بە فەرمانداریێتیی ماک ماهۆ بۆ لەناوبردنی ئەم بزووتنەوەیە بەرێ کرد، لە مێژووی فەرەنسا بە هۆی دڕندەیی ئۆپەراسیۆنەکە ئەم هەفتەیە بە هەفتەی خوێن ناسرا. لەم هەفتەیەدا زۆربەی شوێنەکانی پاریس سوتێنران لەوانە: کۆشکی تۆیلەری و خانووی شارەوانی. لەم ماوەیەدا حکومەتی ڤێرسای هیچ نیانی و دلۆڤانییەکی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا نەنواند، دادگای سەربازیی بۆ دامەزراندن و زۆربەیانی لێ لە سێدارەدا و بەسەر ئەوانی تردا زاڵ بوو.

## کۆماری فەرەنسیی سێیەم

دوای لەناوبردنی شۆڕشی کۆمۆن لە پاریس دەبووایە حکومەتە کاتیەکە لە شێوەی حکومەتی نوێی رۆژانی پشێوی رەفتار بکات، دەبووایە بە زوترین کات خۆی بسەپێنێت.

ئەنجومەنی نیشتمانیی وەکو رای گشت خەڵکەکە بەسەر دوو ئاڕاستەدا دابەش ببوون:

١- **کۆماریخوازەکان:** ئەوانیش کەمینە بوون لەناو ئەنجومەنی نیشتمانی، ژمارەی کورسیەکانیان ٢٥٠ کورسی بوو لە کۆی ٦٥٠ کورسی، ئەمان دژی دامەزراندنی هەر جۆرە رژێمێکی پادشایەتی بوون.

٢- **پادشاخوازەکان:** کە زۆرینە بوون لە ئەنجومەنی نیشتمانی، ئەوەی هەڵوێستەکانیانی لاواز کردبوو، ئەگەر لەسەر شێوەی رژێمیش رێک بکەوتبان، ناکۆکیان لەسەر کەسی پادشا هەبوو. دەستەی کۆنەپارێزەکان داوای گەڕانەوەی تەختی پادشایەتیان بۆ خانەوادەی بۆربۆن دەکرد، پاڵێوراویشیان (کۆمت دی چامبۆر) بوو نەوەی پادشا شارلی دەیەم، لەولاتر پارتێکی پادشاخوازی تر هەبوو بانگەوازیی بۆ یەکێک لە ئەمیرەکانی خانەوادەی ئۆرلیان دەکرد.

ئەم دابەشبوونە هەڵوێستی پادشاخوازەکانی تارادەیەک لاواز کردبوو، کە هەندێک لە ئەندام ئەنجومەنەکانیان دەنگیان دەخستە پاڵ دەنگی کۆماریخوازەکانی کۆنەپارێز، پاڵێوراوی پادشاخوازەکانی زۆرتین کانس (کۆمت دی چامبوور) بوو، بەڵام ئەویش بۆ هاتنە سەر تەختی پادشایەتی زۆر بە توندی مەرجی دەستهەڵگرتن لە ئاڵا سێ ڕەنگیەکەی فەرەنسای هەبوو، کە ئەمەش مەحاڵە ئەنجام بدرێت.

لە بەرانبەر ڕێکنەکەوتنی پادشاخوازەکان لەسەر یەک پاڵێوراو، کە هەموو فەرەنسییەکان پێی رازی بن، تیییر ناچار دەبێت بچێتە پاڵ کۆماریخوازە کۆنەپارێزەکانەوە، هەرچەندە لە سەرەتاوە خۆی لایەنگری رژێمی پادشایەتیی دەستووری بووە. کاتێک بەڕاشکاوی هەڵوێستی خۆی راگەیاند بە پشتگیریکردنی کۆماریخوازە کۆنەپارێزەکان، دووبەرەکی لەناو ریزی فەرەنسییەکان دروست بوو، هەردوو پارتی پادشاخوازەکە لە ٢٤ی ١٨٧٣ مایۆ دژی تیییر یەکیان گرت و ناچاریان کرد دەست لە کار بکێشێتەوە.

ئەنجومەنی نیشتمانیی جەنەرال (ماکماهۆن)یان وەکو سەرۆکی وڵات بۆ ماوەی ٧ ساڵ هەڵبژارد، را و بۆچوونەکانی دیار و ئاشکرابوون، کە لە کۆنەپارێزەکانی لایەنگرانی ئەکلیری بوو، ئارەزوی لە رژێمی پادشایەتی و خانەوادەی بۆربۆن بوو. سەرۆکی نوێی وڵات لە هەوڵێکی دا بۆ گەڕاندنەوەی پادشایەتی بۆ وڵات بە هۆی سووربوونی کۆمت دی چامبوور گەورەی خانەوادەی بۆربۆن لەسەر هەڵوێستەکەی سەرکەوتوو نەبوو.

دواجار ئەنجومەنی نیشتمانیی لە ١٨٧٥ بە زۆرینەی یەک دەنگ لە بەرژەوەندی رژێمی کۆماری بۆ حکومڕانیی فەرەنسا دەنگیان دا، ئەمەش بوو بە دەستوور و بە دەستووری ١٨٧٥ ناسرا.

## دەستووری ساڵی ١٨٧٥

ئەم دەستوورەی ساڵی ١٨٧٥، کە تا رووخانی کۆماری فەرەنسای سێیەم لە ١٩٤٠ کاری پێ دەکرا، لە دەقەکەی دا رێگەی بە دامەزراندنی دوو ئەنجومەن دا:

ئەنجومەنی پیران و ئەویتر ئەنجومەنی نوێنەران. هەروەها دەقێکی تری دەڵێت: "لە کۆبوونەوەی هەردوو ئەنجومەن سەرۆکی کۆمار دێتە هەڵبژاردن". ئەمە بۆ ئەوە بوو تا لە شێوەی هەڵبژاردنی جەماوەری دوورکەونەوە لە پێناو پاراستنی کۆمار لە هەموو مەترسیەک، دەسەڵاتی جێبەجێ کردنیشیان دایە دەست حکومەت، کە لە بەرانبەر ئەنجومەنی نوێنەران بەرپرسیار دەبێت.

# بەشی حەوتەم

## کێشەی رۆژهەڵات و کۆنگرەی بەرلینی ١٨٧٨

- سروشتی کێشەی رۆژهەڵات
- جەنگی روسیی عوسمانی و پەیماننامەی سان ئستتیڤانۆ
- کۆنگرەی بەرلینی ١٨٧٨ و بڕیارەکانی

لە دوای ئەوەی بروسیا سەرکەوتنی بەسەر نەمسا و فەرەنسا بەدەست هێنا، پارسەنگی هێزەکانی نێودەوڵەتی ناڕاستەیان لێڵ بوون، ئەڵمانیا بووە شۆڕەسواری ئەورووپا و نەدەتوانرا کۆنترۆڵ بکرێت. فەرەنسای دۆڕاویش پڕ بوو لە پشێویی سیاسیی، لەگەڵ ئەوەشدا لە توانایدا مابوو چالاکیەکانی ئەو هێزە زەبەلاحە سنووردار بکات، بەتایبەت کە ئینگلتەرا لەژێر کاریگەریی زیرەکیی سیاسیانەدا بوو و نیازی ئەوەی نەبوو هەلەکان بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی هاوسەنگی نێودەوڵەتی تێک نەچن و ئەڵمانیاش نەبێتە هێزێکی بەهێز، لەبەر ئەم هۆیە فەرەنسای لەناو نەبرد.

روسیا و نەمسا نەیاندەویست کارەکان لەوە زیاتر ئاڵۆزتر بن، ئەوکات جۆرێک لە پارسەنگیەکی نێودەوڵەتی بەرقەرار هەبوو، دووبارە سەراوژێربوونی بارودۆخەکان ماوەیەکی دەویست تا هەر وڵاتێك لە رووی سیاسییەوە پێشەخۆی بە روونـاکی ببینێت، بە تایبەت فەرەنسا بەدوای هاوپەیمانێکدا دەگەڕا دژی هێزە زەبەلاحەکەی ئەڵمانیا، کێشەی رۆژهەڵاتی وای کرد هەر وڵاتێك بە دوای ریبازی خۆیدا بگەڕێت.

بنەما سەرەکیەکانی کێشەی رۆژهەڵاتی خۆیان لەم بابەتانە دەدۆزیەوە:

١- ململانێیە کلاسیکیەکەی نێوان رۆژهەڵاتی ئیسلامیی و ئەورووپییە سەلیبیەکان: ئەوەی ڕاستی بێت بیری سەلیبیی کلاسیکی لە سەدەی شازدەهەمەوە بە تەواوەتی ون بوو، بەڵام گەلانی ئەورووپا چاوەڕوانی ئەوەبوون ئاخۆ کەی ئەم بیرە کلاسیکیەی ئیسلامییەش، جا رەگەزەکەی هەر کوێیەک بێت، تورکی بێت یان فارسی یان عەرەبی، ون دەبێ. ئەم هەستە لەگەڵ چالاکیەکانی تاکی ئەورووپی و لەلایەن سیاسەتمەدارانی ئەورووپیش گەلاڵەی کردبوو، حکومەتە ئەورووپییەکان لەو ئامانجانەی سەلیبیەکان پاشگەز نەدەبوونەوە، تەنیا ئەگەر دژی بەرژەوەندییەکانیان بووایە، لەم روانگەیەوە فراوانبوونی وڵاتە ئەورووپییەکان لەسەر مافەکانی دەوڵەتی عوسمانیی تێکشکاو بووایە کارێکی خۆشەویست بوو لەناو کۆمەڵگای ئەروپی و سیاسەتمەدارانی ئەورووپیش.

٢- لاوازیی دەوڵەتی عوسمانی لە رووی سەربازیی و ئابووریی و سیاسییەوە ببوونە هۆکاری چاوبڕینی وڵاتە ئەورووپییەکان لە سامانی دەوڵەتی عوسمانیی و دروستبوونی کێشەی رۆژهەڵاتی، ئەمەو هێزەکانی عوسمانی رێگربوون لەبەردەم بەشبوونی وڵاتە ئەورووپییەکان و فراوانبوونیان لەسەر مافەکانی، تا ئەوکاتەی روسیا بووژایەوە و بە هێز

بوو، هێزەکانی گەیشتنە پاریس لە ساڵەکانی ١٨١٤ و ١٨١٥، دواتر گەیشتنە لێواری ئەستانە لە ١٨٢٨ و ١٨٢٩. ئەمە بووە مایەی پەیدابوونی مەترسی لەلایەن وڵاتەکانی ترەوە، نەک تەنیا ئیمپراتۆریەتە ئەوروپییە دراوسێکانی وەکو نەمسا، بەڵکو ئیمپراتۆریەتی ئەو دیو دەریاش بەهەمان شێوە نموونە وەکو بەریتانیا.

کێبڕکێیەک لە نێوان روسیا و نەمسا لەسەر جێماوەکانی دەوڵەتی عوسمانیی لە بەلکان هەبوو، بەتایبەتی دوای شەڕی قرم (١٨٥٣-١٨٥٦) و دوای شەڕی سادوا (١٨٦٦) لەوکاتەوە نەمسا رووی لای ئەڵمانیا نەما، هەر گۆڕانێکی عوسمانی لە ناوچەی بەلکان رویان بدابایە، هەستیاریەک لای ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا دروست دەبوو. روسیاش جەختی لەسەر بزووتنەوەی سلاڤی کردبووەوە، ئەم بزووتنەوەیە هەم بۆ دەوڵەتی عوسمانیی و هەم بۆ ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا زیانبەخش بوو، ئەم بزووتنەوەیە خەباتی بۆ رزگارکردنی گەلانی سلاڤی دەکرد، کە لەژێر دەسەڵاتی هەردوو ئیمپراتۆریەتدا دەژیان، هەروەها خەباتیان بۆ بەهێزکردنی روسەکان دەکرد لە ناوچەی بەلکان، بە رزگاربوونیان دڵسۆزی روسیا دەبوون.

ئەوەی کێشەکەی بەلکانی ئاڵۆزتر کردبوو ئەوەبوو، کە لەناو کێشەکەیان چەند کێشەیەکی ناوخۆیی هەبوون:

١- کێشەی ململانێی سەلیبیەکان لەنێو وڵاتە موسڵمانەکان بەگشتی (دەوڵەتی عوسمانی) و گەلانی کریستی.

٢- کێشەی گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی لەنێو سلاڤیەکان خۆیان لە سرب و بوولگار و مجیار ئەم هەستە دەبووە دروستبوونی شەڕی ناوخۆ بە هۆی دەمارگیریی نەتەوایەتیی.

٣- هەر لەناو بەلکان جگە لە دەمارگیریی نەتەوایەتیی دەمارگیری مەزهەبییش هەبوو، لە کاتێکدا زۆربەی سلاڤیەکان ئەرسەدۆکس بوون، ئەفلاق و بەگدان کاسۆلیک بوون، لەولاتر هەندێک کەمینەی کاسۆلیک لەناو سلاڤیەکاندا هەبوون لەگەڵ کەمینەی موسڵمان.

٤- لەتەک دەمارگیری نەتەوایەتی ئارەزوی جیاکردنەوەی کڵێساکان لەسەر بنەمای نەتەوایەتیش هەبوون. ئەگەر بولگاریەکان مەبەستیان دروستکردنی کڵێسایەک بووایە بۆ

خۆیان دروستی کەن، نابێت ئەکلیرۆسەکەی یۆنانی بێت یان سەر بە بەتریرکی یۆنانی بێت، بەڵکو دەبێت کڵێسایەکی بولگاریی سەربەخۆ بێت.

٥- مەترسیی ئەوە هەبوو روسیا دەست بخاتە سەر یەکێک لە رێگەوبانەکانی نێودەوڵەتی لە ئاسیای ناوەڕاستەوە یان رۆژهەڵاتی خواروو بۆ هیند، بۆ ئەم مەسەلە سوود لە لاوازی دەوڵەتی عوسمانیی و سۆزی کریستەکانی روسیا و پەرەسەندنی دەمارگیری نەتەوایەتیی کریستیی سلاڤی لە بەلکان وەرگرێت، بەرگریی ئینگلتەرا- فەرەنسی- نەمسایی دژی پەرەسەندنی روسیا لەسەر حسابی دەوڵەتی عوسمانیی هۆکاری دواکەوتن و لەناوچوونی ئەم وڵاتە بوون.

دەبێت ئەوە بپرسین ئاخۆ کارەکان بەرەو چ ئاڕاستەیەک دەڕۆن پاش ئەوەی دۆستایەتیەکەی روسیی-بڕوسی مەبەستەکانیان ئاشکرا بوون، کە بە هۆیەوە روسیا توانیی لە ١٨٦٣ لە شۆڕشی پۆلۆنیا بدات و لە ساڵی ١٨٧٠یش لە بەندەکانی پەیماننامەی پاریسی ساڵی ١٨٥٦رزگاری بێت؟ ئەو پەیماننامەیەی چالاکییە سەربازیە دەرياييەكانی روسییان لە دەریای رەش سنووردار کردبوون؟ بە رەچاوکردنی ئەوەی ئەوسا روسیا لە دوو لاوە هەڕەشەی لە دڵی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی دەکرد: بەرەی ئەرمینیا- ئەرزەرۆم و بەرەی بەلکان.

ئەمەو پێویستیەکانی بسمارک بە روسیا دوای ١٨٧١ کەمتر بوون، لەگەڵ ئەوەی مەترسیەکانی روسیا لە دوای ١٨٧١ لە ئەڵمانیا زیاتر بوون لەوەی لە بڕوسیا. ئەوکات پەرەسەندنێکی باشی بەرژەوەندییەکانی ئەوروپی لەگەل دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوون، لە هەمان کاتیشدا بەریتانیا دڵنیا بوو لەوەی دوای شەڕی قەرم هێشتا خۆی باڵادەستە لە بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی تایبەت بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. سیاسەتە کلاسیکییەکانی بەریتانیا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا ساڵەکانی حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم سەرچاوەیان لەسەر ئەم بنەمایانە گرتبوو:

١- بەرانبەر بە هەر نیازێکی فراوانخوازیی ئەوروپی قەوارەی دەوڵەتی عوسمانیی بپارێزرێت.

٢- بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەریتانی لە دەوڵەتی عوسمانیی بە تایبەت لە شوێنە ستراتیجەکانی ڕێگاوبانە نێودەوڵەتییەکان، ئەو هەنگاوانەی بۆ ئەم مەبەستە نران بریتی بوون لە:

ا/ دزرائیلی سەرۆکوەزیران و باوکی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی، وای دەبینی کە ئەستانە کلیلی ڕێگای بەرەو هیندە، بۆیە دەبینین بەشی (سهم)ی خدێوی ئیسماعیلی لە کۆمپانیای کەناڵی سوێسی لە ١٨٧٥ لێ دەکڕێ، وەکو پێشەکیەکی دەستگرتنی بەریتانا بەسەر کەناڵدا، لە هەمان کاتیشدا بەگژ زاڵبوونەکانی دەسەڵاتی روسیدا دەچووەوە لە بەنداوەکانی دەردەنیل و بۆسفۆر.



دزرائیلی

ب/ زیادکردنی دادوەریەکانی بەریتانیی بازرگانی و سەربازی لە عێراق، بەتایبەتیش لە بوارەکانی هاتووچۆی زەمینی و ئاسمانی ودەریایی لە دیجلە و فورات.

ج/ هێزێکی پاسەوانی بۆ پاراستنی میرنشینە عەرەبەکان دابین بکات بەتایبەت ئەوانەی دەڕواننە سەر دەروازە دەریاییەکان، وەکو: بەحرێن و میرنشینەکانی کەنداوی عەرەبی، دەوڵەتی ئەلبووسەعید لە مەسقەت و عەمان و زنجبار و پارێزراوەکانی خوارووی یەمەن.

د/ هەندێک لە بەشەکانی عەرەبی بکرێنە موستەعمەری بەریتانی وەکو: عەدەن.

لە هەمان کاتدا بەریتانیا ئامادە بوو لەگەڵ روسیا بکەوێتە جەنگ، ئەگەر روسیا هەوڵی لەناوبردنی ئەم بنەمایانە بدات، بەڵام بە بەسەرچوونی رۆژگار سیاسەتەکانی بەریتانیا سەبارەت بە دەوڵەتی عوسمانیی گۆڕانیان تێکەوتن، لە پاراستنەوە بۆ پارچەکردن و داگیرکردنی دەوڵەتی عوسمانی گۆڕان، ئەمە دوای چەند تەنگژەیەکی دارایی و رێکخستنیی دەوڵەتی عوسمانی و میسر و تونس هاتن، چەند پشێویەکی تایەفیش لە ١٨٦٠ لە سوریا و لوبنان ڕوویان دا، دواتر ناوچەی بەلکان لە سێ یەکی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بوو بە ناوچەیەک لە تواناادا نەبوو بەرایی لە پەرەسەندنی گۆڕانەکان بگیرێت.

لە سەرتاسەری ئەورووپاش ئەو مەترسییە هەبوو، کە کێشەی بەلکان دوورنییە هەموو ئەروپا بخاتە بەردەم شەڕێکی سەرتاسەری، بسمارک لەم روانگەیەوە هەڵوێستی وڵاتەکانی دونیای بە کلیلی چارەسەرییەکان دەبینی، پێی باش بوو ئەورووپییەکان بە هۆی کێشەیەکی رۆژهەڵاتی یان عوسمانی نەکەونە گیانی یەک، بە دیدی ئەم هەموو کارەکان دەکرێت لە رێگەی وتووێژ چارەسەر بکرێن لە نێوان وڵاتە ئەورووپییەکان و لەسەر حسابی دەوڵەتی عوسمانیی.

بسمارک ئاشتیەکی ئەورووپیانەی مەبەست بوو، کە سەنگ و شوێنی تایبەتی بۆ ئەڵمانیا وەدەست بێنێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارە نێودەوڵەتیەکان، بسمارک بە دڵسۆزی ئاشتیی مەبەست بوو، گرنگیی بە پەیوەندییەکانی ئەڵمانی - فەرەنسی - بەریتانی دەدا، ئەمە بە پێچەوانەی ئەوەی لە رۆژنامەکان لەسەریان دەنووسی. تا ئەوکات حەزی لە شەڕی فەرەنسی - بەریتانی نەبوو، کە زۆر لە مەرجەعەکان هۆکاری ئەم شەڕە بۆ قەیرانەکانی یەک لە دواییەکی دوای ساڵی ١٨٧٥ لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت دەگێڕایەوە، کە لە گەلێک ناوچەی ئەفریقیا و وڵاتانی عەرەبی و ئاسیا رویان دان.

ئەوەتا بسمارک لەم نامەیەیدا دەڵێت:

(I shoud ceretainly try to maintain the peace between the European Powers; it is - moreover so esential- that it shoud be the expense of Turkey whose present day situation holds no promise of any stability.

A rapprochement between England and France woud not be disadvantageous to interests ' or for the balance of power in Europe)

دوای دۆڕاندنی فەرەنسا لە شەڕی حەفتا و ئەو لاوازیەی توشی دەوڵەتی عوسمانی هاتبوو پارسەنگی وڵاتەکانی ئەوروپیی لەباریەک بردبوو، بزووتنەوەی رزگاری خوازی نەتەوایەتی لە بەلکان کەوتە جموجۆڵ. ئەم بزوتنەوانە لە زۆر روەوە یەکیان نەدەگرتەوە، هەر یەکەی ئامانج و بەرنامەی جیای خۆی هەبوو، دۆخەکانیان لە بەلکان روەو ئاراستەیەکی تر دەبرد. ئەو شۆڕشەی هەڵگیرسابوو، کە وڵاتەکان پێی حەپەسان، سەرەتا لە هەرێمی هرسک هەڵگیرسا لە نێوان زۆرینەی کریستی و کەمینەی موسلمانی، دواتر بڵاوبووەوە و سربیا و چیای رەش بەشداریان تێدا کرد، پاشان بولگاریا. وڵاتە مەزنەکان لە بەرانبەریدا بەسەر چەند را و بۆچوونێکدا دابەش بوون، روسیا مەبەستی بوو هاوکاریی شۆڕشگێڕەکان بکات و دژی دەوڵەتی عوسمانی بووەستێت لە بەلکان، بەڵام بەریتانیا هەڕەشەی دژی هەر جووڵانەوەیەکی سەربازیی دەکرد. روسیا لەم شەڕانەدا خۆشحاڵ بوو، چونکە دژی بەرژەوەندییەکانی عوسمانیی بوون، بەڵام ئەوەندەی نەبرد هێزەکانی عوسمانی دەستێکی کوشندەیان لە سربەکان وەشاند و هەڕەشەشیان لە بولگاریا کرد. لێرەدا روسیا هاتە ناو کێشەکە و بڕیاری شەڕی دژی عوسمانییەکان راگەیاند و هێزەکانیان هەردوو شارە رۆمانیەکەیان بڕی (ئەفلاق و بەگداد) و بەشداری شەڕ بوون. لەو کاتەی بەریتانیا هەوڵەکانی بۆ بەرتەسککردنەوەی شەڕەکان چڕتر کردبوون، سوپای عوسمانیی بەرگریەکی ئازایانەیان لە پلێفنا دەکرد.

ئەوسا هەندێک گۆڕانی ناوخۆ رویان دا، مەدحەت پاشا چاکسازی مەزنی تورک، پلەی سەدری مەزنی پێ سپێردرا، عەبدولحەمیدی دووەمیش بوو بە سوڵتان ( ١٨٧٦-١٩٠٩) یەکەم دەستووری بۆ دەوڵەتی عوسمانی لە ١٨٧٦ دەرکرد. مەزندەی ئەوە دەکرا وەکو شەڕی قەرم بەریتانیا بە هێزەوە لەتەک دەوڵەتی عوسمانی بووەستێت، بەڵام بەرژەوەندی و هێز و بارودۆخەکان گۆڕابوون، دەرگای باڵا (باب العالی) ناچار بوو داوای ئاگر بەست بکات، لە ٣١ی جەنیوەریی ١٨٧٨ ئاگربەست راگەیەنرا و روسیا پەیماننامەی

(سان ستیڤانۆ)ی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا سەپاند، لە ٣ی مارتی ١٨٧٨ ئەو پەیماننامەیەی بووە هۆی جووڵەکردنی وڵاتەکان.

هۆی سەرهەڵدانی نارەزاییەکان دژی پەیماننامەی سان ستیفانۆ ئەوە بوو، کە لەم پەیماننامەیە لەسەر حسابی مومتەلەکاتی عوسمانی و یۆنانی دەوڵەتی بولگاریا دروست کرا. لەمەش زیاتر بە دیدی بەریتانیا بولگاریا بۆ ئەوە دروست کراوە، تا وەکو دەستێکی روسی لەناو جەرگەی دەوڵەتی عوسمانی بێت و بە هۆیەوە بتوانێت دەسەڵاتی بەسەر قوستەنتینیەدا هەبێت، دواتر دەوڵەتی عوسمانیی کەوتە ژێر دلۆڤانیی روسیا وهاوپەیمانانی لە بەلکان.

ئەوەی پتر مەترسیەکانی لای بەریتانیا لە پەیماننامەی سان ستیڤانۆ دروست کرد روسیا لە بەرەی رۆژئاواوە قارس و ئەردەهان و ئەرزەرۆم و زۆربەی خاکەکانی ئەرمینیای داگیر کردبوو. ئەم کردارانەی روسیا بە مەزندەی ئینگلیز ئەگەری دابەزینی سوپاکانی روسیی لە باکووری عێراق و کەنداوی عەرەب تا هیند کردە کارێکی لەبار، هەرچەندە ئەم مەزندانەی بەریتانی زیادەرۆیی بوون، بەڵام بە هۆی ئەوەی ئەوەندە بلێتەوە لای سیاسەتمەدارانی ئەوروپی بوونە راستی.

لە روویەکی ترەوە ئەم فراوانبوونەی روسی ئاراستەی رێگاکانی هاتووچۆیە جیهانییەکان بوون، جا چ بەسەرعێراق و شام یان بەسەر میسردا، مەترسیەکانی بەریتانیا لە پەیماننامەی سان ستیڤانۆ لێرە سەرچاوەیان گرتبوون.

ئەم کەشوهەوایە نێودەوڵەتییە گرژە و هەوری شەڕی نێوان بەریتانیا و روسیا بۆ بسمارک دەرفەتێکی مەزن بوو تا ببێتە رزگارکاری ئاشتیی جیهانی، ئەوەبوو بانگەوازی بەستنی کۆنگرەیەک کرد بۆ ئەوەی هەموو کێشەکانی ئەوروپی لەسەر حسابی دەوڵەتی عوسمانی چارەسەر بکەن، تا پارچەیەک زەوی رۆژهەڵاتی لێرە و لەوێ نەبێتە هۆی رشتنی خوێنی ئەوروپی. بەڵام دزرائیلی لەم کۆنگرەیە رۆڵێکی سەرەکی لە ئامادە کردن و بەرێوەبردن دەبینی، [2] دوای مشتومڕ و گفتوگۆیەکی زۆر، کە دیبلۆماسییە تورکەکانیان لێ وەدوور خستبوون، وڵاتە ئامادەبووەکان لەسەر ئەم خاڵانە رێککەوتن:

[2] سەرۆکوەزیرانی بەریتانی بەردەوام دوپاتی دەکردەوە، کە کلیلی بەرگری کردن لە هیند لە قوستەنتینیەوەیە، لە ٤ ی حوزەیران ١٨٧٨ پەیماننامەیەکی لەگەڵ عوسمانییەکان نیمزا کرد، کە ئەگەر روسیا باتوم یان ئەردوهان

١- بولگاریا دەبێتە میرنشینێکی نایاب، بەناو لەژێر دەسەلاتی سولتانی عوسمانیدا دەبێت، خاوەنی حکومەتێکی کریستی و سەربازی نیشتمانیی دەبێت[٣]
٢- روملیی رۆژهەلات لە بولگاریای مەزن جیا دەکرێتەوە و دەخرێتە ژێر دەسەلاتی راستەوخۆی عوسمانیەکان، بەم شێوەیە بولگاریا بەرتەسک دەبێتەوە.
٣- بۆسنە و هرسک لەژێر داگیرکاریی نەمسادا دەبن، بە مەرجێك سنجەق و نۆقی بازاڕ عوسمانییەکان بەڕێوەی ببەن.
٤- سەربەخۆبوونی چیای رەش.
٥- سەربەخۆبوونی سربیا.
٦- سەربەخۆبوونی رۆما، بە وەدەستهێنانی هەرێمی دبروجە و لەدەستدانی هەرێمی بسارابیا بۆ روسیا.
٧- دەرگای بالا (باب العالی) دەست لە ئەردهان و قارس و باتۆم هەلدەگرێت بۆ روسیا.
٨- دەرگای بالا (باب العالی) دەست لە هەرێم و شاری خەتر هەلدەگرێت بۆ فارس.
٩- دەرگای بالا (باب العالی) دۆلی ئالا کورد و شاری بایەزید وەردەگرێتەوە.
١٠ -دەرگای بالا (باب العالی) پەیمانی چاکسازی لە ئەرمینیا و پاراستنی خاکەکان لە دەست کورد و جەرکس دەدات[٤]
١١- دەرگای بالا (باب العالی) پەیمانی ئازادییەکانی بڕوای ئایینی لە ولاتە عوسمانییەکان دەدات، نابێت بڕوای ئایینیی لە بەردەم هاوولاتیی عوسمانی تەگەرەبێت لە رێگەی مافە سیاسیی و ئایینییەکان.[٥]

---

یان قارس بگرێت، ئەوا بەریتانیا بە هێزەوە بەرگری لە مومتەلەکاتەکانی عوسمانیی بکات و لە بەرامبەریشی قوبرسی پێ بدات، عوسمانیەکانیش بڕیاری تایبەتی دەربکەن بۆ پاراستنی کریستەکان.

[٣] دەقی پەیماننامەکە رژێم و دەستوری بلگاریا دیار دەکات لەگەل شێوەی پەیوەندیەکانیان لەگەل عوسمانیەکاندا بە سنووری ولاتیشەوە بە وردی.

[٤] بەروونی جیاوازی و دووفاقی لە سیاسەتی ولاتە مەزنەکان بەدی دەکرێت،لە کاتێکدا داوای چاکسازی لە عوسمانیەکان دەکات بۆ ئەرمەنیەکان، لە هەمان برگەش داوا دەکات ولاتەکە لە دەست کورد و جەرکس بپارێزرێت، بی گوێدانە ئەوەی کورد و جەرکس خاوەن مالن و ئەوانیتر میوان...وەرگێر.

[٥] ئەم بڕوایانە ولاتە مەزنەکان بەسەر ولاتە بچوکەکنیاندا دەسەپاندن لە کاتێکدا خۆیان پیادەیان نەدەکردن، لەم شێوە کێشانە کێشەی ئیرلەندا لە نێوان پرۆتستانت و کاسۆلیکەکان، ئەم برگانە وەکو بیانووی دەستێوەردانی ولاتە مەزنەکان لە کاروباری ولاتە بچووکەکان بەکاریان دەهێنا، روسیا خۆی جوومکانی دەچەوساندەوە، بە هەمان

١٢- مافی کونسوڵخانەکانە هاووڵاتیەکانیان بپارێزن.

١٣- ئازادیی دەریاوانی لە دانوب.

چ لەم دەقانە دەگەی و چی وای کردووە وایان لێبێت؟

١- رای بەریتانیا بۆ لەناوبردنی پەیماننامەی سان ستیڤانۆ و رێگەگرتن لە بەردەم دروستبوونی (بولگاریای مەزن) زاڵ بوون، [6] هەروەها دووبارە گەڕاندنەوەی رومەلیی رۆژهەڵات تا چیای بەلکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی وەکو سنووری سرووشتی هاوکارە بۆ بەرگریکردن بە ئاسانتر.

٢- زاڵبوونی سیاسەتی بسمارک، کە بە ناوی سیاسەتی (ئاشتەوایی قەرەبووکردنەوە) ناو نرا، ئەم سیاسەتە دەسەڵاتی روسیای لە رۆژهەڵاتی بەلکان و هی نەمساش لە رۆژئاوا بەهێز کرد. روسیا قارس و ئەردەهان و جاتۆمی دەست کەوت، بەڵام بەریتانیا لە رێککەوتنێکی نهێنییدا لەگەڵ سوڵتان قوبرسی لێ وەردەگرێت، ئەم دوورگەیە بە دیدی بەریتانیا دەکرێت وەکو بنکەیەکی سەربازیی گرنگ بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی روسی، کە نیازی بێت لە عێراق دابەزێت، سوودی لێ وەربگیرێت. دانوستانەکانی وەدەستهێنانی قوبرس لە سەرەتادا زۆر بە نهێنی لە نێوان ئینگلیز و تورکەکان ئەنجام دران، بە هۆی مەترسییەکانی روسیا لەسەر دەوڵەتی عوسمانی لە رۆژگارێکی سەختدا، کە تورکەکان پێیدا تێپەردەبوون، لە ٤ی حوزەیرانی ١٨٧٨ ئەم رێکەوتننامەیە ئەنجام درا (بە مەبەستی فراوانخوازی لە سنووری دەسەڵاتی عوسمانیدا ئەگەر روسیا هێرش بکاتە سەر هەریەک لە قارس یان ئەردەهان یان باتۆم و یەکیان یان هەموویان داگیر بکات، ئەوا ئینگلیز چەکی خۆی بەکار دێنێت بۆ پاراستنی موڵکەکاتی عوسمانی لە بەرانبەریشدا قوبرسی پێ دەبەخشرێت).

٤- فەرەنسا ئەم رێککەوتنە نهێنییەی نێوان بەریتانیا و عوسمانییەکان، کە تیایدا عوسمانییەکان دەست لە قوبرس هەڵدەگرن، ئەمەی بە (سیدانی نوێ) شوبهاند، لەبەرانبەریدا داوای قەرەبووی کرد. بەریتانیا رازی بوو بە سەرفرازکردنی فەرەنسا لە تونس، واتە بۆی هەبێت تونس داگیر بکات، هەروەها لەسەر ئەوەش رێککەوتن، کە لە

---

شێوە ولاتە ئەورووپییەکانیش.

[6] دروستبوونی ماوەی سێ یەکی سەدەیەک دواکەوت بە هۆی رازینەبوونی بەریتانیا

میسر دەسەڵاتیان وەکو یەک بێت، تا هیچ دەسەڵات بۆ میسرییەکان نە مێنێتەوە. بەڵام دوای ئەوەی فەرەنسا لە ١٨٨١ تونسی داگیر کرد بەریتانیا ترسی لا دروست بوو لەوەی فەرەنسا گۆمی دەریای سپیی ناوەڕاست بۆ گۆمی فەرەنسا بگۆڕێت. ناچار ئەویش لە ١٨٨٢ واتە دوای یەک ساڵ لایەنانە بە تەواوەتی میسری داگیر کرد.

٥- زاڵبوون بەسەر پەیماننامەی سان ستیڤانۆ و نەوەستانی بسمارک لەتەک روسیا ئەو وەستانەی روسیا چاوەڕوانی بوو لەو هۆکارانە بوون، کە نسفینی بەهێز بکەوێتە گەل (یەکگرتووی سێ ئیمپراتۆرەکە) توڕەبوونی روسیا سوودمەند بوو بۆ ئەوەی فەرەنسا هاوپەیمانێک لە ئەورووپا بدۆزێتەوە.

٦- ئەو زوڵمەی ئینگلیزی- فەرەنسی- روسی- نەمسایی لە دەوڵەتی عوسمانیان کرد و دەرچوونی ئەڵمانیا بێ ئەوەی هیچ لە خاکەکانی دەوڵەتی عوسمانی ببات، وایان لە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کرد لە ئەڵمانیا نزیک بێتەوە و سوود لە پێشکەوتنە تەکنەلۆژیی و سەربازیەکانی وەرگرێت، هەر ئەم نزیکبوونەوەیەش بوو دواتر بوو بە کاکڵی هاوپەیمانێتیەکەی عوسمانیی - ئەڵمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا.

٧- هەرەسەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەم شێوەیە بوون:

لەدەستدانی پێگەکانی لە بەلکان و هەروەها لە باکووری ئەفریقیا، سەرەتا لە میسر تا مەراکش و سوودان، لێدابرانی یەک لە دوایەکەکانی پارچەکان لە دوورگەی عەرەبی بە پشتگیریی بەریتانیا، ئەم لاوازیەی دەسەڵاتی تورکی و زاڵبوونیان بەسەر دەسەڵاتی حوکم هانی عەرەبەکانی دا داوا بکەن لە بەڕێوەبردنی حوکم بەشدار بن، کە پێشتر ئەو مافە تەنیا بۆ تورکەکان رەوا بوو.

بەڕاستی دەستووری عوسمانی، کە لە ساڵی ١٨٧٦ دەریان کرد، بە دیدی سیاسەتمەدارانی عوسمانی دەستپێشخەریەکی باش بوو بۆ رزگارکردنی دەوڵەت و گەلەکانی لە هەرەس و رووخان. بەڵام ئەو رسوابوونەی لە کۆنگرەی بەرلین بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا هات، دەرفەتێکی دایە دەست سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم تا کار بە دەستوور نەکات و فەرمانڕەوایی رەها بخاتە ژێر دەستی خۆی تا ساڵی ١٩٠٨، کە ئەوسا کاکڵی شۆڕشی کۆمەڵەی گەشە و یەکێتی و کاکڵی بزووتنەوەی ئازادیخوازی عەرەبی بوو.

٨- ئومێدەکان بەرەو ئاسۆیەک هەنگاویان دەنا، کە مافی زیاتر بە ئەرمەنەکان ببەخشرێت لەژێر سێبەری دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام ئەرمەنەکان پەلەیان کرد لە سوودوەرگرتن لە لاوازی دەوڵەتی عوسمانی. کورد و تورکەکانیش -لەلایەکی تر- خۆیان لەوان بە مەزنتر دەزانی، چونکە تا ئەو کات ئەرمەنەکان لەژێر دەستی کورد وتورکدا بوون، بە یەکسانیان قبووڵ نەبوو، ئەمە بووە هۆی نانەوەی کوشتارەگەی ئەرمەن[٧].

٩ - ئەوروپا دڵنیا بوو لەوەی تارمایی شەڕ لە نێوان وڵاتە مەزنەکان دوور کەوتەوە، بەم شێوەیە بسمارک لە بواری ئاشتەوایی سەرکەوتنی وەدەست هێنا، ئەم گۆڕانە کاری کردە سەر بووژاندنەوەی ئابووریی ئەوروپا تا بتوانێت بەشداری لە ئیمپریالیزمی ئەوروپا بکات بە تایبەت لە ئەفریقیا. ئەمانە بوونە هۆی بەستنی کۆنگرەیەکی نوێ لە بەرلین لە ١٨٨٤-١٨٨٥، کە دواتر دابەشبوونی وڵاتە ئەفریقییەکان لە نێوان وڵاتانی ئەوروپای لێ کەوتەوە.

[٧] دیارە لێرە نوسەر کوردیش وەکو تورک بە خاوەن دەسەڵات و بەرپرسیار بەرامبەر بە کوشتارگەی ئەرمەنەکان ناو دەبا، لە کاتێکدا هیچ وەختێک کورد لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان بە کەمترین مافە کانی شاد نەبووە و خاوەن دەسەڵاتیش نەبووە تا بتوانێت لە کۆکوژییەکەی ئەرمەندا بەشدار بێت بۆ ئەوەی لە بری دەسەڵات بەشداری لە تاوان و هاوکاریی عوسمانییەکان بکات. ئەگەر وا مەزندەدەکەن، بێویژدانی و زوڵمێکە لە کوردی دەکەن، چونکە کورد لە ئەرمەنیش زیاتر قوربانیی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی عوسمانیەکان بووە. وەرگێر.

# بەشی هەشتەم

## پێشبڕكێی ئیمپریالیزمی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم

## گەشەسەندنی فراوانخوازی ئیمپریالیزمی و هۆكار و بارودۆخەكانی

## كۆنگرەی بەرلینی ١٨٨٤ - ١٨٨٥

لە میانەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم بە بەراورد لەگەڵ ڕووداوەکانی سەدەی هەژدەهەم ئاستی فراوانخوازی وململانێکان روەو دابەزین بوون، بەڵام لە ساڵی ١٨٣٠ەوە ئاراستەی ئیمپریالیزم دەستی بە زیاد بوون کردەوە. ئەوە بوو فەرەنسا لە جەزائیر دابەزی، روسیاش بە تایبەت دوای شەڕی قەرم زۆری لە ئیران و ئەفغانستان کرد روەو رۆژهەڵات هەڵمەت بەرن. ئینگلتەرا لە شەڕی ئەفیون لە (١٨٣٩ -١٨٤٠) بەسەر چیندا زاڵ بوو و پەیماننامەی تیان تسنی لە ١٨٥١ بەسەردا سەپاند، ئەمەریکاش لە ١٨٥١ بەتوندی لە دەرگای ژاپۆنی دا، بەریتانیا شۆڕشی هیندی مەزنی لە ١٨٥٧ لەناو برد و فراوانکارییەکەی بە هەموو لایەکدا بەردەوام بوو، تا بۆرما و مالاویشی گرتەوە، هۆڵەنداش لە (دوورگەکانی هیندی رۆژهەڵات) لە موستەعمەرەکانی سەقامگیر بوو[٨]. رێنماکانی مۆنرۆ، کە رێگەی بە داگیرکاری تر نەدەدا لە وڵاتەکانی ئەمەریکای ناوەڕاست و باشوور، ئەم رێنمایانە دەرفەتیان بۆ ئەو وڵاتانە رەخساند، کە لەژێر دەستی ئیمپریالزمی ئەوروپیدا ماون و بە ئامانجەکانیان نەگەیشتوون، هەروەها دەرفەتێکی زێڕینی بۆ ئەمەریکا رەخساند تا دەستێکی باڵای هەبێت لە بواری سیاسی و ئابووری لە جیهانی نوێدا.

ئەمە بەگشتی کەشوهەواکانی پێشبڕکێیە ئیمپریالیزمیەکانی نیوەی سەدەی نۆزدەهەم بوون، دوای ئەوە گۆڕانێکی ریشەیی ئەوتۆ رویان نەدا لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ئەو کودەتایە پیشەسازییەی رویدا پێویستیی بە گواستنەوەی خێرایی بەرهەمەکان دەکرد بۆ بازاڕەکانی دەرەوە، پێویستیشی بە دۆزینەوەی بازاڕ و گواستنەوەی بۆ بەندەرەکان هەبوو، بۆ ئەم مەبەستە دەبووایە بەدوای ئامێری پێشکەوتوودا بگەڕێن.

٢- لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئامێر لە خزمەت سوپای وشکانی و دەریاییدا شێوازی ئامرازی سەربازی گەشەی زۆری بەخۆوە بینی، هێڵی ئاسنین یەکێک بوو لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەو وڵاتانەی، کە هەیانبوو. بەلەم و کەشتییە تۆپهەڵگرەکان بە توانایەکی بەرزەوە بەندەرەکانیان تۆپباران و گولـلەباران دەکردن، لە توانایاندا بوو لەناو ڕووبارەکان هێرش بەرن و جێگۆڕکێ بەهێزەکان بکەن، بە پێچەوانەی ئاراستەی ڕووبارەکان دەهاتن و دەچوون، لەناو جەرگەی وڵاتە دواکەوتووەکانی وەکو چین و عێراق دەخولانەوە و هێرشیان دەبردن و حکومەتەکانیان رسوا دەکرد و ناچاریان دەکردن

---

[٨] دوای جەنگی جیهانی دووەم، کە سەربەخۆیی وەرگرت بە ئەندەنوسیا ناسرا.

خۆیان بدەنە دەست. دواتر ئەم پێشکەوتنە ئامێرەی وڵاتانی ئەوروپی و دواکەوتویی وڵاتانی رۆژهەڵات خەرجیی شەڕەکانی کەم کردبوونەوە، شە ڕ و هاتووچۆکان لەسەر وڵاتە ئەوروپییەکان کەم دەکەوتنەوە بە بەراورد لەگەڵ جاری جاران.

٣- ئەمەو فراوانبوونی پانتایی شەڕ و روودانی فرەشێوازی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بوو، فاکتەرێکی گرگرتوو بوو لە پێناو ململانێی وڵاتەکان بۆ بندەستکردنی وڵاتە لاوازەکان. ئیمپریالزم تەنیا بە داگیرکردن و لوش دانی خێر و بێر و دەستگرتن بەسەر چاوگە ئابووریی و سەربازیەکان نەدەوەستا، بەڵکو:

ا/ لکاندنی هەندێک لە وڵاتە داگیرکراوەکان بە وڵاتی ئیمپریالیزمەوە وەکو لەخۆگرتنی جەزائیر، کە فەرەنسا وەکو بەشێک لە فەرەنسا دایە قەڵەم.

ب/ پێدانی قەوارەیەکی خۆجێیەتی بە موستەعمەرەکە وەکو: کەنەدا، بە پابەندبوونی بە بەریتانیاوە.

ج/ بەرزکردنەوەی تەنیا ئاڵای وڵاتێکی ئیمپریالیزم لەسەر خاکی گەلێکی دواکەوتوو، وەکو ئەوەی لە ئەفریقیا رویدا لە دەستگرتنی ئەڵمانیا بەسەر تنجانیقا.

هـ/ لەخشتەبردنی ریشسپی و سەرۆکی هۆزەکان بۆ ئەوەی ئیمزا لەسەر پارچە کاغەزێک بکەن، تیایدا داوای پاراستن لە ئیمپریالیزم بکەن تا بیانپارێزێت، بێ ئەوەی مانای پاراستن تێبگەن چی دەگەیەنێت، ئەمەش وەکو ئەوەی ئەڵمان (کارکبیترز) لەگەڵ سەرۆکهۆزەکانی ئەفریقیی کرد لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا و ئەوەی فەرەنسا لە رێگەی پەیماننامەی پاراستن لەگەڵ سەرۆکهۆزەکانی ئەفریقیا لە کەنارەکانی گینیی ئەنجام دابوو.

و/ بەکارهێنانی شێوازی مرۆڤایەتی لە جێبەجێکردنی ئامانجە فراوانخوازیەکانی ئیمپریالیزمیانەیاندا، بۆ نموونە: بەریتانیا بەناوی (نەهێشتنی بازرگانیکردن بە کۆیلەوە) ئیمپریالیزمێتیەکەی خۆی بەسەر زنجبار لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا سەپاند، هەریەک لە فەرەنسا و بەریتانیاش چالاکیەکانی مرۆییان بۆ مەرامە فراوانخوازیەکانی خۆیان بەکار دەهێنان، فەرەنسا کاسۆلیکەکان و بەریتانیاش پرۆتستانەکانی بەکاردەهێنا. جوانترین نموونە بەریتانیا و ئۆگەندان، هەروەها بە

پاساوی پاراستنی کریستیانەکانی دەوڵەتی عوسمانیی و چین هەریەک لە بەریتانیا و فەرەنسا دەستیان بەسەر خاکی نوێدا گرت.

ز/ ئەو پێگەیەی بەریتانیا پێی گەیشتبوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، کە گەیاندبوویە ئەو ئاستەی بتوانێت ڕێگە لە چین بگرێت هاووڵاتیەکانی لە ماددە بێهۆشبەرەکان قەدەغە بکات، بێ ئەوەی کەس بەرپەرچی بەریتانیا بداتەوە. بە هۆی پەرەسەندنی پایەی ئەوروپا لە دونیادا مەزنترین و دڕندانەترین شێوازی ڕەفتاریان لەگەڵ وڵاتە موسڵمان و هیند و چین بەکار دەهێنا، بێ ئەوەی کەس هەبێت لە شوێن خۆی جووڵە بکات. بەڵام ئەگەر پارچەیەک لە خاکی ئەروپا ڕووبەڕووی ئەم جۆرە ڕەفتارانە ببووایەتەوە، دوانیایان بەسەر یەکدا دەڕوخاند و دەبووە مەزنترین جەنگ.[9]

ح/ خوێنبەردان لە هێزی مرۆڤ لە ڕێگەی بازرگانیکردن بە کۆیلەوە لەسەر دەستی پرتوگالییەکان، کە خوێنیان لە لەشی کۆنگۆ و ئەنگۆلا بەردابوو لە ڕێگەی کۆیلە کڕین و فرۆشتندا. ئەم بازرگانییە لەلایەن ئەوروپییەکان کارێکی قێزەوەن بوو، وڵاتە ئیمپریالیزمەکان بە چەندین شێوە ئەم کارەیان ئەنجام دەدا وەکو گواستنەوەی زنجیەکانی سەنیگال بۆ دوورگەی ئەنتیل لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، کە فەرەنسییەکان پێی هەڵسابوون، هەروەها ئینگلیزەکان هیندییەکانیان لە سوپا بەکاردەهێنا و زیانی گیانیی زۆریان پێ دەگەیاند.، مێژوونووسێکی هیندی ڕاستی وت، کاتێک وتی: خوێنی هیندیەکان بوو ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی لە ڕۆژهەڵات پاراست.

ی/ بە بیانووی بڵاوکردنەوەی شارستانێتیی نوێ و بیری نوێ و ئامێری نوێ وەکو هێڵی ئاسنی و چەند پڕۆژەیەکی تر داردەست و پاساوی ئیمپریالیزم بوون بۆ داگیرکردنی وڵاتەکان، وەکو کۆنگۆ لەلایەن بەلژیک، عێراق و ئەنادۆڵ لەلایەن ئەڵمانیا و چەند پڕۆژەیەکی تر وەکو پڕۆژەی کەندری سوێس و پەنەما.

ک/ بەکارهێنانی کۆمپانیای بازرگانی و بانکەکان بۆ دەستگرتن بەسەر ئابووریی و خاکی وڵاتەکان، وەکو: کۆمپانیای کەناڵی سوێس و کۆمپانیای ئەفریقیی نیشتمانی لە نەیجر و کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیی بەریتانی و کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی

---

[9] یەکێک لە لێکۆڵەرەوەکانی ئیمپریالیزم دەڵێت: تاوانی هتلەر ڕسواکردنی مرۆڤ نەبوو، بەڵکو ڕسواکردنی مرۆڤی ئەوروپی بوو، بۆیە هەر ئەوان لێی هەڵسانەوە تا لە ناویان برد.

ئەفریقیی ئەڵمانی. وڵاتە بچووکەکان لە ڕێگەی ئەم کۆمپانیایانەوە داگیردەکران: جەزائیر کەوتە ناو تەڵەی فەرەنساوە، چونکە داوای قەرزەکانی خۆی لە فەرەنسا دەکرد، بەریتانیاش چونکە داوای قەرزەکانی خۆی لە میسر دەکرد، کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمەوە.

هـ/ شارەزابوونی وڵاتە ئیمپریالیزمەکان لە توانا و ناوچە بە پیتەکانی وڵاتانی لاواز. لە میانەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم ناوچەکانی ئەفریقیا و ئاسیا ئامانجی وڵاتە ئیمپریالیزمەکان بوون، ئەوروپییەکان ماوەیەکی زۆریان بەسەربرد تا شارەزای تەواوی جوگرافیا و دانیشتووان و ئابووریی ناوچەکان بوون بە تایبەتی ئەفریقیا، دوای ئەوەی ئامارەکان لە ڕێگەی هەموو سەرچاوەکانەوە تەواو بوون لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم ئیتر شەپۆڵی داگیرکاریی ئیمپریالیزم بەچڕی دەستیان پێ کرد.

لەپاڵ زۆرتر شارەزایی پەیداکردن لە وڵاتە دواکەوتووەکان بانگەوازییەکان بۆ بە چالاککردنی کاری ئەوروپی لە ئەفریقیا پەرەیان سەندن، ئەم جارەیان بە ناوی (پەیامی پیاوی سپیی) یان بەناوی (بەرگریی بازرگانی کۆیلە) بوو، بۆ ئەم بیرۆکەیە سیاسەتمەدارە ئەوروپییەکان و ئەنجومەنی کۆمپانیاکان یەکیان گرتبوو بە پشتیوانیی حکومەتەکان و بانگەوازخوازانی ئەم بیرۆکانە بۆ دەستگرتن بەسەر زۆربەی وڵاتانی ئەفریقی.

٦- ئەوەی نیوەی دووەمی لە سەدەی نۆزدەهەم کردە ماوەی پەرەسەندنی بزووتنەوەکانی ئیمپریالیزمی ئەوروپی، باشبوونی باری تەندروستی لە ئەوروپا و پێشکەوتنە تەقەنییەکان بوونە مایەی زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانی ئەوروپا، وێڕای بەرزبوونەوەی ئاستی زانین و داهاتی هاووڵاتیان ڕێژەی مردن کەم بووەوە، هەروەها بە هۆی کودەتا پیشەسازییەکان ڕێژەی بێکاری زیادی کرد ،ئەوانەی لە یاسا دەردەچوون بە هۆی هۆکاری سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە ئەوانیش لە زیادبوون دابوون. هەندێک وڵات وەکو بەریتانیا بە هۆی فراوانبوونی ڕێژەی داگیرکاریی لە ئوستراڵیا و نیوزیلەندا، هەروەها سەبارەت بە ڕوسیا لە سیبیریا فراوانیی پێکرا و بۆ ڕزگاربوون لە بێکاریی و دەرچووان لە یاسا ڕەوانەی ئەو وڵاتانەیان دەکردن.

٧- لە میانەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم تەوژمی ئیمپریالیزم تەنیا لە بەرژەوەندیی بەریتانیا هەڵی دەکرد، لە کاتێکدا تاقە رکابەری فەرەنسا بوو، ئەویش لە سەدەی هەژدەهەم چەندین شکستی هاتە رێ و بووە هۆی لەدەستدانی ئیمپراتۆریەتەکەی. ئەو کاتەی ناپلیۆن لە ١٨١٤-١٨١٥خۆی رادەست کرد لە توانای بەریتانیا دابوو هەموو موستەعمەرەکانی لەبن دەست دەر بێنێت، بەڵام تەنیا هۆڵەندای لاواز و جاوە و سۆمەترە (ئەندەنووسیا)ی بۆ هێشتنەوە.

کارێکی قورس بوو بەریتانیا بتوانێت هەموو موستەعمەرەکانی لەوبەری دەریا بپارێزێت، چونکە بودجەیەکی سەربازیی زۆری پێویست بوو. ئەوکات یەکە سەربازییە وشکانی و دەریاوانییەکان لە رووبەرێکی زۆر بەرپرسیار دەبوون، بۆیە بەریتانیا نیازی ئەوەی نەبوو لەمە زیاتر وڵات بخاتە ژێر رکێفی خۆی، لە کاتێکدا هێشتا لە هەندێک وڵاتی داگیرکراو ئارامی و سەقامگیری بەرقەرار نەبووە، تەنانەت ئەگەر بتوانێت شۆڕشی هیندی مەزن لە ١٨٥٧ کپ کات و روسیا لە شەڕی قەرم لە ١٨٥٦ شکست پێ بێنن و رسوای بکات، هەروەها ئێران لە شەڕی ١٨٥٧ و ١٨٥٨ چین لە ١٨٥٩. لەگەڵ ئەوەشدا بەریتانیا دەستی بە هەڵمەتێکی تری داگیرکاریی کرد، ئەم هەڵمەتە لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بوو و کاتێکی گونجاو بوو بۆ بەریتانیا، چونکە رکابەری ئەوکاتەی کە فەرەنسا بوو گورزێکی کوشندەی پێ کەوتبوو، بەڵام ئەڵمانیای زەبەلاحی نوێ پێویستیی بە دۆستایەتی بەریتانیا هەبوو، نیازی ئەوەی نەبوو بێتە مەیدانی ئیمپریالیزم. بۆ ئەڵمانیا ئەو مەیدانە ئەو کاتە گرنگ بوو لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم کاتێک هەردوو وڵاتەکەی ئینگلتەرا و فەرەنسا لە رووی ئیمپریالزمیەوە بەهێز و باڵادەست بوون، بەڵام پەرەسەندنی ئەڵمانیا لە بواری ئیمپریالزمی زۆر خێرا و تەواوکەری ململانێی ئیمپریالیزمی ئەوروپا بوو، وەکو: ململانێی نێوان ئینگلیز و فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و بەلژیک لە ئەفریقیا لە ماوەی هەشتاکان لە سەدەی نۆزدەهەم و دواتر.

ئەو گەشەکردنە مەزنەی ئەوروپا لە رووی بیر و تەکنۆلۆژیا و بازرگانی توانای هەمەجۆریان بۆ پەرەسەندنی داگیرکاریەکانیان لە بەرانبەریشییەوە دواکەوتویی وڵاتانی رۆژهەڵات و عوسمانی و چین لە سەدەی هەژدەهەم، جیاوازیی خەتەرناکی زۆریان لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دروست کردبوو. ئەم جیاوازیانە لە سەدەی نۆزدەهەم زیاتر بوون،

بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەکە، ئەمە سەرەڕای هەوڵ و تەقەلای زۆر بۆ بەیەکگەیشتنەوەی هەردوو لا. بەڵام هەر وڵاتە ئەوروپییەکان بوون، کە لە توانایاندا بوو بەشێکی زۆری شارستانیەت بە وڵاتە دواکەوتووەکان ببەخشن، هەر ئەو وڵاتە مەزنانەی ئەوروپاش بوون لە هەوڵی داگیرکاری و ئیمپریالیزمی دابوون.

ئەو جیاوازیەی شارستانی و هاندەرە ئابوورییەکان کاریگەریان هەبوو لەسەر ململانێی ئیمپریالیزمەکان، ئەو ململانێیە بەر لە سەدەی نۆزدەهەم لە نێوان چەند وڵاتێکی دیار مایەوە، بەڵام لەم سەدەیە هەندێک وڵاتی تر دەرکەوتوون، بە تێروانینی ئیمپریالیزمانە بەربەرەکانی دەکەن:

١- بەلژیک

٢- ئیتاڵیا

٣- ئەڵمانیا

٤- ژاپۆن

لەتەک چەند وڵاتێکی ئیمپریالیزمی چالاک لە بواری فراوانخوزیی ئیمپریالیزمی وەکو:

بەریتانیا، فەرەنسا، روسیا و چەند دەوڵەتێکی ئیمپریالیزمی خاو لە هەمان بواردا، وەکو: ئیسپانیا، پرتوگال و هۆڵەندا بوون.

ئەمە هەندێک لە شێواز و تەکتیک و دیاردەی ئیمپریالیزمی ئەوروپین، پەرەسەندەکانی ئیمپریالیزمی ئەوروپی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و کاردانەوەکانی لە پارسەنگی نێودەوڵەتی پێویستیی بە چاوخشاندنێکی خێرا هەیە، هەوڵدەدەین گۆڕانەکان ئەوانەی چالاکیەکانی ئیمپریالیزم پێیدا تێپەڕیوە دەستنیشان بکەین.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم بەریتانیا دڵنیا بوو، کە موستەعمەرەکانی لە چاوبرسی و دڵەقینەکان دوور و پارێزراوە، کلیلی دەریاکانیش بە دەست خۆیەتی:

١- سانتا لۆشیا لە دوورگەکانی هیندی رۆژئاوا.

٢- (راس الرجاء الصالح) (موستەعمەر کاب)

٣- دوورگەی ئیمزایشۆس.

٤- چیای تاریق (جبل طارق).

٥- عەدەن.

٦- بەحرێن.

٧- سەنگافورە.

٨- هۆنگ کۆنگ.

بەریتانیا لەلایەن وڵاتە ئەوروپییەکان بە هۆی فراوانیی موستەعمەرەکانییەوە خۆشەویست نەبوو، لەلایەن وڵاتەکانیشەوە دڵنیا کرابووەوە، کە لە مەترسییەکان دوورە، ئەمەش دوای شکستەکانی روسیا لە شەڕی قەرمی ١٨٥٦ و شکستەکەی فەرەنسا بەرانبەر بە روسیا لە ١٨٧١.

بەڵام روسیا دوای شەڕی قەرم دەوڵەتی عوسمانیی بۆ چالاکییە ئیمپریالیزمیەکانی بە مایەی پەسەندی نەدەزانی، بۆیە رووی وەرگێڕایە ناوەڕاستی ئاسیا و سیبیریا.

سەبارەت بە داگیرکاریی سیبیریا هیچ کێشەیەک دروست ناکات، بەڵام بۆ ناوەڕاستی ئاسیا و ئەفغانستان بە تایبەتی، مەسەلەیەکی دڕکاوی و ئاڵۆز بوو، چونکە لە سیاسەتی بەریتانی ئەوە هەبوو رێگە بە روسیا نەدات بەرەو سنوورەکانی هیندی باکوور هەنگاو بنێت. بەریتانیا کاری بۆ ئەوە دەکرد شوێنی بەگژیەکداچوونی بەریتانیا و روسیا لێوارەکانی هیندی باکوور نەبێت، بەڵکو لە ناوجەرگی ئاسیای ناوەڕاست بێن، لێرەوە ئەفغانستان بوو بە ناوچەی ناکۆکییەکانی روسیی - بەریتانی.

ئینگلیزەکان لە راگرتنی هێزەکانی روسیی رەو هیند سەرکەوتن، ئەمە بووە هۆی ئەوەی روسیا بیر لە تاقە رێگەی فراوانبوون بکاتەوە، کە مەنشوریا و کۆریان بۆیە لەم ناوچانە دەستی بەسەر پانتایی زۆرەوە گرت لە چین و قەوقاز و تورکستان [١٠]. لە ئەفریقیاش بەریتانیا شوێنپێی خۆی بە چاکی کردبووەوە (وەکو کاب لە ساڵەکانی ١٨٠٠ەوە تا ١٨٧٤) لەو کاتەوە ڕووبەڕووی کێبڕکێیەکی توند بووەوە لەگەڵ فەرەنسا و هەردوو وڵاتە تازەپێگەیشتوەکەی ئەوروپا (ئیتاڵیا و ئەڵمانیا). کێبڕکێکە لە نێوان ئەم وڵاتانە زۆر توند بوو، هەموو شێوازێکی فرتوفێڵە سیاسیەکانیان لەگەڵ یەکتر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بەکار دەهێنان. فەرەنسا و ئیتاڵیا دەسەڵاتی لەیەک نزیکیان لە تونس

---

[١٠] دەبێت تورکمانستانی ئێستا بێ...

هەبوو، هەریەکەیان هەوڵی وەلاتانی ئەوی تریانی دەدا بۆ ئەوەی خۆی تەنیا بمێنێتەوە، لەم هەوڵەیاندا فەرەنسا سەرکەوت و لە ١٨٨١ توانیی فێڵ لە ئیتالیا بکات، هەمان فرتوفێڵ ئینگلیز لەگەڵ فەرەنسا بەکاری هێنا لە میسر. ئەوە بوو لە هەشتاکان ئەڵمانیاش هاتە ریزی ئیمپریالیزمەوە دوای ئەوەی بووە خاوەنی هێزێکی سەربازیی مەزن و خاوەن سەرمایە، دوای ئەوەی توانیان ئەڵمانیا یەکخەن ئەم سەرمایەیان پاشکەوت بوو. ئەوە بوو ئەڵمانیا روەو ئەو وڵاتە ئەفریقیانە چوو، کە تا ئەوکات ئیمپریالیزمەکان پێی نەگەیشتبوون، بە خێراییەکی زۆر لە ١٨٨٤ توانیی خۆی بگەیەنێتە ناوچەیەکی پان و بەرینی ئەفریقیا و لە دەستی ئیمپریالیزمیان بپارێزێت.

بەڕاستی لە ساڵی ١٨٨٤ بەدواوە بسمارک و حکومەتی ئەڵمانیا ئەوانەی دوای ئەویش هاتنە سەر حوکم، لە ئەوروپا بۆ دابەشکردنی وڵاتەکان لە نێوان خۆیاندا خاوەنی وتەی سەرەکی بوون، ئەمە بە ڕوونتر ئەوسا دەرکەوت، کاتێک ئەم هۆکارانە بوونە هۆی بەستنی کۆنگرەی بەرلین لە ١٨٨٤ -١٨٨٥.

دۆزەرەوە (کاپتن کامرۆن) لە چەند گەشتێکیدا دەریخست، کە گۆمی ڕووباری کۆنگۆ بە ڕووباری نیلەوە نە بەستراوەتەوە، لەو میانەدا پەیماننامەیەک لەگەڵ سەرۆکهۆزە کان ئیمزاکرا و مافی پاراستنی خۆیان و وڵاتەکەیان بە بەریتانیا دا. هەرچەندە حکومەتی بەریتانیای ئەوکات لەوێ بەرپرس نەبوو، بەڵام ئەمە دەرفەتێک بوو بۆ پادشای بەلژیک - گەنجینەی وڵاتیان خاڵی بوو - تا داوا لە وڵاتە ئەوروپییەکان بکات لە پایتەختی بەلژیک کۆنگرەیەک ببەستن بۆ مەبەستی ئاشکراکردنی ئەوەی لەناو ئەفریقیادا هەیە وەکو پێشینەیەک بۆ دەستکردن بە ئەرکی (پیاوی سپی) و بڵاوکردنەوەی زانین و شارستانی لەناو ئەفریقیا.

لە ئەنجامی ئەو کۆنگرە بوو دۆزەرەوەی ئینگلیزیی بەناوبانگ (ستانلی)یان نارد بۆ مەبەستی دۆزینەوەی ڕووباری کۆنگۆ لەسەر ئەرکی پادشای بەلژیک، فەرەنساش پیاوێکی خۆی بۆ هەمان مەبەست نارد بە ناوی (برازا). دواتر هەردوو پیاوەکە لە ١٨٨١ بانگخوازی ئەوەیان دا، کە مافی ئەو ڕووبارە بۆ هەردوو وڵات دەگەڕێتەوە (فەرەنسا، بەلژیک). بەڵام بەریتانیا مەبەستی بوو کۆنگۆ لەدەست هەردوو وڵات دەربهێنێت و بیخاتە ژێر دەسەڵاتی پرتوگال (کە وڵاتە ئەوروپییەکان حەزی لێ ناکەن)، چونکە ئەوکات بۆ

بەریتانیا ئاسانتر دەبوو لە ڕێگەی پرتوگالەوە دەست لە ئەفریقیا وەر بدات. بەڵام ستانلی، کە لەسەر ئەرکی پادشای بەلژیک کاری دەکرد، ڕەتی کردەوە و هەڵسا لەگەڵ چەند سەرۆکهۆزی گۆمی کۆنگۆ ڕێککەوتنێکی لەگەڵ ئیمزاکردن تا داخوازیەکانی پرتوگال پووچەڵ کەنەوە.[11] لە پێناو دوورکەوتنەوە لە دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان وڵاتە ئەوروپییەکان بسمارک پێشنیاری بەستنی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیی کرد لە بەرلین بۆ چارەسەری کێشەی کۆنگۆ بەتایبەتی و کێشەکانی ئەفریقیا بەگشتی.

## بۆچی ئەم بانگەوازە لە بسمارکەوە هات لە کاتێکدا ئەڵمانیا هیچ بەرژەوەندیەکی لە کۆنگۆ نەبوو ئەو خەریکی تۆگۆلاند بوو؟

ئەوەی ڕاستی بێت ئەڵمانیا لەسەر دەستی بسمارکی راوێژکارەکەیەوە بڕوای بەوە بوو، کە دەبێت تێڕوانینەکانی ئیمپریالیزم لەلایەن بۆرجوازیەتی تازەپێگەیشتووی ئەڵمانیا تێر بکرێن. دواتر بسمارک درکی بەوە کرد، کە کات پێگەیشتووە بۆ ئەوەی ئەڵمانیاش لەو پێشبرکێیە ئیمپریالیزمیە بەشدار بێ، بۆ ڕێگەگرتن لە بەردەم وڵاتە ئەوروپییەکانی تر لە دەستگرتن بەسەر ئیمپراتۆریەتی ئیمپریالیزمی، دواتر بۆ ئەوەی لە بەردەم وڵاتانی تریش دەرگا واڵا بێت، ئەوەی بیەوێت پارچەیەک لە ئەفریقیا بۆ خۆی دەستی بەسەردا بگرێ. چونکە بە دیدی بسمارک داگیرکردنی ئەفریقیا نابێت لە ڕێگەی بەیەکدادانی سەربازی جێبەجێ بکرێت، بەڵکو لە ڕێگەی کۆنگرەی نێودەوڵەتییەوە دەبێت ئەنجام بدرێت، دیارە وڵاتە ئەوروپییەکانیش لەگەڵ ئەم بۆچوونە کۆک بوون، بیرۆکەی بەستنی کۆنگرە سەرکەوتنی هێنا لە نۆڤەمبەری ١٨٨٤ تا شوباتی ١٨٨٥ کۆنگرەی بەرلین بەسترا.

لەم کۆنگرەیە هەریەک لەو وڵاتانە ئامادە بوون، شاندی ئینگلتەرا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، روسیا، دەوڵەتی عوسمانی، بەلژیک، هۆڵەندا، نەرویژ، سوید، ئیسپانیا و پرتوگال، بە ئیمزاکردنی پەیماننامەیەک کۆتایی هات، کە دەقەکەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- بێلایەنی گۆمی کۆنگۆ و بازرگانی لێی ئازاد دەبێت.

٢- ئازادی دەریاوانی لە گۆمی کۆنگۆ و نیجەر.

[11] وەنەبێ ئەم سیاسەتەی ستنلی دژی بەریتانیا بێ، چونکە ئەو توانایەی هەبوو هاوبەشییەک لە نێوان چالاکییەکانی خۆی و بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دروست کات

٣- پووچەڵکردنەوەی بازرگانیکردن بە کۆیلە و لەناوبردنی ئەوانەی ئەم کارە دەکەن.

٤- هەر وڵاتێکی ئەوروپی بیەوێت وڵاتێکی ئەفریقی داگیر بکات، دەبێت ئاگاداری وڵاتەکانی تر بکاتەوە. ئەگەر وڵاتێک لە وڵاتەکان بانگخوازی ئەوەی کرد، کە ئەو وڵاتە لەژێر پاراستنی خۆی دایە، ئەمە کاری پێ ناکرێت دەبێت داگیرکردنیش لەتەک پاراستنەکەیدا رابگەیەنێت.

ئەم بڕیارانە زەمینەیان بۆ راگەیاندنەکەی بەلژیک خۆش کرد، تا دەرکەوتنی کۆنگۆی ئازاد رابگەیەنێت وەک کارئاسانیەک بۆ داگیرکردنی، پاش ئەوەی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٨٤ بە چەند چالاکیەکی داگیرکاری هەڵسا، بووە خاوەنی پانتاییەکی زۆری خاکەکانی ئەفریقی لەم شوێنانەی خوارەوە:

١- تۆگۆلاند

٢- کامیرۆن

٣- باشووری رۆژئاوای ئەفریقیی

٤- تەنجانیکا

٥- ناوچەی (ویتو) لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا لەگەڵ دوورگەی (هلیگۆلاند) ئاڵوگۆڕی پێکرا، ئەم دوورگەیە خاوەنی پێگەیەکی ستراتیژیی بوو بۆ بەرگریکردن لە ئەڵمانیا لە دەریاوە.

دەبینین شەڕی کۆمپانیاکان لە سەدەی هەژدەهەم توندتر دەبن، وڵاتە ئەوروپییەکان - ئەوانەی بە ئیمپریالیزمیەوە خەریکن- لە ململانێ و کێبڕکێدا بوون تا هەرچی پتر کۆمپانیاکانیان بگەیەننە ئەفریقیا لە رێگەی گرێبەست و رێککەوتننامە لەگەڵ سەرۆکهۆزەکاندا، لەم رێگەیەوە دەستیان بەسەر وڵاتەکاندا دەگرت و هەر زو ئاڵای خۆیان دەچەقاند و بەم کارەش ئەفریقیایان زیاتر پارچەپارچە کرد.

کەمتر لە دوو سەدە لە نێوان ١٨٠٠ - ١٩٠٠ وڵاتە ئەفریقییەکان یەک لەدوای یەک کەوتنە بن دەستی وڵاتە ئەوروپییەکان بەپێی کاتی ژێردەستبوونیان بەم شێوەیەی خوارەوە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| گانا | ١٨٧٤ | کۆنگۆی فەرەنسی | ١٨٨٠ |
| تونس | ١٨٨١ | نیجیریای باشوور | ١٨٨١ |
| میسر | ١٨٨٢ | تەرابلس (لیبیا) | ١٩١١ |
| سۆماڵی فەرەنسی و سۆماڵی بەریتانی | | | ١٨٨٤ |
| ئەفریقیای باشووری رۆژئاوا (ئەڵمانیا) | | | ١٨٨٤ |
| تۆگۆلاند | ١٨٨٤ | کامیرۆن | ١٨٨٤ |
| ئەفریقیای رۆژهەڵاتی ئەڵمانی | | | ١٨٨٤ |
| ئەریتێریا | ١٨٨٥ | ریۆدۆرۆ | ١٨٨٥ |
| کۆنگۆی ئازاد (بەلژیک) | | | ١٨٨٥ |
| سەنیگال | ١٨٨٥ | گینیای پرتوگالی | ١٨٨٥ |
| گینیای فەرەنسی | ١٨٨٥ | تەرنسفال | ١٩٠٢ |
| پارێزراوی بچواناڵاند | | | ١٨٨٥ |
| مەدەغەشقەر | ١٨٨٦ | کینیا | ١٨٨٦ |
| تنجانیکا | ١٨٨٦ | سۆماڵی ئیتاڵی | ١٨٨٧ |
| رۆدیسیا | ١٨٩٠ | ئۆگەندا | ١٨٩٢ |
| ئەفریقیای فەرەنسیی رۆژئاوا | | | ١٨٩٣ |
| نێجیریای | ١٨٩٥ | سوودان | ١٨٩٨ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | باكوور |
| ١٩٠٤ | | | مەراكش (مەغریب) |

ململانێكانی وڵاتانی ئەوروپی لەسەر دەستگرتن بەسەر وڵاتە ئەفریقی و ئاسیایەكان باشترین سەنگی مەحەک بوون بۆ دەرخستنی نیازەكانیان بەرانبەر بە یەكتر.

بۆ نموونە روسیا لەگەڵ بەریتانیا توشی بەیكدادان هات لە ناوەڕاستی ئاسیا و ژاپۆن و مەنشوریا، ئەوكاتەی ئەڵمانیا لە كۆنگرەی بەرلین دەستی لێ بەردا، هەستی بە تاڵییەكی زۆر كرد، فەرەنسای دەبینی كە چۆن هێڵی ئاسنینی بۆ دابینكرد لە سیبیریا وەكو دۆستێكی تاسەر و بە وەفای دەهاتە بەرچاو.

ئیتاڵیا، كە بە دەستی خاڵی لە كۆنگرەی بەرلین دەرچوو و فەرەنساش كڵاوی نایە سەر لە مەسەلەی تونس، كاری بۆ نزیكبوونەوە لە ئەڵمانیا و نەمسا دەكرد، وەستانی ئەڵمانیا لەتەک كۆماری ئۆرنج و ترنفال دژی ئینگلتەرا تا ئەو كاتەی ئینگلتەرا هەردوو بەرەبەرەكانی خۆی دەبینێتەوە (روسیا و فەرەنسا )، كە بوونەتە هێزێكی بەتوانا بۆ بەربەرچدانەوەی هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیەكە: نەمسا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، بووە هۆی ئەوەی فەرەنسا و بەریتانیا لەیەک نزیک ببنەوە، كە پێی وترا خۆشگوزەرانی ١٩٠٤، فەرەنساش هەوڵی لەگەڵ یەكهاتنەوەی بەریتانیا و روسیای دا لە ١٩٠٧ ، ئەویش پێی وترا (تەبایی خۆشگوزەرانیی روسیی -بەریتانی ) لە بەشی داهاتوو هاوپەیمانێتیەكان و دژە هاوپەیمانێتیەكانی ئەم تەبایی و خۆشگوزەرانییەی ئاماژەمان پێیان داون باسیان دەكەین.

# بەشی نۆیەم

## هاوپەیمانێتی و دژەهاوپەیمانێتی و تەبابیەکان ١٨٧٣ - ١٩٠٧

- هاوپەیمانێتی سێ قۆڵی (١٨٧٩ - ١٨٨٢)
- هاوپەیمانێتی دووقۆڵی (١٨٩٣)
- تەبایی (ویفاق) بەریتانیی- ژاپۆنی (١٩٠٢)
- تەبایی (ویفاق) بەریتانیی- فەرەنسی (١٩٠٤)
- تەبایی (ویفاق) بەریتانیی- روسی (١٩٠٧)

## هاوپەیمانێتی سێ قۆڵی

دروستبوونی ئیمپڕاتۆریەتی ئەڵمانی دوای ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی وەدەستی هێنابوون کاریگەریەکی رەگەزپەرستانەی نەتەوەپەرستیی زۆری لەسەر دەروونی تاکی ئەڵمانی کردبوو، تەنانەت لای هەندێک کەس ئەو سەرکەوتنانەیان بە کارێکی خوایی دەگێڕایەوە، گوایە خوا لەم سەرکەوتنانەی مەبەستە ئەڵمانییەکان پەیامی شارستانی و پێشکەوتن بە دونیا بگەیەنن و دەسەڵاتی نەخشەکێشانی دونیا خراوەتە دەست بلیمەتەکانی ئەڵمانیا - ئەمە بەپێی بۆچوونی خۆیان- گوایە ئیمپڕاتۆریەتی بەریتانیا ئاوا نامێنێت و لە شوێنە ئەو ئیمپڕاتۆریەتی ئەڵمانیا دێت، ئەمە لە دانیشگاکانیش لەسەر زاری هەندێک لە مامۆستاکان دەوترایەوە، لە وانە: هاینریخ ڤۆن تریتچکە.



هاینریخ ڤۆن تریتچکە

بەم بانگەوازانە ئەوروپییەکان مەترسیان لەم گەنجە بلیمەتە پەیدا کرد، ئەوان بڕوایان وا بوو، کە ئەڵمانییەکان هەر کوێیەکی ئەم دونیایەیان بووێ، دەتوانن لەسەری داکوتن، جا ئەو شوێنە نەمسا بێت یان سویسرا گرنگ نییە، ئەمەیان بۆ مەبەستی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئەڵمانی بوو.

ئەوەی ئەم مەترسیانەیان مەزن دەکردن دید و روانینەکانی بسمارک بوون، کە ببووە جێی مەترسی قسە و باسی فەرمانگە ئەوروپییەکان لەسەر ئەم پیاوە. دەستی بە گەلێک سەرەداوی دیبلۆماسیی ئاڵۆزی ئەوروپاوە گرتبوو، تەنانەت بەریتانیا خۆشی هەوڵی راوێژکردنی دەدا تا بۆ مەسەلە کۆتکراوەکانی روسی، کە لە کۆنگرەی پاریس لە ١٨٥٦ بڕیاریان لەسەر درابوو، راو بۆچوونەکانی وەرگرێت.[١٢]

ئەوسا ئیتر شەڕێکی هەمەلایەنیی رۆژنامەوانی و یاسایی و بۆچوونی لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی و داگیرکردنی خاکی نەتەوەیەک لەلایەن نەتەوەیەکی تر بەرپا ببوو، ئەوە بوو زاناکانی فەرەنسی - وەکو بەرگریکردن لە ماف - پەنجەی تاوانیان ئاراستەی بسمارک کرد، کە بە خۆپەرستی و بڕوای هێزەوە دەستی بەسەر لۆرین داگرتووە و هەوڵی سڕینەوەی سیماکانی دەدا و بۆ سیمای ئەڵمانیی دەیگۆڕین. وڵاتەکانی ئەوروپی بە هەستیارییەوە سەیری ئەم بلیمەتە یان دەکرد، کە رێز لە مافی چارەی خۆنووسینی گەلان ناگرێت و رەخنەیان ڕووبەڕوو دەکردەوە، بەڵام ئەم بە سینگێکی کراوە رەخنەکانی وەردەگرتن، چونکە ماوەیەک بوو ئەم لەگەڵ ئەو بۆچوونانە یەکلا ببووەوە. ئەوە نییە دەبووایە پرۆسەی ریفراندۆم لە هەردوو بەشەکەی دانیمارک لە هەرێمەکانی شلزوینج و شلزویگ بەپێی ئاشتەوایی پراگ لە ١٨٦٦ لە نێوان نەمسا و ئەڵمانیا دەبووایە ئەنجام بدات، بەڵام بسمارک ئەمەی پشتگوێخست و کەسیش نەیکردە هەرا وەکو مەسەلەی لۆرن.

چونکە هاوسەنگ و بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە ١٨٧١ توشی هەژان و مەترسی نەبوون وەکو ئەوەی لە ساڵی ١٨٦٦ رویدا، لە ڕووێکی تریشەوە وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا - فەرەنساش لە ناویان- هیچ بەهایەکیان بۆ چەمکی مافی چارەی خۆنووسین دانەدەنا، چونکە ئەوان خۆیان وڵاتانی عەرەب و ئەفریقیا و ئاسیایان داگیرکردبوو.

ئەم دیاردە شەڕاوییانەی بروسیا دژی دانیمارک و نەمسا و فەرەنسا خولقاندبوونی ناخی فەیلەسووفەکانی ئەوروپیی وروژاندبوو، بەتایبەت کاتێک ڕووداوەکانی ئەو سەردەمیان بەرچاو دەخستن لە شۆڕشی فەرەنسیی مەزنەوە لە (١٨٧٩) تا راگەیاندنی

---

[١٢] ئەمە جۆرێکە لە سیاسەتی مەکربازیی بەریتانیا کاتێک بیەوێت دۆستایەتی وڵاتێک وەدەست بێنێت بۆ مەسەلەیەکی لەم بابەتە پرسە خەسوانییەکی پێ دەکات، تا ببێتە سەرەتایەک بۆ بەرژەوەندی ئاڵوگۆرکردنی سیاسەتەکانی لە سیاسەتە دڕندانەییەکانی ئەڵمانیا نیانتر نییە

ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی لە (١٨٧١). دەیانبینی ئەوروپا لەو ماوەیەدا خوێنی ژمارەیەکی زۆری گەنج و پیر ومندالی رشتوە و کاولکاریی زۆری لە شەڕەکانی سترلز، بینا، تورفی ئەگەر، لیبزج، دەوروبەری ئەستەمبۆل، هەروەها لە جانتا، سلفرینو، لە سادوا و سیدان و دەوروبەری پاریس ناوەتەوە، هەروەها لە شەڕە خوێناوییەکانی هەرێمەکانی فەرەنسی دژی داگیرکارانی بروسی پێگەییوە. فەیلەسووفەکان لەم ڕووداو و خوێنرشتنە بێزار ببوون ئەوەندە خوێنە لە ئەڵمانیا و فەرەنسا برژێت لەپێناو سەروەری و خۆشەویستی نەتەوەو وڵات و لە پێناو لۆرین و ئەلزاس، بۆیە بانگەوازی (یەکێتیی ئەوروپایان) راگەیاند، تا بنەماکانی مرۆڤایەتی و (یاسای نێودەوڵەتی) و (یاسای چەک داماڵین) و (یاسای ناوبژیوانی) بکەوێتە نێوانیان و کێشەکانیان بۆ یەکلا بکاتەوە . ئەم بانگەوازە وەکو بەخۆداهاتنەوەیەک بۆ پادشا و فەرمانڕەواکانی وڵاتان بوو، تا کاتێک رەفتار دەکەن، وانەزانن هێز و دەسەلاتیان لەدەستە دەتوانن وەکو کۆمەڵێک چەتە و رێگر هەڵسوکەوت بکەن، هەر یەکەو نیازی تالانکردنی ئەوی تری هەیە و یەکتر دەکوژن بەر لەوەی بکوژرێن، ئەمانە وەکو بانگەوازی هێورکردنەوە و بەخۆداهاتنەوە راگەیەندران.

رابەر و مامۆستای یاسای نێودەوڵەتیی بەناوبانگ (جیمس لۆریمەر) رەنجێکی زۆریدا تا بیرۆکەی بنەما یاساییەکانی (یەکێتیی ئەوروپا) دابڕێژێت، هەروەها ڤیکتۆر هوگۆی -لوتکەی بیری ئەدەب- و گاریبالدیی - لوتکەی شکۆمەندی سەربازی- لە ١٨٦٧ سەرپەرشتی دەرکردنی گۆڤارێکیان کرد بە ناوی (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەورپیی) بەڵام تەمەنی کورت بوو، بە هۆی ئەوەی سەردەم سەردەمی ئەم جۆرە چەمکانە نەبوون، بەڵکو سەردەمی دەمارگیری نەتەوایەتی بوو. تەنانەت بسمارک خۆیشی - بلیمەتی سیاسەتی ئەوروپی- لە بەرانبەر ئەم بۆچوونانە پەکی کەوتبوو، دەیوت: "ئەو کەسە هەڵە دەکات ئەگەر بڵێت ئەوروپا تەنیا دەربڕینێکی جوگرافیانەیە".[١٣] بسمارک ئەمەی دەزانی کە هێزی ئەڵمانیا کلیلی سەرکەوتنەکانیەتی و بەرپەرچدەرەوەی مەزندەکانی فەرەنسایە بۆ تۆڵە وەرگرتنەوە، هەروەها دابڕاندنی فەرەنساش کرۆکی فاکتەرەکانە بۆ رێگەگرتن لە بەردەم هاوکاریکردنی فەرەنسا لە رووی سەربازییەوە لەگەڵ

[١٣] ئەمە بەراورد پێ بکەوە لەگەڵ ئەوەی مەترنیخ بەر لە یەکیەتیەکەی وتی، ئەوەی ئێستا ئەوروپا لە شەستەکان و حەفتاکان لەم سەدەیە رووەو (یەکێتیی ئەروپا ) پیادەی دەکەن.

هێزێکی ئەوروپیی تر دژی ئەڵمانیا. دواتر خەریکبوونی فەرەنسا بە چالاکییە داگیرکارییەکان لەوبەری دەریاوە دوور دەکەوێتەوە لە بایەخدان بە لۆرین و ئەلزاسی، ئەمەش لەگەڵ وڵاتە مەزنەکان تووشی کارەساتی دەکات، کە بە هۆیەوە هاوپەیمانێتیی لەگەڵ نابەستن. بسمارک لەوە دڵنیا بوو، کە ناتوانێت لەو کەلێنە بپەڕێتەوە، کە کەوتۆتە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا، هەرچەندە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٧١ دۆستایەتی خۆی بۆ ئەڵمانیا دەربڕیوە، بەڵام کێشە مەزنەکە لەوە دابوو بسمارک چۆن دەتوانێت لە یەک ساتدا خۆشەویستی و دۆستایەتیی روسیا و ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا وەدەست بێن ؟ چۆن ئەڵمانیا دەتوانێت بەردەوام خۆی بەهێز بکات بێ ئەوەی مەترسیی وڵاتە کانی تر بووروژێنێت و لە هەمان کاتیشدا لە رێگەی خۆبەهێزکردنەوە فەرەنسا لاواز کات؟

ئامانجەکانی بسمارک جارووبار لێرە و لەوێ توشی دژایەتی و رکابەریەک دەبوون، کارێکی قورس بوو دڵی هەموو لایەک رازی کات، بارودۆخی دونیا گۆڕابوو و هەڵوێستە نێودەوڵەتییەکان لە پەرەسەندن و ئاڵوگۆر دابوون، بە تایبەت لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم.

بسمارک دوای پەیماننامەی فرانکفۆرت لە ١٨٧١ لەوە دڵنیا بوو، کە فەرەنسا ناتوانێت -تا چەند ساڵێکی تر- لەسەر پێ بووەستێت، بەڵام بۆچوونەکانی هەڵەبوون، چونکە گەلی فەرەنسی بە هانای وڵاتەکەیانەوە چوون. ئەو کاتەی کۆمەکی حکومەتیان کرد بە کۆکردنەوەی سزا سەپێندراوەکان، پارەکەیان کۆ کردەوە و بەر لە وادەی خۆی دایان بە ئەڵمانیا، تا کۆتایی بە داگیرکاریەکەی بێنێ[14]. لە میانەی حکومەتەکەی تییر

[14]{ بۆ مسۆگەریی پارەدانەکە، کە ماوەی ٥ ساڵیان بۆ دانابوو ئەڵمانیا لەشکرێکی لەسەر خاکەکەی دانابوو بە خەرجیی فەرەنساوە ،تا ئەو کاتەی پارەی دیاری کراو وەکو سزا بە ئەڵمانیای دەداتەوە، بەڵام فەرەنسییەکان بەر لە تەواوبوونی وادەکە بە ٢ ساڵ پێش پارەکەیان رەتکردەوە و کۆتاییان بە داگیرکاریەکەی ئەڵمانیا هێنا...وەرگێر}.



تییر

، کە بە لاوازی تۆمەتبار دەکرا، ئەم پیرەپیاوە توانیی مۆڵەتێک بە فەرەنسییەکان بدات بۆ ئەوەی بەئارامی و بە شێنەیی بیر لە کێشەکان بکەنەوە و گەلی فەرەنسیش بکەوێتە ئەو بڕوایەی، کە ئیتر با ئامانجی سەرەکیی فەرەنسییەکان ئاشتی و ئاوەدانکردنەوە بێت، بۆ کێشەی لۆرین و ئەلزاسیش داواکردنی دادپەروەری بێت وێڕای توردانی بیرۆکەی (جەنگ و تۆڵە).

ئەم سیاسەتە رەنگدانەوەی خراپی لەسەر بانگەوازەکەی بسمارک کرد، کە بانگەشەی جەنگی خۆپاراستنی دژی فەرەنسا کردبوو، لە نێوەندی فەرمانگە ئەورووپییەکان بە خراپ لەسەر ئەڵمانیا شکایەوە. بەریتانیا و روسیا لە وتەکانی بسمارک وەرس بوون کاتێک داوای جەنگی خۆپاراستنی کرد بوو، ناچار بوو بانگەوازەکەی بکێشێتەوە، ئەمەش بۆ فەرەنسا دەرفەتێکی باش بوو تا بینای هێزی ئابووریی و سەربازیی خۆی بکاتەوە لەسەر بنەمایەکی بەهێز و هێمنانە.

دوای ئەمە ترسەکانی بسمارک لە فەرەنسا زیادیان کرد، دوای رووخانی تییر لە مایۆی ١٨٧٣ دیارە کە سیاسەتی ئاوەدانکردن و ئاشتی ئەویش بۆ ئەڵمانیا دەرفەتێکی باش بوو تا نەخشە و پلانی ئابووریی و دووبارە دامەزراندنەوەی دەزگا دەوڵەتیەکانی بکاتەوە، کە ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی پێویستیان پێیەتی. دواتر ماکماهۆنی پادشاخوازی

کاسۆلیکیی دوژمنی سەرسەختی ئەڵمانیا- ئەمە بە دیدی بسمارک- هاتە سەر حوکم، کە دەبووایە سیاسەتێکی نوێی لەگەڵ ئەم گۆڕانانە پەیڕەو بکرێن.



ماکماهۆن

ماکماهۆن هەوڵی دا زیاتر لە روسیا و نەمسا نزیک بێتەوە، بسمارک قەیسەر و ئیمپڕاتۆریەتی گەیاندنە ئەو بڕوایەی.. کە بارودۆخەکان وا پێویست دەکات هاوکاریی توندترلە نێوان ئیمپڕاتۆرەکانی رۆژهەڵات و ئەروپا و ناوەڕاست هەبێت، دواتر هەندێک ئامانجی هاوبەش هەبوون، کە هەرسێ هێزەکەی بە یەکەوە دەبەستنەوە ئەوانیش:

١- کەسیان حەزیان لێ نەبوو گۆڕانکاری بکەوێتە ئەوروپا (ئەم دۆخەی کە هەیە بەردەوام بێ).

٢- بزووتنەوە جەماوەرییەکانی دژی حکومەتە ستەمکارەکان لە (روسیا) و (نەمسا و هەنگاریا) و (ئەڵمانیا) تازە بووژابوونەوە، بەو نەگەرەوە بۆچوونەکانی هەردوو حکومەتی سانبترسبۆرگ و بەرلین -بەشێوەیەکی تایبەتی- دژی بزووتنەوە سۆشیالیستیەکان لە یەک نزیک ببوونەوە.

٣- کێشەکانی بەلکان بەرەو ئاڵۆزی دەچوون، هەر یەک لە روسیا و نەمسا تاکرەوانە دەستیان لە کارەکان وەربدابایە مانای ئەوەی دەبەخشی، کە هەردوو وڵاتەکە بەرەو شەڕ هەنگاو دەنێن، واتە شەڕ لە نێوان هەردوو دۆستی ئەڵمانیا رودەدات. ئەمەش لە بەرژەوەندیی بسمارک دابوو، کە ئەم کێشەیە لە رێگەی وتووێژ و بە دانیشتن چارەسەر بکرێت نەک لە مەیدانی شەڕ. بەتایبەت کاتێک شەڕ دەکەوێتە نێوان روسیا و نەمسا

ئەڵمانیا ناتوانێت دۆستیان بێت، واتە ئەڵمانیا بچێتە پاڵ هەرلایەکیان مانای ئەویتر بەرەو دۆستایەتی و هاوپەیمانێتیی فەرەنسادا دەچێت.

ئەمانە دوای دانوستانێکی دوور و درێژ و دوای وازهێنانی بسمارک لە سیاسەتی (جەنگی خۆپاراستن) دژی فەرەنسا هەمووی بوونە ئەگەری دامەزراندنی (دەستەی سێ ئیمپراتۆرەکە) لە ١٨٧٣[15]. ئەوەی رواڵەت بێت تەنیا ئەم هەڵوێستەی روسیا بەرانبەر بە (جەنگی خۆپاراستن) ئەوە دەگەیەنێت، کە دڵی روسیا لەگەڵ فەرەنسایە.

دەستەی سێ ئیمپراتۆرەکە پێویستیان بە قەیرانێک هەبوو بۆ ئەوەی تواناکانیان تاقی بکرێنەوە، ئەوەتا چەندین کێشە لە چاوەڕوانیی وڵاتە مەزنەکان دان، بەتایبەت لە بەلکان. پێشتر ئاماژەمان بەو کێشە ئاڵۆزانە دابوون، کە بوونە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی تورکیی روسی لە ١٨٧٧ و ئەنجامەکانی کۆنگرەی بەرلین لە ١٨٧٨ لە هەموویان گرنگتر مەزندەی قەیسەربوون، کە بە بۆچوونی ئەو ئەم کۆنگرانە هیچ بایەخێکیان نییە، تەنیا چەند هاوپەیمانێتیەکن بە فەرماندایەتی بسمارک دژی روسیا. ئەوان نەمسایان لە ئێمە پێ باشتر بوو، بۆیە لە کۆنگرەی بەرلین بە دەستکەوت لێی دەرچوو، ئەو ئەنجامانە روسیا چاوەڕوانی نەدەکردن.

بەم شێوەیە گۆڕانەکان سەلماندیان، کە ناکرێت دۆستایەتی دوو وڵاتی رکابەری یەک بکات دواتر روسیا لە کۆنگرەی بەرلین بە دەستی خاڵی دەرچوو، لەگەڵ بوونی دەستەی سێ ئیمپراتۆرەکە. گومان لەوەدا نییە کە لە فەرەنسا نزیک دەبێتەوە، هاوپەیمانی سەقامگیر - بە بۆچوونی بسمارک - کە دەکرێت پشتی پێ ببەستین، ئیمراتۆری نەمسا و مەجەرە، روسیاش زۆر بگۆڕ نییە. دواتر هاوپەیمانێتیی لەگەڵ نەمسا لەو داواکاریانەی دوور دەکاتەوە، کە هەردەم نەمسا جەختیان لەسەر دەکاتەوە، کە بریتیە لە گەڕانەوەی بۆ رەچەڵەکی لێدابڕاوی، هاوپەیمانێتی لەگەڵ نەمسا واتە پاراستنی ئەڵمانیا لە رووی پشتەوەی، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی ئەڵمانیا لە هەر هێرشێکی فەرەنسی بێباک و پشتەستور بێت.

---

[15] بە چەند قۆناغ لە نێوان ئەڵمانیا و روسیا لە ٦ ی حوزەیرانی ١٨٧٣ و لە نێوان فەرەنسا و روسیا کۆبونەوە کران لە ٢٢ ی ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەری ١٨٧٣

بە پشتبەستن بەم بنەمایانە بسمارک لە نەمسا نزیک بووەوە، هانی ئیمپراتۆر و حکومەتەکەی دەدا تا هاوپەیمانێتیی لەگەڵ ببەستن بۆ ئەوەی توانای پاراستن و بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی هەبێت .

گەیشتن بە رێکەوتننامە لە نێوان نەمسا و ئەڵمانیا کارێکی ئاسان نەبوو، (ئەندراسی) وەزیری دەرەوەی نەمسا مەرجی قورسی دانابوون لەگەڵ ئەوەی بسمارک لەنێو دبلۆماسە ئەوروپییەکان بەوە ناسرابوو، کە مەرجەکانی لایەنی بەرانبەر پشتگوێ دەخات و کارەکان بە هەوەستی خۆی بەڕێوە دەبات. بسمارک ناچار دەبێت مەرجەکانی (ئەندراسی) قبووڵ کات، کە بریتی بوون لە: دووربوونی نەمسا لە هەر هێرشێکی یەکلایەنەی ئەڵمانی بۆ سەر فەرەنسا. بە هەر حاڵ گەیشتنە هاوپەیمانێتیەکی دووقۆڵی لە ١٧ی ئۆکتۆبەری ١٨٧٩، دەقەکەشی بەم شێوەیە:



ئەندراسی

١- لە حاڵەتی هێرشی روسی بۆ هەریەک لەم دوو لایەنە لایەنی دووەم هاوکاریی هاوپەیمانەکەی دەکات.

٢- ئەگەر یەکێک لەلایەنە هاوپەیمانەکە هێرشی کردە سەر لایەنی سێیەم، لایەنی هاوپەیمان بێلایەن دەوەستێت.

٣- لە کاتی هاوکاریکردنی ئەرێنی یان سەربازی لەلایەن هەریەک لە روسیا یان فەرەنسا، هەردوو وڵاتی هاوپەیمان بەیەکەوە ڕووبەڕووی دەبنەوە. ئەوەندەی نەبرد ئیتاڵیاش هاتە ناو ئەو هاوپەیمانێتیە لە ٢٠ی ئایاری ١٨٨٢، بەم شێوەیە بوونە سێ

قۆڵ. هاندەری سەرەکیی ئیتاڵیا بۆ ئەم هاوپەیمانێتیە ئەوەبوو - کاتی خۆی لە تونسی وەدەرنابوو - کە دڵنیا بوو لەوەی فەرەنسا ڕێگەی نادا پێگەیەکی لە باکووری ئەفریقیا هەبێت، تەنیا ئەگەر لە سەنتەری هێزەوە قسە نەکات. بۆ ئەم هاوپەیمانێتیە ئەڵمانیا خۆشحاڵی خۆی بە هاتنی ئیتاڵیا دەربڕی، چونکە بە هاتنی ئیتاڵیا فەرەنسا لە لایەکی تریشەوە گەمارۆ دەدرێت، ناتوانێ لە یەکلا هێزەکانی کۆبکاتەوە.

بەم شێوەیە بسمارک لەگەڵ لایەنە لە یەک دوورەکان پەیماننامەی بەست، لەگەڵ نەمسای ناحەزی روسیا و ئەندامی (دەستەی سێ ئیمپراتۆرەکە ) لەگەڵ نەمسای خاوەن کێشە لەگەڵ ئیتاڵیا لەسەر سنوورەکان، ئەمانە وایان کرد، کە وردە وردە ئەڵمانیا بخزێتە ناو مقۆمقۆ و ململانێکەی ئەورووپی لە بەلکان.

لەگەڵ ئەوەش بسمارک هەستی بە دووربوونەوە لە روسیا دەکرد، بۆ نزیکبوونەوە هەوڵی زۆری دا هەر نەبێت ئەگەر بە روکەشیش بێت، تا ئەو کاتەی قەیرانەکان هاتن و هەردوو لای لەیەک دوورکردنەوە، ئەویش قەیرانی بەلکان بوو لە ١٨٨٥.

## هاوپەیمانێتی روسیی فەرەنسی

لە ١٨٨٥ شۆڕشێک دژی دەوڵەتی عوسمانی لە رۆمەللیی رۆژهەڵات بەرپابوو، رایگەیاند کە خۆی خستە پاڵ بولگاریا - ئەمە سەرەڕای بڕگەکانی کۆنگرەی بەرلینی ١٨٨٧ - ئەمە بە پشتگیریەکی توندی بەریتانیا، کە بە دیدی بەریتانیا بولگاریا بۆتە دڕک لە تێلەکی روسیادا. لە بەرژەوەندی بەریتانیا دایە بولگاریا خۆی کۆکاتەوە، بەڵام سربەکان لەولاوە جەنگیان دژی بولگاریا راگەیاند، کە لە شەڕێکدا لە سلیفنتزا بولگاریەکان بەسەریاندا زاڵ بوون، لەگەڵ ئەوەش شەڕەکان کۆتاییان پێ هات و بارودۆخەکان بە بڕیاری پەیماننامەی بوخارست لە ٣ی ئاداری ١٨٨٦ بۆ سەردەمی بەر لە شەڕەکان گەڕانەوە.

لە میانە و ئەنجامی ئەم شەڕانەدا باشتر هەڵوێستەکان روون بوونەوە، کە ئیتر لەیەکدوورکەوتنەوە لە نێوان روسیا و ئەڵمانیا گەڕانەوەی بۆ نییە، بسمارک وەکو هاوپەیمانێک لە تەک نەمسا و دژی روسیا وەستا. لەگەڵ ئەمەشی لە ڕێگەی رۆژنامە و راگەیاندنەکانی هەوڵی پاراستنی دۆستایەتیی لەگەڵ روسیا دەدا، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی

ڕۆژنامەکانەوە هانی روسیا ئەدرێت هاوپەیمانیەک لەگەل فەرەنسا ئەنجام بدات، لە ١٨٨٧ توانیی لەم هەولانەی سەرکەوێت کاتێک پەیماننامەی (دووبارە متمانەپەیداکردن)یان لەگەڵ یەک ئیمزاکرد. ئەوەی ڕاستی بێت ئەم پەیماننامەیە دژی پەیماننامەی دووقۆڵی بوو -ئەمە لەسەر حسابی نەمسا بوو - دەقی پەیماننامەکە دەڵێت: ئەگەر یەکێک لەم دوو وڵاتە هێرشیان کردە سەر وڵاتێکی تر، وڵاتی دووەم بێلایەن دەوەستێ، واتە ئەگەر روسیا هێرشی کردە سەر نەمسا، ئەڵمانیا بێلایەن دەبێت.

بەم شێوەیە ناکۆکیەکانی نێوان روسیا و ئەڵمانیا قووڵتر دەبوونەوە، ئەو کاتەش ڕوونتر بوو کە پشێوی و نائارامی گەڕایەوە بولگاریا و روسیاش لە ١٨٨٧ سووربوو لەسەر ئەوەی پادشای بولگاریا فەردیناند ئۆف ساکس کۆبرج لە سەرتەختی پادشایەتی وەلانێت، بۆ ئەم هەڵوێستەی نەمسا بە توندی دژی وەستا.

کاتێک قەیسەری روسی ئاماژەی بەکارهێنانی هێز کرد دژی نەمسا، بسمارک لایەنگریی لە نەمسا کرد بە ئاماژە دان بە هاوپەیمانێتیی دووقۆڵی کە لە شوباتی ١٨٨٧ دەقی پەیماننامەکەی بڵاو کردەوە. لەم دۆزە ئیتاڵیا و بەریتانیاش دژی روسیا بوون، ئەوسا روسیا ئاستی لاوازیی خۆی زانی ئەگەر بیەوێت وشەی خۆی بەسەر کۆمەڵگای ئەوروپیدا بسەپێنێت. هەوڵەکانی دۆستایەتیی لەگەڵ ئەڵمانیا بە جدی نەبوون، بۆیە پەیماننامەکەی (دووبارە متمانەبوون) سەری نەگرت و پووچەڵکرایەوە.

ئیتر دۆخەکان هانی روسیایان دەدا تا هاوپەیمانێتیەک لەگەڵ فەرەنسا ئیمزا بکات، فەرەنساش لە ژوانی ئەو رۆژەدا بوو، هاندەرەکانی پەیماننامەکەی روسیی فەرەنسی تەنیا سەربازی نەبوون، بەڵکو ئابووریی و سیاسییش بوون.

دەتوانین فاکتەرە سەرەکیەکانی ئەم هاوپەیمانەی روسیی فەرەنسی بەم شێوەیە دیاری بەکەین:

١- لە رووی باری ئابووریی: لەو کاتەی روسیا رووی لە فراوانخوازیی ئیمپریالزمی کردبوو، بەدەست دواکەوتنی پیشەسازییەوە دەینالاند، بۆ ئەوەی ئەم دوو ئامانجە بهێنێتە دی، دەبووایە دوو ئامراز دابین بکات: سەرمایە و پسپۆڕیی. ئەڵمانیا و بەریتانیا حەزیان لە بەهێزبوونی روسیا نەدەکرد، کەوایە فەرەنسا تاقە وڵات بوو، کە بتوانێت سەرمایە و پسپۆڕی پێشکەش بە روسیا بکات. ئەم کەشوهەوایانە لە دیبلۆماسیەکان

شاراوە نەبوون، بۆیە قەرزەکانی روسی لە فەرەنسا مەودایەکی باشیان بەخۆوە بینی، فەرەنسا بۆ کێشانی هێڵی ئاسنینی روسی بەرەو رۆژهەڵات و بۆ پسپۆڕیی رێگەوبانەکانی و دامەزراندنی کارگە پیشەسازییەکان هاوکاریەکی باشی روسیای کرد.

٢- لەلایەن هەموو وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا روسیا وڵاتێکی حەزلێنەکراو بوو، گاڵتەپێکردنی لە رۆژنامە و کۆشکە پادشاییەکان کارێکی ئاسایی بوو، بە تایبەت دوای ئەوەی دۆستایەتیی ئەڵمانیای لەدەست دا، فەرەنسا بەم هەستبریندارکردنانەی دەزانی، رووناکبیرەکانیشیان هەستیان بەو پێویستییە دەکرد، کە روسیا دەبێت هاوبەستیەکی لەگەڵ وڵاتێکی ئەوروپیی بەهێز هەبێت، بۆ ئەوەی لە سەنتەری هێزەوە لەگەڵ ئەڵمانیا و نەمسا و بەریتانیا بدوێت. ئەم بۆچوونەی روسەکان فەرەنسا هەستی پێ دەکرد، بۆیە توانیی بۆ بەرژەوەندی خۆی بیان بقۆزێتەوە، بەتایبەت دوای هاتنەکایەی کێشەی بولگاریا.

لە کاتێکدا بیری کۆماریی پێشکەوتنخوازی فەرەنسی یەکێک بوو لە هۆکارەکانی لەیەکدوورکەوتنەوەی روسیا و فەرەنسا، فەرەنسا توانی بە دەستگیرکردنی هەندێک لە چەپڕەوەکان و رادەستکردنیان بە رژێمی روسیا بۆ روسیا بسەلمێنێت، کە لە هەوڵی ئەوەدا نییە رژێمی قەیسەری تێک بدات، ئەم رەفتارەی فەرەنسا لەناو دەزگا حکومیەکانی روسیا دەنگیان دایەوە. روسیا ئەم چاکەی فەرەنسای دایەوە، کاتێک ئەڵمانیا دەیەویست بە هێزەکانی دەماری فەرەنسا بگرێت. کاتێک شەپۆلی تۆڵەسەندنەوە لە ئەڵمانیا چڕتر بوون لە سەردەمی جەنەرال بۆلانجیە[١٦] لەشکری ئەڵمانیاش جووڵەیان کرد، ئەوسا هەریەک لە ئەڵمانیا و فەرەنسا هەوڵیان لەگەڵ روسیا دا، بەڵام روسیا بە ئاشکرا پشتگیریی لە فەرەنسا کرد. ئەم گۆڕانانە بوونە هۆی لە یەکتێگەیشتنێکی سیاسیانە لە نێوان فەرەنسا و روسیا لە ئابی ١٨٩١، کە تێیدا هات "سیاسەتی هەردوو وڵات بەرانبەر بە رووبەڕووبوونەوەی هەر هەڕەشەیەک لەگەڵ یەکدا بگونجێنرێت.

[١٦] ئەفسەرێکی گێل بوو، گەیشتە پلەی وەزیری جەنگ، بەردەوام نەبوو کاتێک زانرا دەمارەکانی لەدەست دان و لە فەرەنسا رایکردە دەرەوە

٣- نزیکبوونەوەی دەروونیی و سیاسیی بۆ فەرەنسا کارێکی ئەوتۆ ناگەیەنێت ئەگەر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەربازی لەگەڵ ئەڵمانیا ڕوویدات، لەگەڵ ئەوەی قەیسەری روسیا بۆ هاوپەیمانێتییەکی سەربازی لە ترسی ئەڵمانیا پەلەی نەبوو، بەتایبەت هاوپەیمانێتییە سێ قۆڵیەکەی ئیتاڵیا و نەمسا و ئەڵمانیا زۆر لە روسیا و فەرەنسا ئامەدەتر بوو بۆ هەر ڕووداوێک، بەڵام نوێکردنەوەی هاوپەیمانیی سێ قۆڵی لە ١٨٩١ پەلەی لە روسیا کرد تا هەردوو وڵاتی فەرەنسا و روسیا بە هۆی هاوپەیمانییەکی سیاسیی و سەربازیی لە یەک ببەستێتەوە. ئەمە لە دیسەمبەری ١٨٩٣ ئەنجام درا، ناوەڕۆکی هاوپەیمانەکە دەڵێت: روسیا لە تەک فەرەنسا بووەستێت ئەگەر ئەڵمانیا هێرش بکاتە سەر فەرەنسا یان ئیتاڵیا هاوکاری ئەڵمانیا بکات لە هێرشەکانی سەر فەرەنسا، هەروەها فەرەنسا پەیمان دەدات، کە لە تەک روسیا بووەستێت ئەگەر ئەڵمانیا هێرشی کردە سەر یان نەمسا هاوکاریی کرد لە هێرشەکانی بۆ سەر روسیا.

دەرکەوتنی ئەو هاوپەیمانییە دووقۆڵییەی فەرەنسیی روسیی وەکو هێزێکی بەرپەرچدەرەوە دژی هاوپەیمانێتیی سێ قۆڵی لاپەرەیەکی نوێ بوو لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ئەوروپی. دوو کوتلەی دژ بە یەک دروست بوون، دەبوایە وڵاتە ئەوروپییەکان لەسەر ئەم بنەمایە پەیوەندییەکان ببەستن، یان لایەنگری ئەم بن یان ئەو.

بەڵام لە ڕووی سەربازییەوە کوتلەی (هاوپەیمانێتیی سێ قۆڵی) لە (هاوپەیمانێتیی دووقۆڵی) بەهێزتر بوو، لەبەر ئەم هۆیانە:

١- پەرەسەندنی ئابووری لە ناوەوەی ئەڵمانیا و دەرەوەی باڵادەستیەکی بە ئەڵمانیا بەخشی، بۆیە هەر نەبێت لەگەڵ ئاستی ئەو سەرکەوتنانەی فەرەنسی دەهاتنەوە، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەدەستی هێنابوو. ئەمە لە کاتێکدا روسیا بەدەست دواکەوتوویی و داتەپینی ئابووریی و برسێتی و نەخۆشیەکانەوە دەیناڵاند، جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ ئەوروپا لە کۆتاییەکانی چەرخی ناوەڕاست.

٢- ئیمپراتۆریەتی نەمسا و مەجەر کێشەی نەتەوەکانی هەبوو، دەکرا روسیا دەست بەم خاڵە لاوازەوە بگرێت، بەڵام کێشە و گیروگرفتە ناوخۆییەکانی روسیاش هەڕەشەیان لە بنیاتنانەوەی قەیسەر دەکردن.

٣- لە رووی سەربازییەوە وڵاتانی هاوپەیمانێتیی دووقۆڵی دەبووایە لە یەک بەرە زیاتر شەڕ بکەن، هەروەها هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیەکەش بە هەمان شێوە، هەر نەبێت پەیوەندیی بەردەوام لە نێوان وڵاتانی هاوپەیمانێتیی سێ قۆڵی هەیە، بەڵام ئەمە لای روسیا و فەرەنسا نییە.

٤- بوونی ئەم دوو هاوپەیمانێتیە بەس بوون بۆ نانەوەی پشێوی لە ئەورووپا، ئەوەی پشێویەکانیان توندتر کردبوون هەوڵی لایەنەکان بوون بۆ وەدەستهێنانی لایەنگرانیان لە وڵاتانی ئەورووپی، بۆ ئەم مەبەستە فەرەنسا چاوی بڕیبووە رکابەرە کەی (ئینگلتەرا). هەر واش بوو هەڵوێستوەرگرتنی ئینگلتەرا کۆتایی بە هەردوو هاوپەیمانێتیەکە دەهێنا، ئەمە سەرەڕای بوونی هەردوو وڵاتە زەبەلاحەکە (ئەمەریکا، ژاپۆن) لە هەردوو سەری کیشوەرە کۆنەکە، بەڵام ئەوان نیازیان نەبوو بەشداری درێژەپێدانی شەڕەکان بکەن، تەنیا لە کاتی گونجاو و سەرکەوتنی مسۆگەردا نەبێت.

ئەم هاوپەیمانێتیە دووقۆڵیەی روسیی فەرەنسی لە کاتێکدا بوو، کە عەسکەرتارێتی و ئیمپریالیزمێتیی ئەڵمانیا لەسەر شێوەی سیاسەتی ئیمپریالیزمی فەرەنسیی روسیی بوو، کە بووە مایەی دروستبوونی مەترسی لای ئینگلتەرا لە دروستبوونی زەبەلاحێک لەو دیو دەریاوە. دواتر ئەم هاوپەیمانێتیە دووقۆڵیەی فەرەنسیی- روسی لەو کاتەدا بوو، کە روسیا روەو رۆژهەڵات لە مەنشوریا و کۆریا بۆ فراوانبوون هەنگاوی دەنا، کە ئەمانیش لە ئامانجەکانی ئیمپریالیزمی ژاپۆنی بوون.

هەروەها ئەوسا بوو کە ئەمەریکا دەستی ئیمپریالیزمێتیی بۆ فلیپین درێژ کردبوو، بە تایبەت لە ١٨٩٣ کاتێک هێرشی کردە سەر ئیسپانیا و داگیری کرد. واتە لە دوای ساڵەکانی نەوەت پارسەنگی هێزی نێودەوڵەتی بە هۆی بوونی سێ وڵاتە مەزنەکە (ئینگلتەرا، ئەمەریکا، ژاپۆن) لە دەرەوەی سیستەمی هاوپەیمانێتی سەقامگیر نەبوو. مەوداکانی ڕووبەڕووبوونەوە و ڕێککەوتن جاروبار وڵاتەکانی بەرەو ئەم هاوپەیمانێتی و ئەو هاوپەیمانێتی دەبرد، بۆ بێبەختی چارەنووسی ئەڵمانیا هەرسێ وڵاتە مەزنەکە (ئینگلتەرا، ئەمەریکا، ژاپۆن) بەرەو هاوکاریکردن لەگەڵ هاوپەیمانێتیی دوو وڵاتەکە (روسیا، فەرەنسا) هەنگاویان دەنا، کە بە (سیستەمی گونجانی دۆستانە) ناونرا.

## گونجانی (ویفاق) بەریتانیی- ژاپۆنی ١٩٠٢

بەریتانیا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم شانازیی بە گۆشەگیرییەوە دەکرد، هەندێک لە مێژوونووسان بە (شکۆ) ناویان دەبرد، خۆی لە شەڕەکانی ناو کیشوەر دوور خستبووەوە، نە لە شەڕی یەکێتیی ئیتالیا و نە لە شەڕی یەکێتیی ئەڵمانیا بەشداریی نەکرد. تەنیا ئەو وڵاتە مەزنانە بەشداریان تێدا دەکرد، کە ترسیان خستبووە دڵی هەموو کەسێک، هەر کاتەی بەرژەوەندییەکانیان بکەوتبایە مەترسی، دەست لە کاروبارەکان وەردەدەن. لە ماوەی نێوان شەڕی قەرم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم هەستی بەوە نەکرد، کە هیچ یەکێك لە وڵاتە ئەوروپییەکان لە توانایاندا بێت لە هەر شوێنێک لە شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی گورزێکی لێ بووەشێنێت، هەر لە ئوسترالیا تا بۆرما و مەلایۆ وهیند و عەدەن و و دۆڵی نیل و کاب و هەموو موستەعمەرەکانی لە ئەفریقیا و ئەمەریکای ناوەڕاست. ئەو کات کەشتیگەلیی دوو ئەوەندەی کەشتیگەلی وڵاتە دەریاییەکانی تر بوو، لەم روانگەیەوە هەستی بە دڵنیایی و ئازادی دەریاوانی و هەستی بە توانابوون لە سەپاندنی چارەسەریەکانی بۆ کێشە نێودەوڵەتییەکان دەکرد، وەکو ئەوەی لە ١٨٧٨ لە کۆنگرەی بەرلین ئەنجام درا.

بەڵام دۆڕاندنی فەرەنسا بەرانبەر بە ئەڵمانیا لە (١٨٧١) و وەدەرکەوتنی هاوپەیمانیی دووقۆڵی و هاوپەیمانی سێ قۆڵی و گۆشەگیرییەکەی بەریتانیا ئەمانە هەمووی بوونە مەترسی لەسەر ئیمپراتۆریەتی بەریتانی، ئەم گۆڕانانە هەموویان بەرەیەکی دژی بەرژەوەندییەکانیان پێک دەهێنا. لەم گۆڕانانە هیچ پێکهاتەیەکی بەتین لە بەرژەوەندییەکانی نەدەهاتنە کایەوە، دروستبوونی هاوپەیمانی دووەم و سێیەم مانای ئەوەیە هەر کاتێک بەریتانیا لەگەڵ رکابەرەکەی (فەرەنسا) بکەوێتە جەنگ، ئەوا روسیا لە دژی دەوەستێت، دەکرێت بڵێین ئەم نەگەرە نزیک بوو لە هاوپەیمانی سێ قۆڵییەکە روویدات، کە پەیوەندییەکی باشیشی لەگەڵ بەریتانیا هەیە. فاکتەرە بنەڕەتیەکەی ئەم پەیوەندییە دۆستایەتییە هاوکێش بوو لەگەڵ فاکتەری ناکۆکی، کە لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیادا هەبوون، هەروەها لە نێوان روسیا و بەریتانیا چ لە بەرەی ئەوروپی یان لە بەرەکانی تری ئیمپریالیزمی لە ئەفریقیا و ئاسی. ئەو کاتەی داگیرکارییەکانی روسی لە رۆژهەڵاتی دوور لە دژی بەرژەوەندییەکانی بەریتانی فراوان بوون، ئەوسا بەریتانیا بەدوای

هاوپەیمانێکدا دەگەڕا، بەڵام ئەم کارە کارێکی ئاسان نەبوو، فاکتەری بڕیاردەر لەم دۆزینەوەیە دۆزینەوەی کوتلەی گونجاو بوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا و لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە هاوبەشەکان دەبووایە ئەم بڕیارە بدرێت.

بۆ ئەوەی تا ئەوکاتەی بەریتانیا لە گۆشەگیری دەرچێت و بۆی روونبێتەوە کێ هاوپەیمانە و دەتوانێت کێ هەڵبژێرێت، بەریتانیا بە گەلێک قۆناغدا تێپەری، ئەوسا بەرِوونی رێگاکەی لێ بەدیار کەوت، ئەم قۆناغانەش بریتی بوون لە:

ا/ هەوڵەکانی بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیا و هەرەسهێنانیان.

ب/ بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ وڵاتێکی مەزنی نائەورِوپی (ویفاقی ژاپۆنیی- بەریتانی ).

ج/ دۆستایەتی لەگەڵ هەردوو وڵاتی هاوپەیمانی دووقۆڵی (روسیا، فەرەنسا).

با چاوێکیش بەو گۆڕانانە دا بخشێنین.

هەندێک هۆکاری نزیکبوونەوەی بەریتانیا و ئەڵمانیا هەبوون، گرنگترینیان:

١- ویڕای گومانگردن لە یەکتر پەیوەندییەکانی گەلی بەریتانی و ئەڵمانی روون و بەهێز بوون، گەلێک جار بانگەوازی یەکخستنەوی رەگەزی (تیۆتۆنی) دەکرا، کە رەچەڵەکی هەردوو گەلی ئەڵمانی و بەریتانی بوو. دیسان پەیوەندییە دۆستایەتیەکانی نێوان هەردوو خانەوادەی پادشاکانیان تەواوکەری هاوپەیمانی دەبوون، ئەمەو ولهالمی دووەم دەبووە نەوەی فیکتۆریای شاژنی بەریتانیا (١٨٣٦- ١٩٠١) ، ئەم نەوەیە کۆشک و تەلار و دێکانی بەریتانیی لا خۆشەویست بوون، هەروەها پەیوەندییەکی رۆشنبیریی باش لە نێوان زانکۆکانی بەریتانی و ئەڵمانیدا هەبوون، بەرهەمە ئەدەبیەکانی ئەڵمانیا لە بەریتانیا رەواجیان هەبوو.

٢- ئەوەی لەسەر بەریتانییەکان دەزانرێت وەکو (پادشا و حکومەت و گەلی بەریتانی) ئەم دیاردە فانتاستی و کۆمەڵایەتیانە بەهەند وەردەگیران و سەرنجی خەڵکیان وەردەگرتن، بەڵام ئەوەی هانی هاوپەیمانێتیان دەدات دەستکەوتە سەربازیی و سیاسیی و ئابوورییەکانە. بە دیدی هەندێک لە سیاسەتمەدارانی بەریتانی ئەم هاوپەیمانێتیە لەگەڵ ئەڵمانیا ئەنجامی باشیان دەبێت. بازرگانی بەریتانی لە ئەڵمانیا بازاڕیان خۆش بوو، هەروەها کەشتیگەلی بەریتانیای بەهێزترین کەشتیگەلی دونیا بوو بەبێ ململانێ،

بەڵام سوپاکەی وانەبوو، سوپای ئەڵمانیا بەهێزترین سوپای دونیا بوو. لەم روانگەیەوە و بۆ تەواوکردنی هەردوو هێزەکە تا بتوانن لە دونیا وشەی بیستراویان هەبێت و بتوانن ئاشتی بەسەر دونیادا بسەپێنن، ئەم نزیکبوونەوەیان بە بەرژەوەندی دەبینی.

٣- فەرەنسا بەریتانیای بێزار کردبوو لە داگیرکردنی میسردا، بۆ بەرپەرچدانەوەی بەریتانیا پێویستیی بە پشتگیریی هاوپەیمانێتیی سێ قۆڵی هەبوو بۆ چەسپاندنی داگیرکاریی.

کەشوهەواکان مەزندەی ئەوەیان دەکرد، کە هەرکاتێک بەریتانیا لەم گۆشەگیرییە دەرچێت ئەوە حەتمەن بەرەو هاوپەیمانی لەگەڵ ئەڵمانیا هەنگاو دەنێت، چونکە مەوداکانی بە گژیەکداچوون لەگەڵ ئەڵمانیا کەم بوون -ئەمە لە سەرەتا-[17]

لە کاتێکدا قەیرانەکانی نێوان بەریتانیا و هاوپەیمانی دووقۆڵی (روسیا و فەرەنسا) زۆربوون، بەڵام هاوپەیمانێتیی سێ قۆڵی (ئەڵمانیا، نەمسا، ئیتاڵیا) بەردەوام بانگەوازی ئەوەیان دەکرد، کە ئاژاوە و ناکۆکی لە ئەوروپا نەنێنرێتەوە، ئەمەش لە بەرژەوەندیی بەریتانیادا بوو، فەرەنسا بە هەموو هێزێکیەوە کاری بۆ وەرگرتنەوەی ئەلزاس و لۆیرن دەکرد بەهەر شێوەیەک بێت. بە هۆی ئەو رۆڵەی روسیا دوای شەڕەکانی نێوان چین و ژاپۆن لە ١٨٩٥ دا دەیگێڕا، ئەم هاوپەیمانێتیە بۆ بەریتانیا پێویست بوو.[18]

دەقی ئەم پەیماننامەیەش، کە لە بەرژەوەندیی ژاپۆن دابوو بریتی بوو لە:

١- سەربەخۆبوونی کۆریا، کە سەر بە چین بوو. ژاپۆن مەبەستی بوو بەم هەنگاوەی ڕێ بۆ داگیرکردنی کۆریا خۆشبکات.

---

[17] لەسەر فراوانخوازیی ناکۆکی کەوتە نێوان بەریتانیا و ئەڵمانیا، لەسەر ئەوە رێککەوتن لە رۆژهەلاتی ئەفریقیا وڵاتەکان بەم شێوەیە دابەش کەن: تەنجانیقا بۆ ئەڵمانیا کینیا و ئۆگەندا و سۆماڵ بۆ بەریتانیا، بەڵام بەریتانیا دورگەی هیلجۆلاندی بە ئەڵمانیا بەخشی بەرانبەر بەوە ناوچەی ویتۆی لە رۆژهەلاتی ئەفریقیا لە ئەڵمانیا وەرگرت.

[18] ئەو شەڕە بۆ ئەوکات دەگەڕێتەوە کاتێک ژاپۆن لەرێگەی داگیرکردن مەبەستی وەدەستهێنانی ئیمپراتۆریەتێکی ئیمپریالیزمی بوو، لە ئەنجامدا لەگەڵ دراوسێکەی (چین) کەوتە جەنگ، لە ئاکامدا شکستی بە چین هێنا و ناچاری کرد پەیماننامەی (شیمونسکی) ئیمزا بکات.

٢- چین بۆ بەرژەوەندیی ژاپۆن دەست لە (تەرومۆزا) و (بیسکادۆرس) و نیمچە دوورگەی لیاوتۆنج هەڵدەگرێت، بۆرت ئەرسەری بەندەریش لە رووی دەریاوانی بە درێژایی ساڵ ئازاد دەبێت.

٣-قەرەبوویەکی زۆری یابان بکرێتەوە.

٤-ژاپۆنییەکان مافی دادوەری لە چین وەدەست دێنن وەکو ئەوروپییەکان، کە لە چین هەیان بوو[19]. ئەم دەرکەوتنە بەهێزەی ژاپۆن لە بوارەکانی ئیمپریالیزمی ئەوروپی لە چین مایەی رق و کینی هەموویان بوو، جگە لە بەریتانیا. ئەوە بوو لە ٢٣ نیسانی ١٨٩٥ هەر یەک لە روسیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بە ناوی پاراستنی یەکێتیی چینەوە گەفێکیان بۆ ژاپۆن نارد، لەژێر فشار و داخوازیی ئەم وڵاتە مەزنانەدا ژاپۆن ناچار بوو هێزەکانی لە نیمچە دوورگەی لیاوتۆنج بکێشێتەوە، بەڵام ئەم سێ وڵاتە بەمە نەوەستان و بێ گوێدانە یەک پارچەیی خاکی چین بە هەرسێکیان چینیان تیا برد.

*روسیا (پۆرت ئاسەر)ی داگیرکرد.

* ئەڵمانیا (شانتۆنج)ی داگیرکرد.

* فەرەنسا (کوانج تشوان)ی داگیرکرد.

* ئینگلیزیش لە وەڵامی ئەمە (وای های وای)ی داگیرکرد.

بە بۆچوونی بەریتانیا داگیرکردنی بەندەری (بۆرت ئارسەر) لەلایەن روسیاوە دوورنییە بکرێتە بنکەیەکی سەربازیی، کە مەترسیی زۆر لەسەر دروستبوونی جەنگ لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی دروست دەکەن پتر لە بەرهیەکی شەڕ، بەمەش پارسەنگی هێزەکان دەگۆڕدرێن. لێرەدا دیسان پێویستی هاوپەیمانێک بۆ بەریتانیا سەری هەڵدایەوە، بۆ ئەم مەبەستە یەکەم ئاراستەکان روەو ئەڵمانیا بوون. داخوازی و بانگەوازەکانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیا گەیشتبوونە لوتکە، کاتێک جۆزیف لە نۆڤەمبەری ١٨٩٩ لە گوتارێکیدا وتی:

"کارێکی تری گرنگ هەیە، کە لە دیدی سیاسەتمەداران داخوازیەکە پێویستە ئەنجام بدرێت، ئەویش چیتر درێژەنەدانە بەو گۆشەگیرییەی بەریتانیا لە کیشوەری ئەوروپا.

[19] لە شێوەی تایبەتمەندیەکانی بێگانەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەراست.

بە دیدی من هەر کاتێک ئەم ئەرکە هاتە سەر جێبەجێکردن، من پێم باش و ئاساییە لەگەڵ ئەڵمانیا بکەوینە هاوپەیمانێتی".

هەروەها وتی:

"لەیەکتێگەیشتن لەگەڵ ئەمەریکا - ئەگەر ئەڵمانیاشی لەگەڵ بێت- کاریگەریی زیاتر لەسەر پاراستنی ئاسایشی دونیا دەبێت باشتر لە هەر هاوپەیمانێتیەک".

بۆ ئەم مەبەستە بەریتانیا هەوڵی فریودانی ئەڵمانیای دا بە کردنەوەی مەراکش لەبەردەم توانا بەهێزەکانی سەربازیی و سیاسیی و ئابووریی ئەڵمانی، بە هۆی پڕبایەخی مەغریبەوە ئەڵمانیا گرنگیی زۆری بە مەغریب دەدا، ئەگەر ئەڵمانیا بتوانێت دەست بەسەر ئەغادیر دابگرێت، دەتوانێت بیکاتە بنکەیەک و لەوێوە روەو ئەفریقیا دەرچێت، دیسان سوودوەرگرتن لە کانزا و بواری بازرگانیی ئامانجێکی تری ئیمپریالیزمیەکە بوون. بەڵام ئەڵمانیا ئەم داخوازیەی بەریتانیای رەت کردەوە، تا دواتریش کێشمەکێش و توێژینەوە لەسەر ئەم رەتکردنەوەی ولهالم و قەیسەری ئەڵمانی هەبوون بۆ زانینی هۆکارەکانی ئەم رەتکردنەوەیە.



ولهالم

هەندێک مێژوونووس ئەم رەتکردنەوەیە بۆ هەڵوێستەکانی ئەم دواییەی بەریتانیا دەگەڕێننەوە، کاتێک ئەڵمانیا لە شەڕەکانی یەکگرتن لە ساڵەکانی ١٨٦٣ - ١٨٧١ بە قۆناغێکی نالەباردا تێ دەپەڕی، بەریتانییەکان دڵیان لای دانیمارک و نەمسایی و فەرەنسییەکان بوو. سەرەڕای ئەمەش کاتێک فەرەنسا تووشی شکستەکانی ساڵی ١٨٧٠ دەبێت، بەریتانیا ئەم هەلانە ناقۆزێتەوە و ئاستی ململانێکانی لەگەڵ فەرەنسا کەم دەکاتەوە تا ئەوکاتەی فەرەنسا توانیی بێتەوە سەر پێ و بە ڕووی ئەڵمانیای زەبەلاح بووەستێتەوە.

مێژوونووسی ئینگلیز (گرانتو تمبلی) هۆکارەکە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە، کە ئەڵمانیا لە هەڵوێستەکانی بەرانبەر بە ڕووبەڕووبوونەوە لە سەرکوتکردنی روسیا جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئینگلیز، ئەو کاتەی روسیا هەوڵی فراوانخوازیی لە رۆژهەڵاتی دوور دەدات، ئەوسا ئینگلیزەکان لەگەڵ روسەکان زۆر توند بوون، بەڵام ئەڵمانەکان وانەبوون.

بە مەزندەی ئێمە ئەوسا بەریتانیا بەدوای هاوپەیمانێکدا دەگەڕا ئەویش ئەڵمانیابوو، بەڵام بێ ئەوەی هیچی پێ بدات. دیارە کە ئەڵمانیا بەدوای زۆردا دەگەڕا لە ودیو دەریا، بەڵام بۆ هەر شوێنێک بچویا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی بەریتانی بەیەکیان دادەدا، ئەمەش سەرەتای گۆڕانەکانی هەڵوێستی بەریتانیا بوون بۆ گەڕان بەدوای هاوپەیمانێک.

ئەم گۆڕانانە توندتر بوون و هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو پەیوەندییە دۆستایەتییەکانی ئەڵمانیا و بەریتانیا بە هۆی سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئەڵمانی لە دەوڵەتی عوسمانی و بووژانەوەی دەریاوانیی ئەڵمانی تێکچوون.

لەبەر ئەمە بەریتانیا کاری کرد بۆ:

١- لەناوبردنی هەردوو کۆماری بوێر.[٢٠]

٢- رێگەی نەدا بە ئەڵمانیا پرۆژەی هێلی ئاسنینی بەرلین- بەغدا- کوێت جێ بە جێ بکات.

ئەوەی زانراوە هۆڵەندییەکان دەستیان بەسەر (راس الرجاء الصالح)دا گرت بوو، بەڵام دواتر لە میانەی شەڕەکانی ناپلیۆن موستەعمەرەکانی هۆڵەندی (بوێر) نەیان توانی لەژێر حوکمی ئینگلیزەکان خۆیان راگرن، بەتایبەت چونکە بازرگانیی کۆیلەکانی لێ قەدەغە کردبوون، ئەمەش گورزێکی ئابووریی کاریگەر بوو بە (بوێر)ییەکان کەوت. بۆیە

[٢٠] ترسنفال و ئۆرنج...

زۆربەیان بڕیاری کۆچکردنیان بۆ باکوور دا، لەوێش دوو کۆماری (ترنسفال و ئۆرنج )یان دامەزراند. ئەوەندەی نەبرد زێڕ و ئەلماس لەوێ دۆزرایەوە، ئیتر لێشاوی لێکۆڵەرە ئابووریناسەکانی ئینگلیز دەستیان پێ کرد. هەر زوو بوونە دەسەڵاتدار بە ئابووریی ئەو ناوچەیە، کاریان بۆ ئەوە کرد ئەم دوو کۆمارە بخەنە ژێر سپاردەی بەریتانیا نەک بە خۆشی خۆیان، بەڵکو بە زۆرەملی.

بەڕاستی بەریتانیا شارەزایی بارودۆخەکانی خۆی بوو، دەیزانی ئەگەر هێرش بکاتە سەر ئەو دوو کۆمارە و داگیریان کات، هەڵوێستەکان بەچی دەگەن، لە هەمان کاتیشدا لە هاووڵاتیانی رادەبینی کە کار بۆ ئەم مەبەستە دەکەن بەڵام بە شێوازێکی تر. بۆ نموونە: هێرشە سەرنەکەوتووەکەی دکتۆر جیمسۆن لە دێسێمبەری ١٨٩٥ بە مەبەستی داگیرکردنی ترنسفال، حکومەتی بەریتانیا خۆی لەم هێرشە بێبەری کرد، بەڵام ولهالمی دووەم دڵنیا بوو، کە ئەم هێرشە تەنیا پیلانێکی بەریتانیە و هیچیتر نا، بروسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ کروگەری فەرماندەی ترنسفال نارد بە بۆنەی شکستپێهێنانی هێرشەکە.

ئەم کارەی ولهالمی دووەم هەستێکی نارەحەتیی ئەڵمانیای دژی بەریتانیا دەردەخست، دەکرێت بڵێین ئەمە هەڵوێستی هەموو وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا بوو، بەڵام حکومەتی بەریتانیا و رۆژنامە کانی هەموو سەنگێکی خۆیان خستبووە سەر ئەڵمانیا بۆ دەربڕینی نارەزایی. هەست و هەڵوێستەکانی خەڵکی بەریتانی هەموویان دژی ئەڵمانیا لە هەڵچوون دابوون، ئەوە چونکە مەسەلەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیا لە ئارادا نەمابوو، تەنیا بەدوای پاساوێکدا دەگەڕا بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ دژی بوێر. دەنگۆی ئەوە لە فەرمانگا سیاسیەکانی بەریتانیا بەرز بوونەوە، کە مەترسیەک لە ئەڵمانیاوە بۆ بەریتانیا لە ئارا دایە، سامانەکانی بوێر بۆ لێدانی ئیمپڕاتۆریەتی بەریتانی بەکار دێن، ئەوەندەی نەبرد بەریتانیا هێرشی کردە سەر بوێر. لە ئەنجامەکانی ئەم جەنگەدا بەریتانیا لەوە دڵنیا بوو، کە ئەڵمانیا ناتوانێت هاوکاری پێشکەش بە هیچ وڵاتێکی بەرهەڵستکاری بەریتانیا بکات بە هۆی ئەوەی خاوەنی کەشتیگەلێکی ئەوتۆ نییە و لە توانایدا بێت ئەم ماوەیە لە دەریاوە ببڕێ بێ گوێدانە کەشتیگەلی بەریتانی. لەو کاتەوە کێبڕکێ لەسەر چەکی دەریاوانی لە نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیا دەستیان پێ کرد، ئەم کێبڕکێیە مەسەلەی مان و نەمان بوو بۆ هەردوو لایان، ئاڕاستەکانی ئەڵمانیا بۆ ئەوە بوون ئەو دیدەی بەریتانیا بە درۆ

بخاتەوە، کە دەڵێت خاوەنی کەشتیگەلێکە دوو ئەوەندەی وڵاتە هاوپەیمانەکان، ئەم بانگخوازییە گورزێکی کوشندە بوو دژی نیازەکانی هاوپەیمانیی ئینگلیزیی- ئەڵمانی.

لەو کاتەی شەڕ لە بوێر بەردەوام بوو، لە وڵاتی تر شەڕی ئابووریش هەڵگیرسا بوو لەسەر ململانێی دەستبەسەرداگرتنی ڕێگاوبانی هێنان و بردنی ئاسنین و دەریاوانی بەسەر ڕۆژهەڵاتی عەرەبدا، کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا بوو. ئەڵمانییەکان لەگەڵ عوسمانییەکان کەوتنە ڕێککەوتنێک تا هێڵی ئاسنین بە ڕێگەی بەغداوە بگەیەننە بەرلین، ئەنجامەکانی هەردوو پڕۆسەکە دژی ویستەکانی ئەڵمانیا بوون، لە بوێر ئینگلیز سەرکەوت، لە ١٨٩٩یش تاکە دەروازەی هێڵی ئاسنینی بەغدا لە ڕێگەی کەنداوی عەرەبییەوە داخرا، ئەمە لە ڕێگەی بەستنی ڕێککەوتننامەیەک لەگەڵ شێخ مبارەک ئەلسەباح - شێخی کوێت - ئەنجام درا. لەم ڕێککەوتنە هەردوو لایەن لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە کوێت بۆ هیچ وڵاتێک واز لە هیچ پارچەیەک لە خاکی ناهێنێ تا بە ڕەزامەندی بەریتانیا نەبێت.

لە ١٨٦٦ دیسان بە هۆی بوونی ئیمپریالیزمی بەریتانی لە میسر و فراوانخوازیەکەی لە سودان و میسر ڕێگەیان بە فەرەنسا نەدەدا هیچ هاوپەیمانێتیەک لە نێوان پاریس ولەندەن ئیمزا بکرێت، بەریتانیا مەبەستی بوو لە میسر بمێنێتەوە بێ گوێدانە سۆزەی ئەو سەرۆک حکومەتانەی بە گەلی میسریان دابوو، بەوەی خاکەکەیان جێ دەهێڵن. لە میسر کونسوڵی ئەڵمانی پشتیوانیەکی تەواوی بەریتانیا دەکرد لەو بێزاریانەی لەلایەن فەرەنسا و روسیا ڕووبەڕووی دەبوونەوە، دواتر پەیوەندییەکانی ئەڵمانیا و بەریتانیا تێک چوون، هەڵوێستی بەریتانیا لە داگیرکاریەکەی میسر تەنگەتاو بوو، ئەم پێویستیی بە پشتگیری هەبوو تا بەرانبەر بە باڵوێزەکانی وڵاتان لە قاهیرە توشی شەرم نەبێت. لەو کاتەی هێزەکانی فەرەنسی لە ١٨٩٩ بە نیازی فراوانکردنی پانتایی دەسەڵاتەکانیان دەبن، هێزێکی میسریش بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتیان لە سوودان لەگەڵ هێزەکانی کاپتن مارشالی فەرەنسی ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە.

لەگەڵ ئەوەی فەرمانگە سیاسییەکانی ئەوروپی مەزندەی جەنگیان لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا دەکرد بە هۆی پێداگریی (کشنەر) لەسەر هێنانەخوارەوەی ئاڵای فەرەنسی، کە لەسەر فاشودە هەڵدرابوو لەگەڵ کشانەوەی کەتیبەی مارشال، بەڵام بوونی

(دلکاسیه) لە سەرۆکایەتی وەزارەتەکانی فەرەنسی و هاوەڵانی سیاسەتێکی نیانیان بەرانبەر بەم هەڵوێستانە نواندن، کە بووە هۆی تێپەڕکردنی ئەم قەیرانە، ئەمە سەرەتای لەیەکنزیکبوونەوەی فەرەنسا و بەریتانیا بوو.



دلکاسیه

لە ١٩٠٢ تا ڕادەیەک پەیوەندییەکانی بەریتانیا لەگەڵ فەرەنسا باش بوون، بەڵام هێشتا لەگەڵ روسیا و ئەڵمانیا زۆر خراپ بوون، تا ئەوکاتیش - بە دیدی بەریتانیا- مەترسیەکی مەزنە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانی بە هۆی (بۆرت نارسەر)ەوە.

ئەوەبوو ئیتر ناستەنگ کەوتنە بەردەم ڕێککەوتن لەگەڵ هەریەک لە ئەڵمانیا و فەرەنسا. مەتریسیە هەرە مەزنەکانی ئەوسای بەریتانی لە داگیرکاریەکانی روسیا لە ڕۆژهەڵاتی دوور بوون، ناچار بەریتانیا بۆ ڕێگەگرتن لە بەردەم ئەم فراوانخوازیەی روسیا روەو ڕێککەوتنێک چوو لەگەڵ ژاپۆن، ژاپۆنیش لەوکاتدا زۆر پێویستیی بەو ڕێککەوتنە هەبوو، تا بە هۆی خاوەنی مەزنترین سوپای دەریاوانیەوە دەستێک لە روسیا بووەشێنێت و دڵنیاش بوو کەسی تر دەست لەم کێشەیە وەرنادات. بۆیە دانوستانەکانی نێوان بەریتانیا و

ژاپۆن ئەوەندە بە ئەزیەت نەبوون، هەر زوو گەیشتنە ڕێککەوتنێک بە ناوی (تەبایی و دۆستایەتیی ژاپۆنیی- بەریتانی) لە ١٩٠٢، کە بە ساڵی کۆتایی هاتنی گۆشەگیری بەریتانیا دەژمێردرێت، هەروەها بە ساڵی کۆتایی هاتنی چاوەڕوانیەکانی هاوپەیمانێتیی ئەڵمانیاش دەناسرێت.

دەقی ئەم تەباییەش دەڵێت:

١- داننان بە دیفاکتۆ (امر الواقع) لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە هەریەک لە کوریا و چین.

٢- ئەگەر جەنگ لە نێوان روسیا و ژاپۆن هەڵگیرسا، بەریتانیا بێلایەن دەوەستێت.

٣- ئەگەر وڵاتێک لە وڵاتەکان - بۆ نموونە فەرەنسا- هاتە ناو کێشەکە، ئەوا بەریتانیا هاوکاری سەربازیی ژاپۆن دەکات.

٤- ماوەی ئەم ڕێککەوتننامەیە ٥ ساڵە [21].

لەدوای ئەم خاڵانە هەندێک ئەنجامیان لێکەوتنەوە:

١- دانپێنانێکی پەردەپۆشی بەریتانی بە مافی ژاپۆن لە کۆریا.

٢- ژاپۆن متمانەی بە خۆی کرد وەکو وڵاتێکی زلهێزی نێودەوڵەتی دەبێت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. ئەمە یەکەم جار بوو لە سەردەمی هاوپەیمانەکان وڵاتێکی ئاسیایی لەم ئاستە یەکسان بێت لەگەڵ وڵاتە زەبەلاحەکانی ئەوروپی.

٣- فەرەنسا لە توانای دا نەبوو بۆ هاوکاریکردنی روسیای هاوپەیمانی دەست بخاتە ناو شەڕەکە، دەنا ئەو دۆستایەتیەی لە ١٨٩٩ەوە لەگەڵ بەریتانیا بنیادی نابوو، هەمووی تێک و پێک دەدان، خۆی بۆ شەڕێکی مەزن بەرچاو کردبوو، نەک بۆ گەڕاندنەوەی ئەلزاس و لۆرین.

لە دواییشدا هەر وای لێ هات، ژاپۆن بە تەنیایی لەگەڵ روسیا کەوتە جەنگ و زیانێکی زۆری بە روسیا گەیاند و شکستی پێ هێنا، لە ئاداری ١٩٠٥دەستی گرت بەسەر (بۆرت ئەرسەر)دا، لەو ڕێککەوتنەی کۆتایی بەشەڕەکە هێنا بە ناوی ڕێککەوتنی (پۆرت سمۆت) لە ٥ی نۆڤەمبەری ١٩٠٥ ژاپۆن سەرکەوتنی باشی لە ڕۆژهەڵاتی دوور وەدەست هێنا. لەم ڕێککەوتنە روسیا دانی بە زاڵبوونی بەرژەوەندییە سەربازی و

[21] لە ١٩٠٥ ڕاست کرایەوە دوای شەڕی روسیی ژاپۆنی لە ١٩١١ نوێ کرایەوە.

ئابووریەکانی ژاپۆنی هێنا لە کۆریا و مەنشوریا. هەروەها رازی بوو بە گواستنەوەی مافەکانی روسیا لە نیمچە دوورگەی لیاو تۆنگ و پۆرت ئەرسەر بۆ بەرژەوەندی ژاپۆن، هەمان شت سەبارەت بە مۆکدن و نیوەی سخالینیش و هێڵی ئاسنینی پۆرت ئەرسەر.

لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنانەی ژاپۆندا روسیا لە چاوتێبڕینەکانی روەو چین وەستا بۆ ئەوەی جارێکی تر لەگەڵ ژاپۆن ڕووبەڕووی یەکتر نەبنەوە، روەو ئەفغانستانیش وەستا بۆ ئەوەی خۆی لە جەنگ لەگەڵ بەریتانیا بپارێزێت. دواتر لە ۱۹۰۷ و ۱۹۱۰ روسیا و ژاپۆن لەسەر دیاریکردنی ناوچەی دەسەڵاتی هەر یەکەیان لە مەنشوریا و مەنگۆلیا پێکهاتن، بۆ ئەوەی زیانی پتر نەیەتە سەر، بەم شێوەیە ململانێی ئیمپریالیزمی لە رۆژهەڵاتی دوور ئارام بوون.[22]

## گونجانی (ویفاقی) دۆستانەی بەریتانیی فەرەنسی ۱۹۰٤

ئەوەی ڕاستی بێت هاوپەیمانێتیەکەی ژاپۆنی - بەریتانی وەکو ڕووداوەکەی فاشودا[23] رسواکردنی لایەنێکە لە لایەنەکانی هاوپەیمانییە دووقۆڵیەکە، بەڵام ئەنجامەکانی ئەم هاوپەیمانێتیە نزیک بوونەوە بوو لە هاوپەیمانێتیی دووقۆڵی، لەبەر چەند هۆ و گۆڕانێک:

١- لە فەرمانگە سیاسیەکانی بەریتانیا ئەوە بەروونی بەدی دەکرا، کە ئەڵمانیا لەو هەوڵانەیدا جێی مەترسییە بۆ بەریتانیا، بە هۆی ئەو هەوڵانەی ولهالمی دووەم دەیدا بۆ وەدەستهێنانی کەشتیگەلێکی زەبەلاح، کە سەر لە کەشتیگەلی بەریتانی بستێنت و خۆی ببێتە خاوەنی زەبەلاحترین هێزی دەریاوانی.

٢- دیبلۆماسیەتی ئەڵمانی سەرەڕای رێککەوتننامەی نێوان بەریتانیا و کوێت لە ۱۸۹۹، لە هەوڵی چالاکدا بوو بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی هێڵی ئاسنینی بەرلین- بەغدا، ئەو هێڵەی بە دیدی ئینگلیزەکان سەری ئەو رمەیە، کە رووی لە هیندی بەریتانی کراوە.

---

۲۲ وەکو دەبینین وڵاتە ئەوروپیەکان لە شۆڕشی چینی ۱۹۱۰_۱۹۱۱ پەندیان وەرگرت، هەوڵی هەلقۆستنەوەیان نەدا و بێلایەنیان هەڵبژارد.

۲۳ لە نێوان لەشکری مسری و پشتگیریی بەریتانیا و سوپای مارشالی فەرەنسی لە ۱۸۹۹ لە سودان رویدا، ئەمە لە کاتێکدا بەریتانیا بە نیازی بەستنی هاوپەیمانیتیەک بوو لەگەڵ فەرەنسا، بەڵام بە هۆیەوە ئومێدەکان هەڵوەرین.

٣- بەریتانیا لە داگیرکاریەکەی میسردا ئەوەندە لە هەڵوێستەکانی ئەڵمانیا بێزار ببوو گەیشتبووە ئەو ئاستەی داوا لە فەرەنسا بکات بۆ پشتگیریکردنی لە پرۆژ کانی لە میسر و سوودان [٢٤]

٤- بەریتانیا خۆی لە ڕوبەڕووبوونەوە لەگەڵ فەرەنسا دووردەخستەوە، بەتایبەت لەو شوێنانەی فەرەنسا بە ناوچەی زیندووی دەزانی وەکو: مەغریب. لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتی بەریتانیا لەم شوێنە (مەغریب) زۆر پەرەی سەندبوو، بەڵام فەرمانگە سیاسیەکانی بەریتانیا لە ترسی داواکاریەکانی فەرەنسی خۆی لەم رەوتە دەپاراست.

٥- حەز و هەستەکانی لەیەکنزیکبوونەوە رەنگیان دابووەوە سەر سروشتی پەیوەندییەکانی دۆستایەتی، سەردانەکەی پادشای ئینگلتەرا (ئەدواردی حەوتەم ) بۆ فەرەنسا کەشوهەوایەکی دۆستانەی لەنێو هەردوو گەلی فەرەنسی و بەریتانی خوڵقاند، هەروەها لە بواری رۆژنامەگەریی هەردوو وڵات.



ئەدواردی حەوتەم

٢٤ لۆرد جرای لە یادەوەریەکانی باس لەو بێزاریانە دەکات نەک تەنها لە میسر، بەڵکو لە هەموو ئەو شوێنانەی دەسەڵاتی بەریتانیای بەسەرەوەیە.

٦- هانۆتۆکسی وەزیری فەرەنسی دژی ڕێککەوتنی فەرەنسیی- بەریتانی بوو، ئەوەندەی نەبرد لە گۆڕینی وەزارەت دوور خرایەوە و (دیلکاسیە) یەکەم بانگەوازخوازی نزیکبوونەوە لە بەریتانیا لە شوێنی دانرا، ئەم نزیکبوونەوەیە سەرکەوتوو نەدەبوو ئەگەر وەزیرێک لەناو وەزارەتەکەی بەریتانیا دژی ئەم پرۆسەیە بووایە، بلفۆر خۆی بڕوای بەم نزیکبوونەوەیە هەبوو.



بلفۆر

هەردوو لایەنی فەرەنسی و بەریتانی وەکو پێشەکیەک بۆ هاوپەیمانێتیەکە کەوتنە گفتوگۆ بۆ دەستنیشانکردنی کێشە مەزنەکان، ئەم گفتوگۆیانە بە بەستنی پەیماننامەی (گونجانی دۆستایەتی) لە ٨ی نیسانی ١٩٠٤ کۆتایی هات، ئەم ڕێککەوتنە هەندێک بڕگەی ئاشکرا و هەندێکی نهێنیی هەبوون. ئەوروپا بەگشتی بڕوای وابوو، کە پەرلەمانێکی وەکو بەریتانیای دیموکرات ڕێگە بەم جۆرە هاوپەیمانێتیە نهێنیانە نادات، بەڵام حکومەت و پەرلەمانی بەریتانی بە چاوێکی دووربینانە سەیری بەرژەوەندییەکانی بەریتانیایان دەکرد لە پێناو پاراستنی ئەم بەرژەوەندیانە بە دڵێکی فراوانەوە مامەڵەیان دەکرد، بۆیە بە بادانەوەیەکی یاسایی توانیان ئەم قەیرانە چارە بکەن.

بڕگەی دووەمی ئەم ڕێککەوتنە دەڵێت: حکومەتی بەریتانیا دان بە مافی فەرەنسا دەنێت وەکو وڵاتێکی هاوسنوور بۆ وڵاتی مەغریب، بەتایبەتی مافی ئەوەی هەبێت شەونخونی لەسەر پاراستنی باری ئارامی ئەو وڵاتە بکات و لە بواری چاکسازیی

بەڕێوەبردن و ئابووریی و دارایی و سەربازیی و بەرهەمهێناندا هاوکاریی بکات و لەم بوارە بەریتانیا تەگەرە بۆ فەرەنسا دروست ناکات. ئەمەو هەردوو لا ڕێککەوتن لەسەر ڕێزنان لە مافی ئیسپانیا، دواتر بە (ئەلریف)ی ئیسپانی ناسرا، لەگەڵ چەکدارنەکردنی کەناری مەغریبی بەرانبەر بە چیای تاریق.

سەبارەت بە میسر بەریتانیا رایگەیاند، کە کار بۆ گۆڕانی سەنتەری میسری سیاسی ناکات، فەرەنساش لەلای خۆیەوە هیچ تەگەرەیەک لە ڕێی کارەکانی ئینگلتەرا دروست ناکات، داواشی لێ ناکات وادەی کۆتاییهاتنی داگیرکاریەکەی دیاری بکات. بەم شێوەیە کێشەکانی نێوانیان یەکلا کردنەوە لە سیام و مەدەغەشقەر و گامبیا و نیجەر و نیو فۆنلاند، لەسەر ئەوەش ڕێککەوتن دۆڵی ڕووباری میکۆنگ و چیای رانج سنووری لەیەکجیاکردنەوەی نێوان هیندی چینیی فەرەنسی و بۆرما و مەلایۆی بەریتانی بێت.

لەم ماوەیەدا حکومەتی ئەڵمانی درکی بەوە کرد، کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٤ - ١٩٠٥ کارێکی خەتەرناک لە دژی ئەو لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسا بەڕێوەدەچێت، قەیسەری ئەڵمانی بە دوو ئاڕاستە کەوتە کارکردن:

ا/ بە سوودوەرگرتن لە شکستەکەی روسیا بەرانبەر بە ژاپۆن، هەوڵی تێکدانی هاوپەیمانێتیەکەی نێوان روسیا و فەرەنسا بدات.

ب/ تەنگەتاوکردنی فەرەنسا بە قەیرانێکی نێودەوڵەتی، بۆ ئەوەی لە ئاستی پەیوەندییەکانی نوێی نێوان بەریتانیا و فەرەنسا بگات، کێشەی مەغریب دەرفەتێک بوو پێی دا.

سەبارەت بە روسیا قەیسەر ولهالمی دووەم توانیی نیکۆلای دووەم قەسەری روسیا بگەیەنێتە ئەو بڕوایە تا هاوپەیمانێتیەکی بەرگریی هاوبەش لە نێوان روسیا و ئەڵمانیا ببەسترێت، قەیسەر ولهالمی دووەم درکی بەوە کرد، کە کاتەکان لە بەرژەوەندی ئەو تێپەر ناکات، بۆیە پەلەی لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەو هاوپەیمانێتیە کرد. لە حوزەیرانی ١٩٠٥ سەردانی قەیسەر نیکۆلای دووەمی کرد لە بیۆرکۆ، توانیی ئیمزایەکی لێ وەرگرێت بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو ڕێکەوتننامەیە، بەڵام سیاسەتمەدارانی روسیا ئەم ڕێککەوتنەیان رەت کردەوە، کە لە پشت ئەوانەوە بەرنامەی بۆ دارێژرابوو، لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ئەم ڕێکەوتننامەیە هاوپەیمانێتیە دووقۆڵیەکەی لەگەڵ فەرەنسا لەناو دەبات، بەمەش ڕوسیا هێزی فشار بۆ سەر هاوپەیمانێتیی نەمسا و ئەڵمانیا لەدەست دەدات.
٢- دەنگی ڕوسیا لە بەلکان لاواز دەبێت.
٣- ئەڵمانیا بە هێزێکی پڕ تەوژمتر بۆ ئەنجام گەیاندنی پرۆژە ئیمپریالیزمیەکانی لە دەوڵەتی عوسمانی دەست پێ دەکات، ئەو ناوچانەی بە سنووورە زیندووەکانی ڕوسیا دەناسرێن.

ئەڵمانیا درکی بەوە کردبوو کە لە ساڵەکانی ١٩٠٤/١٩٠٥ کارێک لە ئارادابوو بۆ دوورخستنەوەی ئەڵمانیا لە مەغریب، ئەمەش لە نەخشەکانی فەرەنسا دەچن. سەرەڕای جەختکردنەوەی فەرەنسا بە بەردەوامبوونی سیاسەتی (دەرگای کراوە) لە مەغریب، ئەوەی ڕاستیش بێ فەرەنسا بە خشکەیی هەنگاوی بۆ دەستگرتن بەسەر سیاسەتی دەسەڵات دەنا تا لە مەغریب بەسەر بازرگانیی ئەڵمانیادا زاڵ بێت. ئەڵمانیا نیازی ئەوەبوو فەرەنسا بخاتە هەڵوێستێکی تەنگەتاوەوە بۆ ئەوەی ناچار بێت سیاسەتەکانی بەرانبەر بە مەغریب و دۆستایەتیەکەی لەگەڵ بەریتانیا ئاشکرا بکات، بەڵکو لەم ڕێگەیەوە بتوانێت درێژە بە سیاسەتەکانی دەرگای کراوە لە مەغریب بدات و بتوانێت جێپێیەک بۆ خۆی مسۆگەر بکات بۆ وەدەستهێنانی دەروازەیەکی پێداچوون بۆ موستەعمەرەکانی لە ئەفریقیا.

بۆ ئەم مەبەستە ولهالمی دووەم قەیسەری ئەڵمانیا لە ئاداری ١٩٠٥ سەردانێکی بۆ تەنجە ئەنجام دا، لەوێ ڕایگەیاند، کە حەز دەکات سوڵتان سەربەخۆ بێت، لە هەمان کاتیشدا دەرگای مەغریب بۆ هەموو وڵاتێک واڵا بێت.

دواتر داوا لە حکومەتی ئەڵمانیا کرا، کە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی مەغریب ببەسترێت (لە نیسانی ١٩٠٥) - هەموو وڵاتە ئەوروپییەکان بە ئەمەریکاشەوە خۆشحاڵی خۆیان بۆ ئەم کۆنگرەیە دەربڕی- بە هۆی ناڕازیبوونی دلکاسیە لە بیرۆکەی بەستنی ئەم کۆنگرەیە دەستی لە کار کێشایەوە، بەڵام دوای ڕاستەڕێبوونی دۆستایەتیەکەی بەریتانیی فەرەنسی، کە تا ئێستا بەهەر شێوەیەک بێت بەردەوامە. بەر لە بەستنی کۆنگرە دانوستانەکان لە هەموو لایەک بەردەوام بوون لە نێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا، فەرەنسا و ئیسپانیا، فەرەنسا و ئینگلتەرا. ئەمە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت، کە

دیبلۆماسیەتی فەرەنسا ئەوەندە چالاک بوو توانیی بەرگەی هەموو فشارە نێودەوڵەتییەکان و ئەڵمانیا بگرێت.

ئەمە یەکەم تاقی کردنەوەی گونجانی دۆستایەتیی نێوان فەرەنسا و بەریتانیا بوو، بەریتانیا بە هەموو هێزێکەوە لە تەک فەرەنسا وەستا، لە کاتێکدا هەڕەشەکانی ئەڵمانیا گەیشتبوونە ئەو ئاستەی بەرپرسێکی ئەڵمانی رایگەیاند: ئەگەر هێزەکانی فەرەنسا لە سنووری جەزائیر بەرەو مەغریب بپەڕنەوە، ئەوا هێزەکانمان لە سنووری فەرەنسا دەچنە ژوورەوە.

دیبلۆماسیەتی فەرەنسا توانیی بەر لە بەستنی کۆنگرەی جەزیرە ئەڵمانیا ناچار بکات دان بە مافی فەرەنسا بنێت لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە مەغریب بەرانبەر بە راگەیاندنی سەربەخۆیی مەغریب، لەگەڵ ئامادەکاری بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە حکومەتی مەغریب، بەتایبەت ئەو چاکسازیانەی پەیوەندیان بە پۆلیس و داراییەوە هەیە. لە کۆتایی لەسەر بەستنی کۆنگرەکە رێککەوتن لە سەرەتاکانی ١٩٠٥ رۆژی ١٦ی جەنیوەریان بۆ دیار کرد.

وتەی سەرۆکی کۆنگرە شازادە دالمۆدۆڤار لە کردنەوەی کۆنگرەکە بریتی بوو لە دەستنیشانکردنی سێ ئامانج بۆ بەستنی کۆنگرە:

١- سەروەری سوڵتان.

٢- لەدەستنەدانی خاکی دەوڵەتی مەغریب.

٣- سیاسەتی دەرگای کراوە لە مەغریب لە بەردەم هەموو وڵاتە ئەوروپییەکان.

لەگەڵ ئەمەش کۆنگرەکە بە بڕیاری دژی بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا و ئامانجەکانی دەرچوو:

١- لە باجی دەستێوەردانە نێودەوڵەتییەکان لە کاروباری مەغریب سوڵتان کورسی و دەسەڵاتەکەی لەسەر دانا.

٢- فەرەنسا بە تەواوەتی خۆی بەسەر دەسەڵاتی مەغریبدا سەپاند، گوندەکانیشی بۆ ئیسپانیا جێ هێشت، ئەمانەی هەموو بۆ ئەوە بوو تا رێ خۆشبکات لە بەردەم داگیرکردنی تەواوی مەغریب لە ١٩١٢.

هۆی دەرچوونی ئەڵمانیا لەم کۆنگرەیە بە دۆڕاوی ئەوە بوو، کە هاوپەیمانانی بە توندی لە تەکی نەوەستان، نەمسا دوودڵ بوو لە بڕیارەکانی، ئیتاڵیاش هانی پرۆسەی ئاشتی و لەیەکتێگەیشتنی دەدا، لە کۆتاییدا دەوڵەتەکانی گونجان و دۆستایەتی بە هێزەوە لە کۆنگرە دەرچوون، بە هێزتر لە بەر لە بەستنی کۆنگرە.

ئاراستەکانی گشتیی ئەوروپی دژی ئەڵمانیا بوون تا نیمچە گۆشەگیر بوو بەر لە کۆنگرە و دوای کۆنگرە، دواتر بەشداربوونی ئینگلتەرا لەگەڵ فەرەنسا و روسیا لە هاوپەیمانێتیە دووقۆڵیەکەی گونجان و دۆستایەتی تای تەرازووی بە لای هاوپەیماناندا شکاندەوە، روسیا و فەرەنسا لە چالاکیەکانیان دژی ئەڵمانیا خەمساردیان نەدەکرد.

دوای ئەوەی ئەڵمانیا لە پێشنیازەکانی بەریتانی سەبارەت بە مەغریب رازی نابێت، بەریتانیا مەغریب رووبەڕووی فەرەنسا دەکاتەوە، ئەمە لەو کاتە دێت، کە وڵاتە ئەوروپییەکان لە هەوڵی یەکلاکردنەوەی کیشەکانیان بوون لەسەر حسابی وڵاتە عەرەبیەکان بۆ ئەوەی کەسیان توشی شەڕێک نەبن، کە ئەنجامەکەی دیار نییە. ئەمانە بۆ دوارۆژی ئەوروپا ئەنجامی خەتەرناکیان لێ کەوتنەوە و بەرپرس بوون لە خێراکردنی رووداني جەنگی یەکەمی جیهانیی:

١- بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێبڕکێیەی نێوان وڵاتە ئەوروپییەکان بۆ دابڕاندنی خاکی عوسمانییەکان چەند کۆنگرەیەکی نێو دەوڵەتی- لەوانە کۆنگرەی بەرلین ١٨٧٨- بەستران، بەڵام دەرکەوتنی فراکسیۆنی (کوتلەی) وڵاتەکانی ئەوروپی هێزی بڕیارەکانی نەهێشتبوو و لە بڕیارەوە ببوونە راسپاردە، ئەویش ئەگەر لە بەرژەوەندی فراکسیۆنێک (کوتلەیەک)دا نەبووایە، توانای جێبەجێکردن نەبوو. دیارە کە بەرژەوەندیی هەردوو فراکسیۆنەکە دژ بەیەک بوون، بۆیە کارەکان بە ئاراستەی بەکارهێنانی هێز رۆیشتن، ئەمە لە هەموو پارچەیەکی دونیا، کە دژی فراکسیۆنێک بووایە، هەڕەشەی بەکارهێنانی هێز دەکرا. لەم حاڵەتانە گۆڕانی بارودۆخەکان لە بەرژەوەندی لایەنێک دەبێت و دژی بەرژەوەندییەکانی لایەنەکەی تر دەبێت، ئەمە زیاتر لە جارێک و لە وڵاتێکی موستەعمەر رویان دا. لە شوێنێک سەرکەوتن دەبوون، لە شوێنێکی تر ژێرکەوتن، کارەکان بەرەو پشێویی و نائارامی دەڕۆیشتن، دواتر بەرەو جەنگ هەنگاویان دەنا. فەرەنسا بۆ ئەم ئامانجە کاری دەکرد، چونکە بە دیدی ئەو

تاقە رێگایە بۆ گەڕاندنەوەی ئەلزاس و لۆرین. بەریتانیا کاتێک لە ١٩٠٤ هاوپەیمانێتیەکەی لەگەڵ فەرەنسا ئیمزاکرد، درکی بە گۆڕانی پارسەنگەکانی هێز کردبوو، کە دژی ئەڵمانیان. پەرەسەندنی دۆخەکان بە ئەنجامی جەنگ دەگەیشتن، ئەگەر ئەڵمانیا لە نیازەکانی ئەوەبێت جێی بەریتانیا بگرێتەوە لە داگیرکاری و ئیمپریالیزمیدا، هەروەها شکاندنی کۆدی زاڵبوونی بەریتانیا لە بواری کەشتیگەلی و هێزی دەریاوانی، بە دیدی حکومەت و گەلی بەریتانیا کەس بۆی نییە بگاتە ئاستی بەریتانیا لە رووی هێزی دەریاوانی. لە هەمان کاتدا قەیسەری ئەڵمانیا و حکومەتەکەی بڕوایان وابوو، کە ئەوان خاوەنی پەیامن لەم دونیایە و دەبێت لەوپەڕی هێزو دەسەڵاتدا بن چ لە رووی دەریاوانی چ لە رووی داگیرکاریی، بۆ گەلی ئەڵمانیا بە رەوایان دەبینی، کە مافی ئەوەیان هەبێت ناڕاستەی مێژووی دونیا بکەن.

٢- ئەڵمانیا رەزامەندیی وەرگرتبوو بەشداری لە ئاڕاستە کردنی کاروبارەکانی مەغریب بکات، بەڵام فەرەنسا ئەم کارانەی بە تاکرەوی پەیرەو دەکردن، بێ ئەوەی ئەڵمانیا بتوانێت دەست بخاتە پێشی تەنیا بە شەڕ نەبێت. بەڵام ئەگەر کارەکان گەیشتنە ئەم ئاستە، ئەوا ئەڵمانیا بە مسۆگەری دۆڕاوە، چونکە پارسەنگی هێز لە بەرژەوەندیی فەرەنسادایە. هەوڵەکانی ولهالمی دووەم بۆ شکاندنی گەمارۆی سەر ئەڵمانیا سەردانەکەی قەیسەری روسیا بوو لە بیۆرکۆ، ئەمە دوایین هەوڵ بوون لەم بوارە، کە بە سەرنەکەوتنی هەوڵەکان و پتەوتربوونی دۆستایەتیی روسیا و فەرەنسا تەواو بوو. بەتایبەت فەرەنسا بۆ یارمەتیدانی روسیا توانا داراییەکانی بەکارهێنا، وێڕای بەگەر خستنی توانا دیبلۆماسیەکانی بۆ لەیەکنزیککردنەوەی روسیا و بەریتانیا، کە بووە رێخۆشکەری تەبایی و دۆستایەتیی روسی – بەریتانی لە ١٩٠٧.

## تەبایی(ویفاقی) روسی - بەریتانی١٩٠٧

ئاماژەمان بەو ناکۆکیەی نێوان روسیا و بەریتانیا دا لە جەنگی نێوان روسیا و ژاپۆن، لەو میانەدا بۆ روسیا دەرکەوت پشتبەستن بە دەستێوەردانی بەریتانیا دژی ژاپۆن تەنیا خەیاڵە و هیچی تر نا، کەشتیگەلی بەریتانی تەنگژەی بە کەشتیگەلی روسی هەڵچنی بوو لە کەنالی سوێس لە کاتی هاتنی بۆ رۆژهەڵاتی دوور بە هۆی زاڵبوونی

بەسەر کەناڵی سوێسەوە، بوونی هاوپەیمانێتیی بەریتانی - ژاپۆنی رێگەی لە فەرەنسا دەگرت هاوکاری روسیای هاوپەیمانی بکات.

تاڵی و سوێرییەکانی روسیا زۆر بوون، بەڵام بە هۆی هاوکارییەکانی فەرەنسا نازارەکان کەم بوونەوە، هەروەها کۆمەڵێک ئامۆژگاریی دیبلۆماسییان بە روسیا دا لەوانە: بەریتانیا سەرباری هەڵوێستە مەترسیدارەکانی بۆ سەر روسیا، هەرخۆی (بەریتانیا) دەتوانێت تەرازوی نێودەوڵەتیی هێزەکان لە بەرژەوەندیی هاوپەیمانێتیی دووقۆڵی و سێ قۆڵی بگۆڕێت.

حکومەتی روسیا دوای ژێرکەوتنەکەی و کپکردنی شۆڕشە مەزنە ناوخۆییەکەی ساڵی ١٩٠٥، لەجیاتی وروژاندنی دوژمندارێتییە کۆن یان نوێیەکان، بە پێویستی زانی بەدوای دۆستێکدا بگەڕێت باشترە، درکیشی بەمە کردبوو، کە ئەو هێزانەی رێگرن لە بەردەم گەشەکردن و پەرەسەندن و فراوانبوونی ئەمانەن:

ا/ بەریتانیا.

ب/ ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا.

ج/ ئەڵمانیا.

دوای ئەوەی ژاپۆن دەرگای فراوانبوونی لە رۆژهەلاتی دوور لە روسیا داخست، شوێنێکی ئەوتۆ لەبەردەمیدا نەما تا ئەجندای فراوانخوازیی جێبەجێ بکات،

ا/ دەوڵەتی عوسمانی بە ئاراستەی عێراق و ئەنادۆل.

ب/ دەوڵەتی عوسمانی بە ئاراستەی بەلکان.

ج/ ئێران.

سەبارەت بە فراوانبوون لەسەر حسابی دەوڵەتی عوسمانی بەریتانیا دژی ئەم فراوانبوونە بوو، بە هەموو توانایەکیەوە دژی دەوەستا، ئەمە لە ترسی ئەوەی دەست بەسەر بەنداوەکانی (دەردەنیل و بسفۆر) دانەگرێت. نەک هەر ئەوەندە، بەریتانیا رێگەی بە کەشتییە روسیەکانیش نەدەدا بەم بەنداوەدا تێپەڕ کەن، دیسان دژی فراوانبوونی روسیا بوو لەلایەنی ئەنادۆل و باکووری عێراقەوە. ئینگلیزەکان سیاسەتمەدارە روسەکانیان بەوە تاوانبار دەکرد، کە نەخشە بۆ گەیشتن بە کەنداوی عەرەبی دادەرێژن، کە وەکو کلیلی رێگای بەرەو هیند وابوو.

سەبارەت بە فراوابوون لە بەلکان ئیمپراتۆریەتی نەمسا و مەجەر دژی ئەم جوولەیە دەوەستان، هەر هەولێکی روسی رەتدانەوەیەکی نەمسای لە پێش بوو، روسیاش لە بەلکان هەمان سیاسەتی لەگەڵ نەمسا پەیرەو دەکرد، بەڵام وڵاتە بەلکانییەکان زو زو هەڵوێستیان دەگۆڕی، هەر ماوەی لەگەڵ وڵاتێک دەسازان بە ئومێدی ئەوەی دەستکەوتێک وەدەست بێنن بە هەر رێگەیەک بێت.

لەبەر ئەوەی هیچ یەک لە نەمسا و روسیا لەبەر ناسکی و پڕمەترسیی ناوچەکە لە گۆڕانی پارسەنگی هێزەکان نەیانتوانی یەکیان بەسەر ئەوی تردا زاڵبن، ناچار هەردوو لا روسیا و نەمسا لە ١٨٩٧ لەسەر ئەوە رێککەوتن، کە بێ دەسکاری دەست بە دۆخەکانەوە بگرن. دۆخەکان لە بەلکان بەم شێوەیە مانەوە تا ١٩٠٣، ئەو کاتەی شۆڕش لە مەکەدۆنیا دژی ستەم و زۆرداری تورک هەڵگیرسا، لەو کاتەوە ململانێی روسیی- نەمسایی لە هەڵچوونە. دواتر بووە شەڕی (هێلی هاتووچۆ) ئەو کاتەی نەمسا پڕۆژەی دروستکردنی هێلی ئاسنینی ئامادە کردبوو بۆ جیاکردنەوەی سنووری سرب و چیای رەش، روسیاش بە کێشانی هێلێکی ئاسنی لە رۆژهەڵاتی سرب بۆ کەناری دەریای ئیجە وەڵامی دایەوە، نەمسا زۆر لەوە دەترسا سرب بکەوێتە سەر دەریا.

دواتر هەر چالاکیەکی روسی لە بەلکان دەبووە مایەی دروستبوونی قەیرانێکی نێودەوڵەتیی ئاڵۆز، ئەنجامەکانی ئەم قەیرانانە مەرج نەبوو هەموویان لە بەرژەوەندیی روسیا دابن، زۆربەیان لە بەرژەوەندیی وڵاتانی بەلکان تەواو دەبوون، لەگەڵ ئەوەش روسیا سووربوو لەسەر ئەوەی سیاسەتەکانی لەم ناوچەیە کاریگەری خۆیان هەبن. هەمان بارودۆخ سەبارەت بە چالاکییە فراوانخوازیەکانی روسیا لە دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام ئومێدەکانی روسیا بە دیاریکردنی چارەنووسی دەوڵەتی عوسمانی هەرەسیان هێنا بە هۆی پەرەسەندنی رۆڵی ئەڵمانیا، بەتایبەت سەبارەت بە پڕۆژەی کێشانی هێلی ئاسنینی نێوان بەرلین - بەغدا تا کازمیە لە کوێت. بەم شێوەیە ئەڵمانیا هاوشانی بەریتانیا لە دەوڵەتی عوسمانی بوو بە هێزێکی دیار و بەرچاو، بەڵکو لە فەرمانگە ئەوروپییەکان وا ناسرا، کە مەودا زیندووەکانی ئەڵمانیا دەوڵەتی عوسمانییە بەتایبەتیش ئەنادۆل وعێراق.

لە بەردەم روسیا جگە لە ئێران هیچ شوێنێکی لەبەردەم نەما بسەلمێنێت، کە روسیا هێشتا وڵاتێکی بەهێزە، دیارە ئەوسا چالاکی داگیرکاری وڵاتە بچووکەکان نیشانە

بەهێزی وڵاتان بوو، بەڵام ماوەی سەدەیەک دەبێت بەریتانیا بە نهێنی و ئاشکرا دژی فراوانخوازیەکانی روسیا دەوەستێتەوە لە ناوچەی فارس.

روسیا بۆ ئەوەی دەرگای فراوانکاری لەبەردەم خۆیدا والآکات، دەبوایە لێکتێگەیشتنێک لەگەڵ هاوپەیمانی سێ قۆڵی یان بەریتانیا ئیمزا بکات، هەر لێکتێگەیشتنێک لەگەڵ ئەڵمانیا لەناوبردنی هاوپەیمانی روسی- فەرەنسی دەگەیەنێت، کەوایە رێککەوتن لەگەڵ بەریتانیا باشترین رێگەیە.

لە ساڵەکانی ١٩٠٦ -١٩٠٧ و دوای ئەوەی روسیا لە نسکۆی ژاپۆن پەرِوباڵی کرابوو، بەریتانیاش لە پێداگرتنەکانی دژی روسیا هەندێک سست ببوو، ئەوە بە دوور دەبینرا روسیا لەگەڵ وڵاتێکی مەزن خۆی بخاتە شەرِەوە. ئەگەر بەراوردێک بە هەڵوێستەکانی روسیا و توانا سەربازیی و ئابووریەکانی ئەڵمانیا بکەین، کە لەوپەڕی گەشە و پەرەسەندنی دابوو لە بواری بەرهەمهێنان و دروستکردنی هێڵی ئاسنین و بەستنەوەی ناوچەکان بە یەکەوە، رێژەی تواناکان ئەڵمانیایان گەیاندبووە ئاستێک بەربەرەکانی بەریتانیای دەکرد و لەم بوارەدا زیانی بە بازرگانی و ئابووریی گەیاندبوو. بەڵام ئەوەی روون و ئاشکرایە دوژمنێکی هاوبەش بۆ روسیا و بەریتانیا و ئەڵمانیا هەبوو، کێشەکانی نێوان روسیا و بەریتانیا دەکرا چارەسەر بکرێن بە پێچەوانەی کێشەکانی نێوان روسیا لە لایەک وهەریەک لە ئەڵمانیا و نەمسا لە لایەکی تر. گومانی تێدا نییە ئەو رۆڵەی دیبلۆماسیەتی فەرەنسی بینیی لە نزیککردنەوەی روسیا و بەریتانیا و کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ و دانوستان بۆ چارەسەرکردنی کێشە کانی نێوانیان، بە مەزنترین سەرکەوتنی دیبلۆماسیەتی فەرەنسی دادەنرێت لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیی.

ناوبژیوانیی فەرەنسا بۆ نزیککردنەوەی بەریتانیا و روسیا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، چونکە فەرەنسا لەسەر بەستنی هاوپەیمانێتی لە نێوان روسیا و بەریتانیا سوور نەبوو، بەڵکو داوای بەستنی تەبایی و دۆستایەتیەکی لێکردن وەکو ئەوەی لە ١٩٠٤ ئەنجام درا. لە کۆتاییدا رێککەوتنێک لە نێوان روسیا و بەریتانیا لە ٣٠ی ئابی ١٩٠٧ ئیمزا کرا، نیوەی باکووری ئێران خرایە ژێر دەسەڵاتی روسیا، نیوەی باشووری ئێرانیش خرایە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا، ناوەڕاستیش بۆ شای (قاجاری) جێما. ئەوەی سەیر بوو لەم رێککەوتنە دەڵێت: "پشتگیری لە سەربەخۆیی شا و وڵاتەکەی دەکەین"، کاتی خۆشی

بەریتانیا و فەرەنسا لە ١٩٠٤ لە ڕێککەوتنێکدا سەبارەت بە مەغریب هەمان شێوازیان پەیڕەو کردبوو. بەهای ئەم ڕێککەوتنەی بە ناوی گونجان و تەبایی نێوان (فەرەنسا- بەریتانیا) و (بەریتانیا- روسیا) ئەوکاتە دەزاندرێت، کاتێک بیردۆزەکەی زانای بەریتانی (مەکندەر) دەخوێنینەوە، کە سەبارەت بە دۆخە ستراتیجیەکانی دونیا ئاوا دەڵێت: "ئەوەی حکومڕانی رۆژهەڵاتی ئەوروپا بکات، دەتوانێت دەست بەسەر "دڵی دونیا"دا بگرێت. ئەوەی دەست بەسەر دڵی دونیاوە بگرێت، دەتوانێ تەحەکوم بە (دونیای کۆن)ەوە بکات، ئەوەی تەحەکوم بە دونیای کۆنەوە بکات، دەتوانێ دەسەڵاتی هەموو دونیا بگرێتە دەست".

دوای بەستنی ئەم دوو ڕێککەوتننامەیە لە توانای ئەڵمانیا و نەمسادا نەبوو دەست بەسەر رۆژهەڵاتی ئەوروپاوە بگرن بێ ئەوەی شەڕێکی جیهانی بەرپا نەکەن لە سەرەتای سەدەی بیستەم.

پاش ئەوەی ئەڵمانیا بەم ڕێککەوتنەی روسیا و بەریتانیای زانی، هەستی کرد گەمارۆدراوە، دوای ئەوە ئیتر ئەوروپا -بەڵکو دونیا هەمووی- کەوتە بەردەم دوو فراکسیۆنی (کوتلە) ئاڵۆزی زەبەلاحی پڕچەک، هەر یەکەیان چاوی بڕیبووە وڵاتێک بۆ ئەوەی بەلای خۆیاندا بیشکێننەوە. بەڵام بە هەموو حاڵەتێک تای تەرازوی وڵاتانی گونجان و تەبایی لە تەرازووی وڵاتانی هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیەکە قورستر بوو[٢٥]، هۆیەکەشی بەریتانیا خاوەنی هێزێکی دەریاوانیی بەرتەقای هەموو دونیا بوو، سەرەڕای ئەمەش هاوپەیمانی ژاپۆن بوو، لە رۆژهەڵاتی دوور لە ١٩٠٥ ژاپۆنی ناچار کرد بەرگری دەریایی لە هیند بکات ئەگەر ڕووبەڕووی هێرش بووەوە. هەروەها لەگەڵ فەرەنسای خاوەن هێزی دەریاوانیی دەستوەشێن لە دەریای سپیی ناوەڕاست دۆست و تەبایە، دیسان لەگەڵ روسیای خاوەن مەزنترین سوپا لە ڕووی ژمارەوە دۆست و گونجاوە.

ئەم پەیوەستیەی روسیا و بەریتانیا و فەرەنسا لە هۆکارە بنەڕەتییەکان بوون، کە بڕوا و متمانە بە روسیا ببەخشێت بەسەر زۆر لە قەیرانەکاندا زاڵ بێت، قەیرانەکان

[٢٥] لە رووی پابەندبوون بە گرێبەستیەوە (هاوپەیمانێتی) لە (گونجان و دۆستایەتی) بە هێزترە، بۆ نموونە: گونجان ودۆستایەتی بەسەر بەریتانیا ناسەپێنێت، کە بەشداری لە شەڕبکات لە تەک فەرەنسا، بەڵام هاوپەیمانێتی ئەمە بەسەر روسیاوە دەکاتە مەرج لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕ دەبێت روسیا لە تەک فەرەنسا بووەستێت.

پەیوەندییەکانیان توندوتۆڵ دەکردن و ئەوروپایان بەخێرایی بەرەو جەنگ دەبردن، لە سەروی ئەم قەیرانانە:

١- قەیرانی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا، کە لە ١٩٠٨ بۆسنە و هرسکیان خستە سەر وڵاتەکەی خۆیان.

٢- قەیرانی ئەگادیر لە ١٩١١.

٣- شەڕەکانی بەلکانی لە ١٩١١ - ١٩١٣.

# بەشی دەیەم

## قەیرانە نێودەوڵەتییەکانی ڕێخۆشکەر بۆ جەنگی یەکەمی جیهانیی

* قەیرانی دەستگرتن بەسەر بۆسنە و هرسک لە (١٩٠٨)
* قەیرانی ئەگادیر.
* شەڕەکانی بەلکان ١٩١٢ - ١٩١٣
* کوشتنی شازادەی نەمسا
* وڵاتە بەشداربووەکانی جەنگ

دوای بەستنی هاوپەیمانێتیی تەبایی روسیی- بەریتانی بەڕوونی کەشوهەواکان ئەوەیان دەگەیاند، کە ئەوروپا بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوو بلۆک هەنگاو دەنێت. مەوداکانی ئاشتەوایی نەمابوون، ئەوەی مابوو مەودای ڕووبەڕووبوونەوە بوو، ئەوەش لەوەتەی ١٩٠٨ تا ئەو کاتەی شەڕی ١٩١٤ رویدا سیاسەتی لێواری جەنگ پیادە دەکرا. هێزەکانی تری دونیا - بەتایبەت ئەمەریکا و ژاپۆن - لە نزیکەوە چاودێری دۆخەکانیان دەکرد تا ئەوکاتەی بە هۆی ڕووداوێک لە ڕووداوەکان لە ئەوروپا دۆخەکان گەیشتنە ئاستی لوتکە. مەبەستمان لە ڕووداوەکە، کوشتنی شازادەی نەمسا فرانز فەردیناند بوو، ئەم قەیرانە بوو ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانیی هەڵگیرساند.

## قەیرانی دەستگرتن بەسەر بۆسنە و هرسکدا

ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا بە پێی بڕیارەکانی بەرلین لە ١٨٧٨ بەڕێوەبردنی ئەم دوو هەرێمە (بۆسنە و هرسک)ی سەربە دەوڵەتی عوسمانییان گرتبووە ئەستۆ، بەڵام نەمسا بە پاساوی چەند هۆیەک لەوانە سەلامەتی ئیمپڕاتۆرەکەی بە پلە یەک، چاوی لێ بوو بیانخاتە سەر خاکی خۆی. چونکە داواکردنی نەتەوەیەک لە نەتەوەکانی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا مافی سەربەخۆ واتە هەموو نەتەوەکان داوادەکەن، بەمەش ئیمپڕاتۆریەتەکەیان، کە لە چەندین نەتەوە پێک هاتووە، هەڵدەوەشێتەوە.

بزووتنەوەی (کۆمکاری سرب) رۆژ لەدوای رۆژ بەهێزتر دەبوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ملیۆنەها سرب، کە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریادا دەژین، داوای یەکگرتنەوە دەکەن لەگەڵ نەوەی رەچەڵەکیان لە میرنشینی سرب.

حکومەتی سرب تا ساڵی ١٨٨٢ لەژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا دابوو، تا لە رێگەی کودەتایەک رژێمی پادشایەتیی نەمسایان وەلانا و لە ١٩٠٣ (بتروس قەرە جۆرجینیچ)یان دانایە سەر تەختی حکومڕانی، ئەوسا شەپۆلێک لە پڕوپاگەندە لەناو نەمسا بۆ دروستبوونی (سربی مەزن ) بڵاوبوونەوە، ئەم کارە هەڕەشە بوو بۆ قەوارەی ئیمپڕاتۆریەتی فرەنەتەوە.

هەروەها پڕوپاگەندەیەکی تری سرب هەبوو دەڵێت: هەردوو ویلایەتەکەی سربی لە بۆسنە و هرسک، کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکانە، دەخرێنە سەر دەوڵەتی دایک

(سربیا) ، بەڵام گۆڕانەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی کارەکانیان بەرەو ئاقارێکی تر برد، لە ۱۹۰۸ شۆڕشێکی سەربازی دژی دەوڵەتی عوسمانیی ستەمکار و دژی حوکمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم هەڵگیرسا، ئەو حوکمەی وڵاتە ئەوروپییەکان چاویان تێبڕیبوو تا هەردەرفەتێکیان بۆ بڕەخسێ دابەشی بکەن. ئەم شۆڕشە هەندێک شۆڕشگێری کۆمەڵەیەک پێی هەڵسا، کە پێیان دەوت (کۆمەڵەی یەکێتی و گەشەکردن)، یەکێک لە ئامانجەکانیان گەڕاندنەوەی حوکمی دەستوور و دەسەڵاتی تورکەکان بە هێزەوە بۆ هەموو ناوچەکانی ویلایەتەکانی بوو، بە کرداریش وابوو هێزەکانی سوپایان بە فەرمانداریێتی ئەفسەرانی ئەم کۆمەڵەیە روەو مکومکردنی دەسەڵات جووڵەیان پێکردن، ئەمان بە (یەکێتییەکان ) ناسران.

کاتێک ئەم (یەکێتیانە) بڕیاری شۆڕشیان دا، مەبەستیان بوو شۆڕشەکەیان سیمایەکی گشتگیری پێ ببەخشن، داوایان لە ویلایەتەکان کرد - لەوانە بۆسنە و هرسک - نوێنەریان بنێرن بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵەی یەکێتی و گەشەکردن. بەڵام کاتێک ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا هەستی کرد ئەم شۆڕشە دژی دەسەڵاتی سوڵتانە، ئەمەی بە دەرفەتێکی زێڕین زانی و نیازی بوو دوو چۆلەکە بە یەک بەرد بکوژێت.

۱- هەردوو ویلایەتەکەی بۆسنە و هرسک بخاتە سەر خاکی خۆی بەر لەوەی تورکەکان لە گیروگرفتەکانی ناوخۆ دەرباز بن.

۲- لێدانی گورزێکی کوشندە لە ئومێدی سربەکان، کە بەم دوو ویلایەتە ئومێدبەست بوون.

بەڵام گۆڕانی نەخشەی بەلکان بەبێ رەزامەندی روسیا سەرناگرێت، (ئەهرانت) - سیاسەتمەداری نەمسا- ئەمەی دەزانی، بۆیە پیلانێکی داڕشت تا روسیا بخزێنێتە ناو کێشەکە و لە دیفاکتۆیەکدا ناچار بێت دان بە دەستبەسەرداگرتنەکەی نەمسا بۆ بۆسنە و هرسک بنێت، دواتر قەرەبوویەکی ماددیی چاکی روسیاش بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ ئەزفۆلسکی -سیاسەتمەداری روسی - کەوتە دانوستان، سیاسەتمەداری نەمسایی ئەهرانت بە زیرەکی خۆی توانیی کار بکاتە سەر روسیا، هەر زوو دانی بە مافی روسیا نا لە هاتووچۆکردنی کەشتیگەلی جەنگاوەری روسی بە بەنداوی دەردەنیل و بسفۆر، دڵنیابوو لەوەی هەم دۆستانی روسیا هەم ناحەزانی تەنانەت ئینگلتەراش رێگە بەم داخوازیە نادەن،

ئەهرانت ئەم بەزمەی داخست و پلانەکەی خۆشی جێبەجێ کرد، ئەم دانوستانانە بەبێ ئاگاداری فەرەنسا بەڕێوە دەچوون. لە لایەکی تریشەوە لەگەڵ پادشای بولگاریا ڕێککەوت- تا ئەوکات لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان دابوو - تا سەربەخۆیی خۆی رابگەیەنێت، ئەوەندەی نەبرد تا لەپڕ ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا بۆسنە و هرسکیان خستە سەر خاکی ئیمپراتۆریەتەکەیان. ئەم دەستبەسەرداگرتنە گورزێک بوو لە دەوڵەتی عوسمانی درا، بەڵام بۆ میرنشینی سربیای جەوان گورزێکی کوشندەتر بوو، بۆ روسیاش گورزێکی زوڵملێکراو بوو بە هۆی ئەوەی نەمسا دەستکەوتی خۆی وەدەست هێنا و روسیاش بە قەرەبوو سەرگێڕدراو کرا. حکومەتی روسیا هەرایەکی زۆری نایەوە، بەڵام لە رووی لەشکرکێشیەوە هیچی نەکرد، روسیا بۆ بەهاناوەهاتنی رووی لە هاوپەیمانە کۆنەکەی (فەرەنسا) و دۆستە نوێکەی (بەریتانیا) کرد، بەڵام فەرەنسا داواکەی رەت کردەوە، گوایە روسیا ژێر بە ژێر لەگەڵ نەمسا گەلێک دانیشتن و هەنگاویان بەیەکەوە ناوە، کە دەبووایە بۆچوونی فەرەنسای وەرگرتبا، بۆ مەسەلەی زوڵملێکراویەکەی روسیا - بە بۆچوونی دیبلۆماسیەتی فەرەنسی- ئەوە ناچارمان ناکات بەوهۆیەوە لەتەک روسیا بووەستین.

بەریتانیاش هەر لەسەر هەڵوێستە کۆنەکەی مایەوە، کە داخستنی بەنداوەکان بوو بە رووی کەشتیگەلی روسی. ئاسایی بوو ئەڵمانیا فشار بخاتە سەر روسیا بۆ ئەوەی دەست لە نانەوەی قەیرانەکان هەڵگرێت، بەم شێوەیە روسیا لە ۱۹۰۸ جارێکی تر ڕوویەڕووی شکستێکی دیبلۆماسی بووەوە لە شێوەی شکستەکەی ئەڵمانیا لە کۆنگرەی دوورگە لە ۱۹۰٦.

هەرچەندە روسیا باجی خۆی دا، بەڵام لەم باجدانە گەیشتە ڕاستیەک، کە ئەگەر هاوپەیمانێتیی سێ قۆڵی سەرکەون، ئەوا هەڕەشە لە روسیا دەکرێت، بۆیە دەبێت لەسەر پابەن بوون بە دۆستە کۆنەکەی (فەرەنسا) سوورتر بێت.

پرۆسەی دەستگرتن بەسەر بۆسنە و هرسک بۆ سربیا ئەوە دەگەیەنێت لە داهاتوو ناتوانێ بخرێنەوە سەر (سربیای مەزن)، داگیرکردنی نەمسا بۆ ئەم دوو هەرێمە مانای ئەوەی نیە نیتر دەستبەرداری ئەو ئومێدە بوو، بەڵام لەخۆگرتنی هەرێمەکان بێگومان کۆتایی بە ئومێدەکان دێنن.

ئەمەو رسوابوونی روسیا لەژێر هەڕەشە و فشارەکانی دۆست و ناحەزانی گورزێک بوو لە سربەکان درا، چونکە ئومێدێکی زۆری بە خۆبزاوتنی روسیا هەبوو، کە دژی نەمسا کاردانەوەیەکی هەبێت. سربەکان کەمێک دانیان بەخۆدا گرت، بەلام بۆ حکومەتەکەیان کارێکی ئاسان نەبوو بتوانێت کار بکاتە سەر هەستی سربەکان، چ ئەوانەی ناو ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و چ ئەوانەی ناو سربیا، ئەم کارە رەنگدانەوەیەکی خراپی لەسەر توندبوونی قەیرانەکانی نێوان سرب و ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا هەبوو.

## قەیرانی ئەگادیر

هەروەکو گۆڕانی بارودۆخەکان لە بەلکان لەسەر دەستی نەمسا و هەنگاریا بە لکاندنی خاکی بۆسنە و هرسک بە ئیمپڕاتۆریەکەیان بووە هۆی نانەوەی کیشەیەکی نێودەوڵەتیی ئاڵۆز، بە هەمان شێوە گۆڕانی بارودۆخەکان لە مەغریب لەسەر دەستی فەرەنسا بوونە هۆی وروژاندنی ئەڵمانیا و دروستبوونی (قەیرانی ئەگادیر)، کە پەشێویی لە نێوان هەردوو کوتلەکە بۆ ئاستێکی خەتەرناک بەرز کردەوە.

کێبڕکێی بەریتانیا و ئەڵمانیا لە بواری دەریاوانی و داگیرکاری لەوپەڕی توندی دابوو، بە هۆی ئەوەی بەریتانیا سووربوو لەسەر ئەوەی هێزە دەریاوانیی دەبێت دووبەرانبەر هێزی دەریاوانیی دونیا بێت، هەوڵەکانی وەستاندنی ئەم کێبڕکێیە سەرکەوتوو نەبوون، هۆیەکی تری سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی وەستاندنی کێبڕکێکە سووربوونی ئەڵمانیا بوو لە دەستهەڵنەگرتن لە بەشی باشووری هێلی ئاسنینی بەغدا بۆ بەرژەوەندی بەریتانیا تەنیا بەمەرجی ئەوە نەبێت، لە حاڵەتی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوانی ئەڵمانیا و فەرەنسا بەریتانیا بێلایەن بووەستێت. بەلام بانگەوازەکەی بەریتانیا لە ١٩٠٨ بۆ داخوازیی سەربازیی مانای ئەوەیە بەریتانیا لە رێککەوتنەکەی گونجان و دۆستایەتی لەگەڵ هەر یەک لە فەرەنسا و روسیا نەما، کارەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە بەریتانیا سوورە لەسەر ئەوەی لە هەموو بوارەکان بەسەر ئەڵمانیادا زاڵبێت.

ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی ئەڵمانیا لە چاوەڕوانی وڵاتەکانی گونجان و دۆستایەتی دابێت بۆ تەنگەتاو کردنیان، کاتێک فەرەنسا بە هێزێکەوە چووە سەر مەراکش، ئەڵمانیا دڵنیا بوو لەوەی هەرکاتەی لەشکری وڵاتێکی ئیمپریالیزمی ئەوروپی لەشکرکێشی بکاتە

سەر مەراکش، ئەمە خۆی لە خۆیدا داگیرکردنە. چونکە کاتی خۆشی بەریتانیا، کە میسری داگیر کرد، سەرەتا بەناوی هاوکاریکردنی خدێوی و پاراستنی لە یاخیبووان چوە ناو میسر، بەڵام دواتر بوو بە داگیرکار، ئەمە هەر چەندە ئۆپەراسیۆنەکەی فەرەنسا زیانی زۆر بە مەراکش ناگەیەنن. بەڵام بە ئەگەری ئەوەی حکومەتی ئەڵمانیا هەردەم سەرنەکەوتنەکەی کۆنگرەی دوورگە لە ١٩٠٦ی لەبیربوو، مەبەستی ئەوەبوو کارێکی وا بکات ئەم کارەساتەی لەیاد بچێت، یان هەر نەبێت قەرەبووی ئابڕووچوونەکەی بکاتەوە. ئەمە بەتایبەت کە ئیسپانیا هەرچەندە لەم داگیرکاریەی فەرەنسا ژێر بە ژێر سازشێکی لەگەڵ فەرەنسا دا هەبوو، بەڵام لە ناخەوە دژی ئەم داگیرکارییە بوو.

بەڵام کاردانەوەی ئەڵمانیا توند بوو، حکومەت کاولکاریی (پانتێر)ی بە چەکی قورسەوە ناردە سەر بەندەری ئەگادیر و دەستی بەسەردا گرت بە نیازی ئەوەی لەژێر دەستیدابێت، تا ئەوکاتەی لەگەڵی دەگەنە رێککەوتنێک، داخوازیەکانی ئەڵمانیا بۆ قەرەبووکردنی کۆنگۆی فەرەنسی بوو.

ئەم هەڕەشانەی ئەڵمانیا بەریتانیا زۆر بەتوندی بەرویدا وەستا، سیماکان ئەوەیان دەخوێندەوە ئەگەر جەنگ روبدات، بەریتانیا لەپاڵ فەرەنسا دەوەستێت. پسپۆرە سەربازییەکانی فەرەنسی و بەریتانی زانیارییەکانی نەخشەی جەنگیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، لەولاشەوە گەلی ئەڵمانیا دەهۆڵی جەنگیان لێدەدا و داوایان لە قەیسەری ئەڵمانیا دەکرد لەگەڵیان توند بێت، بەڵام بە بۆچوونی قەیسەر مەسەلەکە ئەوەندە ناهێنێت جەنگێکی مەزنی لەسەر بەرپا بکرێت، بۆیە بە پارچەیەک زەوی لە کۆنگۆ رازی بوو بەو ئومێدەی ئەم پارچە زەویە لە داهاتوودا بۆ ئەوان ببێتە دەروازەیەک بۆ چوونە ناو ئەفریقیا. بەم شێوەیە فەرەنسا لە کێشەکە بە سەرکەوتویی دەرچوو، دەستەکانی لە مەراکش والابوون، لە ساڵی ١٩١٢یش مافی پاراستنی بەسەردا راگەیاند.

ئەم قەیرانە ئەنجامی گرنگیان لێ دەرکەوتن، ئەویش بەریتانیا، کە تا ئەوسا پەیوەندییەکانی لەگەڵ فەرەنسا لەسەرئاستی گونجان دابوو، بەڵام بەم قەیرانە هەرچەندە بە رێککەوتن هیچ رانەگەیەندرا، بەڵام پەیوەندییەکان چوونە ئاستی هاوپەیمانی.

لە میانەی ئەم قەیرانە و دواتریش هەریەک لە ئیتاڵیا و روسیا هەوڵی سوودوەرگرتنیان دا لەم دەرفەتە، روسیا هەڵمەتی کردە سەر ئێران بە مەبەستی

فراوانخوازی، بەڵام بەریتانیا ڕێگەی نەدا ئامانجەکانی بێنە دی، کەچی ئیتاڵیا بە ڕەزامەندی وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا ڕووەو دەوڵەتی عوسمانی هێرشی برد، لەشکرکێشیی کردە سەر تەرابلس و دوورگەی دۆدیکانیز و داگیری کردن. تورکیا ناچاربوو ئاگربەستی لەگەڵ ئیمزا بکات لەژێر مەترسیی دروستبوونی کۆمەڵەی بەلکان (یۆنان وسرب وبولگاریا) ، کە شەڕیان دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند بۆ وەدەرنانی لە وڵاتەکانی ئەوروپی، ئەوەی ڕاستیش بێت بۆ ئامانجە فراوانخوازیەکانی نەتەوایەتیەکانیان بوو.

## جەنگەکانی بەلکانی ١٩١١ -١٩١٣

بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی بەلکان بە بەرمیلی باروت ناو دەبردرا، هەر واش بوو، هەڵوێستەکانی وڵاتانی مەزن و وڵاتەکانی بەلکانیش ناتوانین دیاریکەین ئاخۆ کێ لەگەڵ کێ دابوو، کامە وڵاتی مەزن دۆست یان دوژمنی کامە وڵاتی بەلکانە یان بە پێچەوانەوە؟ چونکە لە گۆڕانی بەردەوامدا بوون، تەنیا ئەوە دەتوانین بڵێین دوای قەیرانی بۆسنە و هرسک سربەکان دوژمنی سەرسەختی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا بوون.

ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریاش بەدوای فاکتەرێکدا دەگەڕا بۆ ئەوەی هەتاهەتایە پڕوپاگەندە چالاکیەکانی سربی مەزن بێدەنگ کات، بۆ ئەم مەبەستە ڕێگەی گەمارۆی ئابووریان بەکارهێنا، بەڵام بێسوود بوو. سیاسەتمەدارانی نەمسا گەیشتنە ئەو بڕوایەی تەنیا هێز تاقە ڕێگەیە بتوانێت بیرۆکەی (سربی مەزن) لەناوبەرێت، ئەگەر ئەمە ئەکات ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا توشی هەڵوەشانەوە دێت، بەتایبەت دوای شۆڕشە نەتەوایەتیەکەی مەکەدۆنیا دژی حوکمی تورکیی هەستی نەتەوایەتی لای سربەکان گەشەی سەند و بووژایەوە.

مەکەدۆنیا پێک هاتبوو لە سرب و یۆنانی و بولگارییەکان، ڕۆژنامەکان بە دروشمە نەتەوایەتییەکان گڕیان لە نەتەوەپەرستانی یۆنان و بولگاریا و سربیا بەردابوو، ئەم بوارە مەودایەکی دیماگۆجیی بەخۆوە بینی بە هاندانی هەستی سەلبی.

ئەگەر ئەم دروشمە نەتەوایەتیانەمان خستنە لایەک و لەسەر بنەمای نەتەوایەتی مەکەدۆنیامان دابەشی سەر پێکهاتە نەتەوایەتییەکان کرد، دەبینین ئەم کارە ئەستەمە بکرێت بە هۆی ئەوەی نەتەوەکان بە جۆرێک تێکهەڵکێش کراون، جیاکردنەوەیان لە یەک

کارێکی ئاسان نییە. ئەمە بووە هۆی چاندنی تۆوی دووبەرەکی و ئاژاوە و تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان لایەنە بەشداربووەکانی کۆمەڵەی بەلکان، کە لە ساڵی ١٩١٢ دامەزرابوو، هەرچەندە روسیا پشتگیریی لەم جۆرە رێکخراوانە دەکرد، بەڵام ئاشکرای کرد، کە تەنیا دەرکەوتنیان و جووڵەکردنیان دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕوویەڕووی هەمان چاوبڕینەکانی خۆی دەبنەوە لە دەوڵەتی عوسمانی، واتە لە بەرژەوەندییەکانی دەدرێن. فەرەنسا و روسیا هەوڵی ئەوەیان دا دەست بەسەر دۆخەکەدا بگرن و چالاکیەکانی ئەم کۆمەڵە سنووردار کەن، بەڵام بێسوود بوو. وڵاتەکانی کۆمەڵە لە چاوەڕوانی ئەوە دابوون روسیا لە تەکیان بووەستێت، بەڵام ئەم هەموو هەوڵانە بە درەنگوەختانێک هاتن، ئەوەندەی نەبرد چیای رەش (مۆنتنیگرۆ) بڕیاری شەڕی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند، دواتر وڵاتەکانی تری کۆمەڵە چاویان لێکرد.

ئۆپەراسیۆنەکانی وڵاتانی کۆمەڵە پێی هەڵدەستان سەرکەوتوو بوون، بەڵام بووە هۆی سەراوژێرکردنی بارودۆخە سیاسیی و ستراتیجیی و نێودەوڵەتییەکان.

سوپای سربەکان بەسەر تورکەکاندا زاڵ بوون و دەستیان گرت بەسەر مۆناستیتر و دڵی مەکدۆنیا، بولگاریەکان ئومێدیان دەخواست، کە ئەم بەشە سەرکەوتنی ئەوان بووایە. هێزەکانی سربی درێژەیان بە هەڵمەتەکان دا تا گەیشتنە دۆرازۆ، لەوێ ئیتر ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا هار بوو لەوەی سربەکان دەروازەیەکیان لەسەر دەریای ئیجە کەوتە ژێر دەست. لەژێر فشاری نەمسا و ئیتاڵیا سربەکان ناچار کران لە دۆرازۆ بکشێنەوە، هەروەها نەمسا فشاری خستە سەر چیای رەش (مۆنتنیگرۆ) تا ئەویش دەست لە ئەشقودەر هەڵگرێت. هێزەکانی یۆنانیش بەسەر تورکەکاندا سەر کەوتن و شاری سالۆنیکایان ئازاد کرد، بەڵام ئەمەش نیاز و ئومێدی بولگارییەکان بوو.

شاری ئەدەرنەش کەوتە ژێر دەستی هێزە هاوبەشەکەی سربی و بولگاری، هێرشەکان روەو ئەستانە بەردەوام بەرەو پێش دەچوون و ئەوەندەیان نەمابوو بگەن پێی، بەڵام ئەم جارە روسیا دەستی خستە پێش و لەوە رازی نەبوو بەنداوەکان بکەونە ژێر دەستی وڵاتێکی ئەوروپی، جا ئەو وڵاتە لە وڵاتە مەزنەکان بێت یان بچووک، دوژمن بێت یان دۆست، فشاری خستە سەر بولگاریا تا ئەویش بیرۆکەی هێرشبردن روەو پایتەختی عوسمانییەکانی وەلا نا.

ئەم سەرکەوتنانە و ئەم دەستێوەردانانەی دوو وڵاتە زلهێزەکەی ئەوروپا و بە رەزامەندیی وڵاتەکانی تر بۆ بەرقەراربوونی ئارامی لە ئەوروپا بەر لەوەی هەموو کاغەزەکان تێکەڵ بە یەک ببن، بوونە هۆی بەستنی گرێبەستێکی ئاشتەوایی لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و چوار وڵاتە بەلکانییەکە.

ئەوەندەی بەسەرنەچوو تا وڵاتانی کۆمەڵە بە ڕووداوەکانی رابردوودا هاتنەوە، بولگاریا بە هۆی ئەوەی لەم ڕووداوانە هیچی دەست نەکەوتبوو ئاخی هەڵدەکێشا، یۆنان و سربەکان هەریەکە پانتاییەکی باشیان لە خاک کەوتە ژێردەست، کە سەرنشینێکی زۆری لێ نیشتەجێ بوو. ئەم سەرنشینە نوێیانە هەموویان تەنیا یۆنانی و سربی نەبوون، بەڵکو بولگاریش بوون، دەرخستنی ئەم بولگاریانە بە هێز نەبێت ناکرێت، بۆیە پادشای بولگاریا کتوپڕ هێرشێکی بۆ سە ر(دڵی مەکەدۆنیا) برد بە مەبستی داگیرکردنی، بەڵام سربەکان دژی بولگاریەکان هاوکاری یۆنانییەکانیان کرد. بەم شێوەیە سربەکان بۆ هاوکاری یۆنانییەکان دژی بولگاریا کەوتنە جەنگ، لەشکری بولگاریا شکستی هێنا و بەرەو دواوە کشایەوە، بەڵام ئەوەی سەیر بوو رۆمانیا بۆ مەرامەکانی خۆی هاتە ناو کێشەکە و دژی بولگاریا کەوتە شەڕ و راوەدوی بولگاریای نا و ئەوەندەی نەمابوو سۆفیا بگرێت، هەڕەشەی لە سۆفیا دە کرد. لەم میانە ئەنوەر پاشا[٢٦]، کە لە ئەنجامی کودەتایەک تازە دەسەڵاتی لە ئەستانە گرتبووە دەست، توانی ئەم دەرفەتە بقۆزێتەوە و ئەدەرنە بە ئاسانی بگرێتەوە، بە دەرچوونی ئەدەرنە لە دەسەت بولگاریا ناچار دەبێت پەیماننامەی بوخارێست لە ١٩١٣/٠٨/١٠ ئیمزا بکات.

لەم پەیماننامەیە رۆمانیا قازانجی کرد، هەرێمی (سلستریا) و بەشێک لە خوارووی (دبروجە)ی وەرگرت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆرینەی دانیشتووانی دبروجە بولگارین. یۆنانیش خوارووی مەکەدۆنیای بەرکەوت، کە بەم شێوەیە دەروازەی دەریایی لە رووی بولگاریا داخرا. ئەمە سەرباری (کریت)، کە دژی عوسمانییەکان شۆڕشیان هەڵگیرساند بوو، راشیانگەیاند لەگەڵ یۆنان یەک دەبن. لەم کەین و بەینەدا وڵاتێکی نوێ دروست بوو، ئەویش ئەلبانیا بوو، دروستبوونی ئەم دەوڵەتە لە خۆشی خۆی نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوە

---

[٢٦] یەکێک بوو لە سێ سەرکردەکانی( یەکیەتیەکان ) دەستی بە سەر تواناکانی عوسمانیدا گرت تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی، دوانەکەی تر (تەلعەت پاشا) و (جەماڵ پاشا) ن. ی

بوو تا سربەکان نەگەنە دەریای ئەدریاتیک، کە مەبەست و بەرنامەی توندی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا و ئیتاڵیا بوو.

ئەوەی شیاوی باسە لە میانەی ئەو قەیرانانە لە لەندەن لە (١٩١٢-١٩١٣) بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی شیاو کۆنگرە دەبەسترا، دوایین کۆنگرە بۆ دابینکردنی ئاسایش بۆ ئەوروپا، سەرنەکەوتووترین کۆنگرە بوو، ئیتر ئەمە ئەوەی سەلماند، کە تەنیا سوپا دەتوانێت ڕێگە چارە بدۆزێتەوە.

ئەم شەڕ و جەنگانەی بەلکان گۆڕانی بەدوای خۆیەوە هێنا، کە ئەنجامەکەی بووە جەنگی یەکەمی جیهانیی، گرنگترینیان بریتین لە:

١- بولگاریا بە باڵشکاوی دەرچوو بێ ئەوەی ڕوسیا یارمەتیی بدات و ڕزگاری کات، تا رادەیەک نەمسا لەتەکی وەستا، بۆیە پەیوەندییەکانی بولگاریی- ڕوسی دۆستانە نەمان.

٢- حکومەتی (یەکێتییەکان) لە ئاسیتانە زیاتر مەیلی دۆستایەتیان لەگەڵ ئەڵمانیا لا دروست بوو، دوای شەڕی بەلکان ئەمە زیاتر ڕەنگی دایەوە و ئامادەیی خۆیان دەرخست، کە دووبارە ڕێکخستنەوەی سوپاکانیان لە ڕێگەی پسپۆرەکانی ئەڵمانیاوە دەکەن. بۆیە داوایان لە ئەڵمانیا کرد فەرماندەیەکیان بۆ بنێرێت، تا ئەرکی ڕێکخستنەوەی سوپاکەیان بۆ بگرێتە ئەستۆ. ئەم نزیکبوونەوەی حکومەتی یەکێتییەکان لە ئاسیتانە لەگەڵ ئەڵمانیا ڕوسیای نارەحەت کرد لە مەترسی ئەوەی ئەڵمانیا دەست بگرێت بەسەر بەنداوەکان، بۆیە ڕوسیا داوای لە ئەڵمانیا کرد لیمان ڤۆن ساندرۆس لە ئەسیتانە بکێشێتەوە، کە بۆ ئەرکی ڕێکخستنەوەی سوپاکەیانی ناردبوو. بەڵام بەریتانیا بە توندی دژی ئەم داواکاریەی ڕوسیا وەستایەوە، چونکە فەرماندەیەکی بەریتانیش لە ئاسیتانە بوو بۆ کاری ریکخستنەوەی هێزی دەریاوانیی عوسمانییەکان، بە دانوستانی دێسەمبەری ١٩١٣ کۆتایی بەم مەسەلانە هاتن، ئەم دانوستانانەش بۆ چارەسەریی کێشە و گرفتەکان بوون.



لیمان ڤۆنساندرس

بە پێی ئەو ڕێککەوتنە لیمان ڤۆن ساندرۆس سەرۆکایەتیی ستونی سوپای تورکی لە ئاسیتانە پێ سپێردرا، ئەمەی لە بری پۆستی فەرمانداریتی گشتیی سوپای عوسمانیی وەرگرت، بە بۆچوونی ئەم پۆستی فەرمانداریتی بارێکی قورس بوو بەسەر شانەوە و جێبەجێکردنی کارێکی ئاسان نەبوو. لەگەڵ ئەوەی ئەڵمانیا دڵنیا بوو دەوڵەتی عوسمانی بەرەو رووخان و نەمانە لە ناوەوە نەک لەدەرەوە، چونکە بزووتنەوە رزگاریخوازەکان لە شام و عێراق چالاک بوون. لەگەڵ ئەوەی لە کۆنگرەی پاریس لە ١٩١٣ڕێککەوتن و لەیەکتێگەیشتنێک لە نێوان عەرەب و تورک ئەنجام درا، بەڵام گۆڕانەکان ئەوەیان سەلماند، کە سیاسەتی تورک لەگەڵ عەرەب نەگۆڕاوە و کێشەکان هەر وەکو خۆیان مانەوە.

٣- شکستەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر بە وڵاتانی بەلکان بووە هۆی پەرشوبڵاوبوونی هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا، دەبووایە هێزێکی مەزن لەژێردەستی بووایە بۆ ئەوەی چاودێریی وڵاتانی بەلکانیی پێ بکات و لە هەر گۆڕان و

کێشەیەک بگاتە سەریان. ئەمە کاری کردە سەر ئەوەی لە توانایدا نەمێنێت هەموو هێزەکانی لە مەیدانی جەنگ لەگەڵ روسیا ئامادە بکات، لە حاڵەتێک ئەگەر ئەم جەنگە رووی دا. ئەمەو لەیەکنزیکبوونەوەکەی نێوان وڵاتانی گونجانە سێ قۆڵیەکە (بەریتانیا و روسیا و فەرەنسا) زیادی کرد، هەرچەندی کێبڕکێیە دەریاوانیەکەی نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیا زیادیان دەکرد نزیکبوونەوەی وڵاتە سێ قۆڵیەکەش زیادیان دەکرد. دانوستانی جەنگ و دەریاوانی لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسا بەڕێوە چوون، گرنگترین ئەو خاڵانەی لەسەری رێککەوتن، هێزی دەریاوانی فەرەنسا کۆنترۆڵی دەریای سپیی ناوەڕاست بکات، دەریاوانی بەریتانیاش دوای کێشانەوەی هێزەکانی لە دەریای سپیی ناوەڕاست دەست بەسەر دەریای باکوور بگرێت لەگەڵ بەرگریکردن لە کەنارەکانی فەرەنسای باکوور.

رۆژنامەکان ئەم نزیکبوونەوەی وڵاتانی گونجان و دۆستایەتیان زۆر بە زیادەوە دەخستە سەر رووپەری رۆژنامەکان، ئەمەش دەبووە مایەی قووڵتربوونی دوژمنایەتی لەگەڵ هاوپەیمانی سێ قۆڵی. وتارەکانی بڵاوکراوە لە رۆژنامەکانی ئەڵمانیا هێرشی ئاگرینیان دەکردنە سەر روسیا و بەریتانیا و فەرەنسا، رۆژنامەکانی ئەم سێ وڵاتەش بە هەمان شێوە و توندتر هێرشیان دەکردنە سەر ئەڵمانیا، ئەم شەڕە وتارە ناحەزی و کینەکانی بەرەو ئاقارێکی خراپ بردن سەرباری رق و کینی حکومەتەکان لە یەکتری.

لە ماوەی چەند ساڵێکی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی دەماری سیاسەتمەدار و روونا کبیرانی گەل توند و بەستراو بوون بە هۆی قەیرانەکانی هەڕەشەئامێز لە پرۆسەی ئاشتی، کە روەو رمان دەچوو. هەر جارێك کە قەیرانە کۆتایی دەهات، ئاستی شەڕی رۆژنامەکان بەرز دەبووەوە، خەڵک توشی دڵەڕاوکێ دەبوو، بەهۆیەوە کێبڕکێی سیاسی و ئابووریی نێوان هەردوو کوتلەکە دەستیان پێدەکردەوە:

دەوڵەتانی گونجان و دۆستایەتی (روسیا فەرەنسا بەریتانیا) لە لایەک ئەڵمانیا و ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا لەلایەکی تر، بەڵام ئیتاڵیا بە هۆی پەیوەستیی بە هەردوو کوتلەوە رۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو، بەم هۆیەوە کوتلەی دووەم کورتی هێنا لە نێوان (ئەڵمانیا و ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا)دا مایەوە. پرسیاری بێوەڵام لەسەر زمانی سیاسەتمەدار و بەرپرس و رۆژنامەنوسان ئەوەبوو: ئایا دەبێت کام کوتلە بەهێزتر بێت ؟ بەم بۆنەوە کاری ستونە سوپاییەکانی هەموو لایەک ئامادە کاری بوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی

جەنگێکی مەزنی سەرتاسەریی، ئەوروپا لە بەردەم چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان دەستەوەستان مایەوە و لە توانایدا نەبوو چارەسەری هیچ کێشەیەک بکات، وەکو ئەوەی لە کۆنگرەی بەرلین لە ١٨٧٨ کە تایبەت بوو بە کێشەکانی رۆژهەڵات و کۆنگرەی بەرلینی ساڵەکانی ١٨٨٤ -١٨٨٥ تایبەت بە کێشەی داگیرکاریی ئەفریقیا. دەکرێت بڵێین کۆنگرەی دوورگە لە ١٩٠٦ یەکێک بوو لەو کۆنگرانەی ئەوروپا تیایدا خاوەنی وشەیەکی هاوبەش بوو، ئەمە بە چاوپۆشین لە ئەنجامە مەترسیدارەکانی لێی کەوتنەوە، دواجار بەستنی کۆنگرەی لەندەن لە ١٩١٢، کە تایبەت بوو بە لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی بەلکان. بەم شێوەیە تواناکانی ئەوروپا بۆ چارەسەری کێشەکان لە رێگەی کۆنگرەکانەوە رۆژ لە دوای رۆژ لە کورتیان دا، بە ناچاری چەک و لەشکرکێشی بوونە تاقە رێگە بۆ بنڕکردنی کێشەکان.

ئەم هەستە توندانە بوون رێگەیان بە سیاسەتمەدارن نەدا لە رێگەی بانگەوازی کۆنگرەکان بگەنە رێککەوتنێکی ئاشتیانەی نێودەوڵەتی، بۆ نموونە: لە ١٨٩٩ قەیسەری روسیا بانگەوازی بۆ بەستنی کۆنگرەی ئاشتەوایی نێودەوڵەتی کرد، لە ڕاستیشدا مەبەستی سوودوەرگرتن بوو لەم دەرفەتە بۆ ئەوەی روسیا بێهێز بکات، لە کاتێکدا هێزەکان لە وڵاتە مەزنەکان دەبەسترانەوە. بەڵام وڵاتانی ئەوروپا لە بەستنی ئەم کۆنگرەیە رازی نەبوون، چونکە دەیانزانی نیازەکانی روسیا لەم کۆنگرەیە چییە. بانگەوازی دووەم لەسەر زمانی تیۆدۆر رۆزفێلتی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو لە ١٩٠٧، بەریتانیا ئەم بانگەوازەشی لەناوبرد، چونکە خۆی هێزی تەواوی هەبوو، کە بتوانێت پاسەوانیی دەریاکان و هێڵی هاتووچۆی ئیمپڕاتۆرەکەی پێ بکات، گوێشی لەو رەخنانەی ئەڵمانیا واشنتۆن نەگرتن، کە بەپیر بانگەوازەکەی نەچوو، چونکە ئەوسا لە ١٩٠٧ بەریتانیا لەوپەڕی هێز دابوو، باکی بەم رەخنە و هەرەشانە نەبوون.

سیاسەتی خۆ پڕچەککردن وڵاتە سێ قۆڵیەکەی کۆک لە ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا و ئەڵمانیا لە هەڵچوون دابوو بە شێوەیەک، کە پێشتر ئەمەی بەخۆوە نەدیبوو، تا گەیشتە ئەو ئاستەی تارمایی جەنگ بەدی دەکرا، وڵاتە دیموکراسییەکان رەزامەندیی پەرلەمانەکانیان وەرگرت بۆ تەرخانکردنی بوودجەی تایبەتی و خۆپڕچەککردن وەکو خۆپاراستنێک لە مەترسیەکانی روودانی جەنگێکی مەزن. رێوڕەسمەکانی قەیسەر لە

ئەڵمانیا و نەمسا و روسیا جەختیان لەوە دەکردەوە، کە دەبێت ئامادەباشی ڕووبەڕووبوونەوەی هەر دۆخێکی ئاوەرتە بکەین. ئەمە سەرباری گوتارە ئاگرینەکانی سیاسەتمەدار و وتاری رۆژنامەکان، کە هەستی نەتەوایەتیان بریندار دەکرد. ئەوەی جێی سەرنج بێت وڵاتە مەزنە رکابەرەکان لە میانەی ساڵی ١٩١٣ بڕیاری زیادکردنی هێزی چەکداریان دەرکرد، سەبارەت بە ئەڵمانیا لە ١٤ی جەنیوەریی ١٩١٣ یاسایەکی بۆ ئەم مەبەستە دەرکرد، ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریایش لە کۆتاییەکانی ١٩١٣ هەمان یاسای دەرکرد. فەرەنساش لە ٧ی ئابی ١٩١٣ بۆ هەمان مەبەست یاسایەکی دەرکرد، روسیاش لە کۆتاییەکانی ١٩١٣ هەمان یاسای دەرکرد، لە بەریتانیا بانگەوازی سەربازیی بەزۆر لە ١٩١١ - ١٩١٢ راگەیەندرا، بەڵام حکومەتی بەریتانیا جەختی لەسەر زیادکردنی ژمارەی هێزی سەربازیی کردەوە.

٣- لە مەترسیدارترین ئەنجامی شەڕەکانی بەلکان پەرەسەندنی سربەکان بوو لە رووی پانتایی خاک و ژمارەی دانیشتووانیان، هەروەها جۆشبوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی سربی لە ناوەوەی سربیا و لە وڵاتە سربینشینەکان، کە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریادا بوون. خوێندکاران لێرە و لەوێ جووڵە و چالاکیی تیرۆریان دەنواندن، لەپێناو یەکگرتنەوەی سربەکان هێرشی توندیان دەکردن. لە ناوەوەی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا چەندێ کۆمەڵەی نهێنیی تیرۆرستی دامەزران بۆ لەناویردنی کەسانی مەبەست لە فەرمانڕەواکانی حکومی لە بۆسنە و شوێنەکانی تر. کوشتنی ئەرشەدیق فرانز فەردیناند شازادەی نەمسا خۆی و هاوسەرەکەی لە سەرایيڤۆ لە ٢٨ حوزەیرانی ١٩١٤، کە یەکێک بوو لەو سیاسەتمەدارانەی لە هەموویان توندتر بوو بۆ مەسەلەی سربیەکان، دەی وت: ئەم کێشەیە بە هێز نەبێت چارەسەر ناکرێت. ئەم ڕووداوە بوو پەرەیسەند، تا لە کۆتاییدا بووە هۆکاری هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی.

ڕووداوی کوشتنی شازادەی نەمسا کارێکی ئەوەندە مەزن بوو لەوەدا نەبوو نەمسا بتوانێت قبووڵی کات، لە تۆڵەی ئەم کردارە سربییەکان دەبووایە سزای خۆیان وەرگرن. دوای ئەوەی ئەم ڕووداوە بە لێبووردنێکی فەرمیی دیبلۆماسی وەکو چارەیەکی سیاسیانە رێککەوتنێکی لەسەر کرا، گەلی نەمسا ئەمەیان بە رسوابوونی ئیمپراتۆریەت و گەلی نەمسا دەزانی.

بیرۆکەی زاڵبوون بەسەر قەیرانەکە و بەرتەسککردنەوەی ناکۆکیەکان لە نێوانی سرب و نەمسا لەبەر دەستدا بوو، وڵاتە ئەوروپییەکان نیازی لەم شێوەیان هەبوو بۆ ئەوەی لایەنی تر نەکەونە ناو کێشەکە و لە ئەنجامدا ئاڵۆزتر بێت. بەڵام بارودۆخی نەمسا بۆ ئەم جۆرە بیرۆکانە لەبار نەبوو، چونکە چارەسەریی ئاشتیانەی مەسەلەکە لای نەمساییەکان بنبڕکردنی کێشەکەنە بوو، بەڵکو لە باربردنی دەسەڵاتی سربەکان بو. بە مەزندەی نەمسا چ زوو چ درەنگ ئەم کێشەیە دووبارە سەر هەڵدەداتەوە، کەوابێت ئایا دەکرێت کێشەکە لە نێوان هەردوو لایەنی سرب و نەمسا گیر بخوات و رێگە بە هیچ لایەنێکی تر نەدرێت دەست بخاتە ناویەوە، بەر لەوەی ببێتە هۆی هەڵگیرسانی جەنگێک سەرتاسەری دونیا بگرێتەوە؟

نەمسا سوربوو لەسەر وەشاندنی گورزێک لە سربەکان- شازادە لەسەردەمی ژیانی ئەمەی لەبەرچاو گرتبوو - سربەکان هەستیان بەمە دەکرد، بۆیە لە ئامادە باشیدا بوون لەگەڵ ئەوەی دانیان بەوە نەدەنا، کە کوشتنی شازادە و هاوسەرەکەی لە کردەی ئەوان بێت. دیارە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی نەمساش بێگوناهی سربەکانی لەم تاوانە دەرخستبوو، بەڵام فەرمانگا نەمساییەکان گوێیان بەم بڕیارەی لێکۆڵینەوەکە نەدەدا و لە هەنگاوە دوژمنکاریەکانی دژی سرب بەردەوام بوون.

لە رەوشەکان نیازی نەمسا بەدی دەکرا، کە بە تەمای ئۆپەراسیۆنێکە دژی سربەکان، بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەم ئۆپەراسیۆنە سیاسەتمەداری توندڕەوی نەمسایی برستلۆن وەزیری دەرەوەی نەمسا، کە حکومەتی ئەڵمانیاش پشتگیریی دەکرد، دەست نیشان کرا، یەکەم هەنگاو گەفێک بوو لە ٢٣ تەمووزی ١٩١٤ بە ناوی شانشینی نەمسا و هەنگاریا بۆ سربی نارد.

بڕیاری دا دەست لە بچووکترین کاروباری سرب وەربدات، لەوانە: هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە نیشتمانییەکان و رێگەنەدان بە بچووکترین پڕوپاگەندە و بڵاوکراوە دژی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا، بە دوورخستنەوەی هەموو فەرمانبەرە ناحەزەکانی ئیمپڕاتۆرییەت و گەلێک لە هەنگاوی تریش، کە هیچ سەروەرییەکی بۆ سربەکان نەدەهێشتەوە. لەگەڵ ئەوەی حکومەتی سربیا رەزامەندیی لەسەر زۆربەی بەندەکانی گەفەکە دابوو، بەڵام حکومەتی ڤیەننا لە ٢٨ تەمووزی ١٩١٤ بڕیاری شەڕی راگەیاند.

بە دیدی سربەکان ئەمە بڕیاری لەناوبردنیانە، بۆیە بەدوای لایەنێکدا دەگەڕان لەم تەنگەشەیان رزگارکات، دیارە بۆ ئەم جۆرە هاوکاریانە تەنیا ئەگەر روسیا بەهانایانەوە بێت، لەناوبردنی سربیا بە دەستی نەمسا لەبەرژەوەندییەکانی روسیا دەدرێن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت نەمسا بەسەر ناوچەی بەلکاندا زاڵبێت، کە ئەمەش مایەی قبووڵ کردن نییە لەلایەن روسیاوە.

بەم شێوەیە شانشینی نەمسا و هەنگاریا لە بەرانبەر جەنگێک وەستان، کە دژی سرب و روسیا بێت، دواتر دژی هاوپەیمانەکانی فەرەنساش دەبێت. دیارە ئەڵمانیا ئەمەی قبووڵ نییە، شانشینی نەمسا و هەنگاریا، کە هاوپەیمانێتی ئەون، بە دەستی روسیا لەناو ببردرێن.

فەرەنسا هەوڵی لەگەڵ روسیادا بۆ ئەوەی تۆزێکی خاو کاتەوە، ئەڵمانیاش لەگەڵ نەمسا و هەنگاریا هەوڵی هێورکردنەوەی دا، بەریتانیا رازی نەبوو بڕیاری لایەنگیری خۆی رابگەیەنێت، کە بە لەشکرەوە لەتەک فەرەنسا دەوەستێن، تەنانەت ئەگەر کێشەکە پەرەشی سەند و هەردوو کوتلەکەشی گرتەوە. روسیا ئامۆژگاریەکانی فەرەنسای رەتکردنەوە، کە داوای لێ کردبوو هەڵوێستەکانی لە سنووری کۆکردنەوەی هێز و ئامادە باشی بنوێنێت. روسیا بەمە نەوەستا بەڵکو هێز و هەڕەشەکانی ئاراستەی ئەڵمانیش کردن، بەم شێوەیە ئەم دیفاکتۆیەی بەسەر فەرەنسادا سەپاند:

- یان لەتەک هاوپەیمانەکەی دەوەستێت.
- یان روسیا بەتەنیا لە مەیدانی جەنگ جێ دەهێڵێت، ئەوساش روسیا توشی شکست دەبێت، کە کاردانەوەکەی بە خراپی بەسەر فەرەنساشدا دەشکێتەوە.

ڕووداوەکان زۆر بەخێرایی دەڕۆیشتن، هەر چوار دەوڵەتە ناکۆکەکان (روسیا، فەرەنسا، میرنشینە دووقۆڵیەکە و ئەڵمانیا) لە ئامادەباشی و خۆکۆکردنەوە دابوون، یەکتریان تاوانبار دەکرد. تا لە یەکەم رۆژی ئابی ١٩١٤ ئەڵمانیا بڕیاری جەنگی لەگەڵ روسیا دا، لە ٣ی ئابیش بڕیاریدا لەگەڵ فەرەنساش بکەوێتە جەنگ، لە وڵاتانی هەردوو کوتلەکە کەسیان نەمان لە دەرەوەی جەنگ جگە لە ئیتاڵیا و بەریتانیا، بەڵام بەریتانیا هەنگاوی خەتەرناکی دژی ئەڵمانیا و لە بەرژەوەندی فەرەنسا دەنا، کەشتیگەلی لە

دەریای باکوور گیرساندەوە و پەیمانی بە فەرەنسا دا، کە ئەم کەشتیگەلە رێگە نادات هیچ هێرشێکی ئەڵمانی لە کەنارەکانی فەرەنساوە بکرێتە سەری.

مێژوونووسانی بەریتانیا دەڵێن: ئەگەر کارەکان لەم ئاستە بووەستابان حکومەتی بەریتانیا- سەرۆکی وەزیران جرای بوو - بەشداریی لە جەنگ نەدەکرد، بەڵام ئەڵمانیا پاساوی بەشداربوونی جەنگی دایە دەست بەریتانیا ئەو کاتەی ئەڵمانیا هێرشی کردە سەر بەلژیکی بێلایەن تا فەرەنسا داگیر بکات، گوایە ئەم هانی رای گشتیی بەریتانیای داوە تادژی ئەڵمانیا بکەوێتە شەڕ.

بۆچوونی بەریتانیا سەبارەت بە بەشداربوونی بەریتانیا لە جەنگ دەڵێت: بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا پەیوەستن بە بەرژەوەندییەکانی روسیا و فەرەنسا لەم کێشەیە، کە لەپێناو داگیرکردنی سربیا دایە، بەڵام کێشەکان لەگەڵ ئەڵمانیا لە ئەوروپا لەگەڵ ئەو وڵاتانەیە، کە داوای مافی ئازادی دەکەن.

پێم وایە بەریتانیا پاساوی ئەوەی نەبوو بکەوێتە جەنگ، دەکرا خۆی دوور بگرێت، ئەوسا بەرچاوی زەلالتر دەبوو و بەرژەوەندییەکانی خۆشی بە ڕوونتر دەبینی و خزمەتی دۆزەکەی خۆی پێ دەکرا، رێککەوتنی (وفاق) گونجان و دۆستایەتیی نێوان بەریتانیا و فەرەنسا مەرج نییە لەم جۆرە کێشانە بە سوپاوە لەتەک فەرەنسا بووەستێت.

ئەو ئەگەرانەی دوای بەزاندنی سنووری بەلژیک لەلایەن ئەڵمانیاوە بوونە هۆی بەشداربوونی بەریتانیا لە جەنگ بریتی بوون لە:

١- ئەگەر فەرەنسا بە تەنیایی لە مەیدان جێ بهێڵدرێت، گومان لەوەدا نییە بەرگریی پێ لە سنوورەکانی خۆی ناکرێت.

٢- بە بەشداربوونی بەریتانیا ئەگەری بەشداربوونی وڵاتانی تر بۆ لایەنگری ئەڵمانیا و فەرەنسا هەبوون، کە ئەنجامەکەی مەترسی لەسەر ئیمپڕاتۆریەتی بەریتانیا دروست دەبوو.

بەڵام مەسەلەی بێلایەنی بەلژیک و مافی ئازادیی و دیموکراسیی و مافی تاک و دیکتاتۆریەت ئەمانە ئایدۆلۆژیایەکانن، ڕاستیی ئامانجەکان دادەپۆشن. دەبینین بەریتانیا لەگەڵ دڕندەترین وڵات لە بواری مافی گەلان و ئازادی هاوپەیمانە، کە روسیایە، لەلایەکی لە هەموو پارچەکانی ئەم دونیایە تریشەوە مافی گەلان پێشیل دەکات.

ئەم جۆرە ئایدیۆلۆژیانە لەم بڕیارە مێژووییانە بەرپرسیار نین - بڕیاری بەشداری لە جەنگ- کە چارەنووسی ئیمپراتۆریەت دەست نیشان دەکات، مێژوونووسی بەریتانی لەم بوارە بەم شێوەیە بۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕێت:

بڕیاری حکومەتەکان لە تەمووزی ١٩١٤ بەرژەوەندییەکانی پەیوەست بە ئاسایش و سەروەری وهێز، بڕیارەکان دەست نیشان دەکەن.

هێشتا جەنگ بەم شێوەیە پەل و پۆی نە هاویشتبوو، کە چەندین وڵات لەلایەنگری ئەم لا و ئەولا تێوەگلان، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە نۆڤەمبەری ١٩١٤ لایەنگریی وڵاتانی ناوەڕاستی کرد، هەروەها بولگاریا لە ١٩١٥ بەشداریی لە جەنگ کرد، وڵاتانی کۆک و دۆستایەتیش ژاپۆن لە ١٩١٤بەشداریی لە جەنگ کرد، ئیتاڵیا لە ١٩١٥ و رۆمانیا و ئەمەریکاش لە ١٩١٧.

لە ئەنجامی بەشداربوونی ئەمەریکا لە جەنگ زۆرێک لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتین بەشداریان تێدا کرد، بەڵام زۆربەیان بەشداریەکەیان کارا نەبوو، ئەوانیش:

١-کوبا.

٢- بەرازیل.

٣- پەنەما.

٤- گواتیماڵا.

٥- نیکاراگوا.

٦- هندۆراس.

ئەم وڵاتانەی ئەمەریکای لاتینیش پەیوەندییەکانیان لەگەڵ وڵاتانی ناوەڕاست پچڕاند:

١- پۆلیڤیا.

٢- پیرۆ.

٣- ئۆرۆگوای.

٤- ئیکوادۆر.

سەبارەت بە وڵاتە ئاسیایی و ئەفریقیەکان هەموو پارچەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی و فەرەنسی بەشداریان کرد، سیام (تایلاند) لە تەمووزی ١٩١٧ دژی وڵاتانی

ناوەڕاست جەنگی راگەیاند، هەروەها لیبیریا و چین لە ئابی ١٩١٧ جەنگیان دژی وڵاتانی ناوەڕاست راگەیاند.

# بەشی یانزەهەم

## هەڵسەنگاندنی هێزە زەبەلاحەکانی ئەوروپای بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی و لە سەروبەندیدا

- بەریتانیا
- فەرەنسا
- روسیا
- ئەڵمانیا
- شانشینی دوقۆڵی
- ئیتاڵیا
- بەلکان
- ژاپۆن
- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا
- دەوڵەتی عوسمانیی

لەگەڵ ئەو گرژیەی لە ئەنجامی هەر قەیرانێک ئەوروپا تووشی دەهات، ئەوروپا لە رووی ئابووری و بەرهەمهێنانی پیشەسازی بووژانەوە و گەشەی بەخۆوە دەبینی و سوودی لە پێشکەوتنە پیشەسازییەکانی وەردەگرت، هەروەها دواکەوتوویی موستەعمەرەکانی کۆن و نوێی بۆ ئەو ببوونە مایەی سوودمەندی. لەگەڵ ئەوەی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و بەلژیک بە درەنگوەختانێک کەوتنە مەیدانی ئیمپریالزمی - بە بەراورد لەگەڵ ئەمەریکا بەریتانیا و هۆڵەندا - لەگەڵ ئەوەش موستەعمەرەکانیان ئەوەندە دواکەوتوو و برسی بەرهەمبوون، توانای هەڵگرتنی هەموو بەرهەمە پیشەسازییەکانیانی هەبوو، نەک هەر هی ئەوان، بەڵکو هی دوو بەرانبەریشیان. ئەمە بووە هۆی ئەوەی گڕ بەربێتە وڵاتانی تر بۆ کێبڕکێکردن لە بواری ئابووری و سەربازی لەم ناوچانەدا، ئەمە باشتر بۆمان دەردەکەوێت ئەو کاتەی توێژینەوەیەک لەسەر بارودۆخی ئابوورییە سەرەکیەکانی ئەوروپا بکەین.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم کاتێک ئاستی بازرگانیی نێودەوڵەتی دووبەرانبەر دەبووەوە، لە هەمان کاتدا ململانێی بازرگانیی نێودەوڵەتی لە رشتبوون دابوو. هەندێک لە مێژوونووسان بە زیادەوە باسیان لە هۆکارەکانی جەنگ لە نێوان وڵاتانی (کۆک) وهاوپەیمانیە سێ قۆڵیەکە دەکرد، هۆکاری هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانییان بۆ هۆکاری ئابووریی دەگێڕایەوە. بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەوەی کاریگەریی ئابووری لە دروستبوونی ئەم ململانێ و کێبڕکێیە دەزانین، بەڵام بە هۆکاری یەکەمی جەنگی نازانین، دەکرێت ئەمە لە بابەتێکی تایبەت بە پەیوەندییەکانی ئابووریی نێودەوڵەتی بخەینە روو.

بە شێوەیەکی گشتی زیادبوونی قەوارەی بازرگانیی نێودەوڵەتی لەلایەن وڵاتانی ئەوروپی لە هەڵچوون دابوو، خێرایی زیادبوونی قەوارەی بازرگانیی نێودەوڵەتی لە بەریتانیا و ئەڵمانیا دیار و بەرچاو بوو. هەروەها قەوارەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە نێوان ئەم دوو وڵاتە ناحەزە لە زیاد بوون دابوو، هاتووی بەریتانیا لە ئەڵمانیاوە لە ساڵی ١٩١٣ بە رێژەی ١٤,٢% بوو، تەرازووی ئاڵوگۆڕی بازرگانیش لە نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا لە بەرژەوەندی ئەڵمانیا دابوو. فەرەنسا داوای مسۆگەری هاوردەی رەژووی ئەڵمانیای دەکرد، ئەڵمانیاش داوای مسۆگەری هاوردەی ئاسنی فەرەنسیی دەکرد، ئەم هاوکارە بووە ئاکامی ئەوەی فەرەنسا لە پرۆژەکانی خەڵووزی ئەڵمانی بەشدار بکات، ئەڵمانیاش هەمان شێوە لە

پرۆژەکانی کانزا فەرەنسییەکان بەشدار بێت. هەندێک لە کانزاکانی جەزائیری، کە لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسادا بوون، لە ڕێگەی کۆمەکەکانی ئەڵمانی و فەرەنسی دەسوڕێندران.

سەبارەت بە روسیا ٤٧%ی هاتووی لە ئەڵمانیاوە بوو و ٢٩%ی نازدراوی روسیا بۆ ئەڵمانیا بوو. زۆرێک لە جوتیارە ئەڵمانییەکان بەدەرفەتیان زانی سوود لە زەوییەکانی روسی وەرگرن بۆ وەگەڕخستنی سەرمایەکانیان و بەرهەمهێنان، ئەمە لە کاتێکدا ئاستی بازرگانێتیی لەگەڵ فەرەنسا لاواز بوو، ئاستی پەیوەندییەکانی ئابووریی نێوان فەرەنسا- روسیا بەرز نەبوون، لە چوارچێوەی قەرزەکانی فەرەنسی بۆ گەیاندنی هێڵی ئاسنین بۆ سیبیریای رەت نەکردبوو، لەگەڵ والاکردنی بازاڕەکانی فەرەنسی بە رووی (سەنەدە) قەرزییەکانی روسی بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی سەرمایە.

بەڵام پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکەی نەمسا و هەنگاریا لاواز بوون، بەڵام پەیوەندییە ئابوورییەکانی ئیتاڵیا لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ئەڵمانیا و نەمسا و هەنگاریا یەکسان بوو، وێڕای پەیوەندییەکانی ئابووریی لەگەڵ فەرەنسا و بەریتانیا. ئەڵمانەکان لە ئیتاڵیا توانیان بەشی زۆرینە لە کارە بانکییەکانی ئیتاڵیا بخەنە ژێر دەستی خۆیان، بەمەش دەرفەتێکی ئابووریی فراوان بۆ ئەڵمانەکان لە ئیتاڵیا رەخسابوو.

بە شێوەیەکی گشتیی قەوارەی بازرگانیی ئەڵمانیا بەر لە دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانیی زۆر لە زیاد بوون دابوو - جگە لە روسیا و فەرەنسا، کە ئاماژەمان پێیان دابوو - لە هەریەک لە بەلژیک و هۆڵەندا و ئیسپانیا و پرتوگال و لە بەلکان (بولگاریا و سرب و رۆمانیا) هەروەها لە دەوڵەتی عوسمانی. دەبێت لێرە دەستنیشانی هۆکارەکانی زاڵبوونی ئەڵمانیا بکەین لە بواری ئابووریی نێودەوڵەتیی.

بە مەزندەی ئێمە هۆکاری یەکەمی ئەم زاڵبوونەی ئەڵمانیا دەگەڕێتەوە بۆ یەکبوونی ئەڵمانیا، کە بە هۆیەوە توانای بەهەمهێنان و زانستییە پیشەسازییەکانی بۆ ئاستێکی چاوەڕواننەکراو بەرز بووەوە، ئەگەر ئەڵمانیا وەکو خۆی بە پارچەیی بمابایەوە، لەو بڕوایەدا نین ئەم هەنگاوە مەزنەی بهاویشتبا.

هۆکاری دووەم چۆنیەتیی مرۆڤی ئەڵمانی، کە لە شەڕەکانی ئەورپی بە سەرکەوتویی دەرچووبوو، دەبووایە لە رووی بازرگانی و شارستانیش سەرکەوێت و زاڵ

بێت. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە دەبێت هەوڵ و تەقەلای بۆ بدرێت، لە کاتێکدا بازرگانی ئینگلیزی دەستی بە پێشینە کۆنەکانەوە گرتبوو، کە مرۆڤی ئەڵمانی لێی رزگار بووە، ئەمان بە شێوازی رۆتین دەهاتنە بەرچاو.

هۆکاری سێیەم شوێن و پێگەی ئەڵمانیا بوو، کە لە رێگەی هێڵی ئاسنین و هۆکارەکانی تری هاتوچۆ بە بازاڕی هەموو ئەوروپاوە بەسترابووەوە. بازاڕەکان ئامادەبوون هەموو بەرهەمەکانی ئەڵمانی و ئینگلیزی و باقی وڵاتانی تر لەخۆ بگرن بە هۆی ئەو گۆڕانە پێشکەوتوانەی لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەسەر وڵاتانی ئەوروپاوە هاتبوون.

لەگەڵ ئەو پەرەسەندنەی ئەڵمانیا لە رووی بازرگانییەوە بەخۆیەوە بینی بوو، کە کارێکی خراپی کردبووە سەر بازرگانەکانی بەریتانی و تا ئەوکات تەنیا بازرگانیی بەریتانیا لە زیاد بوون دابوو، جیاوازیەکە دابەزینی ئاستی بەرهەمهێنان بوو بە بەراورد لەگەڵ سەرەتای سەدەی بیستەم. لەم دەروازەیەوە کێبڕکێیەکانی بازرگانی نێوان ئەڵمانیا-بەریتانیا بە زیانی بازرگانە بەریتانییەکان تەواو دەبوو، بەڵام نەگەیشتە ئەو ئاستەی بازرگانەکان قەلۆش و بێئومێد بن.

ئەوەی کاری کردە سەر کەمکردنەوەی ئەم کێبڕکێیە دەرچوونی پارتی ئازادیخوازانی بەریتانی بوو، کە بەردەوامیی بە سیاسەتی (ئازادیی بازرگانی) دا بۆ پەیڕەوکردنی (پاراستنی گومرگ) بەرووی داخوازیەکانی پارتی پارێزگاران وەستا، بە مەزندەی پارتی ئازادیخوازان پیادەکردنی سیاسەتی (پاراستنی گومرگ) جەنگی ئابووریی لە نێوان بەریتانیا و ئەڵمانیا روودەدات بەبێ هیچ پاساو. پیاوە بازرگانەکانی بەریتانیا خۆشیان لە پیادەکردنی ئەم سیاسەتە رازی بوون، حەزیان لەوە نەبوو چەک بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی ئابووریی لە نێوان بەریتانیا و ئەڵمانیا بەکار بێت.

هۆیە سەرەکییەکە، کە پیاوانی خاوەن کار و بەرپرسە بازرگانیەکانی بەریتانی بە دەمارێکی ساردەوە مامەڵە بکەن، ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا سەرمایەیەکی باشی خستبووە بازاڕەکان و بواری وەبەرهەمهێنان بۆ ئەوەی بەریتانیا رووبەڕووی هیچ راچڵەکانێکی دارایی و ئابووریی نەبێتەوە، ئەمە بە پێچەوانەی سەرمایەکانی ئەڵمانی، کە لە ناوەوە وەبەرهەم دەهات. دوای یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا بواری پان و بەرین رەخسان، کە تیایدا

بەرهەم بێنن، بەتایبەتی وەبەرهێنانە نیشتمانییەکان. لە دەرەوەی ئەڵمانیا سەرمایەی ئەڵمانی لەژێر فشاری نەمسا رێگەی بولگاریایان گرتە بەر، دواتر بۆ دەوڵەتی عوسمانی وەکو رێخۆشکردنێک بۆ پرۆژەکانی ئیمپریالزمی ئەڵمانی.

بەم شێوەیە پەیوەندییەکانی ئابووریی لە ئەوروپا لەسەر بنەماکانی دابەشبوونی ئەوروپا لە نێوان کوتلەکاندا دابەش نەبوون، ئەمە ئەوەمان بۆ دەردەخات کێبڕکێکانی ئابووریی لە ئاستی کێشە نەتەوایەتییەکان و سیاسەتە ستراتیجیەتەکان نەبوون، کە ئەوروپایان بە جەنگی یەکەمی جیهانیی گەیاند.

کەوابێت توانای ئەو وڵاتانە چییە، کە بەشداریان لە جەنگی یەکەمی جیهانیی کرد؟ کێشەکانیان چین؟ وەڵامی ئەم پرسیارانەمان بەشە سزاکانی ئەو وڵاتە دیاری دەکات، کە بە بڕوای ئەوان ئەم جەنگە کورتخایەن و کەمزیان دەبێت، بەڵام وا دەرنەچوو، درێژخایەن و زیانبەخش بوو.

## بەریتانیا

لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەریتانیا بە سەقامگیرترین وڵاتی ئەوروپا دەناسرا، گەلی ئینگلیز لە سەردەمی گۆشەگیریدا لە (١٨٥٦-١٩٠٢ ) بە چاوێکی خۆبەزلزانینەوە سەیری گەلانی ئەوروپایان دەکرد. یەکێک لە هۆکارەکانی خۆبەزلزانینیان ئەوەبوو، کە رۆژێک لە رۆژان بەریتانیا لەلایەن هیچ وڵاتێک داگیر نەکراوە، لە کاتێکدا هیچ وڵاتێکی ئەوروپی نەماوە لە دەست داگیرکاری دەرچووبێت، کە ئازایەتیەکە بۆ دەریای مانش و کەشتیگەلی بەریتانی دەگەڕێتەوە.

ئەم ئارامییە درێژەی بەسەر بەریتانیادا تێپەڕی بووە هۆی کودەتایەکی پیشەسازیی، دوای بنیادنانی ئیمپراتۆریەتە مەزنەکەیان بە سەقامگیری باری سیاسیی وڵات لە ناوەوە و ئەو پێشکەوتنانەی بەخۆیەوە بینی لە رووی دەستووریی و کۆمەڵایەتیی بێ ئەوەی توشی هیچ هەژانێک بێت، ئەو رژێمە پادشایەتیەی لەسەر بنەمای پارتایەتیی وەزاری، کە وەزیر لە بەردەم پەرلەمان لە کەموکورپیەکانی وڵات بەرپرسیار دەبێت، سیستەمێک بوو سیاسەتمەداران پێی شاگەشکە ببوون.

سیستەمی سیاسیی ئینگلیزی لەسەر بوونی دوو پارتی مەزنی هاوڕک دروست ببوو، ئەوانیش پارتی ئازادیخوازان و پارتی پارێزگاران بوون، لە دوای هەڵبژاردن ئەو پارتەی زۆرینەی دەنگەکانی وەدەست دەهێنا، پادشا بۆ پێکهێنانی حکومەت رای دەسپارد، ئەویش لەبەردەم پەرلەمان لە بەڕێوەبردنی بەرپرسیار دەبوو. هەر پارتەو خاوەنی بیروڕای تایبەتیی خۆی بوو، کە بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ خۆشگوزەرانی و پێشکەوتن لە بەریتانیا.

پارتی پارێزگاران لە زۆرینەی دەوڵەمەند و موڵکدارانی کشتوکاڵی پێکهاتبوو، ئەوانیش گرنگیان بە کشتوکاڵ و بەرهەمەکانی دەدا لەدەست بێگانان دەیان پاراست، تەنانەت ئەگەر ببوایە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی خۆراکیش لە بەریتانیا. لە رووی سیاسەتی دەرەوە پارێزگاران لایەنگرانی ئیمپریالست و ئیمپریالیزم و لەناوبردنی بزووتنەوەکانی دژی ئیمپریالیست بوون لە بەریتانیا. سەردەمی سەرۆکوەزیران دزرائیللی لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بە سەردەمی زێرینی پارتی پارێزگاران دەناسرێت، لەسەردەمی ئەودا ئیمپریالیزمی بەریتانیا توانی دەستکەوتی زۆر بۆ بەریتانیا وەدەست بێنێت لە بواری ئیمپریالیزمیدا لە قوبرس و میسر و رۆژهەڵاتی دوور و ئەفریقیا.

بەڵام پارتی ئازدیخوازان پتر مەیلی چاکسازیان لە بوازی ژیانی چینە هەژەرەکان و چینی کرێکار هەبوو، ئەو گۆڕانە مەزنەی لە بواری پیشەسازی لە بەریتانیا رووی دا زۆر کێشەی کرێکاری و تەندروستی و کۆمەڵایەتیی لەگەڵ خۆی هێنا. بۆیە پارتی ئازادیخوازان بانگخوازی دابەزاندنی نرخی خۆراکی دەکرد لە رێگەی کردنەوەی دەرگای هاوردەکردن لە دەرەوەی وڵات، ئەمەش لەگەڵ ئەو بڕوایانە کۆک بوون، کە سەرکردەکانی ئازادیخوازان بڕوایان پێ بوو، ئەویش (ئازادیی ئابووریی) بوو. زۆرینەی ئەندامانی پارتی ئازادیخوازان لە خاوەن کارگە و کەشتی و بازرگان و سەرمایەدار لە ناوەوە و دەرەوەی بەریتانیا بەرهەمداریان دەکرد، زاڵبوونی پیشەسازی لە بەریتانیا بەند بوو بە دەست ئەوانەوە. ئەم بڕوایانە خزمەتی ئامانجەکانی ئازادیخوازانی دەکرد، دیسان ئەمە سیاسەتی پارتەکەیان بوو، جێبەجێکردنی ئەم بیرۆکانە باری کرێکارەکانی سوک دەکرد، دەرگای بازاڕی بەرخۆریی بۆ بەریتانیا لە وڵاتە کشتوکاڵییەکان دەکردەوە بە ناردنی بەرهەمە

پیشەسازییەکان و هێنانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە بەرانبەریدا، بەمە دەستکەوتی دارایی باش بۆ خاوەن کارگەی پیشەسازی و کەشتیەکان وەدەست دەهات.

بەڵام ئەم سیاسەتەی دەرەوە و ناوەوە زیانی زۆر لە گەورە موڵکدارەکان و سەرکردەکانی پارتی پارێزگاران دەدا بە هۆی ئەوەی لە ئەنجامی ئەم سیاسەتە بەروبوومی کشتوکاڵی بازاڕەکانی بەریتانیای دادەپۆشی، نرخی بەروبوومە خۆجێیەکە دادەبەزی، لەگەڵ ئەمەشدا بەکردار ئەمە سەلمێنرا، کە سیاسەتی پارتی ئازادیخوازان لەم رووەوە حکومەت بەرەو ئابوورییەکی ئازاد و چاکسازیی کۆمەڵایەتی دەبات.

ئەوەی ڕاستی بێت ئاڕاستەکانی پارتی ئازادیخوازان بەرەو دانانی یاساکانی چاکسازی و باشکردنی باری ژیانی کرێکاران و خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان و موچە و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانی تر روون و دیار بوون. بەڵام ئەم جۆرە یاسایانە بایەخێکی ئەو تۆیان بۆ کرێکاران نەبوو، چونکە ئەوان دوای بەرزبوونەوەی بەرهەم و خۆشگوزارنی و لە چاوەڕوانی پتر دابوون.

هەر لە شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە بزووتنەوە کرێکاریەکان لە بەریتانیا چالاک و بەهێز بوون:

- لە ١٨٦٧ لە لەندەن یەکێتی نێودەوڵەتیی کرێکاران (نێودەوڵەتیی کرێکاری) کۆنگرەیەکیان بەست.
- هەروەها لە ١٨٨١ یەکێتی کرێکاران (سۆشیالیست)ی رەوتی مارکسی دامەزرا.
- لە ١٨٨٤ کۆمەڵەی زۆرینە (فابیزم) (سۆسیالستی) ڕۆڵێکی باشی بینی لە دۆزینەوەی فەلسەفەی تایبەت بە پارتی کرێکاران.

زۆربوونی ژمارەی کرێکاران و یەکێتیەکانیان ڕۆڵی سەرەکیان بینی لە ئاڕاستەکردنی کرێکاران بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی، ئەمە مەزنترین فاکتەری دامەزراندنی پارتی کرێکاران بوو لە ١٨٩٣. کاتێک رامز ماکدۆنالد لە ١٨٩٤هاتە ناو ریزی ئەم پارتە، هەر زوو تواناکانی لە سەرپەرشتیکردنی چالاکیەکانی فەرمانداریکردنی کرێکار و سۆسیالیستەکان بەدەرکەوتن و بەئاسانی پۆستی سەرۆکایەتیی گرتە دەست. لەگەڵ ئەمە و سەرەڕای هەوڵێکی زۆریش ئەم پارتە رازی نەبوو نازناوی سۆشیالیست هەڵگرێت، پاساوەکانیان ئەوە بوون، کە مانەوەی ناوی پارتەکە

لەسەر کرێکاران پارت زیاتر پابەندی کار و ئامانجەکانی کرێکاران دەبێت، بە دانانی نازناوی سۆسیالیست ئەرک و ئامانجی تریش بەسەر پارتەوە دەبنە ماڵ بە تایبەت لەم کۆمەڵگایەی بەریتانی، کە نموونەی لوتکەی سەرمایەدارییە.

پارتی کرێکاران توانیی ڕۆڵێکی باش لە ئاراستەکردنی سیاسەتەکانی بەریتانیا بگێڕێت، سەرەڕای ئەوەی لە ساڵەکانی بەر لە جەنگ ژمارەیەکی کەمی کورسیی لە پەرلەمان وەدەست هێنابوو، بەڵام پارتی ئازادیخوازان لەگەڵ خۆی لە حوکمدا بەشداری پێ کردبوو. کارێکی ئاسایی بوو ئەم دوو پارتە هاوپەیمانی یەک بن، بە هۆی ئەوەی لە پارتی ئازادیخوازان زانراوە ئامانجەکانی لە دانای یاساکانی کرێکاری بە پێچەوانەی پارتی پارێزگاران بوو، کە دژی یەکێتییە کرێکارییەکان بیری سۆشیالیستی کاری دەکرد، ئەم بوونی سۆشیالیست و یەکێتیی کرێکارەکانی وەکو تێکدەری ڕژێمی پادشایەتی و دەستووری هەڵبژاردنی دەزانی.

پارتی ئازادیخوازان لە ماوەی ١٠ ساڵی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی تا ١٩١٦ حکومڕانیی لە وڵات قۆرخ کردبوو، بەر لە دەستپێکردنی جەنگ بە چەند ساڵێک پارتی ئازادیخوازان چەند پڕۆژەیاسایەکی چاکسازی و کۆمەڵایەتیی خستنە بەردەم پەرلەمان، کاتێک ئەنجومەنی (لۆردەکان) - زۆرینەیان لە پارتی پارێزگاران بوون - دژی وەستانەوە، ئەوانیش هەندێک گۆڕانکاریان لە دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی لۆردەکان کردن، کە تەنیا ئەنجومەنی گشتی (پەرلەمان) مافی دەرکردنی یاسی هەبێت -تەنانەت ئەگەر ئەنجومەنی لۆردات دژیشی وەستان -. بەهای ئەم چاکسازییە کۆمەڵایەتی و پەرلەمانیانە ئەوەبوو، کە خەتەرناکترین کێشەی لە بەریتانیا چارەسەر کرد و ریزەکانی گەلی بەریتانیاشی یەکخست و هەمووی لە دەوری حکومەت کۆکردنەوە.

هەرچەندی ناکۆکی لە نێوان هەر سێ پارتی پارێزگاران و ئازادیخواز و کرێکاران هەبووبێت، کەچی بۆ رێگەگرتن لە بەردەم ئەوانەی دەست دەخەنە ناو بوارەکانی ئیمپریالیزمی بەریتانی هاوڕا و کۆک بوون.

هێزی بەریتانیا سەرچاوەی لە مەزنیی کانزاکانی خەلوز و ئاسن گرتبوو، هەروەها لەو کودەتایە پیشەسازییەی سوودی پێ بەخشی بوو و ئەو چاکسازیانەی لە بواری بەرهەمهێنان و گواستنەوەی بەخۆوە بینی بوو، بەریتانیا بووە مەزنترین بەرهەمهێنەرو

نێرەری بەرهەمەکانی خەڵووز و پۆلا و چنین و پیشەسازییەکانی قورس و سوک، هەروەها هێزەکانی سەرچاوەیان لە فراوانی ئیمپراتۆریەتەوە وەرگرتبوو، کە ڕۆژی لێ ئاوا نەدەبوو:

لە ئەفریاک: دۆڵی نیل هەمووی، کینیا، زنجبار، ڕۆدیسیا، یەکێتی باشووری ئەفریقیا، نێجر، کەناری زێر(ساحل الذهب) ، کەناری عاج (ساحل العاج) ، سیرالیۆن، گامبیا و سۆماڵی ئینگلیزی.

لە ئاسیا ئەم موستەعمەر و پارێزراوانەی (محميات) دەگرتنەوە:

عەدەن، مەحمیات، مەسقەت، عەمان، ساحلی موتەسالح، قەتەر، بەحرێن، کوێت، نیمچە کیشوەری هیند، بۆرما، مەلایۆ، سەنگافورا، ئوسترالیا، نیوزلەندا، هۆنگ کۆنگ، گەلێک دوورگەی نێوان ئوسترالیا، ژاپۆن و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. لە ئەمەریکای باکوور، کەنەدای هەبوو و لە ئەمەریکای ناوەڕاستیش جیانای بەریتانی و باشووری دوورگەی فۆکلاند.

ئەم موستەعمەرانە بەمانە تایبەتمەند بوون:

١-هەڵکەوتنی لەسەر هێلی بەرینیی هەمەجۆری بەربڵاو لە نیوەی باکووری گۆی زەوی و نیوەی باشووری، ئەم هەڵکەوتنە دەبێتە یارمەتیدەر بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی هەمەچەشن بن، کە ئاستەمە گورزی لێ بووەشێندرێت.

٢- لەم موستەعمەرانەیدا بە ملیۆنان ئینگلیزی لێ نیشتەجێکردبوون، کە بۆ ئینگیز ببوونە سەرمایەی سەر و ماڵ، هەر کاتەی بەریتانیا پێویستیی پێ بووایە ڕووی تێدەکردن، ئەمە سەرەڕای سوودوەرگرتن لە توانا و وزەی موستەعمەرەیستەکان و وەگەڕخستنیان لە بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا.

٣- بەڕاستی هەندێک لە موستەعمەرەکانی بەریتانیا هەبوون لە ژوانی ئەوەدابوون، کە دەرفەتێک وەرگرن، تا سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیەنن، وەکو: کاسۆلیکە ئیرلەندییەکان و میسرییەکان، بەڵام زۆرینەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی لە توانایاندا نەبوو هەمان هەنگاوی ئیرلەندا بنێن. حکومەتی بەریتانیا لەم ڕووەوە خاوەنی دوو ئەزمونی تاڵ بوو، یەکێکیان شۆڕشی ئەمریکی و ئەوی تریان جەنگی بوێر بوو. بەریتانیا ئەمەی دەزانی، کە گوێنەدانە داواکاریی ئۆتۆنۆمی کارەساتی بەدواوە دێت، بۆیە مافی ئۆتۆنۆمیی بە کەنەدا و ئۆستڕالیا، نیوزلەندا و

هەروەها باشووری ئەفریقیا دا بە سیستەمێکی دیموکراسیی پەرلەمانی، ئەم بەخشینە پێگەی ئیمپراتۆریەتی مکوم تر کرد، هەستی ئەو حکومەتانە لە هەستی حکومەتی بەریتانیا کەمتر نەبوو بۆ بەرگریکردن لە ئیمپراتۆریەت دژی دوژمنانی، لەسەرووی هەموویان ئەڵمانیا و کارکردن بۆ بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆرییەت.

چەمکی (ئازادیی بازرگانی)، کە کەشتیگەلییەکانی بەریتانیا دەیان پاراست، لە هۆکارەکانی دەوڵەمەندبوونی بەریتانیا بوو بە هۆی دواکەوتوویی وڵاتانی دونیا و والابوونی بازاڕەکانی دونیا لە بەردەم بەریتانیا بەم پاساوەوە بوو. تا ئەو کاتەی ئەوروپا بەسەر دوو فراکسیۆن(کوتلە)دا دابەش نەبوو، نەتوانرا بەریتانیا بهەژێنن یان لە تواناکانی بەرگریی کەم کەنەوە.

هاوپەیمانێتیی دووقۆڵی و هاوپەیمانێتیی سێ قۆڵی، ئەم وڵاتانەش کەوتنە کێبڕکێ بۆ بەهێزکردنی سوپا کەشتیگەل و خۆپڕچەککردن، ئەو هەموو ماوەیە بەریتانیا بە ئارامی لێی پاڵ کەوتبوو، بە هۆی ئەوەی هێزی دەریاوانی و کەشتیگەلی بەریتانیا دوو بەرانبەر هەموویان دەبوو.

بەڵام لە دەیەکانی یەکەمی سەدەی بیستەم بە هۆی نەخشەکانی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا ولهالمی دووەم بۆ بەهێزکردنی کەشتیگەلی ئەڵمانیا بازرگانیی بەریتانیای ناڕەحەت کرد، بەریتانیا ناچاردەبێت بەدوای هاوپەیمانێکدا بگەڕێت، تا لە گۆشەگیری دەرچێت. یەکەم جار پەیوەندیی بە ئەڵمانیاوە کرد، کە بێسوود بوو، دواتر بە ژاپۆن و فەرەنسا و روسیا -لەم پەیوەندیانەیدا هێز و وزەیەکی بە بەریتانیا دەبەخشی- تا جەخت لەسەر کەشتیگەلیەکەی بکاتەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزەکانی ئەڵمانیا.

دوای ئەوەی لە ١٩٠٥ ژاپۆن بەرپرسیارێتی بەرگریکردن لە هیندی گرتە ئەستۆ، بەریتانیا توانیی هێزەکانی لە ئاوی هیند بکێشێتەوە بەرەو دەریای باکووری ببا، دواتر کاتێک پەیمانی (گونجان) دۆستایەتیی لەگەڵ فەرەنسا ئیمزا کرد، قەیرانەکان لەگەڵ ئەڵمانیا یەک بەدوای یەکدا هاتن. لە ١٩٠٦ فەرەنسا توانیی بەرگری لە دەریای سپیی ناوەڕاست بکات، ئەوسا کەشتیگەلی ئەوێشی بۆ دەریای باکوور گواستەوە بۆ رووبەروبوونەوە لەگەڵ ئەڵمانیا. بەم شێوەیە بەریتانیا توانی هێزە پەرشوبڵاوەکانی کۆبکاتەوە لە ناوچەیەکی دیار و ناوچە دوورەکانیش بە هێزە هاوپەیمانەکانی بسپێرێت. ئەمە

سەرەڕای زیادکردنی بەرنامە چەکداریەکەی دوو ئەوەندەی پێشتر لە بەرنامەکانی ئەڵمانیای رەت کرد، ئەمەو بە هۆی بوونی چاوگی پترۆڵی بەردەست لە عەرەبستانی ئێران و شارەزایی هونەری شەڕ و تەکتیکەکانی، تواناکانی بەریتانیا لە هی ئەڵمانیایان رەت کرد. لەگەڵ ئەم هەموو ئامادەکاری و خۆپڕچەککردنەی لە رووی دەریاوانی وشکانی و ئاسمانیی هێزەکانی بەریتانیا، لەگەڵ ئەمەش هەر لە هەوڵەکانی ناوبژیوانی لە نێوان هەردوو لایەنی شەڕکەر دابوو.

هەوڵەکانی لەگەڵ ئەڵمانیا بۆ راگرتنی کێبڕکێکان بوو، کە بۆ زاڵبوون بەسەر هێزەکانی دەریاوانیی بەریتانیا هەوڵی دەدا، هەوڵەکانی بەریتانیا بۆ مەبەستی سەقامگیربوونی دۆخەکان بوو، لەگەڵ ئەمەش بەریتانیا رازی نەبوو رێککەتنەکەی گونجان و دۆستایەتی بگۆڕێت بە هاوپەیمانێتی، ئەمە سەرەڕای هەوڵ و داخوازیی بەردەوامی فەرەنسا.

ولهلم ئیمپراتۆری ئەڵمانیا ئەم داخوازیانەی بەریتانیای رەت کردنەوە، کە دەست لە کێبڕکێکانی چەکداریکردن هەڵگرێت، بەم شێوەیە ئەڵمانیا و بەریتانیا زیاتر لە یەک دوور کەوتنەوە، لەگەڵ ئەوەش بەریتانیا لەسەر ئەوە سووربوو، کە دەستپێشخەرییەکان لە دەست خۆی بمێننەوە و ئەوکاتە بکەوێتە شەڕ لە تەک فەرەنسا، کە خۆی هەڵی دەبژێری نەک پێی هەڵبژێرن.

تارمایی برسێتی و لاوازبوونی بازرگانی لە بەریتانیا دەکرێ بڵێین لەپشت هۆکارەکانی بەشداریکردنی بەریتانیا بوو لە جەنگی یەکەمی جیهانیی، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لە رووی توانای کەشتیگەلی بەسەر هێزەکانی ئەڵمانیادا زاڵە و لە توانایدابوو ئەڵمانیا گەمارۆی بدات، بەڵام ئەڵمانیا ئەمەی لە توانادا نەبوو.

مەترسییەکی مەزن بۆ بەریتانیا لە ئەڵمانیاوە لە ئارادابوو، بە هاوکاریی هاوپەیمانانی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا ئەڵمانیا لە توانایدابوو لە وشکانییەوە دەست بەسەر هەموو ئەوروپادا بگرێت، لەم روانگەیەوە دەبووایە بەریتانیا بە هێزی زەمینی رووبەڕووی ئەڵمانیا ببێتەوە. دەبووایە بەریتانیا بایەخ بە بەهێزکردنی هێزی زەمینی بدات، تا رێگە بە ئەڵمانیا نەدات دەست بەسەر ئەوروپادا بگرێت. بەریتانیا تەنیا بیری لای

فەرەنسا نەبوو، بەڵکو لای هەموو شوێنە دەستکەوتووە ئیمپریالیزمە کۆن و نوێکەی بوو لە شام و عێراق و بەنداوی دەردەنیل و بسفۆر.

## فەرەنسا

فەرەنسا لە بەهێزترین وڵاتانی (گونجان[٢٧] و دۆستایەتی) بوو لە رووی هێزی زەمینی، بەڵام کێشە ناوخۆییەکانی کاری زۆریان کردبووە سەری، پەیوەندییەکانی فەرەنسی - ئەڵمانیش هۆکاری پەرەسەندنی دۆخەکانی ناوخۆ بوون.

خوێندنگا و زانکۆ و کڵێساکان هەموویان هەردەم کۆستی لەدەستدانی (ئەلزاس و لۆرین)یان وەبیر دەهێنانەوە و داوای گێڕانەوەیان لە حکومەت دەکرد، بەڵام بڕیاری شەڕ لەگەڵ ئەڵمانیا لە دەسەڵاتی تەنیا فەرەنسادا نەبوو. هەر دوای کۆستەکە لە ١٨٧١/١٨٧٠ ڕاستەوخۆ زۆر لە سەرکردە فەرەنسییەکان داوای تۆڵەی خێرایان دەکرد، لەوانە (گامبیتا)، بەڵام بە وشیاری و بلیمەتی (تییر) درکیان بە خەتەرناکی ئەم ئەرکە کرد، بۆیە فەرەنسا لە بانگخوازی تۆڵەسەندنەوەوە بوو بە بانگخوازی دۆزینەوەی چارەسەریی دادپەروەرانە بۆ دۆزی ئەلزاس و لۆرین.

ئەگەر تێبینی بکەین دەبینین هەموو مێژوونووسان ئەوانەی باسیان لەم کێشەیە کردووە باسی ئەم دوو هەرێمە بەیەکەوە دەکەن وەکو تەواوکەری یەک، کە لە یەک ناوچەی جوگرافی بن، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت دۆخی جوگرافیای هەر یەکەیان جیایە و ئەوە نییە بەم شێوەیە لە یەک بچن.

بۆ نموونە: ئەلزاس پشتی لە فەرەنسایە و کەوتۆتە پشتی چیای (فوج)، وەکو درێژایی هەرێمی (بادن)ی ئەڵمانی دێتە بەرچاو چ لە رووی جوگرافیای سروشتیی چ لە ڕاستیی ئەوەی ٩٥% دانیشتووانی ئەڵمانین ئەوانیتریش فەرەنسین. ئەلزاس ناوچەیەکی کشتوکاڵیی بە پیت و بەرهەمهێنەرە، بەڵام لۆرین ناوچەیەکی گردۆلکەیی لە نێوان سنووری ئەڵمانیا و فەرەنسایە، هەردووکیان (ئەڵمانیا و فەرەنسا) لە رووی زمان و شارستانی و رەگەزی لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کردووە.

---

[٢٧] ویفاق

ئەوکاتەی ئەڵمانیا لە ١٨٧١ لۆرینی داگیر کرد تازەکی ئاسنی لێ دۆزرابووەوە، بەم شێوەیە ئەڵمانیا بووە خاوەنی هەموو جۆرە کەرەستە خاوەکانی بەرهەمهێنان، خۆی پێشتر خەلوزی هەبوو لە هەرێمی (رور).

ئەڵمانیا بە پشتبەستن بەم ڕاستییە جوگرافیانە مافی دەسگرتنی بەسەر ئەم دوو هەرێمە دەسەلماند، بەڵام فەرەنسییەکان پەنایان بۆ ڕاستیە مێژووییەکان دەبرد. هەر چەندی بیانووەکانی ئەم یان ئەو بەهێز بن ئەڵمانیا لە توانایدا نییە ئەم دوو هەرێمە بۆ فەرەنسا بگەڕێنێتەوە، چونکە ئەگەر ئەمەی کرد زۆر بە لاواز و بێهێز دێتە بەرچاو. دواتر هیچ ڕێگەیەکیش لە بەردەم فەرەنسادا نییە ئەم دوو هەرێمە وەرگرێتەوە جگە لە ڕێگەی هێز نەبێ، چونکە زۆربەی مێژوونووسان رەخنەیان لە ئەڵمانیا دەگرت بە هۆی ئەوەی بە زۆر ئەم دوو هەرێمەی داگیر کردووە، بۆیە کارەکان رووەو نائارامی پەرەیان سەند تا جەنگی یەکەمی جیهانیی روویدا.

بەریتانیا دوورگەی هیگۆلاندی داگیر کردبوو، کە دەکەوتە بەرانبەر بە باکووری کەنارەکانی ئەڵمانیا لە بەرانبەر دەستهەڵگرتنی ئەڵمانیا لە هەرێمی ویتۆ لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا بۆ بەریتانیا، ئەمیش دەستی لە دوورگەی هلیگولاند هەڵگرت بۆ ئەڵمانیا، ئەڵمانیا دەستی بەسەر شلزوینگی دانیمارک داگرت بێ ئەوەی کێشە دروست بێت.

ڕاستیی کێشەی ئەلزاس و لۆرین ئەوە بوو، کە فاکتەری وای تیابوو دەکرێت ببنە یەکەم کێشەی نێودەوڵەتیی بەردەوام بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی، فاکتەرەکانیش بریتین لە:

١- فاکتەری شکۆمەندی نەتەوایەتی لە بەهێزترین هاندەری فەرەنسییەکان بوو بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو سوکایەتیەی پێیان کرا.

٢- ئەگەر ئەو دوو ناوچە لەدەستدراوە لە نیشتمان دوور بوونایە بۆی هەبوو ئاستی سوکایەتیەکەی، کە بە شکۆمەندی نەتەوایەتی کرا، کەمتر خۆی نیشان دەدا، بەڵام ئەلزاس و لۆرین بە فەرەنسا و ئەڵمانیاوە نوسابوون، هەردەم لە پەیوەندییەکان کێشە دروست دەبوو.

٣- زیانەکانی فەرەنسا لە ئەلزاس و لۆرین گەلێک زۆر بوون، لە لۆرین کانزای ئاسن هەبوو.

ئەو زامەی لە ئەنجامی لەدەستدانی ئەو دوو هەرێمە لە جەستەی فەرەنسا دروست بوو گەلێک قووڵ بوو، تیمارکردنی تەنیا بە وەرگرتنەوەی هەردوو هەرێمەکە دەکرا.

بێدەسەڵاتی حکومەتی فەرەنسا لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لە توانایدا نەبوو کاتی گەیشتن بەو ئامانجە نەتەوایەتیە دیاری بکات، بۆیە مقۆمقۆ و ژاوەژاو لە ناوخەڵک و پشێویش لە هزری سیاسیی فەرەنسا دروست بوو، هەندێک جار بیریان بۆ تۆڵە دەچوو، هەندێک جاریش میانڕەوانە بیریان دەکردەوە. لەتەک بوونی لایەنی توندڕەو بە وەرگرتنەوەی تۆڵە بەهەر ڕێگەیەک بێ، لایەنێکی تریش هەبوون بیریان لە کاری ئاشتەوایی و ڕێگەچارەی یاسایی دەکردەوە بۆ ئەلزاس و لۆرین، بۆ ئەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەڵمانیا نەپچڕێن و بەرژەوەندییەکانی ئەوانیش بەردەوام بن.

کۆماریخوازەکان لەسەر حوکم زاڵبوون، ئەوان سیاسەتی وڵاتیان دەبرد بەڕێوە لەگەڵ ئەوەی لەلایەن پادشاخوازەکانەوە دژایەتیان دەکرا. ئەوەبوو پادشاخوازەکان توانیان لە ١٨٧٣ حکومەتی کۆماریخوازەکان بڕوخێنن، کە بە سەرۆکایەتی تییر بوو، لە شوێنی ئەو مەکماهۆن دابنێن، کە پادشاخوازەکان و کاسۆلیکەکان پشتگیریان لێ دەکرد. بەڵام نەیانتوانی لە بەردەم گەشەکردنی کۆماریخوازە میانڕەوەکان بووەستن، چونکە لە ساڵی ١٨٧٥ دەستوورێکی کۆماری بۆ وڵات دانرا. بە پێی ئەو دەستوورە دەسەڵات کەوتە دەست وەزیرەکان، ئەوانیش بەرپرسیاربوون لە بەردەم پەرلەمان. ئەوەندەی نەبرد تا بە پاڵپشتی بۆرجوازەکان کۆماریخوازەکان لە ١٨٧٧ دەسەڵاتیان گرتە دەست، لەگەڵ ئەوەش باری ناوخۆی فەرەنسا سەقامگیر نەبوو بە هۆی پابەند بوونی ئەم سەقامگیریە بە پەیوەندییەکانی ئەڵمانیی - فەرەنسی.

ئەگەر خەڵک چاوی بڕیبێتە ئەلزاس و لۆرین، بەڵام سیاسەتمەداران بڕوایان وابوو کە هێشتا کاتەکان لەبار نین بۆ گەڕاندنەوەیان، ئەمەو زەمینە لەبار بوو بۆ بەدیارکەوتنی سەرۆکایەتیەکی دیماگۆجی، کە بتوانێت هەستی جەماوەر دژی کەموکوڕییەکانی حکومەت لە بەجێنەگەیاندنی پەیامەکەی جۆش بدا، لێرەوە قەیرانی پۆلانگەر لە کۆتاییەکانی هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم سەری هەڵدا.

سیاسەتی حکومەتی فەرەنسا بە ئاراستەی سیاسەتمەداری زیرەک (جۆن فری) ئەوەبوو، کە لەناو کێشەی ئەلزاس و لۆرین نەخولێنەوە، بەڵکو بەرەو دەرفەتەکانی

ئیمپریالیزمی هەنگاو بنێن. ئەمە دیارە کە فەرەنسا بەر لە رووخانی لە ٣٠ی ئاداری ١٨٨٥ لەم بوارە سوودی زۆری وەرگرتبوو، بەڵام میللەت هەر پابەندی ئەلزاس و لۆرین بوون. لێرە بۆلانگەر توانیی بگاتە پۆستی وەزیری جەنگ، کە ئەفسەرێکی بلیمەت بوو لەو کاتەدا دەرکەوت، بانگەوازی بەرزکردنەوەی توانا سەربازییەکانی وڵاتی دەکرد لە پێناو رزگارکردنی ئەلزاس و لۆرین، رەخنەشی لە حکومەت دەگرت، کە بەرانبەر بە ئەرکە نیشتمانییەکان کۆڵی داوە.



بۆلانگەر

بۆلانگەر پەنای بۆ شێوازی دیماگۆجی برد، تا لایەنگر بۆخۆی پەیدا بکات، سەرکردە فەرەنسییەکان درکیان بە مەترسیەکانی ئەو بزووتنەوەیە دەکرد، بۆیە تەنگیان پێ هەڵچنی. بۆلانگەر لە توانایدا نەبوو بەرگری لەم هێرشانە بکات، بۆ ئەوەی لێی رزگار بن بڕیاری دەستگیر کردنیان دا بە تۆمەتی خیانەتی مەزن، ناچار رای کرد بۆ دەرەوەی فەرەنسا تا لە ١٨٩١ خۆی کوشت.

وەکو ئەوەی حکومەتی فەرەنسا لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم توشی گەلێک قەیران ببوو، گەلی فەرەنساش لە ناوخۆیاندا دابەشی سەر ئەم قەیرانانە ببوون، یەکێک لەم قەیرانانە بۆلانگەر بوو. هەروەها بە هۆی دریسفوس، کە ئەفسەرێکی جوو بوو، دابەشبوون رویدابوو. ئەمانە هەموویان تۆمەتبار دەکران بە خیانەتی مەزن، ئەمەش دیارە تەنیا بۆ

رووکەشکردنی بڕیارەکانیان بوو، بەڵام نووسەری مەزنی فەرەنسا ئەمیل زۆلا توانی بەرگە بگرێت و بەرگری لە خۆی بکات لە ناوەوەی فەرەنسا و دەرەوەی تا لە کۆتایی بێگوناهی خۆی سەلماند.

گەلی فەرەنسی دوای ئەو کۆستەی بە دەستی ئەڵمانیا بەسەری هات هەستیان بە بۆشاییەکی سیاسی دەکرد، دواتر کەشوهەوای وڵات لەبار بوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی کێشەی تر ببیتەوە، خەڵکەکە لە دڵەڕاوکێدا بوو تا ئەو کاتەی دووبارە ئامانجە سیاسیەکانیان دەگەڕێنەوە دۆخی سروشتیی خۆیان. ئەم ئاواتەی فەرەنسییەکان هاتە دی، کاتێک پۆینکاریە لە ١٩٠٣ پۆستی سەرۆکایەتیی وەرگرت.

پۆینکاریە خەڵکی هەرێمی لۆرین بوو، پیاوێکی بەهێزی لە جۆری پلەیەک بوو، سەردەمی ئەم بە سەردەمی کۆتاییهاتن بە سیاسەتی بەرگری و سەرەتای سەردەمی گەمارۆ و گۆشەگیرکردنی ئەڵمانیا دێتە ناسین، بە مانایەکی تر توانیی دۆخەکان لە بەرژەوەندی فەرەنسا سەرەوژێر کاتەوە.

پۆینکاریە لەوە دڵنیا بوو، کە جەنگ لەگەڵ ئەڵمانیا بەرێوەیە، بۆیە هەوڵی ئەوەیدا جەنگەکە هی فەرەنسا بێت، داواشی لە دەسەڵاتداران کرد نەخشە و بەرنامەکانی سەربازیی فەرەنسا بەرانبەر بە ئەڵمانیا دەستکاریەکی بنەڕەتیی بۆ بکەن. هەمووومان دەزانین فاکتەری دەستپێشخەری و کتوپڕی جەنگ لە ساڵەکانی دوای کۆستی ١٨٧٠ - ١٨٧١بەدەستی ئەڵمانیا بوو، بەڵام لە سەردەمی پۆینکاریە ئەمە گۆڕا، هەوڵی دروستکردنی هێزێکی هێرشبەر لەناو جەرگەی ئەڵمانیای دا لەگەڵ هێزێکی بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی ئەڵمانیا لە فەرەنسا، ئەمە لە رووی ئامادەکاریی کەرتەکانی سوپا.

بەرپرسە فەرەنسییەکان بیریان لە ئامانجەکانی جەنگ دەکردەوە نەک لەسەر بنەمای گەڕاندنەوەی هەردوو هەرێمەکەی ئەلزاس و لۆرین و بەس، بەڵکو لەسەر بنەمای فراوانکردنی دەسەڵاتی فەرەنسا لەناو ئەڵمانیا بە دەستگرتن بەسەر کەناری چەپی رووباری راین. بەرپرسە فەرەنسییەکان تا ئەو ئاستە بڕوایان بە خۆ بوو بتوانن ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا هەڵوەشێننەوە، لەرێگەی هاندان و کارکردن بۆ سەربەخۆیی نەتەوەکان. بەم شێوەیە ئەڵمانیا پاڵپشتێکی مەزن لە ناوەڕاستی ئەوروپا لەدەست

دەدا، بەڵام ئەمەیان ترسێکی لەگەڵ خۆی دەهێنا، کە لە بەرانبەریدا روسیا هانی پۆلۆنیەکان بدات بۆ هەمان ئامانج، بۆیە فەرەنسا ئامادە بوو لە پێناو دۆستایەتیی روسیا گوێ لە داخوازییە نەتەوایەتیەکانی پۆلۆنیا نەگرێت، بێ ئەوەی دەست لە پرۆژەی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا هەڵگرێت.

لە رووی بڕوابوونی حکومەتی فەرەنسی بە توانای خۆی وێڕای رەزامەندی وڵاتانی گونجان (وفاق) و دۆستایەتی: روسیا و بەریتانیا وەکو دوو ئیمپراتۆری ئیمریالیستی دونیا دوای ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا، سنووری دەسەڵاتی ئەم ئیمپراتۆریەتە بریتی بوو لە باکوور و رۆژئاوای ئەفریقیا. لە جەزائیر، تونس، مەراکش. مۆریتانیا، سەنیگال، گینیا (کە دواتر بە چاد ناسرا)، مالی، نیجر، ڤۆلتای باکوور و کۆنگۆی فەرەنسی، هەروەها لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا سۆماڵی فەرەنسی لە دەروازە بوو (باب المندب) و مەدەغەشقەر، لە ئاسیاش دەسەڵاتی لەسەر هیندی چینیی فەرەنسی (ڤێتنام و لاوس و کەمبۆدیا)دا هەبوو لەتەک ئەوانیش چەند دوورگەیەکی پەرشوبڵاو.

بەرگریکردن لەم هەموو سنووره پان و بەرینەی دەسەڵاتی فەرەنسی جێی مشتومڕی کاربەدەستان بوو، بە دیدی سەرکردەکانی فەرەنسا بەرپرسیارێتی گەڕاندنەوەی ئەلزاس و لۆرین لە پێشینەی نەخشە سەربازیەکەی حکومەت دابوو، بە دیدی ئەمان دابەشکردنی سوپای فەرەنسا بەسەر ئەم هەموو ناوچە پەرشوبڵاوەدا ئومێدی گەڕاندنەوەی ئەلزاس و لۆرین تیا دەچێت، بۆ فەرەنسا باشتر ئەوەیە فراوانبوونی ئیمپڕیالزمیەکەی بە شێوەیەکی کاتی بووەستێنێ و جەخت لەسەر لەشکرەکانی ئەڵمانیا بکات.

ئەوەی ئەم کێشەیەی ئاڵۆزتر کردبوو زیادبوونی رێژەی دانیشتووانی فەرەنسا بە رێژەی دانیشتووانی ئەڵمانیا زیاد نەدەبوو، ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی فەرەنسا ناچاربێت کۆچبەرەکان لە باکووری ئەفریقیا و ئیتاڵیا و پۆڵەندا قبووڵ بکات بۆ پڕکردنەوەی کەمی رێژەکە و کرێکاری.

ئەوەی لەم کێشەیەی کەم دەکردەوە جەزائیر بوو، بە رێژەیەکی بەرچاو بەشداریی لە چەکداری و پەیداکردنی هێزی کرێکاری لە فەرەنسا کرد، چونکە باری کەسایەتی و گوزەرانی ژیانی رۆژانە و ئاستی ئابووری و پیشەسازی لەفەرەنسا بە رادەیەک بوو خەڵکی بۆ خۆی رادەکێشا. لە سێ یەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم فەرەنسا ببووە

قیبلەگای ئەوانەی بەدوای کار و خۆشگوزەرانیدا دەگەڕان، دیارە پێشوەچوونی پیشەسازییش لەم بوارە ڕۆڵێکی کاریگەری بووە.

بە هۆی ئەوەی فەرەنسا بەشێکی زۆری لە زێڕی یەدەگی هەبوو، مەترسیی برسێتیی نەبوو وەک مەترسیەکانی ئیتالیا و بەریتانیا لەم بوارە، ئەمەش بۆ سرووشتی چاوگەکانی سامانە نەتەوایەتییەکان دەگەڕێتەوە. فەرەنسا وڵاتێکی بە پیت و بەرەکەتە، وڵاتێکی کشتوکاڵی و پیشەسازییە، سەرەڕای ئەمەش فەرەنسا بە وڵاتێکی بەرهەمهێنەری کەلوپەلە جوانکارییەکان (کەمالیەکان) دەژمێردرێت، کە لای بۆرجوازەکانی ئەمەریکا و ئەوروپا بایەخی پێ دەدرا. دیسان بە هۆی ڕۆڵی گرنگی زمانی فەرەنسی و جوانی سیما و سروشتی فەرەنسا - پاریس ناونرابوو بە شاری ڕووناکیی- فەرەنسا بووە جێی سەرنجی ملیۆنەها گەشتکار و خوێندکار، ساڵانە گەشتکار رویان تێدەکرد، ئەمەش بۆ فەرەنسا داهاتێکی باش بوو، بەم هۆیەوە چینی بۆرجواز سوودمەندی یەکەم بوون و بوونە نموونەی رەوشتپاکی و رەفتاری کۆمەڵایەتیی بەرز و نموونەیان لەسەر دەهات. لە نێوان رەوتی بۆرجوازیی سەرمایەداری گەلی فەرەنسی و رەوتی عەسکەرتاری ئیمپریالیزمیی فەرەنسا، بزووتنەوەیەکی سۆشیالستیی دژی هەردوو رەوتەکە سەری هەڵدا.

سۆشیالیستەکان دژی خەرجکردنی پارە بوون لە بواری خۆپڕچەککردن، رەخنەشیان لەو بوارانە دەگرت، کە بۆ روسیا لە فەرەنسا رەخسابوون، بۆ ئەوەی بەم شێوەیە سوودمەند نەبێت، بە گوتەی ئەوان ئەم وڵاتە کۆنەپەرستە شایەنی ئەو یارمەتیانە نییە.

لە پشت ئەم بزووتنەوە سۆشیالیستییە بەرەیەکی بەهێز هەبوو کە یەکێتی گشتیی کرێکاران بوو، بەڵام بۆرجوازیەتی حوکمدار لە فشارەکانی کریکاران و سۆشیالیستەکان بەهێزتر بوو، نەیانتوانی چۆکی پێدا بدەن، حکومەت لە توانای دابوو بەهێزەوە ڕوویەڕووی هەردوو لایان بێتەوە بۆ کپکردنیان.

ئەمەو سۆشیالیستەکانی فەرەنسا بەو رادەیە شۆڕشگێڕ نەبوون، کە بڕیار و راکانیان لە سەروی ئامانجە فەرەنسییەکانەوە بگرن و ئامانجەکانیان بەرەو سۆشیالستی جیهانی بەرن، ئەوەندەی نەبرد کاتێک جەنگی یەکەمی جیهانیی هەڵگیرسا لایەنگری خۆیان لەگەڵ حکومەت راگەیاند.

## روسیا

روسیا فراوانترین وڵاتی (ویفاق) گونجان بوو[٢٨]، لە رۆژهەڵاتی ئەورووپاوە تا مەنشوریا و کۆریا و چینی دابووە بەر خۆی، بەم شێوەیە دەبووە تاقە وڵاتی ئەورووپیی بەستراو بە رۆژهەڵاتی دوور. بەڵام لە رووێکی ترەوە جیاوازیی هەبوو لەگەڵ وڵاتەکانی تری ویفاق، واتا فەرەنسا و بەریتانیا، بەوەی لەودیو دەریا خاوەنی ئیمپراتۆرییەت نەبوو.

دەسەڵاتەکانی قەیسەر رەها بوون، سەدەی نۆزدەهەم زۆر قەیسەری بەخۆوە بینی، کە هەموویان ستەمکاری توندڕەو بوون، بەڵام نیقۆلای دووەم، کە شۆڕشی ١٩١٧ لە سەردەمی بەرپا بوو و ئەوەی خانەوادەی (رۆمانۆف)ی لەناو برد، لە هەموویان کەمتر ستەمکار بوو و لە هەمووشیان پتر خەڵکی خۆی خۆش دەویست. پیاوێکی بەدڵ بوو و حەزی لە چاکە دەکرد بۆ گەلەکەی، تەنیا ئەوەبوو پێویستییەکانی حوکمی ئەو سەردەمی نەدەزانی، مەرجی پێویستی تیانەبوو بۆ حکومڕانیی وڵاتێکی وەکو روسیای ئەو سەردەمی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، کە پێویستی بە پیاوێکی بەهێزی پشتئەستور بە گەلەوە هەبوو. یەکێکیتر لە کەموکورپییەکانی بە پێی پێویست چاکسازیی لەناو رژێمی حوکم نەدەکرد، کە وڵات بگەیەنێتە ئاستی وڵاتانی سەردەم لە دیموکراسی یان نیمچە دیموکراسیدا.

قەیسەر لە کۆشکەکەی خۆی دەژیا و پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە گەل و رەشوروتەوە نەبوو، لە پێویستییەکانی گەل شارەزا نەبوو، پەیوەست نەبوو بە ئومێدەکانیان، بۆیە لە توانایدا نەبوو هەست بەو بیروکراتیە بکات، کە بەسەر دامودەزگا حکومییەکان و بەسەر ئەستۆی ملەتەوە زاڵە. هەستی بە ئازارەکانی چینی هەژار و کرێکار و جوتیاران نەدەکرد، زانیاریی لەسەر باری گوزەرانیان نەبوو، کە تا چ رادەیەک بە کەسادی و نەهامەتی ژیان بەسەر دەبەن.

خەڵک رقیان لە قەیسەر بوو، ئەم رقلێبوونە پڕ بوو لە بێزاری لە دەست و پەیوەندەکانی کۆشکی قەیسەر لە شکۆمەندەکان لە هەموو سوودمەندەکان، ئەوان چیرۆکی گەندەڵی و تەرەنتێکردن بە پارە و پولی میللەتیان دەزانی، هەروەها ئەو چیرۆکانەی لەسەر خەرجیاتەکانی راسپۆتین لە کۆشکی قەیسەر و ئەمیرە دەستڕۆییەکان

[٢٨] رووبەرەکەی بە قەدەر رووبەری ئەمەریکای باکورە

و نوبەلاکان و تەنانەت ئەفسەرەکانیش، ئەمانە هەموو بوونە هۆی بەرگرینەکردنی گەل لە کۆشک و قەیسەر، لە ئەنجامدا قەیسەر بۆ هەتاهەتایە روخا. ئەوەی زیاتر قەیسەری لاواز کرد ئەوەبوو، کە هیچ کاتێک ئامادە نەبوو چاکسازی بکات، تەنیا لەژێر فشاردا نەبێ.

مەزنترین هۆکاری پەرەنەسەندی دەستوور لە روسیا بوو، بنکەی جەماوەر لە جوتیار و کرێکارەکان پێکهاتبوو، ئەمانیش لەوپەڕی برسێتی و هەژاری و نەخوێندەواری دابوون، ئامادەنەبوون کار بۆ گۆڕانی دەستوور بکەن، کە هیچی ئەوانی تیا نییە. گرنگیان بەم مەسەلەیە نەدەدا، تەنیا ئەوەی لای ئەوان گرنگ بوو باشکردنی باری ژیانیان بوو. ئەگەر بەشداریشیان لە هەمووارکردنی دەستوور بکردبا، تەنیا لە بڕگەیەکی کەمبەها بەشداردەبوون. نەرێنیەکان زیادیان کرد، ئەو هەرێمانەی نوبەلاکانی لێ حوکمڕان بوون بە رادەیەک خەڵکی هەژاریان دەچەوساندەوە دەتوانین بڵێین جوتیار و هەژارەکە وەکو کۆیلە دەژیان. تەنانەت کڵێساکانیش، کە دەبووایە لەتەک داخوازیەکانی چینی هەژار و جوتیار بووەستێت، داوایان لێدەکردن پشیان هەبێت و ئەم ستەمکارییە وەکو دیفاکتۆ قبووڵ کەن.

ئەگەر گوزەرانی کرێکارەکان لە جوتیارەکان کەمێک باشتر بێت، ئەوا جیاوازیەکە زۆر کەم بوو. کێشە کۆمەڵایەتی و تەندروستی و خۆراکیی کرێکاران لە شار زۆر مەزن بوون، کەس لە فەرمانگە و کۆشکی قەیسەر گوێیان لە داخوازییەکان نەدەگرتن. حکومەت گرنگیی بە هەڵسانەوەی پیشەسازی دەدا بێ ئەوەی چاوێک بە سیستەمی حوکمدا بگێڕێتەوە، کە لەگەڵ ئەم گۆڕانانەی بەرهەمهێنان نەدەگونجان.

گەورە بازرگانەکان بە شێوەیەکی گشتی یان جوو بوون یان بێگانە، کۆمپانیا مەزنەکان -دامەزراوی ئێستا- بەدەستی ئەوان بوون، کاتێک حکومەت هەوڵی بەرەوپێشبردنی پیشەسازی دەدا، خۆی لەبەردەم پێویستیەکانی سەرمایە و ئەقڵی بەتوانا دەبینی، کە کارگە مەزنەکان ببەن بەڕێوە، ئەمە ناچاری دەکرد دەرگای وڵات لەبەردەم سەرمایەدارانی بێگانە بخاتە سەر پشت.[29] ئیمپراتۆرییەتی روسیا لە ناوەوە کێشەی نەتەوایەتیی هەبوو، کە تووشی گیروگرفتی ناوەوە و دەرەوەیان دەکرد، لەوانە: فنلەندییە کاسۆلیکەکان لە باکوور و پۆلەندییە کاسۆلیکەکان لە رۆژئاوا رقیان لە حوکمی روسیی

[29] لەم بوارەدا فەرەنسا سەرمایە و پسپۆری پێشکەش کردن، کە بە هۆیەوە روسیا توانیی گەلێک لە پرۆژەکانی جێبەجێ بکات

ئەرسەدۆکس دەبـووەوە، ئومێـدێکیان بـە شکسـتەکانی روسـیا هـەبوو تـا بـە ئامانجـە نەتەوایەتییەکانیان بگەن. کەمەنەتەوایەتیەکانی تر وەکو: قەوقاز و تورک و مەگۆل بە ژمارە زۆر بوون، بەڵام دواکەوتوبوون و ئەوە نەبوون ئاوەکە بشلەقێنن.

کەمەنەتەوایەتیەکانی فینلەندی، پۆلۆنی، قەوقازی، تورکی و مەنگۆلی هەریەکە هەرێمی تایبەتیی خۆی هەبوو و لێی کۆببوونەوە، بەڵام کەمەنەتەوایەتیی جوو لە شارەکان پەرشوبڵاو بوون، هەموویان سەرمایەدار و دەوڵەمەند بوون، کاریان کردبووە سەر سیاسەتە ئابوورییەکانی دەرەوەی روسیا.

کەلێنێکی مەزن کەوتە نێوان گەلی جوو و حکومەتی روسیا بە هۆی پابەندبوونیان بـە بزووتنـەوە نەتەوایـەتیەکـەیان، لـە ئۆدیسـیا کۆمەڵەیـەک دامـەزرا بـۆ کـۆچپێکردنی جووەکان بۆ فەلەستین بە ناوی (دۆستانی جوو).

لە ماوەی ساڵەکانی دوایی سەدەی نۆزدەهەم مەودای خوێندن و فێربوون بەرفراوان بوو، کۆمەڵێک خوێندنگا و زانکۆ کرانەوە، بەڵام ئەگەر ئەمە بە روبەری بەرفراوانبوونی ئیمپراتۆریەتی روسیا بەراورد پێ بکەین، کە بە شێوەیەکی بەرچاو هەموو شوێنەکانی گرتبووەوە، دەبینین ئەم خوێندنگا نوێیانە رێژەیەکی زۆر کەم پێکدەهێنن.

ئـەوەی جێی سەرنج بێت ئـەم هەڵسانەوە و پەرەسەندنەی پیشەسازیی و فێربـوون بـە شـێوەیەکی دیـار تـەنیا هەنـدێک لـە شـارە مەزنـەکانی گرتبـووەوە، لـە وانـە: (سـان بتروسبۆرگ)ی پایتەخت. لەم شارە و هەندێک شاری تری روسیا بە رێژەیەک مامۆستا و زانا و بیرمەندی مەزن وەدەرکەوتن، رۆژنامەگەری و چاپەمەنی هەموو ئەو شارانەی گرتبووەوە، ئەمە وێڕای ئەو فشارانەی سەر رووناکبیر و رۆژنامەکان.

چەند دەیەک بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی بووژانەوەیەک لە بواری نووسین و بیرکردنەوەدا روسیای داگرتبوو، ئەمانە بوونە هۆی دروستبوونی رەوتی بیری گشتی بێ ئەوەی لە پەنایەوە بیری نەتەوایەتی دروست بێت، کە هەموو وڵاتی روسیا بگرێتەوە لە مەنشوریاوە تا روسیای سپی و پۆڵەندا و فنلەندا و قەرم و تورکستان. ئەوەی بووە هۆی دروستنەبوونی بیری نەتەوایەتی، دەستگرتنی نوبەلاکان بوو بەسەر دەسەڵاتی هەرێمەکان و پیادە کردنی شێوازی ستەم و زۆرداری لەگەڵ جوتیارانی هەرێمەکان، کە وێنەیەکی روونیان دەربارەی نیشتمان لا دروست نەبێت.

بەڵام دەرکەوتنی چەند ناودارێکی بەتوانا، کە بوونە جێی چاوی خەڵک، ئەوانیش لە بواری میوزیک و ئەدەبدا بوون، لەوانە: (تۆلستۆی)، کە بە لوتکەی ئەدەبی نیشتمانیی دەناسرێت، هەروەها راسپۆتینی هاوسەردەمی، کە گیانی رەخنە و بەراوردیان بووژاندەوە.

رەوتە هزروانییەکان زەمینەیەکی لەباریان لە روسیا دە بینی، بەتایبەتی بیری پێشکەوتنخوازی سۆشیالستی بە هەموو شێوە میانرەو و توندرەوەکانییەوە، ئەوەبوو گەل ئامادەبوو لە ١٩٠٥ شۆڕش دژی حکومەتەکەی بکات، بەڵام ئەو کات حکومەت بە شەڕەکانی ژاپۆنەوە خەریک بوو.

کارێکی ئاسایی بوو قەیسەر بە ئاگر و ئاسن ئەم شۆڕشە کپ کاتەوە، چونکە هیچ بەرنامەیەکی رازیکردنی نەیاران لە ئارادا نەبوو، دیسان دەسەڵاتداران ئامادەی ئەوە نەبوون گوێ لە داخوازییەکانی کرێکار و هەژاران بگرن، بۆیە بە ئاگر و ئاسن حکومەت وەڵامی شۆڕشی دایەوە، ئەوە بوو لە ٢٢ی جەنیوەریی ١٩٠٥ رووداوی خوێناوی رویان دا.

هەر کە هەواڵی ژێرکەوتنەکانی روسیا بەرانبەر بە ژاپۆن بڵاوبوونەوە، قەیسەر ناچاربوو سەر بۆ داخوازییەکانی گەلی روسی دابنەوێنێت، لە ٣٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٠٥ لە بەیاننامەیەکدا جۆرێک لە دەسەڵاتی بە پەرلەمانی وڵات بەخشی، بە پشتبەستن بەم بنەمایە ئەنجومەنی (دوما) دامەزرا.

لەم ئەنجومەنە هەندێک کەسایەتیی خاوەن بیری ئازاد و پێشکەوتووی تیاکەوت، بەڵام بە هۆی پابەندبوونی سوپا بە بیرۆکراسیەتی قەیسەرەوە نەیانتوانی هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆ لەسەر سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی روسیا ئەنجام بدەن، چونکە قەیسەر باکی نەبوو هەر کاتەی مەترسیی لێ بنیشتایە ئەوا پەرلەمانی هەڵدەوەشاندەوە.

لە ساڵەکانی بەرایی چەند پارتێک سەریان هەڵدا بە شێوازی جیا جیاوە: (ئۆکتۆبەریەکان) سەربە بەیاننامەی ئۆکتۆبەر بوون، کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێی دابوو، بانگەوازی دامەزراندنی حکومەتێکی بەهێزیان دەدا لە چەشنی حکومەتی بروسیا. دیموکراسییە دەستووریەکانیش (کادێت) بانگخوازی دیموکراسییەکیان دەکرد لەسەر شێوەی بەریتانیا، ئەم دوو حزبە (ئۆکتۆبەرییەکان ) و (دیموکراسییە دەستوورخوازەکان) لە میانرەوترین و لایەنگیرترین پارتی دەستووریی بوون.

بەڵام دوو پارتەکەی تر:

١- پارتی دیموکراتی سۆشیالیست.

٢- پارتی شۆڕشگێڕی سۆشیالیست.

داوای رزگارکردنی گەلی روسیایان لە ئۆتۆکراسی و سەرمایەداری و دەرەبەگایەتی و ئوروستوکراتیی فەرمانڕەوا دەکرد، لەگەڵ گواستنەوەی مافی موڵکدارێتی بۆ هەموو گەلی روسی، هەرچەندە لە شێوازی کارکردن و ئامانجەکانیان نیمچە جیاوازیەکیان هەبوو.

هەرچەندە بیروڕاکانی ئەم دوو پارتە سۆشیالیستە لەنێو چینی جوتیار و هەژاراندا نامۆ بوون، بەڵام کرێکار و جوتیاری روسیا بەدوای دۆزینەوەی کەسایەتییە ونبووەکەی خۆیاندا دەگەڕان، کاتێک لە بڕواکانی سۆشیالیستیدا خۆیان دەدۆزنەوە وەکو خاوەن کەسایەتی و ماف بە ئاسوودەیی ژیان، ئەگەر ئەم کەسایەتییە لەناو کۆمەڵ بتاوێتەوەش هەر گرنگ نییە. ئەمە بوو ئەو روسیایەی پێی نایە ناو قۆناغەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی لەگەڵ دیموکراتیترین وڵاتی ئەوروپا، کە بەریتانیا و فەرەنسا بوون، بەشداریی کرد. بەڵام کاتێک هەڕەشە لەسەر قەوارەی وڵات دەبێت، ئەوکات بیروڕا و بۆچوونەکان بەها و گرنگیان نامێنێ، بەم شێوەیە دیموکراتیەتی بەریتانیا و فەرەنسا ئامادەبوو لەتەک کۆنەپەرستی و زۆرداری وڵاتێکی وەکو روسیا بووەستن.

تێڕوانین ودیدەکانی قەیسەر و حکومەتەکەی لە بەشداربوونی بۆ ئەم جەنگە دەبێت چی بن ؟ دەبێت تێڕوانینەکانی گەل چی بن؟

ئێمە هەردووکمان لە یەک جیا کردەوە، چونکە کەلێنێکی زۆر لە نێوان چاوبڕین و ئامانجەکانیان هەبوون، گەل لە ئامانجەکانیان چاویان بڕیبووە بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیان و بۆ باشبوونی گوزەرانی ژیانیان هیچ بەرنامەیەکی سیاسیانەیان نەبوو، هەرچەندە گەل دەیخواست فراوانبوونی ئیمپراتۆریەکەیان لەسەر حسابی وڵاتە مسوڵمانەکانی دراوسێیان بێت، وەکو: ئێران و دەوڵەتی عوسمانی، بە هۆی دوور و درێژی کێشەکانیان لەگەڵ یەک لە شەڕەکانی سەلیبی، کە ئامانجی سیاسی وئابووریی وستراتیجیان بەدواوە بوو.

بەڵام قەیسەرو حکومەتەکەی ئامانجی سیاسیی گرنگیان هەبوون:

١- مەبەستی روسیا لەم جەنگە خۆڕزگارکردن بوو لە شەرمی شکست خواردن، کە لە ئەنجامی جەنگی کۆریا تووشی هات، لەگەل بەردەوامبوونی لە هاوپەیمانێتیی لەگەڵ هەریەک لە بەریتانیا و فەرەنسا، هەموو دەرگاکانی فراوانخوازی بە رووی روسیادا داخرابوون، تەنیا بەلکان نەبێت، ئەویش نەمسا بە هاوپەیمانێتی ئەڵمانیا خۆی بەسەردا کێشابوو.

٢- قەیسەری روسیا و حکومەتەکەی لە پەرەسەندنی بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا لەناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نارەحەت بوو، بە تایبەت هێڵی ئاسنینی، کە بەرلین و ئەستانە و بەغدا و بەسرەی بەیەکەوە بەستبووەوە. هاوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە ئەڵمانیاوە پەرەیان سەندبوو، ئەڵمانیا دەستی بەتەواوەتی خزاندبووە ناو دەوڵەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەکەی، هاوکاریی سەربازیی و ئابووریی پتەویان هەبوون و ئەفسەری ئەڵمانی راهێنان و مەشقیان بە سەربازە تورکەکان دەکرد، ئەمەش مایەی مەترسی و نارەحەتی بوو بۆ روسیا. ئامانج لە چالاکییەکانی ئەڵمانیا رێگەگرتن بوو لە بەردەم مەودا زیندووەکانی روسیا و دەستگرتن بەسەر بەنداوی دەردەنیل و بسفۆر، ئەمەش لەلایەن روسیاوە بە هیچ شێوەیەک مایەی قبوولکردن نییە، کە ئامادەیە لە پێناویدا هەموو هەڵوێستێک وەرگرێت.

٣- حکومەتی قەیسەر مەبەستی لەم هاوپەیمانیی لەگەل فەرەنسا و ویفاقی لەگەل بەریتانیا هاندانی بزووتنەوەی (دانیشگای سلاڤی) بوو بۆ چالاککردن و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا بوو بۆ ئەوەی بەردەستی روسیا لە بەلکان خۆش کات، ئەمانە ئومێدەکانی قەیسەرو حکومەتەکەی بوون، بەم ئومێدانەوە بەشداریی لە جەنگی یەکەمی جیهانیی کرد.

## ئەڵمانیا

ئەڵمانیای یەکگرتوو دەوڵەتێکی ساوا و گەنج بوو، شانازیی بە مێژووی کۆن و تازەی خۆیەوە دەکرد، کە زنجیرە سەرکەوتنێکی بەدەست هێنابوو. گەلی ئەڵمانیا بۆ پەیداکردنی پارووی نان و وەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی لەسەر خەباتی تاڵ راهاتبوون، بەهۆیەوە گیانی لەشکرداری لە ناخیان روابوو. رژێمی ئەڵمانیا دەستکەوتی باشی بۆ ئەڵمانییەکان وەدەست هێنابوو، گەلی ئەڵمانیاش بۆ حکومەتەکەی گوێڕایەڵ و بە بڕوا

بوون، گومانیان لە تواناکانی حکومەتدا نەبوو، کە ڕووبەڕووی هەموو ئاستەنگەکان ببێتەوە. ئەم بڕوایە لە سەردەمی بڕوسیا لە سەدەی هەژدەهەمەوە پەیدا ببوو، کە چەندین پادشا و فەرمانداری بەناوبانگ سەرکەوتن و پاڵەوانێتیی بێوێنەیان لە پێناو ئەڵمانیا و ئەڵمانیەکان نواندووە. گومانی تێدا نییە کە فردریکی مەزن و بسمارک بەرپرسن لە راهێنانی گەلی ئەڵمانی لە گوێڕایەڵی و پابەندبوون بە گیانی نیشتمانپەروەری، ئەم دوو سەرکردەیە تارادەیەک بەتوانا و بلیمەت بوون، هەڵوێستەکانیان وەکو ئەفسانە دەگێڕنەوە، لەگەڵ ئەوەی لە ڕێبازی دیموکراتی شارەزایەکی ئەوتۆ نەبوون، بەڵام دەستکەوتی مەزنیان وەدەست هێنابوو.

لە ئەنجامی ئەم گۆڕانە مێژووییە لە سروشتی فەرمانداریێتیی ئەڵمانیا، گەلی ئەڵمانیا بەر لە ساڵەکانی ١٩٧٠[٣٠] پێش ئەوەی کار بۆ دیموکراسی بکەن، کاریان بۆ یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا کردووە. لێرەوە ئەوکاتەی دوای یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا جۆرێک لە حوکمی پەرلەمانی بە گەل درا، ئەم پێدانە هی حکومەت بوو نەک لە ئەنجامی هەوڵەکانی گەل هاتبێتە دەست. ئەوەی ڕاستی بێت سەرەڕای ستەم و زۆرداریی گەل شانازیی بە حوکمی جارانی بڕوسیای دەکرد، چونکە دەستکەوتی باشی بۆ ئەڵمانیا وەدەست هێنابوو.

بۆیە دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆری ئەڵمانیای یەکگرتوو و پان و بەرین بوو، دەسەڵاتی راوێژکاری رایخ بۆ مانەوەی لەسەر دەسەڵات پشتی بە ئیمپڕاتۆر بەستبوو نەک ئەنجومەنی دەوڵەت (ریخستاج یان بندسرات).

ئەنجومەنی ریخستاج لە ڕێگەی گەلەوە دەهاتە هەڵبژاردن، بەڵام زۆربەی ئەندامەکانی لە بۆرجوازی و ئوروستوکراتی بوون.

بندسرات، ئەندامانی نوێنەری ویلایەتەکانی ئەڵمانی بوون. بڕوسیا ٣/٢ی ئەندامەکانی هەبوو، ئەمە لە چاکەی خۆی بوو دانی بە یەکێتیی ئەڵمانیا نا، زۆر لە ویلایەتە بچووکەکان لە گەردوونی بڕوسیادا دەخولانەوە، چینی فەرمانڕەواش بڕوسی بوون، هیچ بڕیارێک دەر نەدەکرا ئەگەر بڕوسیا رازی نەبووایە. دیسان چینی یۆنکزی بڕوسی

[٣٠] ڕاستیەکەی ١٨٧٠یە.

لە سوپا باڵادەست بوون، قەیسەر و حکومەتەکەی بەرانبەر بە هیچ ڕووداوێک نەدەهەژان تەنانەت بە سۆشیالیستە رکابەرەکانیش.

حکومەتی ئەڵمانیا بە رادەیەک بەهێز بوو، کە توانیی هەموو بزتنەوەکان سەرکوت بکات، ئەم بزوتنەوە سۆشیالیستیە لە سەردەمی بسمارك کپ کرا، بەڵام ولهالمی دووەم، کە لە ١٨٨٨هاتە سەرتەختی پادشایەتی، گەنجێکی پڕلە وزە و چالاک بوو و هەوڵی دا هەموو چینەکانی گەل لە دەوری خۆیان کۆ کاتەوە. لێرەوە بسمارک فشاری سەر بەرهەڵستکارانی کەم کردەوە. بەم کەمکردنەوەیە ژمارەی بەرهەڵستکاران زیاد بوو، ئەمەش ڕێخۆشکەربوو تا ولهلم لە بسمارک رزگار بێت، ئەوەبوو لە ١٨٩٠ لەسەر پۆستەکەی لابرد، بەڵام ئەم کارە ئاستی بزتنەوەی سۆشیالستی پێ بەرز نەبووەوە. بەڕاستی پارتی سۆشیالیست دوای رووخانی بسمارک پەرەی سەند، بەڵام نەبووە فاکتەری زاڵ، چونکە لەلایەن بەشێکی زۆری گەلەوە ناپەسند بوو.

١- بە هۆی ئەوەی دژی سیاسەتی پرچەککردن و کێبڕکێ سەربازیەکان بوو، لەلایەن فەرماندەکانی سوپا ناپەسند بوو.

٢- لەلایەن بازرگان و دەوڵەمەندەکانیشەوە ناپەسند بوو، بە هۆی بانگخوازییەکانی بۆ بەرزکردنەوەی ڕێژەی باج.

سەرباری ئەمە ئەو پارتێکی شۆڕشگێر نەبوو، بەڵام کاری بۆ ئەوە دەکرد، کە ئەڵمانیا لە سەرووی هەموو کەسێک بێت، بۆیە لە پشتگیریکردنی جەنگ دژی وڵاتانی (ویفاق) نە دەسڵەمینەوە.

گەلی ئەڵمانیا بە بەراورد لەگەڵ گەلانی ئەوروپا یەکگرتوو بوون تەنیا لە گەلی ئینگلیز نەبێت، دەنا لە هەموو گەلێک یەکگرتوتر بوون. لە ناوەوە هیچ کێشەی کەمەنەتەوایەتیی ئەوتۆیان نەبوو، کەمەنەتەوایەتیی دانیمارک لە شلزویچ و پۆلەندی لە بروسیا و فەرەنسییەکان لە لۆرین و ئەلزاس بوو، ئەوانە هەمووی پەرشوبڵاو بوون و لە یەک نزیک نەبوون، ڕێژەی ٧%ی دانیشتوانیان پێک دەهێنا.

بەرەی ناوخۆی ئەڵمانیا بەم شێوەیە پارێزراو بوو، بەڵام بۆ بەرگریکردن لە سنوورەکانی کێشەی هەبوو، ئەمە سەرەڕای بەهێزی ئەڵمانیا، کە خاوەنی باشترین سوپای زەمینیی ئەوسا بوو.

ئەوەی لە بەردەم ئەڵمانیا کێشەبوو بەرگریکردن لە سنووورە دوور و درێژەکەی بوو، ئەڵمانیا وەکو هێزێکی زەبەلاح هاتە ناسین و دوژمنی زۆربوو، دەبووایە هێزێکی زۆریش بۆ پاراستنی سنووورە ئاوەڵاکانی تەرخان کات. ئەمە بە پێچەوانەی بەریتانیا بوو، ئەم بە هۆی کەشتیگەلییەوە سنووری دەریای دەپاراست و زۆر بە ئاسانی دەیتوانی خاڵی دابەزینی هێزەکانی دوژمن دیاری بکات و ڕێگەی پێنەدا دەرباز بێت، لە توانای کەشتیگەلی بەریتانی دابوو کەنارەکانی دەریای مانش و دەریای باکوور زۆر بەئاسانی بپارێزێت بێ ئەوەی هێزەکانی لەناو ببردرێن.

فەرەنسا دڵنیا بوو کە ئەگەر ئەڵمانیا هێرش بکاتە سەری، لە سنوورەکانی بەلژیکا و سنووورە هاوبەشەکەی لە رۆژهەڵات هەوڵی داگیرکردنی دەدا، لەوەش دڵنیا بوو ئیتاڵیا هێرش ناکاتە سەری، هەروەها ئیسپانیاش، بەڵام ئەڵمانیا ناچارە لە دوو بەرەی لە یەک دوور هێرش بکات (بەرەی روسی و بەرەی فەرەنسی) دەبووایە ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا بەرەی روسی بگرتە ئەستۆ، بەڵام هەڵگیرسانی شۆڕش و دروستبوونی نائارامی لە بەلکان دەبووایە دەست بە هێزێکی زۆرەوە بگرێت بۆ چاودێریکردنی ناوچەی بەلکان. باشترین بەرنامە بۆ هێرشەکان بلیمەتی سەرکەوتنەکانی ئەڵمانیی رابردوو (ڤۆن مۆتلتکە) دایدنابوو، ئەو کاتەی داوای لە فەرماندە ئەڵمانییەکان کرد بۆ ماوەی شەش هەفتە کار لەسەر سوپای فەرەنسی بکەن بۆ ئەوەی بتوانن بەخێرایی بەرەو بەرەی روسیا وەرچەرخێن، ئەڵمانیا پشتی بە شەڕی کتوپڕ دەبەست.

بارودۆخی پێدانی خۆراک و تفاقی سەربازی وای پێویست دەکرد، کە شەڕەکان زۆر بەخێرایی تەواو بن، بۆ ئەوەی درێژەنەکێشن و گەمارۆ نەخرێتە سەریان، چونکە زۆربەی ئەم خۆراکانە لە دەرەوەی ئەڵمانیا دەگەیشتن شوێنی ئەمبارکردنی لە ساڵێک یان دوو ساڵی زیاتر نەبوو.

لە تواناشیدا نەبوو پشت بە بەرووبوومی موستەعمەرەکانی ببەستێت، چونکە بۆی نەدەکرا شکست بە کەشتیگەلی بەریتانیا بێنێت. لە رووی ئابوورییشەوە هاوپەیمانەکەی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا لەو ئاستەدا نەبوو بتوانێت هاوکاریی بکات، چونکە ئەمیش گیرۆدەی کێشەی خۆی ببوو، ئەم کارە ئەگەر درێژەی بکێشابا زۆر لە تواناکانی ئەم مەزنتر بوون.

له ١٩١٤ ئەڵمانیا پرۆژەی کەشتیوانیی تەواو کرد، کە کەندری (بەنداو) (کییل) بوو، ئەم کەندرە توانایەکی سەربازیی مەزنی بە ئەڵمانیا بەخشی و کەشتیگەلییەکانی لە بەلتیك و دەریای باکوور بە یەکەوە گەیاندن.

## ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا

ئەگەر روسیا بۆ وڵاتانی (ویفاق) وەکو ئەسپی دۆڕاو وابوویێت، ئەوا ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا بۆ ئەڵمانیا بوونە هەمان شت. وەکو ئەڵمانیا هەندێک تایبەتمەندیی هەبوون، بەڵام کێشەکانی رۆژ دوای رۆژ روەو خراپی دەچوون. ئەو جەنگەی هەموو دونیا لە چاوەڕوانی دابوون لە نێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا رویدات تا ئەو کاتەی بە حەزی ئەڵمانیا نەبوو رووی نەدا، دوای ئەوەی توانیی یەکێتیی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریای هاوپەیمانی بپارێزێت.

بەر لە سەدەی نۆزدەهەم ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا وێنەیەک بوو لە وێنەی ئەو ئیمپڕاتۆریەتە کۆنانەی لە چەندین نەتەوە و رەگەزی جۆراوجۆر پێکهاتبوون، هیچ شتێک کۆی نەدەکردنەوە تەنیا لایەنگری بۆ ئیمپڕاتۆر نەبێت، ئەویش بە هۆکاری سیاسیی و ئابوورییەوە بوو. لە میانەی سەدەی نۆزدەهەمیش، کە بەسەدەی سەردەمی نەتەوەکان ناسرا، بارودۆخەکان بە تەواوەتی گۆڕان، بەڵام ئیمپڕاتۆر لەسەر هەمان دۆخ و شێوازی خۆی مایەوە، مەبەستی بوو هەر لەژێر دەستی خۆی بمێننەوە، دوای ئەوەی لە ساڵانی پەنجاکان لە دەست هاوپەیمانی باکووری ئەتلەس شکستی زۆری خوارد و لە ١٨٦٦ لە دەست روسیا رژێمی ئیمپڕاتۆرییەت گۆڕابوو بە پادشانشینی دووقۆڵی.

سیستەمی پادشانشینی دووقۆڵی لەسەر بنەمای دوو دەوڵەتی نەمسا و هەنگاریا دامەزرا، هەریەکەیان دەستوور و رژێم و بەڕێوەبردنی خۆجێیەتیی تایبەتی خۆی هەبوو، کاروباری بەرگری و سیاسەتی دەرەوە لە پسپۆڕی و بەڕێوەبردن ئیمپڕاتۆڕ بوو.

سەرباری ئەمە پێکهاتەکە لە نەمسایی و ئەڵمانی و لەهەنگاریش چەندین کەمەنەتەوایەتیی تری چالاک هەبوون:

١- چیکەکان لە بۆهیمیا.

٢- پۆلۆنیەکان لە گامبیا.

٣- سلاڤەکان لە باشووری ئیمپراتۆرییەت.
٤- کرواتیەکان لە باشووری ئیمپراتۆرییەت.
٥- ئیتاڵییەکان لە ترەنتینۆ.

ئەم کەمەنەتەوایەتیانە زۆرینەی دانیشتووانی پادشانشینەکەیان پێک دەهێنا.

کێشەی کەمەنەتەوایەتییەکان لە کێشە هەمیشەییەکانی پادشانشین بوو، ستەم و زۆرداریی هەنگاریا بەرانبەر بە کەمەنەتەوایەتیی سلاڤی مەزنترین مەترسیی پەیدا کردبوو. ئەمە بۆ وڵاتانی (ویفاق) گونجان دەرفەتێکی باش بوو تا دەست لە ناوخۆی وەربدەن بە ئومێدی لەناوبردنی پادشانشینی دووقۆڵی، زۆرجار ناویفاقی لە نێوان هەنگاریا و نەمسا لەسەر سیاسەتی بەڕێوەبردن دروست بوو بۆ ئەوەی وڵات لەم تەنگژەیە دەرباز کات، بەڵام دیارە بێسوود بوو.

ئەگەر لەگەڵ ئەم کێشەیە داهاتی تاکی سلاڤی زیادیان بکردبا، بۆی هەبوو سلاڤییەکان بەرگەی ستەمی حکومڕانی هەنگاریایەکان بگرن، بەڵام ئابووری وڵات لە خراپەوە بۆ خراپتر هەنگاوی دەنا، سەرمایە و کەرەستەی خاو لە کەمبوون دابوون، هاتووچۆ گرفتیان تێکەوتبوو، بە هۆی نالەباری دۆخەکانی کۆمەڵایەتی پێشکەوتنەکانی پیشەسازی لە مەترسی دابوون. هەموو سەرمایەدار و خاوەن کۆمپانیا و موڵکدارەکان یان نەمسایی بوون یان هەنگاریی، کرێکار و هەژارەکانیش سلاڤی بوون. ئەم فاکتەرانە بوونە هۆی ئەوەی لەتەک کێشەکانی نەتەوایەتی، کێشەی دادپەروەریی کۆمەڵایەتیش هەبن. سەرکردە خۆجێیەکانی نەتەوایەتی ئامادەبوون یارمەتی دەرەکی وەرگرن بۆ ئەوەی لەم ستەم و زۆردارییە رزگاریان بێت، ئەو یارمەتی وەرگرتنە، حکومەتی ئیمپراتۆریەتی دووقۆڵی بە خیانەتی نیشتمانیان دەزانی.

حکومەتی پادشانشینی دووقۆڵی هەوڵی زۆری دا بۆ ئەوەی ئیمپراتۆریەتی فرەنەتەوە یەک بخات، بەڵام ئەم بیرۆکەیە بەر لەوەی بیرۆکەیەکی پراکتیکی بێت، بیرۆکراتی بوو. کاتێک ویستی زمانی ئەڵمانی بەسەر هەموو کەسانی ئیمپراتۆریەتدا بسەپێنێت، لەلایەن نەتەوەکانەوە ڕووبەڕووی بەرگری و نارەزایی بوو و هەوڵەکان سەرکەوتوو نەبوون.

بەم شێوەیە کێشە ناوخۆییەکان بەسەر نەتەوەکاندا دابەش بوون، کە بووە هۆی ئەوەی پادشانشینی دووقۆڵی نەبێتە خاوەنی یەک گوفتار و بەرانبەر بە مەترسیەکانی دەرەکی هاوڕا نەبن، ئەگەر جەنگێک رووبدات ئاسان نەبوو چەمکێکی نیشتمانیی هاوبەش بۆ هەموولایەک بدۆزرێتەوە.

زاڵبوونی ئەم فرە کەمەنەتەوایەتیە ببووە مایەی ئەوەی لە توانادا نەبێت چەمکی دیموکراتی لە هەڵبژاردنەکان لەم وڵاتە پیادە بکرێت، لە ترسی ئەوەی نوێنەری کەمەنەتەوایەتییەکان بەسەر پەرلەمانەکاندا زاڵ بن یان زۆرینە وەدەست بێنن، ئەوسا کارەکان ئەوانەی بەسەر ئەستۆی سلاڤیەکانەوە زاڵ بوون بەسەر نەمسایییە ئەڵمانییەکاندا سەرەوژێر دەبنەوە، بەم جۆرە حکومەتی پادشانشینی دووقۆڵی حکومەتێکی ڕێورەسمی دیکتاتۆر بوو، دیموکراسی رووکەشێک بوو خۆی پێ داپۆشیبوو.

سیاسەتی دەرەوەش بە هۆی ئەو دەسەڵاتەی لە ئیمپراتۆرەوە بە وەزیری دەرەوە درابوو، کەس بۆی نەبوو سیاسەتەکە ریفۆرم بکات، پۆستی وەزیری دەرەوە تەنیا بۆ نەمسایییە ئەڵمانییەکان بوو یان هەنگارییەکان، ئەم سیاسەتەی دەرەوەش لە خزمەتی ئەم دوو رەگەزە دابوو.

ئەڵمانیا هیچ کاتێک بیری لەو ئەڵمانیانە نەدەکردەوە، کە کەوتبوونە ناو ئیمپراتۆریەتەکە تا بیانخاتەوە سەر ئەڵمانیا، تەنیا بە هاوپەیمانێتیەکە رازی بوو. لەگەڵ ئەوەی دەیزانی بەم هەنگاوە ئیمپراتۆرییەت هەڵدەوەشێتەوە لەسەردەستی نەتەوەکان، بەڵام بانگەوازی ئەڵمانیا بۆ (دانیشگای سلاڤی) مەترسیدارترین هەڕەشەبوو بۆ ئیمپراتۆرییەت، مەترسیی دووەم بانگەوازیی هەڵبژاردنێکی دیموکراتی بوو.

بیرۆکەی دانیشگای سلاڤی مانای دەرچوونی نزیکەی سێ یەکی دانیشتووانی پادشانشینی دووقۆڵی و چوونیان بۆ ناو سربەکان بوو، دواتر بەدوور نابینرێت وڵاتێکی سلاڤیی سەربەخۆ دابمەزرێت بەڵکو لە پادشانشینی دووقۆڵی بەهێزتریش دەبێ.

ئەم بیرۆکەیە پادشانشینی دووقۆڵی ناچار دەکات هەڵوێستێکی بەرهەڵستکاری وەرگرێ، لە کاتێکدا ناوچەی بەلکان بووە تاکە ناوچە لەبەردەم نەمسا بۆ فراوانبوون، کە بە هۆی ئەو ناوچەیە دەکرێت بکەوێتە سەر دەریای ئەدریاتیەوە.

بۆیە دەبینین کە پرۆژە سەربازییەکانی دژی سربەکان بوون، هەروەها پرۆژە ئابوورییەکانیشی بۆ هەمان مەبەست و بۆ گەیشتن بە دەریای سپیی ناوەڕاست بوون. بەڵام ئەم جۆرە پرۆژانەی هەم روسیا و هەم وڵاتە بەلکانیەکان دژی دەوەستانەوە، بە هۆی دروستبوونی ئەم هەڵوێستە پادشانشینی دووقۆڵی هەوڵی دامەزراندنی کوتلەیەکی سیاسیی دا لەناو وڵاتانی بەلکان بۆ ئەوەی بەرنامەکەی پێ جێبەجێ بکرێت، بە دیدی ئەم ئەو کوتلەیە دەبێت لەو وڵاتانە پێک بهێندرێت، کە لە شەڕەکانی بەلکان لە ١٩١٢-١٩١٣ شکستیان خواردبوو:

ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی و دەوڵەتی بولگاریا بۆ ئەوەی ببنە هێزێکی فشار بەسەر یۆنانییەکان لە لایەک و هێزێکی بەربەرچدەرەوە بۆ هەر دەستێوەردانێکی روسی لە ناوچەکە، بەڵام لەم هەوڵەی سەرکەوتوو نەبوو، تا جەنگی یەکەمی جیهانیی بە هاوکاری ئەڵمانیا ئەوسا بۆی جێ بە جێ کرا.

فراوانبوون لە بەلکان تەنیا روسیای نەدەوروژاند، بەڵکو ئیتاڵیاشی دەوروژاند، کە چاوی بڕیبووە ئیتاڵیا بە هۆی هەڵکەوتنی جیوگرافیی، هەردوو لایەن (ئیتاڵیا و پادشانشینی دووقۆڵی) هاوکاری یەکتریان دەکرد بۆ ئەوەی سربەکان دەست بەسەر ئەلبانیاوە نەگرن، بەڵکو دەبێتە بەشی یەکێکیان. هەردووکیان دژی لایەنی سێیەم بوون لە هەردەست تێوەردانێک لە ئەلبانیا، لە هەمان کاتیشدا هەردوو لایەن لە هەوڵی ئەملا و ئەولادا بوون بەڵکو لە وەدەستهێنانی ئەلبانیا سەرکەوتوو دەبن.

لەتەک مەسەلەی ئەلبانیا کێشەیەکی تریش هەبوو بە ناوی کێشەی ئیتاڵیا (ترەنتینۆ) ، بانگخوازەکانی ئیتاڵیا بۆ یەکخستنی خاکی ئیتاڵیا دەنگیان هەڵدەبڕی، هەر کاتەی ئیتاڵیا پێویستی پێ بووایە ئەمەی وەکو چەکێک بە ڕووی نەمسا بەرز دەکردەوە.

تاقە ئومێدی پادشانشینی دووقۆڵی ئەڵمانیا بوو، کە بتوانێت لەم قەیرانەی دەرباز کات بە هۆی کێشانی هێڵی ئاسنین، کە بەرلینی بە بەغدا و بەسرا و موسڵ و ئەسیتانەوە دەبەستەوە. ئەم پرۆژەیە مانای وایە دەوڵەتی عوسمانی کەوتە ناو بازنەی ئەڵمانی، کە بۆ پادشانشینی دووقۆڵی هەیە سوود لەم بەستنەوەیە وەربگرێت. لێرە دەردەکەوێت کە مەترسیی مەزن لەسەر بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیستی ئینگلیز لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دوور هەن لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی روسیا لە ئێران و پرۆژەکانی

فەرەنسی لە شام، ئەمانە بوونە یارمەتیدەر بۆ بەستنی دوو (ویفاق) گونجان، ئەوانیش گونجانی فەرەنسیی- بەریتانی و بەریتانیی- روسی بوون. بەم شێوەیە مەترسیی مەزن لەسەر پادشانشینی دووقۆڵی دروست بوون و بەرپرسیارێتیی لە بەرگریکردن زۆر زیاتر بوو. ئەوکاتەی ئەڵمانیا هاوپەیمانێتیی لەگەڵ پادشانشینی دووقۆڵی بەست بۆ ئەوەی لە دوو بەرەوە نەکەوێتە جەنگەوە، بەڵام مەترسییەکان نزیک کەوتنەوە، ناچاربوو لە دوو بەرە بجەنگێت، کە بەرەی فەرەنسا و روسیا بوون. هەروەها پادشانشینی دووقۆڵیش ناچارە لە دوو بەرەوە بجەنگێ، ئەوانیش بەرەی روسیا و بەلکانن، ئەمە ئەگەر ئیتاڵیا رووی وەرگێرا ئەوا دەبێتە سێ بەرە.

هەماهەنگیی سیاسیی و سەربازیی لە نێوان هەردوو هاوپەیمان زۆر بەهێز بوون، فەرمانەدە سەربازییەکانی نەمسایی بە شارەزایی و پسپۆڕی فەرماندە ئەڵمانییەکان دەوڵەمەند کرابوون، بەڵام لە رووی ناوەخۆ جیاوازی زۆریان هەبوو، ئەڵمانیای یەکگرتووی دووقۆڵیش لەبەر یەک هەڵوەشاوە وو سوپای ئەڵمانیا یەکگر و بەهێزبوو، بایەخیان بە هیچ شتێک نەدەدا تەنیا کاری جەنگین و بەرەی جەنگ نەبێت. سوپای پادشانشینی دووقۆڵی بایەخی بە پاراستنی ئارامی ناوخۆ و بەرگری لە سنوور و ڕووبەڕووبوونەوەی پشێوییە نەتەوایەتییەکان دەدا، کە ئەگەری روودانیان هەبوو.

لەگەڵ ئەمەش ئەڵمانیا هەنگاوێکی مەزنی لە بواری پیشەسازی و زاڵبوون بەسەر زانستی پیشەسازی نابوو، بەڵام دووقۆڵی لە قۆناغەکانی بەرایی دابوو لە بواری پیشەسازی، کە دەبووە هۆی وەپاشکەوتن لە کاروانی بەرەوپێشچوون. بەڵام ئەم کاروانە لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا بە یەک ئاستدا دەڕۆیشتن، بەڵام روسیا بۆ ئەوان لە شوێن دووقۆڵی بوو بۆ ئەڵمانیا، واتە لەپاش بوو.

ئەوەی کێشەکانی دووبەرانبەر کردبوو، کێشەی نەبوونی سنووری سروشتی بوو بۆ بەرگریکردن، سنوورەکانی نەمسا هەمووی واڵا بوون و بەرگریکردن بەبێ خاڵی سروشتی هەوڵ و بەرگریی زیاتری گەرەک بوو، سنوورەکانی پادشانشینی دووقۆڵی کراوە و درێژ بوون بۆ ئەڵمانیا، ئەمەش کێشەیەکی تر بوو.

## ئیتاڵیا

ئیتاڵیا وڵاتێکی ئەورووپیی گەنج بوو، وڵاتێکی زەبەلاح نەبوو وەکو ئەڵمانیا و فەرەنسا و بەریتانیا، کەلەپوری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی هانی ئەوەی دەدا تێڕوانینی دووری هەبن.

ئیتاڵیا تازە دروست ببوو، گیرۆدەی هەندێک کێشەی ناوخۆ بوو، بەتایبەت دواکەوتویی باشوور (نابلی) لە رووی فێربوون و ئابووریی و سیاسییەوە بە پێچەوانەی ناوەڕاست و باکوور بوو. ئەویش ببووە ئیمپراتۆریەتێکی داگیرکەر، هەر یەک لە لیبیا و سۆماڵی ئیتاڵیی لە خۆ گرتبوو، بەڵام نەخشە داگیرکاریەکانی تری هەندێك جار هەستی ئینگلیز و فەرەنسییەکانی دە وروژاند، پێویستییەکانی ئەم فراوانخوازییە ئیمپریالیزمییە باری ئیتاڵییەکانی گران دەکرد. دوای شەڕەکانی لە لیبیا ئیتاڵیا توشی قەیرانێکی ئابووری ببوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئاستی سەربازیی لە سەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی بوو، یەکێک لە هۆکارەکانی ئەم قەیرانە، ژمارەیەکی زۆر لە گەنجەکان چوونە ریزی سوپا، بەو هۆیەوە رێژەی کرێکار کەم بووەوە. کێشە کۆمەڵایەتیەکانی ناو وڵات قەیرانەکانیان توندتر دە کردن، بەتایبەت لە رووی پەرەسەندنی بیری سۆشیالیستی و داخوازیەکانی هاووڵاتیان بۆ چاکسازیی کۆمەڵایەتی، تا ئەو بابەتانە بەسەر رەوشەکەدا زاڵ بوون پرسیار دەکرا: دەبێت ئیتاڵیا چی بکات ئەگەر جەنگێک لە نێوان وڵاتانی ناوەڕاست و وڵاتانی (ویفاق) روویدا ؟ وەکو دیفاکتۆ ئیتاڵیا لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا و ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا لە ١٨٨٢وە هاوپەیمان بوو، بەڵام ئەم هاوپەیمانێتیەی تەنیا بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکارهێناوە، کاتێک فەرەنسا بڕیاری دا لیبیا داگیر کات، بەدڵنیاییەوە بڕیارەکەی راگەیاند، چونکە لەوە دڵنیابوو کە هێرش ناکاتە سەر فەرەنسا.

ئەم سیاسەتە پارسەنگیەی ئیتاڵیا بەرانبەر بە دەوڵەتانی ناوەڕاست و هاوپەیمانی دووقۆڵی رەنگی دایەوە سەر گەلی ئیتاڵیا و بووە دابەشبوونی بەسەر دوو لایەن، لە ئەنجامدا بووە مایەی یەکلانەبوونەوەی ئیتاڵییەکان، ئەگەر جەنگ لە نێوان هەردوو فراکسیۆن (کوتلە) رویدات لایەنگری کام لا بن ؟ هەندێک سیاسەتمەداری مەزن هەبوون وەکو (جیۆلۆتی) سەرۆکی پارتی ئازادیخوازان

بانگەوازی ئەوەی دەکرد، کە ئیتاڵیا داوای ناوچە ئیتاڵینشینەکانی ناو نەمسا بکات وەکو هەرێمی (ترنتینۆ) و کەناری دالماش لە ڕێگەی سازشی دیپلۆماسییانە، تەنانەت ئەگەر.هەمووشی وەرنەگرتەوە با پارچەیەک بێت. ئەم سیاساسەتمەدارانە مەسەلەی ئابووریان دەخستە بەرچاو بۆ ئەم خواستنەیان، لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئیتاڵیا بکەوێتە ئەو جەنگە ئەوروپییەی هەموو کەس لە چاوەڕوانیەتی، ئەم هەرێمانە کاریگەری ئەوەیان دەبێت نەختێک لە باری ئابووریی ناوخۆی ئیتاڵیا بەرەو باشی بەرن. هەروەها سەرکردە کاسۆلیکەکان - ئەوانەی لەژێر کاریگەری پاپادا بوون - بانگخوازی ئیتاڵیایان دەکرد بۆ بێلایەنی لەم جەنگە چاوەڕوانکراوە، چونکە بە دیدی ئەوان کارێکی قورسە حکومەتی ئیتاڵیای کاسۆلیک جەنگێک بەرپا بکات لەگەڵ مەزنترین دەوڵەتی کاسۆلیکی ئەوروپا، کە نەمسایە.

سۆشیالیستە ئیتاڵییەکانیش هانی ئیتاڵیایان دەدا تا خۆی لەم قەیرانە ئەوروپییە دوور خاتەوە، ئەمە وەکو پیادەکردنی سیاسەتی گشتیی پارتەکەیان بوو، کە بانگخوازی ئاشتیان دەکرد.

بەلام باڵێک لە ئازادیخوازان و باڵێک لە سۆشیالیستەکان داوای تێوەگلانی ئیتاڵیایان بەم قەیرانە دەکرد، هەروەها دیموکراسە کریستییەکانیش داوایان دەکرد ئیتاڵیا لە تەک ولاتانی (ویفاق) گونجان بووەستێت، دوای ئەم هەموو بۆچوونانە کارێکی ئاسایی بوو ئیتاڵیا هەڵوەستەیەک بکات تا دەگاتە بڕیاری کۆتایی.

لە بەردەم حکومەتی ئیتاڵیا - بەسەرۆکایەتی سیاسەتمەدار سالاندرا - ڕێگایەک لەم سێ ڕێگایە هەبوون:

١- بێلایەن بووەستێت لە پای ئەم بێلایەنییە پاداشتی خۆی لەو ولاتە وەرگرێت، کە داوای بێلایەنیی لێ دەکات.

٢- بە هۆی پابەندبوونی بە هاوپەیمانی لەگەڵ ولاتانی ناوەڕاست، لە تەکیان بووەستێت.

٣- ناپاکی لەگەڵ هاوپەیمانانی بکات و بکەوێتە لایەنی (ویفاق) گونجان (نەمسا و ئەڵمانیا).

حکومەتی ئیتاڵیا بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیی لەگەڵ هەردوو لایەن کرد بۆ ئەوەی بزانێت دەتوانن چی بۆ یەکتر بکەن. سەبارەت بە لایەنی ناوەڕاست پادشانشینی دووقۆڵی

زۆر بایەخی بە گۆڕانەکانی سیاسەتی ئیتاڵیا دەدا، چونکە بەشداربوونی ئیتاڵیا لە جەنگ مانای وایە نەمسا دەبێت لانی کەم لە دوو بەرەوە شەڕ بکات. حکومەتی ڤیەنناش درکی بەوە دەکرد، کە ئیتاڵیا مەبەستیەتی نەمسا دەست لە هەرێمی (ترینتینۆ) هەڵگرێت، کە سەرنشینەکانی ئیتاڵین، ئەمە لە پای بەشداری کردنی ئیتاڵیا. بەڵام حکومەتی نەمسا بۆ ئەم داخوازیەی ئیتاڵیا سیاسەتێکی وەرچەپانەی لەگەڵ بەکارهێنا، کە حکومەتی ئیتاڵیا مەترسیی لێ نیشت بە هۆی ئەوەی فرتوفێڵی لەگەڵ دەکات و دەیهێنێت و دەیبا تا ئەوکاتەی شەڕەکان تەواو دەبن. ئەگەر بەسەرکەوتویی لێی دەرچوو، ئەوا ئیتاڵیا ناتوانێت هیچ پارچە لە خاکی (ترنتینۆ) وەدەست بێنێت.

لە ڕاستیدا بیرۆکەی (ترینتینۆ) بۆ پادشانشینی دووقۆڵی خەتەرناک بوو، چونکە دەبووە هۆی ئەوەی هەموو نەتەوەکان داوای چارەسەری کێشەی نەتەوایەتیان بە هەمان شێواز بۆ بکرێت، بەمەش تارمایی هەڵوەشانەوەی پادشانشینی دووقۆڵی لە ئارا دابوو، یا لە کاتی جەنگ یان دواتر.

هەروەها تێڕوانینەکانی ئیتاڵیا لە پادشانشینی دووقۆڵیی بۆ هەرێمەکانی تریستا و ئەستریا و کەنارەکانی دەلماش بوو، ئەم ناوچانە هەمووی ببوونە خاڵی جەختکردنی پادشانشینی دووقۆڵی لە بەلکان، بۆ پادشانشینی دووقۆڵی مەترسیەکی مەزن بوو، هەر وڵاتێکی ئەوروپی جێ پێی لە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ئەدریاتی بکاتەوە، دواتر ئومێدەکانی ئیتاڵیا دووربوون بە ئەنجام بگەن، ئەگەر وڵاتانی ناوەڕاست لەم جەنگە سەرکەون. ئیتاڵیا پەیوەندیی بە وڵاتانی (ویفاق) گونجانیشەوە کرد، لە میانەی دانوستانەکان بۆی دەرکەوت، کە ئومێدەکانی فراوانبوونی لە سەرحسابی پادشانشینی دووقۆڵی زیاتر دەبن ئەگەر بە هاوشان وڵاتانی (ویفاق) بکەوێتە جەنگ. لە سیمای هاوپەیمانان بەدی دەکرا، کە -لە کاتی سەرکەوتنیان - لاریان نییە ئیتاڵیا ئەم هەرێمانە وەدەست بێنێ:

١- هەرێمی ئەدیجی سەرووی دانیشتووان ئەڵمانی.

٢- ئستیریای دانیشتووان سلاڤی.

٣- بەندەری ڤالونا لەسەر کەناری ئەلبانی.

٤- دوورگــەی ساســینۆی یــەکگرتوو لــە دەروازەی کەنــدری (کــەنال ) ئــەوترنت.
٥- چەند بەشێک لە کەنارەکانی دەلماشی، بە مەرجێک دەستکاری بەرژەوەندییەکانی (سربی ) نەکات، کە روسیا بەرگریان لیَ دەکات.
٦- ناوچەی ئەزالْیای تورکی.
٧- هەموو ئەو خاکانەی ئیتالْییەکانی لیَ نیشتەجێن.

ئەم جیاوازییە زۆرانە لە دەستکەوتەکانی ئیتالْیا بوونە هۆی گۆڕینی سیاسەتی بۆ ئەوەی لە تەک وڵاتانی (ویفاق) گونجان بکەوێتە جەنگ، بە کرداریش لە ٢٦ی نیسانی ١٩١٥ لە نێوان ئیتالْیا و وڵاتانی (ویفاق) گونجان کۆتایی بە دانوستانەکان هاتن بە ئیمزاکردنی رێککەوتننامەکە لە نێوان هەردوو لا. ئەوەندەی نەبرد (سالْندرا) هاوپەیمانێتیە ســـێ قۆڵیەکـــــەی لـــــە ئایــــاری ١٩١٥ هــــــەڵوەشــــــاندەوە، بەڵام وەرگرتنی رەزامەندی لە پەرلەمان پێویست بوو. لێرە سالْندرا توشی کێشەیەکی مەزن بوو تا بتوانێت نەخشەکانی سیاسەتەکەی لەم تەنگژەوە دەرباز کات، چونکە زۆربەی ئەندامانی پەرلەمان لە بانگخوازانی بێلایەن بوون، تا ئیتالْیا لەم جەنگە دوور کەوێتەوە و وڵات توشی کاولکاری و باجی جەنگ نەبێت. لە بەرانبەر ئەم قەیرانەدا سالْندرا لە ١٣ی مایۆ دەستی لە کار کێشایەوە، بەڵام بزووتنەوە رووناکبیریەکانی شارە مەزنەکان هانی پادشایان دا تا دەسبەرداری سالْندرا نەبێت و داوا لە پەرلەمان بکات بە بڕیارەکەی خۆیاندا بچنەوە.

ئەم جۆش و سۆزە جەماوەرییە لە رێگەی رۆژنامەکانەوە کلپەی دەکرد، کە بە بڕوای نووسەرەکانی ئیتالْیا وڵاتێکی تازەپێگەیشتووە دەتوانێت لە رێگەی بەشداربوونی جەنگ سەنگ و بوونی خۆی لە ئەوروپا بسەلمێنێت و بەرژەوەندییەکانی بپارێزێت، نەک لە رێگەی گەمەی سیاسی و پێچ و پەناوە، ئەوەبوو پەرلەمان لە ٢٣ی ئایاری ١٩١٥بڕیاری بەشداری کردنی لە جەنگ دا.

## بەلکان ودەوڵەت

بەلکان سەبارەت بە گۆڕانەکانی قەیران لە نێوان وڵاتانی ناوەڕاست وڵاتانی (ویفاق) گونجان لە هەستیارترین ناوچە بوو، بەتایبەت بەهۆیەوە جەنگ هەڵگیرسا، چونکە

سربەکان کەوتبوونە ناوەڕاستی بەلکان. بەلکان گەلێک جار لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوون پادشانشینی دووقۆڵی لە یەک هەڵوەشێتەوە، هەندێک جاریش لە ئەنجامی ئەم هەڵوەشانەوەیە دەترسان. مەزەندەی ئەوە دەکرا، کە رۆژهەڵاتی ئەورووپا لە چەند وڵاتێکی بچووک پێک بێت، کە هەر یەکەیان میکرۆبێکی بۆ دراوسێیەکەی هەڵگرتبێت، بەم هەڵوەشانەوەیە و نەبوونی پادشا گومان لەوەدا نییە، کە روسیا لە ناوچەکە دەبێتە خاوەن دەسەڵاتی بەرز، ئەمەش وڵاتانی بەلکان لێی دەترسان.

لە پێچەوانەکەشی هەر دەترسان، سەرکەوتنی پادشانشینی دووقۆڵی بەسەر سربەکان مانای ئەوەیە ئەمسا بووبە زەبەلاح و دەستەڕۆ لە ناوچەکە. بەلکان لە چەند دەوڵەت و دەوڵەتۆکە پێک هاتبوو، هەر یەکەیان خزابوونە ژێر باڵی کوتلەیەک بە ئومێدی سەرکەوتنی کوتلەکەی بەڵکو بە ئامانجەکانی دەگات. وڵاتانی بەلکان ئەمەیان دەزانی، کە دروستبوونی کێشە لە نێوان سرب و پادشانشینی دووقۆڵی ئەنجامەکەی بە رسوابوونی سرب تەواو دەبێت، ئەمەش هەڕەشە لە ئاسایشی وڵاتەکانی تر دەکات جگە لە بولگاریا، کە بە ئاواتەوە بوو رۆژێک بێت سربەکان هەمان جامی ژەهر بخۆنەوە، کە بولگاریا لە پەیماننامەی بۆخارێست لە ١٩١٣ خواردبییەوە.

بولگاریا لە چاوەڕوانی رسوابوونی سربەکان دابوو بۆ ئەوەی لە پەنایەوە (مەقەدۆنیا)ی دەست کەوێت، کە زۆربەی دانیشتووانی بولگارین، هەروەها بولگاریا ئومێدی ئەوەشی هەبوو هەرێمی (دبروجەی باشوور) لە رۆمانیا بسێنێتەوە. پەرەسەندنەکانی جەنگ لە ساڵی یەکەمەوە مەزنترین کاریگەریان لەسەر سیاسەتی بولگاریا دروستکرد، زۆرێک لە سیاسەتمەدارانی بولگاریا داوایان دەکرد لەگەڵ روسیا ڕووبەڕووی یەک نەبنەوە، ئەوان ساڵەکانی رابردویان بەبیر خەڵک دەهێنایەوە، کە روسیا چەند رۆڵی هەبوو لە دامەزراندن و توانای لەناوبردنیشی هەیە ئەگەر دەرفەتی بۆ برەخسێت. بەڵام لەگەڵ رەچاوکردنی پەیوەندییەکانی نێوان روسیا- بولگاریا سیاسەتمەداران بەرژەوەندی و ئامانجەکانی بولگاریاشیان لەبەر چاو دەگرت، کە لە هەوڵی ویفاقردنەوەی بولگاریەکان دابوون. مەکەدۆنیای سربی مەزنترین پێکهاتەی بولگاری لە دەرەوەی بولگاریا پێکدێنێت، وەدەستهێنانی ئەم ئامانجە رووی بولگاریای بەرەو وڵاتانی ناوەڕاست وەردەگێرا. ئەمسا گفتی بە بولگاریادا - دوای ئەوەی ئیتاڵیا بڕیاری دابوو - کە مەکەدۆنیای سربیا بە

بولگاریا بدا لەگەڵ پشتگیریکردنی لە داواکانی بولگاریا لە ناوچەکانی سنووری تورکیا (ترافیا).

بەڵام وڵاتانی (ویفاق) بە ئاسانی ناتوانن گفتی مەکەدۆنیای سربیا بە بولگاریا بدەن، چونکە ئەمە پێویستی بە توێژینەوە و بڕیاری تایبەت هەبوو، بۆیە بولگاریا لە وڵاتانی (ویفاق) گونجان ئەوەی لێ وەدەست ناکەوێت، کە لە نەمسای لێ وەدەست دەکەوت، گفتی پێدانی (ئەدرنە) لە تورکیا و بەشێک لە تراقیا کەمترە لەوەی پادشانشینی دووقۆڵی گفتی پێدابوو.

کاتێک پایزی ١٩١٥ هات ئەڵمانیا دەستێکی لە روسیا وەشاندبوو و ئەوەندەی نەمابوو روسیا رێککەوتننامەیەکی شەرمەزاریی لەگەڵ ئیمزا بکات -ئەمە وەکو باسدەکرا- بۆیە بولگاریا رشت بوو، پێی باش بوو شان بە شانی وڵاتانی ناوەڕاست بکەوێتە جەنگ، لە ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩١٥ بەشداریی لە تێکشکاندنی سربەکان کرد و بەلگرادی داگیر کرد.

ئەم تێروانین و ئاراستانەی بولگاریا گومانیان لەوەدا نەهێشت، کە بولگاریا جێی مەترسییە، بەتایبەت لەلایەن یۆنانەوە مەترسیی زۆری لە فراوانبوونی بولگاریا دەکرد لەسەر حسابی سربەکان لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- بە هۆی ئەوەی یۆنان لە بولگاریا دەترسا، کە رۆژێک لە رۆژان تۆڵەی لێ بکاتەوە، بۆیە لە هاوپەیمانێتیی لەگەڵ سربەکان بەردەوام بوو.

٢- یۆنان بەشێکی مەکەدۆنیای خستبووە ژێر دەستی خۆی و لەوە دەترسا ئەگەر بولگاریا مەکەدۆنیای سربەکانی وەرگرتەوە دەڕوانێتە بەشە داگیرکراوەکەی تریش.

٣- زاڵبوونی بولگاریا و سەرکەوتنەکانی بەسەر سربەکان و فراوانبوونی لەسەر حسابی ئەوان ڕاستەوخۆ هەڕەشە لەسەر یۆنان دروست دەکات، بەتایبەت هەندێک نزیکبوونەوە لە نێوان بولگاریا و پادشانشینی دووقۆڵی هەبوو. لەتەک پەیوەندییەکانی پادشانشین و دووقۆڵی و دەوڵەتی عوسمانی، دەوڵەتی عوسمانی لە ژواندا بوو بۆ یۆنان، تا ئەوەی لە جەنگی بەلکان لە ١٩١٢/١٩١٣ لەژێر چنگی دەرهێنابوو لێی بسێنێتەوە.

رەوشـەکانی نـاوخۆی یۆنـان ڕێگـەیان پێنـەدەدا سیاسـەتێکی سـەقامگیر بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکارییەکان دابڕێژێت، کە لە ساڵی یەکەمی جەنگی یەکەمی جیهانیی روویان دا.

بەشداربوونی ئیتاڵیا و بولگاریا لـە جـەنگ، شکستەکانی روسیا، هێرشـەکانی فەرەنسا و بەریتانیا بۆ سەر گالیبۆلی بۆ کردنەوەی ڕێگا بۆ روسیا بەزۆر، ئەمانە هەمووی دەبووایە یۆنان هەڵوێستێک لەم جرت و فرتانەی وڵاتانی شەڕکەر وەرگرێت، کە لە دەوروبەری یۆنان دەخولانەوە. بەڵام پادشای قوستەنتین -زاوای قەیسەر ولهلم - لە سەرکەوتنەکانی ئەڵمانیا دڵنیا بوو، دیسان لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکەشی دڵنیا بوو بە رەچاوکردنی بەرپرسیارێتیی وەزارەتی یۆنانی، ئەم بە سیستەمی حوکمی پروسیی نیمچە دیکتاتۆر شەیدا و سەرسام بوو. بە پێچەوانەی ئەمە لە ئاراستەکانی ناوخۆ و دەرەوە سیاسەتمەداری زیرەک (ڤینزیلۆس) دەیروانییە تەواوکردنی یەکێتی نەتەوایەتیی یۆنان و ژیاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لەگەڵ پێدانی مەودایەکی زیاتر لە دیموکراتی و پەرلەمانی بۆ گەلی یۆنانی.

بە ئەنجام گەیاندنی ئەمەش تەنیا بە لادانی پادشا نەبێت ناکرێت، ئەگەر لەسەر بۆچوونەکانی توند بمێنێتەوە.



ڤینزیلۆس

ئەوەبوو لەشکرەکانی فەرەنسی و بەریتانی گەیشتنە گالیبۆلی بێ گوێدانە بێلایەنی یۆنان و سەروەرییەکانی وڵات، ئەوسا یۆنان کەوتە بەردەم دووڕیانێک، ڤینزیلۆس بە رازینەبوونی پادشا بڕیاری دا وڵاتەکەی لە بەردەم هێزەکانی (ویفاق) گونجان واڵا بکات، بەڵام دابەزینی هێزەکانی فەرەنسی و بەریتانی لە سالۆنیک و کردنی بە بنکەی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی وڵاتانی (ویفاق)گونجان لە ناوچەکە ڤەنزیلۆسی پێ بەهێز بوو ئیرادە و بڕیارەکانی بەسەر بڕیارەکانی پادشادا زاڵ بوون. لە سالۆنیکا لە ١٩١٦ حکومەتێکی نیشتمانیی دروست کرد، دبەم شێوەیە یۆنان لایەنی (ویفاق) گونجانی هەڵبژارد، لەوپەڕی باکووری رۆژهەڵاتی بەلکان رۆمانیا هەوڵی دەدا ڕۆڵێکی سەرەکی لە کاروباری بەلکان هەبێت بۆ ئەوەی لەم میانەدا یەکێتیی رۆمانیا مسۆگەر بکات و ئەگەر کرا فراوانتریشی بکات.

ملیۆنەها رۆمانی لەژێر حوکمی روسیا لە بسارابیا و لە ترانسلڤانیاش لەژێر حوکمی پادشانشینی دووقۆڵی دەژیان، وەدەستهێنانی ئەم هەرێمانە بۆ رۆمانیا ئەنجام نادرێت تەنیا ئەگەر لە تەک وڵاتانی (ویفاق) گونجان نەکەوێتە جەنگ، کە دوژمنی پادشانشینی دووقۆڵییە. حەزێکی تەواو لە رۆمانیا هەبوو بۆ ئەوەی بکەونە لایەنی (ویفاق) گونجان، بەڵام بوونی پادشا کارلی یەکەم لەسەر تەختی حوکم رێگەی لەمە گرتبوو - دوای ماوەیەکی کورت- رۆمانیا دژی وڵاتانی ناوەڕاست رووی وەرگێرایەوە، کە ئەوەندەی نەبرد پادشا لە ئۆکتۆبەری ١٩١٤ کۆچی کرد و دوای ئەو فەردیناندی برازای هاتە سەر تەختی حوکم. فەردیناند لە توانایدا نەبوو بەسەر سیاسەتمەداری رۆمانیی و سەرۆکی حکومەت (براتیانۆ)دا زاڵ بێ، لەسەر ئەم پیاوەبوو هەڵوێستەکانی رۆمانیا لەم جەنگە دیار بکات لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە نەتەوایەتییەکانی رۆمانیا و داخوازیەکانی لە ترانسلڤانیا، کە لەژێر دەسەڵاتی پادشانشینی دووقۆڵی دابوو. هەروەها بسارابیا، کە لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی روسیادا بوو، لە میانەی پەیوەندییەکاندا لە نێوان بۆدابست و ڤیەننا دڵنیا بوون، کە روسیا دەست لە ترانسلڤانیا هەڵناگرێت، بەڵام وڵاتانی (ویفاق) گونجان ئامادەبوون رۆمانیا ترانسلڤانیا وەدەست بێنێت. ترانسلڤانیا - بەدیدی حکومەتی رۆمانیا- پێشینەی جووڵانەوە و چالاکیەکانی نەتەوایەتیی رۆمانیا بوو روەو یەکێتی نەتەوایەتی بۆ هەموو رۆمانییەکان، بۆیە بەرهەمی وتوێژەکانی نێوان رۆمانیا و وڵاتانی (ویفاق) گونجان

پەیماننامەی هاوپەیمانی بوو لە ١٧ی ئابی ١٩١٧، کە رۆمانیا پێشتر لە بەردەم سوپاکانی وڵاتانی ناوەڕاست بوو لە ١٩١٧ ئیمزای کرد.

## ژاپۆن

ژاپۆن وڵاتە مەزنەکەی ئاسیا بوو، کە بەشداریی لە جەنگ کرد و لەتەک ژاپۆن وڵاتی تری بچووک لە ئاسیا بەشداریان کرد، وەکو سیام (تایلاند)، بەڵام ڕۆڵی بچووکیان لەم جەنگە گێڕا. ژاپۆن هەوڵی وەرگرتنی جێماوەی (وراسە) ئیمپڕاتۆریەتی ئەوروپی لە رۆژهەڵاتی دوور دەدا، بەئەنجامگەیاندنی ئەم ئامانجە بە کەرەتێک هەرگیز نەدەبوو، کاری بۆ سوودوەرگرتن لە قەیرانەکانی ئەوروپی دەکرد بۆ وەدەستهێنانی دەستکەوت لە رۆژهەڵاتی دوور.

بازاڕە قەرەباڵغەکانی چین جێی چاوبڕینەکانی ژاپۆن بوون، سەرباری تێڕوانینەکانی بۆ دەستگرتن بەسەر کانزاکانی چین، کە نەیتوانیوە سوودیان لێوەر بگرێت. بۆیە بە دیدی ژاپۆن بەردەوامبوونی لە هاوپەیمانی لەگەڵ بەریتانیا ئەم دەرگایانەی بۆ دەخرێنە سەر پشت و دەتوانێت لەم رێگەیەوە دەست بەسەر ئەو شوێنانەدا بگرێت، کە ئەڵمانیا لە چین لە کەنداوی (چاو و شانتۆنگ) داگیری کردوون.

لەسەر ئەم بنەمایانە ژاپۆن لە ٢٣ی ئابی ١٩١٤ جەنگی دژی وڵاتانی ناوەڕاست راگەیاند بە ئومێدی بە ئامانج گەیاندنی ئاواتەکانی، تەنانەت ئەگەر لەسەر حسابی وڵاتانی (ویفاق)یش بن گرنگ نەبوو.

دوای ئەوەی ژاپۆن دەستی بەسەر ئەو شوێنانە داگرت، کە ئەڵمانیا لە چینی داگیری کردبوون -ئەوسا ئەڵمانیا بەهێز بوو ئەوروپاش خەریکی شەڕ بوو - هەوڵی فەرمانڕەوایی بە تواناکانی چینی دا، لە رێگەی هەڕەشەلێکردن بە ئازادکردن و ناردنەوەی سیاسەتمەدارانی پەناهەندە بۆ ناو چین، دیارە ئەوان لە توانایاندا بوو دژی دەسەڵاتی (یوان چی کای)ی دیکتاتۆر ئاژاوە و نائارامی بخولقێنن.

لە جەنیوەری ١٩١٥ ژاپۆن یاداشتێکی بە چیندا -بە ماوەیەکی کورت- تیایدا داوای ئیمتیازاتی سیاسی و ئابووریی و سەربازیی لێکرد، بەم پێیە چین وەکو پارێزراوێکی (محمیە) ژاپۆن دەمایەوە. چین لەبەردەم داواکاریەکەی ژاپۆنی زەبەلاح بە باڵشکاویی

مایەوە، ئەمە وێڕای نارازیبوونی بەریتانیا لە قورسکردنی باری چین و زیادەڕۆیی لە داواکاریەکانی ژاپۆن، هەروەها وێڕای داواکاری ئەمەریکا لە ژاپۆن بۆ وەستانی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی یاداشتەکە بە تایبەت ئەو خاڵانەی سەروەریی چین پێشێل دەکەن.

ئەو رێککەوتنانەی لە نێوان چین و ژاپۆن لە ٢٤ی ئایاری ١٩١٥ ئیمزا کران ئاوی روان بۆ چین دەهێشتەوە ماوەیەکی باشیشی بە ژاپۆن دەبەخشی تا دەست بەسەر چیندا بگرێت، وڵاتانی (ویفاق) بە هۆی خەریکبوونیان بە جەنگەکانی ئەوروپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناچاربوون ئەم رێککەوتنەی نێوان چین و ژاپۆن پەسند بکەن، ئەمەو بەریتانیا پەیمانی بە ژاپۆن دا کە ئەو دوورگانەی ژێر دەستی ئەڵمانیان لە زەریای ئارام بە ژاپۆن بدات.

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی لە (فراوانیی هەرێمی) لە ناوەوەی کیشوەر بۆ کیشوەرە دوورەکان گۆڕدران (ئالاسکا و هاوای)، ئەمە بووە هۆکاری دۆزینەوەی مەودایەکی زیندوو لە ئەمەریکای لاتینی. ئەوەندەی نەبرد دەستی گرت بەسەر فلیپین، کە لەژێر دەستی ئیسپانیادا بوو، هەروەها کەناڵی پەنەما و کوبا. ئەمەریکا زۆر بە هەستیاری مامەڵەی لەگەڵ هاوپەیمانەکان و دژە هاوپەیمانەکانی ئەوروپای دەکرد، هەوڵی ئەوەی دەدا ببێتە ناوبژیوانێکی بەهێز بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان لە کیشوەری ئەوروپا، بەڵام بە هۆی توندی شەڕەکان لە نێوان هەردوو ئۆردوگای شەڕکەر لە ئەوروپا و پێویستی نەبوونیان بە ناوبژیوان و دڵنەچوونی ئەمەریکا لە دەستێوەردان، ئەمانە هەمووی بوونە فاکتەری ئەوەی ئەمەریکا وەکو بینەرێک لە چاوەڕوانی ئەنجامەکانی جەنگەکەدا بێت تا ئەو کاتەی لایەنێک بەسەر دەکەوێت، ئەوسا بە پشتبەستن بە بنەماکانی بەرژەوەندی گەلی ئەمەریکا هەڵوێستێک وەگرێت.

## دەوڵەتی عوسمانی

دەوڵەتی عوسمانی تاقە دەوڵەتی موسڵمان بوو، کە بڕیاری بەشداریکردنی لە جەنگی یەکەمی جیهانیی دا.

چەند هۆکارێک هەبوون، کە دەوڵەتی عوسمانی بچێتە پاڵ وڵاتانی ناوەڕاست نەک بێلایەن بێ:

١- بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا لەناو دەوڵەتی عوسمانی بەر لە دەستپێکردنی جەنگ گەلێک پەرەیان سەندبوو. قەرزی ئەڵمانی هەبوو، پرۆژەی هێلی ئاسنی هەبوو، کە ئەڵمانیا پێی هەڵدەستا، سوپای عوسمانییەکان لەسەر دەستی پسپۆرە سەربازیەکانی ئەڵمانی مەشقیان دەکرد، تا ئەوکات لاپەرەی ئیمپریالیزمیی ئەڵمانیا سەبارەت بە دەوڵەتی عوسمانی خاوێن بوو.

٢- بەرژەوەندی و چاوتێبڕینی بەریتانیا و فەرەنسا زۆر بە روون و ئاشکرا دیار بوون، چاویان بڕیبووە دەوڵەتی عوسمانی و لێدانی گەلانی موسڵمان لە مەیدانی بڕوا و ئابوورییەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی گەلانی موسولمانی ئاسیا و ئەفریقیا - بەتایبەت لە هیند و کەنداوی عەرەبی و عەدەن و نیل و باکووری ئەفریقیا - ژێردەستە و کۆیلە کرابوون، هەریەک لە بەریتانیا و فەرەنسا بە چاوی شەڕەوە دەیانڕوانییە عێراق و شام و بەندەرەکان.

٣- روسیا مەزنترین مەترسیی لەسەر چارەنووسی دەوڵەتی عوسمانی پێک دەهێنا، کە شەڕەکانی تەرابلس و بەلکان هێوریان کردەوە، روسیا بەڕوونی بەدوای لەناوبردنیدا دەگەڕا. حکومەتی ئەستانە لە هاوینی ساڵی ١٩١٤ نەیتوانی لەگەڵ وڵاتانی (ویفاق) گونجان بکەوێتە رێکەوتنێک، کە ئەوەی لە میسر و بەلکان لەدەستی دابوو، بۆی بگێڕنەوە، بۆیە ئاراستەکانی حکومەتی ئەستانە ئاسایی بوو، کە رووەو ئەڵمانیا بن.

بەڕاستی هەندێک دەنگ هەبوون داوایان دەکرد لەم شەڕە تێوە نەگلێن، بەڵام ئەنوەر پاشا [٣١] لەوە دڵنیا بووسەرکەوتن بۆ ئەڵمانیایە، بۆیە دەرفەت رەخساوە تا تۆڵە لە دوژمنە مەزنەکانی بکاتەوە. کەسایەتی و توانای ئەنوەر پادشا لەو ئاستەدا بوو بتوانێت لە ٢ی

---

[٣١] وەزیری جەنگ و یەکێک لەو سێ کەسانەی بەسەر دەسەڵاتەوە زاڵ بوون، دووەکەی تریش تەلعەت پاشا وەزیری ناوخۆ و جەماڵ پادشا وەزیری دەریاوانی بوو

ئابی ١٩١٤ پەیماننامەیەکی بەرگری دژی روسیا لەگەڵ ئەڵمانیا ئیمزا بکات، ئەمە دوای یەک رۆژ لە راگەیاندنی بڕیاری ئەڵمانیا هات، کە راگەیاندنی دەستپێکردن بە جەنگ بوو. بەم شێوەیە هیچ ئاستەنگێک لە بەردەم حکومەتی ئاستانە نەما جەنگ دژی وڵاتانی (ویفاق) رابگەیەنێت تەنیا رەخسانی دەرفەت نەبێ، بە تایبەت دوای ئەوەی بەریتانیا دەستی بەسەر ئەو دوو کەشتییە جەنگییەی دەوڵەتی عوسمانیی داگرت، کە لە بەریتانیای کڕیبوو و هێشتا لە بەندەرەکانی بەریتانیا وەستابوون.

کاتێک هەردوو کەشتیەکەی ئەڵمانی لە ترسی کەشتیەکانی بەریتانی رایان کردبوو و گەیشتنە بەنداوەکانی عوسمانی لە ١١ی ئابووی ١٩١٤، حکومەتی عوسمانی مافی هاتنەژووری پێدان لەگەڵ وەستان لە بەندەرەکانی. لە کاتێکدا ئەم بەنداوانە بە رووی کەشتیگەلی بەریتانی لە دەریای سپیی ناوەڕاست داخران هەروەها کەشتیگەلی روسی لە بەنداوەکانی دەریای رەش رێگەیان پێ نەدرا بچنە ناوەوە. پاساوی تورکەکان ئەوەبوو، کە جوین و برسلاو بوون بە بەشێک لە کەشتیگەلی عوسمانی، ئەمە وەکو کاردانەوەیەک لەسەر گلدانەوەی کەشتییە سەربازییەکان، کە بەریتانیا گلی دابوونەوە. ئەوەندەی نەبرد لە بەندەری ئۆدیسا سباستیۆلی روسی لە کتوپڕی لە کەشتیەگەلی عوسمانی درا بە کەشتیەکانی جۆبن و بروسلاویشەوە، ئەمە سەرەتای دەستپێکردنی پراکتیکیی جەنگی تورکی بوو لەتەک وڵاتانی ناوەڕاست دژی وڵاتانی (ویفاق) گونجان. ئەوسا ئیتر سوڵتانی عوسمانی - خەلیفەی موسلمانان محمدی پێنجەم بانگەوازی (جیهاد)ی کرد بە هیوای ئەوەی هەموو موسڵمانەکان لەو وڵاتانەی بەریتانیا و فەرەنسا و روسیا دەستیان بەسەریاندا گرتووە، شۆڕش بەرپا کەن [٣٢]، لەشکرەکانی عوسمانی ئامادەی شەڕکردن بوون دژی وڵاتانی (ویفاق) گونجان لە هەموو بەرەکان:

١- بەرەی قەوقازی ئەنادۆڵی.
٢- بەرەی بەلکانی.
٣- بەرەی دوورگەی عەرەبی وعێراق و فارس.
٤- بەرەی کەندری (کەنال) سوێس و شام.

---

[٣٢] نەی دەبێت لایەنگرانی تورک کێ بن ؟ موسلمان بوون ؟،نەڵمانیا ونەمساو هەنگاریا هەمان چلێشت نەبوون؟...چۆن گەمەیان بە هەستی ساویلکەی خەڵک کردوە بەناوی ئایین، خۆیان کردووە بە کوێخا و رێش سپی ی موسلمانان....

٥- بەرەی یەمەن.

بەشداریکردنی تورکیا وا بە زووەخت لەو کاتەی روسیا توشی چەند شکستێک بووە و لەشکرەکانی ئەڵمانیا بەرەو فەرەنسا لەشکرکێشی دەکەن، یەکێک لەو هۆکارانە بوو کە باری وڵاتانی (ویفاق) گونجانی قورس کرد، بە تایبەتی روسیا و بەریتانیا. حکومەتی ئەڵمانیا و ئەسیتانە زۆر دڵیان بە بانگەوازی (جیهاد ) خۆش بوو، کە ببێتە مایەی لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی هێزەکانی بەریتانی و فەرەنسی بە تایبەتی. بەڵام مەزندەکانی تورک وئەڵمانەکان ڕاست نەبوو، ئەم بانگەوازەی (جیهاد) نەبووە هۆی بەرپابوونی شۆڕش لە وڵاتە موسولمانەکان. بە پێچەوانەوە ئینگلیزەکان توانیان هاوکاریەکانی پادشا حوسێن بن علی شەریفی مەککە وەدەست بێنن و لەگەڵی بکەونە هاوپەیمانێک تا شەریف خۆی سەرپەرشتی شۆڕشێکی عەرەبی بکات لە ١٩١٦ دژی خەلیفەی عوسمانی، ئەم شۆڕشە بووە هۆی تێکشکاندنی هێزی بانگەوازی دەوڵەتی عوسمانی بۆ (جیهاد). ئاسایی بوو وڵاتانی (ویفاق) گونجان دوای سەرکەوتنیان دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن، ئەمە ئەوکات دەستی پێکرد، کە بەریتانیا رایگەیاند قوبرس لە خۆ دەگرێت و مافی پاراستنیش بەسەر میسردا دەسەپێنێت، هەروەها بە هەوڵەکانی دەستگرتن بەسەر بەنداوی دەردەنیل لە ١٩١٥ ، کە سەرکەوتوو نەبوو تیایدا. لە کۆتایی وڵاتانی (ویفاق) گونجان کەوتنە ڕێککەوتن لەسەر دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان خۆیاندا، کە بەناوی ڕێککەتنی قوستەنتینیەی ٤ تا ١٠ی نیسانی ١٩١٥ناسرا، لە ڕاستیدا ئەم نامانە لە نێوان ئەم وڵاتانە ئالوگۆڕ کراون، بریتین لە بەریتانیا و فەرەنسا و روسیا بۆ پێکهاتن لەسەر دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی بەم شێوەیە:

١- روسیا ئەسیتانە و بەنداوەکان وەدەست دێنێت، بە مەرجی ئەوەی بەندەری ئەسیتانە بۆ بازرگانی ئازاد دەبێت، هەروەها بەنداوی دەردەنیل و بسفۆر کراوە دەبن لە ڕووی پاپۆرەکانی بازرگانی.

٢- دڵنیاکردنەوەی وڵاتانی بەلکان لە کاتی داگیرکردنی ئەسیتانە و بەنداوەکان لەلایەن روسیاوە.

٣- ڕاستکردنەوەی سنوورەکانی نێوان ئەفغانستان- روسیا، بە شێوەیەک داخوازیەکانی روسیا جێ بە جێ بکات.

٤- فەرەنسا هەرێمی سار وەدەست دێنێ وێڕای ئەلزاس و لۆرین.
٥- دروستکردنی وڵاتێکی نوێ لە کەناری چەپی ڕووباری راین لەسەر خاکی ئەڵمانیا.
٦- ناوچەکانی بێلایەن لە فارس، کە لە دەقی ڕێککەوتنەکەی (ویفاق) گونجان لە ساڵی ١٩٠٧ ئاماژەی پێدراوە دەبێتە ناوچەی دەسەڵاتی بەریتانیی.
٧- بەریتانیا و فەرەنسا وڵاتە عەرەبیەکانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی وەکو عێراق و شام لە نێوان خۆیاندا دابەشی دەکەن، دواتر ئەمە جێبەجێ کرا، کە پێی وترا ڕێککەوتنی سایکس-بیکۆی بەناوبانگ لە ١٩١٥.
٨- فەرەنسا دەست بەسەر سوریا و کیلکیا و کەنداوی ئەسکەندەریە دادەگرێت.
٩- حکومەتێکی ئیسلامیی سەربەخۆ لە خاکەکانی ئیسلامیی پیرۆز دادەمەزرێت.
١٠- پچڕاندنی خەلافەت لە تورکیا.

کاتێک ئیتاڵیا بڕیاری دا لەتەک وڵاتانی (ویفاق) گونجان بەشداری لە جەنگ بکات، بەشداریی لە مەسەلەی دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی دا کرد بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- دەسەڵاتی ئیتاڵیا لەسەر دوورگەی دۆدیکاینز رادەگەیەندرێت، مافی سوڵتانی عوسمانی لە لیبیا بۆ ئیتاڵییەکان دەگواسترێتەوە.
٢- بەشێک لە هەرێمی ئەزاڵیا.
٣- لە حاڵەتی ئەوەی بەریتانیا و فەرەنسا دەست بەسەر موستەعمەرەکانی ئەڵمانیادا بگرن، بەشی ئیتاڵیای لێ دەدەن لە ناوچەکانی سنووری ئەریتێریا و سۆماڵ و لیبیا. ئیتاڵیا بەم شێوەیەی لێی دەڕوانی، تا دەست بەسەر کەنارەکانی بەلکان و ئەوانەی دەکەونە ڕووبەڕووی ئیتاڵیا و بەتایبەت کەنارەکانی دالماشیا و بەندەری فەیومی و تریستا.

جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتن و بڕیارانە لەسەر ئەنجامەکانی کۆتایی جەنگ دەوەستن، هەروەها لەسەر جۆری پیلانەکانی دیبلۆماسی و سەربازیی بەریتانیا دەوەستن، کە دژی بوونی روسیا و فەرەنسا لە تورکیا و ڕۆژهەڵاتی عەرەبییە. جگە لەمە وڵاتانی (ویفاق) گونجان لەناوەوە هەوڵی لەناوبردنی تورکیایان دا بە ڕێگەی وروژاندنی هەست و ئومێدەکانی نەتەوایەتیی کپکراو دژی دەسەڵاتی حوکمی تورکی عوسمانی بەتایبەتی:

١- بزووتنەوەی عەرەبی.
٢- تایەفەی ئاشووری.
٣- ئەرمەن.

بەم شێوەیە مەیدانەکانی شەڕ و بزووتنەوەی عەرەبی چارەنووسی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەست نیشان دەکەن.

دوای توێژینەوەی هێزە بەشداربووەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی دەکرێ ئەوسا لەسەر هۆکارە سەرەکییەکانی وردبینەوە:

١- قوڵایی کێشەی نەتەوایەتی لە ئەوروپا.
٢- رێکنەکەوتن لەسەر چەمکی هاوسەنگی نێودەوڵەتیی.
٣- کێبڕکێی ئیمپریالیزمی و ئابووریی.
٤- یەکێک لە وڵاتە مەزنەکان ڕووبەڕووی دارمان بووەوە.

کاتێک دیراسەیەکی بەراوردیی لە نێوان وڵاتە شەڕکەرەکان بکەین، دەبینین هەردوو وڵاتە دیموکراتەکە (بەریتانیا و فەرەنسا) خۆیان هێنایە ئاست روسیای دیکتاتۆر و کۆنەپەرست و ئۆتۆکرات.

لە لایەکەی تر دەبینین ئەڵمانیایەکی پێگەیشتووی بەهێزی یەکگرتووی خاوەن ئابووری و پیشەسازییەکی سەربازیی بەهێز لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی نەمسای لەباریەکچووی یەکنەگرتوو لە ناوەوە و خاوەن فرەپێکهاتەی نەتەوایەتیی ئابووری داتەپیو یەک دەگرن و لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی ستەمکاری ئەوپەڕی دیکتاتۆری کۆنەپەرست دەبنە هاوپەیمان.

لەگەڵ ئەوەی حکومەتەکانی هەردوو لایەنی شەڕکەر هانی میللەتی خۆیان دابوو تا یەکگرتووانە ڕووبەڕووی ئەم قەیرانە ببنەوە، دەنگۆی ئەم بانگەوازە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازی هەبوو، سیمای یەکگرتن لەناو پێکهاتەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتا شەکلی بوون، لە پادشانشینی دووقۆڵیش نەتەوەکان ئامادەبوون کێشە بنێنەوە ئەگەر دەرفەتیان بۆ بڕەخسابایە.

دیسان دەبینین ژمارەی دانیشتوانی وڵاتانی ناوەڕاست نیوەی وڵاتانی (ویفاق) گونجان دەبن جگە لە موستەعمەرەکانیان، هەروەها لە وڵاتانی (ویفاق) ژمارەی مرۆڤی

یەدەگ زۆر بوو، ژمارەی سوپای وڵاتانی ناوەڕاست کەمێک کەمتر بوو. ئەمە ڕێگربوو لە بەردەم وڵاتانی ناوەڕاست، کە بتوانن لەشکری تر دروست کەن لە شوێنی ئەو لەشکرانەی لە شەڕەکان لەدەستیان دان، بەتایبەتی شەڕەکان شەش هەفتە لە مەزندەی (مۆلتکە)ی بچووک فەرمانی سوپای ئەڵمانی ڕەتیان کرد. ئەو کاتەی شەڕەکان پێویستیان بە سەربازی زۆرتر هەبوون سوپای دەوڵەتانی ناوەڕاست لەسەر خاکی دوژمن شەڕیان دەکرد لە فەرەنسا و بەلژیک و بەلکان و روسیا وڵاتانی عەرەبی.

لە رووی دەریاوانییەوە کەشتیگەلی بەریتانی و فەرەنسی دوو ئەوەندەی کەشتیگەلی ئەڵمانی و پادشانشینی دووقۆڵی دەبوون، لەگەڵ ئەوەی کەشتیگەلی روسیامان نەخستۆتە ناو ئەو بەراوردە، چونکە لە دەریای بەلتیك و دەریای رەش گیری خواردبوو بە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی و دانیمارک بەنداوەکانیان لێ داخستبوون، کە لەژێر دەستیان دا بوو.

لەکاتێکدا جەنگاوەرەکانی ئەڵمانی و فەرماندەکانی سەربازیان پلە نایاب بوون، لە سەرەتاوە بلیمەت بوون، جەنگاوەرە فەرەنسی و ئینگلیزەکان تارادەیەک کەمتر بەتوانا و مەشق پێکراو بوون لە رکابەرە ئەڵمانییەکانیان، بەڵام ئاستی فەرماندەیی و سەربازەکانی سوپای روسی و ئیتاڵی و سربی خراپ و داتەپیو بوون ئەگەر لەگەڵ ئاستی ئەڵمانی و ئینگلیزی و فەرەنسییەکان بەراوردیان پێ بکەین.

هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی نیشانەی هەرەسهێنانی دیبلۆماسیەتی ئەوروپی بوو، بەم شێوەیە چارەنووسی فەرمانەکان لە دەستی حوکمرانە سیاسییەکان گواسترایەوە بۆ دەستی پیاوانی جەنگاوەر و شەڕکەر. پێویستەتەکانی عەسکەرتارەکان بڕیاردەری چارەنوسەکان بوون و ئەو بڕیاریان لەسەر گۆڕانە سیاسیەکان دەدا، حەزی عەسکەرتارەکانی روس بۆ پڕچەککردن و دەوڵەمەندکردنی بواری سەربازی زۆر بە پەلە و خێرا بوو لە کاتێکدا سیاسەتمەدارانی روس لەم بوارە هێواش و لەسەرخۆ بوون.

هێرشەکانی ئەڵمانیا و داگیرکردنی بەلژیک کاریگەریی لەسەر خۆوەدەستدانی وا بە خێرایی فەرەنسا هەبوو و دواتر کاری کردە سەر ویفاقردنەوەی لەشکر و ڕووبەڕووبوونەوەی لە بەرەکانی ئەڵمانی و دواتر کاریشی کردە سەر سیاسەتی ناوخۆی وڵات.

بەڵام بەریتانیا یەکەم وڵات بوو پارسەنگی پێویستیەکانی سەربازی و مەدەنیی تێکنەچوو بە هۆی ئەوەی پشتی بە بەرنامەی بەرگریکردن بەستبوو، یەکەم جار لە ئەوروپا و دووەم جاریش لە دەریای باکوور و دەریای مانش. دواتر بڕوایەکی گشتییش هەبوو، کە ئەم شەڕە درێژە ناکێشێت، بەڵام لە هاوینی ١٩١٤ دەستی پێکرد و لە پایزی ١٩١٨ کۆتایی پێهات، چوار ساڵ و پانزە هەفتە پێیەوە خەریک بوون.

## قۆناغی یەکەم لە جەنگی یەکەمی جیهانیی

ئەڵمانیا بەهێزێکی زۆرەوە بەرەو فەرەنسا بە ناو خاکی بەلژیکدا جوولەی بە هێزەکانی کرد بە نیازی لێدانی فەرەنسا بۆ ئەوەی لە حساباتی جەنگی وەدەرنێت، بە هۆی بەرگرییە بەهێزەکانی بەلژیک لە قەلا (قەلای لییج و نائیمزا) و سەنگەرەکانی بۆ ماوەی دوو هەفتە هێرشەکە وەستێندرا، لەوێ فەرماندەی هێزەکانی فەرەنسی هەستی بەوە کرد، کە گیرساندنەوەی هێزەکانی لە لۆرین کارێکی هەڵەیە، بە هۆیەوە ئەڵمانەکان توانیان بۆ ناو جەرگەی فەرەنسا هێرش بەرن.

فەرەنسا ناچاربوو لە هەموو مەیدانەکانی جەنگ شەڕی پاشەکشە تا هێلەکانی ڕووباری مارن بکات، فشار لەسەر هێزەکانی فەرەنسی کەم نەکرایەوە ئەوە نەبێت (ڤۆن مۆتکە) ناچاربووهەندێک تیپ لە هێزەکانی لە بەرەی فەرەنسییەوە بۆ بەرەکانی بڕوسی بگوازێتەوە تا لە هێرشەکانی روسیا پارێزراو بێت، بەڵام روسیا بەر لەوەی تیپەکانی بۆ بەرەی بڕوسیا بگوازێتەوە توشی شکستێکی مەزن ببوو لە پێگەی (تاننبرگ) بەر لە گەیشتنی بە مەیدانی جەنگ.

گواستنەوەی ئەم هێزانەی ئەڵمانی لە بەرەکانی فەرەنسی هێزەکانی ئەڵمانیای لەم بەرەیە لاواز کرد، فەرەنسا توانی دەرفەت وەرگرێت (بۆفەر) فەرماندەی هێزەکانی فەرەنسا دژە هێرشێکی کردە سەر لەشکرەکانی ئەڵمانیا و ناچاری کرد سەنگەری بەرگری وەرگرن.

ئەمە دەتوانین بڵێین سەرکەوتن بوو بۆ وڵاتانی (ویفاق) گونجان، پلانەکانی شەڕی کتوپڕ سەرکەوتنیان وەدەست نەهێنا، تا شەڕەکان درێژەیان بکێشابایە لە دژی بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی ناوەڕاستدا دەبوو.

لە سێپتەمبەری ١٩١٤وە نەخشەی بەرگری بۆ هەردوو لایەن لە بەرەکانی فەرەنسا پیادەکراو بوو، تیپەکانی پیادە لە سەنگەرەکان جێگیر بوون و لە دوورەوە یەکتریان تۆپباران دەکرد، بەرەیەکی دوور و درێژیان لە نێواندا بوو هێرشیان دژی یەکتر دەکردن و ئەنجامەکانیان یەکسان بوون. لە ڤێردون فەرەنسییەکان بەرگەی هێرشە توندەکانی ئەڵمانیایان گرت، کە ئامانجەکەی لەناوبردنی تیپە فەرەنسییەکە بوو، سەرکەوتوو بوون لەوەی رێگەیان بە ئەڵمانییەکان نەدا دەست بگرن بەسەر هێزەکانیانەوە، زیانی ئەوەندەیان

لێدان بەقەدەر زیانەکانی بەخۆیان کەوتبوون. لە شوباتی ١٩١٦ و زیانەکانی (سوم) لە تەمووزی ١٩١٦، کە فەرەنسییەکان هێرش بەربوون، بەڵام زیان بە ئەڵمانییەکان گەیشتن. پلانی جەنگ بە جەنگی کتوپڕ سەرکەوتوو نەبوو لە بەرەکانی فەرەنسی، بە هۆی هاوکارییە سەربازییەکانی ئینگلیزەکان لە ١٩١٥، ئەوسا فەرماندە ئەڵمانییەکان بیریان لە وەدەرنانی هێزەکانی روسی کردەوە لە رێگەی شەڕی کتوپڕەوە. سیماکان ئەوەیان دەگەیاندن، کە ئەڵمانیا لەم جۆرە نەخشانە سەرکەوتوو دەبێت لەگەڵ روسیا بە هۆی ئەوەی روسیا پێویستیی بە تفاق و زەخیرەی سەربازی دەبێت بۆ گەیاندنی ئەم تفاق و زەخیرانەش پێویستیی بە هۆکاری هێنان و بردنی نوێ هەیە، روسیاش لەم رووەوە لاوازە، بۆیە ئەگەرەکانی سەرکەوتن زیاتر بوون. هێرشەکانی ئەڵمانیا بۆ سەر روسیا سەرکەوتنیان بەدەست هێنان، بوونە هۆی ئەوەی پۆڵەندا و لیتوانیا و چەند بەشێکی خۆشەویست لە خاکی روسیا بکەونە دەست وڵاتانی ناوەڕاست، سەرباری لەدەست دانی دوو ملیۆن روسی لە کوژراو و بریندار و دیل.

هەڵوێستی سەربازیی وڵاتانی (ویفاق) گونجان تەنگەتاوی تێکەوت، بەتایبەت هێزەکانی روسیا، هێرشەکانی بەریتانیا لە ١٩١٥ بۆ سەر دەردەنیل سەرکەوتوو نەبوو چ لە دەریا و چ لە زەمینەوە، ناچاربوو بەرەو دواوە هێزەکان پاشەکشە پێ بکات. بەم شکستە روسیا بێئومێد دەبێت لە کردنەوەی بەنداوە داخراوەکان، کە بەهۆیەوە زەخیرە و تفاقی سەربازیی پێ نەدەگەیشت.

لە ئۆکتۆبەری ١٩١٥ هێزەکانی ئەڵمانی - بولگاری - نەمسایی سربیان داگیر کرد و بەرەو پێش هێرشیان برد تا گەیشتنە تیرانای پایتەختی ئەلبانیا، هەرچەندە ئیتاڵیا ئەوسا بەشداریی لە جەنگ کردبوو، بەڵام بەشداریی لە شەڕەکانی دەردەنیل وبەلکان نەکرد تا ئەوکاتەی ڕووبەڕووی هێرشێکی توندی نەمسایی دەبێتەوە لە پێگەی کاپۆریتۆ لە ٢٤ی ئۆکتۆبەری ١٩١٧، کە لەم شەڕە زیانی مەزن بە لەشکری ئیتاڵی دەکەون.

لە بەرەکانی رۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی هێرشەکانی بەریتانیا، کە لە بەسرەوە بەرەو بەغدا هەڵمەتیان دەبرد، لە کوت و عەمارە وەستا. لەوێ تورکەکان لەشکرێکی ئینگلیزیان گەمارۆ دابوو، لە سەرەتاکانی ١٩١٦ ناچاریان کردن خۆیان بدەن بەدەستەوە، لە بەرەکانی میسر دەستپێشخەرییەکانی هێرشبردن بە دەست جەماڵ پاشاوە بوو تا گەیشتە

کەندری (کەنال) سوێس، بەڵام لەشکری ئینگلیز و شۆڕشی عەرەبی لە ١٩١٦ تورکەکانیان ناچار کردن لە یافا و قودس پاشەکشە بکەن.

هێزە شەڕکەرەکان لە ١٩١٥/١٩١٦ لە بەرەکانی زەمینی یەکسان بوون، ئەنجامی شەڕە مەزنەکان لە جۆتلاند لە ٢١ی ئایار ١٩١٦ لە نێوان کەشتیگەلییەکان دیسان یەکسان بوون، بەڵام دواتر تەرازووی هێزی دەریاوانی لە بەرژوەندی بەریتانیا بوون و زیانەکانی کەشتیگەلی ئەڵمانی قەرەبوو نەدەکرانەوە، چونکە هێزە دەریاوانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی رێگەیان بە کەشتیگەلی ئەڵمانی نەدا لە شوێنی خۆی جووڵە بکات و هەر لە کەنارەکانی ئەڵمانی پەکیان خستن.

ئەڵمانیا هەوڵی برسیکردنی بەریتانیای دەدا لە رێگەی رێگەگرتن و ژێرئاوخستنی ئەو پاپۆرانەی خۆراک و کەلوپەل بۆ بەریتانیا دەبەن، چ ئەوانەی بێلایەنن وەکو ئەمەریکا، یان ئەوانەی بەریتانین، چونکە ئەڵمانیا ئەو ماوەیە ژێردەریاوانی (غەواسە) یەکی زۆری بۆ ئەم مەبەستە دروست کردبوو، بەڵام دیارە ئەم پلانەش سەرناگرێت بە هۆی ئەوەی بەریتانیا بەرنامەی کاروانی پاپۆری گرتەبەر، کە لە رێگەی کەشتیگەلەکانەوە پاسەوانیان لێ دەکرا، دواتر زۆر لەم ژێردەریایانە بە دەستی کەشتیگەلەکانی ئینگلیز لەناوبران.هێزەکانی هەردوو لایەنی شەڕکەر توانا و وزەکانیان لەدەست دابوو، چونکە ئەوان خۆیان بۆ جەنگێکی کورتخایەن ئامادە کردبوو، سیمای پێویستیەکانی شەڕی درێژخایەنیان پێوە دیار بوو، ڕوودانی هەندێک ئاژاوە و ناویفاقی لە ناوەوەی وڵاتانی شەڕکەر نیشانەی ماندووبوون و نارەحەتیان بوون، کە بە هۆی ئەو رەوشە چاوەڕواننەکراوە دروست ببوو:



ئەسکویت

١- لە بەریتانیا وەزارەتی (ئەسکویت) ڕووبەڕووی قەیرانی خۆراک پەیداکردنێکی توند ببوو، سوپای ئینگلیز، کە لە فەرەنسا ببووە کرێکار، پێویستیی بە زەخیرە هەبوو. لە هۆکارەکانی توندبوونی ئەم قەیرانە بوونی کیچنەر بوو لە پۆستی وەزارەتی بەرگری، کچنەر لەلایەن ئینگلیزەکان خۆشەویست بوو، بەڵام زانیاری و پسپۆڕیی لە بواری خۆراک پەیداکردن و ئازوقە و زەخیرەدا نەبوو، لە بواری نەخشە و بەرنامەداڕشتن بۆ داگیرکاری و کاری ئیمپریالیزمی بلیمەت و کەموێنە بوو، کێشەکان زیادیان کرد ئەوکاتەی پێویستیەکانی شەڕی کەندر(خندق) لە فەرەنسا پێویستیان بە زیاتر زەخیرە هەبوو.

ئەوکاتەی ئەسکویت لە ئایاری ١٩١٥ وەزارەتی گۆڕی (لوید جۆرج)ی بە وەزیری (تموين) دانا، لوید جۆرج لە بواری دابینکردنی خۆراک و ئازوقە بۆ سوپا زیرەکی زۆری نواند، نەخشەیەکی درێژخایەنی بۆ سوپای بەریتانی دانا، سوپایەکی نوێی پێکهاتوو لە ٧٠ تیپ دامەزراند. لوید جۆرج خاوەنی دەسەڵاتی ڕەها بوو لە پێناو ئاراستەکردنی توانا مرۆییەکان بەرەو بەرهەمهێنان و جەنگ، ئەم دەسەڵاتەش دیارە لە پادشاوە پێدرابوو. لە دیسەمبەری ١٩١٦ لوید جۆرج بە هاوبەشی سێ کەسی تر پۆستی وەزارەتی بەرگریان گرتە ئەستۆ، سێ یەکەی تر: کیرزن و لۆرد میلنەر (هەردووکیان لە پارێزگاران بوون) و ئەرسەر هندرستۆن لە (پارتی کرێکاران) بوون.

٢- لە فەرەنسا وەزارەتی ئەرستۆ بریاند هاوسەردەمی خۆڕاگری بوو، ئەوەندەی نەبرد وەزارەتی بەرگریی بە جەنەڕال لیۆتی سپارد، ئەوەی بە کوشتارگەی مەغریب ناسرابوو. بریاند زۆری بەسەرنەچوو دەستی لە کار کێشایەوە، دوای ئەو چەند وەزیرێکی لاواز و تەمەنکورت دەسەڵاتیان گرتە دەست تا لە ١٣ی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ جۆرج کلمەنسو سەرۆکایەتی وەزارەتی گرتە دەست، ئەم توانیی یەکڕیزی بۆ وڵات بگێڕێتەوە و بزووتنەوە یاخیبووەکەی ١٩١٧یش لە ناوبەرێت. گەلی فەرەنسی لەپشت ئەم کەڵە پیاوە وەستان، ورەو تواناکانی گەلی فەرەنسیی بووژاندنەوە، کورتەی سیاسەتەکانی بریتی بوون: لە پێناو سەرکەوتنی یەکجارەکی بەسەر دوژمن، دەبێت سوود لە هەموو تواناکانی فەرەنسییەکان بێتە وەرگرتن. ئەمەو بەرانبەر بە دوژمن تا بڵێی یەکگوفتار و یەکهەڵوێستی توندی هەبوو، دیارە ئەمە لە پێناو بردنەوەی جەنگ بوو، هەردەم دەیوت:

"سیاسەتی دەرەوە و سیاسەتی ناوەوەم یەکن، سیاسەتی دەرەوەم دەبێت بجەنگم سیاسەتی ناوەوەشم هەر دەبێت بجەنگم و بەردەوام دەبێت بجەنگم).



جۆرج کلمەنسو لە ناوەڕاست

٣- ئیتاڵیا ژمارەیەکی زۆری لە پارت و دەزگا و سەرکردەی دژی جەنگی تیابوو، کە لە هیچ وڵاتێک لە وڵاتە شەڕکەرەکان بەم شێوەیە نەبوو. ئیتاڵیا بە هۆی بێتوانایی و بێئومێدی لە وەدەستهێنانی سەرکەوتن تا ١٩١٦ لە دڵەڕاوکێیەکی توندا بوو، ئەوکاتەی بەروبوومی دانەوێڵە لە وەرزی ساڵی ١٩١٦ نەهات بوو، ئەم زیاد ناڕەحەت بوو، کەمی خەڵووز بووە هۆی وەستانی زۆرێک لە کارگە و دەستهەڵگرتن لە کێڵگەکان، کە بووە هۆی مانگرتنەکان لە (تۆرین) و راکردنی سەربازەکان لە بەرەکانی جەنگ و دواتر بووە مایەی شکستهێنانی لەشکری ئیتاڵیا لە (کابۆریتۆ) و رووخانی وەزارەتی (بۆزیلـلی)، دواتر(ئۆرلاندۆ) سەرۆکایەتی وەزارەتی گرتە ئەستۆ.

دەتوانین (ئۆرلاندۆ) بە کلمەنسۆی ئیتاڵیا بشوبهێنین، ئامانجی یەکێتی نیشتمانی بوو، بە دیدی ئەم کلیلی هەموو سەرکەوتنەکانی یەکجارەکین، بانگەوازی هەموو پارتەکانی ئیتاڵیای کرد تا پێکەوە دانیشن و هاوکاری یەکتر بکەن لەپێناو ڕووبەڕووکردنەوەی هەموو تواناکانی ئیتاڵیا بە جەنگی سەرکەوتن و رامالینی شەرمەزاریی (کابۆریتۆ). لەگەڵ ئەوەی لەلایەن سۆشیالیستەکانەوە ڕووبەڕووی دژایەتی بووەوە، بەڵام (جیۆلتی) بانگخوازی مەزنی سیاسەتی بێلایەن، بە هۆی هێرشەکانی نەمسا

لایەنگیری خۆی بۆ ئیتالیا و حکومەتەکەی راگەیاند تا بە هاوکاری ولاتانی (ویفاق) گونجان پێ لەسەر داخوازییەکانی سەرکەوتن داگرن.

٤- لە تەمووزی ١٩١٧ لە ئەڵمانیا نارەزایی سۆشیالیستەکان لە قەرزەکانی جەنگ بەرز بوونەوە، بووە مایەی سەرهەڵدانی قەیرانێکی ناوخۆ.

٥- ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا: بە هۆی درێژەکێشانی جەنگ و کەمی خەرجی و کێشەکانی ناوخۆ نالەبارترین ولات بوو، هەندێک قەیرانی ئابووریی لە نێوان نەمسا وهەنگاریا دروست بوون، لە نۆڤەمبەری ١٩١٦ ئیمپراتۆر فرانسیس جۆزێف کۆچی کرد، شارلی یەکەمی کوڕی هاتە شوێنی و دەستی بە گۆڕینی وەزارەت کرد و داوای لە ئەنجومەنی (ریخسرات) کرد کۆببنەوە. دیارە لە ١٩١٤ەوە ئەم بانگەوازە بۆ کۆبوونەوەی ریخسرات نەکراوە، ئەمە وەکو هەنگاوێکی دیموکراسیانە بوو ئیمپراتۆر دەینا. نوێنەری نەتەوەکان هاتنە ناو ئەنجومەنەکە، ئەوان تەنیا داوای مافی ئازادییان بۆ نەتەوەکانیان دەکرد، سەرەڕای ئەوەی لە هەندەران بە سەرپەرشتی ولاتەکانی (ویفاق) گونجان فەرەنسا و بەریتانیا حکومەتیان بۆ هەریەک لە پۆڵەندا و یۆگسلاڤیا دامەزراند.

٦- لە روسیاش لە دێسەمبەری ١٩١٦ دیاردەکانی شۆڕشی کۆمۆنیستی بەدەرکەوتن، لەگەڵ گرانی باری جەنگ ولاتە شەڕکەرەکان لەسەر درێژە پێدانی جەنگ سور بوون، سەرەڕای بانگەوازەکەی (ودرو ویلسون) سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووە کانی ئەمەریکا لە ١٩١٦ بۆ قبوولکردنی رێککەوتننامەیەکی ناشتەوایی، کە هەموو لایەک رازی بکات. ئەم ئاشتەواییە دەبوایە هەردوو لایەنی شەڕکەر دەست لە هەندێک داخوازیەکانیان هەڵگرن بۆ ئەوەی بگەنە رێککەوتنێک، بەڵام ئەمە لەلایەن هیچیان قبووڵ نەکرا، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو ئەڵمانیا ویلسۆنی تۆمەتبار کرد بەوەی رێککەوتنێکی مەبەستە تەنیا لە بەرژەوەندیی ولاتانی (ویفاق) دابێت. شەڕەکان لە ١٩١٦ بەردەوام بوون بێ ئەوەی کەسیان درک بەوە بکات ناخۆ کامە لایەن سەردەکەوێت، تا ساڵی ١٩١٧ هات، ئەوسا فاکتەرەکان و زەمینەی کۆتاییهاتن بەو جەنگە رەخسان.

ساڵی ١٩١٧ لە گرنگترین ساڵەکان دەژمێردرێت، لەم ساڵە رووداو و پەرەسەندنی مەزن روویان دا، کە کاریگەری قووڵیان هەبوو لەسەر کۆتایی پێهێنانی ئەم ململانێیە تاڵە، ئەم گۆڕانانەش بریتی بوون لە:

١- شۆڕشی روسی لە سەرەتای ئاداری ١٩١٧.
٢- لە ٢ی نیسانی ١٩١٧ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەشداریی لە جەنگ کرد.
٣- لە ١٩١٧ بەرەی ناوخۆی ئەڵمانیا پەشۆکا، دواتر لە هێرشە مەزنەکەی ١٩١٨ شکستی هێنا.
٤- خۆوەدەستدانی بولگاریا لە سێپتەمبەری ١٩١٨,
٥- پادشانشینی دووقۆڵی درزی تێکەوت.
٦- تورکیا وڵاتە عەرەبییەکانی لەدەست دەدا (١٩١٧-١٩١٨).

روسیا بە هۆی شکست و دابەزینی ورە و توانا سەربازییەکان و کوشتارگەری و بڵاوبوونەوەی نوخۆشی و برسێتی و کارەساتە ناوخۆییەکانی و کەمی ئازوقە و تفاقی سەربازییەوە یەکەم وڵات دەبێت لە جەنگ دەچێتە دەرەوە. هەروەها کەمتەرخەمی حکومەتی قەیسەر بۆ رزگارکرنی گەلی روسی لەم نەهامەتی و برسێتییە وێڕای کەمتەرخەمی وڵاتانی (ویفاق) لە هاوکاریکردنی لەم بوارە، هەموویان هۆکاری دەرچوونی روسیان لە جەنگی یەکەمی جیهانیی، لە ئەنجامدا لە پترۆگراد شۆڕش دژی قەیسەر هەڵگیرسا، سوپاش ئامادە نەبوو دژی گەل جووڵە بکات، بە ناچاری قەیسەر لەسەر تەختی حوکم دابەزی. بەم شێوەیە حکومڕانی خانەوادەی رۆمانۆف بۆ هەتاهەتایی کۆتایی پێهات، بە شێوەیەکی کاتیی (کیرنسکی) سەرۆکایەتی حکومەتی کرد. ئەو مەبەستی بوو درێژە بە جەنگ بدات، بەڵام ئەو کودەتایەی لینین - سەرکردەی بەلشەفیک - پێی هەڵسا حوکمی لەژێر دەستی کرنسکی دەرهێنا ، هەر زوو هەوڵی ئاشتەواییان لەگەڵ ئەڵمانیا دا، ئەمەش لە پەیماننامەی (برست لتۆفسک) ئەنجام درا لە ٣ی ئاداری ١٩١٨.

دەقی پەیماننامەکەی برست لتۆفسک دەڵێ:
١- دەست لە دەوڵەتۆکەکانی بەلتیک و فینلەندا و پۆڵەندا هەڵدەگیرێت.
٢- لە ئۆکرانیا بکشێنەوە و دان بە پەیماننامەکەی ئەڵمانیا بنرێت.
٣- دەست لە ئەردوهان و قارس و باتۆم هەڵبگیرێت بۆ بەرژەوەندی تورکیا.
٤- رێگە بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە نەدرێت.

بەم شێوەیە روسیا لە جەنگ چووە دەر، دوای ئەوەی رووبەرێکی زۆری ئەو خاکانەی لەدەست دان، کە لەژێر دەسەڵاتی دابوون.

ئەمەریکا لە ٦ی نیسان بڕیاری شەڕی لەسەر ئەڵمانیا دابوو، دەبووایە ساڵێکی بەسەردا تێپەڕێت ئەوسا بۆی هەبوو بە پراکتیکی بەشداری لە شەڕەکانی ئەوروپا بکات، لێرە پرسیارێکی خەتەرناک دێتە پێش:

ئایا ئەڵمانیا لە توانایدایە لە ماوەی وەستانی شەڕ لە بەرەکانی روسیا تا ئەو کاتەی ئەمەریکا بۆی دەبێت بە هێزە زەبەلاحەکەی خۆی بگەیەنێتە بەرەکانی جەنگ، جەنگەکە بباتەوە؟ چوار مانگ لەبەردەم ئەڵمانەکاندا مابوو تا هێزەکانی ئەمریکی بگەنە بەرەکانی جەنگ و ئەڵمانیا خۆ وەدەست دان بەسەر فەرەنسادا بسەپێنێت، ئەمە بەر لەوەی هێزەکانی ئیتاڵیاش بکەونەوە سەر پێ، کە لە نسکۆی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لە جەنگی (کابۆریتۆ) شکستی خواردبوو.

ئەوەی زانرابوو ئەڵمانیا نیازی وابوو هەموو هێزەکانی لە بەرەکانی روسی بۆ بەرەکانی فەرەنسی بگوازێتەوە، بۆ ئەوەی هێرشێکی بەربڵاو بکاتە سەر فەرەنسا و ناچاری بکات خۆ بداتە دەست. ئەوەی رویدا سەرکردایەتی تەنیا بەشێک لە هێزەکانی بۆ بەرەی فەرەنسی گواستنەوە، ئەوانی تری لە شوێن خۆی جێهێشتن لەبەر مەترسی لە هەڵوەشانەوەی پەیماننامەکە، کە لە ئارادابوو زۆر بە ئاسانی روبدات. دواتر سەرکردە و فەرماندەکانی ئەڵمانی بڕوایان بە بەلشەفییەکان نەبوو پابەندی پەیمانەکانیان بن، ترسیان لەوەبوو هەردەرفەتێکیان بۆ بڕەخسێت درێغی نەکەن لە کودەتایەک لەسەر حکومەتی ئەڵمانیا، دواتر دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا لە هەوڵی بەردەوام دابوون بۆ ئەوەی روسیا لە جەنگ بمێنێتەوە. سەرباری ئەم هۆکار و ئەو هۆکار، کە بوونە کاریگەر بەسەر ئەڵمانییەکان تا هێزەکانیان لە بەرەکانی روسیا بهێڵنەوە. کەمی خۆراک لەناو سوپای ئەڵمانیا بە هۆی گەمارۆکانی دوژمنانی لە دەریاوە حکومەتی ئەڵمانیا ئۆکرانیای وەکو چاوگێکی دەوڵەمەند دەبینی بۆ دابینکردنی خۆراک و کەرەستەی ژیان بۆ سوپا و گەلی ئەڵمانی، بەڵام بۆ دابینکردن و ئامادەکردنی بەرهەمەکانی دانەوێڵە و پێداویستییەکان لە ئۆکرانیا پێویستیی بە ٢٠ تیپی سەرباز هەیە، بۆ مسۆگەرکردنی ئەم ئامانجەی داگیرکردن باشترین گەرەنتییە.

بۆیە دەبینین ئەڵمانییەکان تەنیا بەشێکی کەمی هێزەکانیان لە بەرەکانی روسیاوە بۆ بەرەکانی فەرەنسا گواستۆتەوە، لە کۆتاییدا هیچ گۆڕانێک لە پارسەنگی هێز لە بەرەکان دروست نەبوون، چونکە هاوپەیمانانی ئەڵمانیاش پێویستیان بە هێزی سەربازی هەبوو لە بەرەکانی تری جەنگ، کە لێی بەرپرسیارن. لەم بارودۆخەدا سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانی هەستیان بەو خوێنبەردانە کرد، کە لە ماوەی چوار ساڵی جەنگ خوێنی لێ بەردەبێت، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم زیانانە تەنیا ئەگەر جەنگ لە توانایدابێت ئەنجام بدات، ئەویش لە رێگەی وەشاندنی گورزێکی جەرگبڕ لە هێزەکانی فەرەنسی و بەریتانییە، کە لە باکووری فەرەنسا جێنیشبوونە، بەو لێدانە لەتیان بکات و دەست بەسەر پاریس و کەنارەکانی باکووری فەرەنسیدا بگرێت.

ئەمە را و بۆچوونەکانی (لۆدۆندۆرف) فەرماندەی ئەڵمانی بوو خستیە روو، ئەوکات وتی: "لە ماوەی چوار ساڵ تا ئاستی مردن خوێن لە ئەڵمانیا بەردراوە، لە توانادا نییە بەردەوام بێت تا دەبێتە ساڵی پێنجەم. خەریکە پیاوە ناودارەکانمان تەواو دەبن، بەڵکو هەموو ناودارەکان لە: ئەسپ، کەلوپەل، کیمیایی، کانزا و لاستیک، تا ئێستاش نەمسا و هەنگاریا لە حاڵەتی خوار پێویستی دان، زۆر بە روونی بەرەو نەمان دەچن. هەڵمەتی ژێردەریاوانی هەرەسی هێنا، لە ئەمەریکا تواناکان لەبن نایەن، مرۆڤ رووی زەویان داپۆشیوە، ژێردەریاوانیەکانمان (غواسە) لە توانایاندا نییە لەبەر ژێردەریاوانەکانی ئەمەریکا سەر دەربهێنن، بەڵام دەرگای سەرکەوتن تا ئێستاش لە بەردەممان کراوەیە. ئەوە روسیا لە جەنگ دەرکەوت دەتوانین هێزەکانمان ئاراستەی فەرەنسا جووڵە پێبکەین، دەکرێت بەرەی رۆژئاوا بە ٤٠ بەتالیۆن و ٤٠٠ هەزار سەرباز داپۆشین، دەتوانین سەرکەوتن لە خاڵی بەیەکگەیشتنەوەی هێزەکانی فەرەنسی و بەریتانی وەدەست بێنین، هەردووکیان لە یەک جیاکەینەوە و ئەنجامی جەنگ ببەینەوە. ئەگەر لەمانە سەرکەوتوو بووین، ئەوا هاوکاریەکانی ئەمەریکا ناگەن و هیچ کاریگەریەکیان لەسەر هەڵوێستەکان نابن".

کتومت فەرماندەکانی ئەڵمانی هێرشەکانیان دەست پێکردن لە ماوەی نێوانی ئادار و تەمووزی ١٩١٨ لە چوار لای بەرەی فەرەنسییەوە:

١- لە ناوچەی (سان کانتین) فەرماندەی هێزەکانی ئەڵمانی (لۆدندۆرف) لە هێرشێکدا بۆ سەر بەرەی فەرەنسی هێزەکانی فەرەنسی و بەریتانیی لە یەک جیا کردنەوە،

کە بە فەرماندایەتی (بیتان و هیچ) بوو، پەیوەندیش لە نێوانیاندا زۆر لاواز بوو، کە بووە یارمەتیدەر بۆ ئەوەی لۆدندۆرف بتوانێت سوود لەو پچڕانە وەربگرێت ودەستی باشیان لێ بووەشێنێت. سەرکردەکانی هاوپەیمانان هەستیان بە فرەفەرماندەیی کرد لە سوپای فەرەنسی و بەریتانیی لە یەک مەیدانی جەنگ، بەتایبەت کاتێک ئەم مەیدانە ڕووبەڕووی هێرشێکی بەر بڵاو دەبێتەوە، فەرماندایەتیەکانیان یەکخستن و جەنەرال (فۆش) بوو بە فەرماندەی گشتی بەرەکە لە ئاداری ١٩١٨. ئەم هەنگاوانە زۆر بەخێرا ئەنجام دران، فۆش لەشکرەکانی ئامادە کردن و بە یەک نەخشەی سەربازی جووڵەی پێکردن، توانیی بەرگری بکات و دواتر بەرسنگی هێرشەکانی ئەڵمانی بگرێت و لە نیسانی ١٩١٨وەستاندنی. ئەوەی ڕاستی بێت لەشکری ئەڵمانی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەڵام لەو کاتەوە لەم بەرەیە توانای هێرش و سەرکەوتنی مەزنیان نەما.

٢- لە سەرەتای نیسانی ١٩١٨ ئەڵمانییەکان هێرشێکیان لە بەرەی ئەرمنتیز و لاباس ئەنجام دا لەگەڵ ئەوەی هێزەکانی بەریتانیا نەچار کران بەرەو دواوە بکشێنەوە، بەڵام لەشکرەکەی ئەڵمانی توانای بەدواداچوون و ڕاوەدوونانی نەمابوو، بە هۆی کەمی خۆراک و بێتوانایی سەربازی ئەڵمانییەوە. دواتر ئەم هێرشانە ئەو کاتە ئەنجام دران دوای ئەوەی فەرماندایەتی هێزەکانی فەرەنسی و بەریتانی کەوتە دەست فۆش، چونکە ئەو بە هۆی گردبوونەوەی هێزەکانی فەرەنسی و بەریتانی و کۆمبوونیان لە بەردەستی لە توانایدابوو بەربەرچی هێرشەکانی ئەڵمانیا بداتەوە، بۆیە ئەوەندەی نەبرد تا لەشکری ئەڵمانی هێرشەکانی لەم بەرەیە وەستاندن.

٣- ئەڵمانییەکان لە مانگی ئایار هێرشیان برد و لەشکرەکانیان گەیشتنە (مارن) ، بەڵام وزە و تواناکانیان لەبار چوبوون، دواتر (بیتان) توانیی بەرۆکی هێزەکان بگرێت و بیان وەستێنێت. لەگەڵ ئەوەی ئەڵمانییەکان ڕوبەرێکی زۆریان لە خاکەکانی فەرەنسی دەست بەسەرداگرتبوو، بەڵام ئەمە ئەوپەری تاواناکانی لەشکری ئەڵمانی بوو، دوای ئەمە لە توانای لەشکری ئەڵمانیدا نەبوو تەنیا بەرگریش لە خۆی و لەو خاکانە بکات، کە لەژێر دەستی دابوون.

٤- لۆدندرۆف لە تەمووزی ١٩١٨ چوارەم هێرشی خۆی بەرەو ناوچەی (شمبانی) دەست پێکرد، هێزەکانی ئەڵمانی هێرشێکی تریان کردە سەر (مارن)[٣٣] ، بەڵام (فۆش) دژەهێرشێکی بۆ کردن و وەستاندنی، بەوەندەش وازی لێ نەهێنان راوەدووی نان تا پاشەکشەی پێ کردن. دواتر ئینگلیزەکان هێرشێکی کتوپڕی مەزنیان کردە سەر هێزەکانی ئەڵمانی، بەڵام سوپای ئەڵمانی ئازایەتیان سەلماند کاتێک لە شوێنەکانیان چەقین و زیانێکی یەکجار زۆریان لە هێرشبەران دا و بە دەیان هەزار سەرباز لە دیل و بریندار و کوژراو و بێسەروشوێن مەزندە دەکرێ.

دوائەنجامەکانی ئەم هێرشە ئەڵمانیانە و توانا و بەرگرییە سەرکەوتوانەی سوپای هاوپەیمانان بەم شێوەیە دەبینین:

١- لەشکری ئەڵمانی توانای دووبارەکردنەوەی هێرشەکانیان لەبەر نەمابوو، بەڵام تواناکانی لەشکری هاوپەیمانان لە بەرزبوونەوە دابوو.

٢- کات لە بەرژەوەندی ئەڵمانییەکاندا نەبوو، لەشکرەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی لە خۆئامادە کردن دابوون بۆ هێرشبردن لە هەموو بەرەکان.

٣- خۆڕاگری فەرەنسی – ئینگلیزی و بێتوانایی ئەڵمانییەکان لە بردنەوەی جەنگ بەر لە هاتنی سوپاکانی ئەمریکی بۆ مەیدانی جەنگ رویاندا، دواتر هاتنی لەشکری ئەمریکی بۆ ئەوە نییە لەشکرەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی لەدەست هێزەکانی ئەڵمانیان رزگار کات، بەڵکو بۆ تەواوکردنی سەرکەوتنەکان بەسەر لەشکری ئەڵمانیا دێت.

فەرماندەکانی هاوپەیمانان نەخشەیەکیان دانا بۆ هێرش کردنە سەر بنکەکانی ئەڵمانی لە گەلێک لاوە، دوای ئەوەی هێزەکانی ئەمریکی گەیشتن ئەوە نەما (فۆش) بیر لە نەخشە و پلانی بەرگری بکاتەوە، ئەمە دوای ئەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان لە رووی ژمارەوە بەسەر هێزەکانی ئەڵمانیدا زاڵ بوون، بوونە خاوەنی چەندین تانک و زرێپۆش لە کاتێکدا ئەڵمانییەکان خاوەنی چەند ژمارەیەکی دیار بوون. دوای بەرگریکردنی ئەڵمانی لە هەندێک سوکە هێرش ئەم جارەیان (فۆش) هێرشێکی گشتیی کردە سەر هێزەکانی ئەڵمانیا لە سێپتەمبەری ١٩١٨، لە هەمان کاتدا لەشکرەکانی هاوپەیمانان لە سەرتاسەری سنوورەکانی بەرەی جەنگ لە بولگاریا و شام و عێراق دەستیان بە هێرشبردن کرد،

[٣٣] بە شەڕی مارنی دووەم ناسرا.

بەرگرییەکان لە ئاستی پێویست نەبوون و سستیان پێوە دیار بوو لە بەرەکانی بولگاری و تورکی و نەمسایی و ئەڵمانی. وڵاتەکانی ناوەڕاست داوای ئاگربەستیان کرد، بۆ ئەم وڵاتانە باشتر بوو بۆ ئاگربەست ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ دوژمنەکانیانەوە بکەن. ئەگەر کرا ١٤ خاڵەکەی سەرۆکی ئەمریکی (ویلسۆن) وەکو مەرجی ئاشتەوایی باشترین خاڵی بەیەکگەیشتن بوون، ئەم ڕاگەیاندنەی سەرۆکی ئەمریکی هاندەرێکی باش بوو بۆ وڵاتانی ناوەڕاست تا لەسەر بانگەوازەکەی ئەمەریکا رازی بن باشترین چارەسەرە، کە (کیان) وڵاتی پێ دەپارێزرێت.

لەبەر گرنگی ئەو ١٤ خاڵەی ویلسۆنی سەرۆکی ئەمەریکا لە ئۆکتۆبەری ١٩١٨ خستبوویە بەردەستی کۆنگرێس، لێرە ئاماژە بە ناوەڕۆکی ئەم نامەیە دەدەین:

١- رسواکردنی پەیماننامە نهێنییە نێودەوڵەتیەکە، ئەمەش رێگە بە ئەمەریکا دەدات لە داهاتودا و باس لە هەموو بابەتەکانی پەیوەند بە نەخشەی ئەوروپا و دونیا هەیە بکات دوور لە گۆڕان و پەرەسەندنەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئەو دۆخەی کە پەیماننامە نهێنیەکەی تیا ئیمزا کراوە، کە لەسەر حسابی دۆست و نەیاران لە یەک کاتدا ئەنجام دراوە.

٢- مسۆگەرکردنی ئازادیی دەریاوانی، ئەمەش لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا دەگونجا، کە بوو بە مەزنترین دەوڵەت لە ڕووی بازرگانیی نێودەوڵەتی. بۆیە دەبینین داوا دەکات ناوبڕە ئابوورییەکانی نێوان وڵاتانیش لاببردرێت لەگەڵ یەکسانی لە دەرفەتی بازرگانیدا، چونکە کارێکی سوودبەخشی ئەم بوارەیە.

٣- داواکرا کۆمەڵەیەی نەتەوەکان (عصبە الامم) دابمەزرێت، ئەرکی سەرپەرشتیکردنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتان و پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی بێت، کە ببێتە رێگر لە بەردەم نانەوەی ئاژاوە و هەڵگیرساندنی جەنگێکی تری خوێناویی لەم چەشنەی کە روویدا.

٤- داوای کەمکردنەوەی چەک کرا، ئەم داوایە بەبێ وردەکاری پێشکەش کرا بێ ئەوەی باس لە چەند و چۆن و چ جۆرە چەکێک کەم بکرێتەوە. دواتر هەر چۆنی چەک کەم کرێتەوە دواپین وتە هەر هی وڵاتە مەزنەکان دەبن، چونکە ئەوان خاوەنی زۆرترین چەک و بەهێزترین چەک دەبن.

٥- سەبارەت بە وڵاتە بەزیوەکان چەند بنەمایەک دانران بۆ کشانەوە لە بەلژیک و فەرەنسا و رادەستکردنەوەی ئەلزاس و لۆرین و رۆمانیا و سرب و مۆنتنیگرۆ (چیای رەش) و رەچاوکردنی مافی نەتەوەکان لە یەکلاکردنەوەی کێشەی بەلکان، ناوچە ئیتالییەکانی ژێر دەسەڵاتی نەمسا بخرێنەوە سەر ئیتالیا، پێدانی مافی چارەی خۆنووسین بەو نەتەوانەی پادشانشینی دووقۆڵی و دەوڵەتی عوسمانی لێی پێکهاتوون، بە ئازادکردنی هاتووچۆ لە بەنداوەکان راسپاردرا دەوڵەتی پۆلۆنیا دروست بکرێت.

بنەماکانی مافی چارەی خۆنووسین و یەکلاکردنەوەی کێشەکانی ئەورووپا لەسەر بنچینەی رێزگرتن لە نەتەوەکان، مەزنترین هاندەری رازیکردنی حکومەتەکانی ناوەڕاست بوون، تا بڕوا بە نیازپاکی وڵاتە دوژمنەکان بکەن بۆ ئەوەی لە نیازپاکی و میانڕەوی ئەوان دڵنیا بن. بەتایبەتی کە لە ئەورووپا پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاو ببووەوە، کە ئەم رێککەوتنە پەیمانی ئاشتەوایی نییە، بەڵکو پیادەکردنی چواردە بڕواکەی ویلسۆنە. گوایە بەزینە سەربازییەکانی وڵاتانی ناوەڕاست بوونە هۆی داوا کردنی ئەم ئاگربەستە .

## ١ - بولگاریا:

مەزنترین کێشەی بولگاریا ئەوە بوو، کە لەناو وڵاتانی بەلکان خۆشەویست نەبوو، هێزەکانی بەریتانی و فەرەنسیش سالۆنیکایان کردبووە بنکەی هێزەکانیان و داڵدەدانی هێزە بەرهەڵستکارەکانی بولگاریا و بەلکان. لەگەڵ ئەوەی رۆمانیا، کە هەردەم لە دواوە هەڕەشەی لە بولگاریا دەکرد، لە ١٩١٨/١٩١٧ سەرکوت کرابوو، بەڵام تواناکانی سوپای بولگاری لە ئاست تواناکانی سوپای ئینگلیز نەبوو لە بەلکان. دواتر ساڵی ١٩١٨/١٩١٧ ساڵێک بوو هاوپەیمانانی بولگاریا لە توانایاندا نەبوو هاوکاریی بکەن، ئەگەر کەوتە رەوشێکی نالەبارەوە وەکو ئەو هەڵوێستەی بەر لە ئێستا رویدا بوو. زیرەکی سەرکردایەتی هاوپەیمانان و توانایان لە داڕشتنی نەخشەی سەربازی - لە دانانی فرانشیە دیسبیریە - لەو ئاستەدابوو، کە لە هێرشێکی کتوپڕدا بۆ سەر لەشکری بولگاری گیانی بەرخۆدانیان لێ بڕوخێنێت.

لەناو ریزەکانی سەرکردایەتی سوپای بولگاری گیانی رێککەوتن لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیمان هەبوو، دوای ئەوەی دڵنیا بوون، کە سەرکەوتن بەشی هاوپەیمانانە. بە ئومێدی

ئەوەی هاوپەیمانەکان لە تۆڵەی هەڵوێستی بولگاریا میهرەبان دەبن، بەتایبەت لە تۆڵەی دەرچوونی بولگاریا لە ریزی هاوپەیمانەکانی، ئەوەی هانی بەرپرسە بولگاریەکانیدا پەیوەندییەکانی کۆنسولی ئەمریکی بوو لە سۆفیا. دوای پەیوەندییەکی کورت لە ٢٩ی سێپتەمبەری ١٩١٨ ئاگربەست راگەیەندرا، بەڵام مەرجەکانی هاوپەیمانان میهرەبان نەبوون، توند و بێبەزەییانە بوون:

ا/ بڵاوەپێکردنی (تسریح) سوپای بولگاریا و دەستهەڵگرتنی لە ئامێر و جبەخانە سەربازییەکانی.

ب/ دەرکردنی ئەڵمانییەکان لە بولگاریا.

ج/ هێزەکانی هاوپەیمانان هەموو شوێنە ستراتیجییەکان داگیر بکەن جگە لە پایتەخت.

ئەم خۆوەدەستدانەی بولگاریا مەترسیی لەسەر تورکیا و پادشانشینی دووقۆڵی دروست کرد، بووە کارئاسانی بۆ گەمارۆدان و لەناو بردنیان. دواتر بە دەرچوونی بولگاریا لە جەنگ دوایین ئومێدی ئەڵمانیا تیا چوو، کە بتوانێت لە هەموو بەرەکان خۆڕاگرانە بەرگری بکەن، ئەمە بووە هۆی رووخانی ورەی سەرکردە ئەڵمانییەکان.

## ٢- تورکیا:

تواناکانی تورکەکان لە خۆڕاگری بەرانبەر بە سوپای ئینگلیز لە بەرەی (عێراقی باشوور) و (فەلەستین) سنووردار بوو، هەڵگیرسانی شۆڕشی عەرەبی لە ١٩١٦ بە سەرۆکایەتی ئەلشەریف حوسێن کوری عەلی لە عەرەبستانی سعودی و بە هاوکاری ئینگلیز مانای وایە شوێنەکان لە بەردەم سوپای تورک بەرتەسک بوونەوە، ئەو خاکانەی تورکی لەسەر بوو بوونە خاکی دوژمن، هێزەکانی تورک لە یەمەن و شام و حیجاز بە هۆیەوە لە یەک جیاکرانەوە.

ئەگەر ساڵی ١٩١٧ ساڵی ئامادەباشی بێت لەلایەن ئینگلیزەوە بۆ هێرشکردنە سەر هێزەکانی تورک لە بەرەکانی عێراق و شام، ئەوا هەوڵەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ وەدەرنانی وڵاتانی عەرەبی لە جەنگ، کە لە تەک ئینگلیزدا بوون، بەفیرۆ چوو، سەرەڕای بڵاو کردنەوەی پەیماننامەی سایکس – بیکۆ، کە تیایدا وڵاتانی عوسمانیی عەرەبی لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیادا دابەش کردووە.

هێرشەکانی ئینگلیز بۆ سەر عێراق و شام سەرکەوتوو بوون، عەقەبە لە ١٩١٧/٧/٦ و قودس لە ١٩١٧/١٢/٩ لەدەست دران. دەبینین دیمەشق لە یەکەمی ئۆکتۆبەری ١٩١٨ دەڕوخێت و دواتر بەیروت و دوای ئەوە بە هۆی پشێوی و ئاژاوەی ناوخۆ هێزەکانی تورکی تا تورکیا پاشەکشە دەکەن. دوای ئەوە بەغدا دەڕوخێت لە ئاداری ١٩١٨ هێزەکانی ئینگلیز هێرش دەبەن تا لە موسل نزیک دەبنەوە، ئەو کات بولگاریا خۆی وەدەست دابوو .ئاسیتانەش لەژێر هەڕەشەدابوو، ئیتر حکومەتەکەی لە نۆڤەمبەری ١٩١٨ داوای ئاگربەستی کرد، دوای ئیمزاکردنی ئاگربەستەکە ئینگلیز دەستی گرت بەسەر موسڵدا، کە لە ئاییندە دا بووە مایەی دروستبوونی کێشە.

## ٣- پادشانشینی دووقۆڵی:

ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا لە کاتی شەڕەکانی (ڤینیتۆ) کاتێک بەزین لەم شەڕە، لەوساوە چاوشکێن بوون و روویان لە شەڕی بەرگری کرد، ئەوساش هاوپەیمانان هێرشیان دەبردن. کاتێک بولگاریا خۆی دەداتە دەست، پادشانشینی دووقۆڵی ناچار دەبێت لە پتر لە یەک بەرە شەڕ بکات. ئەمە دەرفەتێک بوو بۆ ئەوەی نەتەوەکان شۆڕش بکەن و کۆببنەوە بەتایبەتی کاتێک حکومەتی ئەمریکی ١٤ بنەماکانی راگەیاند نەتەوەکان کەوتنە خۆ، پادشانشینی دووقۆڵی پەرتەوازە بوو، ئەو نەتەوانەی لە سلاڤییەکان بوون حکومەتەکان هاوکاریان کردن، بەم شێوەیە ئیمپڕاتۆریەت لە ٣ی نۆڤەمبەری ١٩١٨ ناچار دەبێت داوای ئاگربەست دەکات.

## ٤- خۆوەدەستدانی ئەڵمانیا:

هێزە هێرشبەرەکانی ئەڵمانی توانای لێدان و شەڕیان نەمابوو، سوپاکانی ئەڵمانی لە بەرانبەر هێزەکانی هاوپەیمانان تەنیا بەرگری و پاشەکشەیان بۆ مابووەوە، شپرزەیی لەناو فەرماندە ئەڵمانییەکان پەرەی سەند، بێزاری لە ریزی بەرەکانی ناوخۆ بڵاوبووەوە. هێزە دەریاوانەکان، کە ماوەیەک بوو لە کاتی شەڕی جتلاند لە ١٩١٦ەوە بێکار ببوون، جێبەجێکارە جووەکان هانی هێزی مانگرتوو و یاخیبووانیان دەدا، بێزاری و قاتوقری و بێکاری سەرتاسەری وڵاتی گرتەوە، فەرماندەکان ناچار بوون بە پشتبەستن بە ١٤ بنەماکانی ویلسۆنی سەرۆکی ئەمەریکا و بەتایبەتیش (مافی چارەی خۆنووسین) داوای

ئاگربەســـــــــــــــــــــت بکـــــــــــــــــــــــەن.

فەرماندەکانی ئەڵمانیا وایان مەزندە دەکرد، کە ئاگربەست ئیمزادەکرێت و هێزەکان و حکومەتەکەیان بۆ دەمێنێتەوە، بەڵام ویلسۆن مەرجی توندی بۆ ئاگربەستەکە دانان، کە بریتی بوو لە دەستهەڵگرتنی کاربەدەستانی حکومی و فەرماندە سەربازییەکان. ئەوانەی سەردەمی جەنگ لەسەر کار بوون، دەست لە کار بکێشنەوە و ڕێگە بە دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراتی بدەن، کە کاروباری وڵات بگرێتە ئەستۆ تا تێگەیشتن لەسەر ڕێککەوتنی ئاشتەوایی لەگەڵ دیموکراتیەتی ڕۆژئاوای سەرکەوتوو بکات. ئەوەی ویلسۆن داوای کرد جێ بە جێ بوو، ئیمپڕاتۆر دەستی لە کار کێشایەوە و رایکردە دەرەوەی وڵات، سەرکردە سەربازی و سیاسییەکان دەستیان لە کار کێشایەوە و بە پراکتیکی ئاگربەست لە ١١ی نۆڤەمبەری ١٩١٨راگەیەندرا.

دوای ئەوەی هاوپەیمانان سەردەکەون و نەخشەی ئەوروپا چی بەسەردێ ؟ ئاراستەی سەرکردەی وڵاتانی سەرکەوتوو لە پەیماننامەی ئاشتەوایی چی دەبن؟ ئەمانە لە داهاتوودا بە وردی دێینە سەر باسکردنی.

# بەشی سیانزەهەم

## ئەنجامەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی

- کۆنگرەی ئاشتەوایی
- کۆمەڵەی نەتەوەکان
- ئەنجامە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان
- ژیانەوەی بیرۆکەی دەوڵەتی تۆتالیتاری

## کۆنگرەی ئاشتەوایی ١٩١٩

پاریس وەکو بارەگای کۆنگرەی ئاشتەوایی هەڵبژێردرا، بۆ ئەم هەڵبژاردنە هەندێک نیشانەی سیاسیی دیار هەبوون، لەسەروی هەموویان:

١- بانگخوازی هەبوو بۆ ئەوەی سویسرا بکرێتە بارەگای کۆنگرەی ئاشتەوایی، گوایە دەوڵەتێکی بێلایەنە، بەڵام سەرۆک ویلسۆن پێی باش بوو پاریس بکرێتە بارەگای کۆنگرە، چونکە ئەوسا پاریس پڕی بوو لە هێزە ئەمریکییەکان.

٢- فەرەنسا لە هەموو وڵاتە هاوپەیمانەکان زیاتر لەم جەنگە زیانی پێ کەوتبوو لە ڕووی گیانی و ماڵی و خاپوو ربوونی دام و دەزگا و کارگە و کانزاکانی، ئەم زیانانە تەنیا لە ئەنجامی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان پێی نەگەیشتبوون، زۆربەیان کاتی کشانەوەی هێزەکانی ئەڵمانی لەدوای خۆیان کاولیان دەکردن. لەم روانگەیەوە فەرەنسا لە هەموویان زیاتر شایستەی ئەوەبوو ئەم کۆنگرەیە لەوێ ببەسترێت، بە پێوەری ئەوەی فەرەنسا مەزنترین خۆبەخشکاری دادپەروەرییە.

٣- بە هەڵبژاردنی پاریس وەکو بارەگای کۆنگرە، کلمەنسوی (پیرەپیاو) بۆی دەبێت سەرپەرشتی کۆنگرە بکات، ئەمەش کێشەی سەرۆکایەتی کۆنگرە چارەدەکات.

٤- بوونی کۆنگرە لەناو پاریس دەنگی فەرەنسییەکان باشتر دەبیسترێت.

بە هۆی سووربوونی ویلسۆن سەرۆکی ئەمەریکا لە خوێندنەوەی وتارەکەی لەناو کۆنگرێس کۆنگرەکە کەمێک دوا کەوت، دیارە کە رەوشی بەریتانیاش ئەوسا ئەوەی دەخواست کۆنگرە دوا بخرێت. (لویدجورج) سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێ هەڵبژاردنی دیموکراتیانە لە بەریتانیا ئەنجام بدرێت، ئەگەر بەرنامەکانیشی لە کۆنگرە سەرکەوتن، هەردەبێت ئەم هەڵبژاردنە ئەنجام بدرێت. ئەم کاتێک بۆ کۆنگرە دەچوو پشتەستور بوو بە جەماوەر و پەرلەمان بەتەواوەتی، چونکە ماوەی هەشتساڵی بەسەردا چووبوو بەریتانیا هیچ هەڵبژاردنێکی نەکردبوو، بۆیە ئەم هەڵبژاردنە لە دێسەمبەر ئەنجام درا.

لەم هەڵبژاردنە بانگەوازی لەسێدارەدانی قەیسەری ئەڵمانیا بەرز بوونەوە لەگەڵ سەپاندنی سزای قەرەبوو بەسەر ئەڵمانیادا، بۆ بەدبەختی ئەڵمانیا ئەو ماوە دواییەکانی جەنگ کارەساتی مرۆیی هاتنە رێ، لەوانە ژێردەریاوانەکانی ئەڵمانی پاپۆری پۆستی ئیرلەندا، کە چەندین ژن ومنداڵی تیابوو، ژێرئاویان کرد و نزیکەی ٤٥٠ ژن و منداڵ و

پیاو تیاچوون. ئەم کارەساتە رق و کینەی زۆری لە دڵی بەریتانیەکان دژی ئەڵمانییەکان دروست کرد، ئەم کارەساتە نارەزایی و داخوازییەکانی خەڵکی زیاد کرد بۆ سزادانی ئەڵمانیا لە تۆڵەی ئەم کارە درندانەییەی.

یەکەم بەستنی کۆنگرە لە ١٨ی جەنیوەریی ١٩١٩بەسترا، پەیماننامەی ڤێرسای لەگەڵ ئەڵمانیا لە ٢٨ی تەمووزی ١٩١٩ ئەنجام درا، کە دەیکردە یادی پێنجەمی ڕووداوی (سەراییڤۆ). دوایین دانیشتنی کۆنگرە لە ٢٠ی جەنیوەریی ١٩٢٠بوو، دوای ئەوە ڕێککەوتننامەی ئاشتەوایی لەگەڵ هەریەک لە هەنگاریا و تورکیا ئەنجام درا، ڕێککەوتە یەکلایەنیەکانی ئەمەریکا لەگەڵ ئەڵمانیا لە ٢٥ی ئابی ١٩٢١ کۆتاییان پێ هات، لەگەڵ تورکیاش (پەیماننامەی لۆزان)، کە لە تەمووزی ١٩٢٣ بەسترا، بە پراکتیکی لە ئابی ١٩٢٤ جێ بە جێ کرا.

بەڕاستی ماوەی بەستنی کۆنگرەکە درێژەی کێشا، هەروەها ماوەی ئیمزاکردنی پەیماننامەکانیش درێژەیان کێشا، ئەمە بە هۆی ئاڵۆزیی و کەڵەکەبوونی بابەتەکان لەسەر مێزی کۆنگرەوە بوو، سەرەڕای ئەوەی کە بابەتەکان هەموویان هەستیار و پڕ کێشەی ئاڵۆز و لەیەکبەستراو بوون، بۆ چارەسەرکردنیان دەبووایە لێکۆڵینەوە و گفتوگۆی زۆریان لەسەر بکرابا، تا هەموو لایەک دەکەوتنە ڕێککەتن لەسەری. ئەمەو زۆری ئەندامانی کۆنگرەکە، کە نزیکەی حەفتا نوێنەری تیادا بەشدار بوو، کارەکانی زیاتر ئاڵۆز کردبوو.

لە بنەڕەتدا کۆنگرەکە بۆ دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و دەوڵەتە بەشداربووەکان بوو[٣٤] بوو، بەڵام وڵاتی نوێش دواتر کەوتنەناوی، وەکو چیکوسلۆڤاکیا و پۆڵەندا، هەروەها نوێنەری دەزگا و دەستەی کاریگەر لە جەنگ ئامادەی ئەم کۆنگرەیە بوون، وەکو: عەرەب، لوبنانی، میسری، کورد، ئەرمەن، زایۆنی، کۆرییەکان، روسیای سپی و ئیرلەندییەکان.

ئەو دەوڵەتانەی نەدەبووایە بەشداری بکەن لە هەمەجۆر پێکهاتبوون:

١- دەوڵەتە بەزیوەکان.

٢- روسیا.

---

[٣٤] بریتی بوون لە کوبا، بەرازیل، پەنەما، گواتیمالا، نیکەراگوا، هندوراس، سیام، چین، لیبیریا و هەندێک دەوڵەتی تر هەبوون، کە پەیوەندیان لەگەڵ وڵاتانی ناوەراست پچراندبوو و بەشداریان لە ئیمزاکردنی پەیماننامەکان کرد

٣- دەوڵەتە بێلایەنەکان.

بێگومان ئامادە نەبوونی وڵاتە بێلایەنەکان کەموکوریەکی مەترسیدار بوو، چونکە ئەم وڵاتانەش بەدەست کارەساتەکانی جەنگیانەوە ناڵاندبوو، دەبووایە بۆ نەخشەی داهاتووی ئەوروپا گوێ لە دەنگی ئەوانیش بگیرێت.

دوورخستنەوەی روسیا لە کۆنگرە بە هۆی ئەوەبوو لە خۆیەوە لە جەنگ دەرچووبوو، ئەمە بۆ وڵاتانی هاوپەیمان سوودی زۆری هەبوو، توانیان بە پێی بەرژەوەندییەکانیان لە ئەوروپای رۆژهەڵات بازنەیەک لە دەوری روسیا بکێشن بۆ ئەوەی کشانی کۆمۆنیستی سنووردار بکەن و رێگە لە بڵاوبوونەوە و هاتنی بۆ ناو ئەوروپا بگرن. بەڵام ئامادەنەبوونی ئەڵمانیا و سەپاندنی پەیماننامەی ڤێرسای بەسەر کۆماری ئەڵمانیای نوێدا دەرفەتێک بوو بۆ سەرکردە نوێکانی ئەڵمانیا بۆ ئەوەی دواتر لە پەیماننامەیەک پاشگەز ببنەوە، کە ئەوان رۆڵیان لە ئامادەکردنیدا نەبووە.

بۆ دابەشکردنی ژمارەی ئەندامانی کۆنگرە بەسەر دەوڵەتاندا رێگەیەکی ئاڵۆزیان گرتبووە بەر، ئاسایی بوو وڵاتە سەرکەوتووەکانی مەزن بە ژمارەیەکی مەزنەوە بەشداری لە کۆنگرەکە دەکەن، ئەمەریکا، فەرەنسا، بەریتانیا، ئیتاڵیا و ژاپۆن هەریەکەی بە ٥ ئەندام بەشدار دەبوون، بۆ بەلژیک و بەرازیل و سربیا هەریەکە و ٣ ئەندام، وڵاتەکانی تریش هەریەکە و یەک ئەندامی دەبێت.

ئەم هەموو نوێنەرانە 3/4ی دانیشتووانی دونیایان پێک دەهێنا، بۆیە دەتوانین بڵێین کۆنگرەی ئاشتەوایی پاریس یەکەم کۆنگرەی ئاشتەوایی جیهانی بوو، بە رەچاوکردنی ئەوەی چارەنووسی بڕیارەکانی ئەم کۆنگرەیە بەدەست ٥ وڵاتە مەزنەکە بوو.

کاتێک دەست بە کارەکانی کۆنگرە کرا، چارەنووسی وڵاتە بەزیوەکان و رەوشی وڵاتە بێلایەنەکان و دەسکەوت بۆ وڵاتە سەرکەوتووەکان بە دەست سێ کەسەوە بوون:

١- کلمەنسو.

٢- لوید جۆرج.

٣- ودرو ویلسۆن.

ڕاستە ئیتاڵیا و ژاپۆن لە پێنج دەوڵەتە مەزنەکە بوون، بەڵام ژاپۆن لە کۆنگرەی ئاشتەوایی پاریس رۆڵی کەمی هەبوو. لەبەر گرنگی رۆڵی کەسایەتی و دەوڵەتیی

هەریەک لە بەشداربووان بە پێویستی دەزانین لەم رووەوە توێژینەوەیەک بکەین بۆ ئەوەی لە توانا و زیرەکی هەریەک لە بەشداربووان ئاشنا بین، با لە لاوازترین کەسەوە دەست پێ بکەین:



ڤیتۆریا ئۆرلاندۆ

## ا/ ئۆرلاندۆ

ڤیتۆرا ئۆرلاندۆ لە ناخۆشترین بارودۆخی ئیتاڵیا پۆستی سەرۆکوەزیرانی [35] وەرگرت، کە دوای کارەساتی (کپۆریتۆ) بوو، توانیی تا سەرکەوتنی دوایی کارەکان زۆر بە توانایی ببات بەڕێوە. بەڵام رەوشی ناوخۆی ئیتاڵیا بە هۆی ناویفاقیی نێوان پارتەکان ئەم بوارەی پێنەدەدا، کە دەستی لە هەموو بڕیارەکان کراوە بێت. دواتر ئیتاڵیا لە هەموو وڵاتێک زیاتر کەوتبووە ژێر باری قورسی کارەساتەکان، چونکە لە رووی پیشەسازیی بەرتەسک بوو و لە رووی کەمی کەرەستەی خاویش کەمیی هەبوو. ئەمەو پەرلەمانەکەی لە توانایدا نەبوو بڕیار لەسەر دۆزە گرنگەکان بدات، حکومەت رووبەڕووی هێرش و رەخنەی چەپڕەو و ڕاستڕەوەکان بووەوە، خۆنیشاندان و مانگرتن زۆربەی

---

[35] ئەوسا پادشای ئیتالیا ڤیکتۆر عەمانۆئیلی سێیەم بوو.

ناوچەکانی وڵاتی گرتەوە. تێروانینی دووریان بۆ سەرکەوتنەکانی وڵاتەکەیان هەبوو، لەخۆباییبوونی ئیمپراتۆری ئیتاڵیا و خۆبەزلزانینەکانی گەلی ئیتاڵی لە ئاستی وڵاتە مەزنەکاندا بوو، ئۆرلاندۆ لەناو کۆنگرەی ئاشتەوایی هەستی بە لاوازی هەڵوێستەکانی خۆی دەکرد بۆ وەدەستهێنانی دەستکەوتی مەزن لە کۆنگرەی ئاشتەوایی لەژێر فشاری جەماوەری و سیاسەتی وندا بوو.

دواتر پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەڤاڵانی (کلمەنسو، ویلسۆن و لوید جۆرج) باش نەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ لایەنی ئەمریکی و فەرەنسی، کلمەنسو بە هۆی ڕۆڵە لاوازەکەی لە جەنگ رقی لە ئیتاڵیا بوو، ویلسۆن مەبەستی نەبوو مافی تەواوی پێبدات و ڕاستگۆ نەبوو لەگەڵی. لوید جۆرجیش سۆزێکی ئینگلیزیانەی بۆ هەبوو، بەڵام بەبێ گفت پێدان، هۆکاری ئەم هەڵوێستانە سۆزداری نەبوون هەموویان دەرەنجامی پێداویستیەکانی ئاسایشی فەرەنسا و ئینگلیز بوون.

ئیتاڵیا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی ببووە ئیمپراتۆر، موستەعمەرەکانی دراوسێ بوون لەگەڵ موستەعمەرەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی لە باکووری ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی، دواتر ئەم دوای دۆڕانەکانی ئەڵمانیا و پادشانشینی دووقۆڵی لە ناوەوەی ئەوروپا بوو بە دەوڵەتی مەزن لە دوای فەرەنسا. بەم پێوەرە بوو بە خاوەنی تایبەتمەندیی ستراتیژی، کە دەتوانێت دەستێکی بگاتە ناو هەموو ئەوروپا و دەستەکەی تری بگاتە باکووری ئەفریقیا، بە هەموو حاڵەتێک (ریفییرا)ی فەرەنسی درێژبوونەوەی ئیتاڵیایە و سقلیەش کەوتۆتە سەر ڕێگای نێوان فەرەنسا و شام، کە بە پێی پەیماننامەی سایکس - بیکۆ لە ١٩١٦ بەر فەرەنسا کەوتبوو، لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین هەڵوێستە توندەکەی کلمەنسۆ بەرانبەر بە ئۆرلاندۆ و (سۆنینۆ)ی جێگری لە کۆنگرەشی بەکینەوە و لێی تێبگەین.

ناوێفاقییەکانی نێوان نوێنەرانی ئیتاڵیا و سێ وڵاتە مەزنەکان زیادیان کردن و بووە هۆی ئەوەی ژێر بە ژێر ئیتاڵیا ڕێککەوتنێکی نهێنی لەگەڵ وڵاتانی (ویفاق) ئیمزا بکات، کە بووە مایەی ناڕەزایی سەرۆکی ئەمریکی ویلسۆن لە کۆنگرەی ئاشتەوایی. هەندێک لەم ڕێککەوتنانە ڕێزیان لە مافی نەتەوەکان نەدەگرت، یەکێک لەو ڕێککەوتنانەی لەگەڵ وڵاتانی (ویفاق) ئیمزاکرا ڕێگەدان بە فراوانبوونی وڵاتانی (ویفاق)

لە خاکەکانی بەلکان بێ گوێدانە رەگەزی دانیشتووانەکان دەدا. بۆیە لەلایەن ویلسۆن و کلمەنسۆ نارەزایی لێکەوتەوە، ئۆرلەندۆ وەکو دەربڕینی نارەزایی هۆڵی کۆنگرەی جێهێشت و (سۆنینۆ)ی لە شوێن خۆی دانا وەکو نوینەری وڵاتەکەی.



کلمەنسۆ

## ب/ کلمەنسۆ

بەهێزترین و زیرەکترین و توندترین کەسی چوارمەزنەکە بوو، تەمەنی لە هەشتا ساڵی نزیک کردبوو، بێ ئەوەی بەرهەڵستکارانی سیاسەتەکەی کاری تێبکەن و ماندوی کەن شێوازێکی بەهێزی هەبوو لە مامەڵە کردن. قسەزان بوو، لەگەڵ بەرهەڵستکارەکانی کەم نیان بوو، ورەی بەر نەدەدا تەنانەت ئەگەر ناحەزەکەی توند و رشت و بەهێزیش بووایە، وەکو ویلسۆنی سەرۆکی ئەمریکی یان سیاسەتمەداری پێگەیشتووی ئەوروپا لوید جۆرج. ئەزمونی کەسایەتی و سیاسیی ناوخۆ و ئەوروپی و جیهانیی زۆربوو، لەم رووەوە دەوڵەمەند

و خاوەن ئەزمون بوو، لە هەموو دۆخەکانی وڵات و جیهان ئەزمونی هەبوو، لە ١٨٧٠ - ١٨٧١ لە فەرەنسا رسوایی بە چاوی خۆی بینی. لەدەستدانی دەرفەتەکانی گەلی فەرەنسی لە حەفتاکان و هەوڵە نەزۆکەکانی حکومەتی فەرەنسی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم قەیرانانەی هەست پێ کردبوو، تا ئەو کاتەی هەڵسایەوە سەرپێ و ئەوسا بەرانبەر بە ئەڵمانیای زەبەلاح وەستا. دواتر وەستانە پاڵەوانیەکەی فەرەنسا بەرانبەر بە هێرشە کتوپڕیەکانی ئەڵمانیا لە سەرەتای جەنگ، دواتر ئەم گەلە قارەمانە بەرانبەر بە داگیرکردنی خاک و ئازار و ئەشکەنجە و خەبات و خۆبەختکردنەکان و خاپووربوونی کشتوکاڵ و لەناوبردنی ڕۆڵە مەدەنی و سەربازییەکانی جوامێرانە دانیان بە خۆدا گرت و بەرگەیان گرت.

بە چاوێکی پڕ لە حەسرەت و پەژارەوە سەیری ئیمپراتۆریەتی بەریتانیای دەکرد، کە لە رووی سامان و سەروەت چەند لە فەرەنسا بەتواناتر و دەوڵەمەندترە، ئەوساش لە ڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی بە قەدەر فەرەنسا لە رووی ماڵی و گیانی زیانی پێنەگەیشت. لەگەڵ ئەمەش بە چاوی چارەنوس و داهاتووەوە سەیری ئاسۆی فەرەنسای دەکرد، دوو مەترسیی مەزنی بەدی دەکردن، هەردووکیشیان لە دۆستانیەوە بوون ئەوانیش: بەریتانیا و ئەمەریکا بوو، ئەمە دەبێت مەترسییەکانی ئەڵمانیاش بەدوور نەزانێت ئەگەر مەرج نەخاتە سەر جموجۆڵەکانی سەر سنووری. بەڵام کلمەنسۆ هەستی بەوە دەکرد، کە ویلسۆن بایەخ بە مەترسیەکانی فەرەنسا نادات و لوید جۆرجیش مەبەستی بوو هەمان گەمە لاساییەکەی بەریتانیا بکات، کە بریتییە لەوەی فەرەنسا ترسی لە ئەڵمانیا هەبێت بۆ ئەوەی بەریتانیا بە تاکڕەوانە دەست بەسەر زۆرترین موستەعمەرەکانی ئەڵمانی و دەوڵەتۆکەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بگرێت، تا بتوانێت گەمە بە هەموو لایەنەکان بکات بۆ ئەوەی دەستکەوتی زیاتر بۆ خۆیان وەدەست بێنن.

کلمەنسۆ دەستی لەگەڵ هەموو کێشە ئەوروپییە دیار و شاراوەکاندا هەبوو و لە هەموو گەمە سیاسییەکان، کە سیاسەتمەدارانی بەریتانی پەیڕەویان دەکرد، شارەزا بوو. زانینی زمانی ئینگلیزیی کارئاسانی بوو بۆ فێربوونی ئەم گەمانە، کلمەنسۆ تاکە کەس بوو لەنێو سێ سەرکردە مەزنەکە هەرسێ زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی بزانێت. بە هۆی واقیعبینییەوە لە فانتازیی ویلسۆنی بردبووەوە، لە سامی ئەمەریکای کەم کردبووەوە،

ئەم بلیمەتیەی وای کرد خۆی و لوید جۆرج ببنە وێنەکێشی نەخشەی ئەورووپا و رۆژهەڵاتی ناوەراست تا دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی.

بۆیە کلمەنسۆ لە وتوویژ و مشتومڕەکانی لەگەڵ ویلسۆن و لوید جۆرج توند و وشک بوو، ئەمە بووە مایەی بێئومێدی لە رەفتاری مرۆڤانە و زاڵبوونی بیری خۆپەرستیی فەرەنسی بەسەریاندا.

لایەنێکی کەسی هەبوو، کە کاری کردبووە سەر ئاراستەکردنی کۆنگرە بەرەو سیاسەتێکی دیار، (کلمەنسو) دەیەویست بە سەرکەوتنێکی نەتەوایەتیی مەزنەوە لەم کۆنگرەی ئاشتەواییە کۆتایی بە ژیانی بێنێت. وا بیری دەکردەوە کە رای گشتی بۆ دژایەتیکردنی ئەڵمانیا لەگەڵیەتی، دەرفەتیش لەبارە بۆ ئەوەی فەرەنسا ببێتە خاوەن سنوورێکی ئارام و پارێزراو، هیچ دەوڵەتێکی ئەورووپیش شک نابات هەرەشە لە فەرەنسا بکات، دیسان فەرەنسا ماوەیەکی زۆری لە ترس و دڵەڕاوکێ بەسەر برد ئێستاش نۆرەی ئەوەیە بە ئارامی و دوور لە ترسی سنووربەزاندن بژی.

فەرەنسا داوای زۆری دەکرد، بەڵام بەبێ زیادەرۆیی، سەرەکیترینیان ئەمانە بوون:

١- سار:

سنووری سار بگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ١٨١٤/١٨١٥، ئەم داخوازیەی فەرەنسا بووە مایەی مشتومڕ لە نێوان کلمەنسۆ و لوید جۆرج. لوید جۆرج فەرەنسای ئاگادار کردەوە، کە کێشەیەکی تری وەک ئەلزاس و لۆرین دروست نەکات. لە لایەکی تریش ئەمەریکا ئەمەی بە زیادەرۆیی لە چوارچێوەی ١٤ بنەماکەی ویلسۆن دایە قەڵەم[٣٦] ، بە گوێرەی بڕواکان سنووری سار دەبێت بکەوێتە ناو خاکی ئەڵمانیا.

٢- سەرپەرشتیکردنی کەناری چەپی ڕووباری ڕاین:

مەبەستی فەرەنسا لەم داوایەی دروستکردنی ناوچەیەکی دابڕاندنی سنوورەکانی فەرەنسا بوو لەگەڵ ئەڵمانیا، ئەگەر نەیکاتە ناوچەیەکی چەک داماڵراو بە سەرپەرشتیکردنی ئەم ناوچەیە ئەڵمانیای لێ دادەبڕێت، بەم دابڕانەش ئەڵمانیا زۆر لە چاوگە پیشەسازییەکان لەدەست دەدات، کە بە هۆی جەنگەوە کەمیان تێ کەوتبوو.

[٣٦] بنەماکانی چارەسەری کێشە نەتەوایەتییەکان

٣- موستەعمەرەكان: داوای پانتاییەكی زۆری لە موستەعمەرەكانی ئەڵمانی و دەوڵەتی عوسمانی دەكرد، لە رێككەوتننامەی سایكس- بیكۆ دابەشكردنی موستەعمەرەكان دیار كرابوو عێراق و شام لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا دابەش كرا، بەڵام بەریتانیا سستیی دەنواند بە بیانووی ئەوەی سەربازەكانی بەتەنیایی دەستیان بەسەر ئەو ناوچانەدا گرتووە، بەڵام دواتر لەگەڵ فەرەنسا سازشێكیان لەسەر كرد.

لەم كارانە بۆمان دەردەكەوێ دانوستانەكان لە نێوان كلمەنسۆ و هاورێكەی لوید جۆرج چەند توند و ئاڵۆز بوون، هەروەها لەگەڵ ویلسۆنی خەیالخواز دا.

## ج/ لوید جۆرج

سیاسەتمەدارێكی دروەشاوە بوو، بە هۆی ئەزموونی لە كاری پارێزەری ببووە پادشای دەمەقار و مشتومڕانێ، لە گفتوگۆ سیاسیەكاندا سەركەوتوو بوو، شارەزایی لە دانیشتنەكانی پەرلەمان و كاری وەزیری و سەرەدەریی لە كاروبارەكانی ناوخۆ وایان لێ كردبوو بلیمەتانە لە هەموو كارەكانی سەركەوتوويێت.



لوید جورج

لوید جۆرج وەکو کەسێکی سیاسی لەسەر یەک نەدەژیا وەکو کلمەنسۆ، کە بەدرێژایی ژیانی بە زمان دژی بەرهەڵستکارەکانی بوو، بەڵام لوید جۆرج هەردوو سەری لە یەک جیای بەکارهێنا بوو: هەم کاری لایەنگری و هەم کاری رکابەری.

حکومەتەکەشی پادشایی و سەقامگیر بوو، بەڵام فەرەنسا کۆماری و ناسەقامگیر بوو، بەریتانیا ئارام و دەمارسارد بوو بە هۆی ئەوەی ئەمە یەکەم سەرکەوتنی نەبوو بەدەست بێنێت، ئەوەتا لە ئوتریخت ١٧١٣ و پەیماننامەی ئاشتەوایی پاریس ١٧٦٣ و کۆنگرەی ڤیەننا ١٨١٥ و ئاشتەوایی پاریس لە ١٨٥٦هەموویان بۆ بەریتانیا سەرکەوتن بوون، بەڵام فەرەنسا ئەم سەرکەوتنەی وەکو شکاندنی کۆتەکان بوون، کە لە سەدەکانی رابردووەوە نەک لە ١٨٧١/١٨٧٠ تەنیا بەڵکو لە کۆنەوە کۆت کرابوو.

بنەماکانی دەسەڵاتی لە هاندانی پادشاوە سەرچاوەیان گرتبوو، ئەم ئەوەی دەزانی گەل زیاتری مەبەستە، بەڵام هەندێک پێویستیی سیاسیی هەبوون نەدەکرا بەدوای داخوازییەکانی گەل بکەوێت. لە هەمان کاتدا دەبوایە ئەم گەلەش رازی بکات، کە متمانەیان پێی داوە. ئەم کێشەیە بە تەواوەتی ئەوسا سەری هەڵدا و بەدیار کەوت، کاتێک ویستیان نینۆکەکانی ئەڵمانیا بتاشن. لوید جۆرج مەبەستی بوو ئەڵمانیا وەکو هێزێک بمێنێتەوە بۆ بەربەرچدانەوەی فەرەنسا، دواتر دەبێت تەخمیناتەکانی قەرەبوو بە زیادەوە دیار نەکرێت. لێرە لوید جۆرج ڕووبەڕووی فشاری سیاسەتمەدارانی بەریتانی و رەخنەی کلمەنسۆ بووەوە، بەتایبەت لەو خاڵەی کە لوید جۆرج داوای کرد تەنیا ئەڵمانیا چەک نەکرێت، بەڵکو ئەم بڕیارە بەسەر هەموو لایەک جێبەجێ بکرێ ئەگەر ئاشتیان مەبەستە.

داواکاریەکانی بەریتانیا جەختیان لە دەرەوەی ئەوروپا دەکردەوە، بۆ نەخشەکانی ئەوروپا لە ڕاستیدا لوید جۆرج خۆی نەخشەساز و بەرپرس بوو لەگەڵ کلمەنسۆ. تا ڕادەیەکیش ویلسۆن لەسەر ئەو نەخشەیەی ساڵەکانی ١٩١٩ - ١٩٢٠ڕێککەوتن، کە دواتر هەر ئەو نەخشەبوو بووە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانیی دووەم.




ودرو ویلسۆن

## د/ ویلسۆن

زۆربەی هەرە زۆری مێژوونووسان لە کۆنگرەی ئاشتەوایی بە پیاوی فانتازیی ناودەبەن، چوارده بنەماکانی وایان لێکرد ئەم نازناوەی لێ بنرێت، بەڵام خەیاڵخوازیی ئاڕاستەی ئەوروپا بوو، سیاسەتەکان لە ئەمەریکای باکوور و لاتینی بەوە تاوانبار دەکرا، کە (سیاسەتی دۆلارە)، ئەمەش سیاسەتێکی ڕواڵەتییە، کە ئامانجی ئەوەیە حکومەتی واشنتۆن لە وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتینی ئابووری لە پێشینیەکانیەتی. لە نێوان ئەم خەیاڵخواز و ڕواڵەتیەیدا نیلسۆن بەرانبەر بە کلمەنسۆی توندڕەو لە بواری ڕواڵەتی ولوید جۆرجی نیان، پارسەنگی لەدەست دا. ویلسۆن بە گوتارخوێندنەوە بەناوبانگ بوو، بەڵام لە کاتی دانانی وشە لە دەقی پەیماننامەکان لە رووی یاساییەوە ورد نەبوو، ئەمە نیشانەی ئەوەبوو جەختی لەسەر بنەماکان دەکردەوە نەک لەسەر کێشەکانی ڕواڵەتی. دووربینیی لە کاروباری جیهانی پایەیەکی سیاسیی جیهانی درەوشاوەی پێ بەخشی بوو، بەتایبەت کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم) ئەمە لە ئەنجامی پسپۆڕیی لە زانستە سیاسیەکانەوە هات. هەروەها چونکە سیاسەتمەداری ئەمریکی بە شێوەیەکی گشتی چاو لە کێشە جیهانییەکان دەکەنەوە بە شێوەیەکی تایبەتیش کێشە ئەوروپییەکان، لەو میانەوە باشتر

دەتوانن کێشە خۆجێی و ناوخۆکان ببینن. لێرە چواردە بنەماکان لە بەرانبەر کێشە ئاڵۆزەکانی ئەوروپا کەوتنە هەژان، چونکە ئەو بەرپرسیار بوو بەرانبەر بە مافە پێشێلکراوەکانی نەتەوەکان و بنەماکانی مافی چارەی خۆنووسین، هەر خۆشی بەرپرسیارە لەو خیانەتەی بەرانبەر بەو نەتەوانە کرا لە دەستهەڵگرتن و رادەستکردنیان بە دوو زەبەلاحە سەرکەوتووەکە.

ویلسۆن نوێنەری وڵاتێکی دیموکراتیی پەرلەمانی بوو، هەر کاتەی حزبەکەی لە هەڵبژاردن دەرنەچێت ئەم پۆستەکەی لەدەست دەدا، هەر واش بوو هەڵبژاردنەکەی نۆڤەمبەری ۱۹۱۸ پارتی کۆماری زۆرینەی لە کۆنگرێس وەدەست هێنا، بەم ئەنجامە، پۆستەکەی ویلسۆن ناسک بوو، هەریەک لە (لوید جۆرج و کلمەنسۆ) زۆرینەی پەرلەمان پشتیوانیان لێ دەکردن، ئەمە سەرەڕای زۆرینەی رای گشتیش. هەندێک مێژوونووسان وا لێکدەدەنەوە، کە ویلسۆن زیادەی بە گرنگیی بیرۆکەی تایبەت بە کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم) ناوە، لای دۆستەکانی هەوڵی زۆری بۆ داوە و پڕ بایەخی کردووە بۆ ئەوەی قەرەبووی دۆڕاندنەکانی کۆنگرێس بکاتەوە، کاتێکیش دەگەڕێتەوە ئەمەریکا خۆی وەکو فریشتەی ئاشتی و ئارامی نیشان بدات و هەوڵەکانی لە پێناو دابینکردنی ئاسایش بۆ ناوچەکان پڕبەها نیشان بدات.

ئەو کێشانەی بڕیاربوون کۆنگرەی ئاشتەوایی بیانبینێت زۆر بوون، ئاڵۆزترین کێشە نەخشە نوێکەی ئەوروپا بوو، کە مشتومڕێکی زۆر لەسەر ئەم پارچە زەوی و ئەوی تر دروست دەکرد، بۆیە چەند لیژنەیەک بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم کێشانە پێک هێنران. ڕاستیەکەی ئەوەی لە میانەی بەرێوەچوونی کۆنگرەکە روون بۆوە، ئەوەبوو تەنیا سێ سەرکردە مەزنەکە خاوەنی وشەی یەکەم و دوایی بوون لە داڕشتنەوەی نەخشەی ئەوروپای نوێ بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکانیان، ئەمەیان بۆ چووەسەر بە کۆمەڵێک پەیماننامەی سەپێندراو بەسەر وڵاتە دۆڕاوەکان، ئەم پەیماننامانەش بریتین لە:

١- پەیماننامەی ڤێرسای لەگەڵ ئەڵمانیا (٢٨حوزەیرانی ١٩١٩).

٢- پەیماننامەی سان گرمان لەگەڵ نەمسا.

٣- پەیماننامەی تریانۆن لەگەڵ هەنگاریا.

٤- پەیماننامەی نایی لەگەڵ بولگاریا.

٥- پەیماننامەی سیڤەر لەگەڵ تورکیا، بەڵام دواتر بە پەیماننامەی لۆزان هەموار کرا.

یەکلاکردنەوەی پرسەکانی پەیوەست بە ئەڵمانیا گرنگتر بوون، لەگەڵ ئەوەی هەندێک لە کێشەکان کاتێکی کەمیان دەویست و چارە دەبوون.

فەرەنسا ئەلزاس و لۆرینی وەرگرتەوە، مافی دەستگرتن بەسەر کانزاکانی خەڵووزی لە سار بۆ ماوەی ١٥ ساڵ وەدەست هێنا، لەو ماوەیەدا کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبەالامم) ئەم ناوچەیە دەگرێت بە مەرجێ چارەنووسی بە ریفراندۆمێک لە ١٩٣٥دیاری بکرێت.

بۆ حەزەکانی فەرەنسا سەبارەت بە دەسەڵات گرتنە دەست لە کەناری چەپی ڕووباری راین، پاساوە ئەمنییەکان وایان نیشان دا، کە کلمەنسۆ بۆ ئەم داوایە پێێ دادەگرێت. بەڵام لوید جۆرج و ویلسۆن ئەم داوایەیان رەت کردەوە، تەنیا ئەوە نەبێ بە قوڵایی ٥٠کم ئەم ناوچەیان لە چەک داماڵی. کلمەنسۆ ئەمەی قبووڵ نەبوو تا ئەو کاتەی ویلسۆن و لوید جۆرج پەیمانی ئەوەیان پێدا لە حاڵەتی ڕوودانی بەیەکدادان یارمەتیەکانی ئەنگلۆ - ئەمریکیی هاوبەشی پێێ دەگات، بەڵام گۆڕانەکان هەر زوو ئەم پەیمانەیان لەناوبرد، سیناتۆری ئەمریکی پەیماننامەی ئاشتەوایی ئیمزا نەکرد، دواتر حکومەتی ئەمەریکا بەرانبەر بەم پەیمانە بەرپرسیار نەما. ئەوەبوو ئیتر بەریتانیاش رایگەیاند، کە بە هۆی ئەوەی ویلسۆن پابەندی پەیمانەکانی، کە بە کلمەنسۆی دابوون، نییە، بۆیە ئێمەش چاو لە ئەمەریکا دەکەین و ئەم پەیماننامەیە هەڵدەوەشێنینەوە، وا بەدیدەکرا کە کڵاویان خستە سەری فەرەنسا، بۆیە ئەمیش بیری لە گۆڕینی سیاسەتی دەرەوەی خۆی کردەوە.

بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ناوچە سنوورەکانی نێوان دانیمارک و ئەڵمانیا لە شلزوینگ، بڕیار درا ریفراندۆمێک ئەنجام بدرێت، لە ئەنجامی ریفراندۆمەکە تەنیا بەشە باکوورییەکە دەنگیان بۆ دانیمارک دا بەشەکەی تر لە گەل ئەڵمانیا مایەوە.

ئەڵمانیا بۆ بەرژەوەندی بەلژیک ئەمانەی لەدەست دان:

١- ئەوپین.

٢- ماڵمێدی.

پۆڵەنداش پانتاییەکی زۆری لە خاکە بە پیتەکانی ئەڵمانیا وەدەست هێنا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ڕێڕەوەکانی پۆڵەندی کە لە بەلتیک کۆتایی دێت لە شاری دانزیجی ئەڵمانی و بوو بە بەندەرێکی ئازاد، کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبه الامم) بەڕێوەی دەبرد. بەم شێوەیە پۆڵەندا بۆ خۆی دەروازەیەکی لە بەلتیک وەدەست هێنا، بەڵام لە پێناو ئەمە زیانی زۆری بە ئەڵمانیا گەیاند، ئەم ڕێڕەوە ئەڵمانیای کردە دوو بەش: بڕوسیای ڕۆژهەڵات و ئەڵمانیا.

دواتر شاری دانزیج لە رووی مێژوویی و ئابووریی و گەلەری شارێکی ئەڵمانی بوو، جیاکردنەوەی لە ئەڵمانیا لەگەڵ بنەماکانی مافی نەتەوەکان دژ و ناویفاقە. هەروەها بڕیاردارریفراندۆم لە سیلیزیای باکوور (باشووری سیلیزیا) لە پۆلۆنیا ئەنجام بدرێت بە کانزاکانەوە، بەڵام ئەڵمانیا سێ یەکی سیلیزیای لەژێر دەستی خۆی هێشتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی هەموو دەستکەوتەکانی پۆلۆنیا لەسەر حسابی ئەڵمانیا بوون و زیانی زۆریان پێگەیاندبوو، هەڵە ناکەین ئەگەر بڵێین ڕوودانی جەنگی جیهانیی دووەم هۆکارە ڕاستەوخۆکەی کێشەکانی نێوان ئەڵمانیا و پۆلۆنیا بوون. چیکوسلۆڤاکیا - وڵاتە نوێکە- ناوچەیەکی بچووکی لە ئەڵمانیا لێ وەدەست کەوت لە نزیک (ترۆپاو).

بەندەری (مەمیل )- دانیشتووانی ئەڵمانی بوون - لیتوانیا داوای دەکرد، ئەوەندە لەسەر داواکردنی رشت بوون تا لە ١٩٢٣ ئۆقرەیان نەما لە ڕێگەی چەکدارییەوە داگیریان کرد، بۆ ئەوەی کێشەکە مەزن و بڵاو نەبێتەوە هاوپەیمانان بڕیاریان دا سیستەمێکی نێودەوڵەتی بۆ (مەمیل) پیادە کەن، یەکێک بوو لە سیستەمە هەرە ئاڵۆزەکانی دونیا لە هەندێک شاری دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی ئەم سیستەمە بەدەرکەوت. ئەوەی پەیوەندیی بە موستەعمەرەکانیشەوە بوو، ئەڵمانیایان لێ بێبەش کرد. فەرەنسا و بەریتانیا لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کرد، هەر یەک لە بەلژیک و یەکێتی باشووری ئەفریقیا و ئوستراليا و نیوزلەندا و ژاپۆن لەم دابەشکردنەدا شتێکیان بەر کەوت بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- فەرەنسا و بەریتانیا کامیرۆنیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد.

٢- بەریتانیا مافی نوێنەرایەتی (انتداب)ی لە تنجانیقا و توجلاند پێدرا.

٣- یەکێتی باشووری ئەفریقیا نوێنەرایەتیی (انتداب) باشووری رۆژئاوای ئەفریقیا بکات.
٤-ژاپۆن دوورگەکانی زەریای ئارام، کە لەژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیان، وەکو دوورگەی مارشال و کارۆلینا و ماریان، وەدەست هێنا، ناوچەکانی ئەڵمانیش لە چین بۆ مایەوە (کیاو - چاو لە نیمچە دوورگەی شانتوۆنگ).
٥- هەندێک ناوچەی گرنگ بۆ ئوسترالیا مانەوە، وەکو: ناوچەی گینیای نوێ بە دوورگەکانیەوە، نیوزیلەنداش بووە نوێنەری دوورگەی ساموا.
٦- هەموو نایابەکان (امتیازات) لە ئەڵمانیا سەندرانەوە، کە لە رۆژئاوا و چین و سیام و ئەفریکای ناوەڕاست پێی درابوون.

٧- کەندری (کەنال)ی کییل چەکی لێ هەڵماڵرێت و بڕیاری بێلایەنیی بدرێت.
گەرەنتیی ڕاستەقینە بۆ وڵاتە هاوپەیمانەکان بۆ ئەوەی ئەم مەرجانە جێبەجێ بکرێن، تا ئەڵمانیا نەگەڕێتەوە سەر شەنگ وهێزەکانی جارانی بۆ تۆڵەوەرگرتنەوە، دەبێت لە ڕووی سەربازیەوە لاواز بێت و ئەم خاڵانەشیان بەسەردا بسەپێندرێت:
١- نابێ ژمارەی سوپاکانی ئەڵمانیا لە ١٠٠ هەزار سەرباز رەتکات، سیستەمی سەربازیشی دەبێت بە بە خۆبەخشین بێ نەک بە زۆر.
٢- نابێ هێزەکانی ئەڵمانی تانک و فڕۆکە بەکاربێنن.
٣- رادەستکردنی کەشتیگەلیی، لە داهاتوشدا نابێت کەشتیگەلی ئەڵمانیا لە بارهەڵگری ١٠ هەزار تۆن رەتکات، لەگەڵ ژمارەیەکی دیاری پارچەی بچووکی دەریاوانی.
٤- لەناوبردنی بنکەی دەریاوانی ئەڵمانی لە تلیگۆلاند[٣٧]، بەم شێوەیە بەریتانیا لەوە دڵنیابوو، کە لە داهاتوودا هێزی دەریاوانیی ئەڵمانی دروست نابێتەوە.
قەرەبووی زیانەکانی وڵاتانی هاوپەیمان لە کاولبوون و خراپکارییەکان بەسەر ئەڵمانیادا سەپێندرا، لەگەڵ لۆمە و تۆمەتەکانیشی لەسەر بوونە ماڵ، تا ئەو کاتەی ئەڵمانیا ئەم قەرزانە دەداتەوە خاکەکانی راین داگیر دەکرێن. کێشەی قەرەبووەکان لە

---

[٣٧] لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو تلیگۆلاندی لە بەریتانیا وەرگرتبوو لە بەرامبەر ناوچەی ویتو لە رۆژهەلاتی ئەفریکا

ئاڵۆزترین کێشەکانی نێوان هەرسێ وڵاتە مەزنەکە بوون، فەرەنسا داوای زێدەی هەبوون، بەریتانیش -سەرەڕای مامناوەندیی لوید جۆرج - ئەویش داوای قەرەبووێکی زۆری دەکرد، ویلسۆن ئەم قەرەبووەی زیانەکانی مەدەنی و سەربازی پێ زۆر بوو، پێویست بەو زیادەییە ناکات. ئەو کاتە دەنگ و هەرا بەرز بوونەوە کاتێک پسپۆرە ئابوورییەکان راپۆرتێکیان خستە بەردەم ئەڵمانیا، تیایدا زیانەکانیان بە ٢٤ هەزار ملیۆن جونەی ئسترلینی خەملاند، بەڵام پسپۆڕی ئابووریی بەریتانی (کینز) سەرمایە ئابوورییەکەی ئەڵمانیای بە ٢هەزار ملیۆن خەملاند.

لوید و ویلسۆن بە چاکیان زانی مەسەلەی قەرەبووەکان لەناو کێشە و رای گشتیی توندڕەوی فەرەنسا و بەریتانیا وەدەر نێن، ئەم کێشەیان ئاڕاستەی لیژنەیەکی تایبەتی کرد، رای گشتی وا لە مەبەستی لیژنە گەیشتبوون کە بۆ زیادکردنی قەرەبووەکانە، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ مەبەستەکەی لوید جۆرج و ویلسۆن بوو کە پێیان زۆربوو مەبەستیان کەمکردنەوە بوو. بەهەر حاڵ ئەڵمانیا بەشێکی زۆر لە تواناکانی سەربازی و مرۆیی و توانا ئابوورییەکانی لە کانزاکانی خەڵووز و ئاسن لە دەست دا، سەرەڕای ئەمە دە یەکی دانیشتووانیشی لەدەست چوو، پارەیەکی زۆریش بووە قەرزاری وڵاتە هاوپەیمانەکان، کە خۆشی نەیدەزانی کەی لە بنی دەردەچێت، وە ژمارەکانی فەرەنسی ژمارەی خەیاڵی بوون.

داخوازییەکانی سەربەخۆیی نەتەوەکان هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و هەنگاریای دەگەیاند، یەکەم دیاردە جیابوونەوەی هەنگاریا بوو لە نەمسا دواتر شۆڕشی نەتەوەکان هەریەکەی بە جیا، ئەوەبوو یۆگسلافیا هاتە بەرچاو، کە جوگرافیاکەی پێک هاتبوو لە سرب و بۆسنە و هرسک و دلماش و مۆنتنیگرۆ (چیای رەش) و کرواتیا تا سەروی ڕووباری ساف ودراف. وەکو رەگەزیش پێک هاتبوو لە سێ رەگەزی نەتەوایەتی: سرب و کروات و سلاڤی، یەکەمیان ئەرسەدۆکس و دوانەکەی تر کاسۆلیک بوون.

دواتر چیکوسلۆڤاکیا دەرکەوت، کە دانیشتووانی ١٣ ملیۆن کەسە لە رەگەزی بۆهیما و ئیمزافیما و سیلیزیای نەمسایی و بەشێک لە نەمسای باشوور، بەڵام دەوڵەتێکی هاوڕەگەز و یەکگرتوو نەبوو، لە چەند کەمەنەتەوایەتیەک پێکهاتبوو بەم شێوەیە:

٣ ملیۆن کەسیان بە ئەڵمانی دەدوان، بە تایبەت سوودێتی ئەڵمانی ٧٠٠،٠٠٠ کەسیان هەنگاریای بوون.

سەرەڕای سەدان هەزار لە پۆلۆنی و رۆتینی.

رۆمانیا لەسەر حسابی هەنگاریا و روسیا و نەمسای دراوسێی فراوان بوو، ترانسافیای لە هەنگاریا داگیر کرد و بسارابیای لە روسیا داگیر کرد و بۆکۆ ڤیناشی لە نەمسا داگیر کرد. دواتر نەمسا دەستی لە تریستا و ئیستریا و تیرۆڵ و رێڕەوی برنۆی ستراتیجی هەڵگرت بۆ ئیتاڵیا بە ئەڵمانەکانیشەوە، کە لە ئەدیجی سەرو نیشتەجێ بوون، ئیتاڵیاش داوای بەندەری (فەیومی)ی دەکرد، کە (دانۆنزیو) شاعێری ئیتاڵی بەزۆر داگیری کرد و دواتر لەگەڵ یوگسلاڤیا یەکلایی کرایەوە.

بەم شێوەیە نەمسا بوو بە دەوڵەتێکی بچووکی ئەوروپای رۆژهەڵات، کە رووبەرێکی زۆری لەدەست دا بۆ ئەوەی ئەڵمانیا چاوی لەوە نەبێت لەگەڵ ئەڵمانیای یەکخات، ئەو پانتاییەی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا لەژێر دەستیدا بوو لە پەیماننامەی (سان جرمان) بە رێژەیەکی زۆر بەرتەسک بووەوە.

زیانەکانی هەنگاریاش بە پێی پەیماننامەی تریانۆ کەمتر بوون لە هی نەمسا، ئەگەر لەگەڵ نەمساش هاوبەش بن، ئەوا هیچ دەروازەیەکیان بۆ سەر دەریا نەمایەوە. تاقە دەوڵەتی بەزیو، کە هیچ لە خاکەکانی لەدەست نەدابن بولگاریا بوو، گەڕاندیانەوە بۆ سنوورەکانی لە ١٩١٤، گوایە لە شەڕی بەلکانی دووەم لە ١٩١٣ خاکی زۆری لەدەست دابوو. مەزنترین زیانی ئەوسای لێی کەوتن، لەدەستدانی تراقیای رۆژئاوا بوو بۆ یۆنان، پەیماننامەی نایی ئەم یەکلاکردنەوەی لەگەڵ بولگاریا لە ٢٧ی نۆڤەمبەری ١٩١٩ پەسند کرد.

سەبارەت بە دەوڵەتی عوسمانی تەنیا سنوورەکانی تورکیای بۆ مایەوە دوای ئەوەی ئینگلیز عێراقیان داگیر کرد تا موسل و شام و حلب، هێزەکانی هاوپەیمانان دەستیان بەسەر بەنداوەکاندا گرت، دووبارە بە رووی کەشتیە جەنگیەکانیان داخستن، ئەمە وەکو نەریتی جیبەجێکراو لە ١٨٤١ەوە پیادە دەکرا.

پەیماننامەی سیڤەر: لە (ئابی ١٩٢٠) بەسەر تورکیایاندا سەپاند، کە بە پێی ئەم پەیماننامەیە تورکیا دەست لە هەموو مومتەلەکاتەکانی لە ئەوروپا هەڵدەگرێت بۆ یۆنان جگە لە قوستەنتینیە و ناوچەیەکی بچووک لە بەنداوی دەریای مەرمەرە بە قولاییەکی ئەوەندە، کە بەسەر بەنداوەکانی یۆنان زاڵ نەبێت. ئەرمینیاش سەربەخۆ کرا، یۆنان - چەند

دوورگەیەکی لە دەریای ئیجە لە تورکیاوە بۆ جێما - ئەرکی سەرپەرشتیکردنی ناوچەکانی ئەزمیر و دەوروبەری پێ بسپێردرێت، ناوچەی ئەزالیاش بخرێتە ژێر چاودێری ئیتالیا، سوریا و لوبنان لەژێر نوێنەرایەتی (انتداب) فەرەنسا بێت، عێراق و فەلەستین و رۆژهەلاتی ئوردن لەژێر نوێنەرایەتی (انتداب) بەریتانیادا بێت.

گوایە ئەوەی پەیماننامەی سیڤەری ئیمزا کرد سولتانی عوسمانی بوو، بەلام بزووتنەوەی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی کەمال ئەتاتورک ئەم پەیماننامەیە رەت دەکەنەوە، بە پاساوی ئەوەی ئامادە نین دەست لە خاکی تورکیا هەلگرن، دووبارە هێزەکانی تورکیا دامەزرانەوە، شەڕیان لەگەڵ یۆنانییەکان کرد تا شکستیان پێ هێنان، بەدوای فەرەنسی و ئیتالییەکاندا رۆیشتن تا خاکەکانی تورکیایان لێ سەندنەوە. دواتر لە پەیماننامەی لۆزان لە ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣ کۆتاییان بە رەوشی جەنگ هێنا لەگەڵ تورکیا [٣٨]. داواکرا سنووری نێوان تورکیا- عێراق و تورکیا- سوریا دارێژرێتەوە، تورکیا دەستی لە دەسەلاتەکانی خۆی هەلگرت لە ولاتانەی عەرەبی. هاوپەیمانەکان لە لای خۆیانەوە رەزامەندیان دا لەسەر پووچەلکردنەوەی (ئیمتیازاتەکانی) ولاتانی بێگانە، لە هەمان رۆژدا پەیماننامەی (بەنداوەکان) ئیمزا کرا، کە هاتووچۆ بۆ کەشتییەکان لە کاتی شەڕ و ئاشتی ئازاد کرا، بۆ هاتووچۆی هێزە دەریاوانیەکانیش سیستەمێک دانرا و لیژنەیەکی نێودەولەتی بۆ سەرپەرشتیکردنی سەر کاری بەنداوەکان پێک هێنرا. بەپێی ئەم پەیماننامەیە هێزەکانی بەریتانی، فەرەنسی و ئیتالی، کە لەسەر ئەو خاکانەن، کە تورکیا داگیری کردوون، دەکشێنەوە. تا چەند ئەم یەکلاکردنەوانە دادپەروەر بوون؟ مشتومڕی زۆر لەسەر ئەم دۆز و پرسە کرا، رای جیا هەبوون، ئەوەی بەسەر ئەم مشتومڕانەدا زاڵ بوون ئامانجە نەتەوایەتیەکان بوون، بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بەم شێوەیە کورتیان کەینەوە:

١- ئەلمانیا هەستی کرد هاوپەیمانان کلاویان لەسەری ناوە، هەرکە چەکیان دانا بینیان هاوپەیمانان مامەلەی سەرکەوتوو و ژێرکەوتووی لەگەلدا دەکەن، نەک هەر ئەمە بەلکو

---

[٣٨] بە پشتبەستن بە ١٤ بنەماکەی ویلسۆن تایبەت بە مافی نەتەوەکان لە برگەی ٦، ٦١ ی پەیماننامەی سیڤەر تایبەت بوو بە کێشەی کورد لە کوردستانی باکوور، تیایدا دان بە مافەکانی کورد دادەنرێت بە مەرجی ئەوەی مۆلەتی ٦ مانگ بە دەسەلاتی کورد بدەن ئەگەر توانیان کاروباری خۆیان ببەن بەڕێوە، ئەوا لە رێگەی ریفراندۆمێک چارەنوسیان دیاری بکرێت، سەربەخۆیی یان بەستنەوە بە ولاتێکی تر، بەلام دواتر لە پەیماننامەی لۆزان لە ١٩٢٣ کاتێک کەمال ئەتاتورک پابەندی سیڤەر نابێت، لە شوێنی ئەو لە لۆزان رێک دەکەون لەوێ ئیتر ئومێدەکانی کورد ژێرخاک دەکرێن بە هەلوەشاندنەوەی برگەکان....وەرگێر

خراپتریشیان لەگەڵ بەکار هێنا، وەکو نەریتی پەیماننامە ئاشتەواییەکان دەبێت وتووێژ لە نێوان سەرکەوتوو ژێرکەوتوو لەسەر بنەمای رێککەوتن بێتە ئیمزا کردن. بەڵام ئەمە لە نێوان ئەڵمانیا و هاوپەیمانان نەکرا، هاوپەیمانەکان دیراسەی دۆخەکانیان لە نێوان خۆیاندا کرد ئەوەی بە پێویستیان دەزانی بەسەر ئەڵمانیایاندا سەپاند، لە پەیماننامەیەکدا بە ناوی پەیماننامەی ڤێرسای پێیان ئیمزا کرد. ئەڵمانیا ئەم کارەی بە کارێکی زۆرلێکردن وەسف کرد، ئەم هەڵوێستەی هاوپەیمانانی کردە پاساوێک، هەرجارەی بۆیان بلوابا خۆیان لە بڕیارەکان دەدزیەوە. بۆیە دەکرێ بڵێین ئەم رەفتارەی هاوپەیمانان بەرپرسیارە لەوەی دواتر وەکو تۆڵە رویاندا، پەیماننامەی ڤێرسای نینۆکەکانی ئەڵمانیایان تاشین، تۆوی جەنگی جیهانیی دووەمیان چاند هەروەکو پەیماننامەی فرانکفۆرت لە ١٨٧١ تۆی جەنگی یەکەمی جیهانیی چاند. مافی چارەی خۆنووسین، کە ئەڵمانییەکان ئومێدی زۆریان پێی بوو بۆ ئەوەی خۆیان لە یەکێتیەکدا ویفاقەنەوە، بۆ ئەوان پێشێل کرا. زۆر لە ئەڵمانییەکان لەژێر دەسەڵاتی چیکوسلۆڤاک و پۆڵەندا و فەرەنسا دەژیان، ئەڵمانیا کرا بە دوو بەش: بروسیای رۆژهەڵات و ئەڵمانیا، هەر هەوڵێک بۆ یەکگرتنەوەی ئەم دوو بەشە مانای جەنگێکی تر دەگەیەنێ.

٢- وڵاتە سەرکەوتووەکان هیچ هەنگاوێکیان لە بواری چەکداماڵین نەنا، ئەم پرۆژەیە - پرۆژەی چەک داماڵین - فێڵ بوو، مەبەست تەنیا ئەڵمانیا بوو وڵاتە مەزنەکانی نەگرتەوە.

٣- بە هۆی ئەوەی روسیا لەم پەیماننامەیە ئامادە نەبوو، رەچاوی هیچ بەرژەوەندیەکی روسیا نەکرا، بەڵکو لە دژی بەرژەوەندییەکانی کار دەکرا. یەکێک لە هۆکارەکان بڵاوبوونەوەی حوکمی سۆشیالیستی بوو لە روسیا، وڵاتە مەزنە سەرمایەدارەکان ترسیان لە بیرۆکەی کۆمۆنیستی هەبوو و هاوکاریی سەربازیان نەدەکرد، چونکە دژی حوکمی سۆشیالیستی- لینینی بوون.

٤- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەکو پاڵپشت و بەرگریکاری وڵاتە نوێنەرەکان (انتداب) خۆی نیشان دەدا، بۆ ئەم مەبەستە لیژنەی (کنج کرین)ی ناردە رۆژهەڵاتی عەرەبی، ئەم لیژنەیە لە گەڕانەوەی دا چەند راسپاردەیەکیان پوخت کردن،

بەڵام فەرەنسا و بەریتانیا گوێیان پێ نەدان، کاتێک ئەمەریکا پترۆڵی موسڵی دەست کەوت دەرگاکانی بە رووی بزووتنەوە نیشتمانیەکاندا داخستن.

بەهەر حاڵ ئەم پەیماننامەیە بەناوی سەقامگیری دونیا دانرا، بە دیدی ویلسۆن دەبێت رێکخراوێکی جیهانی کاری پاراستن و بەڕێوەبردنی ئەم ئاشتی و سەقامگیرییە بگرێتە ئەستۆ، ئەویش کۆمەڵەی نەتەوەکانە (عصبە الامم).

## (٢) کۆمەڵەی نەتەوەکان

ئەو زیانە زۆرانەی لە میانەی جەنگی جیهانی بە ئەوروپا کەوتن تیایدا بە ملیۆنەها مرۆڤ بوونە قوربانی، هاندەرێکی بەهێز بوو بۆ ئەوەی بە هاوبەشی وڵاتەکان کارێکی وا بکەن رێگە لە دووبارەبوونەوەی ئەم جۆرە کارەساتانە بگرن، کە ماوەی چوار ساڵی خایاند. یەکەم کەس کە بیری لەم کارە کردەوە ویلۆسن بوو، بانگخوازی کۆمبوونی کۆمەڵگای ئەوروپیی کرد بۆ ئەنجامدانی کارێک لە پێناو ئاشتیدا. بە درێژایی مێژوو گەلێک لە سیاسەتمەدار و فەیلەسوف و زانا کان بانگەشەی دۆزینەوەی کۆمبوونێکیان دەکرد لەسەر ئاستی ئەوروپا و بۆ هەمان مەبەست، بەڵام کەس گوێی پێ نەدەدان، نە لایەنە حکومیەکان نە لایەنە جەماوەرییەکان، چونکە تا ئەوکات سیمای پێویستیەکی ئەوتۆ بەدی نەدەکرا. لە رووێکی تر دەرکەوتنی بیرۆکەی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم)، کە ویلسۆن بانگەوازیی بۆ دەکرد، تەنیا کار و داخوازیی خۆی نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی پێویستیەکانی قۆناغەکە و پەرەسەندنی پەیوەندییەکان بە هەموو شێوەکانیەوە هاتە پێش.

ئەوروپا پتر لە جارێک ناچار دەبێت کۆنگرەیەکی مەزن ببەستێت، تا هەموو کێشە هەڵواسراو و ئاڵۆزەکانی دەوڵەتان، کە پێیان چارەناکرێت، لەم جۆرە کۆنگرانە چارەی کەن، لەو جۆرە کۆنگرانە:

| | |
|---|---|
| کۆنگرەی وستفالیا ........................ | ١٦٤٨ |
| کۆنگرەی ڤیەننا ........................... | ١٨١٥ |
| کۆنگرەی ئێکس لاشابیل.................. | ١٨١٨ |
| کۆنگرەی ترۆپاو،.................. ..... | ١٨٢٠ |
| کۆنگرەی ڤیرۆنا،......................... | ١٨٢٢ |

کۆنگرەی پاریس،.................. ١٨٥٦
کۆنگرەی بەرلین،................... ١٨٧٨
کۆنگرەی بەرلین،.................. ١٨٨٤- ١٨٨٥
کۆنگرەی لاهای،..................... ١٨٩٩
کۆنگرەی لاهای،..................... ١٩٠٧
کۆنگرەی لەندەن.................... ١٩١٢ -١٩١٣

لە میانەی سەدەی نۆزدەهەم زۆرێک لە یەکێتی و دەزگا و سیاسەتی نێودەوڵەتی ئەوانەی گرنگیان بەم جۆرە بابەتانە دەدان لە هەموو پارچەکانی دونیا دروست بوون، لەوانە بۆ نموونە:

- لیژنەی ڕێکخستنی دەریاوانیی نێودەوڵەتی لە ڕووباری راین و ڕووباری دانوب، بە پێی پەیماننامەی پاریس لە ١٨١٤ و کۆنگرەی ڤیەننا... ١٨١٥.
- یەکێتی تەلەگرافی نێودەوڵەتی ،................ ١٨٦٥
- یەکێتی پۆستی گشتی،............................... ١٨٧٤
- بیرۆی نێودەوڵەتی بۆ بوودجە و ئەندازەکان............ ١٨٧٥.
- یەکێتی پاراستنی موڵکدارێتی پیشەسازی،.......... ١٨٨٣.
- یەکێتی پاراستنی موڵکدارێتی ئەدەبیی وهونەریی.... ١٨٨٦.
- بیرۆی گواستنەوەی نێودەوڵەتی،.......................١٨٩٠.
- یەکێتی پیسەسازیی شەکر............................ ١٩٠٢.
- بیرۆی نێودەوڵەتی بۆ تەندروستی...................... ١٩٠٣.
- یەکێتیی ئەمریکی.......................................... ١٩١٢.

ئاساییە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان ڕێخۆشکەربن بۆ دەرکەوتنی دەزگا و دامەزراو و ڕێکخراوە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، بۆیە ئەم کۆنگرە و یەکێتیانە ڕێخۆشکەر بوون بۆ ئەوەی ئەوروپا بیرۆکەی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ١٩١٨ قبووڵ بکات، دواتر تیۆری کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم) بۆ کۆمەڵگای ئەوروپی هەنگاوێک بوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی ئیمزای هەمولایەکی پێوەیە، کە کاردەکەنە سەر باری ئاسایشی دونیا بەگشتی.

پەرەسەندنی جەنگ لە ژاپۆنەوە بۆ ئەوروپا و دواتر بۆ ئەمەریکا و رەوشی ئەوروپای دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی و تێڕوانینەکانی گەلێک لە گەلانی مافخوراو بۆ گەیشتن بە ئامانج بوونە یارمەتیدەر بۆ ئەوەی خەڵک بەپیر بانگەوازی دامەزراندنی کۆمەڵەیەی نەتەوەکان (عصبە الامم) بێت.

ئەگەر بمانەوێت ئامانجەکانی دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوەکانمان بە ئاسانی بۆ دەربکەوێت، لە سەرووی هەموویان پاراستنی ئاشتی و دواتر هاوکاری لە نێوان وڵاتەکاندا بوو.

هەریەکە لەلایەن خۆیەوە کار بۆ پاراستنی ئاشتی بکات، لە هەمان کاتدا هاوکاری وڵاتێک بکات ئەگەر توشی کێشەیەک یان مەترسییەک هات، یان بەروونتر بڵێین: بیرۆکەی بەرگریی هاوبەش و ئاسایشی هاوبەش یەکێکە لە ستونە سەرەکییەکانی ئەم رێکخراوە نێودەوڵەتییە نوێیە.

سەرکەوتن لە جێبەجێکردنی مانای سەرکەوتن لە ئەزمونەکە دەگەیەنێت، بە هەمان شێوە سەرنەکەوتن مانای هەرەسهێنانی بیرۆکەی کۆمەڵەی نەتەوەکانە.

بە دیدی ویلسۆن ئاشتیی جیهانی توشی هەرەس دەبێت بە هۆی حوکمی ئۆتۆکراتی و ستەمکاری، و دوژمنکاریی وڵاتە مەزنەکان دژی وڵاتە بچووکەکان، بۆیە بە پێویستی دەزانی دونیا لەم هەڕەشە و مەترسیانە رزگار کات، ئەمەشی لە وتەکەیدا لە کۆنگرەی ئاشتەوایی پاریس لە ٢٥ی جەنیوەریی ١٩١٩ بەڕوونی دەربڕی.

بیرۆکە و بۆچوونەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان یەکەم جار سەرۆکی ئەمەریکا ویلسۆن دایڕشت و هەوڵی بۆ دا لە کۆنگرەی ئاشتی، بە مەزندەی ویلسۆن بە خستنە بەردەستی ئەم بیرۆکەیە و پشتیوانی لێکردنی دەتوانێت بە فانتازیەکەی خۆی بەسەر سیاسەتمەدار و کاربەدەستە ئەوروپییەکاندا زاڵ بێت، کە خاوەنی چەندەها گەمەی سیاسین. ئەوانەی بەرژەوەندی میللەتەکەی خۆیان لا گرنگە و بەس، وادەزانن ئەگەر لەسەر حسابی خەڵکانی تریش شتێك بۆ گەلی خۆیان وەدەست بێنن، کارێکی قارەمانانەیان کردووە. دوای مشتومڕ و گفتوگۆیەکی دوور و درێژ لە نێوان ویلسۆن و لوید جۆرج و کلمەنسۆ هەردووکیان نەیانتوانی کەمێک لە بەرزایی ویسلۆن دابەزێنن و بۆ خۆشیان نەیانتوانی

هیچ بۆ فەنتازیە یان ویلسۆنیەکە سەرکەون، بۆیە کۆنگرەکە بە ئەنجامی دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوەکان تەواو بوو، بەڵام کۆمەڵەیەکی لاواز.

ویلسۆن ئەم کۆمەڵەیەی وەکو بەردی بەر پێی کۆنگرەکانی ئاشتەوایی لێکردبوو، لە هەموو کۆڕ و کۆنگرەکان پرسی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە پێشەوەی هەموویاندا بوو، بەڵام کلمەنسۆ ئەم پرسەی بە پرسێکی سانەوی دەبینی وەکو هەموو کارە ئاساییەکانی تر، بەتایبەت ئەگەر بە نەخشەی ئەوروپای بەراورد پێ بکەین. خاڵی ناکۆک لەم کۆمەڵەیە - بەدیدی ئینگلیز - ئەم کۆمەڵە ناتوانێت نە ئەرکی پاراستنی ئاشتی بگرێتە ئەستۆ نە ئەرکی بەرگریکردن لە وڵاتان، چونکە پاراستنی ئاشتی دەبێت کۆمەڵەی نەتەوەکان پڕچەک بکرێت بۆ ئەوەی ئەم ئەرکەی پێ بکرێت، تا هەرکاتەی وڵاتێک لە وڵاتەکان لەم هێڵەی لادا ئەم بە هێزەوە بیانهێنێتەوە راستیان کاتەوە، ئەمەش بۆ ئەوکات کارێکی نارەوا بوو. دواتر ئەمە ئەوە دەگەیەنێت بەرگری لەو وڵاتانە بکرێت، کە پەیماننامەی ئاشتەواییان ئیمزا کردووە، لە کۆتاییدا ئەمە جێگیر دەبێت تا هەتایی، ویلسۆن رای وابوو کە پەیماننامەکە کاتییە و کۆمەڵەی نەتەوەکان هەمیشەییە. ئەم رایەی ویلسۆن فەرەنسای بێزار کرد، چونکە فەرەنسا دەستکەوتی زۆری لە کۆنگرەکە وەدەست هێنابوو، مەبەستی بوو دەستکەوتەکان جێگیربن هەتاهەتایە.

بەهەر حاڵ لە ٢٨ی نیسانی ١٩١٩ بڕیار لەسەر (میساقی) کۆمەڵەی نەتەوەکان درا وەکو رێکخراوێکی نێودەوڵەتی ئەرکی پاراستنی ئاشتیی جیهانی بێت بە پاڵپشتی هێزی رای گشتیی نەک هێزی چەک، هەروەها بە هێزی هاوکاری و پشتیوانیی نێودەوڵەتی و پەیوەستیان بە میساقی کۆمەڵەی نەتەوەکان، کە پەنا بۆ چەک نەبەن بۆ چارەسەری کێشەکانی نێوانیان، لەسەر دەوڵەتەکان سەپێندرا پابەندی ئامانجەکانی بن، کە بریتی بوون لە:

١- هیچ پەیماننامە و رێککەوتننامەیەکی نهێنی نەبەسترێن، دەبێت هەموویان بە ئاشکرا بن.

٢- ئامانجی هەموو پەیماننامەکان دەبێت دادپەروەری و دەستپاکی و بەئابڕوویی بن.

٣- کاتێک وڵاتێکی مەزن نوێنەری (انتداب) ناوچەیەکی دواکەوتوو دەبێت، پێویستە کار بۆ گەشەکردن و بەرەوپێشچوونی ئەو ناوچەیەو وکۆمەڵگاکەی بکات. کۆمەڵەی

نەتەوەکان خۆی بوو کاری بە جێبەجێکردنی سیستەمی نوێنەرایەتی (انتداب) کرد، لەسەر ئەو خاکانەی لەژێر حوکمی وڵاتە بەزیوەکاندابوون (ئیمپڕاتۆریەتی ئەڵمانی و دەوڵەتی عوسمانی)[٣٩]

٤- لە بواری پەیوەندییەکانی ئابووریی نێودەوڵەتی میساقی کۆمەڵە داوای مسۆگەرکردنی هاتووچۆیە بازرگانییەکانی کرد.

٥- لە بوارەکانی کرێکاری و کۆمەڵایەتییدا کۆمەڵە داوای بەرزکردنەوەی ئاستی کرێکاری کرد، بەرزکردنەوەی رۆژانەی کرێکارانی بە پێویست زانی بۆ ئەوەی بتوانن ژیانێکی بەختەوەر بژین.

٦- پاراستنی ژن و منداڵ لە چەوساندنەوە.

٧- دابینکردنی هۆکاری قەڵاچۆکردنی نەخۆشییەکان.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجانە دەزگایەکی بەڕێوەبردن و هونەری بۆ جێبەجێکردنیان لە کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە دامەزراند بەم شێوەیەی خوارەوە:

## ١- کۆمەڵەی گشتیی (العصبە)

لە نوێنەری وڵاتەکانی ئەندام پێک دێت[٤٠]، هەر دەوڵەتەی دەنگێکی دەبێت، گرنگترین بەرپرسیارێتیی پاراستنی ئاشتییە، بەڵام بێ ئەوەی تواناکانی جێبەجێکردنی لەبەردەستدا هەبن. خاوەنی هیچ هێزێکی سەربازی نابێت بۆ سەپاندنی ئاشتی و لە کاری چەکداماڵین سەرکەوتوونابێت. لێرە بۆمان دەردەکەوێت دەسەڵاتەکانی سنووردار بن، واتە ئەرکی راوێژکارییە و بەس، بارەگاشی لە جنێف دەبێت.

## ٢- ئەنجومەن

---

[٣٩] سەبارەت بە دوورگە دواکەوتوومکان بە هۆی ئەوەی خۆیان هیچ سیستەم و رژێمێکیان نەبوو، بڕیار درا هەمان سیستەمی (انتداب) بەسەر ئەوانیشدا جێ بە جێ بکرێت.

[٤٠] فەرەنسا نارازی بوو لەوەی وڵاتە دوژمنەکان بێنە ناوی، ئەوەندەی نەبرد هاتنە ناوی و دواتر کشانەوە، بەم هۆیەوە ئەندامەکانی زیادیان کرد تا بوونە ٦٢ دەوڵەت .

لە نوێنەری وڵاتە مەزنەکان پێک دێت [41] لەگەڵ نوێنەری چوار وڵاتی تر، کە کۆمەڵەی گشتی هەڵیان دەبژێرێت، لە ئەرکەکانی ئامادەکردنی نەخشەی پێویست بۆ پاراستنی ئاشتی و هەر ئەرکێکی تری کۆمەڵە هەبێت، بەتایبەت چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان وڵاتان بە رێگایەکی ئاشتییانە، ئەنجومەن ئەرکی ئامادەکردنی لستی کارەکانی (دادگای دادی نێودەوڵەتی)ی گرتە ئەستۆ.

## ٣- ئەمینداریێتی گشتی

دەزگایەکی بەڕێوەبردنە، بە پێچەوانەی کۆمەڵە و ئەنجومەن دەزگایەکی هەمیشەییە، دواتر چەند دامەزراوە و دەستەی تری نێودەوڵەتیی نوێ بە کۆمەڵەی نەتەوەکان گەیشتن، گرنگترینیان:

ا/ دادگای دادی نێودەوڵەتی:

تایبەت بوو بە کێشەی نێوان دەوڵەتان، لە رووی یاساییەوە سەیری دەکردن و ناوبژیوانی بۆ دەکردن، لە پێناو چارەسەری ئەم جۆرە کێشانە ئەم دەزگایە دامەزرا، لاهای (دەنهاخ...وەرگێر) لە هۆڵەندا بووە بارەگای.

ب/ بیرۆی کاری نێودەوڵەتی:

ئامانجی ئەم دەزگایە چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکانی کرێکاران وهەڵگرتنی زوڵم ستەم بوو، لەگەڵ دەرکردنی ئەو یاسایانەی، کە مافیان پێ دەپارێزرێت.

ئەم بارودۆخانە بوونە هۆی دەرکەوتنی کۆمەڵەی نەتەوەکان و شێوەی دەرکەوتنیان و ئامانجەکانی، بەڵام سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی گۆڕانەکانی نێوان جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیی لە ١٩١٨ تا ١٩٣٩ کاریان کردە سەر سەرنەکەوتنی کۆمەڵەی نەتەوەکان، لە گرنگترین کێشەی جیهانی، کە پێی هەڵسا، کێشەی ئاشتیی جیهانی بوو، لە توانایدا نەبوو رای خۆی بەسەر وڵاتە مەزنەکاندا بسەپێنێت، کە هەردەم یەکێکیان لایەنێکی کێشەکە بوون، لە ئەنجامدا ئاشتیی جیهانی رووبەڕووی هەڕەشە دەبووەوە، کۆمەڵەی نەتەوەکان تەنیا لەو کێشانە سەرکەوتوو بوو، کە دەکەوتنە نێوان وڵاتە بچووکەکان.

[41] ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و ژاپۆن .

کۆمەڵەی نەتەوەکان لەم کێشە مەزنانەدا سەرکەوتوو نەبوو:

١- داگیرکردنی شاری (ڤلنا)ی لیتوانی لەلایەن پۆڵەنداوە- فەرەنسا پشتگیریی لێ کرد -.

٢-کۆمەڵەی نەتەوەکان نەیتوانی چین لە هێرشەکانی ژاپۆن رزگارکات، کە ماوەیەکی زۆری درێژە کێشا لە ئەنجامی دەربڕینی نارەزایی چین لە ساڵی ١٩٣١ لە کۆمەڵە کشایەوە.

٣- کۆمەڵە نەیتوانی حەبەشە لە نەخشەسازییەکەی ئیمپریالزمی ئیتاڵیا رزگار کات تا داگیری کرد.

٤- دوای ئەوەی ئەڵمانیا چووە ناو کۆمەڵە، بینیی فەرەنسا و بەریتانیا بە پێی بەرژەوەندییەکانیان کار دەکەنە سەر ئاراستەکانی کۆمەڵە، مانەوەی هیچ سوود بە ئەڵمانیا ناگەیەنێت و تا بتوانێت کەمەنەتەوایەتییە ئەڵمانییەکانی پەرتەوازە پێکراو لە پۆڵەندا و چیکو سلۆڤاکیا و شوێنەکانی تری پێ کۆبکاتەوە، کشانەوەی پێ لە مانەوە باشتر بوو.

ئەو کێشانەی سەرکەوتنی لێ وەدەست هێنا بریتی بوون لە:

١- کێشەی نێوان فینلەندا و سوێد لەسەر دوورگەی ئالاند لە ١٩٢٠.

٢- کێشەی نێوان پۆڵەندا و ئەڵمانیا لەسەر سنووری سیلیزیا لە ١٩٢١.

٣- کێشەکانی سنوور لە نێوان یۆنان و بولگاریا لە ١٩٢٥ و نێوان پیرۆ و کۆلۆمبیا لە ١٩٣٣.

هۆکارەکانی سەرکەوتن و سەرنەکەوتن هەرچیەک بن، بیرۆکەکانی کلمەنسۆ و لوید جۆرج بەسەر بەڕێوەچوونی کارەکانی کۆمەڵە زاڵبوون و هەر بۆچوونەکانی ئەوانیش بوون کاریان پێ دەکرا. ئەوەبوو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خۆی لە کۆمەڵە کێشایەوە، ئەمەش بووە هۆی گۆشەگیربوونی کارەکانی لە ئەوروپا، تەنیا لە سیاسەتەکانی ئەوروپا بەشداریی هەبوو، کۆمەڵە ئەو هێزەی لە دەست دا، کە وەکو ئامێر بەدەست فەرەنسا و بەریتانیا بوو.

## (٣) ئەنجامەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی

لە میانەی جەنگی یەکەمی جیهانیی وڵاتەکان سیاسەتی ئاڕاستەکردنی توانا ئابوورییەکان لە خزمەت پێویستیەکانی جەنگدا پیادە دەکرد، ئەم جەنگەش درێژەی کێشا و بەم هۆیەوە ئابوورییەکانی ئەوروپا لەبار چوون، لە ئەنجامدا هەندێک سیستەمی نوێ بۆدەستگرتن بەسەر بەرهەمەکان هاتە کایەوە، کە جیاواز بوون لەگەڵ سیستەمەکانی بەر لە ١٩١٤.

دوای ئەوەی جەنگەکان بە کۆتایی گەیشتن، خەڵک وای مەزەندە دەکرد، کە گواستنەوە لە ئابوورییەکانی جەنگەوە بۆ ئابوورییەکانی ئاشتی کارێکی ئاسایی و ئاسانە، بەڵام وانەبوو و زۆر گران و ئاڵۆز بوو، تەنانەت بۆ وڵاتە سەرکەوتووەکانیش، بۆیە ئاسەواری هیلاکەتی ئەوروپا تا ماوەیەکی زۆر دوای جەنگ هەر مانەوە.

ئەوەی کارەکانی دوای جەنگی قورستر کردبوو، کەمبوونی ڕێژەی گەنج بوو لە ئەنجامی ئەو ژمارە کوشتارەی پێیان گەیشتبوو، کە بە ملیۆنان لە مەیدانەکانی جەنگ دەکوژران، کەمی لە کرێکار و هێزی کارکردن پەیدا بوو، چونکە ئەوکات ئەوروپا بە هۆی پەککەوتنی کارگە و کێڵگە کشتوکاڵییەکانی پێویستی زۆری بە کرێکار هەبوو. بەتایبەت فەرەنسا، ژمارەیەکی زۆری پاپۆڕەکانی بازرگانی لە کاتی جەنگدا ژێرئاو کرابوون، ڕێگا و بانەکانی شەڕیان لە دەوروبەر هەبوو تێک چوبوون، بۆ هێنان و بردنی کەلوپەلەکان ئەوروپا توشی گرفتی مەزن ببوو. بۆ هێنانی کەلوپەل پارەی زۆری گەرەک بوو، کە ئەمەش لە بەهای کەلوپەلەکانی بەرز دەکردەوە. زۆربەی سەرمایەکانی زێڕیی وڵاتانی شەڕکەر بە هۆی درێژەکێشانی شەڕ لەدەست درابوون، ناچاردەبوون کاغەزی کاش دەرکەن - وەکو پارە بۆ تەداولپێکردن - ئەمەش بووە هۆی دابەزینی بەهای پارە لە کاتێکدا نرخی کاڵاکان بە هۆی جەنگ خۆی زیادیان کردبوو. ئەم بارودۆخانە بوونە هۆی پیادەکردنی سیاسەتی خۆتێرکردن (الاكتفاء الذاتي)، ئەم سیاسەتەش قەوارەی بازرگانی نێودەوڵەتی کەم دەکاتەوە، بەمەش لە ١٩٢٩ قەیرانەکانی ئابووری جیهانی قووڵتر بوون.

بەرزبوونەوەی نرخی کاڵا بووە هۆی تێکچوونی باری ژیان و داهاتی ڕۆژانەی کرێکار، لە توانای حکومەتدا نەبوو پلەکان بۆ ئاستێک بەرزکاتەوە لەگەڵ نرخەکان بگونجێن. ئەوەندە نەبێت پێوستی بوون بە کرێکار بۆ چاککردنەوەی تێکچووەکانی جەنگ

لە کارگە و کێڵگەی کشتوکاڵی بووە هۆکاری بەرزبوونەوەی رۆژانەی کرێکاران. گوورزەکە ئەم جارە بەوانە کەوت، کە خاوەنی داهاتی نەگۆڕن، وەکو: فەرمانبەر و خاوەن موڵک و سەنەدەکان، لە بەرانبەریشی کۆمەڵێک بەناوی (دەوڵەمەندانی شەڕ) پەیدابوون، ئەوانەی سوودیان لە بازرگانیپێکردنی کاڵا و چەک و تفاقی جەنگ دەکرد، لەم میانەدا ئەوان سوودمەند بوون.

جوتیارەکان، کە خاوەن زەوی بوون، هەرچەندە وڵات توشی کارەسات و هەژانی مەزن دەبوو، بەڵام ئەوان ئەوەندە نەبێت کار دەکرایە سەر کەمی بەرهەمەکانیان، دەنا جگە لەمە هەژانی مەزنیان پێ نەدەکەوتن، چونکە بە هۆی بەسەربازیکردنی گشتی بەرهەمەکان کەمیان دەکرد. دوای شۆڕشی بەلشەفی لە روسیا ترسێک کەوتە گیانی وڵاتە دراوسێکان، حکومەتی ئەم وڵاتانە بۆ دڵنەوایی جوتیاران و دوورکردنەوەیان لە بیری بەلشەفی هەندێک هەنگاویان نان بۆ ئەوەی جوتیارەکان بە لای خۆیاندا بکێشن، بەڵام بانگخوازی دابەشکردنی زەوی دەرەبەگەکان بەسەر جوتیاران بووە مایەی ئەوەی جوتیارەکان بەلای بەلشیفیکەکاندا وەرچەرخێن. ئەوەبوو ئیتر وڵاتەکان پەلەیان لە دابەشکردنی زەوی و زاری گەورە دەرەبەگەکان دەکرد و بەسەر جوتیاراندا دابەشیان دەکردن، ئەمە لە پۆلۆنیا و وڵاتەکانی بەلتیک و رۆمانیا و هەنگاریا رویان دا تەنانەت لە ئەڵمانیاش.

ئەوەی شیاوی باسە سەرەڕای ئەوەی ئەڵمانیا بە بەزیوی لە جەنگ دەرچوو و گەلێک بنکە و سەنتەری پیشەسازیی لە دەست دابوون وێڕای کەشتیگەلی بازرگانیی، لەگەڵ ئەمەش کێشە و گرفتی ئابووریی توندی نەبوون وەکو ئەوەی لە وڵاتە مەزنەکان هەبوو، چەنکە جەنگ نەگوازرایەوە ناوجەرگەی ئەڵمانیا. دواتر لە کاتی جەنگەکان بە هۆی گەمارۆی دوژمنانی، کە بەسەریاندا سەپاندبوو، پشتی بە داهات و تواناکانی ناوخۆی دەبەست و لە توانایدا نەبوو لەدەرەوە خۆراک و کەرەستەی خاو بگوازێتەوە، بۆیە دەبینین کاتێک ئەڵمانیا لە جەنگەکان دەرچوو قەرزاری کەس نەبوو، بە پێچەوانەی فەرەنسا و بەریتانیا، کە بەشێوەیەکی بێسنوور لە ئەمەریکایان قەرز کردبوو. ڕاستە پارەیەکی زۆر وەکو قەرەبووی جەنگ بەسەر ئەڵمانیا کرایە ماڵ، بەڵام دواتر بە هۆی

فشاری نێودەوڵەتی ئەم پارەیەش کرایە ساڵانە و کەمیش کرایەوە، ئەوە نەبوو ڕێگە بدرێت ببێتە هۆی رووخانی ئەڵمانیا لەدوای جەنگ.

دوای ئەوە ئەم گەمارۆ دەریاییەی بەسەریدا سەپێنرا، ئەڵمانیا ناچار دەبێت لە شوێنی ئەو کەرەستانەی دەبووایە لە دەرەوە بیان هێنێت، لە ناوەوە لەجیاتی بۆ دۆزینەوە، وەکو بەکارهێنانی لاستیکی پیشەسازیی و ماددەی کیمیایی و پترۆڵ و ئارموشی پیشەسازیی.

لە رووی گۆڕانە کۆمەلایەتییەکان دەکرێ بڵێین ئەم جەنگە بە گران لەسەر وڵاتە شەڕکەرەکان وەستا لە رووی بەخشینی گیان و ماڵی زۆر، روسیا لە هەموو وڵاتەکان پتر زیانی گیانیی لێ کەوت، ژمارەی زیانەکانی گەیشتنە پتر لە دوو ملیۆن کەس، ئەڵمانیاش کەمتر لە یەک ملیۆن، پادشانشینی دووقۆڵیش ملیۆنێک و چوار یەک ملیۆن، بەریتانیاش بە ئیمپراتۆریەتەکەیەوە نزیکەی ملیۆنێک کەس، فەرەنساش بە نیوملیۆن زیاتر لە بەریتانیا خەڵکی لەدەست دا، ئەمەریکاش ١١٥هەزار کەس، زۆربەیان بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی ئەنفلۆوەنزا تیاچوون، کە دوای ئاگربەستەکە تووشی هاتن. بەم شێوەیە زیانی جەنگی یەکەمی جیهانیی ١٠ ملیۆن کەسی لە توغیانی گەنجێتیدا لەناوچوون، لەگەڵ دوو ئەوەندەی تریش بریندار و کەمئەندام مانەوە تا دوایین ڕۆژی ژیانیان. لە رێژەی زیانە مرۆییەکانەوە بە بەراورد لەگەڵ رێژەی دانیشتووان دەر دەکەوێت، کە روسیا -لەهەموو وڵاتەکان پتر زیانی گیانیی لێ کەوتووە- بە رێژەیەکی کەمتر لە ئەڵمانیا و فەرەنسا زیانی لێ کەوتووە، ئەمە بە هۆی زۆری دانیشتووانی روسیاوەیە لەگەڵ بەرزی ئاستی چۆنایەتی هاووڵاتی ئەڵمانی لەگەڵ هاووڵاتیی روسی.

ئەوەی فەرەنسییەکان فەرامۆشی خۆیان پێدەدەنەوە ئەوەیە، کە زۆربەی قوربانییەکانیان لە دانیشتووانی موستەعمەرەکانن. دیسان ئەگەر بەراوردیەکی جەنگی یەکەمی جیهانیی لەگەڵ جەنگەکانی تری مەزنی ئەوروپا بکەین، دەبینین ئەروپا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی توشی کارەسات و زیانی وا مەزن نەبۆتەوە، فەرەنسییەکان دەڵێن: لە ماوەی ساڵەکانی ئابی ١٩١٤ تا شوباتی ١٩١٧ هەر خولەکێک فەرەنسیەک دەکوژرا. لێکەوتنی ئەو زیانە مەزنانە لە ئەوروپا سامانێکی زۆری مرۆیی لەدەست ژمارەیەکی وا بەرز لە هاووڵاتیانی، کە هەموویان لە تەمەنی نێوان ٢٠ تا ٤٠ ساڵیدا بوون، تیاچوون. ئەوروپا بە تێکرایی توشی گۆڕانی هاوکێشە و هاوسەنگی هات، لەوانە

ئامارەکانی ژنهێنان و یەکساننەبوونی ڕێژەی کچ لەگەڵ کوڕ، ڕێژەی لەدایکبوون و تەمەنی خوێندکارەکان لەناو خوێندنگاکاندا و تەمەنی کرێکار و تا چەندین کێشە و گرفتی تر بۆ ئەوروپا دروست بوون.

ئەمە بەم شێوەیە شی دەکرێتەوە، کە زیانە مرۆییەکانی جەنگ زۆرینەی رەهای لە پیاوان بوون بە تایبەتیش گەنج و ڕێژەیەکی کەمی لە ریزی ژنان بوو، ئەمە بووە هۆی تێکچوونی پارسەنگی کۆمەڵایەتی لە نێوان کوڕ و کچ. ئەوەی شایانی ئاماژەیە زۆرینەی قوربانیان لەدایکبووانی چارەکەی دوایی سەدەی نۆزدەهەم بوون، ئاسایی بوو دوای تەواوبوونی جەنگ ڕێژەی لەدایکبوون کەم ببێتەوە، دوای جەنگ ئەم ڕێژەیە زیادیان کرد، ئەمە کاری کردە سەر بزووتنەوەی فێربوون و خوێندن و کرێکاری. سەبارەت بە خوێندنگاکان لە ساڵی ۱۹۳۰ خوێندنگاکان ڕێژەی خوێنکاری تەمەن لە ۱۱ تا ۱۵ ساڵی زۆر کەم بوو، سەبارەت بە کرێکاری حکومەتی فەرەنسا پلانێکی بۆ دروستکردنی هێڵی ئاسنینی ماجینۆ بۆ بەرگری دانا، لەسەر ئەو بنەمایە، کە لە ساڵی ۱۹۳۵ ئەم پرۆژەیە تەواو ببێت، گوایە سەربازەکان ساڵ بە ساڵ ژمارەیان کەم دەبێتەوە تا دەگاتە نیوەی ئەو ژمارەی کە هەیە لە ساڵی ١٩٣٤-١٩٣٩.

ئەم جەنگە کاری کردە سەر ئەوەی پەلە لە پێدانی مافی ژن کرا و بە ئاستێک گەیەندرا، کە هەرگیز مەزندەی ئەوە نەدەکرا. لە کاتی جەنگ و بەر لە جەنگ ژن زۆر بەهێواشی مافی خۆی وەدەست دەهێنا، بەڵام دوای جەنگ زۆر لەو کۆتە کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی سەر ژن هەڵگیران.

لە بەریتانیا ئەم جەنگە کولفەی زۆری هەبوو کاتێک پیاو دەچوو بۆ مەیدانی جەنگ ژن شوێنی دەگرتەوە لە نەخۆشخانە و کارگە و خوێندنگا، تەنانەت گەلێک جار شوێنەکانیان لە سوپاش پڕ پڕدەکردنەوە، واتە ژن لەتەک پیاو وەستا بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکان و خۆبەختکردن بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتنەکان. جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ژن و پیاو نەما، مافی بەشداربوون لە هەڵبژاردنەکانی پێدرا، کە لە تەمەنی ۳۰ ساڵی بۆی هەبێت بەشداری لە هەڵبژاردنەکان بکات، بەم شێوەیە هەندێک بەربەستی کۆمەڵایەتی کە لە نێوان ژن و پیاو هەبوون لابران. لەگەڵ ئەوەی ناوپڕچکەکانی نێوان ژن و پیاو نەمان ناوپڕچکەکانی نێوان بۆرجوازی و هەژارەکانیش نەمان، ئەمانە هەمووی

گۆڕانەکانی جەنگ بوون بە هۆی ئەوەی هەموویان بۆ یەک مەبەست هەوڵیان دەدا، ئەویش سەرکەوتن بوو بەسەر دوژمن و شەڕکردن لە یەک کەندری شێدار لە باکووری فەرەنسا.

## (٤) گەشەکردنی تیۆریی دەوڵەتی تۆتالیتاری

دەرکەوتنی کۆمۆنیزم لە ئەنجامی دروستبوونی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆشیالستی و هاتنی دیکتاتۆریەتی پڕۆلیتاریا بوو، دەرکەوتنی فاشیزم لە ئیتاڵیا و نازیزم لە ئەڵمانیا مکومکردنی حوکمی دیکتاتۆریەتی دوو سەرکردەی: بەنیتۆ مۆسۆلینی و ئەدۆلف هیتلەر و سەرکەوتنی دیکتاتۆریەتی فرانکۆ لە ئیسپانیا و دیکتاتۆریەتی سالازار لە پرتوگال بوو. بڵاوبوونەوەی لاساییکردنەوەی ئەم جۆرە دیکتاتۆریانە لە وڵاتانی نائەوروپی یان لەناو پارتەکان ئەمانە ئەوە دەگەیەنن، کە رەوتێکی بەهێزماڵی دیموکراتیی جێهێشتووە، زۆرێک لە سیاسی و بەرپرس و جەماوەری بەرەو تیۆری دیکتاتۆریەت بردوە، بەڵام دەبێت جیاوازی لە نێوان دیکتاتۆریەتی چین و پارت و دیکتاتۆریەتی شۆڕشگێر و تاکەکەسی دیار کەین. لە لایەکی ترەوە دەبینین پارت لە سۆڤیەت دەتوانێت سیاسەتی خۆی بەسەر سەرکردەدا بسەپێنێت، بە پێچەوانەی فاشت و نازییەکان. بەڵام ئەم جۆرە جیاوازیانە لە سەرەتا زۆر روون نەبوون، ئەم گۆڕانە لە دیموکراتەیتی رۆژئاوا بۆ دیکتاتۆریەت لە میانەی جەنگی یەکەمی جیهانیی بەروونی هەستیان پێ دەکرا لە زۆربەی وڵاتانی دیموکراتیش: فەرەنسا و بەریتانیا. رژێمەکانی ئەم دوو وڵاتە ناچاربوون هەندێک دەسەڵاتی ناوەرتە بخەنە ژێر دەستی خۆیان بۆ دووبارە دامەزراندنەوەی سوپا و تەرخانکردنی بوودجەی تایبەتی بۆ سوپا و پێداویستییەکانی. لەم بوارە ئەوەی بەریتانیا پیادەی کرد کارێکی تاکانە بوو و لە هیچ شوێنێکی تر ئەمە نەبوو کاتێک سیستەمێکی نوێی هێنایە ناو وەزارەت، بەو پێیە وەزارەتێکی ئیئتلافی بە سەرۆکایەتی لوید جۆرج و چوار وەزیری تر پێکهێنا، بۆ بەڕێوەبردن وگرتنە دەستی هەموو کاروبارەکانی وڵات و جەنگ. لە فەرەنساش چاودێریی پەرلەمانی دەسەڵاتی فراوانتری پێدرا بۆ سەربەشتی کردنی تواناکانی جەنگ.

دەبینین جەنگی یەکەمی



فرانکۆ هیتلەر

جیهانیی تاکی لەناو کۆمەڵ تواندەوە، دەنگی تاک نزم و کز کرایەوە، ئەمە تەنیا ئەوە دەگەیەنێت متمانە بەو رژێمە سەرمایەداریە نامێنێت، کە بەر لە جەنگ هەبوو. هەر ئەو رژێمە نەبوو پێشکەوتنی فکریی مەزنی بە ئەوروپا بەخشی؟ بەڵام هەمان رژێمیش بوو، کە ئەوروپای تووشی ئەم جەنگە کاولکاریە کرد شار و گوندی بەشێوەیەک لێ خاپوور کرد، کە ئەمەی پێشتر بە چاو نەدیبوو؟ دواتر هەر ئەو دەستبەسەرداگرتنەی پیشەسازیی و بازرگانییانە نەبوو بووە مایەی ململانێ و دواتر جەنگ و کاولکاری لە نێوان کورە ئامۆزاکان لە ئەوروپا، کە هەموویان بۆ یەک رەگەز دەگەڕێنەوە ؟

کۆمپانیاکان بوون ململانێ و جەنگ و پیلان و تەڵەی سیاسییان بەدوای خۆیاندا هێنا، چونکە باکیان بە هیچ نەبوو و هەوڵی هیچیان نەدەدا تەنیا قازانجی کۆمپانیاکەیان نەبێت، لە هیچ بەرنامەیەکی بووژانەوەش بەشداریان نەدەکرد تەنیا زیادکردنی سەرمایەکانیان نەبێت. هەر ئەم کۆمپانیایانە نەبوون ئەندام پەرلەمان و بەرپرسە حکومی و سیاسەتمەداری گەندەڵ کرد، رەوشتی سیاسی و کۆمەڵایەتیی خەڵکیان ژێر پێخست ؟ خەمی هیچ گۆڕان و پێشوەچوونێکیان نەبوو لە هیچ بوارێک چ لە بواری بنیاتنانی کۆمەڵایەتی یان بووژانەوەی جوتیار و کرێکار.

دواتر کێن قوربانیی ڕاستەقینەی جەنگ؟ هەر ئەو کرێکار و جوتیارانە نین، کە کۆمپانیاکان دەیانچەوسێننەوە لەپێناو دەستگرتن بەسەر چاوگی بەرهەم و بەرفراوانکردنی مەیدانی بەرهەم و سەرمایەکانیان، دواتریش گاڵتەیان پێ دەکەن و کڵاویان دەخەنە سەر؟

ئەوروپا لە جەنگی ناوخۆیدا (جەنگی یەکەمی جیهانیی) ٣٠ ملیۆن و نیو کەسی لە گەنجی بەتوانا لەدەست دا، زۆرینەیان کرێکار و جوتیار بوون. ئەوا جەنگ تەواوبوو و کاتی ئەوەیە حکومەتەکان ئاوڕێک لەو خەڵکە بدەنەوە، کە بوونە سوتەمەنیی ئەو جەنگە، جیاوازییەکانی نێوانی چینەکان نەهێڵن و لەیەکیان نزیک کاتەوە.

ئەم بەراوردە بووە هۆی بەرپابوونی شۆڕشی بەلشەفیی مەزن لە روسیا، کە بووە مایەی مەترسیی وڵاتە سەرکەوتوو و ژێرکەوتوەکان، ئەوکات هێشتا بۆرجوازی تواناکانیان لەو ئاستەدابوون، کە ئاڕاستەی سیاسەتەکانی دەوڵەت و ئەوروپا بکەن. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت بۆرجوازیی چەوساوەی ئەوروپا مامەڵەی لەگەڵ گەلی هەژار وەکو ئەو مامەڵەیە نەبوو، کە لەگەڵ هەژارانی روسیادا دەکرا، دواتر ئەوەبووە هۆی ئەوەی شۆڕشی بەلشەفی هەڵگیرسێت و چارەنووسی رەش لە چاوەڕوانی خانەوادەی (رۆمانۆف) بە لەگەڵ جەنەراڵەکانی قەیسەری بێنرخ و بەهای مرۆڤایەتی و کاربەدەستە گەندەڵ و دەوروبەرە بۆگەنەکەی، کە ژمارەیان تا بڵێی زۆر بوون. ئەم جۆرە شۆڕشە شایەنی روسیا بوو، کە تۆلستۆی بەناوبانگ و شاعیر و خاوەن ناوداری بنەماڵە دەستی لە سامان و ناوبانگی خانەوادەکەی هەڵگرت بۆ هەژار و نەداران بۆ ئەوەی وەکو کەسێکی سادە خۆی و پێنوسەکەی لە ریزی خەڵکە هەژارەکە خەبات بکات، بەڵام ئەوروپا پێویستیی بەم جۆرە شۆڕشەی بەلشەفی نەبوو تا چاکسازییەکی سەرتاپایی ئەنجام بدات، تەنیا پێویستیی بە جۆرێک لە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی هەبوو، ئەمە بە دیدی زۆربەی فەیلەسووفە ئەوروپییەکان بوو. بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە چەمکانە لەگەڵ سەرکەوتنەکانی بەلشەفی و سەرەڕای هەوڵە بێئومێدەکانی ئەمریکی و ژاپۆنی و فەرەنسی و بەریتانی بۆ کپکردنی ئەم جۆرە دەنگانە هەرلە بێشکەوە، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی هەندێک لە حکومەت و بۆرجوازەکان بۆ رێگەگرتن لە دزەکردنی کۆمۆنیزم بۆ وڵاتەکانیان، شەپۆلێک چاکسازیان ئەنجام دان، بەتایبەت لە وڵاتەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات لە (پۆڵەندا، رۆمانیا، ئستونیا،

لیتوانیا و فنلەندا) ئەم رژێمانە، بایەخیان بە دامەزراندنی حکومەتێکی بەهێز و رەهادا، حکومەتی یەک پارتی بە بەرنامەیەکی نەتەوایەتیی گشتگیرەوە دەدا.

زۆرێک لە پیاوانی خاوەن تیۆریی سیاسەت لە مێژووی نوێ ڕووبەڕووی ئەم کێشەیە بوونەوە، کە تایبەت بوو بە شێوازی دەسەلأت، ئەوان رایان وابوو نابێت سەروەری یەکانی گەل لەدەست چەند کەسێک دابن و بە هەوەستی خۆیان گەمەی پێ بکەن، چ لە دەسەلأت چ لە دابەشکردنی بەرهەمەکان و توانا و خزمەتگوزاریەکانی ولأت، لەم جۆرە کەسانە نـاوی چەنـد کەسێک لە سیاسەتمەداران دەبەین:

١- ئاماژەکانی (هۆبز) بۆ دەوڵەتی رەها.

٢- تیۆریی پەیمانی کۆمەڵایەتیی هی جان جاک رۆسۆ و بانگخوازیەکەی بۆ ئەوەی هەموو تاکێک ببێتە بەشێک لە جەستەی هەموو(دەوڵەت)، کە خۆی لەو پێک دێت (ئیرادەی گشتی) بە بەشداریکردنی تاک، لە کۆتاییدا دەسەلأت دەکەوێتە دەست گەل.

٣- سۆشیالیستی فابیزم[٤٢] لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە بەریتانیا دەرکەوت، بانگخوازی گواستنەوەی هۆکارەکانی بەرهەمهێنانی بۆ دەست کۆمەڵ دەکرد، حکومەتیش دەست لە کارەکان وەربدا بۆ چاککردنی رۆژانەی کرێکاران و چاککردنی باری ژیانیان و سەپاندنی باج بەسەر دەوڵەمەندان.

٤- مارکسیزم، مێژوو بە شەڕی چینەکانی ناوزەد دەکات، کۆتاییەکەی بە جەنگی نێوان چینی زەحمەتکێش و بۆرجواز هات، بانگخوازی بۆ نەهێشتنی موڵکدارێتیی تاک دەکرد تا کۆمەڵگا هیچ ململانێ و ناتەباییەکی تیادا نەمێنێت.

تیۆرە ئابووریەکانی نوێ ئاستی چەمکی (دەوڵەتی رەها) یان بەرز کردەوە لەوانە:

١- گوتەی ئابووریناس (لۆدردال): ئازادیی ئابووریی بەرپرسە لە نارێکی دابەشکردنی سەرمایە نیشتمانییەکان.

٢- فردریک لیست رەخنەی لە تیۆری ئازادیی بازرگانی نێودەوڵەتی گرت، گوایە گورزێکی کوشندەیە لە ولأتە هەژارەکان دەدرێت هەژاری و نەهامەتیان بۆ زیاد دەکات، لە هەمان کاتدا ولأتە پیشەسازییە مەزنەکان لەسەر حسابی ئەوان دەوڵەمەند

---

[٤٢] تیۆرێکی سۆشیالیستیە رێز لە موڵکداری تاک و سەرمایەدار و تایبەتی دەگرێت.

دەبن. هەروەها ئاراستە گشتییەکان ڕۆڵیان لە بەهێزکردنی ئاراستەی بەرەو دەوڵەتی گشتی گێرا، لە بارەی ئەوەی دەوڵەت سەرپەرشتی سیستەمەکانی فێربوون و یەکخستنی بەرنامەکانیان بکات، لە ڕووی ئەوەی حکومەت بایەخ بە خزمەتگوزاری لە ناوچە هەژارەکان بدات زیاتر لە ناوچە دەوڵەمەندەکان، ئەمەش باری دەوڵەت قورستر دەکات. بەڵام ئەم جۆرە بیرۆکە و ئاراستانە ناگەنە قۆناغی جێبەجێکردن تەنیا ئەگەر گەل خۆی دەسەڵاتی دیکتاتۆریەتی گرتە دەست یان کەسێکی بەتوانای دیکتاتۆر بە پشتگیریی گەل، کە قبوولی دیکتاتۆریەکەی بکرێت، دەنا ئەم جۆرە بۆچوونانە پیادەکردنیان ئاسان نین. دواتر مەسەلەکە زیاتر لای حەزەکانی گەلە، ئاخۆ تا چەند ئامادەیە ئەم کەشوهەوایە بخولقێنێت؟ ئەم حەز و بۆچوونانەی گەل شتێکی خۆرسک و بێبنەما نین، ئەمانە لە ئەنجامی بێئومێدی لە سیستەمی دیموکراتیی وڵاتەکانیان هاتۆنەتە کایەوە یان لە ئەنجامی فشاری وڵاتە مەزن و دیکتاتۆرەکان ئەم ڕەوشە دێتە کایەوە، کە دەیخاتە ژێر قەیرانێکی ئابووریی و سیاسیی و سەربازیی و ناچاری دەکات بەدوای کەسێکدا بگەڕێت بەناوی ئەوان پەیام پەخش کات، بە ئومێدی ڕزگاربوون و بەئامانج گەیاندنیان. لێرە دەبینین دەرکەوتنی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان لە بەرپرسیارێتیی دەوڵەتە مەزنەکانی ئیمپریالییە، چونکە ئەم دەوڵەتە ئیمپریالیانە دەزانن دیکتاتۆرییەت کاتییە، بۆیە هانی دەوڵەتیان دا تا ببێتە دەوڵەتێکی دیکتاتۆر، ئەوسا توشی قەیرانی مەزن دەبێت تا بیر لە دیموکراتی نەکەنەوە.

لەم ڕژێمە دیکتاتۆریانە کەسی دیکتاتۆر و دەوڵەت دەبنەیەک کەس، خواستەکانی سەرکردە لە هەموو خواستەکان بەهێزتر دەبن، ئەم جۆرە ڕژێمانە لە هەموو وڵاتەکان لە ماوەیەک تا ماوەیەکی نادیار وەدەردەکەوتن. دەوڵەتە ئیمپریالیە ڕۆژئاواییەکان تەنیا وەکو بەشێک لە گۆڕانەکانی مێژوو سەیری سەردەمی ئەم دکتاتۆریانەیان دەکرد سەیری پاڵەوانێتی و سەرکەوتن و ژێرکەوتنەکانیان دەکرد، بەڵام دەوڵەتە دیموکراتییە ڕۆژئاواییەکان (فەرەنسا و بەریتانیا) بە چاوێکی ڕسوا و سوکەوە سەیری ئەڵمانیا و ئیتاڵیایان دەکرد لە سەردەمی هیتلەر و مۆسۆلینی بە هۆی ڕەفتاری دیکتاتۆریان، ئەمە تەنیا بەشێکە لە نەخشەی سیاسیی گشتی بۆ لەخشتەبردنی هەردوو دەوڵەتی بەرهەڵستکاری فەرەنسا و بەریتانیا و ئەمەریکا.

# بەشی چواردەهەم

## شۆڕشی کۆمۆنیزم و دەرکەوتنی یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆشیالستی

- شۆڕش
- کێشە ناوخۆییەکان
- سیستەمی حوکم

ڕەچەڵەکی شۆڕشی کۆمۆنیزم بۆ ئەو تیۆرە دەگەڕێتەوە، کە هەریەک لە کارل مارکس[٤٣] و هاوڕێکەی فریدریک ئینگلس بانگخوازیان بۆ کرد تا بە (شۆڕشی تۆتالیتاری لەپێناو کۆمەڵ و یەکسانیی ڕەها) ناسرا.

تیۆریی کۆمۆنیزمی جەخت لەسەر توێژینەوەی پەرەسەندنی مێژوویی ئادەمیزاد دەکات لەبەر ڕۆشنایییەکانی ماتریالیزمی دیالکتیکی، کە دەڵێت: مێژووی ئادەمیزاد دەبێت لە سوچی ئابوورییەوە تێی بڕوانین، هەروەها دەبێت لەسەر بنەمای تیۆری ماتریالیزمی مێژوویی دیراسە بکرێت.



کارل مارکس

سەردەم هەبوو کە بۆرجواز و دەرەبەگی بەخۆوە گرتبوو و سەردەمی دەسەڵاتی چینی زەحمەتکێش خرابووە ژێر گڵەوە، مارکس یەکەم کەس بوو ئەم تیۆرەی بڵاو کردەوە و لە بەیاننامەی کۆمۆنیست لە ١٨٤٨رای گەیاند، هەروەها لە پەرتوکەکەیدا بەناوی

[٤٣]کارل مارکس لە ١٨١٨_١٨٨٣ ژیاوە، لە ڕەگەزی جووی ئەڵمانیا بوو، توندڕەوبوو و یەکەم بانگخوازی کۆمۆنیزمی بوو، بە هۆیەوە حکومەتی پروسیا دەری کرد لە وڵات و کۆچی کرد بۆ فەرەنسا ،لەوێ دەرفەتی پەیوەندی کردن بە هاوڕێکەیەوە فردریک ئینگلس بۆ ڕەخسا بەیەکەوە فەلسەفەی سۆرشی کۆمۆنیزمیان دارشت. ئەوەندەی نەبرد فەرەنساش دەری کردن، ڕوی لە لەندەن کرد. کاتێک کۆمەڵەی کۆمۆنیزمی لە برۆکسل بانگەشەیان کرد بۆ ئەوەی بنەماکانی کۆمۆنیزمیان بۆ داڕێژێت. ئەو بنەمایانە بوون ناونران مەنەفێستی کۆمۆنیست لە ١٨٤٨.

(سەرمایەداریی) ئەم تیۆرەی تیا شیکردۆتەوە، تیایدا بانگخوازی سۆشیالستی زانستی دەکات، کە کۆمەڵگایەکی بێ مولکداری و بێ چین و یەکسانی رەها لە نێوان تاکە کەسەکاندا دەخوازێت. لێرە بۆمان دەردەکەوێت ئەم تیۆرە راگەیاندنی شەڕی چینەکانە: ئۆرستوکراتی و بۆرجوازی و گەورە مولکدار و دەرەبەگەکان و خاوەن کار و خاوەن کارگە و کۆمپانیا و دەزگا بەرهەمهێنەرەکان، بە حسابی ئەوەی ئەمانە هەموویان نوێنەرایەتی هێزی چەوساندنەوەی چینی زەحمەتکێش دەکەن.

ئەم تیۆرە وای دەبینی سیستەمی سەرمایەداری، کە دەستی بەسەر ئەورووپادا گرتووە، خۆی خۆی لەناو دەبات، بەڵام دادپەروەری نییە چینی هەژار لە چاوەڕوانی ئەم خۆلەناوبردنە بن، بەڵکو چەند سەدەیەک دەخایەنێت. دەبێت پەلەی لێ بکرێت و ڕەوڕەوەی مێژوو خێرا بکرێت بۆ گەیشتن بە (کۆمەڵگایەکی تۆتالیتاری) لە ڕێگەی (شۆڕشی تۆتالیتاریەوە)، کاتێک ئەم کۆمەڵگا گشتگیرە دێتە کایەوە، ئەوسا کۆمەڵگایەک ئامادە دەبێت ئازادییەکان لە خۆیانەوە روون و سنوور دیار دەبن و ئازادی کۆمەڵایەتی دەبێت نەک ئازادی سیاسی.

مارکس ئەوە رەخنەی لە دەوڵەتی سەرمایەدار نەدەگرت، کە چینێک چینێکی تر دەچەوسێنێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوە رەخنەی لێ دەگرت، کە رژێمێک دەبا بەڕێوە دەسەڵات و سەربەخۆیی دەدا بە هەندێک دەزگا و لە هەندێکی تریش دەگرێتەوە، ئەمەش لەگەڵ یەکبوونی کۆمەڵگا و تۆتالیتاری ناگونجێت. ئەو دژی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بوو[44]، کە ئەم دەوڵەتە سەرمایەدارانە بە پیرۆزیان دەزانی، بانگخوازیی بۆ سەرپشککردنی دەسەڵاتەکانی دەکرد، بە شێوەیەکی قوچەکی لە بنکەی گەلەوە دەست پێ بکات، کە دەبێت ئەم حوکم بکات، بانگخوازی بۆ دابەشکردنی کارەکان کرد لەسەر ئەم بنەمایانە:

(هەریەک بە پێی پێویستیی پێی بدرێ، هەر یەکیش بە پێی توانای پێی بدرێ) کرێکار و چینی زەحمەتکێش دەبێت شۆڕش و جەنگی چینەکان بەڕێوە بەرن، دەبێت ئەم چینانە دەسەڵاتی دیکتاتۆری بگرنەدەست بۆ ئەوەی بە ئامانجی کۆمەڵگای تۆتالیتاری بگەن.

---

[44] مەبەستی دەسەڵاتی یاسادانان وجێبەجێ کردن و دادوەری بوو.

مەزندەکانی کارل مارکس سەبارەت بە شۆڕش لە وڵاتە سەرمایەدارە پیشەسازییەکان ورد نەبوون، چونکە دەسەڵات بەدەست بۆرجوازی بوو، ئەویش لەوپەڕی تۆغیانی هێزدا بوو. فراکسیۆنە کرێکارییەکانیش هەڵوەشاوە بوون بە پێچەوانەی پەیوەندییەکانی بۆرجوازەکانی ئەوسا لە دونیا، چونکە دەوڵەتە بۆرجوازییە رۆژهەڵاتییەکان زوو هەستیان بە بانگەوازە کۆمۆنیستیەکان دەکرد، کە پڕوپاگەندەیان بۆ دەکردن، بۆیە هەندێک گۆڕانیان لە بواری یاساکانی کرێکاری ئەنجام دان بۆ ئەوەی لە بیری جیهانبینی مارکسیان دوورخەنەوە و بە بیری نەتەوایەتیان پەیوەست کەن، ئەم گۆڕان و چاکسازییانە کەمێک لە گلەیی و سکاڵاکانی کرێکارانیان کەم کردنەوە.

هەندێک لە پارتە سۆشیالستیەکانی ئەورووپای رۆژئاوا خاوەنی پانتایی جەماوەری بەرین بوون، هێزیان لە هێزی پارتە شۆڕشگێڕە کۆمۆنیستەکان زیاتر بوو، چونکە بیری سۆشیالیستی لە ئیتالیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بە رۆڵی بۆرجواز وڵاتیان گەیاندبووە ئاستێکی پێشکەوتووی خاوەن ئابووریەکی بەتین. بەڵام لەناوبردنی هێزی بۆرجوازی بە شێوازی بیرکردنەوەکانی مارکس ئەنجامەکەی رووخانی ئابووری وڵات دەبێت، لەم رووخانەش چینی کرێکار لە چینی بۆرجوازی زیانی پتر پێ دەگات. سەیر نییە ئەو وڵاتەی شۆڕشی کۆمۆنیستی لێ سەرکەوتووە روسیای قەیسەریی کشتوکاڵیی دەرەبەگی دواکەوتوو لە رووی خوێندەواری و پیشەسازییە، کە قەیسەری ئوروستوکراتی گەندەڵی پشتبەستوو بە فەرماندارێتیی سەربازیی نەزان حوکمی دەکا!

روسیا وڵاتێکی بێ بۆرجوازیی وشیاربوو لە میانەی جەنگی جیهانی یەکەم -بەتایبەتی دوای شکستەکانی سوپای روسیا - رەوشی ئەم وڵاتە بۆ شۆڕش لەبار بوو، بەتایبەت ئەگەر ئەم شۆڕشە لایەنی زیانپێکەوتووی یەکەمی بەر کەوێت، کە سەرباز و کرێکار و جوتیارەکان بوون و شەڕ دژی گەندەلانی دەسەڵاتدار بکات. پڕوپاگەندەی مارکسییەکان بەهێز و رێکخراو بوون لە روسیا، قەیسەر لە توانایدا نەبوو ریشەکێشیان کات هەرچەندە زۆر لە سەرکردەکانی دوورخستنەوە وەکو (لینین)، بەڵام رێکخراو و شانەی چالاکوانی کۆمۆنیستی لە هەموو سووچەکانی وڵات روو لە بڵاوبوون و لە چاوەڕوانی دەرفەتێکدا بوون.

لێرە گۆڕانکارییەکانی جەنگ لە ڕووی سەربازییەوە گرنگ بوون بۆ ئەوەی لەم ڕەوشە بگەین، کە بووە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشی کۆمۆنیستی لە روسیا و سەرکەوتنی.

سەرەتا هێزەکانی روسیا لە بروسیای رۆژهەڵات هەندێک سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوون، ئەویش بە هۆی ئەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا خەریکی بەگژداچوونەوەی هێزەکانی فەرەنسا بوون بە نیازی ئەوەی لە مەیدانی جەنگیان وەدەرنێن، بەڵام فەرەنسا بەرگەی هێرشەکانی گرت. دواتر ئەڵمانیا رووی وەرگێڕایە لای روسیا و چەند دەستێکی بەهێزی لێ وەشاندن، بەزینەکانی روسیا یەک لەدوای یەک هاتن، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت روسیا لە جەنگ وەدەر نەکەوت. ئەم هێرشانە بە زۆری لەسەر وەستان نزیکەی دوو ملیۆن کەسی تیا چوو بێ ئەوەی جەنگێکی پیرۆزانە ئەنجام بدات یان خۆراگر بێت، لەمەش زیاتر قاتوقرییەکی بێئەندازە لە رووی خۆراک و تفاقی سەربازی کەوتە ناو سوپای روسی، تەنانەت هەندێک هێرشی ئەڵمانی هەر کوشتار و سەرپەڕاندن بوون بێ هیچ بەرگریەک لەلایەن سوپاکانی روسیەوە، فەرماندە سەربازییەکان هیچ شارەزاییەکیان لە هونەری شەڕدا نەبوو، ئەفسەرەکان لە زۆربەی بەرەکان دەسەڵاتیان لەسەر سەربازەکان نەمابوو.

لە ناوەوەی وڵاتیش قەیرانەکان لە خراپەوە رەو خراپتر هەنگاویان دەنا: لە شار و کارگەکان نەخۆشی مانگرتن و راپەڕین و یاخی بوون و خۆنیشاندان بە شێوەیەکی بەربڵاو هەموو شوێنێکی گرتبووەوە، بە تایبەت لە ناوچەی (سان پترس بۆرگ). لە ئاداری ١٩١٧ قەیسەر دوور لە پایتەخت خۆی سەرپەرشتی بەرەکانی جەنگە دۆڕاوەکانی دەکرد، کاتێک شۆڕشگێڕەکان دەستیان بەسەر پایتەختدا گرت ناویان نا (بترۆگراد). قەیسەر ویستی لەشکرێک بنێرێت بۆ دەستگرتن بەسەریدا، بەڵام جەنەڕاڵەکان ئەم فەرمانەیان رەت کردەوە و رازی نەبوون شەڕی براکانیان بکەن، لە کاتێکدا خاکی روسی لەژێر پای ئەڵمانیای داگیرکەردا دەناڵێنێت. کارەکان لە دەست قەیسەر دەرچوون ئەوکاتەی بینی دەزگا و دامەزراوە لە پایتەخت داوای گرتنەئەستۆی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات دەکەن لە ڕێگەی (دوما)ی — *بە روسی مانای ئەنجومەن واتە ئەنجومەنی گەلەری دەگەیەنێت-* کاتی بە سیمایەکی بۆرجوازی (سۆڤیەتی) لە (بترۆگراد) کە (لێژنەیەکی جێبەجێکردنی سۆڤیەتیان) بۆ هەڵبژارد، ئەوسا قەیسەر ناچار بوو دەست لە تەختی پادشایەتی هەڵگرێت

بۆ برازاکەی، بەڵام ئەویش ناچار کرا واز بێنێت، ئەمە کۆتاییەکەی خانەوادەی (رۆمانۆف)ی بەناوبانگ بوو.

ئەستەم بوو لە یەک کاتدا ئەنجومەنی(دوما)ی کاتی و لیژنەی جێبەجێکردنی ئەنجومەنی سۆڤیەت لە بەڕێوەبردن بترۆگراد هەبێت، هەوڵەکان چڕتر کران بۆ ویفاقردنەوەی هێزە شۆڕشگێڕە نوێیەکان، ڕووبەڕووبوونەوە دەستی پێکردبوو لە نێوان لیژنەی دومای بۆرجوازی و ئەنجومەنی سۆڤیەتی سۆشیالستی. لە میانەی ئەم ململانێیە تواندرا حکومەتێکی کاتی لە بۆرجوازەکان پێک بهێندرێت بە پاڵپشتی ئەو پارتانەی بەر لە جەنگی جیهانیی دەرکەوتبوون وەکو: پارتی (ئەکتۆبرین) بە سەرۆکایەتی (جۆتشکۆف) و پارتی (کادات) بە سەرۆکایەتی ملیکۆف.

وەزارەتی داد بە سۆشیالستی میانڕەو و ئەندامی ئەنجومەنی دوما (کرێنسکی) سپێردرا.

ڕاگەیەندرا کە ئەم حکومەتە ئامانجی دەوڵەتێکی دەستووریی دیموکراتییە، لەگەڵ درێژەدان بە جەنگ لەتەک هاوپەیمانانەوە، ئەمە بووە مایەی ئەوەی وڵاتانی (ویفاق) دڵیان لای چارەنووسی قەیسەر نەبێت. ئەمەو بەنگەوازەکان بۆ کۆنگرەکانی سۆڤیەت کە لە نیسانی ١٩١٧داوایان دەکرد:

١- وەستاندنی جەنگ و بەستنی پەیمانی ئاشتەوایی.
٢- مافی چارەی خۆنووسین.
٣- وەستاندنی سیاسەتی قەیسەری ئیمپریالیزمی.

ئەمجارەش مەیدانەکانی جەنگ هۆکاری ڕووخانی حکومەتی روسیا بوون، دووبارە لەشکرەکانی روسی لە مەیدانەکانی جەنگ شکستیان خوارد، برسێتی و ئاژاوە لە گوند و ناو ریزی سوپا بڵاو بۆوە، برسێتی لە گوندەکان و چاوبرسێتی لەناو موڵکدارەکان تەشەنەیان کرد، جوتیارەکان لە خۆیانەوە و بەبێ هیچ پشتگیرییەکی حکومەت دەستیان بەسەر زەویەکانی دەرەبگدا گرت و لە نێوان خۆیاندا دابەشیان دەکرد، ئەمە خۆی شۆڕشێکی گشتگیر بوو.

حکومەتە کاتیەکە لە درێژەدانی جەنگ سەرکەوتوو نەبوو، بەم سەرنەکەوتنەی هۆکاری مانەوەی لە دەست دا، سیماکانی ڕووخانی حکومەت لەسەر دەستی

بەلشەفیک[٤٥]، کە باڵی زۆرینەبوون لە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و سەرۆکەکەی (لینین) بوو، دەستیان بە لێدان و لەقکردنی جێپێی حکومەت کرد. حکومەتی ئەڵمانیا لە ١٩١٧ کارئاسانیی بۆ لینین کرد بۆ گەڕانەوەی بۆ بترۆگراد، بۆ ئەوەی بەشداری لە بەجێگەیاندنی ئامانجەکانی شۆڕش بکات بۆ ئەوەی کار لە وەدەرنانی روسیا بکا لە جەنگ، دیارە ئەمەش بەشێک بوون لەو هەوڵانەی ئەڵمانیا و نەمسا کاریان بۆ دەکرد.

ماوەیەکی کەمی برد لینین بە هاوکاری پیاوە بەلشەفییەکان کودەتایەکی لە ١٦ی تەمووزی ١٩١٧ تەنیا لە بترۆگراد ئەنجام دا، بەڵام حکومەتە کاتیەکە توانیی لێی بدات و سەرکوتی کات، ئەمە بۆ لینین ئەزموونێکی باش بوو، ئەم جارەیان بزووتنەوەیەکی گشتیی سازدا بە پشتگیری و پێهەڵسانی هەموو سۆڤیەتەکان لە هەموو ناوچەکانی بترۆگراد و هەرێمەکان بۆ سەرنگونکردنی حکومەتە کاتیەکە[٤٦]. ئەم جارەیان لینین لە پلانەکەی سەرکەوتوبوو، حکومەتی کرینسکیی رووخاند، لینین خۆی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی رێکەپێدراوی گەلی کرد دەستی بە جێبەجێکردنی بەرنامە و پلانەکانی کرد.

١- ئاشتی و ئاسایش بۆ سوپا و راگرتنی جەنگ و ئیمپریالیزمی.

٢- کارگەکان بۆ کرێکاران.

٣- زەوی بۆ جوتیاران.

---

[٤٥] لە ١٩٠٣ ناویفاقی لە سەر شێوازی کارکردن دروست بوو، زۆرینە دەنگیان بۆ لینین دا، پێیان وترا بەلشەفیک، واتە زۆرینە کەمینەش بە مەنشەفیک ناسرا، ئەوان بە لایەنگرانی چاکسازیی بە قۆناغ دەناسران، بەڵام لینین سەرۆکی توندڕەوەکان بوو.

[٤٦] کرینسکی ببووە سەرۆکی حکومەت.



کرنسکی

٤- جێگیرکردنی ئەنجومەنی گەل لە شوێنی ئەنجومەنی کۆمپانیاکان.

٥- دوورخستنەوەی بۆرجوازەکان.

٦- کارکردن بۆ بڵاوبوونەوە و بەهێزکردنی پارتە کۆمۆنیستەکان لەودیو سنووری روسیاوە.

هەروەها لینین دەرگای دانوستانەکانی لەگەڵ ئەڵمانیا خستە سەر پشت و پەیماننامەی (برست لیتۆفسک)ی لە ئاداری ١٩١٨ لەگەڵ ئیمزا کرد بۆ ئەوەی کاتەکانی بۆ دوژمنانی شۆڕش تەرخان کات، کە بەم شێوەی خوارەوە پۆلین کرا بوون:

١- ئۆروستوکراتیی فەرمانڕەوا لە سەردەمی قەیسەر بە ئەفسەرە کۆنەکانەوە.

٢- پیاوە مەزنەکانی سەرمایەدار و خاوەن کارگە و کۆمپانیاکان.

٣- دەرەبەگ و موڵکدارە مەزنەکان.

٤- پیاوە ئایینییەکان.

٥- کۆماریخوازە میانڕەوەکان.

بەڵام دواتر حکومەتی دژی شۆڕش لە روسیای باشوور بە سەرۆکایەتی (ئەلکسێڤ) سەری هەڵدا، لە ناوچەی (ڤۆلگا)ش بە سەرۆکایەتی لۆبیدیف، لە سیبیریاش بە سەرۆکایەتی کۆلتشکاک، لە دەوروبەری لینینگراد (بترۆگراد) بە سەرۆکایەتی یۆدینیچ، تا ئەوکاتەی روسیا خەریک بوو لەبەر یەک هەڵوەشێتەوە و بەرەو دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا هەنگاوی دەنا.

بەڕاستی هێزە خۆجێیەکان بە پشتیوانی سوپای روسی ئەم کارانەیان ئەنجام دەدا، بەڵام ورەیان نزم بوو، دواتر ئامانجەکانی شەڕیان لە پێناودا دەکرد دیار و روون نەبوون، بە پێچەوانەی بەلشەفیەکان، کە بە خێرایی هێزیان دادەمەزراندەوە بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی شۆڕش و بەربەرچدانەوەی ناحەز و دوژمنان، بە ئایدیۆلۆجیای نوێیان جۆش دەدان و لە ریزی زەحمەتکێشانیان یەک دەخستن.

تەنیا ئەو هێزە خۆجێیانە نەبوون، کە دەبووایە لینین لە ناویان بەرێت، بەڵکو هێزی بێگانەش لە زۆر شوێنی جیا جیا دابەزیبوون و دەستیان بەسەر خاکی روسیاوە گرتبوو، لەوانە هێزەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی و ژاپۆنی و پۆلەندی و رۆمانی. فەرەنسا لەو دەرچوونەی روسیا لە جەنگ زۆری پێ ناخۆش بوو، چونکە ئەو دەسەڵاتە نوێیە دانی بە قەرزەکانی قەیسەر نەدەنا، فەرەنساش قەرزێکی زۆری لەسەر روسیا بوو.

لە رووێکی ترەوە ئەورووپای رۆژئاوا ترسێکی زۆریان لە شۆڕشی کۆمۆنیستی دەکرد لەو سەرکەوتنانەی لە روسیا بەدەستیان دەهێنان لەوەی ئەم سەرکەوتنانەیان کار بکاتە سەر بڵاوبوونەوەی شۆڕشی کرێکاری لە وڵاتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپا، بۆیە فەرەنسا و بەریتانیا هەر لە بێشکەوە دەستیان لەو شۆڕشە وەشاند، فەرەنسا دەستیگرت بەسەر ئۆدیسیا لە ١٩١٩، بەریتانیاش دەستی گرت بەسەر - ناوچەکانی ئێران- چەند بەشێک لە قەوقاز تا باکۆ.

ژاپۆنیش مەبەستی بوو سوود لەم پەشۆکاوییە وەرگرێت، کە هێزەکانی روسیا لە دەرەوە و ناوەوە توشی هاتوون هێزێکی رەوانەی (ڤیلادیلفیا) کرد تا داگیری بکات، کە بەندەرێکی پڕبایەخ بوو، بۆ ئەوەی لەوێشەوە بتوانێت دەست بەسەر خاکەکانی روسیادا بگرێت لە سیبیریا. پۆڵەندا و رۆمانیاش، کە هەردووکیان دراوسێی روسیا بوون، ئەوان هەستیان بە مەزنی ئەو کارەساتە دەکرد، ئەگەر کۆمۆنیستی بڵاوەی وڵاتەکانیان بێتەوە، بۆیە هەریەکە لە لای خۆیەوە هەوڵی دەستگرتن بەسەر بەشێک لە خاکەکانی روسیای دا، پۆلۆنیا سنوورەکانی بەسەر روسیاوە بوو، نەخشەکانی بە هاوکاری هاوپەیمانان داڕشتن، هێلی کیرزۆن وەکو هێڵی جیاکەرەوەی سنووری نێوانیان بوو. بەڵام کاتێک پۆڵەندا ئەمەی بەدەرفەت زانی، کە روسیا بە قەیرانەکانەوە خەریکە، بڕیاری جەنگی لەگەڵ

روسیا راگەیاند و دەستی بەسەر پانتاییەکی زۆردا گرت بە پاساوی ئەوەی جێنیشانی ئەوێ پۆلۆنین.



لینین

رۆمانیاش هەرێمی بسارابیای داگیر کرد، چونکە لە دێرزەمانەوە چاوی تێ بڕیبوو بە هۆی ئەوەی زۆرینەی جینیشەکانی رۆمانین، دیارە کە هاوپەیمانان لەم کارەیدا پشتیوانیان لێ کرد.

ئاسۆکان لە بەرچاوی حکومەتی لینین تاریک بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەش توانیان رووبەڕووی کێشەکان ببنەوە، (سوپای سوور) توانیی بەرسنگی سوپای روسیای سپی بگرێت، ئەوەندەی نەبرد سوپای روسیای سپی هەڵلوەشایەوە، هەروەها سوپای سوور توانیی هەموو حکومەتە خۆجێیەکانی لێرەو لەوێ راگەیاندرابوون هەڵوەشێنێتەوە و لەناویان بەرێت. بەڵام حکومەتە کۆماریخوازەکانی تر یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆشیالیستیان تاوانبار کرد بەم کارەی، کە لە دەستووری ۱۹۱۸ بڕیاری لەسەر درابوو.

هەرکە لە ئەرکە ناوخۆییەکان تەواو بوو لینین رووی لە ئەرکە دەرەکییەکان کرد، ناچار دەبێت لەو ناوچانە دەکشێتەوە، کە داگیری کردبوون جگە لە پۆلۆنیا و رۆمانیا.

سەبارەت بە پۆلۆنیا سوپای سوور توانیی شکست بە پۆلۆنیەکان بێنێت، کێشەکان بە بەستنی پەیماننامەیەک هات لە ١٨ی ئاداری ١٩٢١ بەسترا، لەم پەیماننامەیەدا پۆڵەندا خاکێکی زۆری لێ وەدەست کەوت لە روسیای سپی. سەبارەت بە رۆمانیا حکومەتی یەکێتی سۆڤیەت نارەزایی دەربڕی لەوەی هاوپەیمانان رەزامەندییان لەسەر داگیرکردن و خستنە سەر خاکی بیسارانیان داوە بۆ سەرخاکی رۆمانیا، داوای ریفراندۆمێکیان بۆ ئەم کێشەیە کرد، بەڵام زۆری برد تا یەکێتی سۆڤیەت توانیی ئەم هەرێمە بگێڕێتەوە.

سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە تیۆریی شۆڕشی تۆتالیتاری باڵی بەسەر حکومەتی یەکێتی سۆڤیەتدا پۆشی بوو، بۆیە لینین بانگخوازی (نێودەوڵەتیی سێیەمی کرد)[٤٧]، لە ئاداری ١٩١٩ لە مۆسکۆ بۆ مەبەستی یەکخستنی بزووتنەوە کرێکارییەکان و پەلە کردن لە رەوڕەوەی مێژوو بەرەو شۆڕشی تۆتالیتاری. لەم کۆنگرەیە بڕیاری دامەزراندنی (کۆمنترن) درا، کە رۆڵی بەرچاوی هەبوو بۆ وروژاندنی [٤٨] شۆڕشگێڕ و و شۆڕشی کۆمۆنیستی لە گەلێک وڵاتی ئەورووپی، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا و هەنگاریا و ئیتاڵیا لە ١٩١٩ – ١٩٢٠. بەڵام ئەم شۆڕشانە نەبوونە هۆی پتەوکردنی پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە ئەورووپییەکان، بە پێچەوانەوە پەیوەندییەکانیان روەو خراپی بردن، بەتایبەت لە بواری بازرگانی توند وشک بوون.

مێژوونووس تۆمسۆن ئەم دیاردەی بەم شێوەیە دەربڕی:

هەموو پارتەکانی فەرەنسا بڕوایان وایە دوو دوژمن هەڕەشە لە قەوارەی فەرەنسا دەکەن، یەکیان لاساییکەرەوەی نەتەوەییە ئەویش ئەڵمانیایە، ئەوی تریان نوێیە سۆشیالستی (کۆمۆنیست )یە، کە یەکێتی سۆڤیەتە. سەردەمی حکومڕانیی لینین بە دەستکەوت و ئەنجامدانی کاری مەزن دەناسرا لە پێناو پاککردنەوەی کێشەکانی ناوخۆ، ئەوانەی دژی شۆڕش ئاژاوەیان دەنایەوە، لەگەڵ گەڕان بەدوای سیاسەتێکی گونجاو بۆ سیاسەتەکانی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت.

---

[٤٧] نێودەوڵەتیی یەکەم بۆ یەکگرتنی کرێکارەکانی دونیا بوو لە ١٨٦٤، بەهۆی ناویفاقی بۆچوونەکانی کرێکاران هەرەسیان هێنا و چالاکیەکانیان وەستێنران، (نێودەوڵەتیی دووەم) چالاکیەکانی بەهۆی جەنگی یەکەمی جیهانیی وەستا.

[٤٨] نێودەوڵەتیی سێیەم بە ناوی کۆمەنتەرن ناو دەبردرێت، یەکەم دەستەی کۆمۆنیستی نێودەوڵەتیی چالاک بوو، چونکە بە پاڵپشتی یەکیەتی سۆڤیەت ئەرکەکانی دەبرد بەڕێوە، ئەمە لە پێشتر بۆ هیچ بزوتنەوەیەکی کۆمۆنیستی نەرەخسابوو.



ترۆتسکی



ستالین

به مردنی لینین له ١٩٢٤ و وەرگرتنی پۆستی سکرتێری پارتی کۆمۆنیست لەلا ،ن ستالینەوە خەڵکەکە سەرسام بوو، چونکە چاوەڕوانی ئەوەدەکرا ترۆتسکی (هەڤاڵی لنـ ـن له دامەزراندنی شۆڕش) ئەم پۆستە بگرێتە دەست. لەت بوون لەسەر بنەمای کامەیان جێی لینین دەگرێتەوە دروست بوو، جێگرتنەوە لەسەر بنەمای کامە فەلسەفە و رێباز بۆ ئەم قۆناغە گونجاوترە، نەک لەسەر بنەمای بەراورد پێکردنی کەسایەتیان.

١- بەردەوام بوون له بانگخوازی کۆمۆنیزمی جیهانی و جیهانیبوونی شۆڕش.

٢- یەکەم جار کارکردن بۆ یەکێتی سۆڤیەت، دواتر بۆ شۆڕشی جیهانی.

له کۆتاییدا باڵی ستالین بەسەرکەوتن، دەستیان به نەهێشتنی باڵی بەرهەڵستکار کرد، ترۆتسکییان لـه هـەموو پلـه و پایەیـەک بێبـەش کـرد و بـۆ دەرەوەی وڵاتیـان دوورخستەوە. دواتر ستالین دەستی به پاکسازی لەناو دام و دەزگا حکومی و حزبیدا کرد، تا له ساڵەکانی دواییني سییەکان خۆی بەتەنیا له مەیدان مایەوە بێ رکابەر و بەرهەڵستکار تـا مردنـی. ستالین هەوڵـەکانی لـه پێنـاو توانا ئابوورییـەکانی یـەکێتی سۆڤیەت خستنەگەڕ و جەختی لەسەر کردنەوە، کێشـەی کشتوکاڵی لـه ئـاڵۆزترین کێشـەکان بـوو، بەرهـەم و داهـاتی جوتیـاران دابـەزی بـوو، لـه کاتێکدا بـۆ هەندێک

توێژکارەکان بە ئەرێنی کاریان تێکرابوو، تا ئەو کاتەی ستالینیش دەسەڵاتی گرتە دەست زەوییەکان بە دەست جوتیارەکان بوون نەک هەرەوەزەکان.

هەندێک جوتیار، کە بە (کۆلاک) ناسران، توانیان بەرهەمە بەبەهاکانیان ویفاقەنەوە و یەکخەن، بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە ستالین لە ١٩٢٩ بڕیارێکی دەرکرد، هەموو زەویەکانی بۆ شێوازی (کێڵگەی هەرەوەزی) لە ماوەی ٣ ساڵدا گۆڕین، کۆلاکی تیابرد و کێڵگەی هەرەوەز هاتە مەیدان.

لە ڕاستیدا لە قۆناغی گۆڕان داهاتی جوتیاران خراپ بوو، بەڵام جێبەجێکردنی (پڕۆژەی پێنج ساڵی)ی یەکەم ئاستی داهاتی جوتیار و بەرهەمی بەرەو باش برد، دواتر بەرهەمەکان ڕۆژ بە دوای ڕۆژ روەو باشتر چوون و باری جوتیاری روسی باشتربوو.

دەستووری ١٩٣٦ لە گرنگترین دەستکەوتەکانی ستالین و باشترین دەستووری یەکێتی سۆڤیەتیش دێتە ئەژمار، هەروەها بە درێژترین دەستووریش. هەرچەندە بە درێژەپێدەری دەستووری ١٩٢٤ دێتە ئەژمار. بە پێی دەستووری ١٩٣٦ گرنگی بە سەربەخۆیی دووەمی کۆمارەکانی ناو یەکێتی سۆڤیەت درا، بەتایبەتی ئەوانەی تایبەتمەندێتیی نەتەوایەتیان هەیە، هەروەها گرنگی دان بە یەکسانی لە نێوان کۆمارەکان و گرنگیان بە سیستەمی قوچەکیدا لە نوێنەرایەتی، بەم شێوەیە ئەنجومەنەکان وەدەرکەوتن:

١- یەکێتی سۆڤیەتی:

لەسەر بنەمای قوچەکی دادەمەزرێت لە یەکە بچووکەکانەوە دەست پێدەکات، کە یەکەی پارێزگاکان هەڵدەبژێرن، ئەمانیش یەکەی هەرێمەکان هەڵدەبژێرن. یەکەی هەرێمەکان یەکەی کۆمارەکان هەڵدەبژێرن و ئەوانیش ئەنجومەنی سۆڤیەتی یەکێتی هەڵدەبژێرن، ئیتر ئەوان نوێنەرایەتی سەرجەم هاووڵاتیانی یەکێتی دەکەن.

٢- ئەنجومەنی نەتەوەکان:

لەم ئەنجومەنە کۆمارەکان و هەرێمەکانی ئۆتۆنۆمی نوێنەریان دەبێت بە ڕێژەی جیا لەسەر بنەمای ژمارەی دانیشتووانیان، ئەمیش بە هاوشان لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتیەت.

تاکە پەیوەستی بەستنەوەی هەموو دەزگا و ئۆرگان و دەستە ڕێکخراوەیی و سیاسی و دەستوورییەکان پارتی کۆمۆنیستە، پارتی کۆمۆنیست هەروەکو لە دەستوور ئاماژەی پێدراوە تاقە حزبی وڵات دەبێ، بیرۆی سیاسیی ئەم پارتە سیاسەتی دەرەوە و ناوخۆ و

جیهانی و گشتی و تایبەتیەکان دادەڕێژێت، هەر خۆشی بەرنامە بۆ حکومەت دەس نیشان دەکات، تێکەڵیشە لەگەڵ دەسەلاتی حکومەت.

دەسەلاتی جێبەجێکردنی لە دوو دەستە پێک هاتووە:

١- دەستەی بالای سەرۆکایەتی سۆڤیەت:

ئەنجومەنی سۆڤیەتی یەکێتی و ئەنجومەنی سۆڤیەتی نەتەوەکان بە یەکەوە ئەم دەستەیە هەڵدەبژێرن. ئەم دەستەیە فەرماندەکانی سەربازی و نوێنەرە سیاسیەکانی ولات دادەمەزرێنن، هەروەها لە دەسەلاتی ئەوانە باری نائاسایی ولات رابگەیەنن، ئەنجومەنی پەرلەمان هەڵوەشێننەوە، یان بڕیار لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردن و ریفراندۆمەکانی گەلەری بدات.

٢- ئەنجومەنی کۆمیسێری گەل:

دەبێتە ئەنجومەنی وەزیران و ئەنجومەنەکانی پەرلەمان دایان مەزرێنن، ئەم ئەنجومەنە سەرۆکێک و هەشت بریکار و چەند وەزیرێکی دەبێت. دەقی دەستوور لەسەر مافەکان دەڵێ:

١- مافی کارکردن.

٢- مافی فێربوون.

٣- مافی بڕوا ئایینییەکان، هەر چەندە لە سەردەمی لینین و ستالین بەشێکی لێ پیادەنەکرا.

٤- مافی رادەربڕین، بەلام رۆژنامەگەری مولک و ئاراستەی حکومەت بوو. تەنیا ئەوە نەبێت هەندێک رەخنەی لەخۆگرتن هەبوون دەزگا و تاکەکەسییەکان پیادەیان دەکردن، بۆ چاوپێداخشاندنەوەی ئەو کارانەی کراون نەک پێداچوونەوەی پەیرەو.

٥- ئازادی تاکەکەسی، ئەویش بۆ هەمووان رەخسابوو، بەلام هەندێک فشار هەبوون لەسەر بیرکردنەوە تایبەتییەکان، کە هەندێک نووسەر و هونەرمەند بەدەستیانەوە دەیان نالاند.

٦- یەکسانی، ئەمە بە تەواوەتی پیادە دەکرا، کەس مافی نایابی (ئیمتیازات) نەبوو تەنیا لە بواری بەرهەمهێنان نەبێت.

مافی مولکدارێتی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان هەڵوەشێندرایەوە، لە شوێنی ئەم مولکدارێتی سۆشیالستی دانرا، سەبارەت بە زەویە کشتوکاڵییەکان سیستەمێک دانرا بۆ دەستبەسەرداگرتنی:

١- کۆلخۆز:

ئەم شێوازە بریتییە لە کۆمەڵێک جوتیار لە شێوەی دەستەیەکی هەرەوەزی کۆمەڵەیەک پێک دەهێنن یەک جۆرە بەرهەم دەچێنن، کە حکومەت بۆیان دیاری دەکات، بەشێک لە بەرهەمەکە بۆ دەوڵەت دەنێردرێت ئەوی تر بەسەر کرێکارانی کۆلخۆز دابەش دەکرێت.

٢- سۆلخۆز:

دەوڵەت ئەم کۆمەڵە دەبات بەڕێوە لە ڕێگەی کارپێکردنی بە کرێ، لێرە هەموو جۆرە بەرهەمێک دێتە چاندن لەگەڵ هەموو جۆرە کاری جوتیاری تا بەخێوکردنی مەڕ و ماڵاتیش. لە نەزەری سۆڤیەت ڕوودانی جەنگی یەکەمی جیهانیی حاڵەتێکی سروشتی بوو، ئەم جەنگە لە ئەنجامی ململانێ و کێبڕکێی نێوان هێزە ئیمپریالیزمییەکان بوو، شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسیی توانیویەتی تەنیا بەسەر ململانێی یەک لەسەر شەشی دونیا زاڵ بێت.

بە هۆی چاوبرینەکانی ئیمپریالیزمی دەبووایە جەنگێکی جیهانیی مەزنتر رووی دابا، چونکە هێزی ئیمپریالیزم خاوەنی چالاکی و توانای بەرچاوە، بەردەوام لە ململانێ و کێبڕکێدایە لەگەڵ یەکتر لە پێناو دەست گرتن بەسەر وڵاتانی بێدەسەڵات و لوشدانی خێر و بێریان. دیارە ئەم چاوبرسێتیە دەیانگەیەنێتە ڕووبەڕووبوونەوە لە پێناو خۆپەرستی و بەردەوامبوونیان لە دەستگرتن بەسەر تواناکانی گەلان، یان لە پێناو گەل زیاتر حەزیان لە چەوساندنەوەی گەلی ترە، بۆیە بە پشتبەستن بەم بنەمایانە سیاسەتی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت دوای سەرکەوتنی شۆڕش لەسەر بنەمای رسواکردنی تێروانینی فراوانخوازیی نەتەوایەتی و ئیمپریالیزمی بنیاد نرا.

بۆ یەکێتی سۆڤیەت دەرکەوت، کە بۆ گەشەپێدان و بووژاندنەوەی بەرهەمە پیشەسازی و کشتوکاڵییەکانی پێویستی زۆری بە رۆژئاوا هەیە، لەم روانگەیەوە سیاسەتی دەرەوەی هەموارکردەوە، کە دژایەتی هێلی سنووری دەکرد، هەوڵی بەستنی

پەیمانێکی بازرگانیی لەگەڵ بەریتانیا دا. لە ١٩٢١ ئەمە ئەنجام درا، بەڵام ئەم پەیماننامەیە نەیتوانی پەیوەندییە بازرگانیەکانی نێوان بەریتانیا و یەکێتی سۆڤیەت بەهێز کەن، ئەمە سەرەڕای دروستبوونی حکومەتی کرێکاران لە بەریتانیا بە سەرۆکایەتی (رەمزی ماکدۆنالد) و هەوڵی ئیمزاکردنی گرێبەستی بازرگانی لەگەڵ سۆڤیەت، بە هۆی ئەوەی ئەم گرێبەستانە هێشتا ئیمزا نەکرابوون، حکومەتی کرێکاران روخا.

پەیوەندییەکانی بەریتانیا و یەکێتی سۆڤیەت ئەنجامێکی بەرچاویان نەبوون، بەڵام دەرگاکانی لە بەردەم سۆڤیەت و وڵاتە ئەوروپییەکان واڵا کردن بۆ دانوستان و گرێبەست ئەنجام دان، یەکێتی سۆڤیەت بانگەوازیی ئەڵمانیای کرد بۆ ئامادەبوونی کۆنگرەی ئابووریی نێودەوڵەتیی مەزن لە جەنەوا لە ساڵی ١٩٢٢. لە هەمان ساڵ یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیا پەیماننامەیەکیان ئیمزا کرد بە ناوی (رابللۆ)، بەهای ئەم پەیماننامەیە ئەوەبوو:

١- بۆ یەکەم جار یەکێتی سۆڤیەت لەلایەن وڵاتێکی ئەوروپییەوە دانی پێ دەنرێت، دواتر وڵاتەکانی تری مەزن و بچووک یەک لەدوای یەک دانیان پێنا.
٢- بەشێک لەو دیوارە ئابڵوقەی دەوری سۆڤیەت درابوو، رووخا.
٣- بەم پەیماننامەیە پەیوەندییەکانی نێوان (ئەڵمانیا و سۆڤیەت ) توندوتۆڵتر بوون، کە بووە مایەی نارەحەتی و مەترسیی وڵاتانی تری ئەوروپی لەم پەیوەندیانە. پڕوپاگەندە بڵاوبوونەوە گوایە یەکێتی سۆڤیەت بە چەک هاوکاری ئەڵمانیا دەکات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی دژی بڕگەکانی پەیماننامەی (ڤێرسای)ە.
٤- یەکێتی سۆڤیەت لە قەرزەکانی سەر ئەڵمانیا خۆش بوو.

ئەگەر ئەم پەیماننامەیە بواری پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتیی لە بەردەم یەکێتی سۆڤیەت واڵاکردن، بەڵام پەیماننامەی لۆکارنۆ، کە لە نێوان بەلژیک و فەرەنسا، ئیتاڵیا، پۆلۆنیا و چیکوسلۆڤاکیا لە ١٩٢٥ ئیمزا کرا ترسی لای یەکێتی سۆڤیەت دروست کرد، لەوەی لە پشت ئەم هاوپەیمانە بەرنامەیەک هەبێت، کە ئەڵمانیا ئاراستەی رۆژهەڵاتی یەکێتی سۆڤیەت بکەن.

سۆڤیەت لە پەیماننامەی لۆکارنو و پرۆژەی (دۆس) بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەی قەرەبووەکانی ئەڵمانی و سەپاندنی قەرزە بەخشندەیەکانی ئەمەریکا بەسەر ئەڵمانیا، لەم کارانە تەنیا بەگژداچوونەوەی یەکێتی سۆڤیەتی دەبینی - نەخشەیەکی سێ قۆڵیی

فەرەنسی بەریتانی و ئەمریکی، بۆ پاڵپێوەنانی ئەڵمانیا و ژاپۆن دژی روسیا - بەم شێوەیە ئەمەریکا سێ چۆلەکە بە یەک بەرد دەپێکێت:

١- لێدانی سۆڤیەت و لەناوبردنی شۆڕش و دەستگرتن بەسەریدا.

٢- دروستبوونی ململانێ لە نێوان روسیا لە لایەک وهەریەک لە ژاپۆن و ئەڵمانیا لە لایەکی تر دەبێتە هۆی لاوازکردنی هەردوو وڵات، بەم شێوەیە دەکەونە ژێر دلۆڤانیی سێ وڵاتەکەی بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمەریکا.

سەرەڕای ڕۆڵی گرنگی ئەڵمانیا وەکو وڵاتێکی مەزن ڕووبەڕووی پیلان و نەخشەی ز[illegible]ی بەریتانی و فەرەنسا بۆتەوە، کە پێی بێزار بووە، ئەوکاتەی سۆڤیەت لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەڵمانیا بە گومان و نارەحەت بوون، ئەڵمانیا داوای بەستنی پەیماننامەیەکی لێ کرد لە ١٩٢٦. ئەمە بۆ دڵنیابوونی سۆڤیەت بوو، ئەمان جەختیان لەسەر پەیماننامەی رابلۆ کردەوە و هەردووکیان پەیمانیان بۆ یەکتردا، کە لە حاڵەتی رووداني جەنگ لەگەڵ لایەنی سێیەم، ئەویتر بێلایەن بووەستێت.

لەساڵەکانی داهاتوو پەیوەندییەکانی سیڤیەت - ئەڵمانی وەکو ئەوەی بەرەو باشتر چووین، تا ئەوکاتەی نازیزم سەری هەڵدا او کاروباری نێودەوڵەتی رووەو رەوتی تری خەتەرناک ئاڕاستە کران، یەکێتی سۆڤیەت بڕوای وابوو کە رۆژئاوای ئیمپریالی - بەتایبەت بەریتانیا- هانی نازییەکان دەدا بۆ هێرشبردنە سەر نەمسا و چیکوسلۆڤاکیا وەکو رێخۆشکردنێک بۆ لێدانی یەکێتی سۆڤیەت لەلایەن ئەڵمانیاوە.

# بەشی پانزەهەم

## بزووتنەوەی فاشیزم

## ڕۆڵی مۆسۆلینی

## رژێمەکەی

## فراوانبوونە دەرەکییەکانی

## پەرەسەندنی بیری ئیتاڵی بەرەو فاشیزم

بە بڕوای مێژوونووسان دوارۆژی ئیتاڵیا لە میانەی سەدەی نۆزدەهەم لە سێ ساڵی دوای پەیماننامەی ئاشتەوایی لە ١٩١٩ ئیتاڵیا نابێتە وڵاتێکی فاشیزم و دیکتاتۆر و حوکمی دیموکراتی و پەرلەمانش بخاتە ئەولاوە. بە هۆی کاریگەری شۆڕشی فەرەنسا بەسەر ئیتاڵیاوە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لە ئیتاڵیا رەوتێکی بەهێزی بیری ئازادیی دیموکراتی لە جووڵە دابوو، بزووتنەوەی یەکبوون لەگەڵ بزووتنەوەی دەستووری بەیەکەوە نوساند. هەروەها شارل ئەلبێرت دەستوورێکی بۆ بیدمۆنت دەرکرد، کاتێک ئیمپڕاتۆری نەمسا هەوڵی دا فیکتۆر عەمانۆئێلی جێگیری ناچارکات دەست لە دەستوور هەڵگرێت، ئەم پێی لەسەر مانەوەی دەستوورەکە داگرت، بە مانەوەی دەستوور یەکێتی ئیتاڵیای بە ژیانێکی پەرلەمانەوە بە ئەنجام گەیاند.

بەڵام گەلی ئیتاڵیا بە چاوێکی گومانەوە سەیری شێوازی هەنگاوەکانی حکومەتەکەیان دەکرد، کە بەهۆیەوە یەکێتی ئیتاڵیا بە ئەنجام گەیشت لەگەڵ شێوازی دەرچوونی ئیتاڵیا لە هاوپەیمانی سێ قۆڵی و وەرگرتنی هەڵوێستی لە تەک وڵاتانی (ویفاق) - لێی بێئومێد بوون و بە پیلانیان دەزانی، دەیان وت دەبێت ئیتاڵییەکان ئەم پیلانانە قبوڵ نەکەن. لە و ماوە درێژەی ژیانی پەرلەمانی و بەشداری ئیتاڵیا لە سیاسەتی نێودەوڵەتی وێنەی سیاسەتمەدارانی ئتالیا لەلای گەلی ئیتاڵی ناپەسند بوو، بە چاوی پیلانگێڕی نێودەوڵەتی سەیریان دەکردن، وەکو ئەوەی ئەم دەوڵەت دژی ئەو دەوڵەت بەکار بێنن لە پێناو بەرژەوندیی تایبەتییان و خەرجکردن و بە فیرۆدانی سامانی وڵات لە پێناو پۆست و پایەکانی پەرلەمانیی خۆیان و لە خزمەت پیلانە حزبیەکانیان خەرج دەکەن، هەروەها لە خزمەت کوتلەبازی، کە تەنیا خزمەت بە پارتەکەی دەکات نەک بە گەل.

یەکێک لە مێژوونوسان ئەوکات بەم شێوەیە ناساندنی:

خەڵک لە ئیتاڵیا رقیان لە پەرلەمانتار و فەرمانبەران دەبووەوە، ئەوەی ڕاست و دادپەروەربێت و رێز و خۆشەویستی خۆیان پاراست توێژی سوپا بوو، ئەوان لە ژیانێکی دوور لە رابواردن و خۆشگوزەراندا دەژیان، ژیانی خۆیان بەخشیبووە خزمەت وڵات و تاجی پادشا بە دوای هیچ دەستکەوتێکی تایبەتی خۆیان دا نەدەچوون.

ئەمە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی، بەڵام دوای ئەوە و لە کاتی شکستەکانی سوپای ئیتالی بەرانبەر بە سوپای نەمسا لە شەڕەکانی (کاپۆرێتۆ)، کە ئیتالییەکانی زۆر ئازار دا، دواتریش سەرکەوتنەکانی ئیتالی بەسەر سوپاکانی نەمسایی لە شەڕەکانی (ڤیتۆریۆ ڤینیتۆ)، سەرباری سەرکەوتنیان ئەمە نەبووە هۆی فەرامۆشکردنی ئازاری بەزینەکانیان.

دواجار هاوپەیمانان و بەتایبەت فەرەنسا لەسەر کەمی خەرجیی ئیتاڵیا لە میانەی جەنگ گوفتاریان دا، دەستکەوتنی ئیتاڵیا بۆ تریستا و ئیستریا و ترینتینۆ و ئادیچی سەروو ئەمانە لەگەڵ بەخششەکانی ئیتاڵیا نایەنەوە، کە هیچی لە پێناو جەنگ نەبەخشی و دەسکەوتی زۆریشی وەدەست هێنا.

لە کۆنگرەی ئاشتەوایی کاتێک ئیتاڵیا داوای موستەعمەری تری دەکرد بۆ ئەوەی بیان خاتە سەر موستەعمەرەکانی، فەرەنسییەکان گاڵتەیان پێی کرد، بۆیە ئیتاڵیا وەکو نارەزایی لە کۆنگرەی ڤێرسای چووە دەر بێ ئەوەی هیچ لە ئامانجە فراوانخوازییەکانی بێتە دی، مۆسۆلینی بەم شێوەیە ئەمەی دەربڕی:

(ئیتاڵیا لە خوانی ئیمپریالیزمی و نایابی بێکەڵک دەرچوو) ئەگەر بەراوردێک لە نێوان دەستکەوتەکانی ئیتاڵیا و فەرەنسا و بەریتانیا بکەین، ئەوەی ئیتاڵیا لەسەر حسابی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی وەدەست هێناوە زۆر لە هی ئەوانی تر پتر بوو، ئیتاڵیا چاوی بریبووە موڵکەکانی ئەم دوو ئیمپراتۆریەتە.

ئیتاڵییەکان ئومێدیان بەوە خۆش بوو، کە ئیتاڵیا لە جەنگ دەرکەوت نەک تەنیا بەسەرکەوتویی، بەڵکو بووە خاوەن شوێنێکی دیار لە ئەوروپا و زۆر لە پانتایی زەویی بەدەست هێنا، هەروەها لە ئاستی داهاتی ئیتاڵییەکان بەرز بووەوە. بێئومێدیەکەیان لەوەبوو هاوپەیمانان چاویان بریبووە خاکی ئیتاڵیا، بەرانبەر بەو قەیرانە ئابوورییەی دوای جەنگ توشی ئیتاڵیا هاتبوو. ئیتاڵیا بەدەست کەمی خەڵووز و ئاسن و بەرزبوونەوەی نرخی کاڵاکانەوە دەیناڵاند، نمایشکردنی کەلوپەلەکان لە بازاڕ بەرێژەیەکی بەرچاو کەمبووەوە، زۆرترین زیان بە چینی کرێکار و خاوەن داهاتە کەمەکان کەوت، سەرەڕای باری گرانی، کە توشی هاتبوون، ڕووبەڕووی ئاراستەکانی پڕوپاگەندەی ریفۆرمی سۆشیالیستەکانیش دەبوونەوە.

سەلمێندرا کە حکومەتەکانی سیاسەتمەدارانی کۆن نەیانتوانیوە بە پێی پێویست چارەسەری ئامانجە نیشتمانیەکان بکەن، بەڕاستی هەڵوێستی حکومەت لە کێشە و ڕووداوەکانی ناوخۆی وڵات هەڵوێستێکی شەرمەزار و پڕ ڕسوا بوو، دەستی لە هەموو هەنگاوەکانی چارەسەری هەڵگرتبوو و بواری بە فاشستەکان[٤٩] دابوو تا گەشە بکەن و لەگەڵ سۆشیالیستەکان بکەونە ملی یەکتر. بە دیدی حکومەت هەردووکیان یەکتر لەناو دەبەن، بۆیە پێویست بەوە ناکات حکومەت بکەوێتە گیانیان و ناویژیوانیان لێ بکات، بەڵام بەڕاستی ئەمە هەڵوێست و بیرکردنەوەیەکی خەڵەفاوانە بوو. هێزە ناوخۆییەکانی دژی حکومەت یاخیبوونیان گەلێک زۆر بوون، ئاسایی بوو بەرانبەر بە لاوازبوونی حکومەت ئەم هێزانە هەم زیاد دەکەن هەم گەشە کەن، بەتایبەت لەنێو ریزی کرێکاران، کە هەواداری بیری سۆشیالیستی و ئاڕاستە چەپڕەوەکان بوون. مانگرتنەکان پەرەیان سەند لە ساڵانی ١٩١٩، ١٩٢٠ و ١٩٢٢، کارگەیشتە ئەوەی کرێکارەکان کارگەکانیان داگیرکردن، کرێکارە کشتوکاڵییەکانیش دەستیان بەسەر کێڵگە و زەویەکاندا گرتن، پارتە سیاسیەکانیش لە توانایاندا نەبوو جۆرێک لە دەوڵەتێکی بەهێز دروستکەن، یان هێزێکی بە توانا بتوانێت ئاستی سەرکردایەتیی نیشتمانی بکات. پارتە ڕاستڕەوە کلاسیکییەکان هەڵوەشاوە بوون، هەروەها پارتە چەپڕەوەکانیش هەمان شێوە، تینی سەرۆکی ئەوسای ئیتاڵیا، کە پارێزەرێکی دەست پاک بوو، بەڵام ئەوە نەبوو ببێتە پیاوی دەوڵەت، هیچ نیشانە و تایبەتمەندێتیی سەرکردایەتی سیاسی و جەماوەریی تیا نەبوو.

بەڵام (جیۆلێتی) لە پیاوە کۆنە سیاسەتمەدارەکان بوو، خاوەنی ئەزموونێکی باش بوو و لەو پیاوانە بوو، کە هەموو گەمە سیاسییەکان شارەزابوو، ڕاهێنرابوو لەسەر هێنان و بردنە سیاسیەکانی نێوان هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئەوسەردەم. بە چاوێکی چنۆک و قینەوە سەیری گەشەکردنی سۆشیالیستەکانی دەکرد، هەروەها بە هەمان شێوە سەیری فاشستەکانی دەکرد، ئەوانەی لایەنگری مۆسۆلینی بوون.

مۆسۆلینی هەم سۆشیالیست و هەم نەتەوەپەرست بوو، بیری سۆشیالیستی هانی ئەوەی دەدا بەرگری دژی بانگخوازانی جەنگ بکات، بەڵام بینیی چۆن سۆشیالیستە

---

[٤٩] فاشی کۆمەڵێکن دژی سۆشیالیست و کۆمۆنیست، بەر لە جەنگ مۆسۆلینی پشتگیریی لێ کردن، دواتر پەرەی پێ سەندن و کردنی بە پارتێکی بڵاو لە ئیتالیا.

ئەڵمانییەکان لەتەک حکومەتەکەیان وەستان لە کاتی جەنگ، وڵاتیان بە هەموو تواناکانیەوە بۆ جەنگ ئامادە کرد. سۆشیالیستە ئەڵمانییەکان دەستیان نەخستە پێش حکومەتەکەی لە بەرانبەر بێلایەنی لە بەلژیک، دڵنیا بوو کە سۆشیالیستە ئەڵمانییەکان ئامانجە نەتەوایەتیەکانیان خستبوونە پێش ئامانجە سۆشیالیستییەکان، کەوابێ بۆچی ئەم وادەست بە ئامانجێکی جیهانیەوە بگرێت و دەستبەرداری نەتەوایەتیەکەی بێت. ئەی چارەنووسی سۆشیالیستی بە چی دەگات ئەگەر ئەم ئەو هەڵوێستەی وەرگرت و دەستی بە فانتازیەوە گرت و هاوکاریی حکومەتەکەی کرد ئەویش بە کاری فراوانخوازیەوە خەریک بوو؟

بەرانبەر بەم هەڵوێستانە هەمووی مۆسۆلینی[50] ئاراستە و رێبازەکەی خۆی گۆڕی و بە ئاراستەیەکی دا برد، کە خزمەت بە بیری نەتەوایەتی بکات. بانگخوازی بۆ بەشدارکردنی لە جەنگ کرد لەتەک هاوپەیمانان، ئەم بەشداری کردنەی بە پێویست دایە قەڵەم، بۆ ئەوەی دەستکەوتی زەمینی وەدەست بێنێت لەسەر حسابی نەمسا.

ئیتاڵیا بەشداریی لە جەنگ کرد و هەندێک دەستکەوتیشی وەدەستهێنان، کە ئیتاڵییەکان پێیان کەم بوون، ئەوە نەبێت لە (فەیومی) بە رسوایی لێی دەرچوو. کاتێک ئیتاڵیا داوای کەنارەکانی دەلماسیی کرد تەنیا ئەوە داواکەی نەبوو، بەڵکو داوای فەیومیشی کرد، بەڵام سەرۆکی ئەمریکی ئەم داوایەی رەت کردەوە بە ئەگەری ئەوەی ئەمە فراوانخوازییە ئیتاڵیا داوای دەکات، لەسەر ئەم خاڵە رێکنەکەوتن. یۆگۆسلافیا بە چاوێکی گومان و نارەزاییەوە سەیری داواکەی ئیتاڵیای دەکرد لە وەدەستهێنانی فەیومی، چونکە فەیومی بۆ ئەوان بەهایەکی بازرگانی و ستراتیجیی هەیە، ئەمە سەرەڕای بوونی

---

[50] مۆسۆلینی لە ٢٩ ی تەموزی ١٨٨٣ لە بریابیو لە هەرێمی رۆماگنا لە دایک بووە ئەو هەرێمە بە شۆڕش و یاخیبوون بەناوبانگە. باوکی ئاسنگەر بووو دایکیشی مامۆستا، خوێشی دەرسی دەوتەوە، دواتر رەقی لێبوو سەفەری سویسرای کرد لەوێ کاری کرد. بەهۆی ئەوە هامشۆی ئاژاوەچییەکانی دەکرد لەسەر کار لابر او زیاتر لە جارێک زیندانی کرا. دواتر سویسرای جێ هێشت و چووە پاریس، لەوێش بە تۆمەتی بەرەڵایی دەردەکرێت. پاشان دەچێتە ریزی سوپا، دواتر کاری رۆژنامەگەریی کردوە و دژی بەشداری کردنی ئیتالیا لە شەڕبووە. کاتێک شەڕەکە دژی تورکیا دەبێت لە ١٩١١، هانی کرێکارەکانی دەدا تا هێڵی ئاسنین تێک دەن بۆ ئەوەی رێگە لە ناردنی سەربازەکان بگری تا نەگەنە بەرەکانی جەنگ. دواتر وەکو سەرنوسەر لە رۆژنامەیەکی سۆشیالستی کاری کردووە. بەڵام دژی سۆشیالیستەکان وەستا کاتێک نارەزاییان دەربڕی لە بەشداریکردنی ئیتالیا لە جەنگ ئە مداوای دەکرد ئیتالیا بەشدار بێ لە جەنگ، لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ئەستێرەکانی دەدرەوشێنەوە.

کەمەنەتەوایەتیەکی سلاڤی لە تەک زۆرینەی ئیتاڵی لە فەیومی و دەوروبەری. بەڵام هیچ لایەک نە ئیتاڵیا و نە یۆگسلافیا لە توانایاندا نییە چارەنووسی ئەم شارە دیاری بکەن، چونکە لەژێر داگیرکاری فەرەنسا و ئینگلیز دابوو تا ئەوکاتەی چارەنووسی دیار دەکرێت.

دانوستانەکان لە ئاستێکی نێودەوڵەتی دەستیان پێ کرا بە چارەسەرییەکی مام ناوەندیانە کۆتاییان هات، لە ڕواڵەتدا ئەم ڕێککەوتنە بۆ پێشکەوتنی ناوچەکەبوو، وڵاتەکان لەسەر ئەوە پێکهاتن، کە فەیومی ببێتە شارێکی ئازاد وەکو (دانتزج)، بەڵام ڕای گشتی ئیتاڵی دژی ئەم ڕایە وەستان و حکومەتی ئیتاڵیان بە شەرمەزار تاوانبار کرد. نووسەری ئیتاڵی (د.ئانۆنزیۆ) دەستی کرد بە ویفاقردنەوەی خۆبەخشکاران لە بووندوقیە بۆ ئەوەی بە ئەرکی ئەو کارە هەڵسێت، کە حکومەت پێی نەکراوە بیکات، ئەویش هێرشبردنە سەر فەیومی بوو تا بیخاتە ژێر حوکمی ئیتاڵیا. ئەم پیاوە بانگەوازەکەی بەهێز بوو بزووتنەوەکەی خەڵک چاویان لێ بوو، لە بەرانبەر بە حکومەتە ڕسواکراوەکە خەڵک دڵیان بۆی کردەوە و جێی چاوان بوو. هەڵوێستی نێودەوڵەتی لە بەرژەوەندی ئەم دابوو، دیبلۆماسیەتی فەرەنسی و بەریتانی دژی ویستەکانی ئیتاڵیا نەیانتوانی بەرانبەر بە تواناکانی ئەم پاڵەوانە و هەڤاڵانی لە دۆستە چەکدارەکانی هیچ بکەن بۆ ئەوەی فەیومی نەخرێتەوە سەر ئیتاڵیا. بۆیە بزووتنەوەی (دئانۆنزینۆ) توانیی دەست بە سەر فەیومی دابگرێت و فەرەنسا و بەریتانیاش ڕازی بکات، کە دەبێت فەیومی بخرێتەوە سەر ئیتاڵیا.

هێزی بەیاننامەکەی دئانۆنزینۆ سەلماندی، کە هەڤاڵانی لە بزووتنەوەکە دڵیان بۆ براکانیان لە فەیومی کراوەیە بەرانبەر بە هەڵوێستە شەرمەزاریانەکەی حکومەتیش ئەم بزووتنەوەیە، بەم شێوەیە حکومەت بەرانبەر بە گەل لاواز و بێتوانا هاتە بەرچاو، بێتوانا لە ئاست بەرزکردنەوەی بەرپرسیارێتیی نەتەوایەتیی سەرشانی لە (١٩١٩). ئیتاڵیا درکی بەوە کرد، کە ئیتر کاروباری فەیومی لە بەردەستی خۆیەتی سەرەڕای ڕازی نەبوونی ویلسنی سەرۆکی ئەمەریکا.



گابریل دئانۆنیزۆ

بۆیە ئیتاڵیا بڕیاری دا ڕاستەوخۆ دانوستان لەگەڵ ئەو وڵاتانە بکات، کە پەیوەستن بەم پرسەوە، لەوانە یۆگسلافیا. ئەم دانوستانانە لە ١٩٢٠ بەڕێوە چوون، گەیشتنە ئەو ڕێککەوتنەی، کە فەیومی وەکو شارێکی ئازاد بمێنێتەوە.

سایسەتمەدارانی کۆن لە بەجێگەیاندنی ئامانجەکان شکستیان هێنابوو، دواتر ئەمە بەرپرسیارێتی مۆسۆلینە ئامانجە ناوخۆ و دەرەکییەکان بە جێبگەیەنێت، مۆسۆلینی دەستی بە دامەزراندنی پارتی (فاشستی) کرد، دەستی کرد بە دروستکردنی دەستەی ئەندامانی دژی بیری سیاسیی کلاسیکیی کۆن، ئەوانەی ترسیان لە بیری کۆمۆنیستی و سۆشیالستی توندڕەو هەیە زیان بە ئیتاڵیا بگەیەنێت. لەم ڕوانگەیەوە بزووتنەوەی فاشستی دژی بیری کۆمۆنیستی بوو زۆر بەتوندی، توندتر لە دژایەتیی بۆ ڕژێمی کلاسیکیی کۆن. کۆمۆنیزم ئامانجەکانی جیهانین، فاشیزم ئامانجەکانی ئیتاڵین و خزمەتی نەتەوەی ئیتاڵیا دەکات دژی چینەکان نییە، هەروەها هاوکاری لە نێوان بۆرجواز و کرێکارەکان ئامانجیەتی.

دوای وەستانی جەنگی یەکەمی جیهانیی هەندێک لەو سەربازانەی لە سوپا وەدەرنرابوون و بێئیش بوون چوونە ریزی ئەم پارتە، پەرەسەندنی لستی لایەنگرانی ئەم پارتە

لە زیاد بوون دابوو، تا وای لێهات لە هەموو شارەکان پەیوەستیەکی وا هەبوو لە توانایان دابوو ئاراستەی کارەکان وەرچەرخێنن دوای ئەوەی، کە کەمینە بوون. بە هۆی لەیەکنزیکبوونی بۆچوونەکانیان لەگەڵ بۆرجوازەکان ژمارەیەکی زۆری ئەم چینەی بۆخۆی راکێش کرد. بۆرجوازەکان لە گەشەکردنی کۆمۆنیزم دەترسان، لە هەمان کاتدا پارتی فاشیست پێویستیی بەم بۆرجوازانە و بەتایبەتیش گەنجەکانیان هەبوو، چونکە ئەوان بەدوای سەرکردایەتیی نیشتمانیدا دەگەڕان. دواتر ئەوان شێوازی پەرلەمانیی کۆنیان رەت کردبووەوە، ئەوان لە پارتی فاشستی بیری رێکخراوی لەسەر شێوازی ئیتاڵیایان دەبینی، ئەمەبوو هۆی چوونەڕیزی زۆرێک لە مامۆستایانی زانکۆ و خوێندکارەکانی بۆ ریز پارتەکەی مۆسۆلینی.

مۆسۆلینی جەختی لە چنگکەوتنی کرێکارەکانی دەکردەوە، چونکە بە چنگکەوتنی چینی کرێکار بەرەی کۆمۆنیستی لاواز دەبێت، ئەوان بە پشتبەستن بە چینی کرێکاران هەوڵی دەستگرتن بەسەر دەسەڵات دەدەن هەرکاتێک کرێکارەکان ریزی کۆمۆنیستەکان جێ بێڵن، ئەوان لاواز دەبن و فاشستیش بەهێزدەبێت.

لە سەرەتا زۆر لە کرێکارەکان نەچوبوونە ریزی پارتی فاشست، بەڵام لە پایزی ١٩٢١ مۆسۆلینی هەوڵ و تەقەڵای زۆری دا بۆ ئەوەی بەر لە سۆشیالیستەکان دەست بەسەر سەندیکاکانی کرێکاراندا دابگرێت.

مۆسۆلینی (سەندیکای فاشستی) دامەزراند بۆ ئەوەی کرێکارەکان لە بازنەی سۆشیالیستەکان دەرچن، بەڵام لەم بوارە رەنجەکانی بەو رادەیە سوودمەند نەبوون تا ئەوکاتەی دەسەڵاتی گرتە دەست.

لەتەک ئەم رێکخستنە حزبیە، مۆسۆلینی شێوازی پڕوپاگەندە و تۆقاندنی بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی پارتە بەرهەڵستکارەکان، پیاوە حزبیەکان چەکداربوون و دەستیان لە کوشتنی بەرهەڵستکارەکان نەدەپاراست، بە تایبەتی سۆشیالیست و کۆمۆنیستەکان، هێرشیان دەبردە سەر نەیاران و مومتەلەکاتیان لێ خاپور دەکردن.

ئەم دەستدرێژیانە یاسایی نەبوون و لە پێناویدا چەندی کەسی خاوەن رای ئازاد و بیری نەتەوایەتی تیاچوون، رۆژ لە داوی رۆژ ئەوە دەسەلمێنرا، کە ئەم پیاوە هیچی پێ قبووڵ نییە تەنیا بە تاکرەوی دەسەڵات بگرێتە دەست. لەگەڵ ئەوەی ئەو حکومەتەی

ئەوسا هەستی بە جوولانە سەربازییەکان و پیلان و تالانکاری و پاتالکردنی سەر و مالی هاوولاتیانی دەکرد، کە دژی سۆشیالیستەکانی ئەنجام دەدا، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم حکومەتە هیچ هەنگاوێکی وای نەدەنا تا سەر و مالی ئەم خەلکە لە دەست ئەو پارتە بپارێزێت. ئەمەش لەبەر ئەوە نەبوو، کە ئەقلیەتی وەزیرەکان کۆن وکلاسیک بوون، نەخێر بەڵکو بۆ هۆکاری تر دەگەڕێتەوە کە ئەمانەن:

١- حکومەتەکانی ئەوسای ئیتاڵیا دژی سۆشیالیستەکان بوون، کارە راوەدونانەکانی مۆسۆلینی و کوشتن و کاولکاریەکانی دژی سۆشیالیستەکان کارێک بوو لە جیاتی حکومەت ئەنجامی دەدا و پێویست بە مەی نەدەکرد دەستیان بگرێت.

٢- رای گشتی ئیتاڵیا دژی بیری کۆمۆنیستی بوو.

٣- سۆشیالیستەکان خاوەنی فەرماندەیەکی وەکو مۆسۆلینی بەهێز نەبوون، کە، بە گوتارە ئاگرینە نەتەوایەتیەکانی سەرنجی جەماوەر ڕابکێشێت .

دواتر دۆخەکان لە بەرژەوەندیی مۆسۆلینی دابوو تا دەست بگرێت بە دەسەلات ئەوکاتەی کارەکان روون و ئاشکرا دەبن، بەتایبەت دوای ئەوەی پارتی فاشستی دەبێتە بەهێزترین پارتی ئیتاڵیا ئەگەر خاوەنی زۆرینەش نەبێت.

مۆسۆلینی هەستی بەوە کرد بۆ ئەوەی ببێتە خاوەنی زۆرینەی رەها لە رووی ژمارەوە پێویستیی بە کاتێکی زۆرە، ئەمە دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت پارتی فاشی بەسەرەوەی بزووتنەوەی سۆشیالیستە، بۆیە دەستی بە داڕشتن و جێبەجێکردنی نەخشە پلانێک کرد بۆ گەیشتن بە فەرمانڕەوایی.

داوای کرد حکومەت دەبێت بە دابەشکردنی پۆستە وزاریەکاندا بچێتەوە لەسەر بنەمای هێز دابەشیان کات، بەم کارە پارتی فاشستی پێنج پۆستی وەزاریی بەردەکەوێت، بۆیە حکومەت ئەم داوایەی رەت کردەوە، لێرە هەنگاوی دووەم دەست پێ دەکات، ئەویش تەنگەتاوکردنی حکومەتە، بریاری دا هێرش بکاتە سەر رۆما.

هێرش بردنە سەر رۆما خاڵێکی وەرچەرخانی مەزنە لە مێژووی ئیتاڵیا و مێژووی مۆسۆلینی و بەتایبەت پارتە فاشیستەکەی، داوای لە ئەندامانی پارتەکەی کرد لە کاتژمێری دیاری کراودا لە دەوروبەری رۆما کۆببنەوە، ئەم بڕیارە بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی نێوان وەزارەتە کلاسیکیەکەی (فاکتا) و بزووتنەوە فاشیەکەی مۆسۆلینیە.

فاکتا هەستی بەوە کرد کارەکانی لەدەست دەرچوون بەرانبەر بە دەرچوونی پارتێک لە بنەماکانی حکومەت و هێرشبردنە سەر پایتەخت بەنیازی رووخانی حکومەت بە رێگەی هێز، وەکو بەرپرسیارێتیی نیشتمانی دەبێت کارێک و ئامادە باشییەک بکات. مەبەستی بوو بە هێز رێگە لە فاشییەکان بگرێ بۆ ئەوەی لە دەوروبەری رۆما کۆنەبنەوە، داوای لە پادشا کرد (حوکمی عورفی) رابگەیەنێت، لە ترسی ئەوەی وڵات نەکەوێتە جەنگێکی ناوخۆ ئەم داوایەی فاکتای جێبەجێ نەکرد، تا بە چارەسەریەکی مامناوەندی کێشەکە چارەسەر بکات.

لە ٢٨ی ئۆکتۆبەر وەزارەتەکەی دەستیان لە کار کێشایەوە، پادشا داوای لە (سالاندرا) کرد وەزارەت پێک بێنێت و لە حکومەتەکەی هەندێک وەزیری فاشی هەبن. بەڵام نیشاندانی ئەم هەڵوێستە لاوازەی حکومەتە کۆنەکە و پادشا مۆسۆلینیی توشی لەخۆباییبوون کرد، بۆیە هەنگاوی دواتری راگەیاند، کە بریتی بوو لەوەی خۆی بەتەنیا ببێتە سەرۆکی حکومەت. لەم داواکاریە نوێیەی پێی داگرت، پادشا ناچاردەبێت بە داخوازیەکانی مۆسۆلینی رازی دەبێت، کە مۆسۆلینی ببێتە سەرۆ وەزیران و لە نۆڤەمبەری ١٩٢٢ پۆستی سەرۆک وەزیران بە مۆسۆلینی دەسپێردرێت. هەندێک تایبەتمەندی هەبوون هۆکاری گرتنەدەستی پۆستەکانی وەزاری و پایە بەرزەکانی فاشست بەتەنیای مۆسۆلینی بگرێتە دەست، ئەوانیش بریتی بوون لە:

١- جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە دژی رژێمی پادشا نییە، کەوایە پادشا لە شوێن خۆی دەمێنێتەوە، هەرچەندە توانیی هەموو دەسەڵاتەکانی، کە لە داهاتوو دژی فاشستی بەکار دەهێنا، لێی سەندبوونەوە. کەسانێکی زۆریش هەبوون، کە لایەنگرانی پادشا بوون، مۆسۆلینی خۆی لێ دەپاراستن لە دەست لێوەشاندن، چونکە پێویستی پێ نەبوو.

٢- مۆسۆلینی پێویستی بە متمانەی سوپا هەبوو، بۆیە وەزارەتی بەرگریی بە جەنەرال (دیاز) سپارد پاڵەوانی (ڤیتۆریۆ فینیتۆ).

٣- ئەوکات هێشتا پارتی فاشستی لە توانایدا نەبوو بەناوی زۆرینە بدوێت، مۆسۆلینی پێویستی بە کات هەبوو تا بتوانێت هەموو دەسەڵاتەکان بخاتە ژێر دەستی خۆی و لە

توانایدابێت رێورەسمی فەرمی دەربکات، تا خۆی و پارتەکەی بەسەر کارەکاندا بسەپێنێت. گرنگترین هەنگاو لەم پێناوە دەرکردنی یاسای ئەشیربۆ بوو لە ١٩٢٣.

ئیتاڵیا وڵاتێکی فرە پارت بوو، هیچ لە پارتەکان لە توانایاندا نەبوو بەناوی زۆرینە بدوێن، بەڵام مۆسۆلینی توانیی لە رێگەی یاسای ئشیربۆ لە ١٩٢٣ یاسایەک دەربکات و ئەم شوێنە بۆ خۆی مسۆگەر بکات. یاساکە دەڵێت: زۆرترین دەنگی پارتەکان لە هەڵبژاردن دوو لەسەر سێی کورسیەکانی پەرلەمان دەباتەوە، بەم شێوەیە دەبێتە زۆرینە و کار و بڕیارەکان هەموویان دەکەونە دەست ئەو پارتە، مۆسۆلینی دوای ئەوەی دڵنیابوو دەنگەکانی لە سەرەوەی سۆشیالیستەکانە، ئەم یاسایەی دەرکرد و بەم رێگەیە زۆرینەی پەرلەمانی بردەوە.

مۆسۆلینی بووە خاوەنی زۆرینەی پەرلەمان، وردە وردە دەسەڵاتی فراوانتر بوو، لە توانایدا بوو پڕۆژەکانی ناوەوە و دەرەوەی جێبەجێ بکات، لە کۆتاییدا رووی لە بنیادنانی دەوڵەتی ئیتاڵیای نوێ کرد.

وێنەی ئەو دەوڵەتە چۆنە، کە مۆسۆلینی مەبەستیەتی دروستی بکات؟ دەوڵەت دەبێت لەژێر فەرمانێکی بەهێزی کارابێت، حوکمی پەرلەمانی و وڵات و حکومەت و گەلی گەندەڵ کردووە، ئەمە بە هۆی ئەو سیاسەتمەدارە شارەزایانە لە بواری گەمەی سیاسی و پەرلەمانی و بادانەوەکانیان لە پێناو بەرژەوەندییەکانی تایبەتی و پشتگوێخستنی بەرژەوەندییەکانی نیشتمان رویان داوە.

ناپلیۆن ئەم حاڵەتەی بەم شێوەیە شیکردەوە، کاتێک دەڵێت:

(ئەو ئازادییەی سەرکردە پەرلەمانتارەکان بە شکۆداریەکەی دەنازن، هیچ نییە تەنیا لاشەی ئازادییەکی بۆگەنە، ئازادییە تاکەکەسیەکان دەبێت بخرێنە ژێر چاودێری و لە خزمەت دەوڵەت بەگشتی دابن. دەبێت تاک لەناو دەوڵەت بتوێتەوە، بە هەموو تواناکانیەوە لە پێناوی گیانی ببەخشێت، لەسەر ئەم بنەمایە مۆسۆلینی سیستەمی نوێ حوکمی دانا).

خۆی سەرۆکە (دۆتچێ )[51] و [52]خاوەنی دەسەڵاتی باڵایە لە وڵات وەکو سەرۆک حکومەت و هەموو دەسەڵاتەکانی بەدەستە، خۆی وەزیر دادەمەزرێنێت و خۆشی لایان دەبا،

---

[51] یا مۆسۆلینی.

فەرماندەی سوپایە، پادشا هیچ دەسەلاتێکی نییە تەنیا ئیمزا کردنی ڕێوڕەسمەکان و بڕیارەکان نەبێت.

لە ڕاستیدا ئیتاڵیا لەژێر حوکمی پادشایەتی مابوو وەکو رواڵەتێکی تیۆریی لەسەر بنەمای ئەو دەستوورەی لەساڵی ١٨٤٨ لە سەردەمی شارل ئەلبێرت دەرکرا، بەلام وەکو رواڵەت وانەبوو. لە سەردەمی مۆسۆلینی کەس بۆی نەبوو دەست بخاتە پێش کارەکانی مۆسۆلینی، هەر خۆی بوو و کەسی تر نا. رووکەشی پەرلەمانیی حوکم وەکو خۆی مایەوە، مۆسۆلینی هەندێک گۆڕانی خستنە ناو ئەنجومەنەکانی پیران و نوێنەران، کە بە هۆیەوە هەموو کارەکان لەژێر ئاڕاستە و فەرمانەکانی ئەو بن، ئەنجومەنەکان هیچ دەسەلاتی ئەوەیان بۆ نەمایەوە تا سیاسەتی ولات بەرەو ئاڕاستەیەک بەرن یان لێپێچانەوە لەگەڵ یەکێک بکەن، گەر مۆسۆلینی رازی نەبێ. ئەنجومەنی پیران بە دامەزراندن بوو نەک هەڵبژاردن، کەس بۆی نەبوو کورسییەک لەم ئەنجومەنە وەدەست بێنێ ئەگەر دۆتچێ (مۆسۆلینی) رازی نەبووایە.

ئەنجومەنی نوێنەرانیش لە ڕێگەی سەپاندنی لیستێکی پارتی فاشستی بەسەر دەنگدەران هەموو ئەوانە دەردەچوون، کە پارتی فاشستی دەستنیشانی کردبوون.

بەم سیستەمە مۆسۆلینی ئەوەی مسۆگەر کرد کە هەموو ئەوانەی لەم دوو ئەنجومەنە ئەندامن بەرهەڵستکاری سیاسەتەکەی نین، مایەوە دەست بەسەر دەسەلاتەکانی یاسادانان‌دا بگرێت، دەسەلاتی بە حکومەت دا، کە لە کاتی پێویست بۆی هەبێت یاسا و بڕیاری پێویست دەربکات. بۆیە حکومەت دەتوانێت بە دەرکردنی هەر بڕیار و یاسایەک یاساوی خۆی هەبن زۆر بەئاسانی. سەرباری ئەم و ئەو حکومەت لە پەرلەمان دابڕابوو، پەرلەمان بۆی نەبوو حکومەت بڕوخێنێت یان متمانەی لێ بسەنێتەوە یان بەرپرسیاری کات، بەم شێوەیە پەرلەمانیش متمانە و دەسەلاتەکانی خۆی لەدەست دابوون.

[٥٢] ئەو دۆخانەی بوونە هۆکار هەموو کارەکان بکەونە دەست مۆسۆلینی، تاوانبارکردنی بە کوشتنی رووداوی نوێنەری سۆشیالیست ماتێنۆ یەکێک لە سەرکردە بەرهەڵستکارەکان لە رۆما زۆر لە رۆژنامە و سیاسەتمەداران داوایان کرد مۆسۆلینی دەست لە کار بکێشێتەوە و بێگوناهی خۆی لەم کارە بسەلمێنێت. بەلام مۆسۆلینی گوێی بەم داوایانە نەدان، رایگەیاند کە نەدەست لە کار دەکێشێتەوە و نە داوای لێبووردنیش دەکات، چارسەریش بۆ ئەم کێشەیە تەنها هێزە، هەموو رکابەرەکانی خۆی لەناو بردن.

دوای ئەمانە مۆسۆلینی ویستی هەموارێکی بنەڕەتی لە یاسای نوێنەرایەتی گەل بکات، هەڵبژاردنەکانی کردنە سەر بنەمای ئابووریی، سەندیکاکان کۆدەبوونەوە و نوێنەریان دەست نیشان دەکردن، ئەم سەندیکایانە دەبوونە هێزی ڕاستەقینەی وڵات و نوێنەری گەلی لەناوی دەچووە دەر.

دواتر گەلی لە کێشە و بەگژیەکداچوونەوەی چینەکانی دوور دەکردەوە، لە ١٩٣٠ دامەزراندنی (ئەنجومەنی نیشتمانی)ی ڕاگەیاند، کە لە نوێنەری سەندیکاکان هەڵبژێردرابوو، لە هەمان کاتدا نوێنەری بۆرجوازیەکان و ڕووناکبیرانی پشتگوێ نەخستبوو.

ئامرازی بەهێز لە بەردەستی مۆسۆلینی دابوون، کە لە توانای دابوو بەسەر هەموو دەزگا حکومی و ناحکومیەکاندا زاڵ بێت، ئەویش پارتی فاشستی بوو. ئەوەندەی نەبرد بووە تاکە پارتی وڵات، کە دەبێت هەموو هێزە نیشتمانییەکانی وڵات بگرێتە خۆ لە پێناو یەکبوونی گەل لە کارە بەرهەمهێنانیەکانیان بێ ئەوەی پارتە بەرهەڵستکارەکان بتوانن تووشی سەریەشە و ناڕەحەتیان کەن.

لە پێناو پتەوکردن و جێبەجێکردنی سیاسەتەکەی دەبێت هەموو پارت و دەزگا ڕکەبەرەکان لە کارکردن قەدەغە بکات، گوایە دەوڵەت خۆی کار بۆ بەرهەمهێنان دەکات، تەنیا دەوڵەت بۆی هەیە پەرە بە بەرهەم بدا، ڕاستیەکەی خۆی جێی ئیمپڕاتۆری ڕۆمانیی گرتەوە. دەستی بەسەر ڕۆژنامە و ڕۆژنامەگەرییدا گرت، هەموو بڵاوکراوەکان دەبووایە لە خزمەت فاشستدا بوونایە، تەنانەت جارێکیان ڕۆژنامەیەکی فاشستی نووسیبووی، ئەرکی ڕۆژنامە تەنیا پڕوپاگەندەکردنە لە بەرژەوەندی فاشست. دواتر هەوڵی ڕزگارکردنی ئیتاڵیای دا لە دەست سیستەمی فەرمانگەی هەڵبژاردنی کۆن، سیستەمەکە ئیتاڵیای دابەش چەند هەرێمێک دەکرد، هەر هەرێمێك یەک نوێنەر هەڵدەبژێرن لەوانەی لە ڕۆژانی سەخت خزمەتیان بە ئیتاڵیا گەیاندووە. دیدی مۆسۆلینی بۆ باشترین سیستەمی حوکم بەم شێوەیە بوو:

١- تاکە سەرکردەیەکی دەستکراوەی حوکمی ڕەهای هەموو دەسەڵاتەکانی بەدەست بن، بۆیە ئەم خۆی خاوەنی هەشت وەزارەت بوو لە ئەنجومەنی وەزیرانی، کە لە ١٨ وەزارەت پێکهاتبوو، سەرۆکی تاکە پارتی وڵات بوو (پارتی فاشستی)، ناڕاستەی

ڕاستەقینەی (ئەنجومەنی باڵای پارتی فاشستی بوو)، کە بەرزترین و بەهێزترین پارتی وڵات بوو دوای هەرەسهێنانی پەرلەمان، هەر خۆشی فەرمانندەی گشتی سوپا بوو.

٢- ڕێکخستنی گەنجی کوڕ و کچ لە کۆمەڵەی گەنجانی نیمچە سەربازگەیی، تیایدا وانەی بڕوابوون بە ڕۆڵی شارستانی ئیتاڵیا و دڵسۆزیان بۆ سەرۆک مۆسۆلینی بخوێندرێت.

٣- ئاڕاستەکردنی کاری ئابووری لە خزمەت نیشتمانپەروەری و جەختکردنەوە لەسەر تواندنەوەی تاک لەناو کۆمەڵ و چالاککردنی لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی ئیتاڵیا لەناو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی.

لە بواری دەرەوە، مۆسۆلینی لەو کەسە چالاکانە بوو، کە دەسەڵاتی ناوخۆی مکوم و پتەو کردن، ئەمە بوونە مایەی ئومێدەکانی ئیتاڵیا لەم بوارانە بە دەرەوە پابەند بن:

١- پەیوەدنیەکانی حکومەتی فاشیزم بە لایەنگرانی پاپاوە.

٢- چالاکیە فراوانخوازی و ئیمپریالیزمیەکەی.

## ١- پەیوەندیی فاشیزم بە لایەنگرانی پاپاوە

پاپاخوازەکان لە ١٨٧٠ لەو کاتەی فیکتۆر عەمانۆئیل هاتە رۆما لەگەڵ حکومەتی ئیتاڵیا لە پەیوەندییەکی نائاسایی دابوون، ئەم پەیوەندییە خراپەی نێوان هەردوو لایەن خالێکی لاواز بوو لە بزووتنەوەی ژیانەوەی ئیتاڵی. لە ڕاستیدا ئیتاڵیا بە گرتنەخۆی خاکەکانی پاپاخوازەکان یەکێتیی ئیتاڵیای بە ئامانج گەیاند، دواتر لە ١٨٧٠ رۆمای خستەوە سەر ئیتاڵیا. لۆرد (ئەکتۆن) ڕاستگۆبوو کاتێک وتی: (کافور پێیەکانی خستنە سەر شوێنێک، کە پیرۆزترە لە تیجانی پادشاکان). جێی ئاماژەیە ئەوەی کافور و ڤیکتۆر عەمانۆئیل و سیاسەتمەداران و سەرکردەکانی بزووتنەوەی ژیانەوەی ئیتاڵیا و یەکێتی ئیتاڵیا لە بەرانبەر بە پایەی پاپا پێی هەڵسان، خراپتر نەبوو لەوەی ئینگلیز و فەرەنسییەکان بەرانبەری کردیان، ئەمە لە کاتێکدا ئیتاڵییەکان ڕووبەڕووی هەوڵێستێکی ئاڵۆز ببوونەوە، ئەویش بەگژیەکداچوونەوەی بیری یەکێتی ئیتاڵیا بە بیری مافی دێرینی بۆ پاپا.

بە هەر حاڵ ڤیکتۆر عەمانوئیل دەستی لە پایەی پاپا نەدا و تەنیا دەسەڵاتەکانی ئایینیی لێ نەسەندەوە، بەڵکو دەسەڵاتە دونیایەکانیشی لێ سەندەوە، تەنها پادشایەتی فاتیکانی بۆ هێشتەوە، چونکە ئاراستەکانی جیهانی بڕوایان وابوو، کە کەسی پاپا پیاوێکی پیرۆزە و کورسیەکەشی مافی پاراستنی هەیە، پاپاش مافی بەستنی پەیوەندیی لەگەڵ دەرەوە هەیە لە ڕێگەی ناردنی نوێنەری سیاسی، ئەمەش لە چوار چێوەی یاساکانی ئیتاڵیا دەکرێن نەک یاساکانی نێودەوڵەتی. ئەم پایە بەرزە جیهانییە و ئەم پەیوەندییە سەپێندراوەی لەگەڵ ئیتاڵیا پاپاخوازەکانی خستبووە هەڵوێستێکی لەرووداماو بەرانبەر بە حکومەتی ئیتاڵیا، هەروەها حکومەتی ئیتاڵیاش لە بەرانبەر بە پاپا لەرووداما، چونکە وەکو دەوڵەت لەناو دەوڵەتدا بوو، بەتایبەتی کە لە میانەی جەنگی یەکەمی جیهانیی پایەی پاپا ئاستی بەرزبووەوە، ئەمە دوای ئەوەی فەرەنسا و بەریتانیا نوێنەری دیبلۆماسیان لەگەڵ پاپا ئاڵوگۆڕ پێکرد ئەم پایە نێودەوڵەتییە زیاتر گەشەی کرد. لێرە مۆسۆلینی پێویستی بە لەیەک تێگەیشتن هەبوو لەگەڵ پاپا بۆ ڕێککەوتن لەسەر چۆنیەتی پەیوەندییەکان، ئەمانە بوونە هۆکاری رووپۆشکردن بۆ بەستنی ڕێککەوتنێک، کە ناوی نرا ڕێککەوتنی (لاتران) لە ١١ی شوباتی ١٩٢٩.

ئەم ڕێککەوتنە بریتی بوو لە پەیماننامە و گرێبەست، تیایدا ئیتاڵیا دان بە فاتیکان دەنێ وەکو دەوڵەت، کە خاوەنی دەروازەیەکە لەسەر دەریا و خاوەنی کۆشکی فاتیکانە بە هاوپێچەکانییەوە، هەروەها پاپا خاوەنی سەروەریی و کەسایەتیەکی نێودەوڵەتییە و کەنیسەش مافی ئەوەی هەیە لێپێچانەوە لەسەر ئەو کێشانەی پەیوەندییان بە کەنیسەوە هەیە بکات بێ نارازیبوونی حکومەت، مادام مەترسی لەسەر حکومەتی ئیتاڵیا دروست ناکات. هەروەها حکومەت دووپاتی کردەوە، کە دامەزراندنی قەشەکان بەدەست پاپا دەبێت بێ دەستێوەردان لەلایەن حکومەتەوە، تەنیا ئەگەر هۆکاری سیاسیی بەهێز هەبوون، کە زیان بە حکومەت بگەیەنن، ئەوسا حکومەت دەتوانێ لاریی هەبێت، ئەمەو حکومەت بڕیاری دا ڕێز لە خوێندنی ئایینیی بنێت و لە خوێندنگاکان بخوێندرێت.

مۆسۆلینی لە بەستنی پەیماننامە و گرێبەستەکان لەگەڵ پاپا سەرکەوتنی باشی وەدەست هێنا، تا مێژوونوسێکی ئینگلیزی وتبووی: پاپا رووناکیی بە حکومەتی فاشستی دا، ڕەونەقێک کەس تائێستا نەیتوانیوە ئەم درەوشانەوەی پێ بدا، هەر ئەمەشە دەبێتە

مایەی مانەوەی حکومەتی فاشستی لەسەر حوکم. گومان لەوەدا نییە مانەوەی دیکتاتۆر مۆسۆلینی ماوەی ٢١ ساڵ لەسەر حوکم لایەنی هەرە زۆری چاکەکە بۆ پشگیریەکانی پاپا لە مۆسۆلینی دەگەڕێنەوە.

مۆسۆلینیش لەم بارەیەوە وتبووی: "مرۆڤ دەتوانێت لە کاتێکدا ئیتاڵیەکی چاک بێت (مەبەستی فاشستی)، لەهەمان کاتدا کاسۆلیکێکی چاکیش بێت".

## ٢- چالاکی فاشستیی فراوانخوازی و ئیمپریالیزمی

هەر لەسەرەتاوە چالاکیەکانی مۆسۆلینی بۆ ئەوە بوون تا ئیتاڵیا ببێتە یەکەم وڵات لە گۆمی دەریای سپیی ناوەڕاست، ئەگەر سەیرکی ئەو هێزانە بکەین، کە دەڕواننە سەر دەریای سپیی ناوەڕاست، دەتوانین شوێنی ئیتاڵیا و مەترسی و ئامانجەکانی مۆسۆلینی دیاری بکەین، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێت کە:

١- کۆماری تورکیا دەیەوێت لە ئاسەواری شکستەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی رزگاری بێت، بەڵام تا ئێستا لەهەنگاوە سەرەتاییەکانە و ناتوانێت ڕۆڵێکی ئەرێنی لە ئاڕاستەکردنی تواناکان روەو گۆمی دەریای سپیی ناوەڕاست ببینێ.

٢- نوێنەرایەتیی (انتداب) فەرەنسا لە سوریا و لوبنان وەی ئینگلیز لە فەلەستین ڕۆڵ و کاریگەریی وڵاتە عەرەبیەکانی لەسەر گۆمی دەریای سپیی ناوەڕاست پووچەڵ کردووە، ئەوەی ڕۆڵ دەبینێت فەرەنسایە، کە دەستێکی لەناو جەزائیر، تونس، مەراکش، لوبنان و سوریایە و لە توانای دایە ڕۆڵێکی ترسناک بگێڕێت و لە ڕۆڵی بەریتانیا کەمتر نییە، کە لە فەلەستین و میسر و ماڵتا و چیای تاریق و قوبرس دەگێڕێت.

٣- یۆنان لە ١٩٢٢ بەرانبەر بە تورکیا بە دۆڕاوی لێی دەرچوو ئەوکاتەی هێزەکانی تورکی سوپاکانی یۆنانیان لە ئەنادۆل وەدەرنا، دوای ئەوە یۆنان هیچ ڕۆڵی نەما، نە سیاسی و نە سەربازی، بە هۆی ئەوەی لە بەرانبەر لەشکرێک خۆی نەگرت، کە لە جەنگی یەکەمی جیهانیی بە بەزیوی وەدەرنرابوو ئەویش تورکیا بوو.

٤- ئیسپانیا بەسەر خۆیدا دابەش ببوو، ڕووبەڕووی قەیرانی ناوخۆ ببووەوە لە توانایدا نەبوو هیچ ڕۆڵێکی سەرەکی لە گۆمی دەریای ناوەڕاست بگێڕێ.

٥- بەڵام ئیتاڵیا تێڕوانینی مەزنی هەبوون، هەروابوو لە دەریای ناوەڕاست دوورگەی داگیر کردبوو (دوورگەی دودەکانیز) و رۆدس، لیبیا بەوە بەریتانیا تاوانبار دەکات و پێی دەڵێت: ئێوە (ئینگلیز) داگیرکەرن، گۆمی دەریای ناوەڕاست دەبێت خەڵکی خۆی بیگێڕێت. لەڕاستی لە ئاست ئەم تیۆرە فەرەنسا لە ئاست ئیتاڵیا دایە، بەڵام فەرەنسییەکان رازی نین ئەوان و ئیتاڵییەکان لە یەک ئاستدا بن، چونکە ئەوان ماوەی چوار سەدە لە مێژووی ئەورووپا لە پێناو ئەم گۆمە جەنگ و دیپلۆماسیەتیان کردووە. فەرەنسا ڕۆڵی سەرەکی لە ئاڕاستەکردنی تواناکانی گۆمی دەریای ناوەڕاست دەگێڕێت، بەتایبەت لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم.

مۆسۆلینی بەڵگە و پاساوی مێژوویی هەبوون، کە ئەم بۆچوونانەی فەرەنسییەکان پووچەڵکاتەوە و بە هەندیان وەرنەگرێت، ئیتاڵیا دڵە زیندوەکەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیا بوو، هەموو گۆمی دەریای سپیی ناوەڕاست هەر لەوپەڕی رۆژهەڵاتەوە تا ئەوپەری رۆژئاوا لەژێر دەسەڵاتی دابوو. لە گوتارێکیدا مۆسۆلینی لە ١٤ ئۆ کتۆبەری ١٩٢٢ دەڵێت:

(ئەگەر ئیتاڵییەکانمان وەکو تاکە هێز بەرەو ئەرکە جیهانیەکان برد و دەریای ناوەڕاست وەکو دەریاچەی خۆمان لێهات، پەیوەندیمان لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەسەر ئەو دەریایە دەژین هەبوو، ئەوەی وەکو مشەخۆر لەوێ دەژیا دەرمانکرد. ئەگەر ئێمە ئەو کارە قورسە بکەین، بەڕاستی ئەوسا سەردەمێکی مەزن لە مێژووی ئیتاڵیا دەست پێدەکەین.) سیاسەتی کردنی دەریای ناوەڕاست بە دەریاچەی ئیتاڵیا (واتە دەریاچەی خۆیان) ئەوە سیاسەتی مۆسۆلینییە، کە ئاگری لە هەستی ئیتاڵییەکان بەردابوو. ئاسایی بوو هەریەک لە فەرەنسا و بەریتانیا هەر جووڵانەوەیەکی سیاسی و سەربازیی ئیتاڵیا بەهەند وەرگرن، بۆ هیچ نا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ئاساییەکانیان لەو ناوچەیە. بەڵام ئیتاڵیا بە هێزەوە هەوڵی ئەوەی دەدا هەندێک لە وڵاتە ئەورووپییەکان لەم دەستکەوتانە بەشدار بن، لێرە دانوستان لە نێوان ئیتاڵیا و وڵاتە پەیوەندیدارەکان سەبارەت بەم بابەتانە دەستیان پێکردن:

١- ئیتاڵیا و گرتنەخۆی فەیومی.
٢- ئیتاڵیا و کێشەی ئەلبانیا.
٣- بەشداریکردنی ئیتاڵیا لە بەڕێوەبردنی تەنجە.
٤- ڕاستکردنەوەی سنوور لە نێوان لیبیا و میسر (بەریتانی)

٥- ڕاستکردنەوەی سنوور لە نێوان لیبیا و تونس (فەرەنسا).
٦- بەهێزکردنی پێگەی ئیتاڵیا لە تونس.
٧- داگیرکردنی حەبەشە.

## ١- گرتنەخۆی فەیومی

کەمتەرخەمی حکومەتی جیۆلتی لە پشتگیری و پاڵپشتیکردنی هەوڵەکانی شاعیری ئیتاڵی (دانۆنزیۆ) لە فەیومی، بەڵکو دەرکردنی لە جیاتی پشتگیری لێ کردن، ماکێکی ڕەش بوو بە مێژووی حکومەتەکانی بەر لە مۆسۆلینییەوە، دیسان خاڵی لاوازی مۆسۆلینی بوو لە بەکارهێنانی، هەر کە بەرپرسیاری گرتە ئەستۆ دەبووایە ئەم حەزەی جەماوەر بە ئامانج بگات. مۆسۆلینی دڵنیابوو لەوەی هێزی دەریایی و زەمینی بەشی ئەوەن بۆ ئەوەی دیفاکتۆیەک بەسەر ڕەوشی دوژمنانیدا بسەپێنێت، دواتر ئەو کێشانەی لە بیستەکان ڕووبەڕووی ئەوروپا ببوونەوە بەس بوون بۆ ئەوەی ئەوروپا هەوڵی ڕازیکردنی ئیتاڵیا بدات، تا کێشەکان مەزن نەبن، وە سەلماندی کە ئەوروپا دەستەوەستان دەوەستێت کاتێک ئیتاڵیا لە ١٩٢٢ دوورگەی دۆدیکانز لە ١٩١١ لە تورکیای داگیر کرد، ئەوسا کەس هیچ هەڵوێستێکی نەنواند، بۆیە ئەم جارەیان هەنگاوێکی خەتەرناکتری نا. لە ساڵی دواتر بڕیاری خستنەوەسەرخۆی فەیومیی دا، لەو کاتەوە وڵاتانی بەلکان سەیری ئیتاڵیا دەکەن وەکو هێزێکی هەڕەشە بۆ سەر ئاشتیی ناوچەکە، بەتایبەت ئەو سەرکەوتنەی فاشست بەدەستی هێنابوو ڕاگەیاندنەکان مەزنتریان دەکرد، ئەمە وایکرد ئیتاڵییەکان لە چاوەڕوانیی کاری مەزنتر بن، هەنگاوی ئەمجارەی ڕووەو ئەلبانیا بوو.

## ٢- ئیتاڵیا و ئەلبانیا

ئەلبانیا لە ئەنجامی جەنگی بەلکانی – تورکی لە ١٩١٣/١٩١٢ لە دایک بوو، هەوڵەکانی حکومەتی نەمسا و هەنگاریا و ئیتاڵیا بوونە هۆی دروستبوونی دەوڵەتی ئەلبانیا بۆ ئەوەی وڵاتی سربیا بە کەنار دەریای ئەدریاتی نەگات. لە ١٩١٤ یۆنان و ئیتاڵیایان دابەشیان کرد، دواتر لە ١٩١٥ نەمسا وەری دەگرێتەوە تا هێزەکانی سرب و ئیتاڵی و فەرەنسی لە ١٩١٨ڕزگاری دەکەن. لە دیسەمبەری ١٩١٨ ئەنجومەنێکی

نیشتمانی و حکومەتێکی بۆ دادەمەزرێنن، سنوورەکانی ئەلبانیا بۆ ساڵی ١٩١٣ گەڕایەوە و چووە ناو کۆمەڵەی نەتەوەکان، سەرەڕای داواکارییە زۆرەکانی ئیتاڵیا بۆ ئەوەی ببێتە نوێنەر (انتداب)ی ئەلبانیا، بەڵام سەرۆکی ئەمەریکا ویلسۆن بەمە رازی نەبوو، چونکە لە چاوتێبڕینەکانی ئیتاڵیا بەرانبەر بە ئەلبانیای دەزانی.

لە سەرەتای بیستەکان (احمد زەگۆ)، کە سەرکردەیەکی مسوڵمان بوو لە بەهێزترین کەسایەتیەکانی ئەلبانی بوو و بوو بە سەرۆکوەزیران، بەڵام ڕووبەڕووی یاخیبوونێکی بەهێز بووەوە بە سەرۆکایەتی قەشە (نۆلی)، لە ١٩٢٤ زۆگۆ ناچار دەبێت لە وڵات راکاتە دەرەوە، بەڵام حکومەتی نۆلی لە بەڕێوەبردن وڵات سەرکەوتونەبوو، دواتر احمد زۆگۆ توانیی بە هاوکاری یۆگۆسلافیا بگەڕێتەوە وڵات. لە ١٩٢٤ کۆماری ئەلبانیای راگەیاند، خۆی بوو بە سەرۆکی کۆمار لە ١٩٢٥.

دوای ئەوە زۆگۆ رووی لە رزگارکردنی ئابوورییەکانی وڵات کرد، بەڵام ڕێگەیەکی خەتەرناکی گرتە بەر، ئەویش قەرز کردن لە وڵاتە چاوبرسییەکەی ئیتاڵیا بوو، بۆیە دەبینین مۆسۆلینی قەرز لە دوای قەرزی پێ دەدا تا وڵاتی خستە ژێر قەرزەکان و بەردەستی ئیتاڵیا، ئەوسا ئەم رەوشەی لە پەیمانێک، کە ناونرا پەیمانی تیرانا، لە نێوان ئەلبانیا و ئیتاڵیا لە ١٩٢٦ ئیمزا کرد.

یۆگسلافیا ئەم پەیمانەی دژی خۆی دەبینی بۆیە لە فەرەنسا نزیک بووەوە تا لەگەڵی بکەوێتە پەیمانێک، کارەکان وا پێویستیان دەکرد رۆژ بەدوای رۆژ ئەلبانیا لە ئیتاڵیا نزیک بێتەوە، پەیمانی تیرانا لە ١٩٣١ نوێکرایەوە، دوو ساڵ پێشتر زۆگۆ بێ ئەوەی دیموکراتییەت لە وڵات پیادە بکات، خۆی وەکو پادشای وڵات راگەیاند، هەستیشی بەوە دەکرد کە ئیتاڵیا دەستی خستۆتە ناوەوەی خەریکە لە باریەکی دەبا. هەندێک هەنگاوی نا دژی بەرژەوەندییە ئابووری و رۆشنبیرییەکانی ئیتاڵیا لە ئەلبانیا لە ١٩٣٢، مۆسۆلینی هەر زوو کەرتێکی کەشتیگەلیی بۆ بەندەری دوورازۆ نارد، زۆگۆ ناچار دەبێت ئەم کارانە رادەگرێت، بەڵام فراوانکاریەکانی هیتلەر ئەوەندەیان پێنەچوو هانی مۆسۆلینیان دا تا ئەویش شتێك بۆخۆی وەدەست بێنێت، هێزەکانی بۆسەر ئەلبانیا ناردن و لە ١٩٣٩ پایتەختەکەی لێ داگیر کرد.

### ٣- تنەجە

بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی دەستەکانی فەرەنسا لە مەراکش کراوە بوون، بەڵام بەریتانیا رازی نەدەبوو فەرەنسا بە تەنیا دەست بەسەر تەنجەدا بگرێت، بۆیە بە پێی پەیمانێک لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا لە ١١ی ئایاری ١٩٢٤ ئیمزا کرا، بەڕێوەبردنێکی نێودەوڵەتیان بۆ دەست نیشان کرد لەگەڵ بێلایەنی بەنی. بەڵام هەموو لایەک دەزانێت، کە فەرەنسا خۆی خاوەنی بڕیاری یەکەم و دواییە لەم ئیدارەیە بە هاوکاری بەریتانیا.

ئیمزاکردنی ئەم پەیماننامەیە بە دیدی مۆسۆلینی لەگەڵ ئەو ڕێککەوتنە ناگونجێت، کە رێگە بە ئیتاڵیا دەدا خاوەنی ڕۆڵی یەکەم بێت لە کێشەکانی گۆمی دەریای سپیی ناوەڕاست، لەم فشارانەی مۆسۆلینی کردنیە سەر فەرەنسا و بەریتانیا ئەوەبوو ئسپانیا ناڕەزایی خۆی دەربڕی، کە دەبێت ئیتاڵیا بەشداری لە بەڕێوەبردن تەنجە بکات وەکو ئەوەی لە پەیمانی ١٩٢٦هاتووە، فشارەکە بەرهەمی بوو، بە بڕیارەکانی خۆیاندا هاتنەوە، لەسەر ئەوە رازی بوون ئیتاڵیاش لە بەڕێوەبردن ئیدارەی تەنجە بەشدار بێ. ئیتاڵیا بە سێ ئەندام لە ئەنجومەنی یاسادانانی شار بەشدار بوو، کە ئەندامەکانی فەرەنسی و بەریتانی و ئیسپانی بوون لەگەڵ کەمینەیەک لە هاوولاتیە مەدەنییەکان.

ڕۆژنامەکانی ئیتاڵیا ئەم دەستکەوتەیان لە بەرژەوەندی مۆسۆلینی بە رادەیەک مەزن کرد، ئەوەی ڕاستی بێت هیچ دەستکەوتێکی ماددی لەم بەشدارپێکردنەی ئیتاڵیا نەبوو، تەنیا وەکو رووکەش و لە رووی ئەدەبیاتەوە بەشدارییەک کرا، دەنا سوودی ئابووریی و سامانیی لێ وەدەست نەکەوتن. مۆسۆلینی لە هەر دەستکەوتێک سەرکەوتنێکی مەزنی بەدی دەکرد، کە لە پێناویدا هەنگاویان دەنا، دەبووایە دام و دەزگا حکومییەکان بۆ ئەم دەستکەوتانە ڕێکلامی زۆر بکەن.

### ٤- ڕاستکردنەوەی سنوورەکانی نێوان لیبیا - میسر

ئیتاڵیا بە پلانی هەریەک لە فەرەنسا و بەریتانیا جەنگێکی دژی دەوڵەتی عوسمانی بەرپاکرد بۆ دەست گرتن بەسەر لیبیا، ئەمەی بۆ چووە سەر لە ١٩١١/١٩١٢. بەڵام گەلی عەرەبی لیبیی بێ دەسەڵات ئەوکات تەپوتۆزی جەنگی یەکەمی جیهانییان لێ نەڕەوییەوە، هێشتا لە چنگ داگیرکاری ئیتاڵی نەحەسابوونەوە کاتێک دووبارە لە نێوان هەردوو لا جەنگ بەرپا بوو.

بە دەستگرتنی فاشیست بەسەر دەسەڵاتی ئیتاڵیا مۆسلینی بە بنەمای (گۆڕینی دەریای ناوەڕاست بۆ دەریای ئیتاڵی) ڕەفتاری دەکرد، پیادەکردنی ئەم گوتەیەی بووە مایەی ئەوەی مۆسۆلینی جەنگێکی لەناوبردن دژی گەلی عەرەبیی لیبی بەرپا بکات لە سەرەتاکانی ١٩٢٤ەوە. ئیتاڵیا دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر توانیی دەست بگرێت بەسەر لیبیا، بەڵام بزووتنەوەی سنووسی چاوگی سەریەشە و شۆڕش بوو بۆ لیبیا، کە مێرگی جغبووب - کەوتبووە ناو سنوورەکانی میسر — یان کردبووە بارەگای خۆیان، بەڵام حکومەتی ئیتاڵیا ئەم مێرگەی خستە ژێر چاودێری بۆ ئەوەی سنووسییەکان دژی ئیمپریالیستی ئیتاڵیا لە لیبیا بەکار نەهێنن، ئەمەو زانا ئایینییە سنووسییەکان لە سەرکردە عەرەبەکان بەرانبەر بە ئیتاڵیای داگیرکار توندتر نەبوون.

ئەو کاتە میسر، کە لە ساڵەکانی یەکەمی سەربەخۆییدا بوو، لەژێر کۆنترۆڵی بەریتانی دابوو ئەوسا میسر ڕووبەڕووی فشاری ئیتاڵیا دەبووەوە. هەروەها فشارەکانی بەریتانیش لەسەر میسر هەبوون بۆ چاککردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیتاڵیا و لەسەر حسابی میسر، میسر ناچار بوو دەست لە مێرگی جغبووب هەڵگرێت.

## ٥- کێشەی سنووری لیبی- تونسی

کێشەی سنوور بە دوو کارەوە بەسترابوو، دەستەی ئیتاڵی، کە مۆسۆلینی مەبەستی بوو بەسەر فەرەنسادا بسەپێنێت، بۆ ئەوەی ئیتاڵیا بتوانێت لە سەکۆیەکی بڵندەوە گوفتار لە فەرەنسا بدات، بەڵکو لە داهاتوودا ئیتاڵیا دەتوانێت لە سەنتەری هێزەوە لەگەڵ فەرەنسا بدوێت. کێشەی سنووری نێوان لیبیا و تونس یەکێک بوو لەو کێشانەی ڕاستەوخۆ هەردوو لایەنی ئیتاڵی و فەرەنسیی بە گژ یەکدا دەبردن، لەم کێشەیە ئیتاڵیا ڕووبەڕووی نەیارێکی یاخی بوو، کە ئەوەندە ئاسان نییە وەکو کێشەکە جغبووب زوو بێتە دەست، بۆیە ئیتاڵیا لەم کێشەیە شتێکی ئەوتۆی دەست نەکەوت جگە لە دەستکارییەکی زۆر کەم لە سنوورەکان بۆ ئەوەی بتوانێت کاروانەکانی تێدا تێپەڕکات، کە لیبیا و ئەفریقیای ناوەڕاست بە یەکەوە بگەیەنێت.

## ٦- کێشەی ئیتاڵییەکان لە تونس

ئەوەی زانرابوو ئیتاڵیا مەبەستی بوو دەست بگرێت بەسەر تونسدا، بەڵام فەرەنسا پێشی گرتەوە، لە ١٨٨١ لەگەڵ بەریتانیا لەسەر داگیرکردنی ڕێککەوت، بووە هۆی ئەوەی

ئیتاڵیا لەگەڵ هەریەک لە نەمسا و ئەڵمانیا بکەوێتە هاوپەیمانی و هەڵوێستی لە بەشداربوونی جەنگی یەکەمی جیهانیی بگۆڕێت و لە تەک هاوپەیمانان کەوتە جەنگ.

لەو کاتەوە و تا بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەم فەرەنسا هەوڵی بەهێزکردنی کەمینەی فەرەنسی لە تونس دەدا، هانی فەرەنسییەکانی دەدا بۆ کۆچکردن تا شوێن پێی خۆی لێ قایم کات. بەڵام لەم پلانەی ئیتاڵییەکانیش بێبەش نەبوون، ئەمە لای فەرەنسییەکان ئەوەندە شوێنی هەستیاری نەبوو، چونکە هەرنەبێت ئیتاڵییەکانیش بە دیدی فەرەنسییەکان ئەوروپیین. بۆیە لەم کۆچکردنە بەشی ئیتاڵییەکانیشی تێ کەوت، چونکە بێکاری لە ئیتاڵیا زۆر بوو، ناچار بوون ئیتاڵییەکان بۆ کار کۆچکەنە تونس، تا وای لێهات کۆچبەری ئیتاڵی ڕێژەیان بە رادەیەک زیادیان کرد دە ئەوەندەی فەرەنسییەکان بوون، ئەوانەی لە ۱۸۸۱ەوە لە تونس نیشتەجێ ببوون.

هەوڵەکانی فەرەنسا بۆ سەرکەوتنی ڕێژەی فەرەنسییەکان بەسەر ئیتاڵییەکان سەرکەوتوو نەبوون، فشارەکانی بەردەوامی ئیتاڵیا بۆ سەر حکومەتی فەرەنسی ئەنجامەکی ئەوە بوو، کە فەرەنسییەکان رازی بوون لە یەکلاکردنەوەی کێشەکە لە ۱۸۹٦ لەسەر بنەمای ئیتاڵیا دان بنێ بەوەی فەرەنسا تونس بپارێزیت، لە بەرانبەر ئەوە ئیتاڵیا ئەم مافە نایابانەی (ئیمتیاز) لە تونس هەبن:

١- کەسی ئیتاڵی لە تونس مافی ئەوەی هەبێت لەتەک رەگەزنامەی تونسی رەگەزنامەی ئیتاڵیشی هەبێت .

٢- ئیتاڵی و فەرەنسی لە مافی مەدەنی یەکسان دەبن.

٣- ئیتاڵییەکان مافی کۆچکردنیان بۆ تونس دەبێت.

ئەم مافانە بە ئیتاڵییەکان دران بۆ ئەوەی ئیتاڵییەکان لە تونس ببنە جالیەیەکی بەهێز، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم وەکو دەوڵەتێک لەناو دەوڵەتێکی لێ هاتبوو. فەرەنسا مەبەستی بوو لەخۆبایببوونی ئیتاڵییەکان لە تونس بە ڕێگەیەکی یاسایی بشکێنێت، بەڵام ئیتاڵیا بۆی لەژواندابوو هەموو ڕێگەکانی لێدەگرتن، بواری ئەوەی نەدەدا لە هیچ هەوڵێکی سەرکەوتوو بێت.

کاتێک حکومەتی فەرەنسا هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ۱۸۹٦ی دا، حکومەتی ئیتاڵی بە توندی دژی وەستایەوە، ڕۆژنامەکانی ئیتاڵی شاڵاوێکی توندیان

دژی فەرەنسا لە ١٩٢٧/١٩٢٦ راگەیاند. ئەم کێشەیە بە هەڵواسراوی مایەوە تا ئەو کاتەی نزیکبوونەوەیەک لە فەرەنسا و ئیتاڵیا رویدا لە ١٩٣٥، ئەوسا هەردوو لا لەسەر ئەوە رێککەوتن کێشەی ئیتاڵییەکان لە تونس چارە بکەن، کە لە بەرژەوەندی فەرەنسا تەواو بوو. واتە بە پووچەڵکردنەوەی رێککەوتنی ١٨٩٦ وردە وردە لە بەرانبەر ئەوە مۆسۆلینی پەیمانی لە (لافال)ی سەرۆکوەزیرانی فەرەنسی وەرگرت، کە دەست نەخاتە پێش سیاسەتەکانی ئیتاڵیا لە حەبەشە، بە دیدی ئیتاڵیا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە خۆیان لە هەوڵەکانی دەستگرتن بەسەر حەبەشەدا سەرکەوتوو دەبن.

## ٧- ئیتاڵیا و حەبەشە

ئیتاڵیای فاشستی هێرشێکی دوژمنکارانەی کردە سەر حەبەشە و لە ١٩٣٦ داگیری کرد، ئەمە سەرەڕای بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان.

یەکێک لە مێژوونوسانی ئیتاڵی لە سییەکان بەم شێوەیە باس دەکات:

(ئیتاڵیا لەژێر پێیەکانی مۆسۆلینی دەناڵێنێت، بەمەش توانی دەست بەسەر هەموو چالاکیەکانی ژیانی ئیتاڵییەکاندا بگرێت. گەندەڵی هەموو گیانی سیستەمی کۆمەڵایەتیی ئیتاڵیا گرتەوە، ئەمە لە ئەنجامی زاڵبوونی فاشستی بوو بەسەر ئیتاڵییەکان، کە خەریک بوو وەکو ئەوەی ئیمزانەی لێدابی ئاوا دەخورێت. لە ١٩٤٠ هەموو بنەماکان خۆرکەیان لێ درابوو، هیچ شێوازێکی بەرەنگاربوونەوە لە دەست ئیتاڵییەکان نەمابوو تا لەم زوڵم و ستەمەی فاشستیەکان رزگاریان بێت، ئەندامەکانیان بە ئەدەبەوە ناوی حکومەتیان نەدەبرد، چونکە لە خزمەتچیەک زیاتر هیچی تر نەبوون. سەرەڕای ئەوەی سەرکردە فاشیستەکان بە نەزانی و بێباکی دۆتچێ ئاگادار بوون، کە چۆن پێ لەسەر هەڵە دادەگرێت و گوێناداتە بۆچوونەکانی دەوروبەری. سوکایەتی پێکردن لای ئەوان یاسا بوو، کەس بۆی نەبوو هەر لە پادشاوە تا وەزیر و فەرمانده و لوتکەی پیشەوەرەکان و هاووڵاتیان کەس زاتی ئەوەی نەبوو دژی بووەستێت.

## حکومەتی فیمار



فریدریک ئیبێرت

حکومەتەکەی ئیبێرتی سۆشیالیست لە ئەنجامە شکستخواردەنەکە بەرپرسیارە، دەبووایە ڕووبەڕووی ئەنجامەکانی کۆنگرەی ئاشتەوایی و قەیرانەکانی ئابووری و ئەو قەیرانانەی کۆمۆنیستەکان و کۆنەپەرستە پادشاخوازەکان دەیان نایەوە، ببێتەوە. ' ە یەککاتدا:

١- ئاشکرایە کە پەیماننامەی ڤێرسای هیچی بۆ حکومەتەکەی ئیبێرت نەهێشتبووەوە تا گفتوگۆیان لەسەر بکا، ئەوکات هێشتا هەندێک لە خاکی فەرەنسی لەژێر دەستی ئەڵمانیا مابووەوە، حکومەت خۆی لە خانەی تاوانبار دەبینییەوە، گوایە سڤیلە(مەدەنیـیە) بەزیوەکان بوونە هۆکاری ئەوەی ئەڵمانیا لە بەرانبەر بەزینەکان بەرپرسیار بێت. بە هۆیەوە زنجیرەیەک گوناهـ خرانە پاڵ ئەڵمانیا، کە دەبووایە قەرەبوویان بکاتەوە:

ا/ پارچەکردنی ئەڵمانیا لە نێوان پتر لە یەک وڵاتی دراوسی، ئەڵمانییەکان لەسەر یەکخستنی وڵاتەکەیان کۆک بوون.

ب/ دابڕینی پارچەی بەپیت لە خاکی ئەڵمانیا.

ج/ فەرەنسا داوای قەرەبوونێکی زۆر لە ئەڵمانیا دەکات.

د/ لەگەڵ ئەوەی ئیبێرت خۆی بۆرجوازی بوو، حکومەتەکەی ڕووبەڕووی هێرشی ڕاستڕەو و چەپڕەوەکان دەبێتەوە.

٢- سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە روسیا هانی کۆمۆنیستەکانی ئەوروپای دا بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، بەڵام حکومەتی ئێیبێرت توانیی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لەناو بەرێت، تا دواتر ڕووبەڕووی تێڕوانینەکانی کۆنەپەرستانی ڕاسترەو دەبێتەوە، کە بە پەیماننامەیەک لە حوکمیان دوور دەخاتەوە. حکومەتی فیمار بەسەر بزووتنەوەی کۆنەپەرستیدا زاڵ بوو، بووە هۆی ئەوەی حکومەتی فیمار سوپا بەکار بێنێت بۆ لەناوبردنی بزووتنەوە کۆنەپەرستییەکان و ئەفسەرە حزبیەکانیش لەم گۆڕانە لە شوێنی خۆیان مانەوە، بەڵام بووە مایەی بێزاری و دڵگرانی خەڵک، کە ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند بووەوە.

٣- کێشەی قەرەبووەکانیش - هاوشان لەگەڵ کێشەی ئابووری - لە ئاڵۆزترین ئەو کێشانەبوو، کە ڕووبەڕووی حکومەتی فیمار بووەوە. فەرەنسا داوای قەرەبوویەکی یەکجار زۆری دەکرد، سەرۆکی کۆماری فەرەنسی (بووانکاریە) لەم رووەوە زۆر توند و پێداگر بوو، هەوڵی زۆر دران بۆ لە یەک نزیککردنەوەی بۆچوونەکانی هەردوو لا و یەکلاکردنەوەی کێشەکە، بەڵام هەردوو لایەنی نەیار فەرەنسی و ئەڵمانی لەیەک دوور بوون، یەکیان بە زیادەوە داوای قەرەبووی دەکرد، ئەویتریان بە زیادەوە مەبەستی نەدان بوو. فەرەنسا هیچی لەبەردەم نەما ئەوەندە نەبێت هەنگاوێکی خەتەرناک بنێت، کە بریتی بوو لە داگیرکردنی راین و رۆهەر لە ١٩٢٣ لە بەرانبەر قەرەبووەکانی.

ئەوەبوو ئەڵمانیا شاڵاوێکی دیبلۆماسیی توندی دژی فەرەنسا لە دەرەوە و ناوەوە بەرپا کرد، لەم شاڵاو و هەڵمەتانەی فەرمانگە سیاسییەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا پشتگیری داواکانی ئەڵمانیایان دەکرد، بە دیدی ئەوان ئەم رەفتارەی فەرەنسا دژی پەیماننامەی ڤێرسایە، ئەوەبوو بەریتانیا بە فەرمی ئەم هەنگاوەی فەرەنسای بە نایاسایی دایە قەڵەم. بەریتانیا لەم هەنگاوەی مەبەستی ئەوەی نەبوو تا ئەڵمانیا بکاتە هێزێک بۆ بەرپەرچدانەوەی فەرەنسای بەکار بێنێ، بەڵکو ئامانجی تریشی هەبوون، کە تایبەت بوون بە فراوانکردنی بازرگانی لەگەڵ ئەڵمانیا. دواتر بۆ بەریتانیا لە ڕووی بازرگانییەوە ئەڵمانیایەکی یەکگرتوو باشترە لە ئەڵمانیایەکی لەبەریەک هەڵوەشاوە. بەهەر حاڵ ئەڵمانیا بەدەست ئەم داگیرکردنەی فەرەنساوە دەیناڵاند، کە بەم شێوەیە راینی داگیرکرد.

بەشێوەیەک نرخی مارک دابەزی، کە هیچ بەهایەکی نەمابوو، ئاژاوە و پشێوی بڵاو بووەوە، جێ پێی کۆمۆنیستەکان لە سەکسۆنیا قایم بوو، باڤاریا هەوڵی سەربەخۆیی دا، حکومەت لە چارەسەرکردنی کێشەکان شکستی دەهێنا، چونکە شێوازی چارەسەرەکە بریتی بوو لە لادانی فەرمانبەران لەسەر کار و دەرکردنی پارەیەکی نوێ، لە کاتێکدا کێشە سەرەکیەکەی ئەڵمانیا لەدەستدانی سەنتەرە مەزنەکانی پیشەسازی و داخستنی بازارەکان بە ڕووی بازرگانی ئەڵمانیا و پێویستیی بە سەرمایە بۆ بوژاندنەوەی پیشەسازی بوو.

حکومەتی فیمار هیچ دەرچوونێکی بۆ ئەم قەیرانە پێنەبوو تا ئەو کاتەی پایەی بووانکاریە لە بەرانبەر نارەزاییەکانی بەریتانیا و ئەمەریکا گلۆر بووەوە و لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٢٤ ڕوخا، ئەمە لە کاتێکدا هات، کە سترێسمان بوو بە ڕاوێژکاری کۆماری ئەڵمانی. ئەو پیاوێکی میانڕەو بوو، هەستی بە ئازاری بەردەوامبوونی گۆشەگیری ئەڵمانیا و قەیرانەکانی ئابووری دەکرد، بڕیاری دا کۆتایی بە ماوەی نەرمونیانی لەگەڵ حکومەتی واشنتۆن و پاریس و لەندەن بێنێت، بەتایبەتی کاتێک (ئەدوارد هیریۆ)ی رادیکالی سۆشیالیستی سەرۆکایەتی وەزیرانی فەرەنسای گرتە دەست. ئەوکات پرۆژەی (دۆوز) هاتە بەر چاو بۆ یەکلاکردنەوەی قەرەبووەکانی ١٩٢٤ لەسەر بنەمای کشانەوەی فەرەنسا لە ڕۆهەر و پێدانی قەرزێکی زۆر بۆ ئەوەی مارکی ئەڵمانی متمانە وەدەست بێنێت، وە کردنەوەی بانکێک لە سەنتەری ئەڵمانیا. بە پراکتیکیش ئەمە کرا فەرەنسا لە ڕۆهەر کشایەوە و مارکی ئەڵمانی بوونی خۆی سەلماندەوە.



گوستاف سترێسمان

ئەڵمانیا بەشێکی لە قەرەبووەکان دانەوە، ئەمەش بووە مایەی لەیەکنزیکبوونەوەی وڵاتانی هاوپەیمان لە ئەڵمانیا و چاوخشاندنەوە بە پەیوەندییەکانیان، ئەمە پێشەکییەک بوو بۆ دانوستانەکانی هاوینی ١٩٢٩، کە کۆتاییان بە داگیرکاریەکەی هێزەکانی هاوپەیمانان لە راین هێنا و لە ماوەیەکی دوورترین کات بە حوزەیرانی ١٩٣٠دیاری کرا. ئەم هەنگاوانە هانی ئەڵمانیایان دا تا بەردەوام بێت لە دانەوەی قەرەبووەکان بە پێی پرۆژەی نوێ بۆ یەکلاییکردنەوە، کە (یۆنگ) داینابوو، هەروەها فەرەنساش دەستی لە چاودێریکردنی ئەڵمانیا هەڵگرت بۆ چەک داماڵین. ئەوەی لە پەیمانی ڤێرسای لەسەری رێککەوتبوون، هەر کە ئەڵمانیا ئەم دەستکەوتانەی لێ وەدەست کەوتن، لەپەنایەوە بەدوای ئامانجی تردا دەگەڕا، بۆ نموونە: لە ئەڵمانیا داخوازی بەرز دەبوونەوە، کە کاتی ئەوە هاتووە وڵاتە هاوپەیمانەکان هەرێمی (سار) بۆ وڵاتی دایک بگێڕنەوە، لەگەڵ هەڵگرتنی قەدەغەکاری لەسەر خاکەکانی راین و دەبێت فەرەنسا ئەوە بسەلمێنێت، کە وڵاتێکی ئاشتیخوازە، ئەوەش بە کەمکردنەوەی سوپا دەکرێت.

لە بێبەختی ئەڵمانیا ئەم داواکاریانەی لە کاتێکی زۆر ناسک و هەستیار هاتن، ئەوکاتە قەیرانی ئابووری وڵاتە مەزنەکانی گرتبووەوە و تەنگەی پێ هەڵچنیبوون، بەدوای پارەدا دەگەڕان تا لەم قەیرانەیان دەرباز کات ئەمە لە ١٩٢٩ بوو. بۆیە فەرەنسا داوای لە ئەڵمانیا کرد بەردەوام بێت لە دانەوەی قەرەبووەکان، لەمەش خراپتر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش - کە قەرزێکی زۆری بە حکومەتی ئەڵمانی و پیشەسازی ئەڵمانیا دابوو - داوای لە دانەوەی سەرمایەکانی لە ئەڵمانیا کرد تا ڕووبەڕووی قەیرانە ئابوورییەکان بێتەوە.

ئەمە ئاستەم بوو ئەڵمانیا لە کاتێکدا ڕووبەڕووی ئەم قەیرانە دەبێتەوە و قەرەبووەکانی فەرەنساشی پێ بدرێتەوە، لەژێر فشاری ئەمەریکا و بەریتانیا بڕیاردرا کێشەی قەرزەکان یەکلا بکرێنەوە. بەڵام ئەڵمانیا لەژێر دلۆڤانیی قەیرانە مەزنەکانی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیە ناوخۆییەکان مایەوە، کە ڕێخۆشکەر بوون بۆ دەرکەوتنی هیتلەر و پارتە کەی بەناوی نازی لەسەر شانۆی سیاسیی ئەڵمانیا و نێودەوڵەتی، بە سوودوەرگرتن لەو ئازارانەی لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهانیی بە ئەڵمانیا گەیشتبوون، ئەمە لە هەژانی حکومەتەکەی فیماری ساڵ دوای ساڵ هات.



## بارودۆخی گەیشتنی هیتلەر بۆ سەر حوکم و مکومکردنی

ئەڵمانیا لە سەردەمی حکومەتی فیمار لە ونبوونێکی سیاسییدا دەژیا و ئەو ڕاستیە سیاسیەی نەدەدۆزیەوە، کە دەبوایە ئەڵمانیا لەسەری بڕوا بۆ ئەوەی بگا بە پایەی وڵاتە مەزنەکانی ئەوروپا، ئەمە دوای ئەوەی پەیماننامەی ڤێرسای بەم ڕسواییەی گەیاندبوو. قەیرانە ناوخۆییەکان و پەشێوییە ئابوورییەکانیش هۆکاری ئەم ڕەوشە نالەبارەی ئەڵمانیا بوون، بەڵام ئەوەی گرنگ بوو لە حکومەتەکەی فیمار کارەکانی لە ئاستێک جێگیر کردبوون، کە تەنیا پێویستی بە سەرکردەیەکی خاوەن سەنگ ودەسەڵات هەبوو، کە جەماوەر لە دەوری کۆببێتەوە و بە بەرنامەیەکی سەرکەوتوو دەتوانێت بیانخاتەوە سەر هێڵ. دیارە هیتلەر ئەو کەسە بوو، کە دوای تێپەڕکردنی هەموو کێشە و قەیرانەکان توانیی بە دەسەڵاتی ڕەها بگات.

ئەدۆلف هیتلەر هاووڵاتیەکی نەمسایی بوو، لە خوێندن زۆر کەمی خوێندووە، لەسەر پیشەی نەخش و فرۆشتنی وێنە دەژیا، لە میانەی جەنگی یەکەمی جیهانیی بە خۆبەخش لە ئەڵمانیا و نەمسا خزمەتی سەربازیی کرد و لە میونیخ بزووتنەوەی سۆشیالیست دوای بەزینەکان زۆر چالاک بوو، ئەمیش وەکو هەر ئەڵمانییەک بەو چاوە سەیری دەکرد، ئاخۆ کێ بتوانێت سەروەرییە لەدەستدراوەکانی ئەڵمانیا بگێڕێتەوە و لە کۆت و بەندەکانی پەیماننامەی ڤێرسایان ڕزگار کات، کە پەیمانێکی ڕسواکار بوو بۆ ئەڵمانییەکان. هەروەها ئەوکەسەی بتوانێت لە جووەکانیان خاوێنکاتەوە، ئەو جووانەی خیانەتیان بەرانبەر بەو نیشتمانە کرد، کە لێی دەژین. ئەمانەی سەرەوە بڕواکانی پارتی کرێکاری سۆشیالیست بوون لە میونیخ، لەوکاتەی هیتلەر چوە ریزیان توانا و بلیمەتی خۆی سەلماند، ئەوەندەی نەبرد تا هیتلەر بووە خاوەنی (پارتی کرێکاری سۆشیالیستی نیشتمانی) دواتر لە ١٩٢٠ بە پارتی نازی ناسرا.

پارتی نازی و تیۆریی نازی، کە هیتلەر خۆی داینا، بە گرنگترین تیۆرەکانی دەسەڵاتی دیکتاتۆری، کە لە سەدەی بیستەم دەرچوو، دەناسرێت، ئەم تیۆرە لە کاتێک دەرچوو ئەڵمانیا پێویستیی بەم جۆرە تیۆرە هەبوو. ئەم تیۆرە خۆی دەبینێتەوە لە:

١- پەرتووکی (خەباتم) کە ئەوکاتەی لە بەندیخانەبوو نووسیبووی، دوای سەرنەکەوتنی بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکەی دژی حکومەت لە ١٩٢٣ و بەرگریەکانی، کە لە میانەی دادگاییکردنی لە خۆی دەکردن تیابوو.

٢- بەرنامەی پارتەکەی، بڵاوکراوەکانی، ئەوانەی لەلایەن خۆیەوە دەرچوون بەر لە دەسەڵات گرتنەدەست.

لە خوارەوەش گرنگترین بڕوا و ئامانجەکانی هیتلەر و پارتەکەی دەخەینە روو:

١- بە دیدی هیتلەر جێرمەنەکان رێزدارترین رەگەزی ئادەمیزادن، خاوەن بەرزترین پایەن، بۆیە دەبێت هەردەم ئەوان ئاراستەکان ببەن بەڕێوە. دەبینین هیتلەر لیستێکی رەگەزەکانی ئادەمیزادی داناوە، تیایدا رەگەزی ئاری لە ئەڵمانیا لە لوتکەی هەموویانە و لە هەموویان بەهێزترە، لەدوای ئەوان نۆرد دێت (دانیمارکی و نەرویجی و سویدی)، دواتر نۆرماندۆییەکان و ئەنگلۆ ساکسۆنییەکان، لە دوایین لیستەکە سلاڤ و عەرەب و جوو و قولەکانن. زانا ئەڵمانییەکان رەنجی زۆریان دا بۆ ئەوەی بسەلمێنن رەگەزی ئاری باوکی هەموو رەگەزەکانی ئادەمیزادە، ئەو مەشخەڵی شارستانێتیی لە کۆنەوە هەڵگرتووە، هەر خۆشی بوو ئەم مەشخەڵەی بۆ ئەمەریکا برد، کە لە وێ بڕوایان وابوو عیسا بڕواکەی جەو بووە، بەڵام خۆی لە رەچەڵەکی ئاری بووە، کە ئەمە لە بڕوا گرنگتریشە.

باسی رەگەزی ئاریی دەکرد، کە هەڵگری هەندێ سیفەتی تایبەتە و بە هۆیەوە دەچێتە ژێر باری قورسی وڵات، ئەو لە هەموو رەگەزەکانی تر بەتواناترە بۆ خۆبەختکردن لە پێناو نیشتمان و دواتر لە پێناو دەوڵەتی ئاری.

ئەمەیە رەگەزی ئاری، ئەمەشە ئەرک و فەرمانەکانی، کە خوا لەناو میللەتەکانی هەڵبژاردووە تا ئەرکەکان جێبەجێ بکات، بۆیە دەبێت هەموو هەوڵەکان بخرێنە گەر تا خاوێنی ئەم رەگەزە بپارێزرێت. رێگە بە گەلە لاوازەکانی تر نەدرێت تێکەڵی بن، بۆ ئەوەی ئەوە بەسەر فەرەنسا هات لە ئێمە دووبارە نەبێتەوە، ئەوەی بەسەر فەرەنسا هات و بەسەر ئەمەریکا دێت - بە دیدی هیتلەر - بە تێڕوانینی هیتلەر لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی رەگەزی جوو لەگەڵ فەرەنسییەکان و تێکەڵاوبوونی قولەرەشەکان لەگەڵ ئەمریکیەکان ئەو کارەسات و بەدڕەوشتیەی لێ کەوتەوە.

بانگخوازە نازییەکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە شارستنێتیی دونیا لە سەدەی بیستەم شارستانێکی شەرمەزار و روەو نەمانە و ئابڕوی نییە، ئەمەش تەنیا بۆیە وای لێ بەسەر هاتووە، چونکە جووەکان لە پێشەوەی زۆربەی بوارە زیندووەکانی جیهانی و دەسەڵاتی حکومەتە مەزنەکان دان، هۆکارە سەرەکیەکەی دۆڕاندنی ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانیی بە هۆی ئەوەبوو سەنتەرە هەستیارەکانی دەوڵەت ئەوسا بەدەست جووەکان بوو.

بۆ بەرپرسە ئەڵمانییەکان باشترین ڕێگە بۆ دابینکردنی دوارۆژی ئاری دەبێت خۆیان لە جووەکان رزگار بکەن، جا بە هەر شێوازێک بێت، کۆچپێکردنیان یان هەر ڕێگەیەکی ئەم ئامانجە بپێکێ. ئەمە سەبارەت بە ناوەوەی ئەڵمانیا، بەڵام سەبارەت بەو ناوچە ئەڵمانیانەی لە دەست ئەڵمانیا دەرچوون و لەژێر داگیرکاری دان، دەبێت حکومەت هەوڵ و رەنجی زۆر بدات بۆ گێڕانەوەیان بۆ باوەشی دەوڵەتی ئاریی نیشتمانی دایک. ئەم ئەرکە ئەرکێکی قورس بوو لەسەر شانی پیاوان، بیری نازی جەختی لەسەر بەستنەوەی ژن بە ماڵەوە کرد بۆ ئەوەی ئەرکی منداڵ بوون بگرێتە ئەستۆ، کاری سنووردارکردنی منداڵبوون و نەزۆکی و راگرتنی منداڵبوون بوونە کارێکی قێزەون، جەختەکان لەسەر زیادکردنی منداڵبوون بۆ ئەوەی رەگەزی ئاری ژمارەیان زیاد بکات، ئەمە بە جوڵاندنی هەستی رەگەزپەرستیی تاکی ئەڵمانی جۆش دەدرا. بەڵام لە توێژینەوە زانستییەکان، کە بەرلە هاتنی هیتلەر و دوای ئەو کرا ئەوە سەلمێندرا، کە ئەم بەرنامەیە ئەنجام و بەرهەمی نەبوو، واتە هیچ رەگەزێک لە دونیا ناتوانێت بێگەردیی خۆی بپارێزێت، بەڵکو هەموو رەگەزەکانی کۆن لە ڕێگەی ژن و ژنکاری و هاوسەرگیری تێکەڵ بە یەک بوون و هەندێکیان لەناوچوون.

٢- رەگەزی ئاری دەبێت خۆی سەرانگێری دونیا بکا - بە دیدی هیتلەر - هەر تیۆرێکی تری جیهانی دەبێت لەناو ببردرێت، لێرەوە دوژمنکاریەکەی لەگەڵ کۆمۆنیستەکان زۆر توند بوو، چونکە ئامانجیان دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریای جیهانی بوو. دژی مەزهەبەکانی کاسۆلیک و پرۆتستانت بوو، چونکە بڕوایان بە سەرکەوتویی و پێویستی پێدانی دەسەڵات بەرەگەزی ئاری نەبوو. هەروەها بەوەی کە گیانی جێرمانی و

جەستەیان سەرەتا و دوایی تەنیا بۆ جێرمەنیەکانە و دەبێت مافی هاووڵاتی تەنیا بە جێرمانە بێگەردەکان بدرێت و ئامادەیان کەن بۆ پێسپاردنی ئەرکی دوارۆژ.

٣- بەڕێوەبردنی کاروباری گەیاندنی نەتەوەی جێرمانی تا دەگاتە لوتکەی دەسەڵات، دەبێت بە سەرکردەیەکی دیار و هەڵکەوتوو بسپێردرێت، یارمەتیی بدات لە جێبەجێکردنی ئامانجە ئارییەکان (پوختەی نایاب) لەگەڵ هێزی ڕێکخراو. دەکرێ خاوەنی زۆرینەش نەبێت، بەڵام بە بڕوابوونی بە ئاریایەتی و هێز و تواناکانی پشتبەستوو بە ئارییەکان و لە پێناو نەتەوەی جێرمەنی و سەرۆکایەتیەکی بەهێز دەتوانێت ئەو کۆتە بشکێنێت، کە لە دەوری کێشراوە، ئەم پوختەیە دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت. (هیتلەر) خۆی لەو شوێنە دانا، کە دەتوانێت کۆتەکان بشکێنێت و خۆی بگەیەنێتە بەرزترین ئاست، هەموو هەوڵەکان لە پێناوی دروستکردنی دەوڵەتێکی جێرمەنیی بەهێز وەگەڕنێت و بەرپرسیارێتیە مەزنەکەی بەرەو سەرکەوتنی رەگەزی ئاری بگرێتە ئەستۆ.

هیتلەر بۆچوونی خۆی بۆ ئەم شێوە رژێمە، کە بە باشترین سیستەمی فەرمانداریی دەستوور دەزانی، بەم شێوەیە دەربڕی: (باشترین دەستوور و شێوەی دەوڵەت ئەوەیە بتوانێت رێگەی سروشتی بگرێتە بەر و بەتواناترین ئەقلی کۆمەڵگای نیشتمانپەروەر بگەیەنێتە بەرزترین بنکە و باشترین و گرنگترین جەماوەر، کە هەر سەرۆکێک دەسەڵاتی بەسەر خوار خۆیدا هەبێت و لە بەرانبەر سەرەوەشیدا بەرپرسیار بێت. دەبێت دەسەڵات بۆ بەهێزترین بێت، تا لەناو لاوازدا نەتوێتەوە و گەورەییەکەی لەدەستبدا).

٤- بنیادنانی دەوڵەتی جێرمەنی دەبێت لەسەر بنەمای تەواوکاریی بەرهەمی کشتوکاڵیی پیشەسازی بێت نەک ئاراستە کردن بەرەو پیشەسازی، کە تا ئێستا ئەم ئاراستەیە لەسەر بیری کاربەدەستانی فەرمانڕەواکانی وڵاتانی ئەوروپی زاڵە.

بۆ ئەوەی ئەوکاتەی دەوڵەتی جێرمەنی توشی جەنگێک دێت لە ئەنجامی گەمارۆ توشی هەرەسهێنان نەیەت، بەڵکو پشت بە خۆی ببەستێت و سیاسەتی (خۆتێرکردن) پەیرەو بکات، کە یەکێکە لە ستونەکانی تیۆریی نازیی.

٥- دوای ئەوەی یەکێتی ئەڵمانیا بە ئەنجام دەگات و هێزی ئابووریی بەرەو پێش دەچێت، دەبێت کار بۆ بەجێرمەنیکردنی ئەوروپا بکەین، ئەمەش بە لە خۆگرتنی بەشەکانی تری ئەڵمانیا و ئەوانەی لە ئاریەکانەوە نزیکن. دەکرێ دوای ئەوەی کار بۆ بەهێزکردنی

سیفاتەکانی ئاریی دەکرێت بە هەموو شێوازێک، دواتر رێگە نەدەین دەوڵەتێکی سەربازیی بەهێز لەسەر سنووری ئەڵمانیا دروست بێت، تا ئەوەی هیتلەر بینیی (لەناوبردنی فەرەنسا رێگە بە ئەڵمانیا دەدات دەست بەسەر خاکەکانی رۆژهەڵاتدا بگرێت).

٦- تاکی ئاری دەبێت ئەوپەری هەوڵ و تەقەلاکانی بخاتە گەر بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو ئامانجانەی خراونەتە سەر شانی نەتەوەکەی، هەر وەستانێک لەلایەن خۆی یان حکومەتەکەی روویدات، بە کەمتەرخەم دێتە ئەژمار، کە لێبووردن نایگرێتەوە. دەبێت بۆ خۆی کار و بۆ منداڵەکانیش داهات مسۆگەر بکرێت[٥٣]، تا لە خوێندن بەردەوام بن ز بە بیری نیشتمانپەروەری جۆش بدرێن و ئاراستە ئارییەکان لە ناخیان قووڵتر ببنەوە.

ئەمانە بڕوا و ئامانجەکانی هیتلەر و پارتەکەی بوون، لە رووی نەتەوایەتییەوە زۆر توندڕەو بوو، زاڵبوونێکی نەویستی رەگەزپەرستانەی بەسەر خەڵکدا سەپاند، مافی زۆر گەلیشی پێشێل کرد، ئەوانەی رێیان بۆ ئەڵمانیا خۆشکرد تا بەم هەڵسانەوەیە بگات. دواتر هەر چۆنێکی هەبێت سەلمێنرا، کە تیۆریی ئەم نەتەوەیە لەم نەتەوەیە بەرزتر و سەرووەرترە یان ئەمە هەڵبژێردراوی نەتەوەکانی ترە ئەمانە هەمووی نیشانەی رەگزپەرستی و پاساوی داگیرکارین، نیشانەی توندڕەوی نەتەوایەتین، لەگەڵ ئاراستەکانی ئیسلامیش نایەن، کە مافی بە خاوەن کتابەکان داوە (اهل الکتاب) لەگەڵ مسوڵمانەکان یەکسان بن و لەگەڵ کریس، کە داوای بەهەشت و خۆشەویستی دەکات، هەروەها لەگەڵ دیموکراتیی نوێ، کە مافی هاوولاتی بوون دەدا بێ گوێدانە بیر و بڕوا.

بە بڕوای من ئەم بانگەوازە رەگەزپەرستیانە لە ئەڵمانیا رەواجی نابێت، ئەمە تەنیا بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو شەرمە مەزنەی لە ئەنجامی شکستەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی خواردیان دەکرێن، کە ئەڵمانیا ئەوسا پێویستیی بە کەسێکی بەهێز و بە ورە هەبوو، تا دەرگاکان لەبەردەم ئومێدەکان بکاتەوە. بەتایبەت ئەم گەلە بە مێژووی ژیانێکی نیمچە ئەفسانەیی ژیاوە لە بڕوسیا، کە لە سەردەمەکانی فریدریکی مەزن و سەردەمی

[٥٣] { ئەو رێنمایی و بڕیارانەی ئەوسا، کە هیتلەر سەبارەت بە داهات بۆ منداڵان بڕیاری لەسەر دا، دواتر لە هەموو وڵاتەکانی ئەوروپا ئەم سیستەمە پیادە کرا و تا ئەمڕۆش بە باشترین بڕیار لە بواری مافی منداڵ دادەنرێت و پەیڕەو دەکرێ، کە پێی دەوترێ (کیندەر بایسلاخ) واتە: هاوکارییەکانی منداڵان. تەمەنی منداڵ لە رۆژی لەدایکبوونییەوە تا دەبێتە ١٨ ساڵ سود لەم یارمەتییە وەردەگرێت، ئەگەر داهاتی باوک هەرچەندی کەم یان زیاد بێ پەیوەندیی بەم هاوکارییەوە نابێ...وەرگێڕ.

بسمارک کەمینەی بڕوسیی ئاری توانای بەرپەرچدانەوەی هێزی دەیان جار ئەوەندەی هێزەکانیان هەبوو بێ هیچ گرفتێک، دیارە ئەم گەلە هێشتا لەژێر کاریگەری ئەو ئەفسانانە دەژی.

هیتلەر توانیی خۆی و پارتەکەی بەسەر دەسەڵاتی ئەڵمانیادا بسەپێنێت و حوکمەکە توندوتۆڵ بکات، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ دەستووریش یەکیان نەگرتنەوە، بۆیە دوو جۆرە ڕێکخراوی نیمچە سەربازیی پێکهێنا:

١- خاوەنی کراسە خۆلەمێشیەکان (ئێس. ئەی) (گەردەلول).

٢- تیپی پاسەوانی رەش (ئێس. ئێس).

لە ڕاستیدا تەنیا رژێمی نازی ئەم شێوازەی نەگرتبووە بەر بۆ تۆقاندن و سەپاندنی رای پارتەکەی بەسەر جەماوەری شەقام و حکومەت، بەڵکو ڕێکخراوی تر هەبوون سەر بەم ڕێکخراوە بوون، بۆ نموونە و بەتایبەت ڕێکخراوە کۆمۆنیستیەکان. بە هۆی ئەوەی ناویفاقی لە نێوان پارتی کۆمۆنیست و نازییەکان هەبوو، نەدەگونجا هەردووکیان بمێننەوە، بەگژیەکداچوون بەبەردەوامی لە نێوانیان رووی دەدا.

پیاوەکانی نازی شێوازی پڕوپاگەندە بۆ خۆیان و پارتەکەیان و ئابڕوبردنی نەیارەکانیان گرتبووەبەر، ئەم شێوازە پێشتر نەبوو، رادیۆ و ڕۆژنامە و بڵاوکراوە و کۆبوونەوە و نمایش و پیلانی نهێنی و ئاشکرایان بەکار دەهێنان. لە ڕاستیدا نازیەکان کاتێک ئەم شێوازانەیان بەکارهێنا یەکەم کەس نەبوون، کە بەکاریان هێنابوو، بەڵام لەوە زیرەکیان نواند و گەشەیان بە شێوازەکەدا و فراوانیان کرد، بەر لەوان ئەم بەر بڵاویەی بەخۆوە نەدیبوو، لە لایەکی ترەوە نەیارانیان ئەمانەیان زیاتر مەزن کرد.

گەیشتن بە دەسەڵات لە سەرەتای دامەزراندنی پارتەکەی مەبەستی هیتلەر بوو، لە نەخشەکەی سستی نەبوو، بە دیدی هیتلەر بارودۆخی دوای ڤێرسای دەبێت حکومەت سەرنگوم بکرێت، ئەوساش پشتگیری ئاسانە، بەڵام لە هەوڵی یەکەمی سەرنەکەوت و دەستگیر کرا و لە ١٩٢٣ خرایە بەندیخانەوە. ئەم ڕووداوانە سەرنجی خەڵکی بەلای خۆی و پارتەکەی و فەلسەفەکەیدا راکێشا، ئەم سەرنەکەوتنە بووە هۆی ئەوەی بە و ڕێگایەدا بێتەوە، کە پارتەکەی ڕێکی خستبوو، سەلماندیان ئەم شێوازە سەرکەوتوو نییە.

لێرە لینین وهیتلەر لەیەک دەچن، هەردووکیان لە هەوڵی یەکەمیاندا سەرناکەوتن، لە هەڵسەنگاندنەکانیان بۆ سەرنەکەوتنە بۆیان دەردەکەوێت نرخی گشگیری لە شۆڕش چەندە گرنگە. بەم جۆرە هۆکارەکان یەک بوون، بەڵام ئامانجەکان یەک نەبوون. هیتلەر کاری بۆ سیستەمی بڵاوکردنەوەی شانەکان کرد، ئەم شانانە بانگخوازیان بۆ گیانی نازی و کۆکردنەوەی هێزی خۆجێیەتی و بۆ پەیداکردنی دۆست و لایەنگران بۆ پارتەکەیان تا لە هەڵبژاردنەکان زیاتر کورسی لە (ریخستاد) وەدەست بێنن.

هەروەها کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی گیانی شەڕ و بەرنامەکانی دەکرد، ئەمە لەناو گەنجەکان باوی هەبوو و پێشوازیێ لێوە دەکرا، بە تایبەت کاتێک رسواکاریەکەی حکومەتی فیماریان بەبیردەهاتەوە، ئەو قەیرانە ئابوورییەی حکومەتەکەی فیمار لە ١٩٢٩ توشی هات مەزنترین دەرفەتی بۆ هیتلەر رەخساند تا دەسەڵات بگرێتە دەست. لە ١٩٢٩ بێکاری زیادی کرد بە رادەیەکی مەترسیدار، باری ژیانی خێزانی ئەڵمانی نالەبار بوو، وڵات ڕووبەڕووی شەپۆلێکی بێزاری و ناڕەزایی بوو، ئەنجومەنی کۆمپانیاکان کەوتنە جووڵە بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەک بەر لەوەی پارتی کۆمۆنیست ئەم هەلە بقۆزێتەوە و گەل وەکو روسیا لە دەوڵەت هەستێتە سەرپێ. هیتلەر ئەم دەرفەتەی بە هەل زانی و هێرشی توندی کردە سەر حکومەتی فیمار، کە زۆر لاوازیی و بێتوانایی پێوە دیار بوو، تەنانەت کۆمپانیاکان لە هیتلەر و پارتەکەی نزیک دەبوونەوە، هاوکاریی پارە و ماڵ و سیاسیان دەکرد، گوایە وڵات پێویستیی بە کەسێکی لەم جۆرە بەهێز و بەتوانا هەیە تا وڵات لەم قەیرانە رزگار کات. لە لایەکی ترەوە ئەم کۆمپانیا بازرگانیانە کەوتنە بەر رەوتی گەلەریی گشتی، هەموویان بەیەکەوە لە دەوری هیتلەر کۆدەبوونەوە، بە هۆی ئەوەی سەرکردەیەکی بەهێز بوو و لە ماوەیەکی کورت دەبێتە بەهێزترین سەرکردەی پارتەکان.

هەر وابوو زۆر بەخێرایی لایەنگرانی هیتلەر و پارتەکەی لە هەڵکشاندا بوون، لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٣٢ بەرانبەر بە پارتەکانی تر زۆرینەی کورسیەکانیان بەدەست هێنان. لەگەڵ ئەوەی لە مارت و نیسانی ١٩٣٢ هیتلەر خۆی بۆ پۆستی سەرۆککۆمار پاڵاوت و بەرانبەر بە هندن بوورگ دەرنەچوو، بەڵام تای تەرازووی بەهێز و سەنگین بوو، تەنانەت راوێژکاری کۆماری لە ١٩٣٢ ڤان پاپن پێی باش بوو هیتلەر ببێتە راوێژکار بۆ ئەوەی

رکابەرەکەی ڤۆن شلیخەر دەرنەچێت، هەروەها بۆ ئەوەی کۆمۆنیستەکان دەسەڵات نەگرنە دەست. لە بەردەم هندن بوورگ یەک ڕێگا مابوو بۆ ئەوەی کۆمۆنیستەکان پەک بخات، بۆیە ئامۆژگاریەکانی ڤان پاپنی لە گوێگرت کاتێک پێشنیاری بۆ کرد پۆستی راوێژکاری بە هیتلەر بسپێرێت لە ٣٠ جەنیوەریی ١٩٣٣، لەگەڵ ئەوەی پارتەکەی زۆرینە نەبوو، پشتی بە هێزەکانی دەوروبەر بەست بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتی ڕەها. ڕەوشەکانی ئەڵمانیای ١٩٢٩ - ١٩٣٣ یارمەتیدەر بوون بۆ گەیشتنی هیتلەر بە دەسەڵات، دەتوانین ئەو هێزانەی پارتی نازی ئاوا دەست نیشان کەین:

١- سوپای نیزامیی ئەڵمانی:

پشتی حکومەتی گرتبوو، بۆیە هیتلەر ڕێگەی بە کەسێکی تر نەدەدا فەرمان بەم سوپایە بدات، ئەمەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە هیتلەر(رۆهم )ی فەرماندەی هێزی (گەردەلول)ی گولەباران کرد لە کاتێکدا ئەم ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو لە گەیاندنی هیتلەر بە دەسەڵات، ڕۆهم هەوڵی ئەوەی دا هێزەکانی گەردەلول لەگەڵ سوپا یەکخات بۆ ئەوەی دەسەڵاتی فەرماندایەتیی بکەوێتە دەست، لەسەر ئەوە هیتلەر گولـلەبارانی کرد، چونکە نیازەکانی بە خراپ لێکدانەوە.

٢- سەرۆکە نیشتمانپەروەرەکان و دامەزراوە ئابوورییەکان:

هەرکە هیتلەر پۆستەکەی گرتە دەست، دەستی بە پیادەکردنی بەرنامەکەی کرد، سەرەتا تایبەت بوو بە لەناوبردنی نەیاران و دەستکەوتنی دەسەڵاتی ڕەها. وا ڕێکەوت لە ٢٦ - ٢٧ی شوباتی ١٩٣٣ ئاگر لە بارەگای ریخستاد کەوت، هەر زوو پەنجەی تاوان بۆ کۆمۆنیستەکان درێژ کرا، هیتلەر هێرشی کردە سەریان لەبارەکی بردن و کۆبوونەوە و سەرکردەکانی تەفروتونا کرد. لە هەمان کات نەیارە ناکۆمۆنیستەکانیشی تێبردن، ئەوەندەی نەبرد هەموو پارتەکانی هەڵوەشاندەوە. تاکە پارت کە ئەڵمانییەکان بۆیان هەبێت کاری تایا بکەن، پارتی نازی دەبێت، توانیی دەسەڵاتی فراوان (دیکتاتۆری) وەدەست بێنێ لە ئەنجومەنی رایخستاد و دواتر هەڵی وەشاندەوە. دوای مردنی هندن بۆرگ لە ٢ی ئابی ١٩٣٤ بە ئامانجەکانی گەیشت، کە دەسەڵاتی ڕەها بوو، لەوکاتەوە ئیتر خۆی بووە پیاوی یەکەمی دەوڵەت، ئەوسا ئیتر (رایخی سێیەم) دەست پێدەکات.

رایخی سێیەم، کە سەرۆکەکەی هیتلەرە، شێوەیەکە لە شێوەکانی حوکمی رەهای رەگەزپەرستیی توندڕەو -واتە هیتلەر - خۆی تاقە سەرکردەبوو، پارتەکەشی تاقە پارت بوو، یان دەبێت نازی بیت یان خائینی، ئابووریەکانی ئەڵمانیا دەبێت بەوردی لە خزمەت بەرنامەکانی رەگەزپەرستیی فراوانکاری دابن. یەکێک لە مێژوونووسانی ئینگلیز بەم شێوەیە پێناسەی ئەم رژێمە دەکات:

(مەترسییەکانی لە حوکمی رەها دەردەکەون ئەوەیە نوێنەری دەسەڵاتێکی روون و ئاسانە، بەڵام دەسەڵاتێکی روتە و بێ چاودێرە).

سیماکانی ئەم دەوڵەتە نوێیە لەساڵەکانی دواتر وێنەیەکی دەوڵەتی تۆتالیتاریی دیکتاتۆری نیشان دەدا، دەوڵەتێک هەموو تواناکانی لە خزمەت بەرنامەیەکی یەکگرتووی دارێژراو دابێت، ئەمەش ئەوەبوو کە هیتلەر مەبەستی بوو، بە دیدی هیتلەریش:

١- پێداهاتنەوە لە چۆنیەتیی سیاسی و ئیداریی ئەڵمانیا وەکو دەوڵەتێکی یەکگرتووی نیمچە فیدراڵ، کە هەر هەرێم و ویلایەتێک مافی تایبەتی خۆی هەیە. بۆیە هیتلەر ئەم مافانەی هەڵوەشاندنەوە، بەڕێوەبردن و حوکمی سەنتەر بە دەستی هیتلەر بوون. بەم شێوەیە هەنگاوێکی نا، کە بسمارک ولهمیش ئەم هەنگاوەیان نەنابوو، ئەڵمانیا بە کردار و بە بەڕێوەبردن لە ١٩٣٤ بووە یەک دەوڵەتی یەکگرتوو بە سیستەمێکی سۆشیالستیی نەتەوایەتیی رەگەزپەرستیی جێرمەنی.

٢- بۆ لەناوبردنی هێزە بەرهەڵستکار و رکابەرەکانی دژی ئەم بەرنامە یەکگرتووەی دەوڵەت (پۆلیسی نهێنی)ی دامەزراند، کە بە (جستابۆ) ناسرا، دەسەڵاتی فراوان و رەها خێرای جێبەجێکردنی خستنە بەردەست دژی بەرهەڵستکارانی رژێمی نوێی وڵات، پیاوانی جستابۆ لە شار و گوند و هەموو شوێنێک لە دەزگا حکومییەکان هەبوون. جستابۆ وەکو ئەوەی سەربەخۆ بن، هیچ چاودێریەکی دادوەریان بەسەرەوە نەبوو، دەیانتوانی ئازادی لە خەڵک زەوتکەن، ژمارەیەکی زۆری خەڵک بئاخننە بەندیخانەکان.

٣- پاککردنەوەی ئەڵمانیا لە بەدڕەوشتان بەتایبەت لە جووەکان، یاسایەکی دەرکرد بەناوی یاساکانی نۆرنبێرگ کە دەڵێت:

ا/ دەرکردنی هەموو فەرمانبەرە جووەکان لەسەر کارەکانیان.

ب/ ڕێگەنەدان بە و جووانەی پارێزەر یان رۆژنامەنوس یان دکتۆر یان دەرمانساز یان بڵاوکەرەوەن کار بکەن.

ج/ بێبەشکردنیان لە زەویی جێماوە (ویراسە).

لەم یاسایانە توندڕەوی لە ڕەگەزپەرستیی دژی جووەکان دەردەکەوێت، بەڵام جووە زایۆنیزمەکان لە وان ڕەگەزپەرستترن[٥٤] ، جووە زایۆنیزمەکان بڕوایان وایە ئەوان گەلی هەڵبژاردەی خوان، گرنگ نییە لە کوێ دەژین، هەموو شوێنێک هی ئەوانە. تەنیا بۆ مەبەستی ئابووری جێگۆڕکی دەکەن، هەندێکیشیان بڕوایان وایە کە سەرکردایەتی هەر دەبێت بۆ جوو بێت. لە لایەکی ترەوە حکومەتی ئەمەریکا -تا ئێستاش- کۆت دەخاتە سەر قولەڕەشەکان بێ هیچ پاساوێک تەنیا بە هۆی ڕەنگەوە، ڕەنگ نابێت کار بکاتە سەر بوونی ئادەمیزاد.

٤- ڕێکخستنی گەنجان و فێرکردنیان لەسەر بنەماکانی نازیی نەتەوەیی ڕەگەزپەرستیی گێرمەنی.

٥- یەکخستنی سیاسەتی ئابووریی دەوڵەت، بە شێوەیەک حکومەت دەست بە بەرهەمەوە بگرێت و سەرانگێری بکات، کرێکار و جوتیارەکانیش بەرپرسیارێتی و مافی خۆیان هەیە. لەم حاڵەتە پێویست بە بوونی سەندیکاکان ناکات - بە دیدی هیتلەر - بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی کرێکار و خاوەن پیشەکان بکات. بۆیە سەندیکاکانی کرێکاری هەڵدەوەشێنرێنەوە، لە شوێنیان (بەرەی کار) دامەزرا، کە لە بنەڕەتدا لە کرێکارەکان بەرپرسە بۆ ئەوەی ڕێنمای جێبەجێکردنی بەرنامەکانی پارتی نازییان بکات. دەبینین هەندێک سیمای لەیەکچوو لە نێوان ڕژێمی ئەڵمانیای نازی و ڕژێمی فاشستی هەن.

١- سەرۆکایەتیی ڕەهای نەتەوایەتی.

٢- تاک لەنێو کۆمەڵی تۆتالیتاری دەتوێتەوە.

٣- پارتی (فاشستی یان نازی) تاقە پارتی دەوڵەتە.

٤- پشتبەستن بە ڕێکخراوێکی بەهێز لە ڕووی جەماوەری و نیشتمانییەوە لە سەندیکاکان و ڕێکخراوە گەنجییەکان.

---

[٥٤] ئەمە بە دیدی نووسەر.

٥- ڕێگەنەدان بە هیچ هێزێکی بەرهەڵستکار دژی ڕژێمی فاشستی بووەستێت.
٦- بەکارهێنانی شێوازی پۆلیسی و تۆقاندن بۆ سەپاندنی یاسا و بیر و بۆچوونەکان.
٧- نەخشەکێشانی دیار بۆ سیاسەتەکانی دەرەوە و ناوەوە.
٨- دوژمندارێتیی توند بۆ پارتی کۆمۆنیست.
٩- تێڕوانین بۆ هەمووارکردنی بڕگەکانی پەیماننامەی ڤێرسای.
١٠- تێروانین بۆ فراوانبوون لە ئەوروپا.
١١- بەهەندوەرگرتن لە وەدەستهێنانی مەوداکانی زیندوو لە (بەلتیک و ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئیتاڵیا و دەریای ناوەڕاست و ئەفریقیا )[٥٥] هەروەها کارکردن بۆ وەدەستهینانی مەوداکانی ئیمپریالی، بە لانی کەم بەقەدەر ئەو پانتاییە بن، کە لەژێر دەستی فەرەنسا و ئیتاڵیادایە.
١٢- پشتبەستن بە سومبولێکی باڵای مێژوویی (لای نازیەکان ئاریایەتی و لای فاشستەکان ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی).

سیاسەتە ناوخۆییەکانی ئەڵمانیا کێشە لەگەڵ وڵاتەکان دروست دەکەن، وەکو بەرگریکردنی فەرەنسا و بەریتانیا و ئەمەریکا لە مافی جووەکان لە ئەڵمانیا، هەروەها یەکخستنەوەی هەموو ئەڵمانییەکان کێشە لەگەڵ چیکوسلۆڤاکیا و نەمسا و ئیتاڵی او پۆڵەندا دروست دەکات، لەگەڵ دووبارە پەیوەندیکردنەوە لە نێوان روسیا و ئەڵمانیا، ئەمانە هەمووی رەوشەکانیان بەرەو گرژی دەبردن.

لە ڕاستیدا یەکخستنەوەی هەموو ئەڵمانییەکان لە یەک دەوڵەتی نازیدا ئامانجی یەکەمی هیتلەر بوو، بەڵام پێشتر چەند هەنگاوێک هەبوون دەبووایە بنرابان بەر لەم هەنگاوە، ئەویش زۆر لە خاکەکانی ئەڵمانیا تا ئەوکات لەژێر چنگی داگیرکاری دەیان ناڵاند (فەرەنسی)، یان بە ڕوونتر بڵێین دووبارە پرچەککردنی ئەڵمانیا و گێڕانەوەی (سار) بۆ ئەڵمانیا، لەگەڵ گەڕانەوەی هێزەکانی ئەڵمانی بۆ راینی لە چەک رامالڕاو بەپێی پەیماننامەی ڤێرسای.

---

[٥٥] لەم بابەتە هیتلەر دەڵێت: ئێمە دان بەوە دەنێین، کە دەریای ناوەڕاست دەریاچەیەکی ئیتالیە هەروەکو دەریای بەلتیک دەریاچەیەکی ئەڵمانییە.

پڕچەککردنەوەی ئەڵمانیا جێی مشتومڕی هاوپەیمانانی دوێنێ بوو (فەرەنسا و بەریتانیا و ئەمەریکا)، هیتلەر ئەم کێشەیەی وەکو پێشێلکاری پەیماننامەی ڤێرسای نەدەخستە روو، بەڵام هاوپەیمانەکانی بەوە تاوانبار دەکرد، کە برگەکانی پەیماننامەی ڤێرسای تایبەت بە چەکداماڵینیان پێشێل کردووە. بەڵام کاتێک وڵاتانی هاوپەیمان رازی نابن چەکەکانیان داماڵن، ماف بە ئەڵمانیا دەدەن، کە خۆی پڕچەک کاتەوە. ئەمەریکا و بەریتانیا رایان لەم بارەیە وابوو، کە بە هۆی ئەوەی چەک داماڵین ئەستەمە جێبەجێ بکرێت، بۆیە بەیەکسانی چەکدار بکرێن.

فەرەنسا لەم رایە توند بوو، گوایە ئەو ڕووبەڕووی ئەڵمانیا دەبێتەوە ئەگەر خۆی پڕچەک کرد، بەرگەی زیاتر ناگرێت لەوەی لە جەنگی حەفتاکان و جەنگی یەکەمی جیهانیی بەسەری هات، بەڵام بارودۆخەکان لە نارەزاییەکانی فەرەنسا بەهێزتر بوون، هیتلەر پێی لەسەر خۆچەکدارکردن داگرت، پابەندنەبوونی خۆشی راگەیاند لە ئەندامێتیی کۆمەڵەی نەتەوەکان، بۆ ئەم مەبەستە ریفراندۆمێکی راگەیاند، تا دەنگ لەسەر مانەوەی یان دەرچوونی بدەن،ریفراندۆمەکە لە ئۆکتۆبەری ۱۹۳۳ دەنگیان بە دەرچوون دا.

هیتلەر بۆ دونیای سەلماند کە بەدەرچوونی لە کۆمەڵەی نەتەوەکان نیازی هێرشکردن نییە بۆ سەر هیچ وڵاتێک، بەڵکو لەگەڵ پۆڵەندا - زۆرترین وڵاتی فراوانکراو لە جەنگی یەکەمی جیهانیی - کەوتە پەیمانێک بۆ ئەوەی کەسیان دەست درێژی نەکاتە سەر ئەوی تر. ئەم پەیماننامەیە لە جەنیوەریی ۱۹۳٤ ئیمزا کرا، لە دەقەکەیدا هاتبوو "هەموو کێشەکان بە ڕێگەی ئاشتی چارەسەر بکرێن". هیتلەر کاتێکی گونجاوی بۆ ئیمزاکردنی ئەم پەیماننامەیە هەڵبژارد، حوکمی نیمچە دیکتاتۆری پۆلۆنیا ئەوکات سەرسامبوون بە رژێمی نازی، بە مەزندەی ئەو پۆلۆنیا لە نێوان دوو زەبەلاحی (ئەڵمانیای نازی و یەکێتیی سۆڤیەت) دەتوانێت گەمەی سیاسی لەگەڵ هەردووکیان بکات، دوای ئەوەی فەرەنسا و بەریتانیا دڵنیایان کردبووەوە لە هەر دەستدرێژیەک لەلایەن ئەڵمانیاوە دەگەنە هانای، دیسان بە مەزندەی پۆلۆنیا دەتوانێت لە ڕێگەی هاوپەیمانێتیەکەی لەگەڵ ئەڵمانیای نازیی بەهێزتر لە فەرەنسا دەستکەوت وەدەست بێنێت. پۆلۆنیا لەگەڵ بەریتانیا لەسەر وەدەستهێنانی دەستکەوت لە ئەنجامی کێشە ناوخۆکانی ئیتاڵیا بە مل یەکدا دەچن و هەندێک چاوبڕینەکانی (تەماحەکانی) لە چیکسلۆڤاکیا بە ئامانج دەگەیەنێت. هیتلەر

لەم هاوپەیمانیتەی سوودی وەرگرت، لە ١٩٣٦ ئەوکاتەی هێزەکانی چوونە ناو راین، پۆلۆنیا بێلایەن وەستا، هەروەها کاتێك فشاری خستە سەر چیکوسلۆڤاکیا لە سێپتەمبەری ١٩٣٨ لە میانەی قەیرانی میونخ.

کێشەی سار یەکێک بوو لە کێشە ورد و هەستیارەکان هەرچەندە لە پەیماننامەی ڤێرسای بەڕوونی ئاماژەی بۆ دراوە، کە دەڵێت: "سار لەژێر دەسەلاتی فەرەنسا دەبێت بۆ ماوەی ١٥ساڵ، ئەوسا لە ریفراندۆمێکدا چارەنووسی دیاری دەکرێت."

هیتلەر داوای ساری دەکرد بێ ئەوەی هیچ ریفراندۆمێک ئەنجام بدرێت و بیخاتەوە سەر خاکی ئەڵمانیا، بەڵام بینیی ئەنجامدانی ریفراندۆم لە بەرژەوەندی ئەڵمانیا دەبێت، بۆیە بەریفراندۆم رازی بوو. ئەوەبوو ئەنجامەکەی، کە لە سەرەتاکانی ١٩٣٥ کرا، لە بەرژەوەندی ئەڵمانیا دەرچوو. ئەمە بەتەواوەتی ئەنجام نەدرا تا هیتلەر بڕیاری راگەیاندنی سیاسەتەکەی سەبارەت بە چەکدارکردن دا، بە بۆچوونی خۆی تاکە رێگەیە بۆ گەڕاندنەوەی هێزەکانی ئەڵمانی بۆ راینی چەک لێ داماڵراو.

بەریتانیا بەرنامەیەکی نوێی بۆ چەکدارکردن راگەیاند، بەرنامەکەی زۆر مەزن بوو، لە وەڵامی ئەم بەرنامەیە هیتلەر لە ٩ی ئاداری ١٩٣٥ بە بەرنامەی بەرزکردنەوەی تواناکانی هێزی ئەڵمانی رەدی دایەوە. وڵاتە هەڕەشە لەسەرەکانی بەرزبوونەوەی تواناکانی سەربازیی ئەڵمانی- لە فەرەنسا و بەریتانیا و ئیتاڵیا- داوای بەستنی کۆنگرەی (ستریزا)یان کرد لە نیسانی ١٩٣٥، ئەم وڵاتانە نارەزاییان لە پێشێلکردنی پەیماننامەی ڤێرسای دەربڕی، کە لەلایەن ئەڵمانیا پێشێلکرا بە پابەندنەبوونی لە دیاریکردنی تواناکانی سەربازی ئەڵمانیا. بەڵام بێ ئەوەی هیچ هەنگاوێکی پراکتیکی بنێن ئیتاڵیا زوو زوو لە ئەڵمانیا نزیک دەبووەوە، بەریتانیاش بە دوژمنکاریەکەی ئیتاڵیا بۆ سەر حەبەشە خەریک بوو، نەیدەویست پانتایی کێشەکانی لەگەڵ ئیتاڵیا بەرینتر بن، بۆ ئەوەی نەکەوێتە باوەشی ئەڵمانیا. مەبەستی بوو ئاراستەکانی ئەڵمانیا روەو رۆژهەڵاتی ئەوروپا بەرێت، بۆیە پەیماننامەیەکی دەریاوانیی لەگەڵ ئەڵمانیا لە ١٩٣٥ ئیمزا کرد، ئەم پەیماننامەیە بۆ سنووردارکردنی هێزی کەشتیگەلی ئەڵمانی بوو.

سەیری بلیمەتی هیتلەر بکەن لە کاتێکدا پۆلۆنیای بەلای خۆیدا کێشا، لە حوزەیرانی ١٩٣٤ هەوڵی کێشانی ئیتاڵیاشی بۆ لای خۆی دا، هێزەکانی نازییە

ئەمسایییەکانیشی پشتەستور دەکرد، ئەوانەی دژی حکومەتی (دلفۆس) کاریان دەکرد، کە دواتر لە ٢٤ی تەمووزی ١٩٣٤ تیرۆریان کرد، ئەوکات زۆر هێمن و لەسەرەخۆ بوو، کاتێک دۆتچێ هێزی نارده ڕێڕەوی برنۆ لە کاردانەوەی کوشتنی دلفۆس بەدەستی نازیەکان، هیتلەر نه وروژا و هیچ قەیرانێکی لەگەڵ دروست نەکرد. لە پەیماننامەیەکدا، کە لە ١٩٣٦بەسترا، دڵنیای کردەوە، کە ڕێز لە سەربەخۆیی نەمسا دەگرێت. تا ئەوکاتەی لە ٧ی جەنیوەریی ١٩٣٥ پەیمانێک لە نێوان ئیتاڵیا و فەرەنسا بەسترا، تیایدا دان بە سەربەخۆیی نەمسا نرا و کۆبوونەوەکانی ئیتاڵیا و بەریتانیا و فەرەنسا لە سترێزا لە نیسانی ١٩٣٥ بۆ نارەزایی دەربڕین لە خۆچەکدارکردنەوەکەی هیتلەر. تا دواجار هیتلەر لە وەدەستهێنانی دۆستایەتی ئیتاڵیا سەرکەوت، کە تەوەری (ئاکسیس)ی ئیتاڵی- ئەڵمانییان پێکهێنا، ئەم دوو لایەنە زۆر لە یەک دەچوون لە ڕووی ئامانج و دروستبوون، کاتێک گۆڕانەکان ئەم لەیەکچوونانەیان بەهێزترکردن بەتایبەتی لە ڕووی:

١- دوژمندارێتیان بۆ ئیمپراتۆریەتی دیموکراتیی ئیمپریالیزمی لە ڕووی ئایدیۆلۆجیا و ئابووری و دوژمندارێتیان بۆ کۆمۆنیستی.
٢- پێویستیی هەر یەک لە ئەڵمانیا وئیتاڵیا بە موستەعمەری تر بە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی دانیشتووانیان و بۆ مەبەستی کردنەوەی بازاڕی نوێ.
٣- ڕێککەوتنی ئامانجەکان لە جەنگی ناوخۆی ئیسپانی.
٤- ڕێککەوتن لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی تۆتالیتاریی سۆشیالیستی بۆرجوازیی نەتەوایەتیی دەسەڵاتدار.
٥- هەر یەک لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا رقیان لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بوو، ئیتاڵیا لە ١٩٣٧ لێی دەرچوو دوای چوار ساڵ لە دەرچوونی ئەڵمانیا و یەک ساڵ لە خۆکێشانەوەی ژاپۆن. بۆیە کارێکی ئاسان بوو بۆ هیتلەر داوا لە دۆتچێ بکات بێتە ناو (میساق)ی ئەڵمانیی- ژاپۆنیی دژی کۆمۆنیستیی نێودەوڵەتی، کە پێشتر لە ٢٥ی نۆڤەمبەری ١٩٣٦بەسترا، هەر واش بوو ئیتاڵیاش لە نۆڤەمبەری ١٩٣٧چووە ریزی. بەڵام فەرەنسا لەم بەهێزبوونەی ئەڵمانیا بێزار ببوو، پەنای بۆ پیادەکردنی سیاسەتە رادیکالیەکەی برد، ئەویش بریتی بوو لە هاوپەیمانێتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەوەی ئەڵمانیا نەتوانێت بە تەنیایی دەست لە فەرەنسا بووەشێنێت. لەو حاڵەتە لە دوو لاوە هەڕەشەی لێ

دەکرێ (١٩٣٥-١٩٣٦) کاتێک هیتلەر بەمەی زانی بڕیاری دا ئەم پەیماننامەیە پرۆسەی ئاشتی و کیانی ئەڵمانی دەخاتە مەترسییەوە، بۆیە لە پێناو ڕاستکردنەوەی پارسەنگی نێودەوڵەتی، هێزێکی نارده سەر راینی لە چەک داماڵراو.

لێرە حکومەتی فەرەنسی ڕووبەڕووی ڕەخنە و تیر و توانجی زۆر بووەوە، کە هیچ هەڵوێستێکی بەرانبەر بەم سنووربەزاندنەی ئەڵمانیا نەبوو، لەکاتێکدا هێزەکانی ئەڵمانیا زۆر لە هێزەکانی فەرەنسا لاوازتر و بێتواناتربن. کەشتیگەلی ئەڵمانی هێشتا لە بێشکەدابوو هەروەها چەکی ئاسمانیی، بەڵام دەبێت ئەوە لە بەرچاو بگرین، کە ئەم تەخمینانە دوای قەیرانەکە بوون نەک لە میانەی، بەتایبەت فەرەنسا لە بەیەکدادانە تەنیاییەکانی لەگەڵ ئەڵمانیا دەترسا، بە شێوەیەکی گشتی گەلی فەرەنسی رقیان لە گەڕانەوەی جەنگ بوو.

حکومەتی فەرەنسی تەنیا لەم کێشەیە بەرپرس نەبوو، بەڵکو لە زیاتر لە یەک کێشە لێی بەرپرسیار بوو، وەزارەتی لافال لەژێر فشارەکانی دوژمنکاریی ئیتاڵیا بۆ سەر حەبەشەی دەنالاند، دواتر هەڵبژاردنەکان هاتن، کە تیایدا (بەرەی گەلی)ی چەپڕەوی فەرەنسی سەرکەوتن، بە هۆی ئەم قەیرانە حکومەتی فەرەنسا لە توانایدا نەبوو هیچ سیاسەتێک دیاری بکات بۆ کێشە خەتەرناکەکە. ئەم لێدانە زۆر سەرکەوتوبوو بە رادەیەک هیتلەر خۆشی بڕوای وانەبوو بەم شێوەیە دەبێت، بووە هۆی هەژاندنی پێگەی نێودەوڵەتیی فەرەنسا، کە هاوپەیمانەکانی فەرەنسا (پۆڵەندا و بەلژیک و ئینگلتەرا) سیاسەتێکی نادوژمنکارانەیان لەگەڵ ئەڵمانیا گرتبووە بەر و ببووە هۆی کەمبوونەوەی گرژی لە نێوانیان.

حکومەت و گەلی فەرەنسا دڵیان بۆ تواناکانی ئەڵمانیا لێی دەدا ئاخۆ لە رووی ئابووریی و سەربازیی و جێنیشی تا چەند گەشەی کردووە، ئەم مەترسیانە مایەی باس و خواس بوون، لە هەمان کاتدا مایەی مشتومڕ و ناویفاقیش بوون، بە هۆی بێتوانایی حکومەتی فەرەنسا لە درککردن بە سیاسەتی نێودەوڵەتی و بە هۆی سەرنەکەوتنی حکومەت لە وەدەستهێنانی زۆرینەی پەرلەمان. چونکە فەرەنسا وڵاتێکی فرە پارت بوو و یەک پارت بە تەنیایی ناتوانێت زۆرینە وەدەست بێنێت، دواتر حکومەتە (ئیئتیلافییەکان) بە هۆی تێکەوتنی پارتی خاوەن سیاسەتی جیا لە توانایاندا نەبوو بەرنامەیەکی روون و دیار بۆ سیاسەتی دەرەوە و ناوەوە دیاری کەن.

هەندێک وەزیر شێوازی دەرکردنی رێورەسمیان گرتبووە بەر، لەجیاتی ئەوەی پڕۆژە پێشکەش پەرلەمان کەن لە خۆیانەوە بڕیاریان دەردەکرد، ئەمەش پێشێلی یاساکانی دیموکراتیی پەرلەمانە. ئەمە تەنیا بۆ ئەوە بوو تا پەرلەمان گرفت نەخەنە بەر پڕۆژەکانیان، ڕاستەوخۆ بڕیاریان لەسەر کارەکانی خۆیان دەدا. ئەم شێوازە سەرەتا لافال گرتیە بەر، هەرچەندە لەلایەن بانگخوازانی بە هێز کردنی دەزگا جێبەجێکارییەکانی دەوڵەت ڕووبەڕووی رەخنەی زۆر لەسەر ئەم شێوازە بووەوە. ئەمانە لە کاتێکدا روویان دا، کە ئاڕاستەی دونیا روەو ئەوە دەچوو دەسەڵات بخرێتە دەست سەرکردەیەک بۆ ئەوەی بە توانا و بە هێزەوە وڵات بەرێت بەڕێوە و ڕەوڕەوەی بەرهەمهێنان و سیاسەت بەرەو لوتکە بەرێت. فەرەنسییەکان ئەم شێوازەیان یەکەم جار لە دوژمنەکەیانەوە بینی، بۆیە دەنگی نارەزایی و داخوازی چاکسازی ریفۆرم لە دام و دەزگا حکومییەکان بەرزبوونەوە.

فەرەنسا مافی خۆی بوو ساڵ بە ساڵ ترسی لە ئەڵمانیا زیاد بکات، هاوپەیمانەکانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیی بە دروستی هاوکاریان نەکرد، بۆیە دەبێت پشت بە خۆی ببەستێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەڵمانیا. هەرچەندە فەرەنسا چەند پەیماننامەیەکی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات بەست، لەوانە (یۆگسلافیا، رۆمانیا، چیکوسلۆڤاکیا، پۆلۆنیا) بەڵام ئەم وڵاتانە ناتوانن سنگ لە ئەڵمانیا بگرن، بۆیە ترسەکانی هەر وەکو خۆیان مانەوە لەوەی جارێکی تر ئەم دوو وڵاتە ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە هەروەکو ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی لە سەردەمی بسمارک و ناپلیۆنی سێیەم رویدا. بەتایبەت ئەم ترسانە ئەوکاتە زیادیان کرد، کە ئابووریی ئەڵمانیا لە سییەکان گەشەیان

کـــــرد و بوونـــــە مایـــــەی بووژانـــــەوەی ســـــەربازیی خێـــــرا.
ترسەکانی فەرەنسا لە ژیانەوەی ئابووریی ئەڵمانیا لە شوێنی خۆیان بوون، بەتایبەت لە ساڵەکانی سییەکان و دواتریش، رۆژنامەیەکی بەریتانی لەم بارەیەوە لە سەرەتاکانی جەنیوەریی ۱۹۳۳ بەم شێوەیە لەسەر ئەڵمانیا دەنووسێت:

(ئـەڵمانیا بـووە بـەهێزترین وڵاتـی ئـەروپا لـە ڕووی ئابوورییـەوە، خـاوەنی پیشەسازییەکی تەواوە، لە توانایدایە هەموو دونیا بە کاڵا هەرزانەکانی داپۆشێت، رکابەر و کێبڕکێکارێکی خەتەرناک و دژوارە، نەک هی ئەورووپای ناوەڕاست بە تەنیا، بەڵکو هی هەموو ئەورووپا).

حکومـەتی فەرەنسا پێویستیی بە دەوڵـەتێکی بـەهێز هەیـە بـۆ ئـەوەی ببێتـە هاوپـەیمانی بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی لەگـەڵ حکومـەتی نـازیی هیتلـەری و مۆسـۆلینیی فاشستی، بەڵام حکومەتی فەرەنسا ناتوانێت چۆنایەتیی وەکو ئەم دوو حکومەتە بێت بە هۆی سروشتی گەلی فەرەنسا و جیاوازیی لەگەڵیان. ئەو گەلەی تامی تاڵی و ستەمی حـوکمی رەهـای (لویسـی چـواردەم) و شۆڕشـی ستەمکاری (سـەرکردە شۆڕشـگێڕە فەرەنسییەکان) و کۆمـەڵی پشێوی (حکومـەتی بەڕێوەبردن) و پادشاخوازی دەستووریی لاوازی (لویسی هەژدەهەم و شارلی دەیەم) و ئیمپراتۆریەتی تاکڕەوی (ناپلیۆنی یەکەم) و ئیمپراتـۆری دەسـتووریی (ناپلیۆنی سێیەم) وکۆمـاریی دیمـوکراتیی پـارتی هـەڵبژاردنی ئیمپریالیی (کۆماری سێیەم)ی کردبێت. رەوشەکان بە سەقامگیری دەستووری کۆماری کۆتاییـان هـات، حـەزەکانی فەرەنسـییەکان بـۆ دیمـوکراتی لـە تێربـوون دابـوون، دەرفـەتی مەزنبوونیان بۆ رەخسا، کە لە کاتی واتەرلۆوە لە ۱۸۱۵ بەدوایدا دەگەڕان.

کەوابێت حکومەتی فەرەنسا بەدوای حکومەتێکی بەهێزدا دەگەڕا نەک فاشستی و نـازی، بـەڵکو دیمـوکراتیی حزبی، سـەرەڕای ئـەوەی دیمـوکراتیی رۆژئـاوا ڕووبـەڕووی هێرشی رەخنەی توند دەبوو لەگەڵ هەوڵـەکانی ڕاستڕەوەکان و چـەپڕەوەکان بـۆ دەسـتگرتن بەسەر دەسەڵات. بەڵام سـەردەم بـووە سـەردەمی چینـی زەحمـەتکێش، بـەهای حکومـەت لـە بەرنامـەی سۆشیالیسـتیەکەی دابـوو، بـەهای پارتـەکانیش لـە مـەودای خۆبەسـتنەوەیان بـە چینی کرێکار و جوتیاران دابوو، زۆرێک لە پارتی چەپڕەو لـە فەرەنسـا وەدەرکـەوتن، ئـەم جۆرە پارتانە پاڵێوراو بوون بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست.

بەڵام ناویفاقیەکانی نێوان پارتەکان دروستبوونی بەرەی دواخست، تا ئەوکاتەی ئەم پارتانە هەستیان بە مەترسیی هاوبەش کردن لە سەرکەوتنی پارتێکی فاشست بەسەریان، ئەوسا (بەرەی گەلەری) لە پارتە چەپڕەوەکان دامەزرا بۆ ئەوەی بگەن بە دەسەڵات و بەرنامەی چاکسازیی گشتگیر جێ بە جێ بکەن. ئەم بەرەیە لە دە پارت پێکهات، بۆچوونی جیایان لەسەر مەسەلەی پرۆلیتاریا و بۆرجوازی هەبوون:

١- پارتی رادیکالی.
٢- پارتی کۆمۆنیست.
٣- پارتی سۆشیالیست.
٤- کۆمەڵەی مافی مرۆڤ.
٥- بزووتنەوەی خەبات.
٦- یەکێتی گشتیی کۆنفیدراڵی بۆ کاری یەکگرتوو.
٧- یەکێتی گشتی کۆنفیدراڵی بۆ کار.
٨- کۆمیتەی رووناکبیرانی دژی فاشیست.
٩- کۆمیتەی جیهانی دژی فاشیزم و جەنگ.
١٠- یەکێتی سۆشیالیستی کۆماری.

چەند هۆکارێکی ناوەکی و دەرەکی هەبوون بۆ دروستبوونی (بەرەی گەلەری) لە ١٩٣٥ لە فەرەنسا گرنگترینیان ئەمانەن:

١- بە هۆی ئەوەی پارتێکی بەهێز لە وڵات حوکمی نەگرتبووە دەست، کە بتوانێت ڕووبەڕووی مەترسییەکان بێتەوە، متمانە بە حکومەت نەمابوو. دیسان بە هۆی ململانێی نێوان سیاسەتمەدار و پارتە فەرمانڕەواکانی فەرەنسا نەتوانرا سیاسەتێکی روون و ئاشکرای ناوەوە و دەرەوە بۆ فەرەنسا دیار بکرێت، تەنیا ئەوە نەبێت دژی ئەڵمانیا سیاسەتی توند پەیڕەو دەکرا.
٢- فرەپارتی لە وڵات و زاڵنەبوونی یەکیان بەسەر ئەوی تر بووە مایەی لاوازی حکومەت و بێتوانایی لە ئەنجامدانی بەرنامەی چاکسازی و بەهێزکردنی دەزگا

جێبەجێکارییەکان، تەنیا جەختکردنەوە لەسەر دەسەڵاتەکانیان لە ئیتاڵیای فاشیست و ئەڵمانیای نازی پەیڕەو دەکرد.

٣- ئابڕووچوونەکانی دارایی، کە ئەندامپەرلەمان و پیاوە دەسەڵاتدارەکان و فەرمانبەران دەستیان تێدا هەبوو و تێیەوە گلابوون، بانگخوازیەکانی رسواکردنیان و پاکتاوکردنی دام و دەزگای حکومەتی فەرەنسیی دیموکراتی لە گەندەڵی ببوونە مایەی گاڵتەجاری مۆسۆلینی و هیتلەر.

٤- پەیماننامەی فەرەنسیی سۆڤیەتی لە ١٩٣٦ هاندەرێک بوو بۆ ئەوەی پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسی لەگەڵ حکومەت بکەوێتە ئاشتبوونەوەیەک، دواتر لەگەڵ پارتە چەپڕەوەکان کەوتنە دروستکردنی فراکسیۆنێک بۆ بەرگریکردن دژی فاشیزم و نازیزم.

لە بەرانبەر ئەم کۆمبوونەی چەپەکان کۆمبوونێکی ڕاستڕەوەکانیش پێکهێنرا، ئەمیان ئامادەبوو گەمە بە فرانک بکات بۆ ئەوەی چەپەکانی پێ تەنگەتاو بکات، ئەم هەڵوێستەیان رق و کینی لە نێوان چەپەکان و ئۆلیگارکییە داراییەکان، کە دەستیان بە تواناکانی وڵاتەوە گرتبوو، دروست کرد. بانکی فەرەنسا لە ڕێگەی پشکدارە مەزنەکانەوە (سەهم) ئاراستە دەکرا، ئەوان لە توانایان دابوو گەمە بە ئابووریی وڵات بکەن.

ئەم کۆمبوونە چەپە بۆ هەڵبژاردنەکان ئامادە کرابوو، لە هەڵبژاردنەکان بەرەی گەلەری بە سەرۆکایەتی لیۆن بلۆم سەرکەوت، حکومەتی لە گەورە چەپڕەوانی فەرەنسی پێکهێنا بێ ئەوەی پارتی کۆمۆنیست بەشدار بێت، بەڵام نوێنەرانی پشتگیریان لێ کرد.

بەرنامەکانی بەرەی گەلەری رووەو رووداني گۆڕانێکی بنەڕەتیی رادیکاڵی لە ڕێکخستنی بەڕێوەبردن و یاسادانان و کرێکاری و ئابووریی و بەرهەمهێنان و دارایی هەنگاوی دەنا، بە شێوەیەک گەرەنتی بن بۆ بەهێزکردنی تواناکانی فەرەنسا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەڵمانیای نازیی پەرەسەندوو.

لەم سۆنگەیەوە بەرەی گەلەری کاری بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتەکان کرد تا هەموو دەسەڵاتەکانی خستنە بەردەست حکومەت بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی بەتوانای کاریگەر بە دەزگاکانییەوە، لە هەمان کاتدا کاری بۆ پاکتاوکردنی دەزگاکان کرد لە فاشستەکان، کە لە فەرەنسا بڵاو ببوونەوە.

لە رووی چاکسازی بەڕێوەبردن بەرەی گەلەری بەرنامە و ئامانجی روون و زۆری هەبوون و کاری زۆری ئەنجام دان، بەڵام گەندەڵی لە دام و دەزگا حکومیەکان لەم ئاستە نەبوون تاقە حکومەت بتوانێت هەموویان ریشەکێش بکات. لە ڕووی چاککردنی باری ژیانی کرێکار و زیادکردنی رۆژانەی کرێکاران سەرکەوتوو بوو، بەرەی گەلەری کاتژمێرەکانی کارکردنی کەم کردەوە و کردنی بە چل کاتژمێر لە هەفتەیەکدا، کرێی رۆژانەشی زیاد کرد، هەندێک پیشەسازیی سەربازیی خۆماڵی کردن (تامیم). لەگەڵ ئەمانەشدا بەرهەم زۆر نەبوو، رەخنە زیاتر بوون، ناویفاقیەکانی نێوان سەرکردەکانی بەرەی گەلەری روون بوون. بۆیە ئەم بەرەیە درێژەی بە حکومڕانی نەدا، وەزارەتی (لیۆن بلۆم) بە هۆی بێتوانایی لە ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانە ئابوورییەکان روخا، ئەو قەیرانانەی لە ماوەی جەنیوەری ١٩٣٦ تا جەنیوەری ١٩٣٧ فەرەنسا توشی هات.

گومان لەوەدا نییە کە تواناکانی بەرە لە ئەنجامدانی گۆڕانی بنەڕەتی سنووردار بوون، گومان لەوەشدا نییە ئەو سەردەمەی ئەم حکومەتە دەسەڵاتدار بوو کێشە نێودەوڵەتییەکان بایەخیان زیاتر دەویست لە کێشە ناوخۆییەکان، بەر لەوەی بەرە دەسەڵات بگرێتە دەست ئەڵمانیا راینی داگیر کردبوو، نۆیەراسیۆنە دوژمنکاریەکانی ئیتاڵیاش لە حەبەشە یەک لە دوای یەک بوون، هەروەها دەستێوەردانەکانی فاشستی ئیتاڵی و نازییەکان و سۆڤیەتەکان لە جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا باڵیان بەسەر رەوشەکاندا کێشابوو، ئەمانە بوونە هۆکاری ئەوەی (لیۆن بلوم) لە گۆڕانە ناوخۆییەکان کەمبایەخ بێت.

لەم ماوەیە بەریتانیا لەسەر رەوشێکی سەقامگیری سیاسی مایەوە، ململانێ لە نێوان سێ پارتی مەزن بوو:

١- پارتی پارێزگاران.

٢- پارتی ئازادیخوازان.

٣- پارتی کرێکاران.

مشتومڕەکان لەسەر سیستەمی وەزاری بوون بێ ئەوەی کەس دەست بخاتە ناوی.

قەیرانە مەزنەکانی توشی بەریتانیا هاتن دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی بریتی بوون لە:

١- مانگرتنی ١٩٢٦ و قەیرانی ململانێ لە نێوان کرێکاران و پارێزگاران.

٢- قەیرانی ئابووریی نێودەوڵەتیی مەزن لە ١٩٢٩.

٣- کێشە درێژخایەنەکەی ئیرلەندا.

٤- دەستهەڵگرتنی پادشا ئەدواردی هەشتەم لە تەختی پادشایەتی لە ١٩٣٦.

هێزی رەوتی سۆشیالیست لە بەریتانیا -وەکو هەموو وڵاتانی تری ئەوروپا- دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی سەریان هەڵدا، لە دوای ١٩٢٠ خۆپیشاندان و مانگرتن لە ریزی کرێکارەکان ئەنجام دەدران، بەتایبەت لەناو کرێکارانی کانزاکان. بۆ توێژینەوە لەم مەسەلەیە لێژنەیەک بە سەرۆکایەتی (سیرجۆن سانکی) پێک هات، لە راپۆرتی ئامادە کراو لەلایەن ئەم لێژنەیە، بە ئاشکرا پەنجەی تاوان بۆ ئەو سیستەمەی حکومەت درێژ دەکات، کە تا ئەو کات بۆ بەڕێوەبردنی کانزاکان پیادە دەکرا. راپۆرتەکە داوا دەکات چاو بەو رێنمایی و سیستەمە دابرێژرێتەوە بە شێوەیەک، کە پانتایی زیاتری جەماوەر لە خاوەندارێتی ئەم کانزانە بکەن و رەچاوی بەرژەوەندەیکانی کرێکاران بکرێت. بەڵام حکومەتی پارێزگاران، کە لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٢١ بەسەر پارتی کرێکاران و ئازادیخوازان سەرکەوتبوو، ئەم داوایانەیان بە ئەنقەست پشتگوێ خستن.

کرێکارەکان هەڕەشەی مانگرتنی گشتیان کرد لە ١٩٢١، بەڵام حکومەت گوێی پێ نەدان. ئەوەبوو لە ئایاری ١٩٢٦ دوای ئەوەی دانوستانەکانیان لەگەڵ حکومەتی سەرمایەدار، کە مەبەستی بوو رۆژانەکان کەم کاتەوە، هەرەس دێنن، دووبارە کرێکارانی کانزاکان بڕیاری مانگرتنێکی گشتییان دا. مانگرتنەکەی ١٩٢٦ لەگەڵ ئەوانی پێشتر جیابوو، بەوەی بەرفراوانتربوو و زۆرێک لە کۆمەڵە جیهانییەکان پشتگیریان بۆ دەربڕین، کە ئەمانە بوون:

١- کرێکارانی هێلی ئاسنین و گواستنەوە.

٢-کرێکارانی چاپەمەنی.

٣- کرێکارانی بیناسازی.

٤- کرێکارانی کانزای ئاسن و پۆڵا.

لەتەک ئەمان هەندێک کارگەرانی بواری بازرگانیش هەبوون، ئەم مانگرتنە بووە سەنگی مەحەک بۆ دەرکەوتنی توانا و خۆڕاگری کرێکاران بەرانبەر بە خاوەن سەرمایە نێودەوڵەتییەکان.

حکومەتی پارێزگاران رشت بوو لەسەر ئەوەی ئەم مانگرتنە سەرنەگرێت، ئەویش لە رێگەی بەڕێوەبردنی وێستگە و بنکە پیشەسازییەکان و دەستگرتن بەسەر بنکەی بارکردن و داگرتن و هاتووچۆی ناوخۆ. حکومەتی پارێزگاران بەرانبەر بەم فراکسیۆنسازییە کرێکارییانە خۆڕاگر بوو، لەگەڵ ئەوەش لە ١٩٢٧ هەوڵی بڵاوەپێکردنی مانگرتوانی دا بە دەرکردنی بڕیار و ناساندنی مانگرتنەکان بە نایاسایی، بە پاساوی ئەوەی هەڕەشە لەسەر حکومەت و نەتەوە دەکەن.

کاتێکیش قەیرانی ئابووریی نێودەوڵەتی لە ١٩٢٩ روویدا و نرخی جونەیهی ئیستەرلینی دابەزی، ئەوسا کرێکارەکان بە سەرۆکایەتی رەمزی ماکدۆنالد دەسەڵاتیان گرتبووە دەست، بەڵام کێشەی ئابووریی زۆر ئاڵۆز بوو، ماکدۆنالد ناچار دەبێت لە هاوینی ١٩٣١ حکومەتی یەکێتیی نیشتمانیی دادەمەزرێنێت، کاری بۆ کەمکردنەوەی خەرجی و موچەکان کرد لەگەڵ زیادکردنی باج و گومرگ لەسەر هاتوو بۆ ئەوەی لە کۆمبوونی کاش دوورکەوێتەوە. هەروەها کاری بۆ پتەوکردنی پەیوەندییە ئابوورییەکانی لەگەڵ موستەعمەرەکانی بەریتانیا کرد، ئەمانە بەریتانیایان لە سیاسەتی لاساییکەرەوە دوور دەکردەوە، کە بریتیی بوو لە (بازرگانیی ئازاد). بە شێوەیەکی گشتی تواناکانی ئابووریی بەریتانیا لە پەرەسەندن دابوو، ئەمە بووە مایەی فراوانبوونی دەسەڵاتەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی.

ئەگەر سیاسەتی ناوخۆ و ئابووریی بەریتانیا سەقامگیر بێت و ببێتە هۆی بووژاندنەوە و زیاتردەستگرتنی ئیمپراتۆریەت بەسەر داگیرکەرەکانی، ئەمە نیشانەی ئەوەیە سیاسەتی دەرەوەی بە دیدی زۆر لە مێژوونووسان سیاسەتێکی سەرکەوتوبووە، هەر ئەمانەش بوونە هاندەری هیتلەر تا دژی ئەورووپای رۆژهەڵات و پەیماننامەی ڤێرسای ئەم کارە جەربەزەییانە بکات، ئەم مێژوونووسانە دوای جەنگ حکومەتی بەریتانیایان بەمانەی خوارەوە تاوانبار دەکرد:

١- هاندانی ئەڵمانیا بۆ فراوانبوون بە ئاراستەی ئەورووپای رۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەت.

٢- بەهێزکردنی بۆرجوازیی نەتەوایەتیی توندڕەوی نازی لە ڕووی سەربازییەوە بە هاوکاریکردنیان بە چەک و پسپۆڕیی و هونەری سەربازیی، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش بە هەمان ئاڕاستەی خەتەرناکدا دەڕۆیشت.

٣- حکومەتی بەریتانیا ڕاشکاوانە و بەتەواوەتی لە تەک نازیزمی ئەڵمانی وەستا، ئەوکاتەی پەیمانی حوزەیرانی لە ١٩٣٥ لەگەڵدا ئیمزا کرد، کە بە پێی ئەم پەیمانامەیە هاوکاریی ماددیی و هونەریی ئەڵمانیا دەکات بۆ بنیادنانەوەی ژێردەریاوانیەکانی. بەم شێوەیە بەریتانیا و ئەمەریکا جێبەجێکردنی تیۆریی (ئاسایشی بەکۆمەڵ)یان بنچاڵ کرد، کە یەکێتی روسیاش پابەندی بوو، لە ئەنجامدا کارەساتی (میونخ)ی بەناوبانگ لە ١٩٣٨ روویدا.

بە دیدی چمبرل - سەرۆکی پارێزگاران- لەیەکتێگەیشتن لەگەڵ ئەڵمانیا باشترە لە راکردن بەدوای بیرۆکەی (ئاسایشی بەکۆمەڵ)، تەنانەت بیرۆکەی بەستنی کۆنگرەشی وەلانا، کە رۆزفلت - سەرۆکی ئەمەریکا - پێشنیاری کرد بوو بە مەبەستی هێورکردنەوەی پشێویەکانی دونیا. لە دانوستان و سازشەکان لەگەڵ ئەڵمانیا بەردەوام بوو تا گەیشتە ئەو ئاستەی داوای لە هیتلەر کرد هەموو کێشە نێودەوڵەتییەکان یەکلا بکەنەوە و هەندێک موستەعمەرەکانیش بۆ ئەڵمانیا بگێڕێتەوە.

بەڵام حکومەتی بەریتانیا لەم هەوڵانەی ڕاستگۆیە، یان مەبەستی کڕینی ئاشتیەکی کاتی بوو بە هەر نرخێک بێت تا ئەو کاتەی لەگەڵ فەرەنسا یان یەکێتی سۆڤیەت خۆی دەخاتە کەندرێکی مان و نەمان؟

هەموو بڕواکان دەڵێن، کە چمبلن گەمەی بە یاریەکی زۆر مەزن دەکرد، تا ئەوەبوو لە داگیرکردنەکەی نەمسا و دانوستانەکانی میونخی ١٩٣٨یش بێدەنگ بوو.

# بەشی هەژدەهەم

## قەیرانە نێودەوڵەتییەکانی بەر لە جەنگی دووەمی جیهانیی

### ١- دوژمنکاریی ئیمپرپیالیزمی ژاپۆنی بۆ سەر چین
### ٢- ئیمپرپیالیزمی ئیتاڵی بۆ حەبەشە
### ٣- شەڕی ناوخۆی ئیسپانی و دیکتاتۆریەتی فرانکۆ
### ٤- هیتلەر و گەڕاندنەوەی یەکێتی ئەڵمانی

## (١) دوژمنکاریی ئیمپریالیزمی ژاپۆنی بۆ سەر چین

کێشەی چینی - ژاپۆنی یەکێک بوو لەو کێشانەی بەر لە جەنگی دووەمی جیهانی هەموو دونیای پێ نیگەران ببوون، دیرۆکی ئەم کێشەیە ئەوەبوو، کە ژاپۆن ببووە وڵاتێکی مەزن لەسەر ئەوروپا، ژمارەی جێنیشی زیادیان کردبوو و بەرهەمە زۆرەکانی لەگەڵ ژمارە کەمەکانی موستەعمەرەکانی تێکیان نەدەکردنەوە. ئەو موستەعمەرانەی لە ئەڵمانیاوە بۆی جێمابوون لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دوور و فەرمۆزا و کوبا، داگیرکردنی بەندەری بۆرت هانی ئەوەی دەدا لە فراوانکاری بەردەوام بێت لە مەنشوریا. بەڵام مەنشوریا چینی بوو ئەوکات چین (چانگ کای چیک) سەرۆکایەتیی دەکرد، ئەوەندە لە مێژ نەبوو لە شەڕی ناوخۆ رزگاربوو، ئیتر سیاسەتەکانی ژاپۆن بەرانبەری گۆڕان، هێرشێکی ئابووریی کردنە سەر وەکو رێخۆشکەر بۆ داگیرکردنی مەنشوریا.

ناردن و هێنانی ژاپۆنی بۆ مەنشوریا بە رێژەیەک زیادیان کرد، ژاپۆنیەکان پرۆژەی ئابووریی لێ جێ بە جێ کردن وەکو: هێلی ئاسنین، بە دەیان هەزار ژاپۆنی کۆچیان کردە مەنشوریا. ئەم سیاسەتەی ژاپۆن بووە فاکتەری مانەوە و رووخانی وەزارەتەکان، کامیان بایەخی بە مەنشوریا دەدا و کامیان پشتگوێی دەخات، سەرکردە سەربازیەکانی ژاپۆنیش لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی بیستەم زۆر بە پەرۆش بوون مەنشوریا بگرن.

حکومەتی چین - ئەندام بوو لە کۆمەڵەی نەتەوەکان - مەبەستی بوو سەرنجی وڵاتان بۆ ئەم جووڵانەوە دوژمنکاریەی ژاپۆن راکێشێت، بێ ئەوەی خۆی هیچ هەنگاوێک لەم بوارە بنێت، چونکە رەوشەکانی ئەوسا لەبار نەبوون بە هۆی:

قەیرانە ئابوورییە نێودەوڵەتیەکەی ١٩٢٩، کە هەموو دونیا پێیەوە خەریک بوو. دیسان بە هۆی گەشەکردنی فاشیست لە ئیتالیا و نازی لە ئەڵمانیا و خەریکبوونی یەکێتی سۆڤیەت بە کێشە ناوەکیەکانییەوە و ئەندامنەبوونی لە کۆمەڵەی نەتەوەکان و لەقبوونی جێ پێی کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەتایبەت دوای دەرچوونی ئەڵمانیا لە کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٣٣ و خۆکێشانەوەی ئیتاڵیا لە ١٩٣٦.

دواتر حکومەتی چینی نیشتمانی ناچاردەبێت پشت بە هێزە پەرش و بڵاوەکەی خۆی ببەستێت بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشە دوژمنکارییە سەربازی و ئابوورییەکەی ژاپۆن،

هەڵبەت ئاسایی بوو کاردانەوەی ژاپۆنیەکان بۆ پڕۆژە ئابووریەکانی چین، کە هێڵی ئاسنین بوو، توند دەبێت، هەروەها دژی کۆچی کرێکارە چینیەکان بوو بۆ مەنشوریا، ئەمە کۆچێکی نەخشەدارێژراو بوو نەک هەرەمەکی.

بە زیادبوونی کێبڕکێکانی ئابووریی چین و ژاپۆن لە مەنشوریا ڕووداو لە نێوان گەلی ژاپۆنی و گەلی چینی لە مەنشواریا لە زیادبوون دابوو، کە زۆرجار دەبووە هۆی کوشتن لە هەردوو لایەن. ئەم کارانە بوونە هۆی جووڵاندنی هەستی نەتەوایەتی لە هەردوو لا، بانگخوازی لەنێو فراوانخوازانی ژاپۆنی بەرزبوونەوە بۆ هێرش بردنە سەر چین، ئەم داخوازیانە زیاتر بوون بە زیاد بوونی ڕێژەی بێکاری بە هۆی قەیرانە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکە. بەم شێوەیە شەڕکردن لەگەڵ چین چارەسەری کێشەی ئابووریی و هەستی نەتەوایەتیی ژاپۆنیەکان دەکات، وێڕای پێویستی ژاپۆن بە مەودای فراوانتر بۆ دۆزینەوەی چارەی زیادبوونی سەرنشینەکانی. ژاپۆن ڕووداوی تێکدانی هێڵی ئاسنینیەکەی لە مەنشوریای بە هەل زانی، بێ ئاگاداری و گەفلێکردن لەشکرەکانی (کوانتۆنج) هێرشیان کردە سەر پێگەکانی سەرەکیی و ستراتیجی لە خوارووی مەنشوریا لە سەبتەمبەری ١٩٣١ و داگیری کرد.

چین پەنای بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان برد بە پشتبەستن بە بڕگەی ١١، کە دەڵێت هەنگاوی پێویست بگرێتە بەر بۆ ئەوەی وڵاتێک هێرش نەکاتە سەر وڵاتێکی تر. هەروەها پەنای بۆ ئەمەریکا برد بە پشتبەستن بەو پەیماننامەیەی لە نێوان ئیتاڵیا و واشنتۆن و ئەڵمانیا و یەکێتی سۆڤیەت لە ئابی ١٩٢٨ ئیمزاکرا بۆ ڕێگەنەدان بە هەڵگیرسانی جەنگ و کارکردن بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان لە نێوان وڵاتان بە ڕێگەی ئاشتیانە، ئەمەش بە ناوی (میساق)ی بریاند - کلۆج ناسرا.

کۆمەڵەی نەتەوەکان لە توانایدا نەبوو هیچ بڕیارێکی یەکلا کەرەوە بدات، دواتر ژاپۆن ئامادە نەبوو گوێڕایەڵی بڕیارەکانی بێت، وڵاتە مەزنەکانیش لە بەرانبەر ئەم کێشەیە کەمتەرخەم بوون و هیچ بڕیار و هەنگاوێکیان دژی نەنا. کەمتەرخەمی ئەمەریکا پێویستی بە توێژینەوە هەیە، چونکە بەهێزبوونی ژاپۆن مانای وایە تێڕوانینەکانی ئەمەریکای ئیمپریالی بۆ ڕۆژهەڵاتی دوور تیادەچن، ئەمەریکا لەم هێرشە دوژمنکاریە تەنیا بە بەیاننامەیەکی ناڕەزایی وەستا و لەمە زیاتر هەڵوێستی نەبوو، بەڵام ئەم

بێهەڵوێستەی ئەمەریکا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، بە بڕوای ئەمەریکا فراوانبوونی ژاپۆن لەسەر حسابی چین هەڕەشەیە بۆ یەکێتی سۆڤیەت، کە بنکەی دەرچوون و هاوکاریکردنی چالاکیەکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی چین بوو. دواتر ژاپۆن بە دیدی بەرپرسە ئەمریکییەکان بەرسنگگری یەکێتی سۆڤیەتە، دەبێت لەم کارانە دەست کراوە بێت، ئەگەر چی هەندێکیش لەگەڵ تیڕوانینەکانی ئەمەریکاش نەیەنەوە. هێزەکانی ژاپۆن لە داگیرکردنی مەنشوریا بەردەوام بوون، دوای ئەوەی ئەمەی بۆ چووە سەر حکومەتێکی خۆجێیی بۆ دامەزراندن و سەربەخۆیی راگەیاند بە ناوێکی نوێ (مۆنشۆکۆ)، لە ١٩٣٢ ژاپۆنیەکان ئیمپڕاتۆری کۆنی چین (پو- یی)یان کردە ئیمپڕاتۆری ئەم دەوڵەتە لەرزۆکە.



پو.یی

حکومەتی ژاپۆن بەردەوام بوو تا هەرێمی (جیهۆ)ی داگیر کرد، کە دەکەوتە نزیک پەکین، لاوازی چین لە رووی سەربازی و پشتتێکردنی وڵاتە مەزنەکان و تێکچوونی رەوشی کۆمەڵەی نەتەوەکان هۆکاری گەشەکردنی ژاپۆن و چاوبرسێتیەکەی

بوون، ژاپۆن لە کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ٢٧ی ئاداری ١٩٣٣ خۆی کێشابووەوە. دەستی کرد بە دارشتنی سیاسەتی گێرانی ڕۆڵێکی سەرەکی لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وەکو ئەو ڕۆڵەی ئەمەریکا لە دونیای نوێ دەبینیێ بە گوێرەی بڕواکانی مۆنرۆ. ئەمە کاتێک دەرکەوت بانگخوازی ئەوەی دا، کە هیچ وڵاتێک مافی نییە دەست لە ڕۆژهەڵاتی دوور وەربدا جگە لە وڵاتانی ئاسیایی، لەم پێناوە و بۆ گەشەپێدانی کەشتیگەلیی کرد بۆ ئەوەی بەرانبەر بە کەشتیگەلی ئەمریکی و بەریتانی بووەستێت، بەم کارەی کێبڕکێیەکی دەریاوانی و سیاسیی خوڵقاند.

ئەم گەشەکردنەی ئیمپریالیزمی ژاپۆنی بووە هۆی ئەوەی ئەمەریکا لە ئاست یەکێتی سۆڤیەت بە سیاسەتەکانی خۆیدا بێتەوە، ئەوەبوو وەکو رێخۆشکەریەک دانی پێنا بۆ گرتنەبەری سیاسەتێکی هاوبەش دژی مەترسیەکانی ژاپۆن. بەڵام لە هەمان کاتدا داوای لە ژاپۆن دەکرد لەگەڵ چین لە دەرگایەکی کراوەدا بێت [٥٦] بە ڕووی هەموو لایەک بۆ ئەوەی وەکو کاری داگیرکاری سوودی لێ وەرگرن، بۆیە هێلە رکابەرەکانی ژاپۆن لە دەوری مانەوە، ژاپۆن ناچاردەبێت هەنگاوێکی خەتەرناکتر بنێ، بریتی بوو لە دەست خستنە سەر چین بەگشتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئابووریی ژاپۆن، جا بە هێز بێت یان بە رەزامەندیی. چین رازی نەبوو بە خۆشی خۆی ببێتە موستەعمەری ژاپۆن، لە ئەنجامدا جەنگ لە نێوان ژاپۆن و چین لە ١٩٣٧ ڕوویدا، بە بیانووی ئەوەی ژیانی هاووڵاتیانی ژاپۆنی لە ئەنجامی سیاسەتەکانی چین لە مەترسی دایە، بەر لەوەی چین بکەوێتە خۆ و ئامادەباشیەکانی سەربازیی بە سەرۆکایەتی (شیان کای چیک)ی دوژمنی سەرسەختی ژاپۆن. لە کاتی ڕووداوی سنوور، کە لە نێوان هێزەکانی چین و ژاپۆن لە شاری (وان- بنج) ڕووی دا لە سەرەتای تەمووزی ١٩٣٧، حکومەتی ژاپۆن داوای لە چین کرد هێزەکانی لە باکووری چین بکێشێتەوە، واتا چارەنووسی باکووری چین وەکو چارەنووسی مەنشوریای لێهات، حکومەتی چانگ کای شیک ئەمەی رەت کردەوە.

ئەوەبوو هێزەکانی ژاپۆنی لە ناوەڕاستی مانگی تەمووز هێرشیان کردە سەر پەکین و لە ١٨ی تەمووز داگیریان کرد، دواتر بۆ شانگهای و نانکی لە ساڵی پاشتر. دواتر بۆ

---

[٥٦] سیاسەتی دەرگای کراوە.

چینی باکوور و ناوەڕاست و کەنارەکانی چینی باشوور، ئەوکات چانگ کای چیک پەنای بۆ (چۆنگ کینج) برد، کەچی ئەو سوربوو لەسەر شەڕکردن. سەرەڕای شکست و کارەساتەکانی یەک لە دوای یەکی سوپاکانی چینی و لەدەستدانی ملیۆنەها سەرباز لە مەیدانەکانی جەنگ و دەستگرتن بەسەر یەک لەسەر پێنجی باشترین خاکەکانی چین، لەگەڵ ئەمەشدا بە تێڕوانینەکانی چینیەکان سەرکەوتن بۆ ئەوان بوو، ئەم تێڕوانینانەش بنەمایان لەم خاڵانەوە گرت بوو:

١- ژاپۆن نەخشەی بۆ شەڕێکی خێرا و کت پڕ دانابوو تا هێزی خەباتی چینی لەباربەرێت، بۆ ئەوەی حکومەتی نیشتمانیش ناچارکات بە مەرجەکانی ژاپۆن رازی بێت، ئەوسا ژاپۆن خۆی بینیەوە توشی بە شەڕێکی درێژخایەن و پان و بەرین بووە.

٢- هێزەکانی ژاپۆن دەستیان گرتبوو بەسەر شار و پێگە ستراتیجیەکان، بەڵام گوندەکانی چینی لەژێر دەسەلاتی چینی نیشتمانی بوون، ئەمەش بۆ ژاپۆنیەکان هەڕەشەبوو، کە ڕووبەڕووی شەڕێکی پارتیزانی دژوار ببنەوە.

٣- ژاپۆنییەکان بڕوایان وابوو دوای لێدانەکان حکومەتی چانگ کای چیک دەڕووخێت، بەڵام بەرگریی کرد و بەردەوام بوو لە خۆڕاگری سەرەڕای نابەرانبەری هێزەکانی لەگەڵ هێزە زەبەلاحەکەی ژاپۆن.

٤- سیاسەتی ژاپۆنی ئابووری هەڕەشەی لە بەرژەوەندییەکانی ئەوروپی لەناو خاکی چین دەکرد، ئەمە بووە پێویست، کە لە بچووکترین دەرفەت ئەوروپییەکان جوولەیەک بکەن. ئەم شەڕانە بەردەوام بوون تا جەنگی جیهانی دووەم بەرپابوو، ئەوسا ئەمانەش بوونە بەشێک لە جەنگی جیهانی دووەم، بەشێکی زۆر گرنگیش دوای ئەوەی ژاپۆن لە لیبرال هاربەری دا لە ١٩٤١.

## (٢) ئیمپریالیزمی ئیتاڵی بۆ سەر حەبەشە

ئەفریقیای رەش لە نیوەی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئامانجی ئەوروپای داگیرکار بوو، ئەوکات هیچ وڵاتێکی سەربەخۆ لە ئەفریقیا نەبوو جگە لە حەبەشەی کریستی، کە حاکمێکی نیشتمانپەروەری هەبوو ئەویش هیلاسی لاسی بوو. بەڵام ئەو کاتەی موستەعمەرەکانی ئیتاڵی لە ئەریتێریا و سۆماڵی ئیتاڵی بڵاو ببوونەوە، ئەم دەوڵەتە ببووە

دەوڵەتێکی ناوخۆ، هەروەها موستەعمەرەکانی بەریتانی و فەرەنسی لە سوودان و سۆماڵی ئینگلیزی و سۆماڵی فەرەنسی (جیبۆتی) هەبوون، ئیتاڵیای دڵ پڕ لە کین لە هەموو جێماوەکانی (وراسە) فەرەنسی و بەریتانی و ئەڵمانی لە ئەفریقیا تەنیا حەبەشەی بە مەودای گونجاوی خۆی دەبینی، بەتایبەتی ئەگەر ئیتاڵیا ئەم شوێنە داگیر بکات، دەبێتە هۆی ئەوەی پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ هەموو موستەعمەرەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا هەبێت .

داگیرکردنی حەبەشە بۆ ئیتاڵیا و ئەوروپا ئامانجی تری دەپێکا:

١- گەلی ئیتاڵی تا ئەوکات بەزینەکانی پێگەی (عدوە)یان لە ١٨٩٦ لە بیرمابوو، کە پادشا (منلیک) هێنابوویە ڕێی سوپاکانی ئیتاڵی. مۆسۆلینی یەکێک بوو لەو سەرکردانەی مەبەستی وەدەستهێنانی ئەو جۆرە سەرکەوتنانە بوون، کە پێشتر نەیانتوانیوە وەدەستی بێنن، تا بلیمەتی خۆی بسەلمێ بە سەلماندنی زاڵبوونی ئیتاڵیای دۆتچێ و فاشست.

٢- ئەوروپا بۆ تیۆری زاڵبوونی ڕەگەزی ئەوروپی و پەیامی مرۆیی پیاوی سپی زۆردەمارگیربوو، تەنانەت ئەگەر ئەم پەیامە لەسەرلاشەی ئەفریقییەکانیش تەواوبێت، دواتر داگیرکاریەکەی ئیتاڵیا بۆ حەبەشە لە ئەوروپا پێشوازیی لێ کرا، تەنیا لەلایەن هەندێک سەرکردەی ئەوروپی نەبێت، ئەویش لەبەر هۆکاری سیاسی بوو.

٣- فاتیکان لە ئامادەکاریەکانی ئیتاڵیا بۆ داگیرکردنی حەبەشە بێلایەنی خۆی ڕاگەیاند، لە هەمان کاتیشدا ناڕەزایی لەم هەنگاوە دەرنەبڕی، مەزندەکان بۆ ئەوە دەچن لەم داگیرکردنەی فراوانبوونی مەوداکانی بلاوکردنەوەی کاسۆلیکیی دەبینی لەگەڵ دەستەڕۆبوونی کەنیسەی قیبتی لە حەبەشە و دواتر ڕادەستکردنی بۆ کاسۆلیکی.

بەلام بەجێگەیاندنی ئەم ئامانجە تەگەرەی زۆری لە پێشە و بەئاسانی ئەم مەرامانە بە ئەنجام ناگەن، ئەم کارە هەموو دونیا دەخاتە بەردەم قەیرانێکی ئاڵۆز و هەندێک دەوڵەت دەکاتە دژی ئیتاڵیا، گرنگترین کۆسپەکان بریتین لە:

بەریتانیا و فەرەنسا لە ١٩٠٦ەوە دەسەلاتیان لە حەبەشە لە نێوان خۆیاندا دابەش کردبوو، هەر سنووربەزاندنێک مانای ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ ئەم دوو وڵاتە، بەلام ئەم هاوکارییە لە ڕووبووروبوونەوە بە هۆی ناویفاقیەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی لە نێوان

ئینگلیز و فەرەنسا لاوازە. فەرەنسا ترسی لە بەرپەرچدانەوەی پرۆژەکەی ئیتاڵیا هەبوو، نەبادا لە ئەنجامی ئەم بەرپەرچدانەوەیە نزیک بوونەوە لەگەڵ ئەڵمانیا روویدا یان ببێتە مایەی جەختکردنەوەی چالاکیەکانی ئیتاڵیا لە دەریای ناوەڕاست، کە ئەمەش بۆ فەرەنسا سەریەشەیە.

٢- حەبەشە لە ١٩٢٣ ببووە ئەندام لە کۆمەڵەی نەتەوەکان، ئەم هەنگاوەی ئیتاڵیا ڕووداوێکی خەتەرناکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان و بەر لە ئێستا رووی نەداوە کۆمەڵە دەخاتە هەژان، ئەمە لەسەر بنەمای (ئاسایشی بەکۆمەڵ) بنیاد نراوە بۆ پاراستنی ئاسایشی دەوڵەتانی ئەندام. نەدەبووایە وڵاتەکان ئەمە قبووڵ بکەن، چونکە ئەمە چارەنووسی هەموویانە، بەڵام هەڵوێستی وڵاتە مەزنەکان هێز بە مەساجی کۆمەڵە دەدات هەر ئەو هەڵوێستەشە یان چەمکەکان بە هێز دەکات یان شەرمەزار. مۆسۆلینی دەیزانی کە هەمووشتێک دەکرێت گفتوگۆ و سازشیان لەسەر بکرێت چ لەگەڵ بەریتانیای ئیمپریالیزم چ لەگەڵ فەرەنسای ئیمپریالیزم، کە شەو و رۆژ ترسی لە بەستنی هاوپەیمانیەتێکە لە نێوان ئیتاڵیا و ئەڵمانیا، لێرەوە ئامادەباشییەکانی ئیتاڵیا بۆ سەربازی و دانوستان لەگەڵ پاریس و لەندەن وەرگیران.

دیارە کە فاکتەری ئابووری لە دوژمنکاریەکەی ئیتاڵیا بۆ سەر حەبەشە بەدی دەکران، ئەم فاکتەرەش دووسەرە بوو:

١- نێردراوە زانستیەکانی ئیتاڵیی هەڵسابوون بە ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر توانا ئابووریەکانی حەبەشە، راپۆرتەکانی ئەم نێردراوانە باسیان لە دەوڵەمەندی حەبەشە کردبوو لە رووی سامان و بەرهەمی کشتوکاڵیی سەرزەمین و یەدەگی ژێرزەمین، تەنانەت هەندێکیان ئاماژەیان بە بوونی (پلاتینیۆم)یش دابوو.

٢- چارەسەرکردنی فاشست بۆ قەیرانی ئابووریی ئیتاڵیا، کە لە ساڵی ١٩٢٩وە ڕووبەڕووی ببووەوە، بەشێکە لە چارەسەری قەیرانی ئابووریی جیهانیی مەزن، کە چارەسەرییەکی ریشەییان بۆی پێنەکرا تا ئیتاڵیاش تووشی هات و دواتر ڕووبەڕووی شەپۆلی بێکاریش هات، فاشست ئەم بێکاریەی لە رێگەی بەسەربازیکردن پەردە پۆش کرد، کە ئەمەش توانایەکی سەربازیی بەرفراوان دەخاتە بەردەست حکومەتی ئیتاڵیا و دەتوانێت چاوتێبڕینەکانی لە فراوانکاری پێ بە ئەنجام بگەیەنێت.

دواتر ئیتاڵیا خۆی ئەریتێریای داگیر کردووە، ئەگەر بەریتانیا ئاوی حەبەشەی لە ڕووباری نیلەوە لێبگرێتەوە، ئەم دەتوانێ کار بکاتە سەر بەریتانیا و ئەم پرۆژەیەی نەزۆک بکات، ئەوکاتەی بەریتانیا ویستی لەمپەرێک لەسەر دەریاچەی (تانا) دروست بکات، ئیتاڵیا لەگەڵی کەوتە سازشیەک و لە ١٩٢٥ بەم شێوەیە پێک هاتن:

١- بەریتانیا مافی ئەوەی هەیە لەمپەرێک (بەنداو)ێک لە شوێنی دەرچوونی دەریاچەی تانا دروست بکات.

٢- بەشی ڕۆژئاوای حەبەشە ناوچەی دەسەڵاتی ئیتاڵیا دەبێت.

پەیوەندییەکانی ئابووریی ئیتاڵیا و حەبەشە بە پێی بەرنامەیەکی داڕێژراو لە گەشەکردن دابوو، لەگەڵ ئەوەی (میساق)ی دۆستایەتی و خۆشەویستی لە نێوان ئیتاڵیا و حەبەشەدا هەبوو لە ١٩٢٨ەوە، بەڵام ئابووریی ئیتاڵیا بە شێوەیەکی مەترسیدار خزابووە ناو دەزگاکانی حەبەشە، کە هەڕەشەیان لە سەربەخۆیی دەکرد، بۆیە هیلاسی لاسی ناچار دەبێت داوا لە سەرمایەدارانی ئەمەریکا بکات بۆ ئەوەی لە مەترسییەکانی ئیتاڵیایان رزگار بکات و لەدەست فشارەکانی ئابووری ئیتاڵیاش نەجاتی بێت. بەڵام بوونی ئیتاڵیا وەکو دراوسێ و نەبوونی شوێنپێی ئەمەریکا لە ناوچەکە و دوورەدەستی و هەڵوێستە نەرێنیەکەی بەریتانیا و فەرەنسا لە دەستتێوەردانەکانی ئیتاڵیا، ئەمانە بوونە هۆکاری ئەوەی مۆسۆلینی فشارەکانی توندتر بکات و لە ژوانی دەرفەتێکدا بێت تا داگیری بکات. ئەم دەرفەتە لە کاتێکدا هات، کە پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی لەوپەڕی ئاڵۆزیدا بوون لە ساڵەکانی ١٩٣٤/١٩٣٥، لە دیسەمبەری ١٩٣٣ کێشەیەکی چەکداری لە نێوان هێزەکانی ئیتاڵی و حەبەشە لەسەر خاوەندارێتی گوندی (وال وال) دروست بوو، تیایدا ٣٠ سەربازی ئیتاڵی کوژران. لەگەڵ ئەوەی هێزەکانی ئیتاڵی دەستیان گرتبوو بەسەر (وال وال) بەڵام مۆسۆلینی داوای قەرەبووی دەکرد، ڕازی نەبوو هیچ گفتوگۆیەک لەسەر هۆکارەکانی دروستبوونی ئەم کێشەیە بکەن. حەبەشەش پەنای بۆ (میساق)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان برد، داوای ناوبژیوانیی کرد بە پێی (میساق)ی دۆستایەتی و خۆشەویستیی نێوان ئیتاڵیا و حەبەشە، بەڵام ئیتاڵیا لە فشار و ویفاقردنەوەی هێزە سەربازییەکان بەردەوام بوو، سەرەڕای داواکردنی کۆمەڵەی

نەتەوەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بە پێی (میساق)ی ناوبراو، ئیتاڵیا هەموو هەوڵە ئاشتیخوازەکانی رەت کردنەوە و هێزەکانی بەرەو ناوجەرگەی حەبەشە بردن.

ئەم جەربەزەییەی ئیتاڵییەکان بۆ ئەمانە دەگەڕێنەوە:

١- کەسایەتیی بەهێزی مۆسۆلینی و رشتبوونی لە داگیرکردنی حەبەشە لە پێناو چەسپاندنی سیاسەتە فاشستیە ئیمپریالیزمیەکەی.

٢- سەرکەوتنی لە دانوستانەکانی لەگەڵ (بییر لاڤال)ی وەزیری فەرەنسی، کە تیایدا لەسەر ئەوە پێکهاتن، چاوپۆشی لە هەنگاوەکانی ئیتاڵیا بکرێت.

٣-لاوازی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەروونی ئاشکرا بوو، کە ناتوانێت (ئاسایشی بەکۆمەڵ) بۆ وڵاتان و بەتایبەت بۆ حەبەشە دابین بکات.

٤- بەریتانیا بەرەو ئەو ئاڕاستەیە چوو تا ئیتاڵیا بە بەشێک لە حەبەشە رازی بکات نەک هەمووی، وە لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵ فەرەنسا کەوتە گفتوگۆ. لە هەمان کاتدا سمۆیل هۆر بڕوای وابوو، کە لەگەڵ فەرەنسا بکەونە گفتوگۆ و کەشتیگەلی بەریتانیش بۆ ئەم مەبەستە بەکار بێنن وەکو هێزێکی فشار، لەگەڵ دەرکردنی بڕیارێک لە کۆمەڵەی نەتەوەکان ئیتاڵیا وەکو دەستدرێژ لەم کردەوە ناو ببات، بەڵکو لەخۆباییەکانی ئیتاڵیا سنووردار دەبن. سەرەڕای جووڵەکردنی کەشتیگەلی بەریتانی لە دەریای ناوەڕاست، ورەی مۆسۆلینی دانەبەزی، هەروەها لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان رەزامەندیی لەسەر سەپاندنی سزا بەسەر ئیتاڵیادا، بەریتانیا مەبەستی نەبوو لەسەر کێشەی حەبەشە لەگەڵ ئیتاڵیا بکەونە جەنگ، بۆیە خۆی دەهێنا و دەبرد، سزا سەپێندراوەکانیش ئابووری بوون کارێکی ئەوتۆیان بەسەر ئیتاڵیاوە نەبوو. دوایین هەوڵەکانی حەبەشە ئەو رێککەوتنە بوو، کە لە نێوان هۆر و لافال ئەنجام درا لە پێناو دەستکەوتنی دەروازەیەکی دەریایی لە بەندەری (عەسەب)، حەبەشە رازی بوو لە دەستگرتنی ئیتاڵیا بەسەر پانتاییەکی زۆری خاکەکانی حەبەشە. بەڵام بەریتانیا بەم خیانەتە رازی نەبوو، کە ئەندامێکی کۆمەڵە بەم شێوەیە سەرفراز بکرێت، بۆیە (هۆر) دەستی لە کار کێشایەوە، هەروەها وەزارەتی لافالیش رووخا. بەڵام ئیتاڵییەکان دەستیان بەسەر هەموو خاکی حەبەشەدا گرت و فیکتۆر عەمانۆئیلی سێیەمیان کرد بە

ئیمپڕاتۆری حەبەشە، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣٦ رۆژهەڵاتێکی ئەفریقیی ئیتاڵی دروست بوو، ئەو ساڵ هەمان ساڵ بوو، کە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا بەرپا بوو.

## (٣) جەنگی ناوخۆی ئیسپانی و دیکتاتۆریەتی فرانکۆ



فرانکۆ

دوای جەنگی پێنجەمی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ١٨٩٨ و لەئەنجامی لەدەستدانی موستەعمەرەکانی لە ئەمەریکای باشوور لە چوار یەکی یەکەم و دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، ئیسپانیا لە هەرەسێکی گشتی دابوو، پادشای فەرمانڕەوا لە ئیسپانیا لە حکومڕانییدا پشتی بە کەنیسەی کاسۆلیکی و دەسەڵاتی دیکتاتۆری بەستبوو، دەستووریشی پەک خستبوو. بەڵام هێزە ریفۆرمخوازەکان لە دەسەڵاتی کۆنەپەرستان بەهێزتر بوون، بیری سۆشیالیست و لیبرالی لەنێو کرێکاران و دانیشگاکان بڵاوبوونەوە، ئەم پەرەسەندنەی لیبراڵییەکان رەگی گەندەڵی و ئۆروستوکراتیەتی کۆشکی پادشایەتیی قووڵتر کرد.

بە هۆی ئەوەی هێزی ڕکابەری ئۆتۆکراتیی دەسەڵاتدار ئەوەندە بەهێز نەبوو، هەروەها بووژانەوەی دەسەڵاتی سەربازیی لایەنگرەکانی پادشا هەموو شۆڕشەکانی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیی، کە لە ئیسپانیا بەرپا ببوون، کاریگەر نەبوون، وەکو: شۆڕشی بەرشەلۆنە لە ١٩٠٩، بەڵام هەژاندنی مەزن، کە هەموو کۆمەڵگای ئیسپانیی هەژاند لە ڕۆژئاواوە هاتبوو. لە ١٩٢١ سەرکردەی موجاهیدی عەرەبی لە گوندەکانی ئیسپانیا توانیی هێزە نەیارەکان و هێزە نیشتمانپەروەرەکان دژی ئیمپریالیزمی ئیسپانی ویفاقاتەوە، هەروەها عبدالکیرم الخطابی توانیی لە ١٩٢١ کارەساتێک بەسەر لەشکری ئیسپانی بێنێت، کە تیایدا پتر لە دە هەزار کوشتیار هەبوون. گورزەکانی بەر حکومەتی ئیسپانی دەکەوتن کوشندە بوون، بەڵام کوشندەتر ئەو گەندەڵیە بوو، کە پادشا فۆنسۆی سیانزەهەم تێی کەوتبوو.

ئەگەر کەسانی نیشتمانپەروەر دەست بگرن بەسەر وەزارەتەکان ئەوسا کەس لە توانایدا نییە بەرگری لە ئابڕووچوونەکانی پادشا بکات و لەدەست گەلی ڕزگار بکات، ئەمە دوای ئەوەی ڕۆژنامەکان و پەرلەمان داوای ئاشکراکردنی گەندەڵی و کارەساتەکانیان دەکرد، داوایان دەکرد هۆکاری ئەو کارەساتە سەربازیانە ڕوون بکرێنەوە. ئەوەبوو کاریان بۆ ڕووخانی حکومەت کرد، حکومەتێک بە سەرۆکایەتی دیکتاتۆر جەنەرال بریمۆ دی ریڤێرا لە سێپتەمبەری ١٩٢٣ پێکهات.

ئەوەندەی نەبرد پەرلەمان هەڵوەشایەوە، ئازادییەکان سنووردار کران و ڕکابەرەکانیش دوورخرانەوە، بە دەستێکی پۆڵایین دەست گیرا بەسەر حوکم، بەڵام ئەم جۆرە حکومڕانییە توندوتیژە ناتوانێت درێژە بە دەسەڵات بدات، بەڵکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لایەنگرانی کەم دەبنەوە و چارەسەری دڵەڕاوکێی گەل ناکات تا کاتێک خۆی بە گۆشەگیر دەبینێتەوە،، تەنیا لە ڕێگەی سوپا حکومڕانی دەکات، ئەگەر متمانەی خەڵکیش لەدەست بدا، ئەوا چارەنووسی ڕووخانە.

ئەمە لە ١٩٢٩ بەسەر بریمۆ دی ریڤێرا هات لە ئەنجامی فشاری گەل بۆ حکومەتێکی هەڵبژێردراوی نوێنەرایەتیی دەستووری، ناچار دەبێت لە ١٩٣٠ دەست لە کار بکێشێتەوە. پادشا هەستی بەوە کرد کە ڕەوتی پێشکەوتنخواز ئەوەندە بەهێزە، ئەستەمە بەرۆکی لێ بگیرێت. بۆیە ڕێوڕەسمێکی دەرکرد بە ڕەهاکردنی ئازادییەک و ئەنجامدانی

هەڵبژاردن، ئەمە دەرفەتێکی باش بوو بۆ سەرکردە سۆشیالیستەکان بۆ ئەوەی بگەنە ئەنجومەنی نوێنەران و کورسیی وەزارەت. پارتە کۆماریخوازەکان سەرکەوتنی باشیان وەدەست هێنا، کاری کردە سەر پادشا تا وڵات جێ بێڵێت. لە ١٩٣١ کۆماریی راگەیەندرا (زائیمزا) بە شێوەیەکی کاتی بوو بە سەرۆککۆمار، حکومەتێکی سۆشیالستی چەپڕەوی بەرهەڵستکاری کەنیسە و پادشایەتی و دیکتاتۆریی سەربازیش پێک هێنرا، حکومەتی زائیمزای (ئیئتلافی) بەرنامەی چاکسازی خۆی لەسەر ئەم بنەمایانە دارشت:

١- دەسەڵاتێکی کۆماریی پەرلەمانیی دیموکراتیی هەڵبژێردراو.

٢-ئازادی ئایینی لە پێناو پاراستنی یەکڕیزیی رۆشنبیرانەی گەل، خوێندنگا ئەکلیرکیەکان هەڵدەوەشێندرێنەوە.

٣- جێبەجێکردنی چاککردنی کشتوکاڵی و خۆماڵیکردنی (تامین) موڵکەکانی کڵێسا.

٤- توانا ئابوورییەکانی وڵات لە خزمەت بەرژەوەندیی گشتی دابن، حکومەتی (ئازانا) — لە دوای حکومەتی زائیمزا هات - هەنگاوی مەزنی لە مەیدانی جێبەجێکردنی بەرنامەکان نابوو. بەڵام ئەوەندەی نەبرد لە ئەنجامی هێرشی چەپڕەوەکان توشی پشێویی هات، زیاتر شۆڕشگێڕیان لێ داوا دەکردن، بە هۆی ئەوەی لە ئەنجامی جێبەجێکردنی بەرنامەی چاکسازی زیانی زۆر بە بەرژەوەندییەکانی پادشاخواز و سەربازییەکان و دەرەبەگ و کاسۆلیکەکان کەوتبوو، ئەوانیش بۆ قۆستنەوەی ئەم هەڵە پێکهاتەی ڕاستڕەو لەمان و چەپڕەویش لە لایەنی چەپڕەوەکان پێکهێنران بۆ رووخانی حکومەتەکەی (ئازانا)، دوای ئەوە نیتر حکومەت کەوتە ناو قەیرانێکی تایبەتی بە هۆی نەمانی متمانە و سپاردنی پۆستی وزاری بە کەسانی بێ بنکە جەماوەری و بێتوانا بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕووداوە کتوپڕەکان.

وڵات ڕووبەڕووی شۆڕشێکی کۆمۆنیستی بوو لە ١٩٣٤، بەڵام هەر زوو کپ کرایەوە و رەنگدانەوەیەکی خراپی لەناو جەماوەر جێهێشت، هێزی چەپڕەوە هەستی بەوە دەکرد، کە خەریکە کارەکانی لە دەست دەردەچن و ڕاستڕەوەکان گورزی خۆیان دەوەشێنن. بۆیە شێوازی کلاسیکیان گرتە بەر بۆ وەدەستهێنانی زۆرینەی پەرلەمان، کە لە ١٩٣٦ ئەنجام دەدرێت. مەزندەکانیان وا دەرچوون لە ١٩٣٧ هەڵبژاردن ئەنجام درا و (بەرەی گەلەری) زۆرینەی کورسیەکانی وەدەست هێنا، کە بریتی بوو لە ٢٦٧ کورسی، بەڵام ئەم

سەرکەوتنەی لەسەر حسابی پارتی میانڕەو وەدەست هێنا، کە ٦٠ کورسیی وەدەست هێنابوو، پارتە ڕاستڕەوەکانیش ١٣٢کورسی. ئەمە بووە مایەی مسۆگەربوونی ڕوویەڕووبوونەوە لە نێوان هەردوو نەیار، بەڵام ڕاستڕەوەکان شێوازی تۆقاندنی چەکدارانەیان گرتبووە بەر بۆ لەناویردنی نەیارانیان.

(بەرەی گەلەری) کاری بۆ دوورخستنەوەی (زائیمزا) کرد لە سەرۆکایەتی کۆمار، لە شوێن ئەم (ئازانا)یان دانا، بەڵکو ئەم بتوانێت دەست بگرێ بەسەر دۆخەکە، بەڵام بە هۆی تێکچوونی ڕەوشەکە و زۆربوونی هێزی تێکهەڵچوو ئەمەی بۆ نەکرا، ئەم هێزە تێکهەڵچووانەش بریتی بوون لە:

١- کۆمۆنیستەکان، بنکەکانیان لە (ئستۆریاس) و (سەڤیلس) بوو.

٢- هاوپەیمانێتیی نێوان هەندێک لە سەرکردە سۆشیالیستەکان و سەرکردەکانی هەندێک لە سەندیکاکان.

٣- (فلانگ)، ئەمەش دیکتاتۆری پێشوو خۆسێ کوڕی ئەنتۆنیۆ دی ریڤیرا لە کۆمەڵێک ئەفسەر دروستی کردبوو.

وڵات کەوتە ڕەوشێکی ئاژاوە و هێزەکان کەوتنە گیانی یەکتر، لە شەقامەکان کوشتار دەکرا، تۆقاندن هەرەشەی لە خێزان دەکرد. ئەو دادوەرەی فەرمانی بەسەر یەکێك لە (فلانگ) بسەپاندبا لاشەکەیان بە کوژراوی دەدۆزیەوە، ڕۆژنامەوانەکان ئەگەر هێرشیان بکردبایە سەر لایەنێک تیرۆر دەکران، کۆمۆنیستەکان و ئاژاوەگێران مانگرتن و خۆنیشاندانی مەزنیان ئەنجام دەدان لە مەدرید. کارەکان پەرەیان سەند و بێکاری زیاد بوو، بەرهەم نەما، وڵات کەوتە دۆخێکی شەڕی ناوخۆ و شۆڕش دژی حکومەت بەرپا بوو. سەرەتای شۆڕش بە دەستی چەند ئەفسەرێک بە سەرۆکایەتی کالفو ستیلۆ دەستی پێکرد، کە وەزیری دارایی بوو لە وەزارەتی دیکتاتۆر ریڤێرا. بەڵام لە ١٣ی تەمووزی ١٩٣٦ کوژرا، بە هۆیەوە جەنەرال سان جۆرجۆ لە مەراکیشەوە دژی ئیسپانیا هەڵسایەوە و دەستی گرت بەسەر سپتە و ملیلیە، کاتێک بە ڕووداوی فرۆکە دەمرێت جەنەرال فرانسکۆ فرانکۆ جێی دەگرێتەوە. هەر زوو ئەو خەڵکانەی بە دەست حکومەت چەوسابوونەوە، چوونە ریزی ئەم شۆڕشە، بۆیە ڕووخانی حکومەتی پێ کارێکی ئاسان بوو. بەڵام حکومەت پشتی بە هێزێکی زۆری سوپا بەستبوو، دەبووایە جەماوەریش ئەوەی

رقی لە دیکتاتۆریەتی سەربازی و سوپای فرانکۆیە، کە هێزی رۆژئاواشی لەگەڵدا بوو، دەبێت ئەوروپا لە تەک روسیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئەڵمانیا بەرپرس کەن لە درێژەکێشانی ئەو خوێنڕشتنە ناوخۆییەی ساڵەکانی ١٩٣٦ تا ١٩٣٩رویان دا. ئیتاڵیا ١٠ هەزار سەربازی وەکو هاوکاری بە فرانکۆ دا، ئەمەو چونکە حکومەتە نوێکەی بە سەرۆکایەتی (کالبیرۆ)ی سۆشیالیست کاری بۆ ئەوە دەکرد تا بەرپەرچی فرانکۆ بداتەوە لە مەدرید، ئەو حکومەتەی پێکهاتبوو لە سۆشیالیستەکان و کۆمۆنیستەکان، یەکێتی سۆڤیەت بە سەربازی و هەموو شێوەکان پشتگیریی لێ دەکردن. بەم شێوەیە ململانێکە لە ئیسپانیا لە نێوان سۆشیالیستی بۆرجوازیی نەتەوەخواز لە لایەک کۆمۆنیستی جیهانی لە لایەکی تربوو، بەڵام ئایا ئەم ئایدیۆلۆژیانە تاکە هۆکار بوون بۆ ئەوەی هەریەک لە یەکێتی سۆڤیەت و ئیتاڵیا و ئەڵمانیا دەست بخەنە ناو کێشە ناوخۆییەکانی ئیسپانیا، کە ئەم هەموو قوربانی و زیانانەی لێ بکەیتەوە؟ ئامانجی قووڵ لای وڵاتەکان هەبوون، کە بوونە هۆی دەستێوەردانیان، کە ئەمانەن:

## ئیتاڵیا

لە مەزنترین وڵاتی دەستتێوەردەری ئیسپانیا بوو، ژمارەی سەربازەکانی گەیشتبوونە ٤٠ هەزار سەرباز، مەزندەی ئەوە دەکرا لە بەرانبەریدا دوورگەی (بلبیار) لە فرانکۆ وەردەگرێت، کە دەکەوێتە بەرانبەر چیای تاریقی ئینگلیزی یان لە داگیرکاری مەراکشدا بەشداریی پێ دەکات.

## ئەڵمانیا

مەزندەی ئەوەی دەکرد هەندێک (ئیمتیاز)ی لە دەستگرتن بەسەر کانزاکانی پێ بدات، لە هەمان کاتدا مانەوەی فرانکۆ لەسەر دەسەڵات فەرەنسا ناچار دەکات هێزێکی زۆر لە برانس بهێڵێتەوە، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی هێزەکانی فەرەنسی پارچەپارچە بن، بەتایبەت ئەو کاتەی دۆستایەتیەکەی ئەڵمانیی ئیتاڵی روون و ئاشکرابوو، کە لە زیاتر لە پێگەیەک هەڕەشەی لە فەرەنسا دەکرد

## یەکێتی سۆڤیەت

مەبەستی بوو کۆمۆنیست بە ڕووی ستەمی فاشست لە ئەوروپای رۆژئاوا (ئەڵمانیا- ئیتاڵیا - ئیسپانیا -پرتوگال) بەهێز بکات، هاوکاریەکانی بۆ هەردوو لایەن دەنارد، هەموو هەوڵەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ راگرتنی دەستتێوەردانەکان و نێردە مرۆیی و تەقەمەنییەکان بێسوود بوون. کورتی مەوداکە لە ئیتاڵیا و بێسۆزی فەرەنسا بۆ کۆماریخوازەکان و بەریتانیاش بە وەرگرتنی هەڵوێستی بێلایەن، بوونە هۆکار و یارمەتیدەری مانەوەی فرانکۆ و بەهێزبوونی، کە توانی لە ئاداری ١٩٣٩ مەدرید بخاتەوە ژێر دەستی خۆی، بەم شێوەیە کۆتایی بە شەڕی ناوخۆی خوێناوی هات. ئەنجامەکانی دوای جەنگ، کە فرانکۆ لێی دەرچوو، مایەی سەرسوڕمانی وڵاتانی دراوسێ بوو، بەتایبەت (ئەڵمانیا وئیتاڵیا )، سەرەڕای ئەوەی مۆسۆلینی وەکو دیار بوو بە سەرکەوتویی لە جەنگ دەرچوو. بە ڕای ئێمە ئەوەی لەم شەڕە بە سەرکەوتویی دەرچوو تا ڕاددەیەک ئیتاڵیا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بوون، ئەمەش باج و ئەنجامەکانی ئەم جەنگە ناوخۆییەی ئیسپانیایە فرانکۆ حوکمێکی دیکتاتۆریی ئیسپانیای دەکرد. ئەم جۆرە حوکمانە ناکرێت بۆ دیکتاتۆرێکی تر سەردابنوێنێت، هەر کە لە قەیران و تەنگەتاوەکانی ناوخۆ تەواو بوو، ئیتر نۆرەی ئەوەیە کەسایەتیی بەهێزی خۆی بۆ دەر و دراوسێکان بسەلمێنێت، تەنانەت ئەوانەی لە رۆژە رەشەکەش بە هانای هاتن بۆ ئەوەی چاوی ئەوەیان نەبێت لە تۆڵەی ئەم چاکەیە سوودێکیان پێ بگەیەنێت یان تۆڵەیان بۆ دەکاتەوە. ئەمە لە نێوان فرانکۆ و مۆسۆلینی و هیتلەر رویدا، بەتایبەتیش لە نێوان فرانکۆ و مۆسۆلینی، ئەو کاتەی ئیتاڵیا ئەم خۆبەخشینەی پێشکەش دەکرد وەکو ئەوەی لەسەرخاکی ئیتاڵیا خۆیان دەبەخشن، کاتێک ئیتاڵیا و ئیسپانیا گفتوگۆیان لەسەر بەستنی پەیمانێک دەکرد، کە هەردوو لا گەیشتبوونە ئیمزاکردنی تیایدا هیچ تایبەتمەندیەکی جیا بە ئیتاڵیا نادات، هەروەها فرانکۆ رازی نەبوو بچێتە ناو هاوپەیمانێتیی دژایەتی کۆمۆنیستی، ئەم سووربوو لەسەر ئەوەی بێلایەن دەبێت.

٢- هەردوو حکومەتی فەرەنسا و بەریتانیا دانیان بە حکومەتی فرانکۆ نا، لەگەڵ ئەوەی فەرەنسا گرنگیەکی جیای بە سنوورەکانی برانس دابوو، بەڵام فەرەنسییەکان هەمووی لە میانەی جەنگی ناوخۆ نەیاری فرانکۆ نەبوون، لیۆن بلۆم - یاریدەدەری فرانکۆ - ناچار دەبێت لە پێناو سەلامەتی (بەرەی گەلەری) هیچ هەنگاوێک نانێت.

٣- سەرکەوتنی فرانکۆ لسەرکەوتنی فاشیزم و بەزینی دیموکراتی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیتاڵیا لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا لە بەرانبەر هەڵپەرستی هیتلەر بنکەی لەدەست دان -خەریکبوونی ئیتاڵیا بە شەڕەکانی ئیسپانیای بە هەل زانیبوو-، لە سەرحسابی ئیتاڵیا دەسەڵاتی لە بەلکان فراوان کرد. یەکێک لە مێژوونووسان لەسەر ئەم هەڵوێستەی ئەڵمانیا دەڵێت:

ئەمە نە یەکەم جارە و نە دواجاریش دەبێت ئەڵمانیا ئیتاڵیا وەکو نینۆکی پشیلە بۆ بەرژەوندییەکانی خۆی بەکار دەهێنێت.

ئەم شەڕەش بەریتانیا و فەرەنسای لە بەرنامەکانی ئەڵمانیا لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات بێخەبەر کرد لەو هەموو ماوەیە.

٤- جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا دەرفەتێکی بە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا بەخشی کارەکانیان لەگەڵ یەک بگونجێنن بۆ ئامادەباشی بەئەنجامگەیاندنی پەیمانی (میساق)ی سێ قۆڵیی (ئیتاڵیا، ژاپۆن و ئەڵمانیا) لە نۆڤەمبەری ١٩٣٦ دژی کۆمۆنیست.

٥- سەروەری کۆمەڵەی نەتەوەکان لە دەست درا، لەوکاتەوە شتێک نەما ناوی (ئاسایشی بەکۆمەڵ) بێت یان (چارەسەرکردنی کێشەکان بە ڕێگەی ئاشتی)، ئەمە بووە مایەی کردنەوەی دەرگا بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ بەئامانجگەیاندنی داخوازییە نەتەوایەتییەکان. بۆ شکاندنی ئەم ڕەوتە چمبلن هەوڵی کێشانی ئیتاڵیای دا بۆ لای بەریتانیا، کێشەی حەبەشە ئەوکات لە بەرژەوندی ئیتاڵیا تەواو ببوو.

فرانکۆ لە ئیسپانیا سەرکەوتنی وەدەست هێنابوو و هیتلەریش نەمسا و چیکوسلۆڤاکیای داگیر کردبوو، بۆ بەریتانیا لەم حاڵەتە باشترین هەنگاو ئەوەیە لەگەڵ ئیتاڵیا هەوڵێک بدات بەڵکو لە باوەشەکانی هیتلەر دووردەکەوێتەوە..مۆسۆلینی هەستی بەو سوودانە دەکرد ئەگەر لەگەڵ بەریتانیا ڕێک بکەوێت، هەرنەبێت دەستکەوتەکانی پێشتری دەچەسپێن. ڕێککەوتنی جەنتلمان لە نێوان هەردووکیان لە جەنیوەری ١٩٣٧ ئەنجام درا، لەم ڕێککەوتنە هەردووکیان دانیان بە مافە زیندووەکانی یەکتر نا لە دەریای ناوەڕاست، ئەمە سەرەتایەک بوو بۆ ئەوەی بگەنە ڕێککەوتنی فراوانتر سەبارەت پەیوەندییەکانیان لە دەریای ناوەڕاست، لە نیسانی ١٩٣٨ گەیشتنە ڕێککەوتنێک:

١- ئیتاڵیا داوای هیچ فراوانبوونێک لە ئیسپانیا نەکات، لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی بێگانە.
٢- راگرتنی جەنگی پڕوپاگەندە لە نێوان هەردوو لادا.
٣- پاراستنی رەوشی نالەباری کەنالی سوێس.
٤- بەریتانیا دان بە مافەکانی ئیتاڵیا دەنێت لە حەبەشە.

بەڵام پەیوەندییەکانی ئیتاڵیی- ئەڵمانی لەوە بەهێزتربوون تا ئەم پەیماننامەیە لە یەکیان جیا کاتەوە.

## (٤) هیتلەر و دووبارە یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا

## أ/ ئەنشیلۆس {نەمسا و ئەڵمانیا بە یەکەوە پێیان دەوترێت ئەنشیلۆس}

دوای ئەوەی ئەڵمانیا لە ڕووی سەربازیی و نێودەوڵەتی بە هێز بوو، دەستی گرت بەسەر سار و راین، بەلژیک و پۆڵەندا بوونە وڵاتی بێلایەن، بەریتانیاش هیتلەر ئەو ئەرکەی بۆ بەجێ گەیاند، کە ساڵەهای ساڵ بوو بە ئومێد بوو، کە یەکخستنی نەمسا لەگەڵ ئەڵمانیا بوو. ئەمە بێ گوێدانە پەیماننامەی ڤێرسای، کە لەگەڵ فەرەنسا لەسەری پێکهاتبوون سەربەخۆیی نەمسا بپارێزن ئەوکاتەی لە ١١ی تەمووز ئیمزایان کردبوو، بەڵام ئەوەی پاساوەکانی هیتلەری بەهێزکردبوو گەشە کردنی پارتی نازیزم لە ناوەوەی نەمسا و پشتگیریکردنیان بوو بۆ تێڕوانینەکانی هیتلەر.

بۆیە دەبینین کاتێک نازیەکانی نەمسا لە ١٩٣٤ دلفۆسی سەرۆکوەزیرانی نەمسا دەکوژن، هیتلەر لە شوباتی ١٩٣٨ گەفێک بۆ (شۆشنگ)ی سەرۆکوەزیرانی نوێی نەمسا دەنێرێت بۆ ئەوەی پۆستی وەزاریی زیاتر بە نازییەکانی نەمسا بدات، هەر دوای ئەو گەفە گەفێکی تری بۆ دەنێرێت، کە دەبێت حوکم بداتە (سایس ئەنکورات) سەرۆکی نازیی نەمسایی.

سەرۆککۆماری نەمسا (کۆلاس) بەم داوایە رازی نەبوو، بەڵام (ئەنکوارت) توانیی بگات بە پۆستی سەرۆکوەزیران، ئەوسا هیتلەر رایگەیاند نەمسای لەگەڵ ئەڵمانیا یەکخست.

بۆ ئەوەی ڕێگە لەو وڵاتانە بگرێت، کە نیازیانە بە بیانووی پەیماننامەی ڤێرسای دەست لە کارەکان وەردەن و بێنە ناو کێشەکە، ریفراندۆمێکی ڕاگەیاند، کە ئەنجامەکەی ٩٧% لە بەرژەوەندی یەکخستن دابوو.

ئەنجامەکانی ئەم هەنگاوە جەربەزەییە:

١- هیتلەر سەلماندی، کە رای گشتیی جیهانیی هەڵوەشاوەیە و هیچ بەهایەکی نییە.

٢- پەیماننامەی ڤێرسای رووی پێشەوەی وڵاتە سەرکەوتوەکان بوو لە جەنگی یەکەمی جیهانیی، بەم هەنگاوە کەوتە بەر پێی وڵاتە بەزیو و سەرکەوتووەکان بەیەکەوە.

٣- کۆمەڵەی نەتەوەکان دوای ئەوەی دوو لە ئەندامانی سەربەخۆیی خۆیان لەدەست دا، هیچ بەهایەکی نەما.

٤- ئیتاڵیا ئەم یەکخستنە نوێیەی ئەڵمانیا و نەمسای پێ خۆش نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش قبووڵی کرد. هیتلەر هەستی بەوە دەکرد ئەم یەکخستنە لەسەر دڵی دۆتچێ چەند گرانە، بەڵام گفتی دا دەبێت لە ئەنجامە خۆشەکەی ئەم ئەنشیلۆسە تۆڵە بۆ ئارامی و خۆراگری مۆسۆلینی بکاتەوە، دەبێت رەچاوی بەرژەوەندییەکانی بکا لە داهاتوو. بەڵام ئاشکرا بوو، کە دوای یەکخستنەوەی ئەم دوو دەوڵەتە تەوەری هێزەکان کەوتنە دەست ئەم دوو دەوڵەتە، ئیتاڵیا لە ساڵی ١٩٣٨ هەر نەبێت لە ئاست ئەڵمانیا دابوو، بەڵام دوای یەکخستنەکە مۆسۆلینی دەبووایە بە ئاراستەی سیاسەتەکانی هیتلەر بڕوا.

٥- جیاکەرەوەکانی ستراتیجی، کە ئەڵمانیا لە ئەنجامی ئەم یەکخستنە وەدەستی کەوت، گەلێک مەزن بوون، بۆ نموونە: بە یەکجار ڕێژەی شەش ملیۆن و نیو ئەڵمانیی سۆزداری بۆ زیاد بوو، ئەڵمانیا ڕاستەوخۆ بە دوو لە مەزنترین وڵاتانی بەلکان بەسترایەوە (یۆگسلافیا، هەنگاریا) ئەمە وێڕای ئاسانبوونی پەیوەندی لەگەڵ هاوپەیمانەکەی (ئیتاڵیا).

٦- یەکخستنی ئەڵمانیا و نەمسا ترسەکانی یەکێتی سۆڤیەتیان وروژاندن، پێشنیاری کرد تا (ئاشتی بەکۆمەڵ رزگار بکەین) بەڵام بەریتانیا رەتی کردەوە بەهای بە تیۆریی مسۆگەرکردنی بەکۆمەڵ دانەنا و لەژێرەوە وای نیشاندا، کە لاریی لە یەکخستنی ئەڵمانیا و نەمسا نییە.. یەکێتی سۆڤیەت بەریتانیا و وڵاتە سەرمایەدارەکانی بەوە

تاوانبار کردن، کە چاوپۆشی لە دەستگرتن بەسەر نەمسا دەکەن بۆ ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەڵمانیا بەهێز بێت و هێزێکی ئەڵمانیای نازی ڕوەو سۆڤیەت هێرش بەرێت. مێژوونووسە سۆڤیەتیەکان ویفاقی لەسەر ئەوە دەکەن، کە لە ژێرەوە ڕێککەوتن لە نێوان بەرلین و واشنتۆن ئەنجام دراوە لەسەر دابەشکردنی بازاڕەکانی جیهان لە بەرانبەر ئەوەی هیتلەر کۆمۆنیستەکانی ڕوسیا لەناو بەرێت.

٧- چیکوسلۆڤاکیا، کە ئامانجی داهاتوی یەکێتی ئەڵمانیا بوو، دەورەی بە لەشکری ئەڵمانی گیرابوو، بۆ ئەمە جەنەرال یۆدلی نازی دەڵێت: خاکەکانی چیکوسلۆڤاکیا تا ئەم دواییەی مێژوو پاڵپێوەنەری هاتنەناوەوەی خاکەکانی ئەڵمانیا بوو، پشتێنێکی تەسکیش بوو ڕوەو فەرەنسا دەکرا، تا هەردەم ببێتە بنکەیەکی ئاسمانیی بۆ هێزە هاوپەیمانەکان بەتایبەت ڕوسیا. ئێستاش چیکوسلۆڤاکیا بە دوو لا دەوری دراوە، ڕەوشی ستراتیجیی بە شێوەیەک خراپە، کە لە هەر هێرشێکی ئێمە بکرێتە سەری، دەربازبوونی مەحاڵە و هاوکارییە ئاسمانییەکانی ڕۆژئاواش بە هانای نایەن.

ئەم کێشە نێودەوڵەتیانە بوونە هۆی نەمانی بڕوا و متمانە لەناو وڵاتە مەزنەکان، لێرە تیۆریی (دیبلۆماسیەتی پیلاندار) بەسەر تیۆریی (مسۆگەرکردنی بەکۆمەڵ)دا زاڵ بوو.

ئەڵمانیا، بەریتانیا، ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤیەت زیاتر لەو دەوڵەتانە بوون، کە بەسەر ئەم دیبلۆماسیەتە ئاڵۆزەدا دابەش ببوون، کە ساڵەکانی بەر لە جەنگی جیهانی دووەمیان گۆڕی بوو، وەکو ئەوەی بڵێین ببووە (ئاژاوەی نێودەوڵەتی). (میساقەکان) ڕیزیان لێ نەدەگیرا، پەیماننامەکان تەنیا بڕین و پارچەکردنی کاغەز بوون، سەربەخۆیی وڵاتە بچووکەکان دەکرا لەسەر مێزی چاوبرسییە ئیمپریالیزمیە نەتەوایەتییەکان لە ئان و ساتێکدا تیا بچێت. ئەوکاتە ئەم ئاژاوە نێودەوڵەتییە زیاد دەکات، کە هیتلەر هەنگاوە خەتەرناکەکەی تر دەنێت، ئەویش یەکخستنەوەی ئەڵمانییەکانی سوودێت و پۆڵەند لەگەڵ ئەڵمانیایە.

## ب/ لەخۆگرتنی چیکوسلۆڤاکیا

چیکوسلۆڤاکیا لە مەزنترین دەوڵەتی ئەوروپای رۆژهەڵات بوو، کە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی دەرکەوت. سەرکردەکانی دونیا پەرۆشی چارەنووسی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا و هەنگاریا نەبوون، کە بە هۆی فرەنەتەوەیی و رەگەزیی [٥٧] هەڵوەشایەوە و ئەم هەموو دەوڵەتۆکانەی هەمە جۆری رەگەزی گەمارۆدراوی بێ دەروازە لەسەر دەریا لێ وەپاش کەوتن، بەڵام توانی ببێتە خاوەنی پیشەسازییەکی پێشکەوتوی بە پەیوەندیی بازرگانی لەگەڵ وڵاتە ئەوروپییەکان و یەکێتی سۆڤیەت، بەتایبەتی لە رووی ئامێری ئۆتۆمبیلی. ستالین خاوەنی دیبلۆماسیەتێک بوو گرنگی چیکسلۆڤاکیای دەزانی نەک تەنیا لە رووی پەیوەندییەکانی ئابووریی، بەڵکو بە هۆی هەڵکەوتنی لە هێلی پێشەوەی بەرگریکردن لە یەکێتی سۆڤیەت، پۆڵەنداش بۆ ئەم هێلە دووەم و کۆتاییە.

بە هۆی سروشتی چیکوسلۆڤاکیا لە فرەرەگەز و پێکهاتە، تایبەتمەندیەکی بە شێوازی بەرێوەبردن پێدرا، کە هەر پێکهاتەو خۆی ببات بەرێوە. ئەڵمانییەکانی سوودێت وەکو کوتلەیەک (فراکسیۆن)ی نەتەوایەتی خۆشیان دەهات لە یەکخستنەوەی نەمسا بە ئەڵمانیا، ئەڵمانیا دەستی یارمەتیی بۆ ئەڵمانییەکانی سوودێت درێژ کرد.

هیتلەر ئاشکرای کرد، کە یەکخستنی سوودێت بە ئەڵمانیاوە بە پێویستی دەزانێت، بۆ ئەم کارەی تەنیا پشتی بە ئامانجە نەتەوایەتیەکانی ئەڵمانی نەدەبەست، بەڵکو دەیوت بە دەستگرتن بەسەر سوودێت گورزێکی بەهێزلە کۆمۆنیست دەوەشێنێت. چونکە دۆستایەتی سەرۆکی چیک (بینیش) و ستالین خۆش بوو، گەشەکردنی بزووتنەوەی ئەڵمانیی نازی لە ناوەوەی چیکوسلۆڤاکیا بە سەرۆکایەتی کۆنراد هنلن سەرۆکی پارتی سوودێتی ئەڵمانی دەرفەتێک بوو بۆ هیتلەر تا بەرگری لە ئەڵمانییەکانی سوودێت بکات بۆ ئەوەی وا لێکنەدرێتەوە، کە لەم هەنگاوە دوژمنکاریەیدا مەبەستی چیکوسلۆڤاکیایە، هیتلەر کاری بۆ هەردوو ئەرک دەکرد، بە شێوەیەک ئەڵمانییەکانی سوودێت لەگەڵ ئەڵمانیا یەکخات، کە هەموو چیکوسلۆڤاکیا یەکخات (داگیری کا)، وڵاتە ئەوروپییەکان وا تێگەیشتبوون، کە تەنیا سوودێتی ئامانجە.

چیکوسلۆڤاکیا لەگەڵ فەرەنسا و یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٢٤ەوە هاوپەیمان بوو.

---

[٥٧] چیکوسلۆڤاکیا لەم نەتەوانە پێک هاتبوو چیک، سلۆڤاک، رۆتینییەکان، هەنگارییەکان، لەتەک نەڵمانییە سوودێتەکان و نەڵمانییەکانی بەسەر ناوەوەی چیکوسلۆڤاکیادا دابەش بوو، هتلەر خۆی وتبووی، کە دەوڵەتێکی دروست کراوە.

یەکێک لەوانەی حکومەتی پراگ گرەوی لەسەر کردبوو ئەوەبوو، کە هیتلەر ناتوانێت ئەم سەرەڕۆییە بکات لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت و فەرەنسا بکەوێتە شەڕێکی مەزن لە پێناو سوودێت. بەڵام لێرە پرسیارێکی تر دێتە پێش، کە خەتەرناکیی لەوانی تر کەمتر نییە: فەرەنسا و یەکێتی سۆڤیەت ئامادە بوون لە پێناو سوودێت لەگەڵ ئەڵمانیا بکەونە جەنگەوە؟ لە ڕاستیدا وڵاتە مەزنەکان زۆرجار لە پێناو گەیشتن بە چارەسەر چاویان لە کەم پۆشیوە، دواتر هەڵکەوتنی جوگرافیای چیکوسلۆڤاکیا ،کە ناکرێ هاوکاری سوپای بۆ بنێردرێت تەنیا لە ڕێگەی وڵاتێکی تردا نەبێت یان پۆلۆنیا یان هەنگاریا یان یۆگسلافیا، ئەم وڵاتانەش چاویان بڕیبووە چیکوسلۆڤاکیا. ئەمە بە ئاسانی قبووڵ نەدەکرا ڕێگە بەم وڵاتانە بدرێت بەناو خاکیاندا ڕەت ببن و بەهۆیەوە ئەوانیش لەگەڵ ئەڵمانیا بکەونە کێشە. هاوپەیمانێتیی فەرەنسا و سۆڤیەت و چیکوسلۆڤاکیا بەهێزبوو، بەڵام لەسەر کاغەز و بۆ جێبەجێکردن لاواز بوو، مەبەستیان ئەوەبوو سەربەخۆیی چیکوسلۆڤاکیا لە ڕووی ئەڵمانیا بچەسپێنن، بەڵام گۆڕینی ئەم هاوپەیمانێتییە بۆ بەرنامەی کارپێکردن ئەمە فەرمانێکی ئاڵۆزە. بەریتانیا لە یەکلاکردنەوەی کێشەی چیکوسلۆڤاکیا ڕۆڵی بینی، نەک یەکێتی سۆڤیەت یان فەرەنسا، ئەمیش لەبەر ئەم هۆیانە:

١- هەر دەستتێوەردانێکی یەکێتی سۆڤیەتی یان فەرنسی ئەوە دەگەیەنێ بچنە پاڵ هاوپەیمانەکەیان، بەڵام بەریتانیا بەم هاوپەیمانە پەیوەست نەبوو.

٢- دەستێوەردانی بەریتانیا لە کێشەکە - بە بۆچوونی بەریتانیا - لەسەر بنەمای ڕاگرتنی پارسەنگی نێودەوڵەتی بوو، ئەم پارسەنگە نێودەوڵەتیەش لاستیکییە و دەکرێت تا دابەشکردنی دەوڵەتێک لە دەوڵەتەکان لەیەک بکێشرێت.

٣- بۆچوونە سیاسیەکانی لە فەرمانگە بەریتانییەکان دەردەچوون، دەیان وت کاتێک بەریتانیا ناوبژیوانی کێشەیەک دەکات ڕەچاوی بەرژەوەندییە نەتەوایەتیەکانی ئەڵمانیا دەکات.

٤- حکومەتی پارێزگاران بە سەرۆکایەتی نیفیل چمبرلن دوژمندارێتیەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەڵمانییەکان نەبوو، ئەمان کۆمۆنیستەکانیان لە نازیەکان بە خەتەرناکتر دەبینی. ڕێککەوتنە دەریایەکەی ئەڵمانیا و بەریتانیا لە ١٩٣٥ بەریتانیای دڵنیا دەکردەوە.



نیڤیل چمبرلن

نیفیل چمبرلن خۆی و هیتلەر رێککەوتن، بڕوای وابوو گەیشتن بە رێککەوتن لەسەر کێشەی نێوان چیکوسلۆڤاکیا و ئەڵمانیا پێویست بەوە ناکات لەگەڵ لایەنی پەیوەندیدار (ئەڵمانیا، چیکوسلۆڤاکیا) دابنیشن. ئەم بۆچوونە یەکێک بوو لەوەی سیاسەتمەداران رەخنەیان لێگرت، بەڵام بە بڕوای ئێمە ئەمە یەکێکە لە دیبلۆماسیەتی پیلاندار، کە سیاسەتمەدارانی بەریتانیا لە مێژە پیادەی دەکەن. لە رووێکی ترەوە بەریتانییەکان بە چاوێکی نزمەوە سەیری گەلی ئەوروپای رۆژهەلاتیان دەکرد، هیتلەر زانای ئەم بوارە بوو، کە بە تیۆریی زاڵبوونی رەگەزی ئاریی کار دەکرد، ئەوەبوو بەریتانیا زۆر زیرەکانە هەمان تیۆریی لەگەڵ خۆیان بەکار هێنایەوە. چیکوسلۆڤاکیا یەکێک بوو لە قوربانیانی خوانی ئاشتەوایی بەریتانیی- ئەڵمانی بە هۆی رق و کینی ئەڵمانییە نازییەکان و بەریتانیەکان لە گەلانی سلاڤی هەریەک بە رێگەی تایبەتی خۆیەوە. ئەمە وێنەی نێودەوڵەتی بوو، لەتەک ئەمەش هەوڵە نەزۆکەکانی فەرەنسا و بەریتانیا بۆ رێگە گرتن لە نانەوەی ئاژاوە و پشێوی لەلایەن کرێگرتانی نازیی ئەڵمانی و فاشست بۆ ئەوەی ئیمپراتۆریەتەکەیان لەدەست نەچێت، بە پێدانی دەرفەتی زاڵبوونی ئابووریی ئەڵمانیی ژاپۆنی بە هەستکردن بە دابەزینی ئیمپریالیستی بەریتانیی فەرەنسی. هیتلەر ئەمەی

دەزانی، کە فەرەنسا و بەریتانیا نابێت لەسەر موستەعمەرەکانیان بە ئارامی خەویان لێ بکەوێت، دەبێت باجی ئەم ئارامییە بدەن، باجەکەشی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتە دەبێت و بە هیتلەر بدرێت، بەتایبەت لە چارەسەری کێشەی چیکوسلۆڤاکیا رۆڵی تێوەگلانی بەریتانیا لەم پیلانە ئاشکرا بوو چۆن بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی و ئەڵمانیا یەکێتی سۆڤیەتی پەراوێز کرد. بە بڕوای هیتلەر ریزی هاوپەیمانانی لەت کرد، کە لەمەودوا بەناوی هاوپەیمان ناتوانن کۆببنەوە، هەروەها بە دیدی خۆی دەتوانێ گەمە بە بەریتانیا و فەرەنسا بکات و یەکێتی سۆڤیەت دوور بووەستێ وەکو ئەوەی ئەم لە کێشەکانی ئەوروپا بەرپرسیار نییە. بەڵام مێژوونووسەکانی یەکێتی سۆڤیەت بڕوایان وابوو پیلانێکی مەزن دژی سۆڤیەت هەڵدەچنرێت بۆ ئەوەی رێگەی لێ بگرن لە هەر جووڵانەوەیەک، کە هاوکار بێت بۆ کێشەی چیک. لەو کاتانەدا بوو ژاپۆن هێرشی کردە سەر خاکەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە نزیک دەریاچەی هاسان لە هاوینی ١٩٣٨، بەم شێوەیە یەکێتی سۆڤیەت لە توانا کەوت تا چیکوسلۆڤاکیا لەم کێشەیە رزگار بکات.

کاتێک نیفل چمبرلن لە ١٥ی سێپتەمبەری ١٩٣٨ لەگەڵ هیتلەر کۆبووەوە لە (برخستجاد) وێنەیەکی نیمچە روونی لابوو لەو داوایانەی دوایی، ئامادەبوو داواکاریەکانی ئەڵمانیا جێبەجێ باکات لە وەدەستهێنانی ئەڵمانییەکانی سوودێت و هەموو ئەو ناوچانەی ئەڵمانییەکانی لێ جێنشینە. بە مەرجی ئەوەی گرەنتیەکی نێودەوڵەتی بە چیکوسلۆڤاکیا بدات، کە سنووره نوێکانی پارێزراو دەبن.

واهات هەردووکیان -هیتلەر و چمبرلن- کەوتنە ئەو رێککەوتنە و لەسەر ئەو بنەمایانە، دواتر ئاشتی هەرەشەی لەسەر بوو نەک لەلایەن ئەڵمانیا، بەڵکو لەلایەن چیکوسلۆڤاکیاوە، ئەوکاتەی ئەم رێککەوتنەی لەلایەن وڵاتانی دیموکراتیەوە بۆ ئامادە دەکرێت، ئەو رەتی دەکاتەوە. لەم فشارەی فەرەنسا (هاوپەیمانەکەی) بەشداریی کرد وەکو بەرگریکارێک لەو وڵاتانەی تازە بە پێی پەیماننامەی ڤێرسای دروست بوونە، بەڵام دواتر بەریتانیا و فەرەنسا ئەو رێککەتنەی باسی لێوەکرا بەسەر چیکوسلۆڤاکیایاندا سەپاند. لە راستیشدا قبوولکردنی ئەم رێککەوتنە مانای ئەوەیە هەموو ئەو دەوڵەتانەی پێکهاتەیان لە فرەنەتەوەیە داوا دەکەن بخرێنەوە سەر دەوڵەتی دایک، بەڵام فشارەکانی بەریتانی و فەرەنسی توند بوون، بینش سەرۆکی کۆماری چیکوسلۆڤاکیا دەبینێت، کە باری

دۆستەکان لە هی دوژمنەکان بەسەریەوە قورسترە، ناچار دەبێت قبوولّی بکات. چمبرلن شانازیی بەو ڕێککەوتنە دەکرد، گوایە (ئاشتیی رزگارکردووە) چووە جۆدس بێرگ لەسەر راین بۆ دیدەنی هیتلەر، بەلاّم بە سەرسوڕمانەوە بینیی گۆڕان لە هەڵوێستی هیتلەر رویداوە. هیتلەر داواکاریەکی پێدا و داوای گرتنەوەی خێرای سوودیتی کرد لەگەڵ ئەنجامدانی ریفراندۆم لە بەشەکانی تری، کە جێی کێشەن لەسەر ناسنامەی یان ئەڵمانین یان چیکی. کاغەزەکان لە دەستی چمبرلن کەوتن، هەستی بەو سوکایەتیە کرد، کە هیتلەر بە مەزنی بەریتانیا و فەرەنسای دەکات. کارەکان چوونە دۆخێکی ترەوە و بیری لە گێڕانەوەی سەروەریەکانی بەریتانی کرد، ئەمەش بە کاری ئامادەباشی سەربازی نەبێ ناکرێت. دەستی بە ئەنجامدانی مانۆڕی سەربازی کرد دژی ئەڵمانیا و کەشتیگەلی بەریتانیی لە ئامادەباشی دان، لێرە چمبرلن بیری لە یەکێتی سۆڤیەت کردەوە وەکو هێزێکی زەبەلاح، کە لە توانایدا هەیە هەڕەشە لە ئەڵمانیا بکات لەو پەڕی رۆژهەڵاتەوە، پێشنیاری کرد گفتوگۆیەک لەگەڵ یەک بکەن. ئینگلیز و فەرەنسییەکان راکانیان ئاڵوگۆڕ کردن، چیوکسلۆڤاکیا هەندێک لە هێزەکانی ویفاقردنەوە لەگەڵ ئامادەباشیی سەربازی، بەلاّم لەمیانەی ئەمانە بێبڕوایی بەسەر وتووێژەکاندا زاڵ بوو، لەولاشەوە هیتلەر هەوڵی ئەوەی دەدا تا گەمە بە هەموویان بکات، وێنەکان بەگشتی وابەدیار دەکران، کە دونیا لەسەر لێواری جەنگە. خەڵک رقیان لەم وشەیە دەبووەوە، حەزیان لە دۆزینەوەی رێگەچارەیەک دەکرد، بەتایبەت کاتێک هیتلەر بە بلیمەتی رۆڵی لەناو دۆخەکان دەگێڕا و ئەوکاتەی چمبرلن وتی: دوایین داخوازیەکانی هیتلەر ئەوانەن، کە دوایین داواکاریی ئەوروپان. ئەگەر ئەم جارە داواکاریەکانی ئەڵمانیا جێبەجێ کران، ئاشتیەکی درێژخایەن دەبێت. دەرگاکانی ناوبژیوانان و هەوڵدەرانی رێگەچارە کراوە بوون، بانگخوازیەکەی رۆزفلت - لە رێگەی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی ئاشتی رزگارکەن - ئومێدێک بوون وڵاتانی رۆژئاوا پێیەوە پەیوەست بوون، چمبرلن وە الیفاکس لەلایەن بەریتانیا و دولادبیە و بۆنیە لەلایەن فەرەنسا و هیتلەر و رۆبنترب لەلایەن ئەڵمانیا و مۆسۆلینی و چیانۆ لەلایەن ئیتاڵیا لە میونخ لە ٢٩-٣٠ی سێپتەمبەری ١٩٣٨ کۆبوونەوە، یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەم کۆنگرەیە داوەت نەکرا. بۆیە بەستنی ئەم کۆنگرەیەی بە زوڵملێکردن دەزانی و لە هەمان کاتدا وەکو پیلانێک وابوو بۆ ئەو، بەتایبەت باسکردن لەسەر ئەڵمانیا تێڕوانینی

لەخۆگرتنی کرواتیای هەبوو، ئەمەش مەترسیەکانی یەکێتی سۆڤیەت دەوروژێنێت و زیاتر لە بەڵگەیەکی بەدەستەوەیە، کە دیموکراتیەکانی ئیمپریالیزم ئەم دڵنەوایە نابەخشێت، کە مەترسیەکانی ئەڵمانیا بڕەوێنێتەوە. لەم کۆنگرەیە بڕیار درا چیکسلۆڤاکیا وردە وردە لەناوبەرن و ئەم یەکلاکردنەوەیەش بەسەر وڵاتەکان بسەپێنن. کاتێک ئەم تاوانە مەزنە خرایە بەردەم پەرلەمانی بەریتانیا بە زۆرینەی دەنگ ڕەزامەندیان لەسەر دا، ڕۆژنامەکان ڕێکلامەیان بۆ ئاشتیەکەی بەریتانیا دەکرد و پێیاندا هەڵدەگوت، هەروەها ئەنجومەنی نیشتمانیی فەرەنسیش ڕەزامەندیی لەسەر ئەم ڕێککەوتنە دا. هیتلەر دەستی بەسەر چیکوسلۆڤاکیا داگرت، یەکێتی سۆڤیەت لە توانایدا نەبوو هیچی بۆ بکات، بەتایبەت کە سنووریان بەسەر یەکەوە نەبوو و دەبووایە بەناو خاکی وڵاتاندا ڕەت بکات، ئەم وڵاتانەی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش متمانەیان بە یەکێتی سۆڤیەت نەبوو دیسان بە هۆی ترسی ئەم وڵاتانە لە هیتلەر. هۆکارێکی تریش لاوازی سوپای سۆڤیەتی و بێتوانایی لە سوپایەکی زۆری لەوبەری ڕۆژهەڵات گیرساند بووەوە بە هۆی دوژمنکاریەکەی ژاپۆن بۆ سەر چین و هێرشەکانی ژاپۆن بۆ سەر خاکەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە ناوچەکانی مەنگۆلیاوە. ئەنجامەکانی ئەم فراوانکاریە نوێیە چی بوون ؟

١- ترسەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات لە جووڵانەکانی دژیان ئاشکرا بوون، کە وڵاتە دیموکراتییە ئەورووپییەکان لاریان نییە ئەگەر سەودا بە وڵاتێک بکەن لە پێناو پاراستنی دەستکەوتی ئیمپریالیزمیان. لە ئاداری ١٩٣٩ ڕۆمانیا پەیمانێکی لەگەڵ ئەڵمانیا بەست، یۆگسلافیاش دانی بە یەکخستنی ئەلبانیا بە ئیتاڵیا نا، لە ١٩٣٧-١٩٣٩ بەریتانیا هەوڵی دا ئیتاڵیا لە تەوەرەکە بێنێتەدەر، لە نیسانی ١٩٣٨ پەیمانێکی لەگەڵ بەست.

٢- سامی بەریتانیا لە پێش ئەڵمانیا شکا، تواناکانی زیادیان کرد بۆ ئەنجامدانی بلیمەتی سەربازی، داوای (بدنزج)ی ئەڵمانی و(پیل)ی کردنەوە، ئەم جارەیان چمبرلن ڕووی لە وەڵامی بەکارهێنانی توندوتیژی کرد بۆ داخوازییە نوێکانی ئەڵمانی. ئەنجومەنی گشتیی بەریتانی بڕیاری بانگهێشتی سەربازیی بەزۆری ڕاگەیاند لە کاتی ئاشتی -ئەمە بۆ یەکەم جارە لە مێژووی بەریتانی -، هیتلەر دیکتاتۆرێکی پێداگر بوو زۆر بە توندتر وەڵامی دایەوە:

پووچەڵکردنەوەی پەیمانی دەستدرێژی نەکردنە سەر یەکتر، کە لە نێوان ئەڵمانیا و پۆڵەندا ئیمزاکراوە لە ١٩٣٤، ئەمە بووە هۆی ئەوەی جەخت لەسەر ئامانجە داهاتوەکەی بکات، ئەویش پۆلۆنیا بوو، ئەمە ئەوکاتە دەکرێت یان پەیمانێک لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت ببەستێت یان لەگەڵی بکەوێتە جەنگ، هیتلەر لەوە دەترسا لە دوو لاوە جەنگ بکات، بۆیە هەوڵی لەیەکتیگەیشتنی دا. ئەمە چۆن هیتلەر دەتوانێ بەسەر کین و بووغزیدا زاڵ بێ و پەیمانێکی لەگەڵ ئیمزا بکا؟ لە ١٣ی ئابی ١٩٣٩ (میساق)ێک لە نێوان ئەڵمانیا و یەکێتی سۆڤیەت ئیمزا کرا.

## ج/ قەیرانی ئەڵمانیی- پۆلۆنی

کێشەی پۆلۆنیا - وەکو کێشەی چیک - پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی زیاتر کاریگەریان بەسەرەوە بوو لەوەی کێشەیەک بێت لە نێوان دوو وڵاتی دراوسێ، جێبەجێکردنی داواکارییە نەتەوایەتیەکەی هیتلەر لە (دانتزج)ی ئەڵمانی و لە دۆزینەوەی ڕێگەیەکی ڕاستەوخۆ بە ڕێڕەوەکانی پۆلۆنی دا، کە بروسیای ڕۆژهەڵات و ئەڵمانیا بە یەک ببەستێتەوە، تەنیا ڕەزامەندی پۆلۆنیای گەرەک نەبوو، بەڵکو دەبوو ڕەزامەندی وڵاتە مەزنەکانیشی لەسەر بووایە، بە تایبەت ئەم جارەیان لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت، چونکە سنووری هاوبەشی لەگەڵ پۆلۆنیا و بروسیای ڕۆژهەڵات هەیە. گوفتارەکان لەسەر ئەوە دووبارە دەبوونەوە، کە هیتلەر (دانزیج) داوا دەکات و دەبێت بە ئەنجام بگات، تەنانەت ئەگەر لە ڕێگەی قەرەبووکردنەوەی پۆلۆنیا بێت لە ئۆکرانیای بەپیت. لەم هەموو کێشمە کێشمە بۆ یەکێتی سۆڤیەت دەردەکەوێت، کە:

١- ئەو تیۆرەی دەڵێت "ئەڵمانیا ڕووەو ڕۆژهەڵات هان دەدرێت" ڕاستە و لە ڕێگایە، ڕووبەڕووبوونەوەی داهاتوش لە نێوان ئەڵمانیا و یەکێتی سۆڤیەت و پۆلۆنیا دەبێت.

٢- سەرەڕای ئەوەی هیتلەر گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی، کە دەتوانێت یەکێتی سۆڤیەت لەناوبەرێت، بەڵام ئەمەی بۆ ناچێتە سەر تا نەبێتە هێزێکی مەزنی بەتوانا و بە سەرکەوتوویی لە جەنگ دەرچێت دژی یەکێتی سۆڤیەت و بەسەر ئیمپریالیەتی ڕۆژئاواش زاڵ بێت.

٣- نازییەکان و ئیمپریالیستی فەرەنسی و بەریتانی گەمە لەگەڵ یەک دەکەن، ئەگەر هیتلەر بتوانێت یەکێتی سۆڤیەت بخاتە ناو ئەو گەمە خەتەرە، دەتوانێت دەستێک لە پۆلۆنیا بووەشێنێ بێ ئەوەی هیچ یەک لەم ولاتانە بەدەنگ بێن. ئەگەر یەکێتی سۆڤیەت بەشداریکردنی لەم گەمەی رەت کردەوە، ئەوا دەستی یەکەم ئەڵمانیا لە یەکێتی سۆڤیەت دەوەشێنێت لە کاتێکدا ئیمپریالیزمی ژاپۆنی هەڕەشە لە خاکەکانی یەکێتی سۆڤیەت دەکات لە رووی مەنگۆلیا و دەریاچەی بیکال. دیارە یەکێتی سۆڤیەت ناتوانێت لە دوو بەرە جەنگ بکات، بۆیە دەبێت لەسەر یەک لەم هێلانە بڕوا:

ا/ بەستنی پەیمانێک لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا دژی هەر دوژمنکاریەکی ئەڵمانی بۆ سەر پۆلۆنیا یان یەکێتی سۆڤیەت.

ب/ یان لەگەڵ هیتلەر بگەنە لەیەکتێگەیشتنێک.

دوای ئەوەی هیتلەر داوای (بدانزج)ی کرد، ستالین پێشنیاری بەستنی هاوپەیمانێتیەکی بەرگریی لە فەرەنسا و بەریتانیا کرد دژی ئەڵمانیا، بەڵام بەریتانیا و دەوڵەتە ئەوروپییەکان زیاتر لە تەگەرەیەکیان خستە بەردەم ئەم پەیمانە، لەگەڵ ئەوەی بۆچوونی سیاسەتمەداری بەریتانی چرچل ئەم هاوپەیمانیەی بە کلیلی ئاشتی دەزانی بۆ بەریتانیا. تەگەرەکانیش بریتی بوون لە:

١- دلادی بیە - سەرۆکوەزیارنی فەرەنسا - زۆر رقی لە کۆمۆنیستە فەرەنسییەکان و کۆمۆنیستە جیهانیەکان دەبووەوە، دوای کارەساتی چیکوسلۆڤاکیا مەبەستی بوو لەگەڵ ئەڵمانیا بگەنە لەیەکتێگەیشتنێک.

٢- کۆلۆنێل (بیک) - وەزیری دەرەوەی پۆلۆنیا - مەبەستی نەبوو لەگەڵ ستالین هاوکاری بکات -بە دیدی ئەم - چونکە کۆمۆنیزم لە نازیزم خەتەرناکترە.

٣- بەریتانیا - لەسەر دەستی چمبرلن - لە نێوان ئۆردوگای ئەڵمانی و یەکێتی سۆڤیەتی ئەمبەر و ئەوبەری دەکرد، هانی ئەمی دەدا لەگەڵی رێککەوێت دژی ئەوی تر. ئەمە بووە مایەی ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت بڕوای پێ نەما، ستالین بڕیاریدا هاوکاری ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو لایەنە بەهێزە بکات، کە دەتوانێت ئەم مەترسییانە بجوولێنێت یان بیان وەستێنێت، ئەوەبوو ئیمپریالیستی رۆژئاوا لەسەر شێوازی خۆی لە میونخ دانیشتن. دەبووایە یەکێتی سۆڤیەت بەختی خۆی تاقی کاتەوە دوور لە پیلانەکانی چمبرلن و

هاندانەکانی فەرەنسا، بە رێککەوتنی ستالین لەگەڵ هیتلەر دەتوانێت هێرشەکانی ژاپۆنی لە خاکەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی دوور بووەستێنێت.

لەمە بۆمان دەردەکەوێت، کە دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت بێئومێد دەبێت لە دروستکردنی هاوپەیمانێتییەکی ئەورووپی دژی ئەڵمانیا لە شێوەی هاوپەیمانێتییەکەی جەنگی یەکەمی جیهانیی، هەوڵی دا خۆی بپارێزێت لە دەست لێدانە قورسەکەی ئەڵمانی - ژاپۆنی، کە دواتر فەرمانگە سەرمایەدارە ئیمپریالیستەکان و واشنتۆن و لەندەن و پاریس و برۆکسل بەر لە بەرلین و رۆما و تۆکیۆ چەپڵەی بۆ لێدەدەن.

دانوستانەکانی یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانی لە تەمووزی ١٩٣٩ بەردەوام بوون، (میساق)ی دەستدرێژی نەکردنە سەر یەک لە نێوان هەردوو لا لە ١٣ی ئابی ١٩٣٩ ئیمزا کرا، کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

١- رێگەنەدان بە بەکارهێنانی هێز.

٢- ئەگەر هەر لایەک رووبەرووی جەنگ بووەوە، لایەنی دووەم لەم جەنگە بێلایەن دەوەستێت.

مێژوونووسانی رۆژئاوا وادەبینن ئەم (میساقە)ی ئەڵمانی - سۆڤیەتی لەیەکتێگەیشتنێکە لەسەر دابەشکردنی ئەورووپای رۆژهەڵات لە نێوان خۆیاندا، بەڵام مێژوونووسانی سۆڤیەت ئەم (میساق)یان وا لێک دەدایەوە، کە بۆ رزگارکردنی یەکێتی سۆڤیەتە لە کارەساتی هێرشەکانی ژاپۆنی لە رۆژهەڵاتی دوور و ئەڵمانی لە بروسیا و پۆڵۆنیا و ئینگلیزیی فەرەنسی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بەم شێوەیە ئەم (میساقە) رێگەی لە رووداني ئەم کارەساتە گرت، هەروەها ئەو بەرەی دژی یەکێتی سۆڤیەت لە میونخ پێکهات ئەویشی پووچەڵ کردەوە، ئەمەش لە بەرژەوەندی ئاشتی دایە. لە بنەڕەتدا مۆسکۆ هەردەم دووپاتی دەکردەوە، کە هیتلەر لەسەر ئەم (میساق)ە بەردەوام نابێت، لە چاوەڕوانی رووبەڕووبوونەوە دابوو.

هەروەها مێژوونووسانی سۆڤیەت جەخت لەسەر ئەنجامێکی گرنگ دەکەنەوە، کە مێژوونووسە رۆژئاواییەکان پشتگوێیان خستووە، ئەویش ئەو قەیرانەی دوای ئیمزاکردنی (میساق)ەکە لە نێوان بەرلین و تۆکیۆ دروست بوو. حکومەتی ژاپۆن نارەزایی دەربڕی لە ئیمزاکردنی ئەو (میساقە) و بەم شێوەیەی رای خۆی لەسەر دەربڕی و دەڵێت: (دەق و

ناوەڕۆکی ناویفاقن لەگەڵ میساقی قەلاچۆکردنی کۆمنترن) ئەمە بووە هۆی دەستلەکارکێشانەوەی وەزارەتی (هیرا نۆما) و رێککەوتن لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت و مەنگۆلیا و ژاپۆن لەسەر کێشە سنوورییەکان لە ١٥ سێپتەمبەری ١٩٣٩، هەرچیەک بێت ئەم پەیماننامەیە ئەنجام درا. هەردوو لایەنی یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانی لەسەر هەمان رەوشی دوژمنکاری مانەوە، هەریەکەیان چاودێری ئەوی تریانی دەکرد. گومان لەوەدا نییە ئەم رێککەوتنە دەرفەتێکی بە هیتلەر دا دژی پۆلۆنیا جووڵە بکات، داوای یەکخستنەوەی ئەڵمانیای دەکرد و مەبەستی بوو دەستی بەسەردا بگرێت. ئەم دیمەنانە بەر لە ڕووداوەکانی چیکوسلۆڤاکیا و نەمسا بینرا بوون، بەڵام ئەمە دوا وێنەکانی بەر لە جەنگی جیهانی دووەم بوون.

بزووتنەوەی نازیزم لە دانتزیج هانی ئەڵمانیایان دەدا بە ناوی ئەڵمانی نەک بە ناوی فراوانکاری دەست بخاتە ناویان، هەروەها بە ناوی رزگارکردنی ئەڵمانییەکان لە چنگ چەوسانەوەی رەگەزپەرستی پۆلۆنی، بۆ ئەم هەڕەشانە بەریتانیا و فەرەنسا گەرەنتی بەهێزیان بە پۆلۆنیا دا. لە ئاداری ١٩٣٩ پەیمانێکیان لەگەڵ ئیمزا کرد، دوای (میساق)ی ئەڵمانیی سۆڤیەتی فشارەکانی ئەڵمانیا لەسەر پۆلۆنیا زیادیان کردن، وەکو هەموو جارێک بەریتانیا لەسەر دەستی چمبرلن هەوڵی ئاساییکردنەوەی دۆخەکانی دا، بەڵام ئەم جارەیان دڵسۆزی چارەسەریی مامناوەندی نەبوو. لە لایەکی ترەوە حکومەتی پۆلۆنیا سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەم جارە دەست لە هیچ هەڵناگرێت بۆ ئەڵمانیا، هیتلەر یەکی دێسەمبەری دیار کرد بۆ لەناوبردنی پۆلۆنیا. هێرشەکانی ئەڵمانی لە رۆژی دیاریکراو بۆ سەر پۆلۆنیا دەستیان پێکرد، کە دواتر وردە وردە سەرتاپای دونیای گرتەوە، کۆتاییەکەشی لە ئیتاڵیا لە ١٩٤٤ و لە ئەڵمانیا لە نیسانی ١٩٤٥ و لە ژاپۆن لە ئاب ئەویش بە خۆوەدەستدانی تەواوەتیی بێمەرج کۆتاییان پێ هات.